پێڕست

# حەمە کەریم عارف

# پیاوێك لە بارانی وشەی بەردەوام!

شێرکۆ بێکەس

ئەو وەختەی بە عشقەوە ئەنووسیت وئەبیتە هاودەمی زمانی بەخشین وداهێنان.ئەو کاتەی هەموو ژیانت ئەدەیتە دەست قەڵەم وئەبیت بە پەروانەی دەوری وشە وچرای کتێب ورستەیەکی جوان. تۆ ئیتر لەوە دەرئەچی بە تەنها بۆ خۆت بژیت وتۆ ئیتر تەمەنت ئەبێ بە تەمەنی گەڵاوگوڵی خۆشەویستی وژیانت بە ژیانی میللەتێك وتێکەڵ بە ئایندە ئەبی ولەگەڵ باراندا ئەباریت ولەگەڵ هەتاودا هەتاو!

حەمەکەریم عارف

پیاوێك لە شەونخونی و

لە ڕێژنەی وشەو

خۆشنەکردنەوەی قەڵەم و

پەنجەرەیەك بۆ خەمی کەسك و

گزنگی بەیان.

حەمەکەریم عارف

ژێیەك بۆ خۆشەویستی ئەبەدی

ئەدەب وچاوی مرۆڤایەتی و

گۆرانیی هەمیشە پاراوی

گەرووی ژیان!

هەشتا ئەستێرەی کتێب لەو تەمەنەدا

هەشتا جۆگەی روون لەو دارستانەدا.

هەشتا فڕین لەو ئاسمانە زیوینەدا.

هەشتا ماچی منیش لەم نووسینەدا!

ئەمشەو بە تەنها خۆم لەسەر مێزەکەم

ئەم مۆمی ڕێزلێنانەم بۆ ئەو عاشقە داگیرسان!

بە تەنها خۆم وچەند دێرە شیعرێکی جاویدان.

بە تەنها خۆم وپەپوولەیەکی غەمگین و

چەند کاغەزێکی سپی چاوەڕوان.

بە تەنها خۆم کەوتمە هەڵدانەوەی

لاپەڕەی چاو بە شەونمی ئەو مێرگەو

خوێندنەوەی هەناسەکانی ئەو گۆمەو

**گێڕانەوەی حیکایەتی باڵندەیەکی**

**دەنگ زامدار!**

**بە تەنها خۆم، نە حەمەکەریم خۆی زانی و**

**نە رۆژنامەیەك ونە گۆڤارێك و**

**نە شەقامێکی کەرکوك ونە مەقامێکی**

**عەلی مەردان،تەنها هەر خۆم ومێزەکەم**

**کەسی تر نا.**

**کەرکوکییەك**

**پڕ پڕ لە کوردستان و**

**لێوانلێو لە جیهان!**

**کەرکوکییەك**

**هەموو دنیا دێنێتە ناو ئەم پەیڤەوەو**

**پەیڤیش ئەبێ بە گوڵی سان.**

**لە دنیاوە**

**چەندین دەریاچەی ڕۆمانی**

**ڕژانە ناو ئەم وڵاتی زمانەوە.**

**چەندین نزاری چیرۆکی**

**هێنایە ناو ئەم رووبەری زمانەوە.**

**چەندین ئاوێنەی دیرۆکی**

**بە دەوونماندا هەڵواسی.**

**کەرکوکییەك**

**باخی نووسی و**

**کێڵگەی نووسی و ڕانەوەستا!**

**کەرکوکییەك..**

**خۆرەتاوی ناو جیهانی بۆ وەرگێڕاین**

**مانگە شەوی بۆ وەرگێڕاین**

**عەشقی گەورەی ئەفراندنی بۆ وەرگێڕاین**

**ئـــەلبێر کامۆ.ئەلکســـاندەر فەدایـــەف.هیرب میدۆ.قاسموٚف.کازانتزاکیس.چـــیخۆف.گوینتەر دیشنەر.فنســـــــــــــــــــــنت ڤـــــــــــــــــــــــــان گۆگ.مالرۆ.شەکسپیر.م.گۆرکی.هۆمیرۆس.چرنیشفسکی.چایکۆفســـکی.ئیدگار ئـــالان پۆ.جـــاك لەندەن.گۆگۆل.سـیرۆس پرهام.بلیخـانۆف.کریس کۆچـرا.مەهدی حسێن.سـابت رەحمان.ئەحمـەد مەحموود.سەمەدی بیهرەنگی.عـەزیز شـەریف.نەجەف قولی پسـیان. ئەشرەفی دیهقانی.مەسعود**

ئەحمەدزادە.گەوهەر مراد.یەڵماز گونای..چەندین وچەندین کەژو دەریاچەو دەشت و رووباری تریش...

لە سی وپێنج ساڵیدا هەشتا چراوگی

بە ژوورەکانی ئەم زمانەدا هەڵواسی.

لە سی وپێنج ساڵیدا..هەشتا رێگای تازەی

لەم نەخشەیەدا کردەوە

هەشتا تۆوی گوڵی شەست پەڕ

هەشتا پەیژە،هەشتا شەبەنگ و

هەشتا تابلۆ

لەم زمانەدا...ئەم گەرووی چریکانە دەگمەنن.

لەم رەنگانەدا..ئەم تۆنی دەنگانە دەگمەنن.

لەم هەورانەدا..ئەم بارینانە دەگمەنن.

لەم دەغڵانەدا..ئەم گوڵە گەنمانە دەگمەنن.

من ئەمشەو تەنیا هەر خۆم وچەند شیعرێ

ئەم چرای ڕێزلێنانە لە سەر مێزەکەم دائەگیرسێنم.

بۆ کەرکوکییەك کە سەر ڕێژە لە وشەو

کە لێوانلێوە لە خۆرەتاو..سڵاو ئەی بارانە

جوانەکەی زمانی کوردی.سڵاو ئەی

کەرکوکی خۆشەویست!سڵاو!

سلەیمانی ٢٠٠٩/٧/١٥

ئەدەب وهونەر/ژمارە(٦٤٣)/پێنجشەممە/٢٠٠٩/٧/٢٣

"١"

## ژینگەی خانەوادەیی

ئانتون چیخۆڤ چکۆلە هێشتا لە قۆناغی یەکەمی خوێندنی سەرەتاییدا بوو، لە جمنازی تاگانروك،١ تەمەنی نزیکەی نۆ ساڵێك دەبوو، ئەوپەڕی هەوڵی دەدا هەموو هۆش و گۆش و زەینی بخاتە سەر کتێبی ڕێزمانی زمانی لاتینی کە لەبەر ڕووناکی مۆمێکدا لەبەردەمیا کرابووەوە. کەچی بیری لەسەر لاپەڕە چاپ کراوەکەی بەردەمیا دەفڕی بۆ (ژووره گەورەکە) ئەو ژوورەی کە بابی، پاول یگوروفیچی بەسام و ترسناك، سرووت وئەرکە ئاینییەکانی خۆی تیا ئەنجام دەدا. لەم ژووره تایبەتیەدا، کتێبێکی قوداس (نوێژ) لەسەر ڕەحلەیەك دانرابوو. دیواری ژوورەکە بە جۆرەها ئیکونە ڕازابوونەوە. شەو و ڕۆژ چرایان لەبەردەما دەسووتا، شووشەی چراکان ڕەنگا و ڕەنگ بوون. ئەوەی سەیر بوو، خواپەرستی و دینداری پاول یگوروفیچ، زیاتر ڕژدی دەکرد لەسەر ئەوەی کە لە ماڵەوە، بە زاکون و زەبر و زەنگ بێ. چونکە قەناعەتی وابوو هەر ڕەفتارێکی ئەو دەقاو دەق دەگەڵ ویست و مەشیەتی خوادا تێکدەکاتەوەو، پەیوەندیەکی تایبەتی دەگەڵ زاتی خوادا هەیە، بۆیە بە دەستێکی پۆڵایین فەرمانڕەوایی خانەوادەکەی دەکرد. هەر کاتێ لە حوزوری خانەوادەکەیدا دەنگی هەڵبڕیبا، یوگنیا پاکوڤلڤنای هاوسەری (کە ژنێکی وردیلەو گوێڕایەڵ بوو) و کوڕەکانی: ئەلکساندر و نیکولای و ئانتون، ئیڤان و میخائیل و ماریای٢ کیژی، هەموو لەرزیان لێدەهات. دەرکەوتنی پاول یگوروفیچ بەس بوو بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان لای خۆیەوە خۆی بە تاوانبار بزانێ. هەر کارێکی نابەجێی دیتبا، وەکو فیشەکە شێتە دەچوو بە ئاسمانا، ئیدی بەردی بەبا دەکرد، جنێوی دەدا، هەڕەشەی دەکرد، دەستی دەوەشاند. بارانی زللەو شەپەلاخ دای دەکرد. خۆ لە حاڵەتی خەتەردا، قامچیەکەی لە شوێنی خۆی دادەگرت و هەردوو قۆڵی لێهەڵدەماڵی.چیخۆڤ دەربارەی ئەم هەوەڵین یادگاریانەی خۆی دەڵێت: "هێشتا تەمەنم نەگەیی بووە پێنج ساڵان، بابم دەستی بە تەربێت دانم، یان بە گوتەیەکی سادەتر دەستی بەلێدانم کرد. هەر بەیانیەك کە لە خەو ڕادەبووم، هەموو هۆش و گۆشم لای ئەمە بوو: "ئایا ئەمڕۆش کوتەك دەخۆم؟".کاتێ یەکێك لە هاوپۆلەکانی بە ڕێکەوت بۆی گێڕایەوە کە کەسوکارەکەی لەماڵەوە هەرگیز لێی نادەن. باوەڕی پێنەکردو بە درۆزنی زانی. هەنگێ ئانتۆنی جکۆلە، دوای کوتەك خواردن، بە پشتی بە ئازارەوە، دەبوایە، بەپێی عادەتی باو، ئەو دەستەی کە بەو سەختیە تەمێی کرد بوو، ماچ بکات. ئەلهەقی پاول یکوروفیچ نە بە توڕەییەکی زۆر و نە بە مەبەستی ئازاردان لە منداڵەکانی نەدەدا. منداڵەکانی بە شێوازی تایبەتی خۆی خۆشدەویست و قەناعەتی وابوو کە بەو ڕەفتارە توندەی خۆی، یارمەتیان دەدات. ئەمەی بۆ قازانجی ئەوانە. پرەنسیپی سەختگیری بە سەریا زاڵ بوو .بۆیە لەوە غافڵ بوو کە ئەخلاقیات و تەربیەتدان جیایە لە دارو دارکاری. قەناعەتی وابوو، دەبێ بە تۆبزی و بەزەبری لێدان، حەقیقەتە پیرۆزەکان بخاتە مێشکی منداڵە لاسارەکانیەوە. جا بۆ پاکەنەو پاساوی ئەم سەختگیریەی خۆی بە ژنەکەی

دەگوت: "منیش بەم جۆرە گەورە کراوم، بە خۆت دەبینی چۆن دەرچووم! ئەم سووکە سەرکەوتنەی بە دەستم هێناوە، هی ئەو تەربیێتەیە." چیخۆف پاشان، بە کەسەرەوە ئەو ڕەوشە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "ئاغاو فیودالەکان لە باپیرەمیان دەدا، بچووکترین کارمەند و فەرمانبەر دەیتوانی مارهەنجنی بکات، باپیرەمان لە بابمانی دەدا، بابمانیش لە ئێمەی دەدا. ئیدی بەخۆت بزانە چ ئەعسابێك، چ خوینێکمان بە میرات بۆ ماوەتەوە؟" لە شوێنێکی دیدا دەڵێت: "بە منداڵیەتی، منداڵیەتیم بەخۆوە نەدیتووە."

یوگنیا یاکوڤلڤنا، هەندێجار هەوڵی دەدا، توڕەیی و سەختگیری مێردەکەی دابمرکێنێتەوە. بەڵام چونکە کەسێتیەکی بە هێزی نەبوو و شەش منداڵی، لەماوەی نزیك لە یەکترەوە، بوو بوو، تەواو چروسا بووەوە و توانای ئەوەی نەبوو بابی منداڵان کە پیاوێکی توڕە و تڕۆ وزاڵ و بە زاکون بوو، بێنێتە ڕەدایە. لەڕاستیدا، پایەی بابسالاری لەوە بەرزتر بوو، کە وەکو کارەکەر ڕەفتار دەگەڵ ئەم ژنەدا نەکرێت. نەك هەر بەرگری پێ لە منداڵەکان نەدەکرا، بەڵکو جاری وا هەبوو، لەسەر بەڵێیەك یان نەخێرێك، وەکو کارەکەرێك سەرزەنشت دەکرا. چیخوف پاشان، لەنامەیەکا بۆ ئەلکساندری برا گەورەیان دەنووسێت: "تکایە ئەوە وەبیربێنەوە کە هەر جەورو درۆ بوو کە گەنجیەتی دایکتی وێران کرد. هەر جەورو درۆ بوو کە منداڵیەتی ئێمەی بە جۆرێ شێوان، کە ئێستاش بیری لێدەکەمەوە خەریکە زیڕە دەکەم، دڵم تێك هەڵدێت. ئەو ترس و لەرزو نیگەرانیانە وەیادبێنەوە کە ئەو ڕۆژگارە ئێمەی تیا بووین، کاتێ باوکمان لەسەر خوانی ئێوارێ،گەر شلەکە تۆزێ سوێر بایە چ فەرتەنەیەکی دەنایەوە چۆن توڕە دەبوو، چۆن دایکمانی بە گەمژە ناو دەبرد... بە هەرحاڵ مرۆڤ مەزڵووم بێ نەك زاڵم.*"٣"

هەر کاتێ ئانتون بیری لە دایکی دەکردەوە، یان بەدەم کارو مەشغەڵەتەوە لە موبەقەکەدا دەی بینی، یان بەسەر مەکینەی خەیاتیەکەیەوە دەی بینی کە سەرقاڵی درومان بوو. چ بکات، دایکی شەش منداڵ بوو، بەچی خۆراك و پۆشاکیان بۆ دابین بکات؟ کە دەیبینی جلەکانیان زوو دەدڕان و زوو گەورە دەبوون و جلەکانیان بە بەریان تەنگ دەبوو زۆری خەفەت دەخوارد. کێشەی دابین کردنی پۆشاکی منداڵەکان بوو بوو بە وەسوەسەی هۆش و بیری: درێژ کردنەوەی چاکەتێك، پینەکردنی پانتۆڵێك. زۆر گران بوو، پارەیەکی زۆری دەویست. کۆپیك کۆپیك پارەی کۆدەکردەوە، دەترسا لەوەی کە نەبادا مێردەکەی سەرکۆنەی بکات گوایە کەیبانۆیەکی بێ سەروبەرە، ناتوانێ ماڵەکەی بەرێوەبەرێت.

ئانتونی چکۆلەش، هەمیشە، لە بەیانیەوە تا شەوێ، هەر نیگەران و هەراسانی سەر زەنشت بوو. کە دەکەوتە خوێندنەوەی ڕێزمانی زمانی لاتینی، لە دڵی خۆیدا دەپاڕایەوە، دەکەوتە نوێژ و نزایە کە ئەو ڕۆژە بەسەلامەتی کۆتایی بێت و هیچ شتێك لە سۆنگەی ئەم دەرسەوە نە قەومێ. بەڵام ئەوەتا گوێی لە دەنگی پێیان بوو کە لەپشت دەرگاکەوە نزیك دەبووەوە. بابی وەژوور دەکەوێ، قورس و زەلام، چوارشانە، ڕدێن ڕەش و برۆ پڕ، نیگا مەغروورو پڕ متمانە. پاڵتۆیەکی ئەستووری زستانەی لەبەرە. جووتێ پووتی درێژی چەرمی لەپێدایە. دەڵێت:

"ئانتوشا*٤ من هەندێك کارم هەیە، تۆش هەستە بڕۆ بۆ دوکان، بەڵام ئاگات لە دوکانەکە بێ،"

ئانتوشا، بەچاوانی پڕ ڕوندکەوە، بەدەم سکاڵاوە دەڵێت: "دوکانەکە ساردە. لەوەتای لە قوتابخانە هاتوومەتەوە تا ئێستا لە سەرما هەڵدەلەرزم."

– قەیدی نیە، خۆت باش بپێچەوە سەرمات نابێ!

– یەك دنیا دەرس و دەورم هەیە بۆ سبەینێ.

– لە دوکان دەوربکەوە. دەی هەستە بڕۆ. ئاگات لە شتەکان بێ. دەی خێراکە، تەمەڵی نەتگرێ."٥*

ئانتۆن، کە هەمیشە منداڵێکی گوێڕایەڵ بوو، قەڵەمەکەی دادەنێ، پاڵتۆکەی قوتابخانەی کە بەرەکەی پەموو بوو لەبەر دەکات، چەکمە دڕاوەکانی لەپێ هەڵدەکێشێت، کتێبی دەستوری زمانی لاتینیەکەی لەبن هەنگڵ دەنێ و دەردەچێ و لە دوای باوکیەوە، بە نێو تاریکی جادە بەستەڵەکەکەدا دەکەوێتە ڕێ. دوکانەکەیان زۆر نزیك بوو. بەڵام ساردیەکەی لەکێشدا نەبوو، ڕێك سەرمای جەمسەری باکوور بوو. ئاندریوشکا و گاڤریوشکا، دوو دێهاتی ئۆکرانی بچووك بوون، کە مشتەریانی دوکانەکەیان بەرێ دەکرد، ئەمانە لە تاو سەرما پێیان بە عاردیدا دەکوتاو بەدەستە لەسەرما شین هەڵگەڕاوەکانیان دەموچاوی خۆیان هەڵدەگلۆفت تا گەرمیان ببێتەوە. هەر کە چاویان بە ئاغایان کەوت، بەڕێز و حورمەتەوە لە بەردەمیا وەستان، بابی ئەمری بە ئانتون کرد کە بچێت لەپشت پێشخوانەکەوە دابنیشێت، بەخۆیشی چەند جارێك لە هەنبەر ئیکۆنەی بەرەکەتی دوکانەکەدا، نیشانەی خاچی کێشاو پاشان بە هەنگاوی سست و خاو لە دوکانەکە وەدەرکەوت و دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە داخست.

ئانتون، بەدەم سڕینی فرمێسك و چڵمەکەیەوە، لەسەر سەندوقە سابوونێکی قازانی دادەنیشێت، کتێبی دەستوری زمانی لاتینیەکەی لەسەر مێزەکە دەکاتەوە. زۆر بەجدی و ئازایانە لێبڕا کە ئەرك و مەشقەکانی بنووسێتەوە. بەڵام کە دەیەوێ قەڵەمەکەی بە شووشە مەرەکەبەکەدا بکات. نووکی پۆڵاینی قەڵەمەکەی لە نێو شووشە مەرەکەبەکەدا بەر پارچە سەهۆڵێك دەکەوێت. جووتە شاگردە چکۆلەکە لەجێی خۆیانەوە دەکەونە هەڵبەزو دابەز تا گەرمیان ببێتەوە، زۆری نەبرد کەوتنە چەنەبازی، نەخێر شووڵیان لێ هەڵکێشاو بە دزییەوە کەوتنە پێکەنین. مشتەری دێن و دەڕۆن، مامەڵە و سەوا دەکەن، موناقەشە دەکەن. دەنگیان لە ژێر میچە نزمەکەدا دەنگ دەداتەوە. لەم هەراو فەرتەنەیەدا نە خەوتن دەکراو نە دەرس و دەور. ئانتون، کە سەرما گەیی بووە سەر ئێسکی، دەیزانی کە دەبێ چەند سەعاتێك بەدەم چاوەڕوانیەوە، لە دوکان بەرێتە سەر، چونکە هەر کاتێ بابی، بە نیازی دیداری دۆستان یان بە نیازی چوونە کڵێساو نوێژ و نزا لە دووکان دەردەچوو، کوڕەکەی هەر لە بیر نەدەما، بۆیە ئانتون، لەکاتێکا دەستەکانی لە بەڕکی پەستاوتبون و قامکی پێیەکانی لە نێو چەکمەکانیا کرژ کردبوونەوە، بیری لەو نمرە خراپانە دەکردەوە کە سبەینێ لە پۆل وەری دەگرتن، هەستی دەکرد خەریکە لە داخ و لە ترسا بەرە بەرە نەترە بەر دەدات و سست دەبێت.

ئەم دوکانە تاریك و پیسە هەموو جۆرە کاڵایەکی تیا بوو. عەتاری و ئازووقە بەجێی خۆی، بەڵام نەوت، چرا، پڵیتە، گوێزان، تەماکۆ، بزمار، و وەزەنیشی تیا بوو. پاکەتە چای لەپاڵ گورزە

مۆم دا لە سەر ڕەفەکان ڕیز کرابوون. لە عاردی گونیـە ئارد نرابوو بە قەد فەردە گوڵەبەڕۆژەوە. ڕشـە باسـو ق و سـجوق بەسـەر پێشـخوانەکەوە هەڵواسـرا بـوون ئـەم کاڵایانـە بـۆنێکی تێکـەڵ و پێکەڵیان لێدەهات. قاوە، بۆنی نەوتی لێدەهات، برنج، بۆنی پیوی لێدەهات، ئەو تابلۆیەی کە لـە سەرووی دەرگاکەوە هەڵواسرابوو، بە خەتی ڕەش و زێڕین لەسـەری نووسـرا بـوو: چـای، شـەکر، قاوەو ڤەخارن– بۆ ماڵی بەرەوە یان لێرە بیخۆوە. ئەم ڕستەیەی دوایی خۆی لە خۆیدا دەعوەتی مشـتەری بـوو کـە یـەك دوو پیاڵـە ڤۆدگـا لـە ژێرخـانی دوکانەکـەدا بخواتـەوە. چـەند مشـتەریەکی هەمیشەیی، ئەم شوێنە تۆزاوی و بۆگەنەیان کرد بوو بە نیمچە یانەیەك. هەرکە خۆر ئاوادەبوو لە دەوری تونگـە مەیـەکان خڕدەبونـەوە و دوای تۆزێـك گۆنایـان ئـاڵ دەبـوو و گرێـی زمانیـان دەکرایەوە. ئانتون، کە بابی لەوێ نەبا، خۆی بە ژێرخانەکەدا دەکرد، تونگـە و بوتڵـەکانی پـڕ لـە ڤۆدگا دەکردەوە، خزمەتی مشتەریەکانی دەکرد، حیسابی دەگەڵ دەکردن، پارەی لێ وەردەگـرتن و هەڵیدەگرت. ڤۆدگا، لە ڕووسیادا گران نەبوو، دەتتوانی بە چەند کوپیکێك تێرو پـڕ بخۆیتـەوە. مەیخۆرەکان نوکتەی بێ پەرەدەیان دەگێڕایەوە. هەر کاتێ یەکێکیان ویستبای نوکتەیەکی تـەواو بێ دەرپێ بگێڕێتەوە ڕووی دەکردە کوڕیژگەکەو دەیگوت: "ئانتوشا، تۆ گوێ مـەگرە، تـۆ هێشـتا منداڵیت!" بەڵام ئانتونی چکۆلە گوێی لـە هـەموو شـتێك دەگـرت، لـە هـەموو شـتێك حـاڵی دەبـوو، هـەموو نوکتـەکانی هەڵـدەهێنا. وێـڕای ئـەوەی کـە منـداڵ بـوو، ئـەزموونێکی تـەواوی دەگـەڵ کوێرەوەری، دزێوی، تەمەڵی و گەوجاتیدا هەبوو.

دوکانەکە لە سەعات پێنچی بەیانیەوە تا یازدەی شەو کراوە بوو. ئانتون، ئەگـەر ویسـتبای بـۆ دەست بە ئاو گەیاندن بڕوات، کە لـە دەشـتێکی چـۆڵ بـو، دەبوایـە کیلۆمـەترێك دوور بکەوێتـەوە. کە لەمبارەیـەوە دەڵێـت: "هەنـدێجار کـە بـەناو تاریکیەکـەدا دەڕۆیشـتم، ڕوو بـە ڕووی کەسـێکی خانـە بـەکۆڵ دەبوومـەوە کـە شـەوێ پـەنای دەبـردە بـەر ئـەوێ، جـا چ ترسـێك دەیگـرتین، هـەر دووکمانی دەگرت ؟"

ئـەنجام یـەکێك لـە دوو شـاگردەکە، کـە ڕاسـپێردرا بـوو چـاودێری شـەقامەکە بکـات، بـەدەم هـاوارەوە وەژوور دەکـەوت: "بابـە واهاتـەوە." ئـانتون، پشـتی ڕاسـت دەکـردەوە، چـاوە خەواڵوەکانی هەڵدەکلۆفت و چاوانی دەکردنەوە و بەدەم دڵە ڕاوکێوە ئامادەی هـەر سەرزەنشـتێك بوو. پـاول یگـوروفیچ، بـە چـاوانی هـەڵۆ ئاسـاوە چـاوی بـە دوکانەکـەدا دەگێـڕا. ئەوسا دەکەوتـە تاوتوێکردنی دەفتەری حساباتەکە، ئانتون هەناسەی لە خۆی دەبڕی. واوەیلا بـەحاڵی ئەگـەر لـە حیسابەکەدا هەڵەیەکی کردبێت! کاتێ کە بـۆ مـاڵ دەگەڕایـەوە، هیلاك و مانـدوو، تاسـەر ئێسـقان سـەمابردوو، دایکـی دڵخۆشـی دەدایـەوە. هەنـدێجار زاتـی وەبـەرخۆ دەنـاو، دەوێـرا بـەڕێزو حورمەتەوە بەمێردەکەی بڵێ ئەم کارە ڕەنگە لەوە قورستربێ کە ئەم بستە منداڵە لە عۆیەی بێت.

پاول یگوروفیچ، بەرسڤی دەدایەوەو دەیگوت: "چارنیە، دەبێ ڕابێ! من کار دەکەم، بۆ ئەو کار نەکات؟ منداڵ دەبێ یارمەتی بابیان بدەن!

– بـەڵام هـەموو هەفتەکـە هـەر لەسـەر دوکـان بـووە، بـەلای کەمـەوە یـەك شـەممەی بدەیـە بـا ئیسراحەتێك بکات!

– لەجیاتی ئیسراحەت بکات، دەگەڵ کۆمەڵێك منداڵە ورتکەدا بە نێو کوچەو کۆڵانان دەکەوێ و وەکو سەگی پێ سووتاو گەوج گەوج دەسووڕێتەوە. ئەگەر یەکێك لە منداڵەکانی خۆمان لە دوکان نەبێ، شاگردەکان دەکەونە دزینی شەکەرات و شیرینیەکان و کاتێ بەخۆ دەزانی دەخیلەکەش دەدزن!"

هەرکە ئانتون، سووکە گلەییەکی کردبا کە لەبەر سەرماو هاتوچۆی مشتەریان فریا ناکەوێ مەشقەکانی بنووسێت و دەرسەکانی دەور بکاتەوە، بابی لەبن لێوانەوە دەی بۆڵاند: "باشە چۆن من فریا دەکەوم ڕۆژی دوو مەزموران لە کتێبی پیرۆز بخوێنمەوە، بەڵام تۆ ناتوانی تاقە دەرسێك دەور بکەیتەوە و ئەزبەری بکەیت!" قسەی باوی سەر زاری ئەمە بوو: "کاڵای بێ خاوەن دەگری!" وێڕای ئەمەش، بە دەگمەن خۆی لەپشت پێشخوانەکە دەبینرا. ئەدی کوڕی بۆ چ بوون؟ مۆتەکەی دوکانەکە، لە مێشکی ئانتون دا، دەگەڵ مۆتەکەی کلێسادا یەکانگیر بوو بوون، هێندەی دی باری قورس کردبوو. پاول یگوروفیچ هێندە ئاشقی دین و دینداری بوو، کە زۆربەی کاتی خۆی بە خوێندنی وێردو نزایان، بەخوێندنەوەی کتێبانی ئاینییەوە دەبردە سەر. ئەوەی ئەوی بۆ دینداری و مومارەسەی ئەرکێن ئیمانداری ڕادەکێشا، ڕێنماییەکانی مەسیحییەت نەبوو، بەڵکو زیاتر جوانی سرووتە هێدی و ئارام و نهێنی ئامێزەکان، پرشنگ و بریق و باقی ئیکۆنەکان و چوارچێوە زێڕینەکانیان، جیلوەی جل و بەرگی وێردخوانەکان، سروودی دڵگیر، بانگ و گازی سوجدە بردن، نیشانەی خاچ کێشان، بۆنی مەست کەری بخورد بوو. کوڕەکانی ناچار دەکرد، ڕۆژانە لەگەڵیا بچنە فەرزە سەرەکیەکان. جا چونکە لە کلێسا ئەرتەدۆکسیەکاندا کورسی و شوێنی دانیشتن نەبوو، منداڵەکان، بە سەعاتان، حایرو سەرسام لەو نوێژ و نزاو پاڕانەوە دەستەجەمیانەی ئەنجام دەدران، بەپێوە دەوەستان. دوای ماوەیەك پاول یگوروفیچ، هەر بەوەندەوە نەوەستا، ئەم کارەی بەکەم زانی، جا چونکە دەنگێکی خۆش و گوێچکەیەکی هەستیاری هەبوو. لێبڕا کە تیپێکی سروود خوانی بۆ کلێسا دابمەزرێنێ. مەشق و ڕاهێنان لە سەعات دەوە تا دوازدەی شەوێ، لە هۆڵێکی تەنیشت دوکانەکەدا ئەنجام دەدرا. زۆربەی ئەندامانی تیپەکە، لە ئاسنگەرانی بە هێزو توانا بوون. سەرۆکی تیپەکە بۆ ئەوەی هەمئاهەنگی و هاوسەنگیەك بخاتە نێو ئەم دەنگە جیاوازانە: باس، باریتون، تینور، سپرانۆ و ئالتۆ، کوڕەکانی خۆی هێنانە ناو تیپەکە. یەکەمین و دووەمین سپرانۆی بە ئەلکساندرو نیکۆلای سپارد و ئالتوی بە ئانتون سپارد. ئەمانە لە سەر سەندوقی سابوونان، لە دەوری مێزێك دادەنیشتن. پاول یگوروفیچ کەمانی (ویڵۆن) ی لێدەداو ئەوانیش سروودی شکۆمەندیی خودایان دەخوێند. پاول یگوروفیچ دەیگوت: "تازە ڕەبەنان تاکو بەرەبەیان ، نوێژ و نزایان و سرودان دوخوێنن و ئەمە هیچ ئاسیوێکیان پێ ناگەیەنێت، سروودخوانی لە کلێسادا سینەی منداڵەکان دەکاتەوە، بە هێزی دەکات. من لە منداڵیەوە تاکو ئێستاش هەر سروودم خوێندووە و شوکر بۆ خوا تەندروستیم زۆر باشە، پیاو هەرچیەك لە ڕای خواو لەپێناوی خوادا بکات زەرەر ناکات!"

چونکە پەیوەندی و تەماسی دەگەڵ کوڕو ئەنجوومەنانی سەر بە ناوەندە کلێساییەکان هەبوو، داوایان لێکرد کە لە زۆر بۆنەی سروودخوانیدا بەشداری بکات کە بەخۆی زۆری شانازی بەمەوە

دەکرد، بەڵام منداڵەکانی ئەمەیان لەبەر گران بوو. ئانتون، بە تایبەتی لە ڕۆژانی یەك شەمەو ڕۆژانی تەحتیل، کە ڕێوەڕەسمی عیبادەت و سروود خوانی لە بەیانی زووەوە دەستی پێدەکرد، دەترسا. چونکە دەبوایە خۆی و براکانی لە کڵێسادا ئامادەبن و بەشداری سروودخوانی بکەن. بابیان بە دوو سێ سەعات لەپێش ڕێو ڕەسمەکەدا لە خەوی هەڵدەستانن تا فریا بکەون. لەباری جەستەیی و ڕوحیەوە خۆ بۆ ئەو عیبادەتە دەستەجەمیە کە لەپێشیان بوو، ئامادە بکەن. کە شەکەت و ماندوو بۆ ماڵ دەگەڕانەوە، بابیان لەماڵەوەش نیمچە قوداسێکی ئاینی تازەی، کە تایبەت بەخۆی بوو، بەسەردا دەسەپاندن. چەند داربخوردێکی لە بوخوردانێکا، لە هەنبەر ئیکۆنەکاندا دادەگیرساند، داوای لەخێزانەکە دەکرد کە بەدەنگ و ئاوازەوە بەشداری نوحە خوانیەکانی بکەن. ئیدی باب و داك و منداڵان تێکڕا سەریان دەبردە سوجدەو بە دەنگی بەرز لە خوا دەپاڕانەوەو ستایش و سوپاسیان دەکرد، ئەمە تا دوا قوداسی بەیانی بەردەوام دەبوو. کە زەنگەکان جارێکی دی لێیان دەدا، هەموان بە پێیان بەرەو کڵێسا دەچوونەوە. چیخۆف، لە ١٨٩٢/٣/٩ نامەیەکی دەربارەی ئەم مەینەتیەی خۆی بۆ (ئیڤان لیونتیڤ – شچگلوف)ی دۆستی نووسیوەو دەڵێت: " لەسەردەمی منداڵیەتیمدا پەروەردەی ئاینیم دیتووە، لەگەڵ تیپدا سردووم خوێندووە، نامەی پەیامبەران و مەزمورانم لە کڵێسادا خوێندووە، بە بەردەوامی نوێژی بەیانیم کردووە، لە هەیکەل و میحرابدا ئامادە بووم، ناقوسانم لێداوە. بەچی دەچێت؟ کاتێ کە بیر لە قۆناغی منداڵیەتی خۆ دەکەمەوە، هەموو شتێك لەبەر چاوما تاریك و لیلێ دەنوێنێ. تروسکەی تیا بەدی ناکەم. ئێستا زەڕەیەك دینم لا نەماوە. دەزانی، هەر کاتێ من و براکانم سروودی "دوعاکانم قەبووڵ بفەرما" یان "دەنگی سەرۆکی فریشتانمان" لە کڵێسا دەخوێند، هەمووان بە سەرسامی تەمەشایان دەکردین و بەغیلیان بە داك و بابمان دەبرد. بەڵام ئێمە لەوکاتەدا وامان هەستدەکرد، منداڵانی مەحکووم بەبێگارە زندانین.. وامان دەزانی بێگارمان پێدەکەن... قۆناغی منداڵیەتی بۆ ئێمە، بۆ من و براکانم، بە ڕاستی عەزاب بوو نەگاڵتە." وێڕای ئەوەش، چیخۆف دان بەوەدا دەنێ کە بابی، سەرباری بیر تەسکی و زبر ڕەفتاری خۆی، لەواری هونەریدا کەسێکی بەزەوق و سەلیقەدار بوو. نەك هەر لەبەر ئەوەی خۆ بە خۆو بێ مامۆستا فێری کەمانچەژەنی بوو بوو، بەڵکو بە شێوەیەکی ساکارانەو پڕ لە خشوع و ڕێزەوە ئیکونانیشی ڕەسم دەکرد. چیخۆف دەڵێت: "بەهرەمان لە بابەوە بۆ ماوەتەوە، بەڵام ڕوحمان لەداکەوە بۆ ماوەتەوە."

سەرباری ئەو هەموو نوێژو نزایە، ئەو هەموو مۆمانەی لە بەردەم وێنەی پەیامبەرو وەلیاندا هاتنە داگیرسان، ئەوجاش کارو کاسبی پاول یگوروفیچ ڕۆژ بە ڕۆژ دەیدایە کزی. هەڵسوکەوت و بەرخوردی توندی، سیمای گرژو توڕەی، گرانجانی و ڕەزیلی، مشتەریەکانی دەتاراند و دەتۆراند. ئەمە جگە لەوەی کە شتەکانی، بە زۆری خراپ بوون. ڕۆژێ جرجێك دەکەوێتە تەنەکەیەك زەیتەوە، دڵی نایەت تەنەکە زەیتە پیسەکە فڕێ بدات و ئەو خێرەی لە خوا بوێ. چۆن هاوسەنگیەك لە نێوان زەرورەتی دروستکاری هەر مەسیحیەك و، خۆ دەرباز کردن لە زەرەرێکی گەورە فەراهەم بکات؟ پاول یگوروفیچ، ناوی خوای لێهێناو ناردی بەدوای کەشیشێکدا و داوای لێکرد دوعا بەسەر تەنەکە زەیتە پیسەکەدا بخوێنێ و نوێژ و نزای پاکبوونەوەی لەسەر بخوێنێ.

هەنگێ بۆی هەبوو دوای ئەم حیلە شەرعە، بە ویـژدانی ئاسوودەوە، تەنەکە زەیتەکە لە دوکانا دابنێ و بەنرخی زەیتی پاك بیفرۆشێت. دیارە ئەم کارە لە جەوێکی زۆر داخراودا ئەنجام درا، بەڵام هەواڵەکە دزەی کردو دەرو دراوسێ زوو بە واریقاتەکەیان زانی و زۆر پەست و تووڕە بوون. بەڵام زەیتەکە دوای ئەوەی کەشیشەکەش فتوای پاکبوونەوەو حەڵاڵی دا. مشتەری هەر نەبوو. ئیدی گومانی پیسی کەوتە سەر هەموو شتەکانی ناو دوکانەکە و تەنیا مەینۆشان وەکو جاری جاران هاتوچۆی یانەکەیان دەکرد.

پاول یگورۆفیچ، کە کەوتبووە نێوان بەرداشی دکتاتۆریەت و وشکە دینداریەوە، بێهودە هەوڵی دەدا پلەو پایەیەکی بازرگانی شایستە بەدەست بێنێ، بەڵام وێڕای ئەوەش بە یەکێك لەچینی مامناوەندی بازرگانانی تاگانرۆگ دەژمێردرا. بۆیە بە ڕەزامەندیەکی ساکارانەوە، بە زنجیرێك نیشانەی ئەم چینە لە بە رۆکی خۆی دەدا. ڕۆژانی یەك شەموان، تا شەپقەیەکی حەریری نایابی لەسەر نە ناباو کراسی سپی لەبەر نەکردبا، لە ماڵ نەدەچووە دەرێ. کە دەیڕوانیە ڕابردوو و بیری لەو ژینگە کۆمەڵایەتیە دەکردەوە کە لێوەی هاتبوو، بە ڕاستی دەیتوانی شانازی بەو پێشکەوتنەوە بکات کە بەدەستی هێنابوو.

بابی یگوروفیچ، واتا یگور میخائیلوفیچ چیخ (باپیری چیخۆف لەبابەوە) کۆیلە بوو. چونکە کابرایەکی زیرەك و ئیشکەرو بەمشور و پاشەکەوتکەر بوو، توانی ببێت بە بەرێوەبەری پاڵاوگەی چەوەنەری شەکری ئاغاکەی. خۆی فێری خوێندن و نووسین و حیساب کرد، هەمان داواشی لە منداڵەکانی کرد. لەساڵی ١٨٤١دا پاش ئەوەی پارەیەکی باشی پاشەکەوت کرد، توانی ئازادی خۆی و ژنەکەی و هەرسێ کوڕەکەی بە بەهای هەر سەرەی حەوت سەد ڕۆبڵ کە پارەیەکی زۆر بوو، بکڕێتەوە. بەڵام کە نۆرە هاتە سەر تاقە کچەکەی، پارەی پێ نەما، ئەوە بوو (کۆنت چرتکوف)ی ئاغای کە پیاوێکی دڵاوابوو بە خۆڕایی، وەکو پاداشتێك کچەکەی پێ بەخشیەوە. یگورمیخائیلوفیچ هەرکە ئازاد بوو، بەهۆی چاکی و ڕاستگۆیی خۆیەوە بوو بە پێشکاری مۆڵکە بەر بڵاوەکانی دۆتمیر پلاتوڤا، کە کەوتبوونە نێوان تاگانروك و رۆستۆڤی کەنار ڕووباری دنەوە. ئیدی کەس بە تەوسەوە بەچیخ بانگی نەدەکرد، بوو بەچیخۆف بەو ئومێدەی کە ئایندەی خانەوادەکەی خۆی دابین بکات، میخائیلی کوڕی نارد بۆ کالوگا تا فێری سەحافی و جزوبەندی کتێبان ببێت. میتروفانی بۆ روستوف نارد تا لای کابرایەکی بازرگان دوکانداری بکات، پاولی وەکو ژمێریار ناردە لای کوبیلنی گەورە بازرگان و کوێخای تاگانروك. پاول وەکو ژمێریار، ئەرکێکی گەورەی دەستۆ بوو، گوێڕایەڵانەو خاکیانە ئەرکی خۆی بەجێ دەگەیاند. بۆ ماوەی دەدانە ساڵ بە کرێیەکی کەم کاری دەکردو هەموو خواریەکی دەکێشا، لە ناخی خۆیا بێتاقەت بوو. پاشان لە ٢٩/ت١/ ١٨٥٤دا دەگەڵ یوگنیا یاکوڤلڤنادا، کە ئەویش وەکو خۆی لە بنەماڵەیەکی بە بنەچە کۆیلە بوو، زەماوەندی کرد. بابی یوگنیا، لە مۆرشانسکدا بازرگانی کوتاڵ بوو، لە سەفەرێکیا بۆ نوڤوچرکاسك، بە نەخۆشی کولێرا مرد بوو. کاتێ هاوسەرەکەی (دایکی یوگنیا) کە لەو بەری ڕووسیا بوو، چوو بووە سەردانی ژنێکی خزمی لە دەڤەری فلادیمیر، هەواڵی مەرگی مێردەکەی زانی بوو، گالیسکەیەکی بەکرێ گرتبوو، بە مەبەستی دۆزینەوەی

گۆڕی مێردەکەی، دەگەڵ هەردوو کیژەکەیدا، ملی ڕێگای سەفەرێکی بێ ئاکام و دووروودرێژ و تیرسناکی گرتبووە بەر . یوگنیا، بە تاسووقەوە باسی ئەم سەفەرەی بۆ ئانتونی کوڕی دەگێڕایەوە کە چۆن دەشت و دەرو جەنگەڵانیان تەی کردووە، چەند دیمەنی جوانی تەبیعەتی بیابانیان بڕیوە، چۆن تووشی وشکە دینداری سەرگەردان بوون، چۆن لە خان و کاروانسەرایانی شووم لایان دابوو، چۆن دەبوا لە ترسی ڕێگرو دزان دەرگا لەسەر خۆیان دابخەن. چۆن تا زیاتر بەرەو باشوور نشێو دەبوونەوە، ترس و ماندوو بوونی سەفەرەکەیان دەبوو بە جۆرە کەش و هەوایەکی شاعیرانە . چۆن کاتێ کە لە ترس و نیگەرانی ڕزگار بوو بوون، هەندێجار لە دەرەوە دەنووستن و ئاسمانیان بە ئەستێرە جوانەکانیەوە بەخۆدا دەدا، لە ژێر ئاسمانی ساف و بێگەردا، مەگەر تەنیا دەنگی زیك زیکە یان قیژەی لە ناکاوی تاق تاقکەرەیەك بێدەنگیەکەی بشڵەقاندبایە. ئانتون، بە درێژایی تەمەنی ئەم حیکایەتە جوانانەی دایکی لەبیر نەکرد. لە چیرۆکی (ستێپ دا = دەشت) هەندێ لەم ڕیسکانە هێندە بە ئاو و تاو، پڕ جۆش و خرۆشەوە، هێندە بە سۆزو گودازەوە دەگێڕێتەوە لە تۆ وایە بەخۆی تیایدا ژیاوە. ئیدی گۆڕەکەی بابە گەورە موروزوف نە دۆزرایەوەو بۆیە بێوە ژنەکەی دەگەڵ هەردوو کیژەکەیدا، هیچ چارێکیان نەماو لە شاری بەندەری تاگانرۆکدا ئاکنجی بوون. ئیدی لەوێدا پاول یگوروفیچ. تووشی هاوسەری ئایندەی خۆی دەبێت.

ژیانی هاوبەشی ژن و مێردایەتیان لە سەرەتاوە زەحمەت و دژوار بوو. جەنگی قرم هەموو چالاکیەکی بازرگانی لە بەندەری تاگانروگدا ئیفلیج کرد، زۆری نەبرد کە شار لەلایەن هێزی دەریایی هاوبەشی فەرەنسی – بەریتانیەوە تۆپباران کرا. یوگنیا، کە لەو کاتەدا سکی هەبوو، دەگەڵ مێردەکەیدا، باریان کرد بۆ دەوروبەری شار. دوای شووکردنەکەی بە دەمانگ یەکەم منداڵی، ئەلکساندر هاتە دنیا. هەرکە جەنگ تەواو بوو ژن و مێرد دەگەڵ نۆبەرەکەیاندا بۆ شار گەڕانەوە، چوونە کوختەیەکەوە کە بابی پاول یگوروفیچ بۆی کڕی بوون. ئەنجام لە ساڵی ١٨٥٧دا، پاش چەندین ساڵ ڕەزیلی و پاشەکەوت، پاول یگوروفیچ توانی بە ئاواتی خۆی بگات و بۆ خۆی دوکانێکی وشکە فرۆشی بکرێت. لێرەدا، لە ناو جەرگەی تاگانروگدا، لە ماڵی گنوتوفدا، لە شەقامی پولیتزیسکایادا، ئانتون چیخوف لە ڕۆژی ١٧/ك٢/ ١٨٦٠دا لەدایك بوو. ئەم بینایە کە یەك نهۆم بوو، دەلاقەو پەنجەرەکانی سەوز و سەربانەکەی شێروانی بوو، زۆر زوو قەرەباڵغ بوو و ئیدی جێیان تیای نەدەبووەوە، خانەوادەکە بە ناچاری و دووجار گواستیەوە تا ئەنجام لەساڵی ١٨٦٩دا لە ماڵی مویسیڤ، لە شەقامی موناستیرسکایا، لە قەراخی شار ئاکنجی بوون.

ئانتون چیخۆف، یادگارییەکی خەمناکی لەمەڕ ئەم ماڵانەی کە منداڵیەتی خۆی تیا بە سەر بردوو، لەلا بەجێما. لەچیرۆکی "ژیانی مندا" دەنووسێت: "لە ڕۆژانی جەژندا بۆنی چێشتی حەوترینگە لە ماڵەکانەوە بەرز دەبووەوە، لە ڕۆژانی دیدا بۆنی سەگ ماسی سوورەوەکراو لە ڕۆنی گوڵەبەڕۆژەدا، دەهات. خواردنمان نا گەوارا بوو، ئاوەکەمان پیس و ناسازگار بوو. لەسەرانسەری شارا تاقە پیاوێکی دروستکار و شەریفم شك نەدەبرد." لەنامەیەکا بۆ براکەی

دەڵێت: "لە تاگانروکدا نیشتەجێم... هەست دەکەم خەڵکی هرکولانم یان پۆمپیم...ماڵەکان هەموو سواون، عومرێکە بۆیە نەکراونەتەوە... سەربانەکان بۆیەکانیان چووەتەوە، پەنجەرەکان داخراون. هەرکە دەگەیە سەرەتای شەقامی پولیتزیسکایا، ئیدی قوڕە، قوڕێك کە کزر دەبێتەوەو هەنگێ هەڵدەتۆقێ. کە بە ناو شارا دەڕۆیشتم ئەوجا بۆم دەرکەوت کە تاگانرۆگ چەند پیسە، چەند چۆڵە، چەند بۆش و بە تاڵە، چەند تەمەڵ و نەخوێنەوارە، چەند تاقەتبەرە. هیچ تابلۆیەکی تیا نیە بێ هەڵەی ڕێنووس بێت. تەنانەت تابلۆیەکم بینی لیی نووسرا بوو (مەیخانەی ڕووصی)! جادەکان چۆڵن: مەگەر بەرێکەوت چەند کرێکارێکی بارئەنازی لەخۆڕازی، یان چەند کەسێکی فشەکەری خۆنوێنی کڵاو لاری، پاڵتۆ درێژ بدینێ... تەمەڵی لەم شارەدا زاڵە، خەڵکی بەچەند کوبیکێکی کەم،بەڵام ئایندەیەکی نادیار قەناعەت دەکەن و چ دەبێ با ببێ. ئەوەی لێرەدا، لە هەموو شتێك ناشیرینترە ئەم پەنجەرە هەمیشە داخراوانەیە "

لە نامەیەکی دیدا، بە بەرواری هەمان ڕۆژ، کە بۆ ڕۆژنامەوانێکی ناردووە بە نێوی نیکولای لیکین، ڕەوشەکەی بەمجۆرە باس کردووە: "هەرچییەك لە دەرورو‌بەری خۆ دەبینم ئاساییە، هەندێجار باوەڕ بەچاوی خۆم ناکەم. شەش هەزار کەس. جگە لە خواردن و خواردنەوەو منداڵ خستنەوە، هیچ خەمێکی تریان لە ژیاندا نیە. بۆ هەر کوێ دەڕۆی تەنیا کێك و کولیجەو هێلکەو تەنیا شەرابی سانتورانی و منداڵانی بەر مەمکە دەبینی. نە ڕۆژنامەیەك، نە کتێبێك... لێرە نە نیشتمان پەروەرێك هەیە، نە بازرگانێ، نە شاعیرێك، تەنانەت نانەوایەکی ماقووڵیش نیە..."

ئەوەی ڕاستی بێ تاگانرۆگ، یانی ئەو شارەی کە کەوتبووە سەر کەناری باکووری ڕۆژهەڵاتی دەریای ئازۆفەوە، لەو سەروبەندەدا. ڕوو لە نەمان و مردن بوو. ئەو بەندەرەی کە بە فەرمانی پترۆسی گەورە دروست کرا بوو، ڕۆژگارێك ڕەونەق و بوژانەوەیەکی تایبەتی بەخۆوە بینی بوو ژمارەیەك بازرگانی زۆر، کە زۆربەیان یونانی بوون ڕوویان کرد بووە ئەم شارەو کاروباری هەناردەکردنی بەرهەمێن کشتوکاڵیان گرتبووە دەست. ئەمانە گروپێکی ئەرستوکراتی پارەدار یان پێکهێنا بوو، فەرمانڕەوایی خەڵکی ئەسڵی شارەکەیان دەکرد کە دەوری فەرمانبەری بازرگان یان کرێکاریان دەبینی. لە نێو ئەو ئاغا دەوڵەمەندانەدا، لە نێو ملیۆنێرانی تاگانروگدا، گوێت لە ناوانی وەك: "ڤالیانۆ، سکارانگا، کوندویاکی، موسوری، سفائیلو دەبوو. بەڵام تاقە یەك ناوی وەکو: (ئیڤانوڤ یان پتروف) یان تیا نەبوو. ئەم ملیۆنێرانە لە گەڕەکێکی تایبەت بە خۆیان دەژیان هاتووچۆی یەکتریان دەکرد، بە گالیسکەی فاخیر هاتوچۆیان دەکرد، خۆیان بەجل و بەرگی پاریسییەوە دەنواند، کۆمەکیان پێشکەش بە شانۆو کاری شانۆیی ناوچەیی دەکرد، ئەمانە لە پارۆس و کاراراوە، مەرمەڕیان دەهێناو پەیکەرو کێلیان بۆ خۆو خانەوادەکانیان، لە گۆڕستانی یوتانیەکان پێ دروست دەکرد. کاتێ کە تزار ئەلکسندری یەکەم کوت و پڕ بەشێوەیەکی گۆنگ و ئاڵۆز لە ساڵی ١٨٢٥دا، لە تاگانرۆگ مرد، ئەم شارە سووکە ناوو شۆرەتێکی پەیدا کرد. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم دیسان ئەم شارە دەریاییە، ناو وناوبانگی کوێر بوەوە. لم و قوڕ لیتە بە ڕادەیەك کەنداوەکەی پڕ کردەوە، کە کەشتیە گەورەکان ناچار بوون، لەدوورتر و لەناوەندی دەریاکەدا لەنگەر بخەن. لە هەمان کاتدا، شارۆچکەی روستوڤی نزیکی تاگانرۆگ، کە کەوتبووە

سەر ڕووباری دۆن، بەرە بەرە گەشەی کرد، گەورە بوو، بوو بەمەڵبەندی بازرگانی هەموو ناوچەکە، ئیدی لە ناوەڕاستی قەڕنەوە، تاگانرۆك بوو بە شارۆچکەی تاپۆیان. ئانتون چیخۆف هەم لە خامۆشی و مردوویی شارەکە بێزار بوو، هەم خەفەتی بۆ جوانی و ئەفسوونە ناتەندروستەکەی دەخوارد. بێگانانی دەوڵەمەند، بە کەش و فشەوە، های لایف لە شارەکەدا دەژیان و ڕووسەکانیش، کە بریتی بوون لە کرێکاران، حەماڵی باراندازەکان، دوکانداران و خوردە فەرمانبەران، نانیان بەدۆیان نەدەگەیی و بەوپەڕی کولەمەرگی دەژیان. جادەو شەقامەکان قیرتاو نەبوون، لە پایزان و بە هاراندا دەبوون بە قوڕو چلْپاوێکی ئەوتۆ تا گۆزینگی پێی ڕێبواران دەهات. لە هاویناندا، بەپێچەوانەوە، گیاکەڵە ڕێگاکانی بەجاریٚ دەکردە ژێرەوە. تەنیا دوو شاڕێگاکەی ناو شار، بە ئاستەم ڕووناك بوون، بۆیە خەڵکی شار کە بەشەوان لە ماڵ وەدەردەکەوتن، ناچار دەبوون فانۆس دەگەڵ خۆدا هەڵگرن. ناو بە ناو کە هەواڵی گوم بوونی کیژێك بڵاو دەبووەوە، خەڵکەکە دەیانگوت بە حەرەمسەرای عوسمانیان فرۆشتووە. هەندێجار زاندانیانی، زندانی شارەوانی عارەبانەیەکی پڕ لە گونیە ئاردیان بە بەینی زەویە بەیارو پەرژین و تامانە سنگ هەڵکەندراوەکانا ڕادەکێشا. یان هەر ئەو زندانیانە، ڕادەسپێردران کە بە ناو شار بکەون، تاقیبی سەگ و کسۆکانی خوێڕی و بەرەڵا بکەن و بە بەرچاوی خەڵکی و ڕێبوارانەوە، بە گۆپاڵ و تۆپزان، بیانکوژن.

ئاو کەم و پیس و ناسازگار بوو. ڕۆژانی شەموان جاڕچی شار، گسکێکی گەورەی حەسیری دەنایە سەر شانی و بە شەقامەکانی شارا دەسوڕایەوەو بانگەوازی دەکرد: "بۆ گەرماو! بڕۆن بۆ گەرماو! بڕۆن بۆ گەرماوی شارەوانی!"

ئانتونی چکۆلە کەسەراپا لەم شارەپیسەدا، لەم شارە فەرامۆش کراوەدا، ڕووسان گوتەنی لەم شارە "کەڕە"دا نقووم بوو بوو، کەوتبووە نێوان بەرداشی بێزاری و میهرەوە، بەرداشی یاخی بوون و ملکەچییەوە. ئەم شارە، ئەم گۆشە بێنازەی دنیای زۆر چاك دەناسی. ئەوانەی لە دەوروبەری خۆیدا دەی بینین خەڵکانێك بوون، وەکو دایك و باوك و کەسوکاری ئەو، لە کوختەێن دارینی چکۆلەدا دەژیان، خانۆچکەی دارینی داروخاو، کە هەر یەکەیان بەرهەیوانێکی هەبوو و بە زەحمەت لە گەرمای هاوینی دەپاراستن، سەرو باخچەی پەرپووتی تەپوتۆزاویان لەبەر دەرگادا هەبوو. ئانتوون ناو و ناوبانگی یەکە بە یەکەی دراوسێکانیانی دەزانی، ناوی سەگەکانیانی دەزانی، ژمارەی مریشك و کەڵە شێرەکانیانی دەزانی، دەیزانی کولانەی هەر ماڵێك چەند مریشك و کەڵەشێری تیایە، ئیدی هەر نەخۆشیەك، هەر مردنێك، هەر زەماوەندێك، هەر منداڵ بوونێك، هەر دەعوەت و جەژنێك، هی هەموویان بوو، پەیوەندی بە هەموویانەوە هەبوو. ڕکابەری یەکیان دەکرد، بەغیلیان بە یەك دەبرد، وێڕای ئەمەش پشتیوانی یەکیان دەکرد. ئاخر چۆن دەکریٚ شوێنێکمان خۆش نەویٚ کە چاومان تیا هەڵێناوە، کە بچووکترین بەردی لە یادگەماندا نەخشاوە؟ چیخۆفش هەستی دەکرد کە بوونی بەشێکە لە سستی پڕ لەزەتی ئەم دەڤەرەی ڕووسیا. بەڵام لە هەمان کاتدا، زۆری خەفەت لەوە دەخوارد کە سەر بە کۆمەڵگەیەکی ئەوەندە پاشکەوتەو شەخسیەت سزە، کە هیچ باوەڕێکیان بە ئایندەیەکی باشتر نەبوو، دەستیان لە دنیا

شۆرد بوو. هەرچەندە بە تەمەن منداڵ بوو، بەڵام هەستی دەکرد ژیان بە بێ ئومێدی نابرێتە سەر. هەر لەسەرەتاوە دەیزانی کە ئاییندەی ئەو لە سنووری تاگانرۆگدا ناوەستێ. کە لەدوکانەکەی بابیا، لە نێو فەردە ئاردەکان، و سوسیس و باسترمەکاندا دادەنیشت، خەوی بە سەفەرێکەوە دەبینی وەکو ئەوەی دایکی بۆی گێڕا بووەوە، سەفەرێکی دوورودرێژ، سەیرو سامناك، سەفەرێکی ئەفسووناوی بە پانی و درێژایی سەرانسەری ڕووسیادا. ئایا ئەویش بۆی هەڵدەکەوێ و دەتوانێ، کۆسپ و لەمپەران ببڕێت، مل بنێ و ئاسۆو ئافاقێن تازە، سیماو خەڵکانی تازە بدۆزێتەوە؟ هیچ چارێکی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ بەدەم چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەوە، مل بداتە خەت وم بەدەم ئاخ و ئۆف بێزاریەوە، خوو بداتە خوێندنەکەی و..

پەراوێز:

١- جمناز: مەکتەبێکی ڕووسیە، ئەم مەکتەبە لە ڕووسیادا بریتی بووە لە هەشت پۆل، پۆلی یەك نزمترین قۆناغی خوێندن بووە، پۆلی هەشت بەرزترین و دوا قۆناغی خوێندنی بووە.

*- تاگانرۆگ، شارۆچکەیەکی باشووری ڕووسیا بووە لەسەر دەریای ئازۆڤ.

٢- ئەلکساندر لە ساڵی ١٨٥٥، نیکولا لە ساڵی ١٨٥٨، ئانتون لە ١٨٦٠، ئیڤان لە ١٨٦١ و ماریا لە ١٨٦٣ و میخائیل لە ساڵی ١٨٦٥ لە دایك بوون.

٣- (... مەزڵوم بێ، نەك زاڵم): لە نامەیەکی ٢/ك١٨٨٩/٢ی چیخۆفەوە وەرگیراوە.

٤- ئانتوشا: سووکەڵە ناوی ئانتونە.

٥- (... تەمەڵی نەتگرێ): ئەم دیالۆگەو دیمەنەکەی دواتریشی لە یاداشتەکانی ئەلکساندری برای چیخۆفەوە وەرگیراوە.

٦- پیو: چەورایی ناو زگ، پیڤ.

٧- فەرسەخ: دەکاتە ١٠٦٧ مەتر.

٨- باس: بەرزترین دەنگی پیاوانە لە زاراوەی موسیقاییدا

٩- باریتون: سنوری مامناوەندی دەنگی پیاو، کە دەکەوێتە نێوان تینورو، و باسەوە.

١٠- تینور: نزمترین دەنگی پیاو

١١- سپرانۆ: نزمترین دەنگی ژن.

١٢- ئالتۆ: بەرزترین دەنگی ژن.

١٣(.. ئیکونانیشی ڕەسم کردووە...) چیخۆف هەندێ لەم ئیکۆنانەی پاراستووەو تاکو ئێستاش لە موزەخانەکەی چیخۆفدا، لە یاڵتا پارێزراون

١٤- کۆنت چرتکوف: باوە گەورەی موریدو سەروەسێتەکەی دواتری لیڤ تولستۆیە.

١٥- ئانتون چیخۆف ١٧/ك١٨٦٠/٢، ئەم خانووە، هێشتا لە ژێر ژمارە ٤٧دا، لە شەقامی چیخۆفدا ماوە.

١٦- هرکولانم، و پومپی: شارێکی کۆنە لە باشووری ڕۆژاوای ئیتالیا، لە نزیکی ناپولی کە ساڵی ٧٩ زاینیدا دەگەڵ پومپی دا بەهۆی گڕکانی کێوی ڤیزوڤیزو مەحوو بووەوە.

١٧- سانتوران: جۆرە شەرابێکی یونانیە.

١٨- (.. ئەم پەنجەرە هەمیشە داخراوانەیە..) لە نامەیەکی ١٨٨٧/٤/٧وە وەرگیراوە.

((٢))

## هەڵاتن لە قوتابخانە

پاول یگوروفیچ، دڵشکاو لە کەسادی و بێ بازاڕی کار و کاسبی، ڕۆژێ لە دوکانەوە بۆ ماڵ هاتەوە، بڕیاری دا کە منداڵەکانی دەبێ ببن بە شتی گەورەتر لە دوکانداری عەتاری.لە دڵی خۆیدا دەیگوت مادامێکی بازرگانانی دەوڵەمەندی یۆنانی کاروباری تاگانروگیان لە دەست دایە، دەبێ ئەویش چاو لەوان بکات. لە جیاتی ئەوەی ئانتون و نیکولای بنێرێتە قوتابخانەی ڕووسی، کە ژنەکەی حەزی دەکرد بچنە قوتابخانەی ڕووسی، وای بە چاك زانی بیانخاتە قوتابخانەیەکی یۆنانی، کە گوایە لەوێندەر فێری زمانی سەوا و مامەڵە و بازرگانی دەبن. پێی وابوو کە فێری زمان ببن ئیدی لە ئایندەدا بە ئاسانی لە کۆمپانیایەکی ئاڵوویری بازرگانیدا، دادەمەزرێن و بەرە بەرە، هەنگاو بە هەنگاو، پێپلیکەی تەرەقی و پێشڤەچوون دەبڕن و دەگەنە بەرزترین پلە.
مامۆستایەکی قوتابخانە یۆنانیەکەی سەر بە کڵێسا، بە نێوی نیکوس ڤۆتسینا، کە پیاوێکی کەتەی زەلامی، ردێن سووری، تەڕزمانی، گوم ڕەچەڵەك بوو، باوکیانی بۆ ئەم کارە هاندا. کابرایەکی هێندە زمان لووس بوو کە زۆر بە ئاسانی پاول یگوفیچی ڕژد و ڕەزیل و دەست نوقاوی ڕازی کرد کە پێشوەختە بیست و پێنج ڕۆبڵان وەکو پێشەکی خەرج و مەسرەفی ساڵانەی خوێندنی منداڵەکانی بدات. بەمجۆرە ئانتون و نیکولای، ئومێد و ئاواتی ئایندەی بنەماڵەکە، ڕوویان کردە ئەو قوتابخانەیەی کە بە گوتەی ڤۆتسینا، بژاردەی بازرگانانی شار، لە دەرچووانی ئەوێندەر بوون.

ئەوەی ڕاستی بێ، بینای قوتابخانەکە بریتی بوو لە یەك هۆڵی بێ سەروبەری داڕوخاو، هەفتا کوڕیژگەی یۆنانیان تێ پەستاوت بوو کە تەمەنیان لەنێوان شەش ساڵ و بیست ساڵدا بوو. پێنج ڕیزە ڕەحلەیان تیا ڕیز کردبوو، هەر ڕیزەی ژمارەیەکیان لێ دابوو: ١، ٢، ٣،... هتد. هەر ژمارەیەك نیشانەی پۆلێك بوو. قوتابیانی ڕیزی یەکەم لەبەر ئەلف، با، جیم، دال-(١) یان دەخوێند. قوتابیانی ڕیزی پێنجەم گەنجانی بەقوەت بوون، بەدەنیان لە فانیلەی بەدەن چەسپی موقەلەمی شیندا جەڕی بوو، مێژووی یۆنانیان بە منجە منج دەخوێندەوە. ڤۆتسینا تاقە مامۆستای ئەوێندەر بوو. دەرسی هەموو پۆلەکانی بە هەمان تین و تاو دەگوتەوە. پاش ئەوەی کە ئانتون و نیکۆلای، کە یەکەمیان حەوت ساڵان و دووەمیان نۆ ساڵ بوو، لە ڕیزی یەکەمدا دانان، سەرو کتێبی (ئەلفبای نوێ)ی دانێ و پێی گوتن: "سبەینێ یەکی بیست و پێنج کوپیکم هەقی ئەم کتێبانە بۆ بێنن). لە هەوەڵەوە، ئەم دووە، ترسیان لەم دەستە لاوە سەرکێشانە پەیداکرد کە بە زمانێکی جیا لە زمانی وان قسانیان دەکرد، ترسیان لەم مامۆستا ڕدێن سوورە پەیدا کرد کە لەم ڕیزەوە دەچووە سەر ئەو ڕیزە، قوتابیەکانی سەر زەنشت دەکرد، سزای قورسی دەدان: بە ڕاستە دەیکێشا بە دەست و سەریاندا، لە سەر خوێی زبر بە چۆکیا دێنان، یان لە فراڤین بێبەشی دەکردن. ڤۆتسینا هەرکە بینی برایانی چیخوف، وێڕای هەموو هەڕەشە و گوڕەشەیەکی ئەو، نەیانتوانیوە کتێبی ئەلفبا-کەیان ڕەوان بکەن. ئیدی وازی لێهێنان. ئانتون و

نیکولا، کە خرابوونە ڕیزی تەمەڵەکانەوە. لە سەعات نۆی بەیانییەوە تا سێی دوانیوەڕۆ دەست لەسەر سینگ، خاچ ئاسا، دادەنیشتن و گوێیان بۆ ڕێژنە وشەو پەیڤانێك دەگرت، کە هیچی لێ حاڵی نەدەبوون، لەوان وایە گوێزیان بۆ دەژمێرن. بەڵام وێڕای ئەوەش، ئێرەیان لە دووکانەکە یان لە کڵێسا پێ خۆشتربوو. تاقە ترسی ئانتۆن ئەوەبوو کە بابی بە خراپی نمرەکانی بزانێ، بەڵام کاتێ پاول یگورفیچ، دوای دوو سێ هەفتە هەواڵی دەرس و دەوری کوڕەکانی لە ڤۆتسینا پرسی، ڤۆتسینا، بە متمانەوە گوتی کە دەرس گوتنەوەکەی خەریکە دێتە بەر. ئەوسا بۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی دوو ئافەریننامەی دا بە برایانی چیخۆف لە ئافەریننامەکەی نیکۆلادا نووسرابوو "دروستکار" و لەوەی ئانتون نووسرابوو "کۆشا".

لە پشووەکانی جەژنی کریسمسدا پاول یگورفیچ هەندێ لە دۆستە یۆنانییەکانی بۆ ماڵەوە دەعوەت کرد، تا پێشکەوتنی کوڕەکانی لە فێربوونی زمانی هۆمیرۆسدا، بەوان پیشان بدات، لێ مخابن، نە نیکۆلای "دروستکار" و نە ئانتۆنی "کۆشا" کەسیان نەیانتوانی تاقە سێ وشەی یۆنانی بڵێن. پاول یگوروفیچ کە بینی لە بەرچاوی میوانەکانی بوو بە گەپجاڕ، عەینی خواوەندانی ئۆڵەمپ توڕەبوو، غەزەبی لێدەباری. بەڵام چونکە پێشوەختە کرێی خوێندنی ساڵانەی مناڵەکانی دابوو، هەردوو کوڕە تاوانبارەکەی ناردەوە بۆ قوتابخانەکەی ڤۆتسینا تاکو تا کۆتایی ساڵی خوێندن لەوێ دەوام بکەن.

ئەوەبووە لە ١٨٦٨/٨/٢٣دا ئاواتەکەی گوگینا یاکوڤلڤنا هاتە دی و لەو ڕۆژەدا ئانتون بۆ یەکەمجار جلی یەکچەشنی نیلی قۆپچە مەعدەنی لەبەرکرد، تا بچێتە پۆلی بەرایی سەرەتایی لە قەتابخانەی جمنازی ڕووسی لە تاگانرۆگ. ئانتون لەو سەردەمەدا منداڵێکی ڕەنگ زەردی، گۆشتنی، دەموچاو خڕی، قژنی، چاو درشتی قاوەیی ڕەنگی نیمچە خەواڵوو بوو. هەرچەندە شەرمن و دوورەپەرێز و گۆشەگیر بوو، بەڵام کە لە پڕ ڕووی دەکرایەوە ، دەیتوانی بە زەبری توانا و بەهرەی خۆی هەموو هاوڕێکانی وا لێبکات کە هەست بە پووچییەکانی دەوروبەر بکەن و پێی پێبکەنن.

قوتابخانەی جمنازی ڕووسی، لەچاو قوتابخانە تاك ژوورییەکەی ڤۆتسینادا زۆر گەورە دیاربوو. بینایەکی سپیواژ بوو، دیوارەکانی لە پەڵەی وشکەوەبووی تەڕەشوعدا، بەڵەك بووبوون، سەرەکەی شێراونی بوو، بە بۆیاغی سەوز بۆیە کرابوو. بە ڕاڕەوە دووروودرێژ و تۆزاوییەکانیا زیاتر لە ئۆردوگای سوپایی دەچوو. دەرگای هەر ژوورێك کونێکی چکۆڵەی تیابوو، کە چاودێرەکان دەیانتوانی لە دیوی ناوەوە خۆیان لە قوتابیەکان داگرن و چاودێرییان بکەن. بێئەوەی بە خۆیان ببینرێن. بەرنامەی خوێندن، هەشت ساڵی دەخایاند، لەم ماوەیەدا قوتابی زمانای لاتینی و یۆنانی و سلاڤی کڵێسایی و ڕووسی دەخوێند. هەر کەسێك ئەم قۆناغەی بڕیباو دەرچووبا ناوی لە نزمترین پۆلی چواردە پۆلەی (قوتابخانەی پۆلان) قەید دەکرا.ئەم قوتابخانەیە بەر لە سەدەو نیوێك لە لایەن پترۆسی گەورەوە دامەزرابوو، ئیدی ئەوەی قوتابخانەی جمنازی تەواو کردبا، ئەگەر خۆی ویستبای، خۆ بە خۆ لە زانستگە وەردەگیرا.

ئەو مامۆستا و بەڕێوەبەر و چاودێرانەی کە ئەرکی فێرکردن و سەرپەرشتی و پێگەیاندنی ئەم گەنجە شارۆچکە نشینانەیان دەکێشا، لە ئاستێکی مامناوەندیدا بوون. (دیاکونوف)ی مامۆستای چاودێری گشتی، قوتابیەکان ناویان نابوو (هەزار پێ) چونکە بە دزییەوە بێ خشپە دەکەوتە دوویان و گزوگومەت لە ناویانا پەیدا دەبوو و بە ئامۆژگارییە ئەخلاقییەکانی دەی چەوساندنەوە. کرامساکوف کە دەرسی جوگرافیا و مێژووی دەگووتەوە، بە زمانێکی زبر و پیس قوتابیەکانی دەشکاندەوە، بەڵام مامۆستا ئیرپان کە زمانی لاتینی دەگوتەوە و کابرایەکی چیکی بوو، سیخوڕی بەسەر قوتابییەکانەوە دەکرد و لە دوورەوە بۆنی هەر دەسیسە و پیلانێکی سیاسی دەکرد و ڕاپۆرتی بۆ پۆلیس دەنارد. ڕاپۆرتی لە مامۆستاکانیش دەنووسی. لە ڕاپۆرتێکیا نووسیبووی: "هاوکارەکانم لە کاتی کۆبوونەوەی پەروەردەییدا سیغار دەکێشن و گوێیان لەوە نییە، کە ئەو ژوورەی کۆبوونەوەی تیا دەکەن ئیکۆنەی تیایە، وێنەی خاوەن شکۆ تزاری تیا هەڵواسراوە". بێگومان ئەوەی چیخۆف دواتر لە چیرۆکی "پیاوێکی هەگبەدار" نووسیوویەتی دەقاودەق دەربارەی ئەو مامۆستا بیر وشك و داماوانەیە کە دەڵێت: "ئاخر ئێوە مامۆستان؟ ئامۆژگار و پەروەردەکارن؟ نەخێر ئێوە کۆمەڵێك کارمەندی گوناحن ،جێگەی بەزەیین. زانیاری ئێوە، پۆلیسیانەیە؟ ئەگەر وانییە بۆچی بۆنی پۆلیسخانەی لێدێت".

تەنیا پاپا پوکروفسکی، مامۆستای مێژووی ئایینی، لە نێو هەموو مامۆستاکاندا سام و ڕێزێکی لای هەبوو. ئەم پیاوە کەسێکی خوێنەوار و ڕۆشنبیربوو، حەزی لە ئەدەبیات دەکرد، بێ هیچ دوودڵییەك لە پۆلدا، باسی شەکسپیر و گۆتە و پوشکینی دەکرد...

هەر زوو پەی بە بەهرەی تەنزئامێزی ئانتۆن برد و بەڕێزەوە نازنازی (چیخۆنتی) لێنا و ئامۆژگاری دەکرد کە بەرهەمەکانی مولییر و سویفت و سالتیکوف-شچدرین بخوێنێتەوە. هاوڕێکانی ئانتۆن- هەموو دڵبەندی توانا و بەهرەی لەبن نەهاتووی گێڕانەوەی چیرۆکێن تەنزئامێز و کۆمیدیانەی ئەوبوون. بەڵام کەسێکی گۆشەگیربوو. تەنانەت لە گێڕانەوەی نوکتەی کۆمیدیشدا هەر شەرمن و گۆشەگیر بوو. ئەگەر شۆخیەکی خۆشیشی بە خەیاڵدا هاتبا بە خەڵکانی تری دەگێڕایەوە.

سوعبەت و حەنەك و تەنزەکانی سووك و پاك و دوور لە هەر غەرەز و بەدخواییەك بوون. چونکە جاری وا هەبوو گاڵتەی بە خۆیشی دەکرد. بە خۆیشی پێدەکەنی. هەرچەندە پوکروفسکی زۆری هاندەدا کەچی نمرەکانی هەمیشە نزیکی سفر بوون. هەمیشە ئەم بیانوو و پاساوەی بە دەستەوەبوو کە لەبەر کاری دوکانەکە و سروود خوانی لەگەڵ تیپی کڵێسادا، دەرفەتێکی زۆر کەمی بۆ سەعی کردن و دەرس و دەور بۆ دەمێنێتەوە.

جا پاول یگوروفیچ، ئەنجام بە مەبەستی پەروەردە و فێربوونی زیاتری منداڵەکەی، ناردیە لای خانم شوپیە کە زمانی فەڕەنسی فێر ببێت و ناردیە لای فەرمانبەرێکی بانك، کە شارەزای بواری سۆڵفێج بوو،تا مۆسیقا فێر بێت. بەڵام کە هەستی کرد ئەم زانیارییانە هیچ بایەخێکی پراکتیکیان نییە، هەستا ناوی کوڕەکەی کە تەمەنی سیانزە ساڵان بوو، لە فێرگەیەکی فێربوونی خەیاتیدا، قەید کرد. نیکولا و ئیڤانی براشی لەو کارگە و وەرشەیەدا بوون. بەڵام زۆری پێنەچوو

کـە هـەردووکیان لەسـەر سەرکێشـی و تەمـەڵی دەرکـران. ئـانتۆن بـە تـەنیا بـە دیـار دەرزی و دروومانـەوە مایـەوە. کـاتێ هەسـتی کـرد مـەهارەتی تـەواوی پەیـداکردووە، هەسـتا پـانتۆڵێکی تایبـەتی بـۆ نیکـۆلای بـرای دروو. ئـەم پانتۆڵـە هێنـدە باریـك و تـەنگ بـوو، کـە خانەوادەکـە بـۆ سەعبەت و شۆخیان ناویان نا (پانتۆڵی ماکەرۆنی).

ئانتوان وێڕای هەموو پابەندییەکی بەکارێن دوکانداری، کلێسا، قوتابخانـە و فێرگـەی بـڕین و خەیاتییـەوە ناوبـە نـاو دەرفـەتی دێنـا، خـۆی دەدزییـەوە و پیاسـەیەکی نـاو شـاری دەکـرد. هەرچییەکی دەبینی پێکەنینی پێدەهات، پێکەنینی بە هـەموو شتێك دەهات: سەگێ کە کلکی وەکو شـەیپور بـەرز کردووەتـەوە، ڕێـوڕەسمی بـەڕێکردنی جەنازەیـەك کـە کەسوکارەکەی بـە دەم گریانـەوە دوای دەکـەون، قەرقەشـەی نێـوان دوو حـەماڵ. هـەر هـەموو ئـەم ڕووداوانـە لـە یادگـەیدا نەخش دەبوون. زۆرجار سـەری گۆڕستانەکانی دەدا، هـەوڵی دەدا نووسـینی سـەرکێلی گۆڕەکـان بخوێنێتەوە، لە خەیاڵی خۆیدا بیری لە چارەنووسی ئەو سەدان خەڵکە نادیارەی ژێر ئـەو بـەرد و گڵە دەکردەوە. ئەوەی ڕاستی بێ لە سەرانسەری ژیانیـا ڕمـوودەی گۆڕسـتانان بـوو، هەڵبەتـە لـەو زەمان و ڕۆژگارەدا زیاتر حەزی لە گۆڕستانی دێهاتـەکانی دەوروبـەری تاگـانرۆگ دەکـرد، چونکە لـەوێ لـەجیاتی دارودرەخـتی سـەروو، داری گـێلاس و ئاڵوباڵویـان لەسـەر قـەبران دەڕوانـد. کـە دەنکە گێلاس و ئاڵوباڵوەکان دەکەوتنە سەر تاتە بەردی تەنیشت گۆڕەکـان، پەڵەیـەکی سـووریان بەجێدەهێشـت ڕێـك "وەکـو پەڵــەی خــوێن". ئــانتۆن، هەنـدێجار دەگــەڵ براکانیــا دەچــوونە دەرودەشت و لەنێو پنجە دڕك و داڵدا خۆیان لە بۆسە دەنا و کلاوکوڕەیان دەگرت و لەبن بنجك و دەوەناندا دەیان شاردنەوە و دوایی دەیانفرۆشتن، دانەی بە یەك کۆپیك.یان لە پارکی ئیلیزابێتدا لـە دەوری یەکـدی خـڕ دەبوونـەوە گەمـەی کـاوبۆی و سورپێسـتانیان*"٢" دەکـرد، یـان وەکـو جیمزفنیمور کوپر ومین رید پێستی سەری یـەکتریان دەکەنـد. یـان بـە شـەقامی پولتزیسـکایادا بەرەو بەندەر دادەگەڕان و بە سەعاتان بە قولاپ ڕاوەماسیان دەکرد و مەلـەیان دەکـرد. بەیانییـەك ئانتون بە دەم مەلەوە لە ژێر ئاوەکـەوە، دەرکـەوت، زامێکـی قـووڵی کـەوتبووە سـەر ، شـوێنەواری ئەم زامە تا کۆتایی تەمەنی هەر نەسڕدرایەوە.

زەبر و زەنگ و زاکونی بابیـان کردبوویە کارێك کە زوریەتەکەی چیخۆف، کـە خێڵـی چیخـۆف یـەکبخات، سـرووتی تایبـەتی و ڕاز و نهـێنی و زمـانی تایبـەتی خۆیـان هـەبێت. هـەر هـەموو ئەندامانی ئەم خێزانە خەڵکانێکی تەبیعەت خۆش و سوعبەتچی بوون. بەڵام ئانتۆن لە هەموویان پتر ریتمی ئەم گیانی سوعبەتچیاتیەی ڕادەگرت. ئەم منداڵانـە، ئـەم چیخۆفزادانە، هەرچـەندە لـە بنەماڵەیەکی دەستکورت و هەژاربوون. هەمیشە ڕووبە ڕووی ڕەفتـاری زبـر دەبوونـەوە، هەسـتیان دەکـرد پێویسـتیان بـە سـوعبەت و پێکەنینـە و ئـەم شـۆخی و پێکەنینـە خـەم و نائومێـدی لێدەڕواندنەوە.

تاگـانرۆگ، لـە پشـووی دوورودرێـژی هاوینانـدا، لـە تـەپوتۆزدا غـەرق دەبـوو. منداڵـەکان بـەپێی خـاوس، بـە تـۆی کراسـێك لـە مـاڵ وەدەردەکـەوتن، شـەوان، لـە ناوەنـدی باخەکـەدا، لـە نێـو ئـەو کوختانـەدا دەنووستن کە بـە خۆیـان دروسـتیان دەکـرد. ئانتۆن، کوختەکـەی لـە ژێـر درەختێکـی

گەورەدابوو، کە مێوی کێوی هەمووی داپۆشی بوو و، وەکو کەپری لێهاتبوو. لە وێدا شیعرۆکانی بە کێش و سەروای دەنووسین وای تەسەور دەکرد " ئەیوبە لە ژێر دار هەنجیرەکەیدا". کچۆڵەیەکی دراوسێی دیوار بە دیوار، بە جۆرێ شەیدای بوو کە بە دەباشیر چوارینەیەکی ئەڤینداری لەسەر دەرگای باخەکە بۆ نووسی. ئانتۆنیش، بە چوارینەیەکی تەنزئامێز بەرسڤی دایەوە و ئامۆژگاری شاعیرۆکە چکۆڵەکەی کرد، کە لە بری ئەوەی دەر و دیوارەکان بەو شەڕە پشیلانە پیس بکات. بچێ خەریکی بووکەڵەبازی خۆی بێت باشترە.

ئیدی کیژێ گاڵتەی پێکردو و بە دێهاتی و موژیکی* (٣) ناو برد. ئانتۆن توڕە بوو یەك کیسەی تۆزاوی زوخاڵی بە سەریا کێشا. بەو جۆرە یەکەمین شیعری دڵداری ئانتۆن کۆتایی هاتبوو.لە نامەیەکی بەرواری ١٨٩٢/٢/٢٢دا کە بۆ تیخۆنۆفی ناردبوو، بە تەنزەوە نووسی بووی: "من لە سیازدەساڵیدا بە نهێنییەکانی ئەشقم زانیوە".

یوگنیا یاکوڤلڤنا، ئانتۆنی ڕادەسپارد کە بەیانیانی زوو بازاڕی بۆ بکات. کوڕێکی جدی بوو، هەستی بە مەسئولیەت دەکرد، کە دەچوو بۆ بازاڕ، ئەوپەڕی هەوڵی دەدا کە جدی بنوێنێ. هەمیشە دەستی بە پارەکەوە لە گیرفانی دەنا. میخائیلی برایشی بە هەڵتەك هەڵتەك دووی دەکەوت. ڕۆژێ بە ڕێکەوت لە بازاڕ مراویەك دەکڕێت، لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵ، بە درێژایی ڕێگا، ئەو باڵندە بەستەزمانە هەڵدەگلۆڤێ و نوقورچی لێدەگرێت، تا بقیڕێنێ و خۆی گوتەنی "هەموو خەڵکی بزانن، کە بۆ شێو مراوی دەخۆین."

خانەوادەی چیخۆف، یەك شەمموان، ناوبە ناو، بۆ فراڤین دەچوونە ماڵی هاپۆ میترۆفان، کە ئەویش لە تاگانرۆگدا دوکانی عەتاری هەبوو، دوکانەکەی ئەو، چ وەکو شوێن، چ وەکو کاڵا، چ وەکو بەڕێوەبردن لە دوکانەکەی پاول یگوروفیچی برای باشتربوو. ئیدی کار و کاسبیەکەی ڕەونەق و ڕەواجێکی هەبوو، پیاوێکی زۆر دیندار بوو، زۆرجار ئایەت و گوتاری تەوراتی بە گەڵ قسە و گەنگەشەکانی خۆی دەخست. بە هەرحاڵ ڕێك بە پێچەوانەی پاول یگوروفیچەوە، هەم بە قسە و هەم بە کردەوە مەسیحییەکی باش و دروستکار بوو، دژی هەر جۆرە سزایەکی بەدەنی بوو، ڕێزی ژنەکەی دەگرت، دەگەڵ منداڵەکانیا نەرم و نیان بوو، زۆر دەگەڵ برازاکانیا، بە کوڕ و کچەوە، میهرەبان و دلۆڤان بوو، سەردانی ماڵی هاپۆ میترۆڤان بۆ ئانتۆن جەژن بوو. ئەم پیاوەی خۆش دەویست و سوعبەت و شۆخی دەگەڵ دەکرد. ڕۆژێك هات بەسەریا کە بە سەروسیمای گەداوە بچێ بۆ ماڵی مامی، میترۆفان نەیناسی بووەوە، کە چاوی بە سەروسیمای مەلوول و داماوی کەوتبوو، بەزەیی پێیدا هاتبووە و سێ کوپیکی خستبووە دەستییەوە، ئیدی هەموو خێزانەکە تا ماوەیەکی زۆر لە بەینی خۆیاندا بەم شۆخیە فریوئامێز و بێگەردە، پێکەنی بوون.

بەڵام ئەم سووکە شۆخیانە، هیچ نەبوو لەچاو ئەوانەدا کە لە پشووی درێژی هاویناندا، کاتێ کە دەچوون بۆ ماڵی باوە گەورەیان، بابی بابیان، پێشکارەکەی دۆتمیرپلاتۆف، لە گوندی کنیاژایا، دەیانکرد. ئەم گوندە لە دەشتی دونتزی هەفتا کیلۆمیتری تاگانرۆگ بوو. جا بۆ ئەم سەفەرە گالیسکەیەکی گەورەی فەلاحییان بەکرێ دەگرت. ئەم گالیسکەیە سپرینگی نەبوو.یەکسەر ناوە تەختەکەی دەنیشتە سەر ئەکسلەکانی، دوای ئەوەی پاول یگوروفیچ (کە

خۆشـبەختانە لـە تاگـانرۆگ بـە دیـار دوکانەکەیـەوە دەمایـەوە و لەگـەڵیان نەدەچـوو) بـەدەم ئامۆژگاری و دوعـای خێرەوە بە ڕێی دەکردن، ئیدی یوگنیا یاکوڤلڤنا دەگەڵ کیژەکەی و هەر پێنج کوڕەکەیدا، خۆیـان بـە گالیسـکەکەدا دەکـرد و بـە سـەریەکا کەڵەکـە دەبـوون. هەرکـە جێـی خۆیـان خـۆش دەکـرد و ،گالیسـکەکە وەرێدەکـەوت، ئیـدی خۆشـی و پێکـەنین دەسـتی پێـدەکرد. گالیسەکەکە بە خاوی و بە لەقە لەق و تەقە تەق، بە نێو گەردەلووی تەپوتۆزا دەڕۆیـی و دەچووە پێشیێ.دەشـتی پـان و بـەرین، تـا چـاو برکـات لـە ژێـر هـەتاوی گـەرم و پرشـنگدارا ڕاکشـابوو، یەکپارچە پووش بوو، دەگەڵ سووکترین شنەبادا، دەکەوتە شەپۆلدان و لە دوورەوە دەبریقایەوە. هەزاران پێشکەی ورد لەو گڕەی گەرمایەدا بە گیزە گیز کەپرۆکەیان دەبەست. ئانتون بە دەست خـۆی نـەبوو، هـەرگیز نەیـدەتوانی بیر لـەو سـەفەرە نەکاتـەوە کـە دایکـی بـۆی گێـڕا بـووەوە. ئـەو سەفەرەی بە پـانی و درێـژی ڕووسـیای بـەربڵاودا، بە دوای گۆڕێگا گرتبوویـە بـەر. یادگـاری ئـەم حیکایەتە دەگەڵ هەستە شەخسییەکانیدا تێکەڵ دەبوو.بێئەوەی بە خۆی بزانێ، وێنە و دیمەن و بۆن و دەنگەکان لە هزر و خەیاڵیا کەڵەکە دەبوون، تا پاشـان بڕژێنـە نـاو شـاکارەکەی ئایندەیـەوە (ستێپ =دەشت): "وڵاتێکی سەیر نائاسایی. کە کـاتی خـۆی لـە کۆنـا، دەچـوومە ئـەوێ، هەسـتم دەکرد لە ماڵی خۆمدام، چونکە شارەزای بست بە بستی بووم". ( لە نامەیـەکی سـاڵی ١٨٨٨ وە کـە بـۆ پلشچییف نێردراوە، وەرگیراوە). زۆرجـار بـە خێزانـی لـە ڕێگـا لایانـدەدا، ماوەیـەکی زۆر دەمانەوە، لە قەراخ ڕێگادا نانیان دەخوارد، لە گولاوێکدا مەلـەیان دەکـرد، لەسـەر کۆمەڵـە پـووش پاڵدەکەوتن، شەویان لە خانێکدا ڕۆژ دەکردەوە یان هەر ئاگرێکیان دەکردەوە و هەر لەو دەشتەدا دەمانـەوە. ئـانتون کـە دەیڕوانیـە بڵێسـەی ئاگرەکـە، هەسـتی دەکـرد دڵـی سـەر ڕێـژ دەبێـت لـە خۆشەویستی و ستایشی ئەم ئاسمانە زۆر بەرز، زۆر ساف و بێگەردە، لـە بـۆنی گیـا و پـووش و دووکەڵ، لەم بێدەنگییە قووڵە، لـە خۆشەویسـتی ئـەم کەسـوکارە ئازیزانـەی دەوری کـە لـە سـەرما خۆیان لە چاکەت و پاڵتۆکانیانەوە پێچابوو.

باپیرە یگور میخائیلوفیچ لە کنیاژایادا، زۆر بـە گـەرمی و دڵـاوایی پێشـوازی نـەوەکانی دەکـرد. خانوویـــەکی گـــەورەی دەبەرســـت، دەخســـتە خزمەتیانـــەوە، ئیـــدی خۆیـــان لـــە حەوشـــە و سەیرانگەیەکی گەورەدا دەبینییەوە، دەیـانتوانی بـە ئـارەزووی خۆیـان ڕاکـە ڕاک بکـەن، یـەکتر ڕاو بنـەن، بـە دار و درەختانـدا هـەڵزنن، بـە کـامی دڵ مەلـە بکـەن. نیکـولای لـە کـاتی ئـەم یاریانـەدا، کڵاوێکی شـاخداری لـە سـەر دەکـرد، مەگـەر هـەر خـۆی بزانـێ لـە کـوێی پەیـدا کردبـوو. ئـەوەبوو ڕۆژێك ئانتون تـوانی بـە زەربەیـەك لـە سـەری بیپـەڕێنێ و بکەوێتـە دەریاچـەیەکی دەسـتکردەوە و بەرە بەرە نقوم ببێت. لە بەهەشتەکەی کنیاژایـادا تەنانـەت کـارکردنیش مایـەی خۆشـی و شـادی بوو، بە ئەمری باپیرە یگوروفیچ زۆرجار منداڵانی چیخۆف، لە وەرزی درەو وخەلە و خەرماندا بۆ کێڵگـەکان دەنێـردران و کاریـان پێـدەکرا. ئـانتون ئێسـتاش بـیری مـاوە کـە چـۆن ناچـار بـوو دەسـتبەرداری هەڵبـەز و دابـەز بێـت و بـە درێـژایی ئـەو ڕۆژە چـاودێریی کۆمپاینەکـە بکـات و دانەوێڵـە دووراوەکـان لـە دەفتـەرێکا تۆمـار بکـات. لـە نامەیـەکی بـەرواری ١٨٨٠/٨/٨دا بـۆ سوڤورینی سەرنووسەری ڕۆژنامەی ڕۆژگاری نوێ. لەو بارەیەوە دەڵێت: "هاڕە هاڕەی مەکینەکە

و خشەخش و دەنگی یەکنەواو فڕەفڕی بڕندەی لە گەرمەی کارکردنا، زیکە زیکی پێچەکەکانی، هەنگاونانی سست و خاوی گاجووتان، تەپوتۆز و دووکەڵی هەور ئاسا، دەموچاوی ئارەقاوی ڕەش هەڵگەڕاوی نزیکەی پەنجا زەلام، هەر هەموو ئەمانە لە مێشکمدا وەکو "دوعای ڕەبانی" نەخش بووبوون.

لە پاییزی ساڵی ١٨٧٣دا، ئانتون، بە ماوەیەکی کەم پاش گەڕانەوەی لە کنیاژایا، خولیایەکی کوتوپڕی کەوتە سەر کە بە درێژایی تەمەنی لێی نەبووەوە: ئەویش خولیای شانۆ و دنیای شانۆ بوو. ڕەنگە پێشتر پتر لە سەد کەڕەت بە بەر شانۆ چکۆڵەکەی شارەوانی سەرجادەی بتروفسیکایادا ڕەت بوو بێ و هەر بە خەیاڵیشیدا نە هاتبێ بچێتە ژوورەوە. تا لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا بردیان بۆ دیتنی ئۆپرای "هیلینی جوان"ی ئوفینباک(٤). ئەم ئۆپرایە سەرانسەری ژیانی هەڵگێڕایەوە. ئەو پارچە شینەی کە وەکو ڕەمزی ئاسمان دانرابوو، پڕ بوو لە چرچ و لۆچی ترسناک، لە تۆ وایە دانت لێ جیڕ دەکاتەوە، ئەستوون و پایە مەڕمەڕەکان، هێندە سست بوون لە تۆ وایە مقەوان، ئەکتەر و گۆرانی بێژەکان، بە جلوبەرگی بێ سەروبەر و نەگونجاوی بریق و باقەوە هەر بە دەوری خۆیانا دەسوڕانەوە. کەچی ویڕای هەموو ئەمەش ئەم ئۆپرایە بە شێوەیەکی گشتی کارێکی ئەفسوناوی لە کوڕیژگەکە کرد. ئەمە دەرگای دنیای خەون و خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگی لێکردەوە و بە تەواوەتی شەیدای ئەم خولیا تازەیە بوو، هەموو خولیاکانی دیکەی وەکو گەمەی شەڕی کاوبۆیان و سووڕپێستان و ڕاوە کلاوکوڕەو سەردانی گۆڕستانی لە بیر بردەوە، دەستبەرداری هەموو ئەو کەڵکەڵە و خولیایانە بوو و خۆی بۆ خولیا و حەزە تازەکەی تەرخان کرد. بە هەمان جۆش و خرۆشەوە دەگەڵ شانۆنامەی هاملێتی شەکسپیر، جەنابی موفەتیشی گۆگۆڵ، بەڵای زیرەکی گریبویدوڤ، کوختەکەی هاپۆ تۆم کە بۆ شانۆ ئامادە کرابوو، و نمایشی ئەو میلودراما و کۆمیدیانەی کە لە نموونە فەڕنسییەکانەوە ئامادە کرابوون، دەژیا.

ئانتون، بە جۆرێ حەزی چوو بووە سەر شانۆ، ناچار پەنای دەبردە بەر فەند و فێڵان بۆ ئەوەی دەرفەتی دیتنی شانۆیان بە دەست بێنێ و کامی دڵی خۆی دابمرکێنێتەوە. چونکە قوتابیانی قوتابخانەی ناوەندی جمناز، بۆیان نەبوو بەبێ ئیزنی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بۆ سەیری شانۆ بڕۆن . بەڵام ئانتون و هەندێ لە هاوڕێکانی، لەوانە ڤشنڤسکی کە پاشان بوو بە ئەکتەر، و ئاندرێ درۆسی کە لە بنەماڵەیەکی خانەدان و دەوڵەمەند بوو، توانیان بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ بن، پاڵتۆو جلکی بابیان لەبەر بکەن و عەینەکی شین لە چاو بکەن تا نە ناسرێنەوە. بەمجۆرە و بەو جلکانەوە گەورەتر لە تەمەنی خۆیان بەدیار دەکەوتن، و بەردەوام بە ترس و لەرزەوە، بە دزییەوە بە بەردەم چاوێریی جمنازەکەوە کە لەسەری بوو نەیەڵێت هیچ قوتابییەك بچێتە ئەم بنکەی گومڕاییە، تێدەپەڕین.

ئانتون، بۆ ئەوەی باشترین شوێنی لە سەرەوە، لە داڵانەکەی سەرەوە، دەست بکەوێ، بە دوو سەعات بەر لە دەستپێکردنی نمایشەکە خۆی دەگەیاندە بەردەم باجەی بلیت فرۆشییەکە، زۆرجار نەیدەزانی چ شتێك نمایش دەکرێت، درام، کۆمیدیا، تراجیدیا، یان ئۆپرا یان ئۆپەرێت، هەموو ئەمانەی پێ باش بوو، بۆ ئەو فەرقی نەدەکرد. لە کاتێکدا کە لە ڕیزی پێشەوە و لە

نزیکی شانۆکە دادەنیشت، بە دەم بۆنکردنی بۆنی غوبار و تۆز و کرێمی دەموچاو و سەمغەوە، بە تاسە و پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ساتە ئەفسوناوییەی دەکرد کە پەردەکە دەکرایەوە.

دالان و هۆڵەکە بەرە بەرە پڕدەبوو لە جەماوەرێکی پڕ هەرا و هەنگامە، شڕوشەپڕێو، جەماوەرێك کە بە دەنگی بەرز قسانیان دەکرد، قاقا پێدەکەنین، گوڵە بەرۆژەیان دەقرتاند.

ئەوسا لۆژە گرانبەهاکان و کورسییەکانی باڵکۆنەکە پڕ دەبوون لە پیاو ماقوڵان و دەوڵەمەندان: لە یۆنانیانی دەوڵەمەندی کەشتیدار و بازرگانانی خۆماڵی خواپێداو دەگەڵ ژنە شیك و خۆش مکیاجەکانیان، ژاوە ژاوێمی خۆش و پڕ هەڵچوونی چاوەڕوانی لە سەرانسەری هۆڵەکەوە بەرز دەبووەوە. بیرو تەسەوری ئەوەی کە ئەم هەموو خەڵکە مجێزجیاوازە، بۆ دیتن و ستایشی هەمان شانۆنامە هاتوون، وای لە ئانتۆن دەکرد، هەست بەو دەسەڵاتە نائاساییە بکات کە ئەکتەر بەسەر زۆربەی بەشەرەوە هەیەتی. ئانتۆن ژیانی ئەکتەرانی بە هەموو ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراوەوە، بە هەموو موبالەغەکارییەکەوە، بە هەموو درۆیەکییەوە، بە هەموو خەیاڵپەروەرییەکیەوە، بە بەراوورد دەگەڵ ژیانی وشك و برینگ و نەگۆڕی خانەوادەیی خۆیاندا زۆر لەلا خۆش بوو. چەند حەزی دەکرد ئەویش یەکێك بێ وەکو ئەو ئەکتەرانەی کە ژێرا و ژێر تەماشای دەکردن. مکیاج بکات. خۆی لە خەڵکی بگۆڕێت. لاسایی شێوەی ڕەفتار و گوتار و سەروسیمای ئەم ئەکتەر یان ئەو ئەکتەرە بکاتەوە کە ژێراو ژێر تەماشای دەکردن.

ئەوەبوو تیپێکی شانۆیی تایبەتی بۆ خۆی دروستکرد، بەرنامەی پێشکەش بە جەماوەرێکی خۆیی دڵپاك لە کەسوکار و دۆست و برادەر و دەرودراوسێ دەکرد. ئەم تیپەی دەگەڵ خوشکەکەی و براکانیدا دامەزراند کە هەموویان بەهرەی خۆڕسکی ئەکتەرییان تیابوو. شەوێك دەوری دکتۆری ددانی دەبینی کە بە خۆو مقاشێکی زوخاڵگیرەوە، بە کەش و فشێکی تایبەتییەوە، هەوڵی دەدا ددانی نەخۆشێکی سەرسەخت بکێشێت. شەوێکی دی خۆی دەکرد بە کەشیشێکی کەودەنی زۆر پیر، کە لە بەردەم قەشە باشیدا (ئوسقوف) ئیمتیحانی دەدا، بەڵام ئەم دیمەنانە، تەنیا ئەو کاتانە نمایش دەکران کە بابی لە وێ نەبایە، چونکە ئەوەی پێ قەبوول نەدەکرا کە بە بەرچاوی ئەوەوە گاڵتە بە خەڵکانی ڕۆحانی بکرێت. هەر هیچ بابەتێکی دەست نەکەوتبا دەچووە کڵێشەی کوێخا و شارداری تاگانروگەوە و لاسایی دەکردەوە کە چۆن سەرپەرشتی ئاهەنگ و بۆنەیەکی لە کڵێسادا دەکرد و دوای ئەوە بە سەروسیمایەکی سوپاییانەوە دەچووە تەمەشای نمایشی سوپایی، تیپێکی قۆزاقان.

ئانتۆن، پاشان کە زیاتر تەماح گرتی، کەوتە خولیای ئەوەی کە خۆی لە شانۆنامانی ڕاستەقینە بدات و دەوری گەورە بدینێ. ئەوەبوو لە شانۆنامەی جەنابی موفەتیشدا، دەوری موفەتیشی بینی، ملی قوت، ورگی کە بە سەرین دەرپەڕاندبوو، زل، سینگ و بەرۆکی پڕ لە میداڵ و نیشانانی کارتۆنی، جەنابی موفەتیشی کرد بوو بە مەسخەرەیەکی ئەوتۆ کە تەماشاڤانان لەبەر پێکەنین خۆیان بۆ نەدەگیرا. پاشان، دوای ماوەیەکی کەم، بە شێوەیەکی سەرکەوتووتر، دەوری پیرەژنی چەنەبازی لە شانۆنامەی (عەرەبانچی یان زیرەکی ئەفسەرێکی سوارە) نووسینی گریگوریفدا بینی. کە ئەندرێ دوسیی هاوڕێی منداڵییەتی دەڵێت: "هەر جارێ کە ئانتۆن

پاڤلوڤیچ دەچووە سەر شانۆ، قاقای پێکەنینی ئامادەبووان بە جۆرێ بەرز دەبووەوە کە تەسەور ناکرێت. هەڵبەتە هەقی خۆیەتی ئەم گەواهییەی ڕەوایەی بۆ بدەین کە ئەلهەقی زۆر بە باشی دەوری خۆی دەبینی".

تیپەکەی چیخۆف، لە ماڵی دایك و بابی ئاندرێ دروسی دا، دەبینی، کە ماڵێکی بورژوازی دەوڵەمەندی کراوە بوون و ئەو شتانەیان زۆر بە لاوە خۆش و ئاسایی بوو. هۆڵی دانیشتنەکەیان بە پەردەیەکی نەخشێنراو بە چۆلەکەیەکی هەنجیرخۆری، ڕەنگاوڕەنگ کرابوو بە دووبەشەوە. لایەکی هۆلەکە شانۆکەبوو، لایەکی تری کە چەند ڕیزە کورسییەکیان تیا دانابوو، کرابوو بە شوێنی دانیشتنی تەماشاڤانان. ئەکتەرەکان شوێنێکی تایبەتییان هەبوو بۆ جلوبەرگ ئەوێندەریان پڕدەکرد لە کەلوپەلی پێویست وکەرەستەی مکیاج و کڵاوقژ و ئەو شتانە. زۆری پێنەچوو کە ئانتۆن تەماحی سەرکەوتن گرتی، کەوتە نواندن و پێشەکەش کردنی هەندێ لەو کۆمیدیانەی کە بە خۆی نووسی بوونی، ئەم کومیدیانە ڕەخنە و ئیراد بوون لە هاوشاریانی خۆی. ئەم دەقانە لە دەفتەری مەشقی مەکتەبدا دەنووسرانەوە. ئیدی دوای پێشەکەش کردن و نمایش، نووسەر بە خۆی دەیفەوتاندن، هیچ یەکێك لەو دەقانە نەماون و نەگەییوونەتە ئێمە.

لەو سەروبەندەدا، ماڵباتی چیخۆف باریان کرد بۆ خانوویەکی تازە کە پاول یگورفیچ لە شەقامی کونتورسکایا (پاشان کرا بە شەقامی ئیلیزاڤێتینسکایا) لەسەر پارچە زەویەك دروستی کردبوو کە باوکی پێی بەخشیبوو. وێڕای حیساب و کیتابی ورد و دەستگردتنەوەی زور، ئەم خانووە پارەیەکی زۆری تێچوو، هەرچییەکیان پاشەکەوت کردبوو، هەر هەمووی قووت دا.پاول یگورفیچ ناچار لە ساڵی ١٨٧٤دا بۆ تەواوکردنی ئم خانووە، سلفەیەکی پێنج سەد ڕۆبڵی لە کۆمپانیای بیمەی هاوبەشی شار وەرگرت. چونکە دەستیان کورت بوو وکەوتبوونە سەر ساجی عەلی، بەشێك لەم خانووەی بەکرێ دا بە کارمەندێکی چکۆڵەی دادگای بازرگانی کە ناوی گابریل پارفنتیوڤیچ سیلیڤانوڤ بوو. لە ساڵی ١٨٧٥دا، ئانتون لەلایەن برایەکی سیلیڤانوڤەوە، کە لە ڕێگەی ژنخوازییەوە پایەیەکی باشی بەدەستهێنابوو و بوو بوو بە خاوەنی موڵکێك لە گوندیدا، دەعوەتکرا کە پشووی هاوین لەلای ئەوان بەسەر بەرێت.ئانتۆن لە ڕێگادا وەستا تا لە ڕووبارێکی نیمچە بەستەڵەکی ژێر هەتاوێکی گەرمی گەرمدا مەلە بکات و خۆی فێنك بکاتەوە.دوای ئەوەی شەوێکی بە دەم ئازارەوە لە وێستگەیکی پشووی پۆستەدا بەسەربرد، تووشی باپەڕو برك بوو و بۆ تاگانروکیان بردەوە. ئیدی لەم نەخۆشییەوە تووشی مایەسیری بوو کە هەرگیز لێی نەبووەوە. دکتۆرێکی جمنازەکەی خۆیان بە نێوی سترامپف، بەو پەڕی دڵسۆزیی کەوتە چارەسەکردنی. هێندە دڵسۆزانە دەرمانی دەکرد کە ئانتۆن بڕیاری دا ئەویش ببێت بە دکتۆر. دڵسۆزی و گەورەیی و پیاوەتی ئەم دکتۆرە، ئەم بیرەی لای نەخۆشەکەی چێکرد کە ئەویش ڕۆژێ لە ڕۆژان هەمان دڵسۆزی بنوێنێ و دەستی یارمەتی بۆ نەخۆشانی وەکو خۆی درێژ بکات. بەڵام پیشەی دکتۆری کۆشش و سەعییەکی زۆری دەویست، نمرەکانی لە پۆلی پێنجەمدا هێندە نزم و خراپ بوون، ناچاربوو ساڵی دووەمیش هەر هەمان پۆل بخوێنێ. ئەمە جگە لەوەی ژینگە و کەش و هەوای ماڵەوەیان ئەوە نەبوو کە بۆ کاری فیکری و کۆشش و سەعی جدی لە بار بێ.

برا گەورەکانی ئانتون، ئەلکساندەر و نیکولای، هێندە لە زەبر و زەنگ و زاکونی بابیان بێزابوون، تەنیا بیریان لەوە دەکردەوە کە لە ڕێگای دەریاوە سەفەر بکەن و خۆیان ڕزگار بکەن. ئالکساندر، کە کوڕێکی ڕاڕاو توندە مجێز بوو، لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا، کەسوکاری بەجێهێشت، چووە ماڵی بەڕێوەبەری جمنازەکە تا سەرپەرشتی منداڵەکانی بکات و دەرسی تایبەتییان پێ بڵێتەوە. پاول یگوروفیچ ئەمەی بە جۆرە یاخبوونێك و بە سووکایەتی بۆ خۆی زانی، بۆیە نامەیەکی پڕ سەرزەنشتی بۆ کوڕەکەی نارد: "بە داخەوەم کە وا زوو داك و بابی خۆت لە بیر کرد، ئەو داك و بابەی لە کانگای دڵەوە خۆشیان ویستوویت و خۆشیان دەوێی و لە پێناوی تۆ و پەروەردەکردنی تۆدا، ماڵ و گیانیان لە بەرچاو نەبووە، لە ئێستا بە دواوە تەنیا یەك شتم لە تۆ دەوێ: سروشتی خۆت بگۆڕە، دەگەڵ خۆت و ئێمەدا باش و خۆشڕەفتار بە". بەڵام ئەلکساندەر گوێی بەو گازاندەیەی بابی نەدا، دوای ئەوەی زۆر بە سەرکەوتووی دوا ساڵی خوێندنی بڕی، لێبڕا بەبێ پرسی دایك و باوکی بڕوات بۆ مۆسکۆ، لەوێندەر، لە زانستگە بەشی ماتماتیك بخوێنێ. نیکولاش کە ئەو کاتانە تەمەنی شازدەساڵ بوو و هێشتا خوێندنی ئامادەیی تەواو نەکردبوو لێبڕا دەگەڵ ئەلکساندەرا بڕوات. ئەم کوڕە بەهرەی نیگارکێشی تیابوو. حەزی دەکرد لە مۆسکۆ بچێتە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان. ئەم جووتە سەرکێشە لە مانگی ئابی ١٨٧٥ دا تاگانرۆکیان بەجێهێشت و بە گۆساخی خۆیان داریان دا بە ڕۆحی پاول یگوروفیچ دا.

ئانتوون کە لە برا گەورەکانی کە زۆری خۆش دەویستن و هۆگر و دڵبەندیان بوو، مەحرووم بوو، هێندەی دی هەستی بە باری قورسی زەبر و زەنگی بابی دەکرد. بۆ ئەوەی خۆی لە کەش و هەواو ژینگەی خەفەتباری ماڵەوە بدزێتەوە، کەوتە بڵاوکردنەوەی بڵاڤۆکێکی دەستنووسی یەك نوسخەیی و ناوی نا (زمانگیر). کە زۆر بە جدی، دیمەنە نموونەییەکانی ژیانی تاگانروگی بە تەوسەوە دەخستەڕوو، سەرکەوتنێکی خێرا و زوو بە زووی لەو کارەدا بە دەست هێنا. قوتابیانی جمناز زۆر بە تاسەوە چاوەڕوانی دەرچوونی هەر ژمارەیەکیان دەکرد. بڵاڤۆکەکە پاش ئەوەی لە نێو قوتابیانی قوتابخانەی نێو برا و دەستاو دەستی دەکرد، هەنگێ بۆ مۆسکۆیان دەنارد تا ئەلکساندەر و نیکۆلای بیدینن. داوەری ئەلکساندەر دەبارەی بڵاڤۆکەکە زۆر توند بوو، لە نامەیەکیا بۆ دایك و باوکی دەربارەی ژمارەی مانگی سپتامبەر دەڵێت: " بە نووسەری زمانگیر بڵێن ئاستی بڵاڤۆکەکەی دابەزیوە، سەرنجڕاکێش نییە، ئەو تامەی جارانی نییە، خوێی کەمە". ئەم داوەرییە توونده کردیە کارێك کە ئانتون چیتر لەسەر چالاکی ڕۆژنامەوانی خۆی بەردەوام نەبێت.

ڕۆژ بە ڕۆژ مەیلی ساتیر و قوشمایەتی دەیدایە کزی. کێشەی نەبوونی بوو بوو بە خەمی ڕۆژانەی خانەوادەکەیان. دوکانەکەیان وەکو پێویست کاری نەدەکرد، دەرامەتێکی کەمی هەبوو، پاول یگوروفیچ تەنانەت نەیدەتوانی قستی ئەو عەقارەش بداتەوە کە بۆ دروستکردنی خانووەکەیان وەریگرتبوو. نامەیەکی بۆ ئەلکساندەری کوڕی نووسی: "دەرامەتم ڕۆژ بە ڕۆژ لە کزییە، بازاڕم کەسادە. خەریکە نائومێد دەبم. نازانم تەگبیری من و دایکت چییە. ئاه پارە، پارە! زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ بە حەڵاڵی پەیدای بکات!"، بەڵام ئەلکساندەر کە لەم کوڕزانەوەیەی

بابی بێزاربوو، وەڵامی دایەوە کە ئەو و نیکۆلای برای زۆر لەو خراپترن. هەم برسین و هەم بێ بەرگن، جلەشڕان لەبەردەکەن. ترس و نیگەرانییەکانی پاول یگوروفیچ بەجێ بوون، بە ڕادەیەك کەوتبووە تەنگانەی داراییەوە کە ترسی ئەوەی هەبوو نەتوانێ خەرجی خوێندنی منداڵەکانی بکێشێت و ناچار بێت لە مەکتەب دەریان بێنێ. یوگنیا یاکوڤلڤنا نامەیەکی بۆ کوڕەکانی مۆسکۆی نارد: " ئانتوشا و ڤانکا(٥) یەك هەفتەیە نەچوون بۆ مەکتەب.. قوتابخانەکەیان داوای مانگانە دەکەن و ئێمەش پارەمان نییە بیدەین... دوێنێ ٩/ت١ پاول یگورفیچ چوو بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان. ڕازی بوون کە ڤانکا بەخۆڕایی، بێئەوەی مانگانە بدات، دەوام بکات. بەڵام ئانتوشا هێشتا لە ماڵەوە دانیشتووە، چل و دوو ڕۆبڵ هەقی ئەو وماشا(٦) قەرزارین و دەبێ بیدەین. ئاخر چۆن دەتوانم نیگەران نەبم؟".

بەڵام ئەلکساندەر و نیکولا کەوتبوون بەسەر خەمی خۆیانا، ئالکساندەر لە هەوڵ و کۆششی تاقەت پڕوکێنا بوو کە لە بواری زانستی ماتماتیکدا خوێندنەکەی تەواو بکات و پلەی دکتۆراکەی وەربگرێت، لە ڕێگەی کاری تاقەتپڕوکێنی ڕوونووسییەوە، ژیانی خۆی و نیکۆلای برای دابین دەکرد. نیکۆلای کە هەموو کاتی خۆی بە ڕەسم کردنەوە دەبردەسەر. بە ئومێد و هیوای ئەوەبوو کە پەرجوویەك ڕووبدات و خۆی و براکەی لەو هەژارییە سەخت و دژوارە ڕزگار بکات، وێڕای ئەو هەموو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، پەشیمان نەبوو لەوەی کە تاگانرۆگی بەجێ هێشتبوو. ئەلکساندەر لە نامەیەکا بۆ باوکی دەڵێت: "کە پیاو دڵی تەنگ بێ، نائومێد و ڕەشبین بێ، بەلای کەمەوە چاوەڕوانی ئەوە دەکات، دەستێکی دۆستانەی بۆ درێژ بکرێت، قسەیەکی خۆشی بە گوێدا بدرێ، بەڵام تۆ لەجیاتی دڵدانەوە، ئامۆژگاریمان دەکەیت کە بۆ کڵێسا بچین!".

پاول یگوروفیچ گلۆڵەی کەوتە لێژی، ڕۆژ بە ڕۆژ، وەزعی خراپتر دەبوو، زۆری پێنەچوو کە بە فەرمی نابووتی و مایەپووچی خۆی ڕاگەیاند. ئەوەبوو لە ١٨٧٦/٤/٣دا، لە ترسی ئەوەی نەبا لە سۆنگەی قەرزارباریەوە بخرێتە زیندان، بە دزییەوە ئاگانرۆکی بەجێهێشت بۆ ئەوەی کەس نەیناسێتەوە چوو بۆ شارۆچکەیەکی دراوسێی خۆیان و لەوێندەر سواری قیتاربوو و مۆسکۆ خۆت بگرە واهاتم. دوای ساڵەها خەون دیتن بە سەرکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە، ئاقیبەت، ئەوەتا تەنیا و داماو، زەلیل، کەساس و لێقەوماو وەکو دزێك خۆی لە فارگۆنێکی نمرە سێ دا دەبینێتەوە، تۆ بڵێی ژن و منداڵەکانی کە بە تاقی تەنیا لە تاگانرۆك بەجێ هێشتبوون چی دەربارە بڵێن؟ کوڕەکانی، کوڕە گەورەکانی چۆن لە مۆسکۆ پێشوازی بکەن؟ پێشوازی ئەم باوکەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، زۆر دەگەڵیاندا توند و بە زەبر و زەنگ بوو، هەنووکە کابرایەك بوو ناکام، لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا و داوی سپیی کەوتبوونە ڕدێنی؟ ئانتون، لە دڵی خۆیدا ئەم هەرەس و داڕوخانەی زۆر لەبەر گران بوو. هەرچەندە لە زەبر و زەنگەکەی بابی بێزار بوو، بەڵام بەزەیی بە حاڵی ئێستایدا دەهاتەوە. هەمیشە داشداری لە بەدبەختان و لێقەوماوان دەکرد تا لە سەرکەوتووانی فشەکەر و خۆهەڵکێش. لە نێو هەموو براکانی دیکەیدا، تەنیا ئەو لە تاگانرۆگ مابووەوە و دەیتوانی پشتیوانی لە دایکی بکات و یارمەتی بدات. دایکی کە لە ژێر باری ئەو

کارەساتەدا دەینالاند، ناردی بۆ لای کابرایەکی سووت خۆر کە پارەی بە سووت بە قەرز دەدا، بەو ئومێدەی کە خانووەکەی پێ بفرۆشێت یان بە ڕەهنی بدات، کابرا هیچ مەیلێکی نیشان نەدا. هەنگێ پەنای بردە بەر کەسوکار و خزمان، تا کۆمەکێکی کاتی بکەن. بەڵام هەموویان خۆیان دزییەوە. تەنانەت هاپۆ میترووڤانی میهرەبانیش گوتی ئەوەندە بێ پارە و پوولە، توانای ئەوەی نییە تاقە کۆبیکێکیان بداتێ. پاشان سیلیڤانوف، کرێچییەکەیان، بە دڵ و گیان، بە چاوانی ساف و بێگەردی چوون ئاسمانەوە هاتە پێشێ. مەگەر دۆستی ئەم ماڵباتە نەبوو؟ وەکو فەرمانبەری ئەو دادگایەی کە کە کەیسەکەی پاول یگوروفیچی لێبوو، دەیتوانی کەیسەکە لە چاونووقانێکدا چارەسەر بکات. هەرواشی کرد: دوای ئەوەی پێنج سەد ڕۆبڵەکەی، ئەوەی کە پاول یگوروفیچ لە کۆمپانیای بیمەی هاوبەش قەرزی کردبوو، دایەوە، توانی لە ڕێگەی حیلە قانونێکەوە،ماڵەکەی ماڵباتی چیخۆف بکاتە ناوی خۆی. بەڵام قەراری دادگا، وێڕای ئەوەش، ئەوەبوو کە کەلووپەلی ناو ماڵەکە، لە بری ئەو فایزەی هاتبووە سەر سلفەکەی، بخرێتە هەڕاج و مزادەیەوە. ئەوەبوو یوگینا یاکوڤلڤنا، دوای بیست و دوو ساڵ لە شووکردن، دەستێکی کەوتە ئەمبەر و یەکێکی کەوتە ئەوبەر، نە خانووی بە دەستەوە ماو نە کەلوپەلی ناوماڵ، لە ١٨٧٦/٢/٢٣ دا، دەستی میخائیلۆ و ماریای گرت و ڕۆیی بۆ مۆسکۆ تا بچێ بۆ لای مێردە بێنەواو و داماوەکەی. بەڵام ئیڤان، کە لای پوری لای ماڵباتی موروزۆف مایەوە، چەند مانگێکی دی لە تاگانرۆگ مایەوە و پاشان بە تەنیا ڕۆیی بۆ مۆسکۆ. بە هەرحاڵ مانەوەو ژیان لە ماڵی کەسێکی دی، لە ڕووسیادا کێشە نەبوو. میوانپەروەری و میوانداری لە نێو ڕووسەکاندا، بە شێوەی هەموجۆر باو بوو. ئەگەر شوێنی نووستنت نەبا، دەتتوانی لە ماڵی دۆستێك، یان خزمێکدا وەمێنی. خۆ ئەگەر ئەم دۆستە بە خۆی چووبا بە میوانی و لەلای دۆست و برادەرانی دی بمێنێتەوە، دەیتوانی زۆر بە ئاسانی میوانەکەشی دەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوێندەرێ ببات. ئیدی ماڵی ڕووسەکان، بە زۆری پڕبوون لە میوان. چ خزم و کەسوکار بان و چ بێگانە یانی پڕبوون لە مشەخۆرانی ناچاری، مشەخۆرانی خۆشەویست، ئەوانەی کە بووبوون بە بەشێك لە تانوپۆی هەمیشەیی پێکهاتەی خێزان. تەنیا ئانتون، لە ماڵەکەی خۆیاندا، ئەو ماڵەی کە بوو بە موڵکی ماڵباتی سیلیڤانوڤ، مایەوە. خاوەن ماڵە تازەکە، کە بێ هیچ شەرم و شوورەییەك بە سەرکەوتنەکەی خۆیەوە دەنازی، گۆشەیەکی دایە ئەنتون کە شەوانە تیای بخەوێ (گۆشەیەك نەك ژوورێك) قاپێکیشی بۆ خستە سەر مێزەکەی.جا دەبوایە ئانتۆن لە بری ئەم جێگاکردنەوە و قاپەدا دەرس بە پیوتەر کراڤتسوڤی برازای سیلیڤانوڤ بڵێتەوە. پیوتەر، هاتبوو بۆ ماڵی مامی تا بەشداری تاقیکردنەوەی قوتابخانەی سوپایی بکات و بچێتە قوتابخانەی ناوبراو. سیلیڤانوڤ بە دەم بزەیەکی خۆپەسندانەوە، بە ئانتونی گوت: "من پێویستن بە تۆیە و تۆش پێویستت بە منە!" ئانتۆن حەزی دەکرد بتوانێ داوای ئەو کابرایە ڕەفز بکاتەوە کە بەو شێوەیە کەسوکارەکەی خستبووە سەر ساجی عەلی. بەڵام ڕووی نەبوونی ڕەش بێ، کە کۆڵەی کوتابوو. بۆیە هەموو خواریەکی قەبووڵ کرد، بەو ئومێدەوە دەژیا، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرکەوتووانە مەکتەبەکەی تەواو بکات، ئەگەر کاروبارەکانی ئاسایی ڕۆیشتبان ئەوا دەیتوانی دوای سێ

ساڵان، کارنامەکەی لە بەرکی بنێت و بەرەو مۆسکۆ لە شەقەی باڵ بدات. ئیدی دەبوایە لێرەوە تا ئەو ڕۆژە دێت، تەنیا پشت بە خۆی ببەستێت.

پەراوێز:

١- (.. ئەلف. با، جیم، دال): لە دەقەکەدا بە لاتینییە.

٢- پـارکی ئیلیزابـت: ئـەم پارکـە بـە نـاوی هاوسـەری ژنەکـەی ئەلکسـاندەری یەکەمـەوە(تزاری رووس) ناونراوە.

٣- موژیك: دێهاتی وجووتیاری ڕووس.

٤- ئۆفینباك: (١٨١٩-١٨٨٠) ئاهەنگساز و سازڤانی ئەڵمانی نەژادی فەرەنسییە، دەیان ئـاوازی لـە پـاریس دانـاوە، لـە کۆتـایی تەمـەنیا سـەفەرێکی بـۆ ئەمـەریکا کـرد و یادگارییـەکانی خـۆی لـە کتێبێکدا بە ناونیشانی "یادگارییەکانی نەواژەنێکی ڕێبوار (١٨٧٧)" بڵاوکردەوە.

٥- ڤانکا: سووکەڵە ناوی ئیڤانە.

٦- ماشا: سووکەڵە ناوی مارییایە.

((٣))

## ئەفسونی مۆسکۆ

پاش هەرەسهێنانی بونیاد و بناغەی خانەوادەیی، ئانتون لە جاران پتر هەستی بە تەنیایی و گۆشەگیری و پەرێشانی دەکرد. ڕاستە لەو بێگارانە ڕزگار بووبوو کە جاران بارببوون بەسەر شانییەوە: دوکانداری و مشتەری بەڕێکردنی لە کۆڵ بووبووەوە، سروودخوانی و تیپی کلێسای لە کۆڵ بووبووەوە، ملکەچی لە هەنبەر زەبر و زەنگی بابیا لەسەر نەمابوو. بەڵام ئەم ئازادییە تازەیە ڕوویەکی تاڵیشی هەبوو: لە تەمەنی شازدەساڵیدا، دەبوایە بە خۆی مشووری گشت پێویستییەکی خۆی بخوات. لە ماڵاندا دەرسی تایبەتی دەگوتەوە، هەموو شاری دەدایە ژێر پێوە، لە ماڵی ئەم قوتابییەوە بۆ ماڵی ئەو قوتابی دەچوو، بە سەرما و سۆڵەی زستان بە تۆی چاکەتێکی تەنکی تاڵکێشەوە دەهات و دەچوو. پارەی نەبوو جووتێ پاتەی لاسیك بکڕێت، شەرمی لە پێڵاوە شڕ و قوڕاوییەکانی خۆی دەکرد، لەکاتی دەرس گوتنەوەدا،بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی بشارێتەوە، لاقی دەخستە ژێر مێزەکەوە".

هەندێجار، هەندێ لە کەسوکاری دڵاواو بە سۆز و بەزەیی قوتابییەکانی کوپێ چایان دەدایە تا گەرم ببێتەوە. لە گەورەییدا باسی ئەو هەژارییە دەکات کە لە نۆلاویدا چۆن پێوەی ناڵاندووە و دەڵێت: "وەکو دان یەشەیەکی بێ ئامانی هەمیشەیی وابوو". هەرچەندە ئانتون، ئالوودەی نەداری بوو، کەچی تووشی بوو بە تووشی کەسێکی لە خۆی نەدارترەوە، کە هاوڕێیەکی گەنجی جولەکەی خۆی بوو بە نێوی ئیسحاق سرولیڤ، ئەمە گەنجێکی چالاکی زیتەڵی زیرەك و هۆشن بوو، نانی نەبوو بیخوات. ئانتون، بێ هیچ دوو دڵییەك پێشنیازی بۆ کرد کە بە شەریکی و بە نۆرە دەرسی تایبەت بە یەکێك لە قوتابییەکانی ئەو بڵێنەوە، کە ماڵیان زۆر دووربوو، لەوبەری هێڵی ئاسنی شار بوو. ئەم دووە مانگی سێ ڕۆبڵیان لە بری ئەم دەرسانە وەردەگرت و ئەم کرێ کەمەیان برابەش لە نێوان خۆیاندا بەش دەکرد.

دایکی ئانتون، کەمێك پێش ئەوەی تاگانروگ بەجێ بێڵێ، ئانتوانی ڕاسپاردبوو کە ئەو کەلوپەلانەی بەجێی هێشتوون، بفرۆشێت و بە خۆیشی لە گیرفانی خۆی چەند ڕۆبڵێکی بخاتە سەر و بۆی بنێرێت بۆ مۆسکۆ. ئەو کەلوپەلانە بریتی بوون لە: کۆمەدییەکی چەکمەدار، چەند کورسییە شکاوێك، جلەکۆنە، هەندێ مەنجەڵ و پاتیلەی کۆن. کاتێ کە ئانتۆن، لە جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکەی دایکی دواکەوت، دایکی بە نامەێن سادە و بێ ڕیا، بە دەست خەتی ناخۆش و خاڵبەندی نادروست و بێ سەروبەرەوە، لێی کەوتە گلەیی. ئەوەی ئەم ژنە بێنەواو داماوەی، لە هەر شتێکی دی پتر پەست دەکرد ئەوەبوو کە کوڕەکەی بە شێوەیەکی تەنزئامێز لە تاگانروگەوە وەڵامی دەدایەوە. غافڵ بوو لەوەی کە ئەم تەوس و تەنزەی کوڕەکەی کە هەڵقوڵاوی ئەوپەڕی بەدبەختی و نامورادی بوو، بۆ خۆی جۆرە کبریا و کەرامەت و نەفس بەرزییەکە. ئەوەبوو لە ٢٥/ت١٨٧٦/٢دا لە نامەیەکا بۆ ئانتۆن دەڵێت: "لە کاتێکا دوو نامەی پڕ لە تەنز و گاڵتە ئامێزی تۆمان بە دەست گەیی، کە بۆ کڕینی خواردن و مۆم تەنیا چوار

کوپیکمان بە دەستەوەبوو. چاوەڕوانی ئەوەبووین پارەمان بۆ بنێریت، بە ڕاستی پێمان ناخۆش بوو، بێگومان تۆ باوەڕمان پێناکەیت کە ماشا فەروەی نییە، من چەکمەی ناو فەروم نییە، ناچار لە ماڵ ناچینە دەرێ. مەکینەی خەیاتیم نییە کە دوو عانەی پێ پەیدا بکەم. تۆ تا ئێستا پێت نەگووتووین، کە ئاخۆ بەم زووانە پارەی شتەکانمان بۆ دەنێریت یان نا، بە ڕاستی وەزعمان شڕە، کارەساتە. مەعز بۆ ڕەزای خوا زوو بنووسە، خێرا ئەو پارەیەم بۆ بنێرە، مەیەڵە بە داخەوە بمرم". ئالکساندرش، لە نامەیەکی خۆیدا، دەربارەی ئەم وەزعە دەڵێت: "وەزعمان زۆر خراپە، پارەمان پێ نەماوە. هەمووومان خواردووە، هیچ هەواڵێکی تازەمان نییە، هەمان تاس و هەمان حەمامە. هیچ شتێکمان نەماوە نەی خەینە ڕەهنەوە".

ئانتوان بێ خەم و خەیاڵ، هەرگیز گلەیی نەدەکرد، یەکێك نەی ناسیبا دەیگوت ڕەنگە فەرشی گوڵی بۆ ڕاخرابێ. بەو گەنجێتییەی خۆیەوە دەرسی هاوسەنگی مەعنەوی و ئەخلاقی بە کەسوکارەکەی دادەدا. ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ میخائیلی برا بچووکی دەڵێت: "شتێك لە نامەکەتا هەیە پێم ناخۆشە. بۆچی خۆت بە برا بچووکێکی کەم و بێ فەڕ و بێ نرخ و بێ مانا دەزانیت؟ دەزانی ئینسان لە کوێدا بچووکە ؟ چاك بزانە کە تۆ تەنیا لە هەنبەر خوادا، یان لە هەنبەر هۆشمەندی و زیرەکی ئینساندا، لە هەنبەر جوانی و تەبیعەتدا بچووکی قەبووڵ بکەیت، نەك لەبەردەم خەڵکیدا. پیاو لەبەردەم خەڵکیدا دەبێ ئاگای لە کبریا و کەرامەتی خۆی بێت. تۆ کەسێکی ئابڕومەند و دروستکاریت، خوێڕی و فریوکار نیت، وانییە؟ کەواتە ڕێزی ئەو مرۆڤە دروستکار و ئابڕومەندە بگرە کە لە ناخت دایە، دڵنیابە کە ئینسانی دروستکار هەرگیز کەم و بێ نرخ و بەها نییە. تەوازوع جیایە و خۆ بەکەمزانی جیایە، ئەو دووانە تێکەڵ مەکە". (بڕوانە نامەی ١٨٧٩/٤/٨).

ئانتون بە حەماسەت و جوامێری و مێریڤانیەکی کەم وێنەوە، خوازیاری دۆستایەتی یەکێك لە کوڕە مامەکانی بوو: ئەم ئامۆزایەی نێوی میخائیل چیخۆف بوو، دە دانە ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو، لە مۆسکۆ دادەنیشت و هەرگیز یەکتریان نەبینی بوو. ئیدی نامە و نامەکارییەکی گەرم و گوڕ و پڕ متمانەیان لە نێواندا بەرپابوو. کار گەییە ئەوەی کە ئانتون ئەم میخائیلەی بە برای خۆی دەزانی "برای دەرەجە دوو". ئانتون لە نامەیەکیا داوای وێنەی شەخسی لێکرد، دەیوست هەموو شتێك دەربارەی شێواز و چۆنێتی ژیانی بزانێت: "پێم بڵێ ئاخۆ سیغار دەکێشیت یان نا. زۆر پێویستم بەوەیە کە ئەمە بزانم". (بڕوانە نامەی ١٨٧٧/٢/٨) هەروەها داوای لێکرد کە چاوێکی لە دایکی، یوگینا یاکوڤلڤنا بێت: "پیاوی چاك بە و ئاگایەکت لە دایکم بێ، دڵخۆشی بدەوە، بە ڕاستی لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە ڕووخاوە، تۆ بۆ ئەو نەك هەر کوڕی شووبرایت، بەڵکو زۆر لەوە زیاتری. دایکم تەبیعەتی وایە کە بە پشتیوانی مەعنەوی هەر کەسێکی دی، زۆر دڵی خۆش دەبێت و ورەی بەرز دەبێتەوە. جا سەبارەت بە من، لەم دنیا نالەبار و بێوەفایەدا لە دایکم ئازیزترم نییە، بۆیە ئەگەر چاوێکت لە دایکم بێت کە لە داخا نیوە گیان بووە و، دڵخۆشی بدەیتەوە، ئەوا بەندە زۆر زۆر منەتباری خۆت دەکەیت". (بڕوانە نامەی ١٨٧٧/٥/١٠). هەروەها دوای چەند هەفتەیەکی دی لە نامەیەکی تردا بۆ هەمان میخائیل

چیخۆف دەڵێت: "باوك و دایكم، لای من ئازیزترین دوو كەسی سەرانسەر ئەم دنیایەن. كەسم لەوان خۆشتر ناوێ، ئەگەر كەمترین شتم لێبوەشێتەوە، لە سایەی هەوڵ و كۆششی ئەواندایە. دوو بەشەری زۆر دلۆڤان و دڵسۆزن، خۆشەویستیان بۆ منداڵەكانیان لە ڕادەبەدەرە، لە سەرووی هەر ستایشێكە، بە ئەندازەیەكە كە هەر هەموو ئەو هەڵە و درێغیانەیان دەسڕێتەوە، كە هەندێجار بە هۆی ژیانی زۆر سەخت و دژوارەوە ڕوودەدەن". (بڕوانە نامەی ١٨٧٩/٧/٢٩).

ئانتون، وێڕای ئەو هەموو كێماسی و درێغییەی كە لە دایك و باوكی دیتبوونی، ئەو مافەی بە خۆی نەدەدا كە گلەیی و گازاندەیان لێبكات. بیرەوەرییەكی خۆشی چەند سەعاتەی خانەوادەیی، هەموو بێ میهری و درێغییەكی دایك و باوكی لەلا دەسڕییەوە. بەشێك لە هۆی تاسەی چوونە مۆسكۆ ئەوەبوو كە بیری كەسوكارەكەی دەكرد و تامەزرۆی دیداریان بوو.لە نامەیەكا بۆ میخائیل چیخۆف دەڵێت: "لە تاگانروگ هیچ شتێكی تازە نییە، یەكپارچە بێزارییە، بێزارییەكی كوشندە".

ئانتوون، بە سكی برسی و مێشكی پڕ لە نێگەرانییەوە زۆر بە جدی پەیگیری دەرس و دەوامی خۆی دەكرد. لە پۆلە سەرەتاییەكاندا قوتابیەكی تەمەڵی خەیاڵپەروەر بوو. بەڵام ئێستا كە گەیی بووە پۆلە بەرزەكان بوو بوو بە قوتابییەكی جددی و مانگ بە مانگ لە جمنازدا نمرەكانی بەرز و بەرزتر دەكردەوە. هەموو خولیا و خەیاڵێكی هاتبووە سەر وەرگرتنی شادەتنامەكەی، ئەو شادەتنامەیەی كە دەرگای خوێندنی پزیشكی لێدەكردەوە. ڕۆژانی یەك شەمموان و پشووەكان، دەچوو بۆ كتێبخانەی شارەوانی كە تازە كرابووەوە. ئیدی لەوێدا، بێ هیچ جیاوازییەك بەرهەمەكانی هاریت بیچەر ستوو، شوپنهاوەر، هامبولدت، ڤیكتۆر هۆگۆ، سێرڤانتس، گونچاروف، تورگینیف و بیلینسكی دەخوێندەوە... ئیدی بە جۆرێ هەناسەی دەنا بە هەناسەی لاپەڕە چاپكراوەكانەوە، هەندێجار لە بیری دەچوو نان بخوات. بەرە بەرە، هەوڵی دەدا لە دوورەوە خۆی بكات بە نموونە بۆ براكانی تا هانیان بدات خۆیان پەروەردە بكەن. كاتێ كە میخائیلی برا بچووكی لە نامەیەكدا بۆی نووسیبوو كە زۆری لەزەت لە (كوختەكەی ماپو تۆم) دیتووە، یەكسەر وەڵامی دایەوە: "ئاخری خانم بیچەرستوو، هێناتییە گریان؟ من كاتی خۆی جارێك لامسەرلایی كتێبەكەیم خوێندەوە، بەڵام شەش مانگێك لەمەوپێش بە مەبەستی دەرس وەرگرتن، بۆ جاری دووەم خوێندمەوە، كە تەواوم كرد، وەكوچۆن كەسێك مێوژە ڕەشكەیەكی زۆر بخوات، بەو ئاوایە هەستم بە بێزاری و بێتاقەتی كرد، كەواتە دۆنكیشۆتیش بخوێنەوە (چاپە تەواوەكەی، حەوت یان هەشت بەرگە) تەقریبەن لە ئاستی شەكسپیردایە". (بڕوانە نامەی ٧-١٨٧٩/٤/٨).
فەلسەفەی شوپنهاوەر كارێكی ئەوتۆی لە ئانتون دەكرد، كە هەندێجار هەستی دەكرد، لە قەراخی هەڵدێری نائومێدیدا وەستاوە و ژیانی دژواری تاگانروك-ش هیچ دەرویەكی گەشی لێناكاتەوە. ئیدی بۆ خۆدزینەوە لە نائومێدی و ڕەشبینی كەوتە خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامە كۆمیكیانەی كە لە مۆسكۆ و سان پترسبۆرگ دەردەچوون، وەكو: "سیسرك، سەعاتی زەنگدار، وردە و پرتكە). كاتێ كە لە هۆڵی خوێندنەوەدا و لە تەنیشت ئاندری درۆسی هاوڕێیەوە

دادەنیشت و ئەو وتار و نوکتە تەنزئامێزانەی دەخوێندەوە، بە جۆرێ لە قاقای پێکەنینی دەدا، کە خوێنەرەکانی دی بێزاردەبوون و دەکەوتنە گلەیی.

ئاندرێ درۆسی، خوشکێکی گەنجی یەجگار بەناز و عیشوەی هەبوو کە ئانتۆن شەیدای بووبوو. لە باخی شارەوانیدا پیاسەی دەگەڵ ئەم کیژەدا دەکرد و هەموو جارێ نوقڵ و نەباتی دەدایێ. کیژەش لەبری ئەمە ڕێی دەدا کە بچێتە ژوورەکەی. بەڵام ئەم دڵداری وڤیانە ڕەوتەنیە لەوەندە تێنەپەڕی. بە پێچەوانەوە، چیخۆف پاشان بۆ سوڤورینی گێڕاوەتەوە کە لە گەنجێتیدا، تووشی هەڵوێستی شەهوانی ئەوتۆ بووە کە هەرگیز بیرناچنەوە. ڕۆژێ لە ڕۆژان کاتێ بەدیار بیرێکەوە دەوەستێ و سەیری بنکی بیرەکە دەکات، کیژۆڵەیەکی دێهاتی پازدەساڵە، دێت بەسەرا بۆ ئاو پڕکردن، کیژێ هێندە جوان دەبێت کە ئانتۆن خۆی پێناگیرێت و باسکی لە قەدی دەئاڵێنێ و دەیەوەێ ماچی بکات، کیژێ لەجیاتی داکۆکی لە خۆی بکات، یەکسەر مل بۆ نەوازشتەکانی دەدات. ئیدی ئەم دەست لە ملانێ ساویلکانەیە گەییوەتە چ ئاستێك؟ ئانتون کە هەمیشە کەسێکی بە ئەدەب و بە پارێزبوو، لەوە زیاتری دەربارە نەگوتووە. بۆ میخائیلی برا بچووکیشی گێڕاوەتەوە کە لە تاگانروگدا چەند چیرۆك و بە سەرهاتێکی ئاشقێنی ئەفسووناوی و خۆشی هەبووە. کاتێ ئەلکساندری برا گەورەی بە هیوا ئەشق ئامێز و بێ ئومێدییەکانی ئانتون دەزانێت بۆی دەنووسێت: "پێویست ناکات کە کیژان پابەندی خۆت بکەیت، هەروەها هیچ پێویست ناکات بە دوویاندا غار بدەی". ئەوەی ڕاستی بێ ئاشقێنییەکانی ئانتون زیاتر لە ڕووی سۆزداری و میهرەبانییەوە بوون تا لە ڕووی هەوەسرانیەوە بن، تەنیا هەستێکی سەرڤەسەرڤە بوو. هێشتا لەوە منداڵتر بوو کە مەیل و ئارەزووی پەیوەندی سێکسی بکات.

ئەلکساندەری برا گەورەی پێش جەژنی پاکی ۱۸۷۷، بلیتێکی ڤیتاری بۆ نارد تا بۆ جەژنی پاك سەفەری مۆسکۆ بکات. ئانتۆن بە دەم خۆشییەکی ئاوێتە بە ترسەوە، ڕێگای ئەم سەفەرە دوور و درێژە، ئەم سەفەرە هەزار و دووسەد کیلۆمەترییەی گرتەبەر، کە ئاخۆ کاتێ دەگاتە جێ چی دەبینێ؟ لەبەر ڕۆشنایی نامەکانی دایکی و براکانیا، خۆی بۆ ڕووبە ڕووبوونەوەی وەزع و ڕەوشێکی دژوار ئامادە کردبوو. بەڵام واقیعەکە لەوە خراپتر بوو کە وێنای دەکرد. خانەوادەی چیخۆف لە یەك ژوورا دەژیان، بە هەموویان یەك ڕایەخیان هەبوو، لە ژوورەکەدا ڕایان خستبوو، کە شەویان لێدەهات، هەر هەموویان بە پاڵ یەکەوە لەسەر ئەو ڕایەخە دەنووستن. نیکۆلا و برادەرێکی کە نیگارکێش بوو، داریان لە عەرەبانان دەدزی تا سۆپای پێ گەرم بکەن.دایکیان بەر لە سپێدە لە خەو ڕادەبوو، پاڵتۆیەکی شڕی پیاوانەی لەبەر دەکرد و دەکەوتە خەیاتی. باوکیان کە ماوەیەك لەوەپێش لە وەرشەیەکدا (کارگە) کرێکاری دەکرد، ئێستا بێ کار بوو. بە ناو شار دەکەوت کە گوایە بە قسەی خۆی لە دووی دۆزینەوەی ئیش و کار دەگەڕا، بەڵام لە ڕاستیدا دەگەڵ برادەرەکانیدا دەچووە مەینۆشی. ماریای ناسك و ئارام، کە ئەو کاتە چواردە ساڵان بوو، ماڵی گسك دەدا، چێشتی لێدەنا، جلوبەرگی دەشت، لەبەر بێ پارەیی نەدەچووە قوتابخانە. بە دەم کاری ناو ماڵەوە، ملپێچی خووری دەچنی، و دانەی بە پازدە– بیست کۆپیکێك دەفرۆشت.

دوو برا گەورەکە پارەیەکی کەمیان بۆ ماڵ دێنایەوە! لە ڕێگەی دەرس گوتنەوە و پاکنووس کردنی محازەرات و بەشداریکردن لە ڕۆژنامانی وێنەداری کەم بایەخەوە پارەیەکی کەمیان بە دەست دێنا. ئەلکساندر دەبوایە خەرجی ئەو ژنەش بکێشێت کە لە خشتەی بردبوو و لەبەر خاتری ئەو وازی لە مێردەکەی هێنابوو.

نیکولاش زیاتر لە مەیخانەکەی گەڕەکدا مژولی بادەنۆشی بوو تا لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکاندا خەریکی نیگارکێشی بێت. بنەماڵەکە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو هەرەس و داڕوخانی زیاتر دەڕۆیی. ژیانیان لە تاگانرۆگدا، لە چاوە وەزعی ئێستایاندا، ژیانی پاشایەتی بوو.

ئانتۆن، کە گەییە مۆسکۆ، ئەوەی لە هەموو شتێك سەرنجی ڕاکێشا، هەڵویستی بابی بوو، مایەپووچی و نابووتی کەم و زۆر نەی گۆڕیبوو، وێڕای ئەو شکستە گەورەیەی کە تووشی بوو بوو، هەمان باوکە بە زەبر و زەنگ و دیندارەکەی جاران بوو. بەردەوام بوو لەسەر وەعزخوانی خۆی. کتێبی ئایینی لە مجێوری کڵێساکەی دراوسێیان دەکڕی. خۆ ئەگەر یەکێك لە کوڕەکانی پڕکێشی کردبا و لە کاتی زیکر و وێردخوانیدا قسەی پیێ بڕیبا، هاواری دەکرد: "بێدەنگ بن، خوا نە ناسینە!" دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی هەر وەعزێك دەبووەوە، وەعزەکەی بە بزمارێکا هەڵدەواسی و ژمارە و بە رواری لێدەدا و لە ژێریا دەینووسی: "نرخ: یەك کوپیکی زیو. سوپاس بۆ خوا!".

هەروەها پاول یگوروفیچ، بە دەست خەتی خۆی پڕۆگرامێکی ناوخۆی لەژێر ئیکونەکان دابوو، بە ناونیشانی: "بەرنامەی بنەماڵەی پاول چیخوف لە مۆسکۆدا". ئیدی هەر یەکێك لە منداڵەکان –جگە لە ئەلکساندەر و ئانتون– دەبوایە پەیڕەوی ئەو بەرنامەیە بکات و بە گوێرەی ئەو بەرنامەیە لە خەو هەستێت، بخەوێت، نان بخوات و بۆ کڵێسا بڕوات.

(نوێژ و نزای بە یانیان، ڕۆژانە سەعات حەوت دەستی پێدەکرد، لە جەژن و پشووواندا، نوێژی ئێواران لە دوو کاتی جیاوازدا، لە سەعات شەش و نیو و لە سەعات نۆدا ئەنجام دەدرا). لە ژێر ئەم فرمانە باوکانەیەدا، ئەم ئاگادارییە نووسرابوو: "ئەوانەی ئەم ئەرکانە ئەنجام نەدەن، جاری یەکەم بە توندی سەرزەنشت دەکرێن و لە قۆناغی دواتردا، دارکاری دەکرێن". ناو و ئیمزای "سەرگەڤاری خانەوادە، پاول چیخوف" لە پاینی ئاگادارییەکە درابوو.

یەکەمین کەس کە لەسەر سەرپێچی لێدانی خوارد میخائیلی دوازدە ساڵان بوو. هۆی لێدانەکەشی ئەوەبوو کە تەنیا هەشت دەقیقە درەنگتر لە کاتی دیاریکراو، لە خەو هەستابوو. دوای ماوەیەك نۆرە هاتە سەر لێدانی ئیڤان، هەنگیٚ تەمەنی شازدە ساڵان بوو، لە ژێر لێدانا، بە جۆریٚ هاواری دەکرد، کە دراوسێکان هاتنە دەنگ. هەموو وەڵامێکی پاول یگوروفیچ ئەوەبوو کە بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە گوتی خەڵکی شارە گەورەکان، زۆر لە خەڵکی تاگانرۆگ کەمتر پەی بە گرنگی زەبت و ڕەبت و دیسپلینی خانەوادەیی دەبەن، ئەسڵەن زەبت و ڕەبتی خانەوادەییان فەرامۆش کردووە. بۆیە ئەو کارەی خۆی بە ناڕەوا نە دەزانی کە هۆی بێکارییەکەی خۆیان لیٚ پرسیبا، خێرا چاوی دەبڕییە دوور، کەمێك ڕادەما و بە ئایەتێکی ئینجیل وەڵامی دەدایەوە: "تەماشای مەلی ئاسمان بکەن، نە دەچێنن و نە دەدوورنەوە و نە عەماران پڕ لە زەخیران دەکەن

و، بابی ئاسمانی ئێوە ڕزقیان دەدات و بەخێویان دەکات". ئەوجا دەگەڕایەوەو بە دەنگی بەرز دەیگوت: "بابە و دایە دەبێ بخۆن"(١). وای هەست دەکرد بە درێژایی تەمەنی ئەوەندەی ڕەنج لە پێناوی منداڵەکانیا داوە، کە چاوەڕوانی ئەوەیان لێبکرێت کە جەوری ئەو بکێشن و تا کۆتایی تەمەنی ڕێزیێ بگرن و چاویان لێی بێت و نەیەڵن هیچ کارێك بکات. بە منداڵەکانی دەگوت ئەمە بەشێکە لە یەکێتی و هاوبەستەگی خانەوادەیی. جا بە دەم چاوەڕوانی و خەیاڵی ئەو حاڵەوە، ئەو تەمەڵییەوە، خووی دابووە خواردنەوە و مەینۆشی. جا هەندێ شەو، کوختەکەیان دەبوو بە مەکۆی هەندێ لە برادەرانی بابیان. ئیدی قاپ لە دووی قاپ دەهات. قاپ بە قاپی دەگوت بەولاوە: ڤۆدکا و شەرابی قرم. ئیدی میوانەکان هەرکە سەریان گەرم دەبوو، بە شێوازی ڕووسی دەکەوتنە فەلسەفەڕێسی دەربارەی ژیان، جاویدانی ڕۆح و سەلماندنی بوونی خوا. ئەوجا بە کۆمەڵ سرروودی کلێساییان دەخوێند، و پاشان هەر کەسە، بە زمانی قورس و چاوی بە فرمێسکەوە ملی ڕێی خۆی دەگرت و دەڕۆیی.

ئانتون، کە کەسوکارەکەی بەو حاڵە بێ حاڵەوە بینی زۆری لەبەر گران بوو، بەڵام ئەمە کۆڵی پێنەدا، لە جاران مکوڕتر بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو تاقە کەسە کە بتوانێ بە کار و میهری خۆی ڕزگاریان بکات. براکانی کە خەڵکانێکی بەرەڵا و تەمەڵ و، سەرکێش و خۆسەربوون، ئەوە نەبوون کە لەم پڕۆژەیەدا، پڕۆژەی ژیانەوەی خانەوادەکەیاندا، پشتیان پێ ببەستێ. کەچی وێڕای ئەوەش، وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، گلەیی لێنەدەکرن. ئیدی وەکو خۆیان، مامەڵە لە تەکدا دەکردن و بەزەیی بە بەدبەختییاندا دەهاتەوە.

جا بۆ ئەوەی خەمی دڵ برەوێنێتەوە، دەگەڵ میخائیلی برا بچووکیدا دەچووە پیاسە و گەڕانی ناو مۆسکۆ. ڕێك بە پێچەوانەی کەسوکارەکەیەوە، کە داخیان بۆ تاگانرۆگ دەخوارد، بە دیتنی گەورە شاری مۆسکۆ دڵی دەکرایەوە. هەرچییەکی دەبینی بەلایەوە جوان و دڵگیر بوو: شەقامە قەرەباڵغ و پڕ هەرا و هەنگامەکانی، پیاوان بە جلوبەرگی مۆدی ئەوروپاییەوە، ئەفسەران و پایە بەرزان بە جلوبەرگی یەکچەشن و شیکەوە. خانمانی شیك پۆش، ژنە دێهاتیانی سەرپۆش لەسەر، مووجیکانی ڕدێنداری پۆستین پینەپیناوی، هاواری ئەو عارەبانچییانەی کە بانگی ڕێبوارانیان دەکرد و سەوای کرێکانیان دەگەڵ دەکردن، ڕووکاری ئەپارتمانی بە شکۆ، کە بە جۆرەها بۆیەی ناسك و جوان بۆیەکرابوون، جامخانەی کۆگا و موغازەێن کەمالیات فرۆشی... کە گەییە مەیدانی سوور، شیفتەی دیوارەکانی کرملین بوو، کە بە تەرتیبێکی سەیر، بورجی زەنگان و گومەز و خاچێن زێر کفت، لەو دیویەوە جیلوە فرۆشیان دەکرد. پاشان لە پێشەوەی مەیدانەکەدا چاوی بە کلێسای سانت باسیلوس کەوت، قەدەرێ لێی ڕاما، کلێسایەکی گەورەی بە نەخش و نیگار و دڵگیر بوو، دەتگووت کۆمەڵێك ئەسپاب و گەمەیە و لە قەراخ مێزێك هەڵچنراوە. لە بەردەم ڕووکاری بەشکۆی شانۆی بۆلشۆی دا، لە فکران ڕاچوو، دە خەیاڵەوە چوو. لەو شەقامە تەنگ و باریکانەی، کە بەرەو ڕوباری مۆسکۆ دادەکشان، ڕێگەی گوم کرد. تووشی ئامۆزاکەی بوو، هەمان میخائیل چیخۆڤ کە بە بەردەوامی نامەی بۆ دەنارد، بە خۆشحاڵییەوە، بۆی دەرکەوت کە مەزەندەکەی بە فیڕۆ نەچووبوو کە ئەو هەموو متمانەیەی پێ

کردبوو. میخائیل چیخۆف گەنجێکی خۆشڕەفتار، سەنگین و ڕۆشنبیر بوو. لای یەکێك لە بازرگانە گەورەکانی شار، خەریکی کارێك بوو کە خەریك بوو ڕەواج و ڕەونەقی پەیدا دەکرد. میخائیل زۆر دڵسۆزی ماڵی مامی بوو. چونکە دەیزانی ئانتونی ئامۆزای زۆری حەز لە شانۆیە، یەکسەر دەگەڵ خۆیدا بۆ شانۆی برد.

کاتێ ئانتون بۆ تاگانرۆگ گەڕایەوە، دوای ئەوەی هەوای گەورەی شاری مۆسکۆی هەڵمژی بوو، هەستی دەکرد، لە ئێستا بە دواوە ناتوانێ لە کەش و هەوای شارۆچکاندا، بە ئاسانی هەڵبکات. هەر جارێ کە بیری لە مۆسکۆ دەکردەوە سەری بە گێژەوە دەچوو. لە نامەیەکی ٤/ت١٨٧٧/٢دا بۆ میخائیلی ئامۆزای دەڵێت: "ماوەیەك لەمەو پێش چووم بۆ شانۆی تاگانرۆگ، دەگەڵ شانۆی مۆسکۆدا بەراوردم کرد. فەرقێکی یەجگار زۆریان هەیە. هەرکە خوێندنی جمنازم تەواو کرد، یەکسەر باڵ دەگرم و بەرەو مۆسکۆ لە شەقەی باڵ دەدەم. ئەو شارەم زۆر خۆش دەوێ". (بڕوانە نامەی ٤/ت١٨٧٧/٢). تەنیا یەك شت ڕێگەی نەدەدا کە لە پشووی هاویندا بۆ مۆسکۆ بگەڕێتەوە. لە تەنزێکی خەمناکدا باسی دەکات و دەڵێت: "پاشان وەزیری دارایی پێت دەڵێت بۆچی!" جا لە ترسی ئەوەی نەبا بە نامە سکاڵائامێزەکانی دەربارەی هەژاری و نەداری کەسوکارەکەی، کوڕە مامەکەی بێزار بکات، دڵنیای کرد کە بە جدی بیر لەوە دەکاتەوە کە لە ڕێگەی بازرگانییەوە سەروەت و سامانێك پێکەوە بنێت: "پێموایە دەبێ تا ماوەیەکی دیکەش تەحەمولی ئەم وەزعە بکەین، من دڵنیام وەکو چۆن دوو جاران دوو دەکاتە چوار، بەو ئاوایە دەوڵەمەند دەبم. گەورە دەبم، باڵا دەفڕێنم، سەرم لە بن میچان دەدات، هەنگێ نانی سپی و هەنگوینت دەرخوارد دەدەم، دەعوەتی باشترین شەرابت دەکەم، چونکە تۆ بە کردەوە ڕێز و خۆشەویستی خۆت دەرهەق بە ئێمە سەلماندووە و برایەتی خۆت نواندووە. بە ڕاستی بێ هیچ ڕووبینییەك وەکو برایەك دەیڵێم کە تۆ لە زۆر ڕووەوە پیاوێکی باشیت، پیاوێکی مەرد و ڕەندی ئومێدەوارم سەد دانە ساڵ بژیت". (بڕونە نامەی ١٨٧٧/٦/٩).

ئەم ئارەزووی بە بازرگان بوون و دەوڵەمەندبوونە، تەنیا ئەوەندە بڕی کرد تا لە نووسینی نامەکەی بووەوە. ئیدی بایدایەوە سەر خولیا پزیشکییەکەی. کە لە دەرس دەبووەوە، بە مەبەستی ئیسراحەت دەچوو بۆ گوندی "کارانتینە" کە کەوتبووە چەند کیلۆمەتری تاگانرۆگەوە بۆیە ناویان نابوو کارانتینە چونکە کاتی خۆی لە کۆنا بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەوە خەڵکی شارەکەیان چۆڵ کردبوو و پەنایان بردبووە ئەو گوندە چکۆڵەیە کە کەوتبووە سەر ڕەخی دەریا. جا هەنووکە چەند کۆشك و ڤیلایەکیان لێدروست کردبوو کە گەنجان لە وەرزی گەرمادا، خۆ بە خۆ بۆ ئەوێندەر دەچوون. جا ئانتون لەوێ لە هۆبەیەکی ئەستووندار‌دا کە لە ڕەخی ئاوەکە دروستکرابوو، دیدەنی هەندێ لە هاوپۆلەکانی خۆی دەبینی. ئەوانە زۆربەیان ڕمووەدەی سیاسەت بوون. هەندێك لەوانە نووسینە ئاشوب ئەنگێزەکانی (ئەلکساندەر هرزن)یان خوێندبووەوە و بە سەرامەدی ئازادیخوازانی ڕووسی سەدەی نۆزدەمیان دەزانی. ئەمانە هەموو گەنجی خوێن گەرم بوون. ڕەخنەیان لە ڕژێمی تزار ئەلکساندەری دووەم دەگرت و خەونیان بە سەرنگونی حکومەتی وەختەوە دەبینی. بە هۆی هەندێ لە ڕەوتە تیرۆرستییە تازەکانەوە، گەیی

بوونە قەناعەت کە شەپۆلێکی گشتگیری یاخی بوون بەڕێوەیە و زۆری پێناچێت کە سەرانسەری ڕووسیا دەگرێتەوە. خەباتی ئازادیخوازانە شتێکی ئاشکرابوو، مۆرك و شەقڵێکی توونـد و توڕەی لە خۆگرتبوو، ئانتون سەری دادەخست و گوێی دەگرت، بەشداری گفتوگۆ و گەنگەشانی نەدەکرد، بە پێچەوانەی هاوڕێکانییەوە، خۆی لە موناقەشە گرنگەکانی ئەو مەسەلانە نەدەدا کە پەیوەندییان بە دنیای خوێندنەکەی ئەوەوە نەبوو. هەموو کاتێك ئەو هەڵوێستەی هەڵدەبژارد کە لە ژیانا بینەر و تەماشاڤان بێت نەك ئەکتەر.

ئانتون، لەجیاتی گەنگەشە بێ ئاکامەکانی کارانتینە، زیاتر حەزی لە ڕۆژانی ئەو پشووانە بوو کە لەگەڵ کەسوکاری پیوتەر کرافستوڤی قوتابی خۆیدا، لە مەزراکەی ئەواندا بەسەری دەبرد، مەزراکەیان لە دەشتی دۆندا بوو. لەوێندەر شێوە ژیانێکی نزیك لە سروشتی دەبینی. شێوە ژیانێکی وەکو ئەوەی ماڵی بابە گەورەی، لە موڵکەکانی دۆتمیر پلاتوفدا، کە زۆری حەز لێدەکرد. سەرەتا لە هەنبەر ئەم دەشتە پان و بەرینە زەردباوەدا، هەستی بە ئازادی تەواو دەکرد. بەڵام لە کۆتاییدا دیمەنی چۆڵ و تا چاو بڕکات تەختانی و بێ هیچ جەنگەڵ و دار و درەخت و هەردە و هەڵەتێك، دڵی تەنگ دەکرد. بەڵام خۆشبەختانە دەیان سەرگەرمی لەم مەزرایەدا فەراهەم کرابوو. ئانتون بە گالیسکەکەی قوتابییەکەی ، پیوتەر کراڤستوڤ، فێری سواری و تیرەندازی و ڕاو بوو. سەگەکان، چونکە لە ماڵەوە نانیان نەدەدانێ، وەکو گورگی درەندە لە دووی نێچیر دەگەڕان. تەنانەت جۆرە دڕندایەتێك بەسەر کولانەی مریشکەکانیش دا زاڵ بوو، ئەگەر بۆ خواردن پێویست بە مریشکێك بوایە، لە دوورەوە بە تفەنگ نیشانەیان لێدەگرتەوە و دەیانکوشت. هەر بۆ مەشق، بۆ دەست ڕاهاتن ئەمەیان دەکرد. مەشق و ڕاهێنانێکی دیکەش هەبوو کە بریتی بوو لە ڕامکردنی ئەسپی چەمووش و سەرکێش. ئانتون، بە چاوی کراوەوە تەماشای دەکرد، بایەخی بە هەموو شتێك دەدا، ئەو وێنە و دیمەنانەی ژیانی لە هزریا عەممار دەکرد. چونکە بیری لە پیشەی ئەدەبیات دەکردەوە. دیارە ئەم بیرکردنەوەیە هێشتا بە تەواوەتی نەخەمڵی بوو، زیاتر لە پێناوی وەدەست هێنانی سووکە بژێویەك بوو. لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٧٧دا، چەند "شتێکی توڕەهاتی" بۆ برا گەورەکەی، ئەلکساندەر نارد، براکەی ئەو شتانەی پیشانی چەند بڵاڤۆکێکی ساتیری مۆسکۆ نیشان دا کە هەوڵەکانی بێهودە بوو. ساڵی دواتر شانۆنامەیەکی سووکەڵەی کۆمیدی بە ناونیشانی: "مریشك بۆچی دەگارێنێ"، هەروەها کومیدیایەکی ڕەخنەئامێز بە ناوی: "دیداری دەگەڵ حەریفەکەیدا کردووە"، هەروەها درامایەك بە ناونیشانی: "دون والد" کە باسی ئەسپ دزان، هێرشکردنە سەر قیتار و، ڕفاندنی کیژان دەکات. هەڵبەتە ڕەئی ئالکساندر، کە بە تەبیعەت کەسێکی درژ پەسند بوو، دەربارەی ئەم درامایە ئەمە بوو کە: "هەرچەندە زادەی نیازپاکیە، بەڵام بوختانێکی لە بەخشین نەهاتووە". بەڵام سەبارەت بە کۆمیدیاکە، بۆ کۆمەڵێك برادەر و دۆستی، کە یەکێك لەوان سولوڤییڤ-ی شانۆکار بوو، خوێندبووەوە، ئەلکساندر بۆ ئانتۆنی نووسی بوو، کە بۆچوونی گوێگرەکان بە قازانجی ئەو بووە: "شێواز و ستایلەکەی نایابە، کارەکە زیرەکی تیایە، هۆشیارانەیە، بەڵام ڕوانینی بۆ ژیان قووڵ نییە، بە ئاشکرا بێ

ئەزمەوەنی پێوە دیارە". "کێ دەزانێ(٢)" لەوانەیە بە تێپەڕبوونی ڕۆژ ببێ بە نووسەرێکی لە زەبر(٣)" ئەمە پێشبینی گوێگرەکان بوو.

بەڵام "نووسەری لەزەبر" لەو کاتانەدا سەرقاڵی ئەوە بوو کە خۆی بۆ تاقیکردنەوەی دەرسەکانی ئامادە بکات. دایکی لە ١٨٧٩/٢/٢٩دا لە نامەیەکدا بۆی نووسی: "خێرا دەرسەکانت تەواو بکە و وەرە بۆ ئێرە، بە تاسەوە چاوەڕوانت دەکەم. زۆرت بیر دەکەم، ئەگەر ڕێزی منت لەلایە بچۆرە قوتابخانەی پزیشکی. پزیشکی باشترین پیشەیە. ئەگەر تۆ ئیشکەر بیت، هەمیشە لە مۆسکۆدا کار پەیدا دەبێت، پێموایە ئەگەر تۆ بێی بۆ ئێرە، من وەزعم باشتر دەبێ[٧]".

دوای چوار مانگان، تاقیکردنەوەی کۆتایی ئانتون دەستی پێکرد. تاقیکردنەوەی یەکەمی زمانی ڕووسی بوو. بابەتەکەی بریتی بوو لە: "هیچ بەڵایەك لە ئاژاوە و ئاشوب خراپتر نییە". ئانتون، بە ماوەی سێ سەعاتان، بە دوورودرێژی ڕاوبۆچوونی خۆی لەمەڕ ئەو بابەتە هەستیارە نووسی. ئەنجامەکەی باشبوو: چوار لە پێنجی وەرگرت. نمرەی بابەتەکانی دیکەشی بە گوێرەی هەوڵ و کۆششی خۆی باشبوو. ئیدی شادەتنامەی دبلۆمی وەرگرت، کە زۆر کەس خۆزگەیان پێدەخواست و، مۆر و نیشانەی داڵی ئیمپراتۆڕی پێوە بوو: "ئاکار: بەرز، ڕەچاوکردنی کات و دیقەت: زۆرباش، کۆشش: زۆرباش، کاری نووسین: زۆر باش".

لە ڕادەبەدەر شاد و دڵخۆش بوو وێڕای هەموو ئەو یادگارییانەی کە بە تاگانروگیانەوە دەبەست، خواخوای بوو بە زووترین کات لەو شارە ناخۆش و تاقەتبەوە بڕوات. شەیدا و دڵبەندی مۆسکۆ و جوانییەکانی مۆسکۆ بووبوو. دەبێ بە خوێندکار، دەخوێنێتەوە، دەنووسێت، دۆست و هاوڕێی تازە دەگرێت، دەچێتە شانۆیان. تاقە شتێك کە ئەم دیمەنەی لێڵ دەکرد: زەبر و زەنگی باوکی بوو. بەڵام گرنگ نییە، دەگەڵ ئەوەشا ڕادێت. ژیانی تەنیایی تاگانرۆگ، فێری حیکمەت و ئەزموونێکی گەورەتر لە تەمەنی خۆیی کردبوو. یانی تەواو پوختە بووبوو. کەسێك بوو جدی و گۆشەگیر، خاکی و بێ فیز، منەوەر، سوور بوو لەسەر پاراستنی ئازادی بیرو کرداری خۆی. "مۆسکۆ! مۆسکۆ! مۆسکۆ!" ئەمە بانگ و گازی ئومێد و هیوایەك بوو، کە بەرلەوەی بیخاتە سەر زاری قارەمانانی شانۆنامەی "سێ خوشك"، بە خۆی، بەر لەوەی تاگانرۆکی زاگەی خۆی بەجێ بێڵێ دەیان جار دووبارەی کردبووەوە و ئاواتی پێ خواستبوو! پاش ئەوەی لە هەموو تاقیکردنەوەکانیشی بووەوە، ناچاربوو بەشێك لە پشووی هاوێنەکە لە تاگانرۆك بەسەربەرێت، تا معامەلەی ئەو بۆرسی خوێندنە بکات کە شارەوانی دەیدا بەو کەسانەی درێژەیان بە خوێندن دەدا، بڕی بۆرسەکە (منحە) مانگی بیست و پێنج ڕۆبڵ بوو. هەروەها ئانتون، توانی قەناعەت بە دوو هاوپۆلی خۆی بکات، ساڤلییڤ زامبولاتوڤ. کە ئەوانیش حەزیان دەکرد بچنە بەشی پزیشکی لە مۆسکۆ، کە بۆ جێگە و نانخواردن لای دایکی ئاکنجی بن، بە وەعد و بەڵێنی "دەستاوی خۆش و بەتام".

ئەنجام، پاش ئەوەی هەموو کار و بارەکانی جێبەجێ کرد. لە ١٨٧٩/٨/٦دا دەگەڵ هەردوو هاوڕێکەیدا، سواری ڤیتار بوو و، مۆسکۆ خۆت بگرە وا هاتم. ئەم زانیارییانەی خوارەوە لەو

ڕوخسەتنامە فەرمییەدا تۆمار کرابوو کە شارەوانی دابووی بە ئانتون و دەیدا بە هەر ڕووسییەکی دیکە کە شوێنی دانیشتنی خۆی بگۆڕیبایە: " تەمەن: نۆزدەسالّ، بالّا: دوو ئارشین(٤) و نۆ ڤرشۆك(٥) دەکاتە نزیکەی ١٨١سم، قژ و برۆ: قاوەیی کالّ، چاو: قاوەیی، لووت و دەم و چەناگە:مامناوەندی، دەموچاو: درێژکۆلە، ڕەنگی ڕووخسار: سپیکەلە، نیشانەی تایبەتی: جیّ برینێك لەسەر تەوێلی لەژێر قژییەوە".

کاتیّ ئانتۆن گەییە مۆسکۆ، گالیسکەیەکی بە کریّ گرت و ئەدرەسی تازە کەسوکارەکەی دا بە عەرەبانچییەکە. برادەرەکانی، واتە ساڤلییێڤ و زامبولاتوڤ، دەبوایە دەرفەتی بدەن کە جاریّ ماوەیەك بە کەسوکارەکەی شاد و شوکر بێتەوە و پاشان پەیوەندی پێوە بکەن. هەرکە لە بەر مالّی خۆیاندا، لە گالیسکەکە دابەزی، ڕووبە ڕووی میخائیلی برای بووەوە کە لەبەر دەرگادا خۆی دابووە هەتاو. ئانتون بە ڕادەیەك گۆڕابوو، کە میخائیل لە هەوەڵەوە نەیناسییەوە. لە زەرفی دووسالّدا بوو بوو بە گەنجێکی گۆنا گۆشتنی بالّا بەرزی، باریکەلەی، سیما جوانی، ڕەنگ کالّ. دەستێك جلی کۆنەی تەسکی لەبەردابوو، شەپقەیەکی خڕی لەسەرنابوو کە زۆر بەسەری بچووك بوو. قژی درێژ بوو. سمێڵی تازە بۆر کردبووەوە. بە نیگای قوولّ و ئارامی لە مەسیح دەچوو، بەلّام مەسیحێك بە زەردەخەنەیەکی گالّتەئامێزەوە. گالّتەی بە کیّ دەکرد؟ بە خۆی یان بە خەلّکی دی؟ ئانتون، بە دەنگێکی بەرز بەلّام نەرم گوتی: "میخائیل پاڤلۆڤیچ چۆنی؟" ئەوجا میخائیل براکەی ناسییەوە، بە خۆشییەوە هاواری کرد: "ئانتون، ئەمە تۆی!" و بە لەز خۆی بە ژوورا کرد.

هەر هەموو خێزانەکە بەسەر ئەم ڕێبوارەدا دابارین و بە دیتنی ئەو ڕوندکی شادی لە چاوانیان هاتە خواریّ. دوای چاك و چۆنی و لە هەمێزگرتن و ڕامۆسان و هات و هاواری شادی و خاچ کێشان لە بەردەم ئیکۆنەکاندا، هەنگیّ یۆگنیا یاکوڤلێڤنای دایکیان میخائیلی نارد تا بروسکەیەك بۆ بابیان بکات، کە لەوبەری ڕووباردا، لە کۆگا و عەمماری کابرایەکی دەولّەمەندی بەزازدا بە نێوی گاڤریلوف، ئیشی کاتبی دەکرد. پارەی بروسکەی ناوخۆ، هەر وشەیەکی بە یەك کوپیك بوو. دوای تۆزێك لە گەلّ گەیشتنەوەی پاول یگوروفیچ دا، خێڵی چیخۆف، هەموو جارێکی دی پێك شاد و شوکر بوونەوە. هەروەها خوشکەکەی یوگینا یاکوڤلێڤنا، پورە ڤیدوسیای نەرمەژنیش لەویّ بوو، دەگەلّ ئەواندا دەژیا، ئەم ئافرەتە هەمیشە لە ئاگر کەوتنەوەیەکی ناگەهانی دەترسا، بۆیە لە کاتی خەوتنیشا پێلّاوە لاسیکەکانی دانەدەکەند. ئەوسا سەرو کەللەی دوو کرێچییە تازەکە پەیدابوو: زامبولاتۆڤ، کورتە بالّایەکی گۆشتنی خەپەتۆلّە بوو، زیاتر بیری لەوە دەکردەوە کە ژنێکی دەولّەمەند بێنیّ و لە سایەی ئەودا بژی، تا بیر لە ئایندە بکاتەوە و بە ڕەنج و هەولّ و کۆششی خۆی بژی. ساڤلییێڤ، کوڕێکی هێمنی سەنگینی خۆش سیما بوو. هەر هەموو لەژێر میچە کەوانەییەکەدا بە دەم قسانەوە پێدەکەنین. بەم بۆنەیەوە دەستیان بە شەراب و ڤۆدکا خواردنەوە کرد. پاشان پاول یگورفیچ پەیتا پەیتا نموونەی ئایەتێن تەوراتی بەگەلّ قسەکانی دەخست. کاتیّ کە لەسەر خوانی ئەم ئاهەنگە دانیشتن و کۆبوونەوە

هەمووان هێندە بە کەیف و دەماخ بوون، کە ئانتون، دوای چەند پێکێك لە بیری چوو کە لەم ژیانە تازەیەیدا، چ کێشە و گرفتێك لە کەمین دایە بۆی.

پەڕاوێز:

١- (بابە و دایە دەبێ بخۆن): چیخۆف زۆرجار لە نامەکانیا ئەو دەستەواژە باب سالاریەی بە تەوسەوە دووبارە دەکردەوە.

٢- (کێ دەزانێ؟): ئەمە لە دەقەکەدا بە فەڕەنسییە.

٣- دەستنووسی بەرهەمەکانی سەردەمی لاوی هیچیان نەماون، هەموو فەوتاون.

٤- ئارشین: پێوانەیەکی ڕووسییە، یەکسانە بە ٧١سم.

٥- ڤرشوك: پێوانەیەکی ڕووسییە، کەمێك لە ٤سم زیاترە، یانی بەم پێیە باڵای چیخۆف نزیکەی ١٨٠سم بووە.

((٤))

## ڕابەری تازەی ماڵباتەکە

هەرکـە شـادی و خۆشـی ڕۆژانـی هـەوەڵ بەسەرچـوون، ئیـدی ئـانتون، بـە خـەمینی کەوتـە دیقەتدانی ئەو شوینانەی کە دەبوا تیایا بژی. ماڵباتی چیخۆف، لەوساوە کە تاگانرۆگیان بەجێ هێشتبوو ئەمە دوازدەمین جاریان بوو کە بە ناچاری بۆ ئەم شوقەیە بار بکەن. ئێستا ماڵیان لە شەقامی گراشوڤکا، لە گەڕەکی ناوزڕاوان! لەژێر زەمینێکی سەر بە کڵێسای سان نیکولاوس بوو. لەم ئەشکەوتە تاریکەدا هەمیشە جلی نیمچەتەڕ بە تەنافەوە بوو. پیاو نەیدەتوانی لە دەلاقە و پەنجەرە تەنگەکانەوە جگە لە پێی ڕێبواران هیچ شتێکی دیکە بدینێ. پیاو کە دەچووە دەرەوە، ڕووبە ڕووی دیمەنی وێرانە و دوکانانی چکۆلە و پیس و ژنانی لەشفرۆش دەبووەوە کە بە تەمەڵی بە کوچە و کۆڵانەکاندا ڕێیان دەکرد. هەموو شتێك هەژاری و گەندەڵی لێدەباری. بەڵام ئەم گەڕەکە چ تەماشاگەیك بوو بۆ ئەو پیاوە ئازاردیدەیەی کە دەبوایە ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئازارێن تیرەی بەشەر وێنەبگرێت.

دە دانە کەس لەم شکەفتە بەد هەوایەدا دەژیان. خوێندکارێکی دیکەش بە ناوی کوروبوف (ناسك عەینی کچ) ئەویش تەقدیمی کۆلێژی پزیشکی کردبوو خۆبە خۆ هاتبووە دەف دوو کرێچییەکەی دیکە. پاول یگوروفیچ، حاڵی حازر لەو بەری شار، لای خاوەن کارەکەی دادەنیشت. تەنیا یەك شەمموان بۆ ماڵ دەهاتەوە. کرێکەی کەم بوو، مانگی سێ ڕۆبڵی وەردەگرت، بۆیە بەشدارییەکی کەمی لە مەسرەف و خەرجی خێزانەکەدا دەکرد، ئەلکساندرش، وەکو بابی لە دەرێی ماڵەکە دەژیا. توانا و بەهرەیەکی باشی هەبوو، دەم دەمی مجێز و تەبیعەت، بەرزەفڕ، خەیاڵباز، فشەکەر، دوودڵ و ڕۆشنبیر بوو. بابەتی بۆ گۆڤاران دەنووسی، بەڵام ناو و ناوبانگێکی ئەوتۆی پەیدا نەکرد. بۆیە ناکامی و نائومێدییەکانی خۆی بە مەی مینۆشی فەرامۆش دەکرد. نیکولای کوڕێکی لەشبەباری دەست بڵاوبوو، هەم لە بواری مۆسیقا و هەم لە بواری نیگارکێشیدا، زۆر بەهرەدار بوو، بەڵام ئەویش قەدری ئەو بەهرانەی خۆی نەدەزانی، بەرەبەرە، ئەو توانا و بەهرەیەی لە نێوان سستی و مەستیدا، کە ئالوودە بوو بوو و ڕۆژ بە ڕۆژ وەزعی خراتردەبوو، لە دەست دا. بە دەگمەن بەر لە نیوەڕۆ لە خەو ڕادەبوو، کە لە خەویش هەڵدەستا، بیری دەچوو دەست و دەموچاوی بشوات. بەڵام ناوبە ناو تابلۆیەکی دەفرۆشت و لەڕێگەی وتنەوەی دەرسی نیگارکێشیەوە پارەو پولێکی کەمی بە دەست دێنا. بەڵام ئیڤان کە خۆی بۆ فێرکاری ئامادە دەکرد، بە پێچەوانەی دوو برا گەورەکەیەوە، گەنجێك بوو کەمدوو، کۆشیار، کەم هۆش، بێ هیچ خەون و خەیاڵ و ئارەزوویەك. ئانتون، هەموو جارێ بە تەوسەوە دەربارەی ئەو دەیگوت: "یەکێکە لە ئەندامە هەرە پەسند و توندوتۆڵەکانی خێزانەکەمان". ئانتون، بە ئاشکرا میخائیلی زیتەڵ و بزێوی خۆشتر دەویست. ماریاش بە گیانی کارا و، هەستیاری و ئاقڵی خۆی خۆشەویستی و سەرنجی ئانتونی بۆ خۆی ڕاکێشا بوو. ئانتون بڕیاری دا، بە هەر نرخێ بووە ماریا و میخائیل درێژە بە خوێندنی خۆیان بدەن. بڕیاری لەمەش باشتری

ئەوەبوو: کە لە جیاتی چاو لە ئەلکساندری برا گەورەی بکات و خۆی لە وەزع و حاڵی نالەباری خانەوادەکەیان بدزێتەوە و بچێ بە تەنیا بژی، باشترین کار ئەوەیە کە جێگای براکەی بگرێتەوە و خۆی بکات بە شەریکی هەموو ماڵوێرانی و هەژاریەکی خانەوادەکەیان و لە وێوە هەوڵی ڕزگارکردنیان بدات. پێی وابوو کە ئەو مینحە بیست و پێنج ڕۆبڵیەی کە بۆ خوێندنەکەی وەری دەگرت، لە گەڵ ئەو شەست ڕۆبڵەی لە هەرسێ کرێچییەکەیان وەردەگرت، لە گەڵ بەشداری باوکیاو ئەو چەند کۆپیکەی لەم لاو لەولاوە دەست دەکەوت، ئەگەر بە ڕێکوپێکی خەرجی ماڵەکە بکرێت، بەشی بژێوی خانەوادەکەیانی دەکرد. ئیدی لە غیابی باوکیانا، کە ناو بە ناو دەهاتەوە، دایکیان کە دەوری کارەکەری ماڵەکەی دەبینی، توانای ئەوەی نەبوو جڵەوی بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵەکە بگرێتە دەست. ئیدی ئانتون بەوپەڕی تواناو خوێنساردییەوە، ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆی خۆی.

پاول یگورفیچ، ئەمەی زۆر لە بەر گران بوو، هەستی دەکرد ئەم کوڕە بوێرە، ماڤی سەرگەڤاری ئەوی داگیر کردبوو. تەنانەت کە هەفتە و هەفتە بۆ ماڵ دەهاتەوە، لە هیچ بڕیار و قەرارێکی پێویستدا شیرەت و ڕاوێژی پێنەدەکرا. لە هەوەڵەوە زۆری لەلا ناخۆش بوو، بەڵام ئەنجام ملی بۆ ئەم حاڵە دا، بە تایبەتی کە ئەنتۆن زۆر بەڕێز و حورمەتەوە ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد.

بەمجۆرە لە سایەی ڕابەریی سەرگەڤاری تازەی نۆزدە ساڵەی خێزانەکەدا، کە هەم بە دیسپلین و هەم میهرەبان بوو، هەماجی ماڵەکە، تۆ بڵێ کوختەکە تەواو گۆڕا. نە لیست و پڕۆگرامی ڕێنمایی قەد دیوار، نەسزای بەدەنی، نە هات و هاواری هیستریایی نەمان. ئانتون کە هەمیشە ئیقناعی بەسەر هەڕەشەدا پەسند دەدا، بە ڕەفتار ئەوانی تری ئامۆژگاری دەکرد. هەر بۆ هاندانی خوشك و براکانی ڕایگەیاند کە ئەو هەفتەی یەك ڕۆژ کاروباری ماڵەکە بەڕێوە دەبات و با براکانی و خوشکەکەیشی بە نۆرە لە ڕۆژەکانی تری هەفتەدا کاروباری ماڵ بەڕێوە ببەن.

ئانتۆن، بە نەرمی میخائیلی گەنجی، کە بە ئاساتی نەدەهاتە سەر خەت، ئامۆژگاری کرد، کە جلوبەرگی ڕیکوپێك لەبەر بکات، درۆ نەکات، لە هەموو کات و شوێنێکا بە ئینساف بێ. بەرەبەرە ئارامی و نەرم ونۆڵی ئانتون، کاری لە هەمووان کرد، تە نانەت کاری لەوانەش کرد کە لە هەوڵەوە لێی بە گومان بوون. ئەلکساندەر بە سوعبەتەوە ناوی نا "پاپا ئەنتۆشا". "ئانتون چ دەڵێ؟"، "ڕای ئانتون چییە؟" هەر کاتێك کێشە و گرفتێك بۆ خانەوادەکەیان هاتبا پێشێ. ئەو پرسیارە تەقلیدیانەیان دەکرد. هەموو هەوڵێکی ئانتون بۆ ئەوە بوو کە بێگەردی و دروستی ئەخلاقی و گیانی کۆشیاری بۆ کەسوکارەکەی بگەڕێنێتەوە. لە کاتێکا کە خۆی ئامادە دەکرد بۆ خوێندنی قورس و درێژخایەنی پزیشکی، بیری لەوە دەکردەوە، ڕێگەیەك بدۆزێتەوە کە بتوانێ کرێی خوێندنی برا بچووکەکانی و خوشکەکەی دابین بکات، زۆرترین سوود لە بەهرە و توانای ئەلکساندەر و نیکولای وەربگرێت و بەهرەکانیان ببوژێنێتەوە، باوکی لە کارێن سووك ڕزگار بکات، باری قورسی کاروباری ماڵ، لە سەرشانی دایکی سووك بکات. لە پێناوی دەرهێنانەوەی کەسوکارەکەی لەو زەڵکاوەی تێی کەوتبوون، هیچ فیداکارییەکی بە لاوە گەورە و زەحمەت نەبوو. لەو پێناوەشدا سڵی لە هیچ فیداکارییەك نە دەکردەوە. مانگێك بوو گەیی بووە مۆسکۆ،

کارێکی وای کرد کە ماڵباتەکەیان بۆ سیازدەیەمین جار باربکەن و ماڵ بگوازنەوە.ئیدی ماڵباتی چیخۆف، شڕە وپڕەیان پێچایەوە و ژێر زەمینە تاریك و شێدارەکەیان بۆ خانوویەکی دیکە، لە هەمان گەڕەکی ناوزڕاو گواستەوە، بەڵام ئەم شوقەیە گەورەتر و لە قاتی دووەما بوو. ئانتون لەگەڵ میخائیل و نیکولایدا ژوورێکی هاوبەشیان هەبوو. ئەمە یەکەم هەنگاو بوو بەرەو ڕوناکی، میخائیل چەندین ساڵ لەوەدوا، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ئەگەر ئانتون، لە کاتی خۆیدا فریا نەکەوتبا و لە تاگانروگەوە نەهاتباوە، کەس نەیدەزانی چی بەسەر خانەوادەکەماندا دەهات؟ یەکێتی و تەباییەکی دڵسۆزانە لە نێوان هەمووماندا چێ بووبوو کە تەوەرەکەی ئانتون بوو".

بە ڕاستی لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، وەزعەکە باش بوو: میخائیل و ماری کە دەمێك بوو بێ هودە لە ماڵەوە دەسوڕانەوە، ڕێگەی خۆیان گرتەبەر، یەکەمیان بەرەو قوتابخانەی دواناوەندی و دووەمیان بەرەو ئەنستیتۆی کچانی رایڤسکی. ئیڤانیش گەڕایەوە بۆ خانەی ماموستایان. ئانتونش چوو بۆ زانستگەی مۆسکۆ و خۆی لە ساڵی یەکەمی کۆلێژی پزیشکی ناونووس کرد.

ئانتون لە خەیاڵی خۆیدا، وای وێناکردبوو کە زانستگە، جۆرە پەرستگایەکی گریگییە و هەتاوی زانست و زانیاری گەرم و ڕوناکی دەکاتەوە. بەڵام کە بینی بریتییە لە کۆمەڵێك بینای تاریك و ناشرین و وێرانە، زۆری بەلاوە سەیر و باوەڕ نەکردەنی بوو. ژووری ناونووسی کە ژوورێکی نزم بوو، پڕبوو لە خوێندکارانی قژ درێژی، جلوبەرگ ناڕێکوپێك کە بەدەم کێشانی تووتنی هەرزان و خراپەوە، بە دەنگی بەرز گەنگەشە و موناقەشەیان دەکرد. ئانتون، کە حەزی لە بێ نەزمی و بی ئەدەبی نەدەکرد. ئارەزووی دۆستایەتیانی نەکرد. کە چووە دەرسەکانی سەرەتاوە هێندەی دی تووشی نائومێدی بوو. ئەوەتا پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ڕێك وەکو قوتابیانی سەرەتایی واین، هەرچییەك لەبەر دەکەین دەیڵێینەوە و پاشان بە زووترین کات لە بیری دەکەین". بەڵام وێڕای ئەم نائومێدییەش، زۆر مکوڕ بوو لەسەر دەرس و دەور و دەوامی خۆی. دەرس و دەور و مەشقی پراکتیکی ناو تاقیگەکان، خوێندکارانی لە بەیانییەوە تا سەعات سێی پاش نیوەڕۆ مژوول دەکرد. زۆربەی ماموستاکان، زانای بە ناوبانگ بوون. ئانتون، کە گوێی لەوان دەگرت، ئەوجا ڕادەی نەزانی خۆی بۆ دەردەکەوت. لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە، تۆ بڵێی ڕۆژێ لە ڕۆژان زانستێکی ئەوتۆ پەیدا بکات، کە بتوانێ مومارەسەی پیشە دڵخواز و هەڵبژاردەکەی خۆی بکات! هەرچەندە لە سەرەتاوە دڵبەند و شەیفتەی ڕۆڵی خێرخوازانە و مرۆڤدۆستانەی دکتۆران بوو، بەڵام خەونی بەو ڕێز و حورمەت و پێگەیەشەوە دەبینی کە ئەو پیشەیە بۆ خاوەنەکەی دابینی دەکرد. ئیدی ناچار نەدەبوو بۆ کرێی خانوو یان کڕینی جووتێ پێڵاوی نیو داشت پەنا وەبەر کارێن سووك بەرێت. یان شەرم لە هەژاری و نەداری خێزانەکەیان بکات. خەونی بە خانوویەکی سەر جادەوە دەبینی! هەڵبەتە خوێندکارەکانی هاوڕێشی، خەویان بە سەرکەوتنی ئایندەی خۆیانەوە دەبینی، چاویان لە سەرکەوتن بوو، بەڵام لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە سیاسەتی سەرکوتکارانەی تزار، تۆڵەی وەزعی نالەبار و پەڕاوێزیی ئێستای خۆیان دەکردەوە. لە کۆڕ و کۆبوونەوانەندا، لە گازینۆ و چاخانەندا، قسانیان دەکرد، نەخشە و پیلانیان دادەڕشت، وتار و نامیلکەی ڕەخنەییان بڵاودەکردەوە. ئانتون، لێرەشدا،

وەکو ئامادەیی تاگانرۆگ، بەشداری ئەو خوێنگەرم و هەڵەشانەی نە دەکرد. ئانتون، کەسێك بوو لێهاتوو و نەرمەپیاو، بەڵام برێك سڵ و گۆشەگیر، بۆیە هاتبووە زانستگە، تا ببێ بە دکتۆر و دەرمانی ناخۆشان بکات. نەك کودەتا بکات و ڕژێم بگۆڕێ. باوەڕی وابوو پیاو ناتوانێ لە هەمان کاتدا هەم پزیشك و هەم شۆڕگێر بێت. ئەمە جگە لەوەی هەڵچوون و جۆش و خرۆشی خوێندکارانی بەبێهوودە و نمایشی دەزانی. بە تەبیعەت ڕقی لە ئاژاوە و خۆ نواندن بوو. هەروەها حەزی لە پەرچەکرداری ساویلکانەی دەستەجەمی نەبوو، کە بەلای ئەوەوە بیری ڕەخنەگرانەی تاك لە هەرا و هەنگامەی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا کاڵ دەبووەوە و ون دەبوو. لەوە تاکگەراتر بوو، ڕادەستی هیچ گوشارێکی دەستەبازی ببێت، داشداری لە هیچ کەسێك نەدەکرد، خۆی لە ئیمزای هەر بەیاننامەیەکی سیاسی دوور دەگرت. کاتێ کە لە ۱۸۸۱/۳/۱دا تزار ئەلکسەندری دووەم کوژرا، بە بۆمبای کەسێکی تیرۆریست پارچە پارچە کرا. ئانتون، کە بە تەبیعەت دژی تیرۆر بوو، ئەمەی پێ سەیر بوو، هەرچی دەکرد، نەیدەزانی بۆچی ئەم گروپە توودڕەوە کوشتنی ئەو پاشا لیبڕاڵەیان بە پێویست زانی بوو، لە کاتێکا ئەو کۆیلەی زەوی ئازاد کرد، ئەو سیستەمی دەستەی سوێندخوارانی هێنایە ناو دادگاکان. ئەو سزای جەستەیی لابرد، بەڵێنی یەکەمین دەستووری وڵاتی ڕووسیای بە هاوڵاتیانی ڕووس دا. هەڵبەتە ئەگەر مەبەستی شۆڕشگێرەکان لە نێوبردنی ڕەمزی ئیمپڕاتۆریش بووبێ، ئەوا ئەو مەبەستەیان نە هاتەدی. چونکە جێگرەکەی تزار ئەلکسندری سێیەمی کوڕی یەکسەر سیاسەتێکی سەرکوتکارانەی تەواو عەیاری گرتەبەر. پڕۆژەی دەستووری وڵاتی لابرد، ڕاوەدوونان و گرتن زیادی کرد، بکوژانی تزار ئیعدام کران، سانسۆر زیادی کرد، چاودێری خوێندکاران لەلایەن پۆلیسەوە توندتر بوو. کەچی دوای ماوەیەکی کەم و دەگەڵ هێوربوونەوەی وەزعەکەدا، هاوڕێکانی ئانتوون سەر لە نوێ دەستیان بە ناڕەزایی خۆ دژی دەوڵەت کردەوە. ئانتون، هەرچەندە دەیویست لە نیازی ئەوانە تێ بگات، بەڵام کەم و زۆر خۆی شێلو نەکرد و ورتەی لێوە نەهات. ئەوەتا یەکێك لە هاوڕێکانی بە نێوی ناردین، لە بارەیەوە دەنووسێت و دەڵێت: "ئانتون، تێکەڵاوی کۆڕ و کۆبوونەوەی هەشتایەکان نەدەبوو، لاڤرۆڤ، میخائیلوڤسکی و، باکۆنینی بە جدی نەدەخوێندەوە، بەشداری ئەو گەنگەشانەی نەدەکرد، کە دەربارەی چالاکی ڕادیکاڵی لە ڕووسیادا دەکران. کەسێکی داخراوی، تەریك بوو". برادەرێکی دیکەی بە ناوی ڕووسولیمو وە لە یاداشتەکانی خۆیدا دەنووسێت: "هەرچەندە چیخۆڤ جارجارێك بەشداری لە گردبوونەوەکانی زانستگەدا دەکرد، بەڵام تەنیا وەك تەماشاڤان بەشداری دەکرد و ئامادە دەبوو. لە دووەمین ساڵی خوێندنماندا، لە ساڵی ۱۸۸۰–۱۸۸۱دا پێش سەرهەڵدانی پەشێوییەکانی یەکی ئازار کە (کوشتنی ئەلکسندری دووەمی لێکەوتەوە) لە ڕیزی ئەو خوێندکارانەدا وەستا کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بێ موبالاتەکانەوە نەبوو و بە هیچ جۆرێ بە شۆڕشگێڕانی چالاك نەدەژمێرران". ئانتون، لە کلۆڵی و کوێرەوەری بێنەوایان، بێئاگا نەبوو، بە پێچەوانەوە لە ڕادەبەدەر بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە و هاوسۆز بوو دەگەڵیاندا. بەڵام هەستی دەکرد کە خەڵکی ڕووسیا پێویستە بەر لە بێزاری و هەر گلەییەك، بە هەوڵ و کۆشش بە کار و کردەوە، وەزع و حاڵی نالەباری خۆیان بگۆڕن. قەناعەتی وابوو کە لە

ڕێگەی خوێنەواری و ویستی تاکەوە، پێشکەوتنی کۆمەڵ بەدی دێت. خوێندنی پزیشکی هێندەی دیکە باوەڕ و قەناعەتی بە هێزی کەماڵبەخشی زانست، پتەوتر دەکرد.

بۆ پارە، بەردەوام چیرۆکانی بۆ گۆڤاری جۆراوجۆری کۆمیك دەنارد، جا ئەم چیرۆکانە لەسەر داوای سەرنووسەرانی ئەو بڵاڤۆکانە، دەبوایە کورت و کۆمیدی بن. برینی بن لە حیکایەت و سکێچان، دەربارەی خەڵکانی کەودەن، گەپچاڕ، مێردی گێل و خەڵەتێنراو، ژنانی سەرشێت، فەرمانبەرانی بەرتیل خۆر، بازرگانانی دەغەڵباز، ئەفسەرانی سەرخۆش، دکتۆرانی ددانی هیچ نەزان، قەیرەکچانی چروساوە. ئیدی ئانتون بە ڕێنمایی ئەلکساندری برای پابەندی ئەو جۆرە بابەتە بوو. پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو دەقانەی کە دەیناردن، ڕەفزکران، ڕۆژێك لە گۆڤاری هەفتانەی "سیسرکە" لە بەرواری ١٣/ك٢/١٨٨٠دا، لە پۆستەی خوێندەوارانـدا، لە وەڵامی نووسەرانی تازەکاردا، ئەم پەیامەی دەبارەی خۆی خوێندەوە: "خراپ نییە، ئەوەی ناردووتە بڵاوی دەکەینەوە، هیواداریـن بەرهەمی ئایندەت باشتر بێت". زۆری پێنەچوو کە لە نووسینگەی هەمان گۆڤارەوە نامەیەکی پێگەیی، ئاگاداریان کردبوو کە لەبری هەر دێرێك(١) پێنج کۆپیکی دەدەنێ. بەڵام دەبووایە دوو دانە مانگ چاوەڕوان بکات، تا چیرۆکی (نامەیەك لە ستیڤان فلادیمیروفیچ.ن، خاوەنی دۆنەوە بۆ دراوسێ زاناکەی دکتۆر فریدریك) بە خەتی درشت لە ڕۆژنامەدا بڵاوببێتەوە. چیرۆکەکە ناوی پێوە نەبوو، تەنیا پیتی (ڤ) لێدرابوو. ئانتون هیچ جۆرە بەرزەفڕییەکی ئەدەبی نەبوو. ئەوەی کە بەلایەوە گرنگ بوو ئەوەبوو کە بە ئاسانی بڕێك پارە، لە ڕێگەی قەڵەمەوە بە دەست بێنێ. ئەندامانی خێزانەکە، بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنەوە لە دەوری کێکێکی گەورە کە بە یەکەمین دەرامەتی چیرۆکەکە کڕییان، کۆبوونەوە و ئاهەنگێان گێڕا. هەڵبەتە ئانتون، لەو کاتەدا، کە تەمەنی بیست ساڵ بوو و، خەونی بەوەوە دەبینی ببێ بە پزیشك، لەو باوەڕەدا نەبوو کە پیشەی ڕاستەقینەی ئەو لەم ڕووداوەوە دەستی پێکردبوو.

ئەم سەرەتا خۆشە، کردیە کارێك، کە زۆربەی کاتی ئازاد و دەست بە تاڵی خۆی بۆ نووسین تەرخان بکات. هەڵبەتە دەبوایە لەم چیرۆکانەدا، ڕەزامەندی سەرنووسەر ڕەچاو بکرێت. جا چونکە ئەم دەقە بە زەرووڕەت کورتانە و لە هەمان کاتدا کۆمیدیانە، پاداشتیان کەم بوو، بۆیە ناچار بوو چیرۆکی زۆر بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی لە کۆتایی مانگدا ئەوەندەی پارە دەست بکەوێ کە خانەوادەکەیان کەلەبەرێکی پێبگرن. ئانتون لێکدا لێکدا چیرۆکی بۆ "سیسرکە" دەنارد وبە تاسەوە چاوەڕوانی وەڵامی دەکرد. لە ساڵی ١٨٨٠دا نۆ چیرۆکیان بۆ بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٨٨١دا سیانزە و تا ساڵی ١٨٨٣ ژمارەی بەرهەمە بڵاوکراوەکانی، لە چیرۆك و گوتار و ڕیپۆرتاج گەیینە سەدوبیست و نۆ نووسین. نووسینی زۆر خۆش لەبەر دەڕۆیی، لەزەتی لە بە هرەی خۆی دەبینی، بەڵام هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەم "هەلەق و مەلەقانە" بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بڵاوبکاتەوە. چەندین ناوی خوازراوی بەکار دەبرد، لەوانە: "پیاوی بێ زراو، برای برام، ئولیس، ئانتوشا" و زۆرجاریش: "ئانتوشا چیخۆنتی" بەکار دەبرد، ئەمە ئەو نازناوە بوو کە بە منداڵی، پاپا پوکروفیسکی مامۆستای مێژووی ئاین، لێی نابوو. وێڕای ئەوەش "سیسرکە" هەندێجار غەدری لەم نووسەرە گەنجەی خۆی دەکرد، گەلێك لە

دەستنووسەکانی ڕەفز دەکرد و بە زمانێکی زبر لە پۆستەی خوێنەراندا وەڵامیان دەدایەوە: "ئەم وڕێنە کاڵ و کرچ و بێ تامانە، بە چەند وشەیەکی جوان و بریقەدار نایەنە سڕینەوە". یان "ئەم سەرەقەڵەمانە بڵاوناکەینەوە. بە کاری ئێمە نایەن، بۆ ئێمەت نەنووسیوە، بێگومان بۆ گۆڤارێکی دیکەت نووسیوە". یان: "زۆر درێژە، بێ ڕەنگە، لە نەوارێکی کاغەزی سپی دەچێ کە سیحربازێك لە دەمییەوە دەری بێنێ". وەڵامی سیسرکە بۆ ئانتون، دەربارەی دوا نووسینی کە لە کۆتایی ساڵی ١٨٨٠دا بۆی ناردبوون بەمجۆرە بوو: "تۆ گەشە ناکەیت، لە حاڵی وشك بووندایت، حەیفێ! بە ڕاستی هەر کەسێك بە هەستی ڕەخنەوانییەوە مامەڵە دەگەڵ نووسینی خۆیدا نەکات، ناتوانێ بنووسێت". ئانتون، بە جۆرێ ڕەنجا کە بڕیاری دا چیتر بەرهەم بۆ دەستەی بەڕێوەبەرانی لەخۆبایی (سیسرکە) نەنێرێت. هەڵبەتە یەکێك لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری بڵاڤۆکی ناڤبری ئەم هەڵوێستەی هاوڕێکانی خۆی زۆر پێ ناخۆش بووو لەو بارەیەوە دەڵێت: "دەستەی نووسەرانی گەوجی سیسرکە چیرۆکی نووسەرێکیان بە نێوی ئانتوشا چیخۆنتی یەوە، ڕەفز کردووە، کە تاکو ئەمڕۆکەش، لاپەڕەکانی سیسرکە شتێکی هاوتای ئەو دەقەیان بە خۆوە نەدیتووە(٢)".

هەرچەندە بڵاوکردنەوەی بابەت لەو بڵاڤۆکە ساتیریانەدا دژوار بوو، بەڵام وەرگرتنی پاداشتەکەی زۆر دژوارتر بوو. زۆربەی کات، وەختایە کە میخائیل دەچوو بۆ وەرگرتنی پاداشتی نووسینەکانی براکەی. بەلای کەمەوە لە دوو کەڕەتا، کەڕەتێك پێیان دەگوت پارەیان نییە، قاسەکەیان بەتاڵە. ئەمە ئەگەر لەجیاتی پارە، بلیتی شانۆیان بە ملیدا نەدابا، یان ڕێکو ڕەوان پێیان نەگوتبا کە بەڕێوەبەر لە دەرگای پشتەوە هەڵاتووە.

ئانتون لە مانگی ١٨٨٠/٧دا، پاش ئەوەی تاقیکردنەوەکانی ساڵی یەکەمی کۆلێجی پزیشکی بڕی ( لە هەموو دەرسەکاندا نمرەی باشی هێنابوو تەنیا لە توێکاریدا نەبێ) دەگەڵ زمبولاتوڤی برادەر و کرێچی خۆیاندا، مۆسکۆیان بەجێهێشت بە مەبەستی بەسەربردنی پشووی هاوین لە باخە هاوینەکەی ماڵی داك و بابی ئەودا. جا بۆ ئەوەی کەڵکەڵەی پزیشکی خۆی بنوێنێ، کاسە سەرێکی لە ژوورەکەیدا دانا، برا بچووکەکەی خانەخوێیەکەشی ڕاسپارد کە چەند قورباقە و جرجێکیشی بۆ بگرێت. ئەوجا ئەو جووتە خوێندکارە، لە بەرچاوی ئەو دێهاتیانەی کە بە ترسەوە دەوریان دابوون، کەوتنە توێکاری گیانلەبەرەکان.

کاتێ ئانتون بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، کتوپڕ کەڵکەڵە و خولیای شانۆی کەوتەوە سەر، لە ماوەی زستانەکەدا و بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە شانۆنامەیەکی درێژی بێ سەروبەری لە چوار پەردەدا نووسی، ناونیشانی بۆ دانە نا، دوای ئەوەی میخائیل نووسخەیەکی جوانی لەبەر نووسییەوە، ئانتون بە خۆی بردی بۆ ماریا یەرمولوڤا، کە ئەکتەرێکی زۆر بەناوبانگ بوو و دەگەڵ شانۆی مالی دا ( مالی لە زمانی ڕووسیدا بە مانای بچووك دێت). کاری دەکرد. وەکو پێشبینی دەکرا، ئەم شانۆنامەیە ڕەفزکرا. ئانتون کە ئەم ڕەفزکردنەی زۆر لەبەر گران بوو، دەستنووسەکەی فەوتان، بەڵام یەکەمین ڕەشنووسی ئەم شانۆنامەیە، بە دەستخەتی چیخۆف خۆی، کە ساڵی ١٩٢٠دا لە نێو ئەرشیفەکانیا دۆزرایەوە و لەژێر سەرناڤی (پلاتونوف) بڵاوکرایەوە. (کورتەیەکی

ئەو شانۆنامەیە لە ژێر سەرناڤی: "پلاتونوڤی شێت"دا کە پۆل کوانتان ئامادەی کردبوو، لە فەڕەنسادا نمایشکرا، ئەگەر شانۆنامەکە بە تەواوەتی و بێ هیچ دەسکارییەك نمایش کرابا، حەوت دانە سەعاتی دەخایاند. دوای ئەوە لە ژێر سەرناڤێن جیاوازدا، لە ئەڵمانیا و ئەمریکا و ئینگلتەرادا پێشەکەش کرا، بەڵام لە یەکێتیی سۆڤییەتدا، بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٩دا پێشکەش کرا).

ئەم کارە، کە هی سەردەمی گەنجاتی نووسەر بوو، بە هەموو میلودرامیەتێکی خۆیەوە، بە هەموو شپرزەییەکیەوە، بە هەموو درێژدادڕیەکیەوە، هەوێن و ماکی هەموو تیمە سەرەکییە چیخۆفییەکانی لە خۆ گرتبوو، تۆنی بەرهەمەکە، لە هەوڵین دێر و دیالۆگەکانیەوە دیارە: "هیچ... زۆر بێزارین... بێزارین نیگولاگیان.. هیچ شتێك ناکرێت... خەمناکی.. بیرێن تاریك.. نازانم چار چییە.." دیمەنی لادێ. بێزاری قورسی دێهاتیانە. خەڵکانی بێ ئیش و کار، بێ دەسەڵات و بێورە، بە دەم باوێشکی تەمەڵییەوە، خەون بە ژیانێکی باشترەوە دەبینن، کەچی هیچ هەوڵێك نادەن ئەو سستی و تەمەڵییە لە خۆ بڕەوێننەوە، نەوەی نوێ، واقیعگەرا، ئامادەن لە پێناوی دەسەڵاتی خۆدا هەموو شتێك بکەن، بێ پارەیی، وایان لێدەکات خانوو و موڵکە جوانەکانیان، بۆ دانەوەی قەرز بفرۆشن، ڤۆدکا وەکو ئاو دەڕوات ، مەستی و سستی، قسەێن بۆش و بەتاڵی بە تەنتەنە، ئاهو ناڵەی ژنانی جوانی بێ بەش لە ژیان و ئەشق... بەڵام پلاتونوف، قارەمانی شانۆنامەکە، سەبارەت بە ژنانی دەوروبەر ئەفسوون بەکاردەبات، ئەفسوونێك کە دەرەقەتی نایەت. لە ژیان بێزارە، قێزی لە ژیان دەبێتەوە، چارەی ئەمە لە ڕیسکی عاتیفی و موغامەرەی شەهوانیدا دەبینێتەوە. ئیدی مەراقی ژن بوو، هەر ژنێکی دیتبا دەبوو بە مەراقی، هەڵبەتە مەبەستی ئاشقێنی و هاوسۆزی ژنان نەبوو، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو، لە ڕووی مەعنەوی و جەستەییەوە وێرانیان بکات و خۆی لە مێبازیدا ون بکات. ئەم قارەمانە ئاوێتەیەکە لە مێملێکی قێزەون و دون جوانێکی ڕووخاوی ناموراد. یان وەکو یەکێك لە قوربانییەکانی دەستی ئەو گوتویەتی "خوێڕییەکی نائاساییە" وێڕای ئەمەش لە هەندێ ساتی نائومێدیدا، پەشیمانی خۆی دەردەبڕێ! "وێرانکردنی ژنانی بێ دەسەڵات و بێگەرد و بێ گوناح، لە ناوبردنیان. خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی دیکە، بە شێوەیەکی جیاواز بە دەم شەپۆلی سۆزی هۆڤیەوە وەکو بابایەکی ئەسپانیایی ئەمەم دەگەڵ کردبان هەر نەیسە، هەستم بە پەشیمانی نەدەکرد. بەڵام هەموو ئەم کارانەم زۆر... گەوجانە وەکو بابایەکی ڕووسی کرد. کابرایەك بوو برسی ، جلوبەرگ شڕۆڵە، گومڕا، بەرەڵڵا... هاتمە ئەم ماڵە... پەنایان دام، جێگەیان کردمەوە، جلوبەرگیان دامێ، میهرەبانیان دەگەڵ کردم.. تەماشا چۆن چاکەی ئەو هەموو پیاوەتییەم دانەوە".

ئەم قارەمانە گومڕا و دەغەڵبازە، لە هەندێ شانۆی دیکەی چیخۆف دا دەردەکەوێتەوە. هەروەها کاراکتەرە لاوەکییەکانیش. هۆڵی نمایش پڕە، بەڵام ئەم کاراکتەرانە، هێشتا هەر سیمای کاریکاتۆریان هەیە. پاشان چیخۆف دیالۆگەکان هەندێ خاو دەکاتەوە و کاریگەرییەکانی نەرمتر دەکات، زمانەکەی بژار دەکات، مەبەستەکانی دەپاڵێوێ. ڕەنگی وێنەکان

**گەشتر دەکات. بە هەرحاڵ، بە هرەی هاندان و جوڵاندنی کارەکتەرەکان لێرەدا فرەیە، هونەری بایەخدان بە کاراکتەرە بنەڕەتییەکان و ڕەنگ و بۆی درامی، زاڵ دەبێت.**

**ڕەفزکردنی ئەم شانۆنامەیە لەلایەن (شانۆی مالی)یەوە، کردیە کارێك کە چیخۆف بۆ ماوەیەك لە شانۆ دوور بکەوێتەوە. دووبارە ڕووبکاتەوە گۆڤار و بڵاڤۆکێن کۆمیکی. چونکە لە گۆڤاری (سیسرکە) تۆرابوو، دەگەڵ دوو گۆڤاری دیکەی هاوشێوەدا، بە ناوی (سەعاتی زەنگدار) و (تەماشاڤان) بە نرخی شەش کوپیك بۆ هەر دێڕێك، ڕێکەوت. ئیدی لەو کاتەوە بوو بە نووسەرێکی هەمەکارە. لە چیرۆکی ساتیرەوە دەچووەسەر ڕۆمانی بە زنجیرە، لە ڕۆمانەوە دەچووە سەر چیرۆکی پۆلیسی. لە ساڵی ١٨٨٢دا، پاش گرەوێك دەگەڵ سەرنووسەری (سەعاتی زەنگدار) ڕۆمانێکی هەشت ئەڵقەیی لە گۆڤاری ناڤبریدا، لە ژێر سەرناڤی (سەرکەوتنی بێهودە)دا بڵاوکردەوە، کە لە ڕاستیدا لاسایی کردنەوەیەکی تەواوی نووسەری بە ناوبانگی مەجەڕی، مورجوکی بوو، ئەم چیرۆکە لە هەشت ژمارەی بەرو دوای گۆڤاری ناڤبریدا بڵاوبووەوە. جا تەقلید و لاسایی کردنەوەکە، هێندە لێهاتووانە و سەرکەوتوو بوو، کە خوێنەرانی سادەی گۆڤارەکە بە ڕادەیەك پێی خەڵەتابوون، کە چەندین نامەی پڕ جۆشیان بۆ سەرنووسەرەکە ناردبوو و دەستخۆشی ئەوەیان لێکردبوو کە ئەو بابەتەی بۆ بڵاوکردنەوە هەڵبژاردووە. لە یەکێك لەو نامانەدا بۆیان نووسی بوو: "کە شتێکی جوان و دڵگیر بوو! ئایا ناتوانن شتێکی دیکەی هەمان نووسەر بڵاوبکەنەوە؟ باشە بۆ ناوی ڕاستەقینەی خۆی نە نووسیوە؟ ناشێت مورجوکی خۆی بێت ؟"**

**چیخۆف، دەگەڵ ئەم چیرۆك و حیکایەتانەدا، بە درێژ و کورتیانەوە، بە سەرکەوتوو و ناکامیانەوە، بە پەلە دیاردە و ڕووداوەکانی ژیانی ڕۆژانەی مۆسکۆی کۆ دەکردەوە. وەکو ڕیپۆرتەر و پەیامنێری ڕۆژنامەوانی، بابەت و زانیارییەکانی لە هۆڵەکانی دادگاوە، لە یانە ئەدەبییەکانەوە، یان لە پشت پەردەی شانۆکانەوە وەردەگرت و هەڵدەهێنجا. بە هۆی هەمەجۆری ئەو ناوەندانەوە کە بە مەبەستی چێکردنی ڕاپۆرەکانی هاتوچۆی دەکردن، بوو بوو بە خودانی جیهانبینی و نۆڕینێکی کراوە و دەوڵەمەند بۆ جیهان. لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا، زانیاری تەواوی لەمەڕ هەموو چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی ڕووسیا هەبوو. زۆر نموونەی پەنهان و تازەی لە هزر و خەیاڵی خۆیدا، تاوتوێ دەکرد و چاوەڕوانی بانگ و گازی قەڵەمەکەی بوو کە بە وشە و لە وشەدا ژیانیان پێ ببەخشێت و بەرجەستەیان بکات. لە بواری ڕەخنەشدا، ڕەخنەگرێکی خودان ڕەئی بوو. کە دەربارەی شانۆ قسەی دەکرد (یەکەمین ناکامی لە بواری شانۆدا، شانۆ و دنیای شانۆی لە بەرچاو نەخستبوو) چ لە مەیدانی نواندن و چ لە مەیدانی دەرهێناندا داوای سادەیی و ڕاستگۆیی دەکرد. کە سارابارناردی ئەکتەری فەڕەنسی لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٨٨١دا بە مەبەستی نواندن گەییە مۆسکۆ، هەرا و هەنگامەیەکی زۆر گەورە لە مۆسکۆدا بەرپابوو، گەیاندیانە کەشکەڵانی فەلەك، چیخۆفیش بە مەبەستی تەماشای نواندنی سارابرنارد، لە هەردوو شانۆنامەی (کامیلیا) و (ئادرین لیکوڤرێر)دا چوو بۆ شانۆی بۆلشوی. ئەوەبوو باری سەرنج و تێبینییەکانی خۆی لە دوو وتاردا نووسی و لە گۆڤاری (تەماشاڤان) دا**

بڵاوی کردنەوە. کە بە زمانێکی وشك لە یەکێ لە ژمارەکانا دەڵێت: " لە هەر کەسێکی ئەم دنیایە زاتر عاشقی شۆرەتە، ڕیکلام بۆ خۆی دەکات". لە ژمارەی دواتردا دەڵێت: "هەموو ئاهو ناڵەکانی سارە برنارد، فرمێسکەکانی، کول و گۆڤانەکانی، هەر هەموو نواندنەکەی، زۆر بە وردی و زیرەکانە ئەزبەری کردووە و دووبارەی دەکاتەوە. کارێکی وەها دەکات هەموو قارەمانە ژنەکان وەکو خۆی ئاوەرتە و ڕیزپەر بنوێنن. ئەوەی لە نواندنی ئەودا دیار و بەرچاویە، بەهرەنییە، بەڵکو هەولێ و کۆششێکی لە ڕادەبەدەرە. هەندێجار بە دەم تەماشای نواندنەکەیەوە، گریان ئەوکی دەگرتین. بەڵام فرمێسکی پێ نەڕشتین، چونکە لایەنی دەستکردی بەسەر نواندنەکەیدا زاڵبوو و هەموو ئەفسوونی کارەکەی ڕەواندەوە". هەڵبەتە چیخۆف دەرهەق بە نووسەرانی ڕووسیش بە هەمان سەختگیری داوەری دەکرد و دوای دیتنی نواندنێکی ئەکتەری بە ناوبانگ ئیڤانۆڤ کوزلسکی کە ڕۆڵی هاملێتی دەبینی، لە ڕۆژنامەی مۆسکۆدا وتارێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا دەڵێت: "هەر ئەوەندە بەس نییە کە ئەکتەر لەسەر شانۆ بە وردی هەستی خۆی دەربڕێت، هونەرمەندایەتی ڕووت بەس نییە، ئەکتەر پێویستە پاشخانێکی ڕۆشنبیری فراوانی هەبێت. ئەکتەر بۆ ئەوەی بتوانێ دەوری هاملێت بدینێ، دەبێ زەحمەتی خۆ ڕۆشنبیراندن بکێشێت".

براکانی چیخۆف، ئەلکساندر و نیکولاش دەگەڵ گۆڤارێن ساتیردا هاوکاریان دەکرد، یەکەمیان وەکو یاریدەدەری سکرتێری نووسین و دووەمیان وەکو نیگارکێش. چیخۆف دنیایەکی قەرەجانەی ،پڕ هەراوزەنا،کینایە ئامێزی، مەیزەدە و بێ موبالاتانەی خستە ناو ژیانی شەوانەی ئەوانەوە. ئەگەرچی تاڕادەیەك سووربوو لەسەر گۆشەگیری خۆی ،بەڵام هاونشینی ئەو نووسەرە سەرکێش و تووندڕەوانەی پێخۆش بوو کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەواندا دەی بینین. یەکێك لەم نووسەرە ئازیزانەی (لیودور پالمین)ی شاعیر بوو، ئەمە کابرایەکی شێتۆکەی شڕپۆش، بەڵام میهرەبان و بلیمەت بوو، دایمە کۆمەڵێك سەگی گڕوی بە دەورەوە بوو. بە دڵ و گیان، دڵسۆزانە پێیان ڕادەگەیی. دەگەڵ پیرە دایەنەکەیدا لە کوختەیەکی کولانە ئاسادا دەژیا، هەرکە شەویان لێ دادەهات هەردووکیان دەستیان بە خواردنەوە دەکرد، هێندەیان دەخواردەوە لاڵ و پاڵ دەکەوتنە ژێر مێزەکە. پالمین هەرکە چەند پێکێ ڤۆدکای هەڵدەدا، ئیدی خەیاڵ دەبوو، سۆز دەیگرت، زاری دەکرایەوە"، جۆرەها بیری تازە و ڕەسەنی، بە زمانێکی ناسك و زندوو دەردەبڕی. پالمین بە هەموو داماویەکی خۆیەوە، کەسێکی فرە ڕۆشنبیر بوو، چەند زمانێکی بە باشی دەزانی، چەند بەرهەمێکی لە ئەدەبی کلاسیکی بێگانەوە، پاچڤەی ڕووسی کردبوو. دەمی لە بیروباوەڕێن لیبرالی دەکوتا، بۆیە دەسەڵات لێی دڕدۆنگ و بە گومان بوو. چیخۆف لە بارەی ئەم پیاوەوە دەڵێت: "پیاو لە قسەی بێزار و بێتاقەت نابێ، ڕاستە پیاو ئەگەر لەگەڵیا دابنیشێت، دەبێ زۆر بخواتەوە، بەڵام دەتوانێ دڵنیا بێت کە بە درێژایی سێ چوار سەعات قسە و گفتوگۆ، تاقە درۆیەك یان قسەیەکی نابەجای لێ نابیستێ، کە ئەمە بۆ خۆی نیشانەی سەنگینی و میانڕەویە". ( بڕوانە نامەی ١٨٨٦/٢/١).

یەکێکی دیکەی ئەم ژینگە قەرەجانەیە، پیاوێکی بە ناوبانگ بوو بە نێوی فلادیمیر گیلیار ڤسکی، ئەمە لە ڕۆژنامەی "ڕووسیا نیوز" کاری دەکرد. کابرایەکی کورتە باڵای قەڵەو، بە شانو

باهۆ، سورکەلە، دەنگ زلی دەنگ لەرزۆك بوو، زور بە ماسولکە پۆڵاینەکانی و بە یادگەی بەقوەت و تەڕدەستی و فێڵبازی خۆی لە وەرقبازیدا دەنازی. لەسەر بەڵێ یەك یان نەخێرێك، پەنای دەبردە بەر بازوو، یان بۆ نیشاندانی هێزی هەرقلانەی خۆی کورسیەکی دەشکاند. هەموو جۆرە کارێکی کردبوو: مەلەوانی لە ڕوباری ڤۆلگادا، ڕێکخستنی بارگیری و بارئەندازی، کرێکاری کارگە و کارخانان، پاڵەوانبازی سێرکان، پەروەردە و ڕامکردنی ئەسپ... سەری پڕ بوو لە نوکتە و چیرۆکی شەهوانی و بێ پەردە، بە دەم قاقای دێوئاساوە دەیگێڕانەوە. چونکە هەموو خەڵکی مۆسکۆی دەناسی، بۆیە زیاتر لە هۆڵەکانی یانەی ئینگلیزان و کاروانسەراکانی بازاڕی خیتروفدا ئاسوودە دەبوو. لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی شارەوە جۆرەها سکێچات و ڕیپۆرتاژ و هەواڵ و شیعری بۆ ڕۆژنامەکەی هەڵدەهێنجا و ئامادە دەکرد. دۆستەکانی بە (شای ڕۆژنامەوانان) ناویان دەبرد. ئەم پیاوە چونکە چیخۆڤ خۆشدەویست، گەلێك لە نهێنییەکانی ژیانی مۆسکۆی بۆ ئاشکرا کرد، زۆرجار بیرۆکەی ئەو وتارانەی دەدایە کە چیخۆف بۆ پارە و بژێوی دەینووسین.

نەفەرێکی دیکەی ئەم گروپە پیاوێك بوو بە نێوی ڤیودور پوپدوگلو کە نووسەرێکی زەبەر دەستی خاوەن شێوازێکی جوان بوو، بەڵام بادەنۆشی بە ڕاستی وێرانی کردبوو و لەوە نەدەچوو زوری بە بەرەوە مابێ. یەکێکی دیکەی سەر بە هەمان گروپ پیوتەر سرگینکۆ بوو، ئەمە لە دەرچووانی کۆنی قوتابخانەی دواناوەندی تاگانرۆگ بوو، لە ڕێگەی قەڵەمەکەیەوە، قەلەندەرانە دەژیا. باوەڕی بە بۆچوونەکانی تۆڵستۆی بوو، سوێندی گەورەی بە تیۆرییەکانی تۆڵستۆی بوو. نیکولاش لەلای خۆیەوە، نیگارکێشانی شڕوشەپڕێوی دێنایەماڵەوە. کە مەشروبیان بە سادەیی، بێ ئاو دەخواردەوەو بە ئاو و وتاو گەنگەشەیان دەربارەی کۆنەپارێزی و نوێخوازی لە هونەردا دەکرد. نیکولای، لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٨٨٠دا، گەنجێکی جولەکەی کەمڕووی بە ئانتون ناساند، ئەو گەنجە ناوی ئیسحاق لیڤیتان و تەمەنی نۆزدە ساڵان بوو، کە پاشان بوو بە نیگارکێشێکی بە ناوبانگی دیمەنان. هەڵبەتە هەندێجار دۆستانی میخائیل و ماریاش، دەهاتنە کۆڕی ئەم میوانە داهێنەرانە و کەم و زۆر بەشداری گەنگەشەکانیان دەکرد و ماڵەکە هێندەی دی جەنجاڵ دەبوو.

لەم ماوەیەدا، ماڵباتی چیخۆف، دیسان باریان کرد، ئەمجارە شوقەیەکی گەورەتریان لە گەڕەکی سرتنکادا بە کرێ گرت. دەرگای شوقەکە بەردەوام بۆ هەموو کەسێك کراوە بوو، کە بە ڕاستی ئەمە بە دڵی چیخۆف بوو، چونکە حەزی لە هاتوچۆ و ناسینی خەڵکی تازەبوو. ئیدی بە کۆمەڵ، بە دەم یاری و گەمەی دەستەجەمیەوە لە دەوری خڕ دەبوونەوە. یان نیکۆلای دادەنیشت و پیانۆی لێدەدا، یەکێکی دی بالالایکای لێدەدا، ئەوجا بە کۆمەڵ هێندەیان گۆرانی و ئاوازی میللی دەگوت تا گەروویان وشك دەبوو، ئەوسا ناچار دەستیان بە خواردنەوە دەکرد. وێڕای ئەوەش چیخۆف هەندێجار گلەیی ئەوەی دەکرد، کە بە هۆی ئەم هەرا و هەنگامە جەنجاڵەوە، ناتوانێ بە ئیسراحەت لە ژوورەکەی خۆیدا کاربکات. ئەوەتا دەڵێت: "من لە وەزعێکی زۆر نالەباردا دەنووسم. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، منداڵی خزمێکمان کە هاتووەتە میوانیمان دەگری. لە ژووری دووەمدا بابم بە دەنگی بەرز چیرۆکی فریشتەی لە مۆمگیراو(٣)" بۆ دایکم

دەخوێنێتەوە. لەولاوە یەکێك سازەکەی کوك کردووە گوێ لە گۆرانیەکەی "هیلینی جوان" دەگرێت. حەزدەکەم بڕۆم بۆ گوندی، بەڵام سەعات یەکی شەوە. بە ڕاستی بۆ کاری نووسین، زەحمەتە شوێنی لەمە خراپتر هەبێت. تەختە خەوەکەم، خزمێکی میوانمان داگیری کردووە، زۆرجار دێتە دیدەنی من و ئیدی دەکەوێتە باسی مەسەلە پزیشکییەکان: "دیارە ئەم منداڵە چکۆڵەیەم دەبێ پێچ بە سکیا بێ، کوڵنجی کردبێت، بۆیە دەگری و کڕ نابێت" بەڵێن بە خۆ دەدەم کە هەرگیز منداڵ نەخەمەوە(٤)".

زۆربەی شەوانی ئەو گەنگەشانە، بە خواردنەوە دەشکایەوە، شەوێکیان ئالکساندر بە سەرخۆشی هاتەوە، فوول سەرخۆش بوو، لا لاموویی دەکرد، کەوتە جنێوی ناشرین لە حوزووری دایکی و خوشکەکەیا، کەوتە هەڕەشە لە ئانتون کە دەمو قەپۆزی دەشکێنێ. ئیدی زۆر پەست بوو، یەکسەر نامەیەکی توندی بۆ نووسی و بۆی ڕوونکردەوە: "ئەگەر سەد هەزار جاریش خۆشم بوێی ئەوا بە هیچ کلۆج و بە هیچ بیانوویەك سووکایەتی و ئیهانەت لێ قەبووڵ ناکەم. ئەگەر بیانووت سەرخۆشی و بێ ئاگایی بێ، ئەوا دڵنیابە کە من چاك دەزانم کە مەست بوون ئەو هەقەت ناداتێ کە ... بەسەر کەسێکی دیدا. بڕێژی. سەبارەت بە وشەی "برا" کە تۆ بە مەبەستی ترساندنی من بەکارت بردووە تا بەڵکو مەیدانی شەڕەکەت بۆ چۆڵ بکەم، چاك بزانە، کە ئامادەم هەر کاتێ پێویست بکات لە فەرهەنگ و وشەدانی خۆمیا بسڕمەوە، نەك لە بەر ئەوەی دڵم نییە، کەسێکی دڵ ڕەقم، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە پیاو لەم دنیا دوونەدا، ئامادەی هەموو شتێك بێ. من لە هیچ شتێك ناترسم، ئامۆژگاریم ئەوەیە براکانیشم وەکو من بن، چاو لە من بکەن(٥)"

بێگومان، ئەلکساندر، کە وە هۆش هاتووەتەوە، تەوازی بۆ براکەی هێناوەتەوە، چونکە ئەم ڕووداوە زوو بیر چووەوە. چیخۆف کەسوکارەکەی زۆر خۆش دەویستن، بۆیە ڕێگەی بە خۆی نەدەدا ڕق لە کەسوکار و خزمانی هەڵگرێت. ئەمە جگە لەوەی کە نیکۆلای براشی، ڕۆژ نەبوو هەمان نیگەرانی و سەریەشەی ئەلکساندری بۆ دروست نەکات. نیکولا، نیگارکێشێکی بە توانا و بەهرەمەند بوو، لە بواری ساتیردا توانایەکی تایبەتی هەبوو، و زۆر جار سکێچ و وێنەی بۆ چیرۆکەکانی ئانتونی برای دەکێشا. ئەگەر متمانەی ئەوەی پێ بکرایە کە لە کاتی دیاریکراودا سکێچەکانی پێشەکەش کردبا، لە بواری ڕۆژنامەوانیدا پێگەیەکی بەرزی بە دەست دێنا. کەسێکی بێ وەعد بوو، لە کارکردنا بێ بەرنامە بوو، زۆرجار ئەو کارە زەروریانەی کە پێیان دەسپارد، لە بیر دەچووەوە. هەندێجار بە چەند ڕۆژ دیار نەدەما و دەچوو بۆ شوێنە پەرپووتەکانی مۆسکۆ وشانی لە خواردنەوە قایم دەکرد. ئەوجا شەوێ بە دەم ڕشانەوەوە، دەهاتەوە، هەر بە جلەکانییەوە، خۆی بەسەر تەختە خەوەکەیا دەدا، پەتۆیەکی بەخۆیا دەدا، تەنیا پێیەکانی بە پێڵاوە دەڕاوەکانییەوە دەبینران، بیست و چوار سەعاتی تەواو دەخەوت، تا مەستی ڤۆدکا بەری دەدا.

چیخۆف، زۆری خۆش دەویست، هەرگیز گلەیی لێنەدەکرد، بەڵام کە دەیبینی ئەو بەهرە گەورەیە بەو جۆرە بە فیڕۆ دەڕوات زۆری خەفەت دەخوارد. بۆیە لە نامەیەکا پێی دەڵێت: "دەبێ

بەردەوام کاربکەیت، شەو و ڕۆژ. نابێ لە خوێندنەوە غافڵ بیت، بە قووڵی بخوێنەوە، ورەت بەرز بێ، کات زێڕە... جامی ڤۆدکاکەت بشکێنە(٦)".

ئانتون، سەبارەت بە داڕوخانی بەرەبەرەی هەردوو برا گەورەکەی، لە هەموو کاتێ زیاتر هەستی بەوە دەکرد کە پێویستە، هەستی کەرامەت و پیاوەتیان لەلا ببوژێنێتەوە. جا ئەمەش هەر بە ئامۆژگاری و قسەی ڕووت نەدەهاتە دی، بەڵکو دەبوایە خۆی بکردایەتە سەرمەشق و نموونە و بە کردەوە بیسەلماندایە، کە کار لە کار نەترازاوە و دەرفەتی تەواو لە ئارادیە. جا چونکە هیچ باوەڕێکی بە بۆچوونە میتافیزکی و ئایینەکان نەبوو، هیچ کاتێك لە قاپی خوا نەدەپاڕایەوە کە فریای بکەوێ و لە کێشە ڕزگاری بکات، شەڕی ئەو لەسەر زەوی بوو، چەکی دەستی تەنیا خۆشەویستی و سەبر و کۆڵنەدان بوو تا بگاتە ئامانج. سوێندی خواردبوو کە لەو ڕێگەیەوە خۆی چاك بکات و خانەوادەکەیان بە زانست پەروەردە بکات. دوای چەند ساڵێك، نامەیەك بۆ سوڤورینی هاوڕێی دەنووسێت و دەڵێت: "ئەوەی نووسەرانی ئەشرافزادە بە خۆڕایی و بە زکماك دەستیان دەکەوێ، خەڵکانی دی، ڕۆڵەێن ڕەش و ڕووت، دەبێ بە بەهای گەنجێتی خۆیان بە دەستی بێنن، گەنجێتی خۆیانی لەسەر دابنەن، دەیسا هێمەتێك بکە و چیرۆکێك دەربارەی گەنجێك بنووسە، کۆیلەزادە، کۆنە شاگردی دوکانداری، ئەندامی سرووودخوانی کلێسا، مەکتەبلی، پاشان خوێندکارێکی گوێرایەڵی، پەروەدەکراو لەسەر ڕێزگرتنی گەورە پیاوانی پلەوپایەدار، ماچکردنی دەستی کەشیشان، بیر و ئەندێشەی خەڵکانی دی بە پیرۆز بزانێت. منەتی هەر پاروە نانێك هەڵبگرێت، ناو بە ناو بەرقامچی درابێ، بە جووتێ پێڵاوی شڕەوە. بە مەبەستی وتنەوەی دەرسی تایبەتی ماڵانەوە، سەرانسەری شاری دابێتە ژێر پێوە، هەراو هەنگامەی نابیتەوە، بە بێهودە مەرایی و ڕیایی لەبەردەم خواو خەڵکی بکات، نەك لەبەر ئەوەی ناچار کرابێ، بەڵکو لەبەرئەوەی زانیویەتی کە هیچ نییە. کەواتە بنووسە، دەربارەی ئەم گەنجە بنووسە کە چۆن هەوڵدەدا، وردە وردە خۆی لەو کۆیلەیەی ناخی ڕزگار بکات، چۆن بەیانییەك لە خەو ڕادەبێت و بۆی دەردەکەوێت کە ئەو خوێنەی بە دەمارەکانیا دێ و دەچێت، ئیدی خوێنی کۆیلەیەك نییە، بەڵکو خوێنی ئینسانێکی ڕاستەقینەیە(٧)".

چیخۆف، بە هەموو توانایەکی خۆیەوە، هەوڵی دەدا، کە قەناعەت بە براکانی بکات، کە "ئینسانی ڕاستەقینەن". جا ئەم (لادری)یە لە ناخا باوەڕێکی بەتینی بە ئایندە هەبوو، وێڕای هەموو گومانداریەکی، باوەڕی بە بایەخی جەوهەری نیمچە خوایی تاك هەبوو، ئەگەر لە نزمترین پلەی کۆمەڵایەتیشا بوایە.

پەراوێز:

١- (.. لەبری هەر دێڕێك..): کوپیك لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بەرانبەر بە (٢,٧٠) فرانکی فەرەنسی، پارەی باوی ئەو سەردەمە بوو.

٢- (.. بە خۆوە نەدیتوە..): هەموو ئەو دەقانە فەوتاون و هیچیان نەگەیوونەتە دەستی ئێمە.

٣- (.. فریشتەی لە مۆمگیراو..) ئەمە نووسینێکی لسکوڤە، ژیانی کۆمەڵێك لە کۆنە ئیماندارانی لە خۆ گرتووە.

٤- له نامەیەکی ئازاری ١٨٨٣/٨/٢٤دا بۆ لیپکینی ناردووه.

٥- بڕوانه نامەی ئازاری ١٨٨٨

٦- (.. جامی ڤۆدگاکەت بشکێنه..): بڕوانه نامەی ئازاری/١٨٨٦

٧- (... ئینسانی ڕاستەقینه...): بڕوانه نامەی ٧/ك١٨٨٩/٢

((٥))

## ڕۆژنامەوانی و پزیشکی

ئیڤانی، خەمین و لە هەمان کاتا ئاقڵ، ئەنجام بە ئاواتەکەی خۆی گەیی و بوو بە مامۆستای قوتابخانەیەکی سەر بە ئەبرەشیە، لە گوندی ڤوسکرسنسکی نزیکی مۆسکۆ. لەوێ خانوویەکی گەورەی بەدەستەوەبوو، وەختێکی زۆری هەبوو. چیخوف، پاش ئەوەی سەرکەوتووانە تاقیکردنەوەکانی ساڵی سێیەمی کۆلیجی پزیشکی بڕی، لێبڕا پشووی هاوینی ئەو ساڵە، ساڵی ١٨٨٢ لە گوندی، لای براکەی بباتە سەر. ئیدی هەموو خانەوادەکەش لەگەڵی چوون.

چیخوف لە ڤوسکرسنسک، کاتی خۆی بە دوو جۆر ڕاوەوە بە سەردەبرد، یەکەمیان ڕاوەماسی و قارچك کۆکردنەوە بوو، دووەمیان ڕاوێکی چەورتر و بەسوودتر بوو، بریتی بوو لە ڕاوە نوکتە و قارەمانانی چیرۆك. هەمیشە گوێ قوڵاغ، چاوکراوە، کەپوو بە بۆن و هزر بێدار، هاتوچۆی ئەم شوێنانەی دەکرد: پۆستەخانە، کابارێیەك کە تابلۆی سەماوەرێکی سوورمەیی پێوە هەڵواسرابوو، بینای دادگا کە یەکپارچە تۆز و غوبار بوو، کوختەی دوکەڵاوی جووتیاران، ماڵی ئەستووندارى پیاوماقوڵان، تەنانەت هاتووچۆی یانەی ئەفسەرانی فەوجی تۆپخانەی ناوچەکەشی دەکرد. ئەو خەڵکانەی کە ئەو هاتووچۆی دەکردن، بە هەموو توێژ و چینەکانیانەوە، زۆر دڵیان بەوە خۆش بوو کە ئەم گەنجە مۆسکۆییە، کە دکتۆری ئایندە، بە خۆ و قژەدرێژ و شەپقە لێوار پانەکەی و، بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە، ڕەفتاریان دەگەڵ دەکات و دەیاندوێنێ. هەرگیز پەیان بەوە نەدەبرد کە ئەم میوانە کاتێ دەیاندوێنێ و پرسیار بارانیان دەکات، دەیەوێ شتیان لێ دەربێنێ. کە لە مۆسکۆ بوو و پێش ئەوەی بێ بۆ ڤوسکرسنسك، پێشنیازی بۆ کەسوکارەکەی کردبوو ئەگەر هەرکەسێك بیرۆکەی حیکایەتێکی چکۆلەی بۆ بێنێ دە کوپیکی دەداتێ و ئوەی حیکایەتێکی تەواوی بۆ بێنێت بیست کۆپیکی دەداتێ، میخائیلی برای چەندجارێك ئەم کارەی کردبوو و پارەی خۆی وەرگرتبوو. بەڵام لە ڤوسکرسنسك دا چیخۆف بەخۆڕایی، بیرۆکە و سیما و هەڵوێستی کۆمیدی کۆدەکردەوە. وەختایەك بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، هەموو ئەو کەرەستە و تیمە و باری سەرنجانەی کە لە گوندی کۆی کردبوونەوە، کردن بە هەوێن و ئامیانی چیرۆکانی زۆر وزەبەند و بۆ ڕۆژنامە و بڵاڤۆکانی جۆراوجۆری ناردن.

لەپاڵ خوێندنەکەیدا کە مەرد و مەردانە ملی پێوەنابوو، بەردەوام لە خەمی پارە پەیداکردنا بوو تا یارمەتی کەسوکارەکەی بدات و فریایان بکەوێ. کە دەستی دەدایە قەڵەم و دەکەوتە نووسین، زیاتر بیری لە پارە دەکردەوە تا بیر لە هونەریەتی کارەکانی بکاتەوە. نە مامۆستاکانی و نە هاوپۆلەکانی، کەم و زۆر ئاگایان لە کۆشش و چالاکیە ئەدەبیەکانی ئەو نەبوو. جگە لە چەندکەسێکی زۆر کەم، ئیدی هیچ یەکێك لە ئاشنا دوورەکانی هەرگیز ئەوەیان بە بیردا نەدەهات کە ئەم چیخۆنتەی، ساتیران لە گۆڤار و هەفتەنامانی جۆراوجۆردا بڵاودەکاتەوە، هەمان چیخۆڤ هێمن و بێدەنگ و کەم دووی خوێندکاری کۆلیجی پزیشکی بێت. بەڵام چەند بە گومناویەکەی خۆی دڵخۆش بوو، بە هەمان ئەندازەش کەمی پاداشتی نووسینەکانی لەبەر گران و ناخۆش بوو.

هەنووکەی بیری لەوە دەکردەوە، پشت بکاتە ئەو گۆڤار و بڵاڤۆکە کاتی و پیسکانەی کە لە مۆسکۆ دەردەچوون و ڕووبکاتە دنیای بەرینی ڕۆژنامەوانی پترسبۆرگ، پێی وابوو لەوێ پاداشتی باش و نەختی دەدەنێ.

ئەوەبوو، ڕۆژێکی ساردی ئوکتوبەری ساڵی ١٨٨٢، لە کاتێکا دەگەڵ نیکولای برایدا، بە جادەکانی مۆسکۆدا پیاسەی دەکرد، لەپڕ گالیسکەیەك لە تەنیشتیانەوە وەستا، پالمینی شاعیری یاخی و دۆستی چیخۆف لە گالیسکەکەدا بوو، پیاوێکی ورگنی، ڕدێن ڕەشی، ڕدێن تۆپ لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو. ئەو پیاوە (لیکین) ی نووسەری پترسبۆرگی بوو کە سەرنووسەر و بەڕیوەبەری هەفتەنامەی کۆمیکی بە ناوبانگ (oskolki) بوو. تومەز لیکین تۆزێك لەوەپێش بە پالمینی گوتبوو، بۆ هەفتەنامەکەی پێویستی بە هەندێ نووسەری بەهرەمەندی بێ فیز و هەوایە، هەم نووسەری بە هرەداربن و هەم خۆهەڵکێش و فشەکەر نەبن. پالمین یەکسەر ئاماژە بۆ جووتە براکە دەکات و هاواردەکات: "ئەوە دوو برای بەهرەدار! یەکێکیان نووسەرە و ئەویتریان نیگارکێشە!" هەرکە لە گالیسکەکە دابەزین، پالمین، ئانتون و نیکۆلای پێ ناساندن. چیخۆف زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە لیکین زیاد لە پێویست بایەخی پێدا. ئیدی ئەوەی بیرکەوتەوە کە چۆن جارێکیان لە تاگانروگ، لە کتێبخانەی شارەوانیدا، بەدەم خوێندنەوەی چیرۆکە تەنزئامێزەکانی ئەم نووسەرە ناودارەوە لە قاقای پێکەنینی داوە. کە چیخۆف ئەوەی بۆ لیکین گێڕایەوە، هێندەی دی لێکدی نزیك بوونەوە. جا چونکە دنیا ساردبوو، درێژەی ئەم گفتوگۆ و یەکترناسینەیان بردە ناو کافەیەکی گەرم و پڕ ژاوەژاوی ئەو نزیکانە. چیخۆف، دڵبەندی گوێ و ڕدێنی لیکین بوو کە بەدەم سوسیس خواردن و بیرە خواردنەوەوە دەجوڵان: هەموو دەموچاوی بەدەم خواردن و قسەکردنەوە دەجوڵا. ئەنجام سیغارێکی پێکرد، بە دەم چەرە دووکەڵی پیرە سیغارەوە، داوا و مەرجەکانی خۆی خستەڕوو: ئەوەی ئەو دەیویست، بریتی بوو لە: چیرۆکی کورت، سەرنجڕاکێش و بە ئاو و تاو، ڕوون و ڕەوان و پێکەنیناوی. مەرجی بنەڕەتی ئەوەبوو کە دەزگای سانسۆر تووڕە نەکات، خۆی لە قەرەی ئەو بابەتانە نەدا کە خوێنەری نائومێد هان بدات، دژی وەزعی نالەباری باو بوەستێتەوە. هەنگێ چیخۆف لە بری هەر دێڕێك هەشت کوبیك پاداشتی وەردەگرت. یانی بەم پێیە لە بری هەر چیرۆکێك نزیکەی چوار پێنج ڕۆبڵی وەردەگرت. دیارە ئەم پاداشتە لە چاو پاداشتی بڵاڤۆکە ساتیریەکانی مۆسکۆدا زۆر زۆر بوو. چیخۆف ئەم پێشنیازەی بە ڕادەیەك بەدڵ بوو کە نەیدەتوانی شادی خۆی بشارێتەوە. بە تایبەتی کە لیکین بەڵێنی دا بیرێك لە بڵاوکردنەوەی ڕەسمەکانی نیکۆلاش بکاتەوە. ئیدی ڕیکەوتن و چیخۆفیش بەڵێنی دا کە باشترین بەرهەمی خۆی بۆ گۆڤاری (oskolki) بنێرێت.

چیخۆف، بەڵێنی خۆی بردە سەر، بە دڵ و گیان کەوتە کارکردن. دەستەی بەڕیوەبەری گۆڤارەکە بەمجۆرە وەڵامی یەکەم بەرهەمیان دایەوە: "مخابن زۆر درێژە. لە ڕووی فۆرمەوە زۆرباشە، دەمێکە بە ئاواتی بەشداری تۆوە بووین... کورتتر بنووسە و پاداشتی زیاتر دەدەینێ". چیخۆف، بێئەوەی ساردبێتەوە. هەستا کۆمەڵێك بەرهەمی دیکەی بۆ پترسبورگ

نارد، ئەوەبوو لە ٢٠/ت٢/١٨٨٢ یەکەم بەرهەمی خۆی لەسەر لاپەڕەکانی (oskolki) بە ئیمزا و ناوی چیخونتی، خوێندەوە.

ئیدی لەوە بەدواوە، چیرۆك لەسەر چیرۆکی دەنارد و بۆیان بڵاودەکردەوە. دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم و لەسەر داوا و سووربوونی لیکین، چیخۆف قاییل بوو کە گۆشەیەکی بەردەوام لە ژێر سەرناڤی (چەند سەرنجێك دەربارەی ژیانی مۆسکۆ) بۆ گۆڤاری ناوبراو بنووسێت. لەم گۆشەیەدا ڕووداو و دیمەنی زیندووی بڵاودەکردەوە کە لە شەقام و خەستەخانە و دادگا و، کافە و شانۆخانەکانەوە هەڵی دەهێنجان و زۆرجار وتاری ئەدەبی و باس و خواسی ژیانی ئەدەبی و مۆسیقی و هونەریشی دەکرد بە کەرەسەی نووسینەکانی. دیارە ئەم کارە زۆر قورس بوو، پەستی دەکرد، نەیدەتوانی بە دڵی خۆی بنووسێت، بەڵام پێویستی و ئاتاجی خانەوادەکەیان بە ڕادەیەك بوو کە ناچاربوو بەردەوام بێت. ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندر دەڵێت: "بەغیلیم پێ مەبە برا. ئەو سەد ڕۆبڵەی کە مانگانە وەری دەگرم، یەکسەر قووت دەدرێ. بە هەڵلوشین دێتە هەڵلوشین، تەنانەت توانای ئەوەم نیە پاڵتۆ کۆنەکەشم بگۆڕم! هەرچیم هەیە و نیە، خەرجی ئەم و ئەوی دەکەم، بە هەر چوارلادا قەرز دەدەمەوە، هیچ بۆ خۆم نامێنێتەوە، پەنجا ڕۆبڵی لە ڕێوە دەدرێ بە خانەوادەکەمان... ئەگەر هەر خۆم بام و بە تەنیا ژیابام، پارەدار دەبووم" (بڕوانە نامەی ١٨٨٣/٥/١٣).

مەسەلەی پارە و پول، لە نامەکانی ئەم قۆناغەیدا، زۆر دووبارە بوەتەوە. خانەوادەکەیان بە ملی ئەودا کەوتبوو. نە یدەتوانی دەستبەرداری بێ، دوای چەند ساڵێك بەمجۆرە باسی ئەو حاڵەی خۆی لە نامەیەکدا دەکات و بەئاشکرا دەڵێت: "من بایەخێکی زۆر بە پارە دەدەم، من لە ژینگە و ناوەندێکدا لەدایك بووم، پەروەردە بووم، گەورەبووم، چوومە قوتابخانە و دەستم دایە نووسین، کە پارە ڕۆڵی یەکەمی دەبینی، ڕۆڵێکی ناشیرین، کە بە ڕاستی ئەو واقیعە وێرانی کردم." ( بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٨/٢٩ )

بە هۆی کاری ئەدەبی ناچارییەوە کە زیاتر لە بێگار دەچوو، ترسی ئەوەی هەبوو تووشی ئینشانووسی سەرڤەسەرڤە و چەنەبازی و هەڵبژاردنی بابەتی هەمەجۆری کاڵ و کرچ ببێ. بەخۆی چاك بەمەی دەزانی، بۆیە هەندێجار لە مەرجە بازرگانیەکانی لیکین یاخی دەبوو. ئەوەی لە هەر شتێك پتر بێزار و و پەستی دەکرد، ئەو مەرجە نەگۆڕە بوو کە دەبوا چیرۆك و بابەتەکانی لە سەد دێڕدا جێبکاتەوە. لەوەدەچوو کە ڕێزدارانی، دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (oskolki) باوەڕیان وابووبێ کە هیچ بابەتێك لە سەد دێڕ پتر هەڵناگرێت... چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ سەرنووسەری گۆڤارەکە دەڵێت: "منیش لە لایەنگرانی سەرسەختی دەقی میناتۆریم، ئەگەر گۆڤارێکی کۆمیکیم هەبوایە، هەر زیادەیەکم لێی لادەبرد... بەڵام وێڕای ئەوەش دان بەوەدا دەنێم کە سنووردانانی وەك (لێرەوە تا ئەوێ) زۆرم پەست دەکات. کە دەمەوێ بابەتێك بنووسم، مەرجی (لە سەد دێڕ زیاتر نەبێ) لە دێڕی یەکەمەوە، توند دەستم دەگرێت. بە گوێرەی توانا دەیگوشم، کورتی دەکەمەوە، تەتەڵەی دەکەم، لێی لادەبەم، هەندێجار ئەمە بەگوێرەی قەریحەی نووسەرایەتی من، دەگاتە ڕادەی ئاسیوگەیاندن بە بابەتەکە، بە زیانی ناوەرۆك و تەنانەت فۆرمی

بابەتەکە دەشکێتەوە. هەرکە لە کورت کردنەوە و تەتەڵەکردن دەبمەوە، دەست بە ژماردن دەکەم. تا سەد، سەد و بیست، سەد و چل دێڕ دەژمێرم (قەت لەوە زیاترم بۆ گۆڤاری oskolki نە نووسیوە) هەنگێ ترسم لێدەنیشێت و بڕیار دەدەم کە نە ینێرم... جا داوام ئەوەیە کە: ڕێگەم بدەن کە دەستم تا سەد و بیست دێڕ کراوەبێت" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٢/ك٢/١٨٨٣.)

هەرچەندە چیخۆف لە مەرجی "سەد دێڕی" بێزار و بێتاقەت بوو، بەرەبەرە و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، لە مەرجی ساتێرئامێزیش بێزار بوو، خاکیانە تکای لە لیکین دەکرد، کە ڕێگەی بدات، هەندێجار لەو یاسا و ڕێسا و مەرجە لابدات. لە یادداشتنامەیەکی خەمگینا، کە لە نێو نووسین و کاغەزەکانیا دۆزراوەتەوە، ڕوو لە لیکین دەڵێت: "نووسینێکی کورتی ڕوون، دەشێت جدیش بێ و بە ئاسانیش بخوێنرێتەوە... ئەلهەقی ساتیر و ساتیرنووسی کارێکی دژوارە، هەندێجار دەتەوێ ساتیرێك بنووسێت، کەچی کاتێ بە خۆ دەزانی، شتێك دەردەچێت، دڵ لێی تێك هەڵدێ، هەنگێ بتەوێ و نەتەوێ، ڕوو دەکەیتە جدیەت نووسی." (بڕوانە نامەی پاش ١٨٨٣/٤/١٧...).

لیکین، دوای دوودڵیەکی زۆر، بە ناچاری قایل بوو، سەبارەت بە چەند چیرۆکێك، چاوپۆشی لە مەرج و یاسا و ڕێساکانی خۆی بکات. لەوە دەترسا خوێنەرانی گۆڤارەکەی کە بە دەق و نووسینی کورت و کۆمێدی سادە ڕاهاتبوون، بڕەوێنەوە و بتۆرێن. بەڵام کەس ناڕەزایی دەرنەبڕی. چیخونتی، توانایەکی ئەفسوونگەری تایبەتی هەبوو، لە هەر بوارێکی قەڵەمڕانیدا، دەیتوانی خوێنەرانی خۆی ئەفسوون بکات. هەرچەندە سەرکەوتنی چیخۆف، هێشتا سنووردار بوو، بەڵام ئەم سووکە سەرکەوتنەش، بەغیلی هەندێ لە هاوڕێ و هاوکارەکانی وروژاند. لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندری برای دەڵێت: "ئێمەی ئەهلی ڕۆژنامەوانی، نەخۆشیەکمان هەیە کە پێی دەگوترێ بەغیلی. لەجیاتی بە سەرکەوتنت خۆشحاڵ بن، بەغیلیت پێدەبەن و ژار و قاری خۆیانت بەسەرا دەڕێژن" (بڕوانە نامەی ١٨٨٣/٢/٢٠)

ئەلکساندری برای، ئەو کەرامەتە دەروونی و نەفس بەرزیەی ئەوی نەبوو. پاش ئەوەی کارێکی دۆزیەوە و لە دایەرەی گومرگی تاگانرۆگ دامەزرا، دەستی ماشقەکەی گرت و مۆسکۆی بەرەو تاگانرۆگ بەجێهێشت. ئەم ماشقەیە حەزی لە ئەلکساندر کردبوو، مێردەکەی پیاوێکی سەرسەخت بوو و تەڵاقی نەدەدا. ئەلکساندر هەرکە دەگەڵ ماشقەکەی و کوڕەکەیدا لە تاگانرۆك جێگیر بوون بە نامەی نائومێدانە، بە نامەێن ڕەشبینانە کەوتە سەرودڵ گرتنی چیخۆف. چیخۆف، بەوپەڕی سەبر و خوێنساردیەوە، هەوڵی دەدا لە دوورەوە، ئەم هەمیشە ناڕازیە ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بکات. ئەوەتا لە نامەیەکیا پێی دەڵێت: " تۆ لە هەوەڵی نامەکەتەوە تا کۆتاییەکەی هەر دەگریت." ئەوجا گلەیی ئەوەی لێدەکات کە هێرشی کردووەتە سەر نیکۆلای برایان، کە داماوە بە جۆرێ خووی بە بادەنۆشیەوە گرتووە، شایستەی سۆز و بەزەییە و، دەڵێت: "بەهرەیەکی ڕووسی جوان و بە توانایە، بەخۆڕایی خۆی لە ناودەبات... ئەوپەڕی ساڵێ دوانی دی دەژی، ئیدی بۆ خۆی لێدەبێتەوە." هەروەها چیخۆف، پێی ناخۆش بوو کە گلەیی لە باوکیان دەکرد، چونکە پەیوەندی ناڕەوای کوڕە گەورەکەی دەگەڵ ژنێکی مێرددارا، پێ ناخۆش بوو. لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندر دەڵێت: "ئاخر تۆ چاوەڕوانی چی لە باوکت دەکەیت. بە خۆت

دەزانی کابرا دژمنی خوێنی جگەرە و هەڤژینی ناشەرعییە، یانی دەتەوێ بیگۆڕیت؟... ڕەنگە بتوانی دایکە و پورە فیدوسیا بگۆڕیت، بەڵام سەبارەت بە باوکە نا، بەردێکە لەو گۆڕە، لە هەر وشکە ئیمانداریێکی کۆن سەختتر و سەختگیرترە... هەر کەسە ئازادە لەوەی لەگەڵ کێدا و چۆن دەژی... تۆ ئەم هاوخانەگی و هەڤژینییەی خۆت چۆن دەبینی؟ لانە و ئاشایانەی تۆیە، گەرمابەخشی تۆیە، خەم و شادی تۆیە، شیعری تۆیە، تۆ بەجۆرێ ڕەفتار دەگەڵ ئەم شیعرەدا دەکەیت، وەکو ئەوەی گوندۆرەی دزیاری بێ. لە هەموو کەس بە گومانی: "تۆ لە خەمی ئەوەدایت کە خەڵکی چۆن بیر لەم مەسەلەیە دەکەنەوە و چی دەڵێن. ئەمەت لە خۆ کردووە بە کێشە، داخی پێ دەخۆی، بەردەوام پێوەی دەتلێیتەوە... چ پێویستت بەوەیە بزانی من، نیکۆلا یان باوکت چۆن بیر لەم مەسەلەیە دەکەنەوە؟ من لە جیاتی تۆبام، هەر گوێشم بەم شتانە نەدەدا، ئاخر ئەمە چ کارێك لە تۆ دەکات؟ خەمی چیتە؟... خەریکی ژیانی خۆت بەو تەواو." (بڕوانە نامەی ١٨٨٣/٢/٢٠.)

هەڵبەتە گۆشەنیگای چیخۆف، لەو سەروبەندەدا سەبارەت بەوەی کە (خەریکی ژیانی خۆی بێ) ئەوەبوو کە هاوئاهەنگی و گونجانێك لە نێوان ئارەزووە نهێنییەکانی خۆیدا چێبکات: ڕۆژنامەوانی وەکو سەرچاوەیەکی کاتی بژێوی و، دکتۆری وەکو پیشە. ئەوەتا لە نامەیەکیا ئەم نهێنییە بۆ ئەلکساندری برای دەدرکێنێ: "ناو و شۆرەتێکم پەیداکردووە، ئەو لێکۆڵینەوانە دەخوێنمەوە کە دەربارەی بەرهەمەکانم دەنووسرێن. خوێندنەکەم لە واری پزیشکیدا باشە. ناوبانگی پزیشکیم، خەریکە لە هەموو شوێنێك دەنگ دەداتەوە. بە زەحمەت باوەڕ بە خۆم دەکەم کە بەو ڕادەیە بووبم بە ئەهلی تەقەڵ... هیچ نەخۆشیەك نیە من لێی نەزانم و دەرمانی نەکەم. تاقیکردنەوەکانمان نزیك بوونەتەوە. ئەگەر دەربچم و بگەمە ساڵی پێنجەم مانای وایە دەگەمە لوتکەی سەرکەوتن و " کۆمیدیاکە تەواو دەبێت..." (بڕوانە نامەی نێوان ٣ و ٦/ك١٨٨٢.) پاش چەند مانگێك و لە نامەیەکی تریا بۆ ئەلکساندر دەڵێت: "من ڕۆژنامەنووسم چونکە زۆر دەنووسم، بەڵام ئەمە کارێکی کاتیە، بە ڕۆژنامەنووسی و بە گومناوی نامرم. ئەگەر بمەوێ لەسەر نووسین بەردەوام بم دەبێ دوورەپەرێزی و گۆشەگیری هەڵبژێرم." هەروەها لە ڕوانگەی ئەو قەناعەتەوە کە ئایندەی ئەو زیاتر بە سەماعەی دکتۆریەوە بە ندە تا بە قەڵەم، لەسەری دەڕوات: "خۆم لە دکتۆریدا نوقم دەکەم، ڕزگاری من تەنیا لە دکتۆریدایە، هەرچەندە هێشتا نەگەیوومەتە قەناعەتی تەواو کە تەنیا دکتۆرم و هیچی دی." (بڕوانە نامەی ١٨٨٣/٥/١٣.) ئەوەی ڕاستی بێ، زۆری بایەخ بە خوێندنەکەی لە بواری پزیشکیدا، دەدا. سەری خەستەخانانی دەدا، ئامادەی عەمەلیاتی نەشتەرگەری دەبوو، بەخۆڕایی معایەنەی دۆستانی بێ پارەی دەکرد، دڵسۆزانە و بەخۆڕایی سەرپەرشتی و دەرمانی نووسەر پوپودوگلوی کرد، ئەویش وەکو وەفاداری و پێزانین، وەسێتی کردبوو کە کۆمەڵێك کتێبی بە نرخ و هەڵبژاردەی لە کتێبەکانی، پێشکەش بکەن. چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندری برای، لەوبارەیەوە دەڵێت: "بە نەخۆشی سەحایای مێشك مرد، هەرچەندە من دکتۆری بووم، بەڵام جگە لە من خۆی بە بیست پزیشکی دیکەش نیشان دابوو، بەڵام من تاقە پزیشك بووم، کە هێشتا لە ژیانا بوو، نەخۆشیەکەیم دەست

نیشـان کـرد. ڕۆحـی شـاد و ئاسـوودەبێ! خواردنـەوە کوشـتی." (لـە نامەیـەکی نێـوان ١٥ و ٢٠/ئوکتوبـەر/١٨٨٣وە وەرگـیراوە) بـەجۆرێ خۆشـی بـە پزیشـکیدا چـووبوو، لێـڕا، کتێبێکـی زانستی دەربارەی پەیوەندی سێکسی نێوان نێر و مێی کۆمەڵێك گیانەوەری جیاواز بنووسێت بە ناونیشـانی: "مێـژووی دەسـەڵاتی سێکسـی". بـەڵام زوو لـەم پرۆژەیـە ژێـوان بـووەوە. زۆر لـە تاقیکردنەوەکانی دەترسا، کە بەردەرگایان پێ گرتبوو، بەو زووانە دەستیان پێدەکرد. لە هەمان نامەی ناڤبریدا بـۆ ئەلکسـاندری بـرای دەڵێـت: "پێویسـتە سـەرلەنوێ، لـە هەوەڵـەوە، لـە نووکـەوە هـەموو شـتێك فێرببمـەوە. جگـە لـە تاقیکردنـەوەکان (کـە یـەك لـە دوای یـەك دێـن) دەبـێ کـاری توێکاری جەندەکانیش بکەم، مەشقی مەیدانیش بکەم، سەری خەستەخانان بدەم و معایەنەی نەخۆشان بکەم، ئێشك بگرم... نامپـەرژێ سـەری خـۆم بخورێنم، زۆر هـیلاك و مانـدووم، مێشـکم لەوە زیاتر ناگرێـت: پیری و تەمـەڵی و خوێندنـەوە و نووسـین، زۆریـان بـۆ هێنـاوم... دەترسـم لـە یەکێك لە تاقیکردنەوەکان دەرنەچم."

چیخۆف، گیـانی بـەوەبوو کـە ئارەزوومەندانـە دەچـوو بـۆ ڤوسکرسنسـك تـا هەنـدێ لـە کـارێن خوێنـدن و ئـەدەبی دووربکەوێتـەوە و پشـوویەك بـدات. لـە وێنـدەر ئاشـنایەتی دەگـەڵ دکتـۆر ئەرگنجلسکی پەیداکرد کە سەرپەرشتیار و بەرپرسی نەخۆشخانەی گوندی چیکینوی دراوسێی ڤوسکرسنسك بوو. لەوێ چالاکانە لە چارەسەر و دەرمانی نەخۆشاندا، یارمـەتی دەدا. هەندێجار شەوان لای ئەو دەمایەوە. دەگەڵ دکتۆری ناوبراو و ئەو خوێندکارانەی لە وێ مەشقیان دەکرد، دەکەوتنـە گەنگەشـە و گفتوگۆ و سـوودی زۆری لێیـان وەردەگـرت. باسـی سیاسـەت و ئـەدەبیان دەکـرد، باسـی تورگینیـف، سـاڵتکوف – شـجدرین یـان دەکـرد. هەنـدێ شـیعری نکراسـوفیان دەخوێندەوە، بە کۆمەڵ گۆرانی کۆنی فولکلوریان دەگوت. کاتەکە هێنـدە بـەخێرایی دەڕۆیـی کـە چیخۆف هەندێجار بیری دەچوو بابەت بۆ گۆڤاری (oskolki) بنێرێت. لە نامەیـەکیا عوزرخوایی لە لیکین دەکات کە بابەتی کەمی بۆ ناردووە و دەڵێت: "بمبورە، دنیـا هاوینـە، هـاوین بـە کـەڵکی کارکردن نایەت... تەنیا شاعیران دەتوانن لەبەر تریفەی مانگەشەودا، هـەم شـیعر بنووسـن و هـەم ئاشقێنی بکەن، ئێمەی پەخشاننووس، ئەو بەهرەیەمان نیە." (بڕوانە نامەی ١ یان ١٨٨٣/٨/٢.)

ئەم ئاماژەیە بۆ ئەشق و کاری دڵ لەوە هێوەتر نەڕۆیی. ئیدی چیخۆف، عادەتی وابوو کە ڕازی ژیـانی ئاشـقێنی خـۆی نەدەدرکانـد، خـۆ ئەگـەر بەڕێکـەوت بـۆ کەسـێکی بـاس کردبـا، وەکـو نوکتەیـەك، بـۆ پێکـەنین و سـوعبەت باسـی دەکـرد. چـیخۆف، وەکـو ئاشـناکانی دەیانگێڕایـەوە پەیوەندی نزیکی دەگەڵ ژنێکی بالیەکار و دەگەڵ ژنێکی ئەکتەری فەرەنسی، شـانۆی لنتوفسـکی دا، هەبووە. بە خۆیشـی دان بـەوەدا دەنـێ کـە هاتوچـۆی "یانـەی هەمـەڕەنگ"ی کـە کافەیـەکی بـە ناوبانگی مۆسکۆ بووە، زۆر پێ خۆش بووە، لەوێ ئەفسەرانی گۆساخ و کچانی سـووکی دەبینـی کە بۆ کۆڕی پێکەنین و خواردنەوەیان ڕادەکێشا. لە نامەیەکی بەرواری ٢٥/ك١٨٨٣/١دا بۆ لـیکین دەڵێت: "سەرانسەری شەوم بە وەرقبازی دەگەڵ کچاندا بردەسەر، تا نوێژی بەیانی بـەدەم ڤۆدکـا خواردنەوەوە، یاریم کردووە، بەهۆی ماندوویەتی و بێزارییەوە (من تەنیا نـاو بـە نـاو دەخۆمـەوە، ئەویش کاتێ کە بێتاقەت و ماندووبم) سەرم یەکپارچە تەمە."

ئەوەی ڕاستی بێ چیخۆف کە هەندێجار ملی بۆ ئاشقینی دەدا، هیچ سۆز و سەودایەکی ئاشقانەی لەدڵدا نەبوو، یانی مەسەلەکەی بە جدی نەبوو. ژنان بەلای ئەوەوە هی کات بەسەربردن و ڕابواردن بوون. جارێك، لە یەکێك لە هەڵچوونەکانیا، لە نامەیەکیا (١٨٨٤/٢/٢٤) بۆ هاوسەرەکەی سافلیفی برادەری، هەوەسخوازی خۆی ئاشکرا دەکات و دەڵێت: "لە کۆتایی حوزەیراندا سەرێکی تاگانرۆك دەدەم بەو ئومێدەی ئەو کیژە بدۆزمەوە کە تۆ وەعدت پێ دابووم. مەرجەکانم ئەمانەن: جوانی، ناز ، لە گەڵ جیازیەکی ناچیزی بیست هەزار ڕۆبڵیدا. گەنجانی ئەم سەردەم و ڕۆژگارە زۆر پولەکی پراگماتی بوون."

چیخۆف، هەرچەندە خۆی بە نووسەرێکی ناپیشەیی بچووك دەزانی، بەڵام حەزی دەکرد باشترین چیرۆکی خۆی لە کۆ چیرۆکێکدا چاپ و بڵاوبکاتەوە. ئەوەبوو ئەنجام کۆ چیرۆکێکی شەش چیرۆکی لە نامیلکەیەکی نەوەد و شەش لاپەڕەییدا، بە ناونیشانی (حیکایەتەکانی ملپومین) لەسەر ئەرکی خۆی، چاپ و بڵاوکردنەوە کە شەست کۆپیکی تێچوو. هەڵبەتە کۆچیرۆکی ناڤیری، بە ناوی چیخونتەوە بوو. ئەلکساندر، کە وازی لە کارەکەی، لە دایەرەی گومرکی تاگانرۆك هێنابوو و، بۆ مۆسکۆ گەڕابووەوە، ئەرکی دابەشکردنی کتێبەکەی بەسەر کتێبفرۆشیەکاندا، گرتە ئەستۆ. بەڵام کتێبفرۆشیەکان بە ناونیشانی کتێبەکە (کە لە ڕووسیدا "Sakazki Melpomey"، زیاتر مانای حیکایەتی جن و پەرییان دەگەیەنێ) خەڵەتا بوون و لە بەشی کتێبی منداڵاندا، نمایشیان کردبوو و لە بەرئەوە خوێنەرانی گریمانەیی و ئیحتیمالی بەلایدا نەچووبوون. بۆیە ڕێژەیەکی زۆر کەمی لێفرۆشرا و زۆربەی نوسخەکان بۆ نووسەر گەڕێنرانەوە. ئەوەبوو ئەلکساندر نامەیەکی گاڵتەئامێزی بۆ چیخۆڤ برای نووسی: "ڕووسیا، ناوبانگی تۆ دەبیستێ ئەنتوشا. زوو بمرە، جوانە مەرگە بە تا ببینی چۆن شیوەنت بۆ دەکەن، چۆن لە هەر چوار نکالەوە، لە باکور و ڕۆژئاواوە، لەودیوی دەریایانەوە فرمێسکت بۆ دەڕێژن. هەنگێ گەورە دەبیت، ناوبانگ دەردەکەیت. بەڵام تا ئەو کاتە خەڵکی مەگەر بە نەبەدڵی، دەنا کتێبەکەت ناکڕن."

بەڵام دەرچوونی لە دوا تاقیکردنەوەکانی کۆلیجی پزیشکی، قەرەبووی ئەم ناکامیە ئەدەبی و بازرگانیەی بۆ کردەوە. لە ١٨٨٤/٦/٢٥دا، کە هەستی دەکرد، پێگەی کۆمەڵایەتی بەرز بووەتەوە وهیچ خەمێکی کۆمەڵایەتی نەماوە، لە نامەیەکیا بۆ لیکین. دەنووسێت: "من هە نووکە لە گەڕەکی ئۆرشەلیمی نوێ دادەنیشم... لە هەوای خۆمدام، میزانی میزانم، چونکە شادەتنامەی پزیشکیم لەبەرکایە و دەتوانم کاری پزیشکی بکەم." و بەمجۆرە ناوی خۆی لە پاینی نامەکە دابوو "دکتۆر و پزیشکی ناوچە، ئا. چیخۆف".

هاوینی ئەو ساڵە، وەکو پزیشکی چاودێر بۆ نەخۆشخانەی چیکینوی نزیکی ڤوسکرسنسك گەڕایەوە. ئەو کرێ و هەقدەستەی وەری دەگرت، لەوە زیاتربوو کە تەسەوری دەکرد: پێنج ڕۆبڵ هەقی دەرمانکردنێکی ناکامی دان یەشەی کیژێك، یەك ڕۆبڵ هەقی دەرمانکردنی زەحیری ڕەبەنێك، سێ ڕۆبڵ هەقی دەرمانکردنی ژانەسکی خانمێکی ئەکتەر کە لە مۆسکۆوە بۆ گەشت هاتبوو بۆ ئەو دەڤەرە. لە نامەیەکی بەرواری ١٨٨٤/٨/٢٣ دا بۆ لیکین، دەڵێت: "هێندەم شایی

بەم سەرکەوتنەی پیشە تازەکەم هات، کە حەماس گرتمی و هەموو پارەکەم هەڵگرت و چووم بۆ مەیخانەی بانیکوف، هەر هەموویم دا بە ڤۆدکا و بیرە و هەندێ دەوا و دەرمانی دیکە".

کاتێ چیخۆف، دەبیستێ پیاوێك لە نزیکی ڤوسکرسنسك کوژراوە، مۆڵەت وەردەگرێت، کە توێکاری جەندەکە کە بەو بسپێردرێ. ئەم کارە لە دەشتا، لە هەوای ئازادا، لە ژێر سێبەری دار بەڕوویەکی سەر ڕێگایەکی گوندیدا دەکات. لە ١٨٨٤/٦/١٧دا لە نامەیەکیا بۆ لیکین، دەنووسێت: "جەندەکەکەیان، کە کراسێکی سوور و پانتۆڵێکی نوێی لەبەربوو، بە چەرچەفێك داپۆشی بوو، خاولیەك و ئیکۆنەیەکی چکۆلەیان لەسەر چەرچەفەکەوە دانابوو، داوای ئاومان لە دەرەکی گوندەکە کرد... حەوزە ئاوێك لە نزیکی نزیکمانەوە بوو، کەس قاییل نەبوو سەتڵێکمان بداتێ ئاوی پێ بێنین: گوایە گڵاوی دەکەین" پاشان ئەو دیمەنە بوو بە ئیلهامبەخشی چیرۆکێکی چیخۆف بە ناونیشانی "جەندەك" کە جووتە شاقارەمانەکەی نە بکوژەکەن نە کوژراوەکە، بەڵکو دوو جوتیاری دێهاتین کە ڕادەسپێردرێن شەوێ، لەو جەنگەڵەدا، ئێشکی جەندەکەکە بگرن. کاتێ کە بەڕێوەبەری خەستەخانەی شارەدێی زڤنیگورود، مۆڵەتی دوو هەفتە وەردەگرێت، چیخوف، داوادەکات، لە ماوەی مۆڵەتەکەی ئەودا، بەڕێوەبردنی خەستەخانەکە بەم بسپێرن. دیارە ئەم کارە، بۆ پزیشکێکی گەنجی، تازەکاری، بێ ئەزموونی وەکو ئەو، لە ڕیسك و مەترسی بەدەر نەبوو. بەڕێکەوت یەکەم عەمەلیاتی، کە بۆ منداڵێکی کرد – هەڵبەتە عەمەلیاتێکی زۆر ئاسان بوو – خەریك بوو کارەساتێکی لێ بکەوێتەوە. منداڵەکە کردی بە شین و شەپۆڕ و لەقەفرتێیەکی ئەوتۆ، کە چیخۆف، کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دا، ناچار ناردی بە دووی هاوکارێکی خۆیا لە چیکینو، کە هات و کارەکەی لە جیاتی ئەو، زۆر بە ئاسانی جیبەجێکرد. سەبارەت بە کاروبارەکانی دی، ئیشەکەی لە خەستەخانەی ناوبراودا، زۆر ڕوتینی و ناخۆش بوو. ڕۆژی سی چل نەخۆشی معایەنە و بەڕێ دەکرد. ئیدی پەیتاپەیتا دەبوا مامەڵە لەتەك کێم و زوخ، زەحیری، سینەپاڵو وبرك، و کرمی کەدوودا بکات، جگە لەم نەخۆشیە گشتیانە دەبوا مامەڵە لە تەك جەهالەت و پیس و پۆخڵی و نەزانی و سەرخۆشی دێهاتی و جووتیارانیشدا بکات، کە بە ڕاستی بەم شتانە پەست دەبوو. کوا ئەو جووتیارە یەك دڵ و یەکزمانەی کە تۆلستۆی ئەوەندە، ستایشی دەکرد و بە شانوباڵیا هەڵدەگوت؟ چیخوف،لە نێوان هەر معایەنە و معایەنەیەکدا، لە پەنجەرەی عەیادەکەی خۆیەوە، چاوی دەبڕییە ئەو بارانەی کە لەوبەری جادەکەوە بە خوڕزم بەسەر ماڵەکەی سەرۆکی پۆلیسدا، دەباری. بەوە داخی ئەو هەژاری و بەدبەختی و نەگبەتیەی کە بەرۆکی گوندەکانی گرتبوو، لەخۆی دەڕەواندەوە، کە لە دڵی خۆیدا بیری لە پڕۆژەیەکی گەورە دەکردەوە، پڕۆژەی نووسینی "مێژووی پزیشکگەری لە ڕووسیا"دا. قەناعەتی وابوو کە نووسینی ئەم بابەتە لە شێوەی تێزێکدا، پایە و پێگەو ناوبانگی ئەو لە ناوەندە زانستیەکاندا بە تەواوەتی دەچەسپێنێ. بەڵام دوای خوێندنەوەی نزیکەی سەد سەرچاوە و کتێب دەربارەی ئەو بابەتە و تۆمارکردنی سەرنج و تێبینییەکانی خۆی لەو بارەیەوە، لە پڕۆژەکەی سارد و ژێوان بووەوە، چونکە پێی وابوو، ئەو کارە، هیچ خەیاڵ و داهێنانێکی تایبەتی ئەوی تیا نابێت.

کاتێ بۆ ڤوسکرسنسک گەڕایەوە، بۆ ئەو هەر وەکو زڤینگورود وابوو، ئاسوودەتر نەبوو. وەزعەکەی بە دڵ نەبوو، خۆی گوتەنی، هەواکەی خەفەناك بوو. بۆیە لە ١٨٨٤/٩/٣دا بۆ شار، بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە. ئیدی زۆری پێنەچوو تابلۆیەکی مسینی بەسەر دەرگای ماڵەکەیەوە هەڵواسی کە ئەم دەستەواژەیەی لەسەر هەڵکەندرابوو: " ئانتون چیخوف، دکتۆر لە پزیشکیدا"

لەم شارەدا، کە ڕۆژ بە ڕۆژ خوشتری دەویست و دەیگوت قەت بەجێی ناهێڵێ، جارێکی دی لە پاڵ کاری پزیشکیدا، کەڵکەڵەی ڕۆژنامەوانی و نووسینی کەوتەوە سەر. بەڵام کە حیساب و کیتابی خۆی دەکرد، دەگەییە ئەو ئەنجامگیرییەی کە کاری پزیشکی، لە ڕووی دەرامەت و دەسکەوتی داراییەوە چ بۆ خۆی و چ بۆ کەسوکارەکەی، زۆر لە پیشە و کاری نووسەرایەتی، مسۆگەرترە. دوای ئەوەی لە مۆسکۆ جێگیربوو، بە نزیکەی مانگ و نیوێك لە نامەیەکیا بۆ ئیڤانی برای لە ڤوسکرسنسك، دەڵێت: "خۆزگە نەقڵی مۆسکۆ دەبوویتەوە و لێرە کارێکت دەدۆزییەوە، هەنگێ بە مووچەکەی تۆ و دەرامەتە کەمەکەی من، دەمانتوانی وەکو پاشا بژین. دەسکەوتی من لە هەموو ئەوانەی کە لەگەڵ تۆدان، پترە، کەچی وێڕای ئەوەش هەر بێ پارەم، تەنانەت بەشی خواردنی تەواوەتیشم پێ نییە، کونجێك نیە تیا دانیشم و کاربکەم. ناتوانم دەگەڵ نیکۆلادا بژیم، نەك لەبەر ئەوەی چارەیم ناوێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆی شتی وای ناوێ... حاڵی حازر کوپیکێکم پێ نییە. بە دڵ تەنگییەوە چاوەڕوانی یەکی مانگی داهاتووم کە قەرارە لە پترسبورگەوە پارەم بۆ بنێردرێت. شەست ڕۆبڵ وەردەگرم، بەڵام یەکسەر نامێنێ... بۆ هیچ شوێنێ دەرناچم، هەمیشە سەرگەرمی کارم." (لە نامەیەکی نیوەی دووەمی/ ئوکتوبەر/ ١٨٨٤ وە وەرگیراوە.)

لە ٧/ت١/١٨٨٤دا، لە گەرمەی ململانێی تاقەتبەری نێوان ناردنی ئەو بابەتانەی دەینووسین و معایەنە و چارەسەر و دەرمانی نەخۆشانی لات و لەوێڕی بێ پارە و پولا، لە ناکاوا تووشی کارەساتێك بوو کە چیخۆف زۆر بە هەندی نەگرت، وای دەنواند هیچ نییە: وشکە کۆکە، دەم تاڵ بوون، خوێن هەڵهێنان. یەکسەر هاوڕێ ڕۆژنامەوانەکەی خۆی، سرگینکوی ئاگادار کردەوە کە: "نەخۆشی سیل نیە." لە ١٠/ك١/١٨٨٤دا، لە نامەیەکیا بۆ لیکین دەڵێت: "سێ ڕۆژە خوێن هەڵدێنم. ئەمە لە نووسینی کردووم، نایەڵێ بۆ پترسبورگ بڕۆم... ئەوەی ڕاستی بێ هەرگیز پێشبینی ئەمە نەدەکرد. سێ دانە ڕۆژە تفەکەم پاك نیە، نازانم کەی ئەو دەرمانانەی کە هاوڕێکانم دەرخواردمی دەدەن، چاکم دەکەنەوە. وەزعی گشتیم باشە. ڕەنگە هی ئەوەبێ کە دەمارێکم پچڕابێ." ئەوسا لە درێژەی نامەکەیا دەڵێت: "بۆ نەگبەتی کۆمەڵێك نەخۆشی ماڵانم هەن، ناتوانم بچم بیانبینم. نازانم چییان لێبکەم، بە ڕاستی شەرمە بە دکتۆرێکی دیکەیان بسپێرم. ئەمە جگە لەوەی، پارەیەکیشم لێیان دەست دەکەوێ."

هەرکە چاك بووەوە، دەستی بە تەبابەت و پزیشکگەری خۆی کردووە. هەرچەندە قەناعەتی تەواوی هەبوو کە سیلی نییە، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە کە سەفەرێکی دەرمانی بۆ شوێنێکی کەش و هەوا خۆش، فێنکی وەکو قرم یان قەوقاز یان هەندەران بکات. بەڵام پاشان دەسبەرداری ئەو تەگبیرە ماقوولەش بوو. نامەیەك بۆ هاپۆ میتروڤان چیخۆف دەنووسێت: "کاری پزیشکیم

باش دەڕوات، بەردەوام معایەنە و دەرمانی نەخۆشان دەکەم، نەخۆش لە دوای نەخۆش، ڕۆژانە پتر لە ڕۆبڵێك کرێی گالیسکەکە دەدەم. دۆستانێکی زۆرم هەن، لەبەرئەمە نەخۆشی زۆرم هەن، نیوەیان بە خۆڕایی مالیجەو دەرمان دەکەم، نیوەکەی تریان سەر و پێنج یان سێ ڕۆبڵم دەدەنێ. (لە مۆسکۆ، پزیشکان لە هەنبەر معایەنە و فەحسی هەر نەخۆشێکدا لە سێ ڕۆبڵ کەمتر وەرناگرن، لێرە هەموو شتێك لە تاگانرۆگ گرانترە) هەڵبەتە تا ئێستا هیچ سەرمایەیەکم پاشەکەوت نەکردووە، بەم زووانەش پێم پاشەکەوت ناکرێت، بەڵام ژیانم خۆشە و لە هیچم کەم نییە. ئەگەر، نەخۆشی بەرۆکم نەگرێت و ئەمانم بدات، ئایندەی خانەوادەکەمان مسۆگەر دەبێت" (بڕوانە نامەی ٣١/ك٢/١٨٨٥.) وەزعی دارایی چیخۆف ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبوو، زۆری پێنەچوو هەندێ کەلوپەلی ناومال و پیانۆیەکی کڕی، دوو کارەکەری بۆ خزمەت و بەڕێوەبردنی ماڵەکەی ڕاگرت، شەوانی مۆسیقا و سازڤانی ساز دەکرد، دوای ساڵانێکی زۆری کوێرەوەری و هەژاری و بەدبەختی، ئەم شادی و کەیفە بورژوایانەیەی زۆر لەلا خۆش بوو. لە تەمەنی بیست و پێنج هەستی دەکرد، بە یەکجارەکی، بەسەر ئەو بەندەیەدا زاڵ بووە، کە لە ڕۆژی لەدایکبوونەوە لە ناخی ئەودا دەژیا. هەرچەندە خوێنی هەڵدێنا، بەڵام دڵی بەوە خۆش بوو، کە ئەم خوێنە، هەر هیچ نەبێ، خوێنی مرۆڤێکی ئازادە. هەر لە هەمان نامەی پێشوودا کە بۆ هاپۆ میتروڤانی ناردبوو، بە شانازییەوە دەڵێت: " هیچ قەرزێکم لەسەر نیە و پیویستم بە قەرزیش نیە، جاران خۆراکم (گۆشت و ئازووقە) بە قەرز دەکڕی، لە دەفتەرێکا لە سەریان دەنووسیم. بەڵام هەنووکە شتی وا ناکەم، بە نەختی پارەی هەموو شتێك دەدەم"

هەڵبەتە ئەم نامەیە جۆرە گەشبینییەکی دەستکردی تیابوو، زیاتر بە مەبەستی دڵخۆشکردنی مامی بوو لە گوندی. گومان لەوەدا نەبوو کە چیخۆف شانازی بەو سەرکەوتنە مادیەوە دەکرد، کە بە ڕەنجی شانی خۆی بە دەستی هێنابوو. هەموو ئاواتێکی ئێستای ئەوەبوو کە دەسڕۆ و ئابڕوومەندانە بژی. چیخۆف، هەستی دەکرد، لە دەرگایەکی چکۆلەوە خۆی بە دنیای ئەدەبدا کردووە و شۆرەت و ناوبانگی کەڵە نووسەرانی ئەدەبیاتی ڕووسی وەك دۆستۆیڤسکی و تورگینیف و تولستوی، نایەڵێ بە ئاسانی دەربکەوێت... ڕاستە دۆستۆیڤسکی لە ساڵی ١٨٨١دا و تورگینیف لە ساڵی ١٨٨٣دا مردبوون و تولستوی هەرچەندە هێشتا لە ژیاندا بوو و، وای دەنواند کە پشتی کردووەتە هونەر و خەریکی پێغەمبەربازیە، بەڵام بەرهەمەکانیان، هێشتا لای هەموو خەڵکی، لە لووتکەدا بوون و بەجۆری بەسەر زەینی خوێنەردا زاڵ بوون، کە هیچ نووسەرێکی نەوەی نوێ زاتی نەدەکرد هەڤرکییان بکات. چما کەس هەبوو، ئەو پێشەنگ و سەرئامادە زەبەلاحانە بەو ئاسانیە تێبپەڕێنێ؟

چیخۆف، لە سەرەتادا، نەدەوێرا بە خەیاڵیش بیر لەو جۆرە پرسیارە بکاتەوە. بەپەلە و خێراخێرا دەینووسی تا وەعدە بەخیلاف دەرنەچێت، دەرفەتی ئەوەی نەبوو خۆی لە قەرەی دۆز و مەسەلە ئەخلاقی یان ئاینی یان کۆمەڵایەتیە گەرمەکانی ڕۆژ بدات، هیچ پەیامێکی بۆ خوێنەرەکانی نەبوو. هەموو خەمێکی ئەوەبوو کە سەرگەرمیان بکات یان کارێکی وەهابکات خەون بدینن. ئەوەبوو لە نێوان ساڵانی ١٨٨٠ – ١٨٨٤دا، بە جۆرەها ناوی خوازراوەوە، سێ

سەد دەقی لە گۆڤارە ساتیرە جۆراوجۆرەکانی مۆسکۆ و پترسبورگدا بڵاوکردەوە. لە نێو ئەم هەموو تەنز و ساتیرانەدا، چەند چیرۆکێکی وەکو: (کچەکەی ئالبیوون، مەرگی فەرمانبەرێك، قەڵەو و لاواز، مەدالیا، نەشتەرگەری، قومقمۆکە، تاقیکردنەوەی بەرزبوونەوەی پلە، ئیجرائاتی پێویست) هەبوون کە بە ڕاستی لە باری سایکولوژی و تەنزەوانیەوە، ورد و پڕ لە سەلیقەبوون و زۆر بە دڵی لیکین خۆیشی بوون، کەچی بەڕیوەبەری (Oskolki)، هەر هەموو ئەم دەستنووسانەی پێشوەختە سانسۆر دەکرد، و بە کەیفی دڵی خۆی، بە بێ پرسی نووسەر، پەرەگراف و دەستەواژە، بڤە و خەتەرەکانی لادەبرد. ئەوەتا لە نامەیەکی بەرواری ١٨٨٤/٤/١١دا بۆ چیخۆف، دەڵێت: "ئەو وەسفەی دەربارەی شەوی جەژنی پاك و خزمەتگوزارانی بورجی زەنگی کڵێسا کردووتە، هیچ عەیبێکی نیە، نیوەی یەکەمی ئەم چیرۆکەم ناردووە بۆ پیت چنی، بەڵام هەرشتێك پەیوەندی بە سروودخوانی و وێردەوە، بە سەرخۆشی و، جەژنە پیرۆزەوە، بە سەردانی یەکترەوە هەبوو، بمبوورە هەموویم لابردووە."

هەر لە هەمان نامەدا دەڵێت: "چیرۆکە کورتەکانت زۆر جوان و ئەفسووناوین، بەڵام یەکێکیان هەیە دەترسم لە سانسۆر دەرنەچێت. بە ڕاستی ماوەیەکە سانسۆر حەشرمان پێدەکات، خەریکە دەمان خنکێنێ."

هەڵبەتە لیکین ڕاستی دەکرد، دوای ئەم سووکە هەوەڵین تەتەڵە و سانسۆرەی کە لەلایەن بەڕیوەبەری گۆڤارەکەوە دەکرا، ئەوسا سانسۆرچی فەرمی بە خۆ و قەڵەمە شینە ئەستوورەکەیەوە، بە ناو نووسینەکە دەکەوت، بە ئارەزووی خۆی دەستی تێوەردەدا. جەنابی پاسەوانی گیانی نیشتیمانپەروەری، دێڕ و وشەی نەدەبوارد، لە سەلامەتترین ڕستە و وشەی سادە و ڕووندا، بۆ هێمایەك، ئاماژە و کینایەیەك دەگەڕا کە بۆنی دژایەتی تزار و سوپا و کڵێسا و ئاین و ئاکاری خانەوادەیی لێبێت. بۆیە زۆر چیرۆکی چیخۆف، بەر مقەستی سانسۆر دەکەوت و دەسکاری دەکران، یان زۆر بە ئاسانی ڕەفز دەکران. لە گەڵ هاتنە سەر تەختی ئەلکساندری سێیەمدا، ئیدی ڕووسیا پێی نایە قۆناغی سەختگیری و بەدگومانیەوە. لە سایەی دەسەڵاتی کونستانتین پوبیدونوستسڤی سەرۆکی ئەنجوومەنی پیرۆزی کڵێسادا، کە شیرەتکاری تایبەتی تزاریش بوو، ژیانی فیکری و ڕۆشنبیری وڵات، ڕەونەقی خۆی لە دەست دا و هەر ڕاوبۆچوونێکی شەخسی بە خراپکاری لە قەڵەم دەدرا.

وێڕای ئەوەش، چیخوف، تەواو خۆی دەگەڵ ئەم واقیعەدا گونجان بوو. تەبیعەتی خەڵکانی یاخی نەبوو، زیاتر تەبیعەتی ئەو چاودێرەی هەبوو، کە بە گومانەوە و لە هەمان کاتدا بە میهر و سۆزەوە دەڕوانێتە تەبعی بەشەران. بەبێ ئەوەی بە خۆ بزانێ، بە شێوەیەکی خۆڕسك، لەم چیرۆکەوە دەچوو سەر ئەو چیرۆك و تابلۆیەکی گەورەی ژیانی ڕووسیای ئەو ڕۆژ و ڕۆژگارەی، بەوپەڕی وردی، خاکیانە و ڕاستگۆیانە، وێنە دەکێشا. ئەوانەی کە لەم تابلۆیەدا شان بە شانی یەکدی دەبینران، هەر هەموویان، ئەو خەڵکە ئاساییانە بوون، کە نووسەر، لە شار و لە گوندیدا، بەدەم ژیان و داب و نەریتی دزێو و کێویانەوە، لەناکاوا، تووشیان بووبوو و کەشفی کردبوون: جووتیارانی نەخوێندەوار و دڕندەخوو، ئاغا و خانانی بێ ئیش و کار کە بە هۆی ڕزگاری

مسـکێنانەوە، نیمچـە نـابووت بووبـوون، خوێنـدکارانی سـاویلکەی مەسـتی بـیری گـەورە، مامۆستایانی بێزار و بێتاقەت، پزیشکانی بیٚ یەغبالٚ، دوکاندارانی دۆش داماو بەسەر دەفتەری حیساباتەوە، فەرمانبەرانی بەرتیل خۆر، پارەی باوی مسین. هەر یەکێك لەم بوونەوەرانە کە مایەی بەزەیی بوون، بە بەڵایەکەوە، گیرۆدەبوون. چیخۆف، لە ڕێگەی زنجیرەیەك گۆشە و کینایـەی ڕوون و کورتـەوە، ئـەو ڕاز و نهێنییـە پیشـان بـدات کـە لـەودیوی ئـەو ڕواڵەتـە تاریکانەیانەوە پەنهان بوو، پوچی ژیانی ڕۆژانەیانی وەکو خۆی، بیٚ هیچ لایەنگریەك بە کورتی و بە پوختی نیشان دەدا، نە کەسی تاوانبار دەکرد، نە داکۆکی لە کەس دەکرد. حەقیقەتی وەکو خۆی، بە هەموو کارەساتباریەکیەوە، فۆتۆگرافیانە وێنە دەگرت و دەنواند. سەیر ئەوەبوو لەم گەلەریە مەزنەدا، کە پڕبوو لە پۆرترێت و وێنەی شەخسی، نووسەر قەت لە نێوان چیرۆکێك و چیرۆکێکی تردا خۆی دووبارە نەدەکردەوە. هەگبەی بەهرە و زیرەکی ئەو لە بن نەدەهات. لیکین بەردەوام هانی دەدا: "دەبیٚ زیاتر بنووسێت." چیخوف، بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی لە چیرۆك، بایەخی بە فۆرم دەدا. بەڵام بەڕێوەبەری (Oskolki) هەمیشە گلەیی ئەوەی لێدەکرد "بۆچی بە پێداچوونەوە و پاکنووسی چیرۆکەکانت، وەختی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت؟ کەس ئێستا شتی وا ناکات." بەڵام چیخۆف گوێی بەو گلەییانە نەدەدا، چیرۆك لە دوای چیرۆك پتر بایەخی بە فۆرم و شێواز دەدا، دەیویست خاوەنی شێوازێکی سادە، سفت و خێرا و بیٚ گریٚ و گۆڵٚ بێت. شێوازێك کە خوێنەر هەست بە بوونی نووسەر نەکات و نووسەر لە بیربکات و تەنیا دەگەڵٚ کاراکتەر و قارەمانەکاندا بژی. بە هیچ جۆریٚ حەزی نەدەکرد حوزوری خۆی لە چیرۆکەکانیا دیاربێـت. لـە مـانگی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ۱۸۸۱دا ژمارەیـەکی گۆڤـاری (تەلـەگراف نوفوروسیسك) پیٚ گەیی، کە گوتارێکی درەخشانی دەربارەی کۆچیرۆکەکەی ئەو (حیکایەتەکانی ملپومین) تیابوو کە دەڵێت: "ئەم چیرۆکانە کورتن، خێرا دەخوێنرێنەوە، جوانی و ڕەوانیان، بزەیەکی خۆڕسك دەخەنە سەر لێوان. تەنزێکی دیکنزانەیان تیایە: پێکەنین ئامێز و هەم خەمناکن." گوتارەکە ناوی ئیاگۆی لەسەر بوو. بەڵام چیخۆف زۆر باش دەیزانی کە ئیاگۆ، ناوی خوازراوی هاوڕێی کۆن و وەفاداری سەردەمی قوتابیەتی خۆی، سرگینکویە. بۆیە ئەم وتارەی بە هەند وەرنەگرت و تەنیا وەکو مجامەلەیەکی دۆستانە وەریگرت و بێهیچ ناخۆشیەك ئەوەی لە وتارەکەوە بۆ دەرکەوت کە هێشتا زۆری ماوە بۆ سەرکەوتنی ئەدەبی تەواو.

"٦"

## هەوەڵین سەرکەوتن و هەوەڵین ناکامی

ئیڤان، دوای هەوڵێکی زۆر، توانی خۆی لە ڤوسکرسنسکەوە بۆ مۆسکۆ نەقڵ بکات و ببێ بە بەڕیوەبەری قوتابخانەیەکی سەرەتایی، کە مووچەکەی زیاتر بوو. هەرچەندە چیخوف، دەمێ بوو بەو ئاواتەوە بوو کە خانەوادەکەیان جارێکی دی لە دەوری یەك خڕببنەوە، بەڵام ئەم هاتنەوەیەی ئیڤان لایەنێکی نەرێنیشی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە خانەوادەکەیان نەیاندەتوانی چیتر لە پشووی هاویندا بچن بۆ ئەو خانووە گەورەیەی کە لە ڤوسکرسنسکدا بەدەست ئیڤانەوە بوو. بۆیە دەگەڵ هاتنی هاوینا و خۆشبوونی هەوادا کەڵکەڵەی گوندی کەوتە سەر. ئیدی کوڕی دوکاندار و ڕۆژنامەوانی بچووك و تازە کورە، ئارەزووی گەشت و گەڕانی دەکرد، ئەم گەشت و گەڕانەیش لەو موڵك و دەشتە بەرینانەی ڕووسیادا دەست دەکەوت، کە تورگینیف و تولستوی لە بەرهەمەکانیاندا وەسفیان کردبوو. ئەو هاوینانەی کە لە دەوروبەری مۆسکۆ بەسەری بردبوون، ئارەزووی ژیانی لادێیان لەلا وروژاندبوو. ئەوەبوو ئەمجارە ڤیروسیای لێکرد و ڤیلایەکی لە بابکینو بەکرێ گرت، ئەم ڤێلایە لە دووری سێ کیلۆمەتری ڤوسکرسنسك بوو، موڵك و باخی خانەوادەی کیسلیوف بوو کە منداڵەکانیان قوتابی ئیڤانی برای بوون. جا بۆ ئەوەی پارەی ئەم ریسکە قومارئاسایە دابینبکات، ناچاربوو سەد ڕۆبڵ لە بەڕیوەبەرێتی گۆڤاری (سەعاتی زەنگدار) قەرزبکات. ئەوەبوو، لە ١٨٨٥/٥/٦دا ماڵباتی چیخۆف، جانتا و کارتۆن و کتێب و ڕۆژنامە و شووشە مرەبا و کرۆکاسە و لە سەرووی هەموویانەوە سەماوەرێکیان پێچایەوە، بە باروبنەوە سواری دوو گالیسکە بوون، لە جەرگەی شەوا، بە بەر ماڵی کیسلیوفدا کە لە غوڕابی خەودا بوون، تێپەڕین، لەدیوی ئەو دیوی باخەکەدا، لەبەر ڤیلا چکولەکەدا، کە بۆ هاوینی ئەوان دانرابوو، دابەزین. دەرگاکان کرابوونەوە، گڵۆپەکان هەڵکران، چیخوف سەرسام بوو. نامەیەکی بۆ میخائیلی برای نارد: "ژوورەکان گەورەن، کەلوپەلی ناو ڤێلاکە لە پێویستی ئێمە زیاترن. هەموو شتێك جوان و بەدڵی خۆمانە، ڕەحەت، خۆش، جێ شخارتە، تەپڵەکی جگەرە، دوو دەستشۆر... مەگەر خوا بزانێ ئەم ماڵە چێیان بۆ ئامادە کردووین! هیچ شتێك نەماوە بۆیان دا نەنابین! ڤیلا و کۆشکێکی وەها لە دەوروبەری مۆسکۆدا هیچ نەکات پێنج سەد ڕۆبڵ دەکات... کە هاتی بەخۆت دەیبینی. هەرکە چووینە ژوورەوە، من جانتاکانی خۆم بەتاڵ کرد و دەستم بە نان خواردن کرد. پێکێ ڤۆدکایشم بەسەراکرد و... تەسەور ناکرێ کە لە پەنجەرەکانەوە دەڕوانێتە درەختە چڕە سێبەرەکان و کەناری ڕووبارەکە چ دیمەنێکی جوان و خۆشیان هەیە... بولبولێك دەیخوێند، ئەما خوێندن، باوەڕم بەگوێی خۆم نەدەکرد" (بڕوانە نامەی ١٨٨٥/٥/١٠).

چیخوف، ڕۆژی دواتر بە جدی کەوتە گەڕان بە باخەکەدا، کە کەوتبووە سەر ڕەخە نشێوەکەی ڕووباری ئیستراوە:باخێکی گەورە و بەرینی وەکو باخەکانی ئینگلتەرا بوو، چڕەدار و درەخت، یەکپارچە گوڵ و گوڵزار، حەوزی ماسی... ئیدی خانەوادەی کیسلیوف، دەگەڵ هەردوو کوڕە

گەورەکەیانا، ئالکساندرا (ساشا) و سێرگی دا، لەم بەهەشتە خۆش و ئارامەدا دەژیان. خاتو کیسلیوفا، خانمێکی چالاك و ڕوح سووك بوو، حیکایەتی زۆر بەنرخ و پڕ بەهای بۆ منداڵان دەنووسی. ماڵەکەیان پڕبوو لە خزمەتکارێن گوێڕایەڵ و ئیشکەر، هەمیشە میوانیان هەبوو، یانی میوانیان لێنەدەبڕا. هەر زیافەتێك میوانی خۆی هەبوو، لەوە دەچوو ئەم ماڵباتە لێڕابن، هەرچی سەروەت و سامانێکیان ماوە هەمووی خەرج بکەن، هیچ خەمێکی ئایندەیان نەبێت. چیخوف کە لە شانۆنامەی باخی ئالوباڵودا، باسی هەرەس و داڕوخانی دارایی و موڵکی خانەوادەیەك دەکات، ماڵباتی ناڤبری وەیاد دێنێتەوە.

چیخوف، هەرچەندە لەوکاتەدا، زیاتر لەژێر کاریگەری و باندۆری ڕەفتاری دۆستانە و میواندۆستی خانەخوێیەکانیا بوو، هەرچەندە حەزی دەکرد، بەدرێژایی ڕۆژ بێ ئیش و بێکار، بێ خەم و خەیاڵ بسوڕێتەوە، بەڵام دەبوا زۆر بە جدی کاربکات، تا پارەی ئەم گەشت و سەیرانەیان لە گوندی، دەربێنێ. بەیانی سەعات حەوت لە خەو ڕادەبوو، لە پشت کۆنە مێزێکی مەکینەی خەیاتیەوە دادەنیشت و دەستی بە کاری نووسین دەکرد. بەڵام جووتیارانی دەوروبەر کە بیستبوویان، پزیشکێك هاتووە بۆ بابکینو، زۆرجار بۆ نەخۆشی دەهاتن بۆ لای و، ناچار دەستی لە کاری نووسین هەڵدەگرت. لە نامەیەکیا بۆ لیکین، دەڵێت: "نەخۆشان سەرم چۆڵ ناکەن، ماندووم دەکەن. ئەم هاوینە سەدانم لێ معایەنە کردوون، و هەموو دەسکەوتی من یەك ڕۆبڵ بووە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٥/٩/١٤.)

چیخوف، دوا نیوەڕوان، هەم بە قولاپ و هەم بە سەبەتە ڕاوە ماسی دەکرد، سەری لە زۆری ڕاوەکەی خۆی سوڕدەما. لە نامەیەکی ١٨٨٥/٥/١٠دا بۆ میخائیلی برای دەڵێت: "دوێنێ ماسییە دڕکەیەکی گەورە کەوتبووە یەکێك لەم سەبەتانەوە، ئەم بەیانیە بیست و نۆ ماسی شەبوتمان دەرهێنا... ئەمڕۆ، بۆ فراڤین سوپی ماسی و ماسی برژاو و ماسی سورەوەکراومان دەبێ." خاتو کیسیلوف زۆرجار دەگەڵیا دەچووە ڕاوە ماسی، قولاپەکەی هەڵدەدایە ئاوەکەوە، بەدەم گرتنی داوەکەوە، گەنگەشەی ئەدەبیاتی دەگەڵ چیخوفدا دەکرد، کە هەستی کرد زۆر بە تاسەوە گوێ لە قسەکانی دەگرێت، تا بیانکات بە هەوێنی چیرۆکەکانی، زۆر حیکایەتی ناو کۆنە گۆڤارانی فەرەنسی بۆ دەگێڕایەوە.

چیخوف کە لە ڕاو دەگەڕایەوە، دەستی بە نووسین دەکردەوە و تا ئێواریێ بەردەوام دەبوو. ئێستا کە بابەتی بۆ گۆڤاری (Oskolki) نەدەنووسی، کاتی زیاتری هەبوو بۆ چیرۆك نووسین، بەتایبەتی ئەو چیرۆکانەی کە بۆ گۆڤاری (سان – پترسبۆرگ)ی دەناردن، کە بەکەیفی خۆی و بێ هیچ مەرجێکی پێشوەختەی وەکو کورتی و درێژی و سنووررداری دێڕ، دەینووسین. لە دوای شیڤ خواردن کە لە سەعات هەشتی ئێوارێدا دادەنرا، هەمووان لە هۆڵەکەی ماڵی کیسلیوڤ، لە دەوری یەکدی خڕدەبوونەوە، بەدەم خواردنەوە و گفتوگۆ و گەنگەشە و وەرەقبازی و شەترەنج و گوێگرتن لە مۆسیقاوە کات بەسەر بەرن. خاتو کیسلیف دەنگێکی یەجگار خۆشی هەبوو، مامۆستا تایبەتیەکەشیان، خانمێکی پیانۆژەنی زەبەردەست بوو. چیخوف زیاتر حەزی لە (لیلیات)ـەکانی شوپان دەکرد. لە کۆتایی شەوبێریەکەدا، مامۆستا، سوناتای مانگەشەوی

بتهوڤنی لێدەدا، خاتو کیسلیوڤ گڵۆپەکانی دەکوژاندەوە، چیخوف بە تاقی تەنیا، بە تاریکی لە بانیژەکە دادەنیشت، هەستی دەکرد، ئارامی و شادی دڵی پڕدەکات، کە دوا نۆتەکان لە جەرگەی شەوا ئاوا دەبوون، هەنگێ، هەرکەسە کڕوکپ بۆ ماڵی خۆی دەڕویشتەوە.

بە چەند ڕۆژێك پاش ئەوەی گەییشتنە بابکینو، چیخوف هەواڵی زانی کە ئیسحاق لیڤیتانی نیگارکێشی هاوڕێی، لە گوندێکی نزیکی ئەواندا، خۆی لە کەوێلێك پەستاوە، مێشکی تێکچووە و لەگینە خۆی بکوژێت. یەکسەر چوو بە شوێنیا، لە کەوێڵەکەی دەرهێنا، بڕێك ئامۆژگاری کرد، لە ژوورێکی ئەلاحەدەی ڤێلاکەدا جێی کردەوە. لە ١٨٨٥/٥/٩دا لە نامەیەکیا بۆ لیکین، دەڵێت: "لیڤیتانی بەسەزمان وەزعی خراپە، لەوەدەچێ کەمێك تێك چووبێت، دەیویست خۆی هەڵواسێت. هێناومە بۆ لای خۆم، جێگەم داوەتێ، پیاسەی دەگەڵدا دەکەم... پێموایە خەریکە باشتر دەبێ... تەبیعەت و سروشتەکەی دەوروبەرمان یەجگار جوانە، نە چاو و نە دڵ لە تەمەشای تێرنابێت..."

بەدەم پیاسەی دوورودرێژی دوو قۆڵی نێو ئەم کێڵگە و باخ و باخاتەوە، لیڤیتان، بەرەبەرە مەیلی ژیانی لا زندوو دەبووەوە. چیخوفش، هاوڕێ دەگەڵ ئەم نیگارکێشەدا، بە شێوەیەکی وردتر سەرنجی ئەم دیمەنە سروشتیانەی دەدا، بچوکترین گیا، بچوکترین گۆلاو، بچووکترین ساقەتەو لاسکە گیا، هەستیان دەهەژاند، هەر هەموو ئەمانەی لە هزر و هەستی خۆیدا، وەکو گەنجی پڕ بەها، بەوپەڕی سەبر و حەوسەڵەوە، عەمار دەکرد.

مخابن، لەو ماوەیەدا، شفای لیڤیتان لە هەڵکشان و داکشاندا بوو، جاری وا هەبوو لە لوتکەی شادمانی و گەشبینیەوە، دەکەوتە هەڵدێری تووشترین نائومێدی و ڕەشبینیەوە. هەرکە چاوی بە کیژێك کەوتبا، تەنانەت ئەگەر زۆر جوانیش نەبا، یەکسەر دەکەوتە داوی ئەشقیەوە و، دڵی خۆی بۆ دەکردەوە. بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی کە کچێکی دیکەی دیتبا، مەیلی دەدایە و ئەوەی یەکەمی لە بیردەکرد. بە قژە ڕەش و پڕ و لوولەکەیەوە، بە کەپووە زلەکەیەوە، بە چاوە پشکۆ ئاساکانیەوە، بە برۆ ئەهریمەنیەکانیەوە، هیچ قۆزی و جوانیەکی تیا نەبوو، کەچی ژنان، تەنانەت ئەو ژنانەش کە گلەییان لە بێ بە قاییەکەشی هەبوو، دڵبەندی دەبوون. لە بابکینو، چاوبازی دەگەڵ ماریای خوشکی چیخوفدا دەکرد. ماریا تازە پێی نابووە تەمەنی بیست و دوو ساڵیەوە، کچێکی زیتەڵ و ڕووخۆش بوو، ئاوێتەیەك بوو لە خەیاڵپەروەری و واقیعگەرایی، دەستی ڕەسم و نیگارکێشی هەبوو، لە خانەی مامۆستایانی ڕایڤسکی کچان دەیخوێند و خۆی ئامادە دەکرد کە ببێت بە مامۆستا. سەروسیمای خەمناکی لیڤیتان و، بەهرەمەندی لە بواری ڕەسم و نیگاران، قسە ئاگرینەکانی، کاری لە دڵ و دەروونی ئەم کیژە دەکرد: بە قارەمانێکی ڕۆمانتیکی نەگبەت و سەر لێشێواوی دەزانی کە کەوتبووە ناو کۆمەڵگەیەکەوە کە لێی نەدەگەیشتن. بەیانیەك کە لە باخەکانی بابکینو پیاسە دەکەن، بە خۆشی و ئارامی دەربارەی هەر شتێك قسان دەکەن، لیڤیتان لەبەردەم ماریادا دێتە سەر چۆکان و سوێندی بۆ دەخوات کە دڵبەستەی ئەو بووە و دەیەوێ زەماوەندی دەگەڵ بکات. ماریا، دەپەشۆکێت، نازانێ چ وەڵامێکی بداتەوە، بە غار بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە، خۆی بە ژوورەکەی خۆیدا دەکات، بە درێژایی ئەو ڕۆژە گریابوو، تەنانەت بۆ

شیڤش نەهاتبووە دەرێ. هەنگی چیخوف دەچێتە ژوورەکەی و ئەویش گرێی دڵی بۆ دەکاتەوە، بەدەم هەنسك و گریانەوە، قسەکانی لیڤیتان و وەزع و حاڵی دەروونی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە. چیخوف، ئاقڵانە، ئامۆژگاری دەکات کە بە وردی بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە. بە خوشکەکەی گوت: "هەڵبەتە دەتوانی شووی پێبکەی، بەڵام ئەوە بزانە کە ژنانی تەمەن بالزاکی١* بە کەڵکی ئەو دێن نەك کچۆڵانی وەکو تۆ" ماریا، بەبێ ئەوەی بزانێ مەبەستی براکەی لە "تەمەن بالزاکی" چیە، یەکسەر پەی بەوە دەبات کە چیخوڤ برای نیگەرانە لەوەی کە ماریا چارەنووسی خۆی بە چارەنووسی پیاوێکی ناجێگیر و ڕاڕای وەکو لیڤیتان ببەستێتەوە. بۆیە لێدەبڕێ ئەم خوازگارە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. پاشان دەنووسێت: "هیچ وەڵامێکی لیڤیتانم نەدایەوە، یەك دانە هەفتەی تەواو، پەست و غەمگین، بە دەوروبەرما سوڕاوەتەوە، بەڵام من لە ماڵ و تەنانەت لە ژوورەکەی خۆیشم نەدەهاتمە دەرێ... بەمجۆرە چیرۆکی ئاشقێنیەکەمان کۆتایی هات. بەڵام وێڕای ئەمەش تا کۆتایی تەمەنی کورتیشی، وەکو دوو هاوڕێی باش و دڵسۆز ماینەوە." (بڕوانە، یادگارێن ڕۆژانی ڕابردووی دوور، ماریا چیخوف)

هاوین، بەرەبەرە تێدەپەڕی، چیخوف زیاتر خەمی بێ پارەیی بوو. پارەی پێنەبوو قەرزەکانی بابکینوش بداتەوە، تەنانەت کرێی گەڕانەوەی خانەوادەکەیانی بۆ مۆسکۆ، پێ نەبوو. ئیدی ناچار، کەوتە داوای پاداشتی بەرهەمە بڵاوکراوەکانی، لە بەڕێوەبەر و سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە بەرهەمەکانیان بڵاوکردبووەوە، دەستبەرداریان نەبوو، تا هەندێ لە پاداشتەکانیان بۆ نارد، ئەوەبوو بە خاوخێزانەوە لە کۆتایی ئەیلولی ١٨٨٥دا، بۆ مۆسکۆ گەڕانەوە. ئیدی چیخوف، یەکسەر گەڕایەوە سەر کارە دوولۆنەکەی خۆی: نۆژداری و ئەدەب. بەڵام لە کاتێکا کە بەم شەقامە "خەمناك و دۆزەخ ئاسایانەدا" دەسووڕایەوە، بەردەوام خەونی بە ئەفسوونی دێهاتیانەی بابکینووە دەبینی. لە نامەیەکیا بۆ خاتو کیسلیوف دەڵێت: "ئێستاش لەزەتی یاد و یادگاری ڕاوە ماسی و قولاپ و پەت و سەبەتەی ماسی گرتن و کرمم، لەو دەشتە سەوزەدا، لەبیر نەچووە و بە ڕادەیەك دەگەڵ یادگاریەکانی هاویندا دەژیم، کاتێ بەیانیان لە خەو ڕادەبم دوودڵم کە ئاخۆ ماسیم گرتووە یان نا" (بڕوانە نامەی بەرواری ١ یان ١٨٨٥/١٠/٢.)

وێڕای ئەمەش، مانەوەی هاوینی لەو بەهەشتەدا، لە ڕووی تەندروستیەوە هیچ یارمەتیەکی نەدا. دیسان کەوتەوە خوێن هەڵهێنان. ماڵباتی چیخوف، پاش گەڕانەوەیان بە ماوەیەکی کەم، دیسان ماڵیان گواستەوە، ئەمجارەیان بۆ ئەودیوی ڕووباری موسکوڤا، بۆ گەڕەکێکی، وەکو چیخوف لە نامەیەکیا بۆ لیکین، دەڵێت: "گوندیاتی ڕاستەقینە، پاك و خاوێن، هێدی و هێمن، هەرزان و... کەمێك فەرامۆش کراو." (بڕوانە نامەی ١٨٨٥/١٠/١٢.)

لیکین، کەمێك پاش گەڕانەوەی ماڵباتی چیخوف لە هاوینە سەفەرەکەیان و ماڵ گواستنەوەیان، چیخوف، بۆ ماوەی دوو هەفتە، لە سەر حیساب و مەسرەڤ خۆی بۆ پترسبورگ دەعوەت دەکات. چیخوف کە هێشتا پایتەختی نەبینی بوو، ئەمەی بە هەلێکی باش زانی، چوو پانتۆڵ و پاڵتۆیەکی تازەی کڕی، لە ١٨٨٥/١٢/١٠دا سواری قیتار بوو بەرەو شاری تەم و مژ، شاری دەوڵەتڕانی، و گەورە پیاوانی ئەدەب و مەڵبەند و مەکۆی نووسەرانی پێشەنگی ڕۆژگار

(سالتیکوف – شچدرین، گریگوروڤیچ، لسکوف، ئوسپنسکی، پلشچیف) و شەبەنگی ڕوحی کلاسیکانی وەك: (پوشکین، گوگول، دۆستویفسکی، و نکراسوف.)... چیخوف، لە نێو ئەو گالیسکەیەوە کە لە وێستگەوە بۆ ماڵی لیکینی دەبرد ، سەری هێنابووە دەرێ و بە تاسەوە دەیڕوانیە شەقامە پان و درێژەکانی شار، بینای جوانی بە روکاری ئیتاڵیایی فستقی یان قاوەیی ئامال زەرد، سەرما و ڕێك و پێکی شار، یان ئەم هەموو جوانیەی کە ڕێك پێچەوانەی پیرە مۆسکۆی ڕەنگاو ڕەنگی ئاشفتە و گوندیانە بوو، کە ئەو زۆری خۆش دەویست. کە گەییە ئەوێندەر، نەیدەزانی ئەو چیرۆکانەی کە خۆی بە "گاڵتەی منداڵانی" ناودەبردن، لێرە ڕەواجێکیان هەیە و خەریکە ناو و شۆرەتی نووسەرێکی ڕاستەقینەی بۆ پەیدا دەکەن. سەری لە پێشوازی گەرمی ئەو نووسەرانە سوڕمابوو کە لیکین پێی دەناساندن. لە نامەیەکی ٤/ك٢/١٨٨٦دا بۆ ئەلکساندری برای دەڵێت: "هەر هەموویان دەعوەتیان دەکردم، ستایشیان دەکردم. منیش لای خۆمەوە هەستم بە تەریقی دەکرد کە تا ئەو کاتە بەوپەڕی بێ موبالاتی، بەرهەمەکانم نووسیون، ئەگەر بمزانیبا بەمجۆرە نووسینەکانم دەخوێننەوە، هەرگیز بە گوێرەی داوا کاری نووسینم نەدەکرد." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ٤/ك٢/١٨٨٦)

دوای دوو هەفتە لە نامەیەکیا بۆ بیبلین، کە یەکێك بوو لە نووسەران و سکرتێرانی نووسینی گۆڤاری (Oskolki) دەڵێت: "جاران کە نەمدەزانی خەڵکی چیرۆکەکانم دەخوێننەوە و داوەریان دەربارە دەکەن، بەوپەڕی ئاسوودەیی دەمنووسی، نووسین و بلینی (جۆرە کولیچەیەکە) خواردنم بەلاوە وەکو یەك بوو، بەڵام ئێستا کە دەنووسم، دەترسم" (بڕوانە نامەی ١٩/ك٢/١٨٨٦)

چیخوف، لە پترسبورگ، ئاشنایەتی دەگەڵ قوتبێکی گەورەی ڕۆژنامەوانیدا بە نێوی ئالکسی سوڤورین، پەیداکرد، ئەم پیاوە دامەزرێنەرو بەرێوەبەری ڕۆژنامەی "ڕۆژگاری نوێ"بوو، کە گەورەترین ڕۆژنامەی ئەو سەردەمە بوو. دوای ئەوەی چیرۆکی (ڕاوچی)ی چیخۆف دەخوێنێتەوە، خۆ بەخۆ پێشنیازی ئەوە بۆ چیخۆف دەکات، کە چیرۆك بۆ ڕۆژنامەکەی ئەو بنووسێت و لە بری هەر دێرێك دوازدە کوپیکی بۆ حیساب دەکات. هەڵبەتە چیخوف، دڵی بەم پێشنیازە خۆش بوو، سەرچاوەیەکی دەرامەتی چەور بوو، ئەوەی زیاتر بۆ ئەم کارەی هاندا، ئەوەبوو کە چیخوف لە یەکەم بینینەوە سوڤورینی وەکو پیاوێکی ڕۆشنبیر، چالاك و جدی، سەر ڕاست هاتبووە بەرچاو. ڕاستە ئەم ڕۆژنامەوانە لایەنگری بێ چەند و چوونی حکوومەت بوو، بۆیە لیبراڵەکان بە هەلپەرستێکی بێ ئامانیان دەزانی، بەڵام چیخوفیش بە تەواوەتی خۆی یەکلایی کردبووەوە و خۆی لە سیاسەت، هەوا و هەوەسی سیاسی دوور دەگرت.

هەرکە بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، خێرا کورتە چیرۆکێکی بە ناونیشانی "نوێژی مردوو" بۆ "ڕۆژگاری نوێ" ڤڕێ کرد و یەکسەر بڵاوبووەوە. لە ١٨٨٦/٢/٢١دا سوپاسنامەیەك بۆ سوڤورین دەنووسێت و دەڵێت: "سوپاس بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە ستایش ئامێزەی کە دەربارەی نووسینەکانم کردووتانە، هەڵبەتە بە خۆتان دەتوانن حوکم بدەن، کە بایەخدانی مهر ئامێزەی کەسێکی کارامە و بەسەلیقە و بەهرەداری وەکو ئێوە بە بەرهەمەکانم، چ کاریگەری و باندۆرێکی

ئیلهامبەخشی بەسەر بەرزەفڕی ئەدەبی منەوە هەیە، بە ڕاستی بایەخدانێکی میهر ئامێزە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٢/٢١.)

بەڵام ئەم جۆش و خرۆشە فلیڤانیەی چیخوف، زوو دامرکایەوە، چونکە نەخۆشی گرانەتا لە شارا بڵاوبووەوە. ئیدی دکتۆران هیلاك و ماندوو بە هەرچوارنکالدا، غاریان دەدا، ئێشکیان دەگرت، شەوان تەنیا یەك دوو سەعاتێك دەخەوتن. سەبارەت بە چیخۆف، کە بە خۆی نەخۆش و لەش بەباربوو، لە هەموو کەسێك پتر، لە تووش بوون بەو نەخۆشیە دەترسا. لە ١٨٨٦/٢/٢٨دا لە نامەیەکیا بۆ بیلیبین دەڵێت: "گرانەتا، لە مۆسکۆدا حەشر دەکات، مۆسکۆ سەرچاوەی ئەم درمەیە. من زۆر لەم نەخۆشیە دەترسم، پێموایە ئەگەر بمگرێت، لێم نابێتەوە، دەمکوژێت. ئەگەری سیرایەت و بڵاوبوونەوەشی لە هەموو شوێنێك هەیە." تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە معاینەی نەخۆشەکانی دەبووەوە و دەرفەتێکی کەمی پەیدا دەکرد و دەستی دەدایە کاغەز و قەڵەم تا بنووسێت، بە زەحمەت تەرکیزی بۆ دەکرا. قاتی سەرەوەی ئەو ئەپارتمانەی ئەوی تیا دەژیا، لە لایەن خاوەن خوارنگەیەکەوە بە کرێ گیرابوو، کە ئاهەنگی زەماوەند و ڕێوڕەسمی بۆنە و چلەی ماتەمینی و ئاهەنگ و بۆنەی جیاوازی هەموو سەندیکاکانی تیا دەگێڕدرا، ئیدی دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا و گۆرانی و تەقوهۆڕی قاپ و دەفر و ئامانان و هەرا و زەنا نەدەبڕایەوە. لە نامەیەکیا بۆ بیلیبن، بە بێزاریەوە گلەیی دەکات و دەڵێت: "حاڵی حازر، دەستەیەك سازڤان، بەسەر سەرمەوە، لە ئاهەنگێکی زەماوەندا، دەهۆڵ و زوڕنا دەکوتن، نازانم چ کەرگەلێك ژن دێنن و وەکو ئەسپ سێ جرتەکی، جووتە دەوەشێنن." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٨٨٦/٢/١٤). هەروەها لە ١٨٨٦/٢/٢٠دا لە نامەیەکیا بۆ لیکین، دەڵێت: "زۆر ماندووم، کاس و گێژ، سەرم دەسوڕێت. شوقەکەم زۆر قەرەباڵغە، یەکپارچە هەراو زەنایە، دەنگەدەنگ و مۆسیقایە. ئەو عەیادەیەی کاری تیا دەکەم زۆر ساردە... نەخۆشیش بەردەوام دێن." وێڕای ئەم هەموو هەرا و هەنگامەیەش، لەپاڵ، ئەو چیرۆکە سادە و ساکار و ڕەوان و تەنز ئامێزانەی کە بۆ گۆڤار و بڵاڤۆکانی دەنارد، زۆر شاکاری چیرۆکڤانی وەکو: (ڕاوچی، تاوانبار، عەریف پریشبیڤ و تازیەباری) نووسی، کە چیرۆکی تازیەباری بەسەرهاتی کابرایەکی پیری عەرەبانچی جەرگ سووتاوی کوڕ مردوو دەگێڕێتەوە. ئەم پیاوە بیهودە هەوڵدەدات، بە گێڕانەوەی مردنی کوڕەکەی بۆ ئەو ڕێبوارە یەك لە دوای یەکانەی کە دەگەڵیا سواردەبن، خەمی خۆی لە بیربکات، کە کەس گوێی لێناگرێت، هەنگێ لە کاتێکا بەرەو تەویلەی ئەسپان دەڕوات، لەوێ ڕوودەکاتە ماینە پیرەکەی: "وای دابنێ جوانوویەکت هەیە، تۆ دایکی ئەوی، دایکی ئەم جوانووە. وای دابنێ ئەم جوانووە، لە نکاوا دەمرێت... خەفەتی بۆ ناخۆیت؟" لەو ماوەیەدا کە کابرای عارەبانچی پیر، بەسەرهاتەکە بۆ ئەو حەیوانە دەگێڕێتەوە: "ماینەکە بەدەم کاوێژکردنەوە، گوێ دەگرێت و هەناسەی دەکا بەسەر دەستوپلی خاوەنەکەیا" هەرچەندە خوێنەرانی (Oskolki و، گۆڤاری سان – پترسبۆرگ و، ڕۆژگار نوێ) ئەم چیرۆکەیان زۆر بەدڵ بوو، بەڵام چیخوف هێشتا هەر لە خۆی بە گومان بوو ونەیدەزانی بۆچی سوڤورین، داوای لێدەکات کە واز لە ناوە خوازراوەکەی بێنێ و بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بەرهەمەکانی بڵاوبکاتەوە. هەروەها کاتێ کە بیلیبین، تکای

لێکرد، کە کۆ چیرۆکە تازەکەی (چیرۆکێن هەمە ڕەنگ) کە بە نیازبوو بڵاوی بکاتەوە، بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بڵاوبکاتەوە، چیخوف لە نامەیەکی ڕێکەوتی ١٨٨٦/٢/١٤دا کە لە "کەلەپوری ئەدەبیدا" بڵاوبووەتەوە، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "من ناو و شۆرەتی خانەوادەییم، بە دکتۆریەکەمەوە ناوە، ئەو کارەی کە تا مردن تەرکی ناکەم. بەڵام ئەدەبیات، زوو یان درەنگ هەر تەرك دەکەم... من لە مەبەستی ئێوە ناگەم، بۆچی دەبێ خوێنەران ناوی چیخوفیان لە چیخونتی پێ خۆشتر بێ؟"

لە ڕاستیدا، چیخۆف کە بە تەبیعەت کەسێکی شەرمن بوو، دوو دڵ بوو لەوەی کە بەبێ دەمامك ڕووبەڕووی جەماوەر ببێتەوە. وای خەیاڵ دەکرد، ئەگەر ناوی خۆی ئاشکرابکات، دەبی بە نیشانەیەکی ڕاستەوخۆ هەم بۆ جنێوان و هەم بۆ ستایش. ئەمە جگە لەوەی کە پێی وابوو کاتێ کە ناوی خۆی ڕادەنێ و ئاشکرا دەکات، مانای وایە ناوی خانەوادە و ماڵباتەکەشی ڕادەنێ، ئایا ئەو مافەی هەبوو کە کاری وابکات؟ ئەمە جگە لەوەی خۆی گوتەنی: "نوژداری کارێکی جدیە و ئەدەب گەمەیە، دەبێ بە ناوونازناوی جیاوازەوە، مومارەسە بکرێن." (بڕوانە هەمان نامەی پێشوو...)

بە چەند هەفتەیەك پاش ئەوەی بۆ بیلیبینی دووپات کردەوە کە بە تەمانییە بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەر شانۆی ئەدەبیات بمێنێتەوە، لە سان — پترسبورگەوە نامەیەکی پێگەیی، کە خستیە گریان. گریگوروفیچی زۆر بە ناوبانگ و زۆر بەڕێز، کە لە سەردانەکەی پترسبۆرگیا، تەعاروف دەگەڵ کردبوو، لە ستایشنامەیەکدا دڵبەندی خۆی بە بەرهەمەکانی دەربڕی بوو. هەمان گریگورفیچی کە چل ساڵ لەوەوپێش بە نامەیەکی لەوجۆرە، مژدەی لەدایکبوونی بلیمەتی دۆستویفسکی ڕاگەیاندبوو. جا ئەم پێشینەیە، بایەخێکی گەورەی، بە ستایشنامە و هەڵسەنگاندنەکەی ئەم پیرە نووسەرە، کە گەیی بووە لوتکەی شۆرەتی خۆی، بەخشی: "من هەموو ئەو شتانەم خوێندوونەتەوە کە بە ناوی چیخونتی یەوە بڵاوبوونەوەتەوە، هەڵبەتە لە دڵی خۆدا زۆر لەو پیاوە زویربووم کە ئەوەندە خۆی بە کەم و بە بچووك دەزانی، کە بەکارهێنانی ناوی خوازراوی بە پێویست دەزانی... بەڵام من دڵنیات دەکەم کە تۆ بەهرە و توانایەکی ڕاستەقینەت هەیە، بەهرەیەك کە زۆر لە سەرووی بەهرەی نووسەرانی نەوەی نوێوەیە... ئەمەی کە دەیڵێم، قسەی دڵمە، قەناعەتی تەواوی منە، من تەمەنم لە شەست و پێنج ساڵ زیاترە، بەڵام هێشتا خۆشەویستیەکی زۆرم بۆ ئەدەبیات هەیە، لە نزیکەوە و بە جۆش و خرۆشەوە پەیگیری ڕەوتی پێشکەوتنی ئەدەبیات دەکەم، کە شتێکی زندوو و تازە کەشف دەکەم، گەزگەز باڵادەکەم، لەخۆشیا خۆم پێ ناگیرێت، بۆیە بە هەردوو دەستان، دەستت دەگوشم."

بەڵام ئەو نامەیەی کە دوعای خێری مامۆستا و برا گەورەی بۆ شایستەترین میراتگری خۆی لەخۆگرتبوو، لە ئامۆژگاری دڵسۆزانەش بەدەرنەبوو: "دەسبەرداری نووسینی پەلە ببە. من نازانم دەرامەتی داراییت چەندە و چۆنە. ئەگەر کەمە و باش نیە، برسێتی بکێشە، وەکو چۆن ئێمەمانان لە گەنجێتیدا کێشاومانە، باری سەرنج و تێبینی و نۆرینەکانت هەڵگرە بۆ کارێن پوختە و تەواو، ئەو کارانەی کە بە پەلە و بە کەرەتێك نایەنە نووسین، بەڵکو لە هەرەتی جەزمە

ئامێزی ئیلهامدا دێتە نووسین. یەك کاری لەو جۆرە کە بەو نەفەسە و بەو کوالێتیانە بنووسرێت، لە سەد کورتیلە چیرۆکی، تەنانەت پاك و پاکیزەی، پەراگەندەی سەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامان، بایەخدارترە." هەروەها گریگورفیچ، هەندێ گلەیی لە هاوڕێ گەنجەکەی، لەسەر بەکارهێنانی هەندێ وشە و دەستەواژەی هەرزەکارانە و بێپەردە و زۆر زەق لە چیرۆکەکانیا، دەکات. ئایا پێویست بەوە هەبوو کە بە ناوی واقیعگەراییەوە، باسی "پێی پیس و نینۆکی درێژ و ناهەموار" یان "ناوکی نووسەرۆکێك؟" لە کۆتاییدا زۆر پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە کۆچیرۆکە تازەکەی "چیرۆکێن هەمەڕەنگ" بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە، چیخوف بڵاوبکاتەوە، بەم وشانە کۆتایی بە نامەکەی هێنابوو: "من ئەم وشانەت وەکو مامۆستا و ئامۆژگار بۆ نانووسم، بەڵکو بەوپەڕی سادەیی و دڵپاکی دڵە پیرەکەمەوە بۆتی دەنووسم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٣/٢٥)

چیخوف، ئەم نامە درێژەی، کە نووسەری "ئەنتون گوریمیکا"و"گوند"ی نیمچە کلاسیکی بۆی نووسی بوو، پتر لە دە جاران خوێندەوە، هەستێکی غەریبی لا دروست بوو: هەستی کرد، کە ئاواتێکی دێرینی ئەو، کە هەرگیز زاتی نەدەکرد باسی بکات، بە ئاشکرا هاتووەتە دی. لەوە دەچوو گریگوروفیچ بەو مەبەستە دەستی بۆ درێژ بکات و دەستی بگوشێت، تا لەو سنوورەی بپەڕێنێتەوە کە کۆمەڵە ڕۆژنامەنووسێکی ناکام لە گروپێکی چکۆلەی بژاردان جیادەکاتەوە. ئیدی یەکسەر و بەوپەڕی پێزانی و خۆشکێنیەوە وەڵامی ئەو نامەیەی دایەوە کە دڵسۆزانە پێگەی ئەوی دیاری کردبوو: "نامەکەتان، ئەی مژدە بەخشی میهرەبان و ئازیز و لە دڵا شیرین، وەکو چەخماخە لێیدام. هێندەم پێخۆش بوو، خەریك بوو لە شادیا دەست بە گریانێ بکەم. ئێستاش هەست دەکەم کاری لە ناخی ناخم کردووە، خودا ئارامی و ئاسوودەیی بە پیریتان ببەخشێت، وەکو تۆ گەنجێتی منت لاواندەوە! نە وشەیەك شك دەبەم نە کردارێ کە شایستەی ئەوەبێ سوپاسی تۆی پێبکەم... جا ئەگەر بە ڕاستی بەهرەیەکم هەبووبێ کە شایستەی ڕێزگرتن بووبێ، ئەوا لە بەردەم دڵە پاکەکەی تۆدا دان بەوەدا دەنەم کە تاکو ئێستا هیچ ڕێزێکی ئەو بەهرەیەم نەگرتووە و زۆر کەمتەرخەم بووم. هەستم دەکرد کە سووکە بەهرەیەکم هەیە، بەڵام وا ڕاهاتبووم بە هەندی نەگرم و بەبێ بایەخی بزانم... سەدان برادەرم لە مۆسکۆدا هەن، کە بیست کەسیان نووسەرن، قەت بە بیرم نایەت تاقە یەکێکیان، منی خوێندبێتەوە یان بە هونەرمەندی زانیبم... لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لەبەر دەرگای ئەم ڕۆژنامە و ئەو ڕۆژنامەدا، بەخۆڕایی بەسەرم برد، چوومە سەر قەناعەتی ئەوان کە نووسینەکانم لە ڕووی ئەدەبیەتەوە هیچ نین، بۆیە خووم بەوەوە گرت کە بە چاوی سووك بڕوانمە نووسینەکانم و بە خەت خەتۆکێی بێ مانایان بزانم، ئەمە یەکەم هۆ بوو. هۆی دووەم ئەمەیە کە من پزیشکم و تا بینا قاقا لە نوژداریدا نقوم بووم. بیرم نایەت لەسەر هیچ چیرۆکێکم پتر لە ڕۆژێك کارم کردبێت. چیرۆکی (ڕاوچی) کە ئەوەندە بەدڵتە، وەختێ نووسیومە کە چووبوومە مەلەوانی... هەرچەندە نامەکەی تۆ چاوەڕوان نەکراو بوو. ببورە کە ئەم بەراوردە دەکەم، بەڵام کارێکی ئەوتۆی لە دڵ و دەروونم کرد، وەکو ئەوەی حاکمێك فەرمان دەربکات کە لە زەرفی بیست و چوار سەعاتدا شار بەجێ بێڵم. یانی لەپڕ هەستم کرد پێویستە بە زووترین کات، ئەو کەلەبەرە بەجێ بێڵم کە تێی کەوتووم." ئەوسا ئەوەی

بۆ ڕوون کردەوە، کە ئەو چیرۆکە چاپ بووە و تازە زۆر درەنگە ناوی ڕاستەقینەی خۆی بخاتە سەر، چونکە کەوتووەتە بازاڕەوە. ئەمە جگە لەوەی لە کتێبەکە ڕازی نەبوو، ئەوەتا دەڵێت: "کارێکی بێ سەروبەرە، هی سەردەمی خوێندکاریمە، سانسۆرچیان و بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامانیش، پەڕوباڵیان کردوون."، " ئەگەر زانیبام خەڵکانێکی زۆر دەیخوێننەوە، یان کەسێکی وەکو ئێوە پەیگیری کارەکانم دەکات، بە هیچ جۆرێ ڕێگەی چاپ و بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەم نەدەدا." بە هەرحاڵ سوێندی خوارد کە لە ئێستا بە دواوە، خۆی لەو گومانە زۆرە دووربگرێت و پشووەکانی هاوینانی بۆ کاری ناوازە و جدی تەرخان بکات و داوای لە گریگورفیچ کرد کە وێنەیەکی خۆی بۆ بنێرێت و، بەم ڕستانە کۆتایی بە نامەکە هێنا: "هەموو ئومێدێکم بە ئایندەیە. ئێستا تەمەنم بیست و شەش ساڵە. لەگینە بتوانم شتێك بە شتێك بکەم، هەرچەندە کات بەخێرایی دەڕوات." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٣/٢٨).

زۆر دڵی بە نامەکەی گریگوروفیچ خۆش بوو، پیشانی داك و باب و کەسوکارەکەی و دۆست و برادەرەکانی دا، چەند پەرەگرافێکی لێ کۆپی کرد و بۆ هاپۆ میتروڤانی نارد، کەچی هەوڵی دەدا وا بنوێنێ کە زۆر دڵی بەم نامەیە خۆش نییە . بەڵام وێڕای ئەمەش بەوپەڕی غروور و لەخۆبایی بوونەوە، ئەم ڕووداوەی بە بیلیبین ڕاگەیاند: "لە ناکاوا، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، وەکو ئەوەی دەستێك لە غەیبەوە هێنابێتی، نامەیەکم لە گریگورفیچەوە پێگەیی. خەتەکەی زۆر بە زەحمەت دەخوێنرێتەوە، ئیدی دەسخەتی پیرەمێردێکە. پیرەمێرد، داوام لێدەکات شتێکی سەنگین و بایەخدار بنووسم، دەستبەرداری نووسینی خێرا و لامسەرلایی ببم. لە نامەکەیدا، جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە بەهرە و توانایەکی ڕاستەقینەم هەیە... نامەیەکی گەرم و گوڕ و ڕاستگۆیانەیە. هەڵبەتە من زۆر خۆشحاڵم، هەرچەندە پێموایە گریگورفیچ زیاد لە پێویست جڵەوی بۆ سۆز شل کردووە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٤/٤).

خولیای ئەوەی لە سەرا بوو کە بۆ پایتەخت بگەڕێتەوە، چونکە لەوێ خەڵکانێکی زۆر بەڕێز، باوەڕیان بە بلیمەتی و توانای ئەدەبی ئەو هەبوو. بە ئەلکساندری برای دەڵێت: "من لەوێ دیاردەیەکی تەواو تازە و پەسندم." بەڵام وەکو هەمیشە کێشەی بێ پارەیی هەبوو، پارەی سەفەرەکەی پێ نەبوو، ئەمە جگەلەوەی کە کێشەی خوێن هەڵهێنانەکەی سەری هەڵدابووەوە و تەواو شپرزەی کردبوو. هەرچەندە لە تەبیعەتی نەخۆشیەکەی بە گومان بوو، بەڵام ئەم گوماندارییەی پێ خۆشتربوو لەوەی کە بە فەرمی بگاتە یەقین و لە نەخۆشیەکەی دڵنیا ببێت. ئەوەتا لە نامەیەکی ١٨٨٦/٤/٦دا بۆ لیکین، دەڵێت: "دەترسم خۆم ڕادەستی فەحس و تاقیکردنەوەی قووڵی هاوکارەکانم بکەم... لەپڕ مەسەلەی هەناسە تەنگیم لێ دەدۆزنەوە!... ئەوەندەی من بزانم نەخۆشیەکە زیاتر پەیوەندی بە گەرووەوە هەیە تا پەیوەندی بە سیپەلاکەوە هەبێ... تام لێ نیە." هەرکە هەستی بە باش بوون کرد، سواری قیتار بوو و سان پترسبورگ خۆت بگرە واهاتم.

دوو هەفتەی لەوێدا، لە ٤/٢٥وە بۆ ١٨٨٦/٥/١٠، بە خۆشی و شادی، دەگەڵ دۆست و برادەراندا، بە هاونشینی دۆستانە و بەوپەڕی ڕێز و حورمەت و ستایشەوە بەسەربرد.

گریگورفیچ و بیلیبین، بەڕادەیەك ستایشیان دەكرد دەیانگەیاندە ئاسمان. بەڵام سوڤرین کە سێ چیرۆکی سەرکەوتووی ئەم نووسەرە گەنجەی لە (ڕۆژگاری نوێ)دا بڵاوکردبووەوە: (نوێژی مردوو، جادووباز و، ئاکافیا)، خۆی بە سەرپەرشتیارو داکۆکیکاری ئەو، لە دنیای ئەدەبیاتدا، دەزانی. سوڤورین، پیاوێکی قۆشمەی دەوڵەمەند و دەستڕۆ بوو. چیخوف، بە پێگە و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی ئەوی دەزانی، بەڵام پێکەنینی بە خۆنواند و خۆهەڵکێشانەکانی دەهات. ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ میخائیلی برای، دەڵێت: "پێشوازیەکی دۆستانەی لێکردم، تەنانەت تەوقەی دەگەڵ کردم و گوتی: "بەردەوام بە گەنجۆ. من لێت ڕازیم. بەڵام زوو زوو هاتوچۆی کلێسا بکە، ڤۆدگا مەخۆوە. کوا هەناسە بدە!" هەناسەم دا، کە بۆنی ڤەرخانی لە هەناسەکەم نەکرد، ئاوڕی دایەوە و بە دەنگی بەرز گوتی: "ئەهای کوڕۆ!" ئیدی کوڕیژگەیەك بە غار هات. دەستوری وەرگرت کە چایم بۆ بێنێ، خێرا چایەکی بۆ هێنام لە گەڵ چەند کلۆشەکرێکدا، بەڵام بەبێ شەکردان. پاشان جەنابی سوڤورین، بڕێك پارەی دامێ و گوتی: "دەبێ پاشەکەوتی بکەیت... ئاگات لە وەزعی خۆت بێت" (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٦/٤/٢٥)

هەر لەو نامەیەدا، دان بەوەدا دەنێ کە گیرۆدەی داوی جوانی یەکێك لە کیژانی کارمەندی (روژگاری نوێ) بووە، کیژێك کە بەرپرسی ناردنی پاداشتەکانی ئەم بووە و، حەزی کردووە بۆ جاری دووەم ببیبینێتەوە. هەڵبەتە قەت ئەوەی نەدەشاردەوە کە لە ئاستی ژناندا، لاوازبوو. بەخۆی دەڵێت کە دەستە خوشکەکانی ماریای خوشکی بۆ ئەو دەیانکردە "چەپکێك لە کیژانی جوان" پیاو حەزیدەکرد بیاندینێ، بۆنیان بکات، قسەیان دەگەڵ بکات، تەنانەت هەندێجار، بیری لەوە دەکردەوە کە یەکێکیان بخوازێ. لە مانگی کانوونی دووەمدا، وەکو هەمیشە لە ڕێگەی ماریای خوشکیەوە، تەعاروف دەگەڵ کیژە جولەکەیەکی دەوڵەمەندا، بە ناوی دونیا ئیفروس، کرد، یەکسەر دڵبەندی جوانی و زیرەکی و زیتەڵیەکەی بوو. شەوێك کە دەیگەیاندووە بۆ ماڵی خۆیان، لە ڕێگادا بێ هیچ پێشەکییەك، داوای لێکرد کە شووی پێبکات. لە نامەیەکیا بۆ ڤیکتور بیلیبین، بە شۆخیەوە دەڵێت: "خەریکە لە تاو هەریسە خۆم لە مەنجەڵی داووم" دوای دوو هەفتە، هەمان داوای لە کیژێ دووبارە کردەوە، کیژێ دوودڵ بوو. جووڵەکە بوونەکەی تەگەرە بوو، چونکە دەبوایە بۆ ئەوەی شوو بە پیاوێکی ڕووسی ئەرتەدۆکسی مەزەب بکات، دەستبەرداری ئاینی خۆی بێت. زۆری نەبرد کە بەینیان تێکچوو، ئیدی چیخوف، بۆی دەرکەوت کە ئەو کیژەی، کە بە دەزگیرانی خۆی دەزانی، کیژێکی زۆر نەکلۆك و توندە تەبیعەت و شەڕانیە. ئەوەتا کە لە نامەیەکی ١٨٨٦/٢/١دا، بۆ بیلیبین، کە لە کەلەپوری ئەدەبیدا بڵاوبووەتەوە، دەڵێت: "لە سەر ئەم مەسەلەیە کردوومانە بە شەڕ، سبەینێ ئاشت دەبینەوە، بەڵام لە زەرفی یەك هەفتەدا دیسان بەشەڕ دێینەوە... لە سەر ئەوەی کە ئاین و مەزەب، تەگەرەی بۆ درووستکردووە، هەرچی قەڵەم و وێنەی سەرمێزەکەم هەیە، هەمووی شکاند و دڕاند. ئەم ڕەفتارە ڕەنگدانەوەی خووتەبیعەتی ئەوە... زۆر شڕندە و دڕە، ئەگەر بشمخواستایە بێگومان دوای ساڵێ دوان دەبوایە تەڵاقی بدەم."

دوای چـوار هەفتـە، بـە تـەواوەتی و بەیـەکجاری پەیوەنـدی دەگـەڵ ئـەم کیـژە، بـێ پـەروا و شەڕاشـۆیەدا بـڕی و لـە نامەیـەکیا بـۆ بیلیـبین، دەڵێـت: "هێشـتا بوخچـەی نـەکراوەم. وازم لـە دەنکەکەم هێناوە، بە گوتەیەکی دی ئەو وازی لە من هێنـاوە. بەڵام هێشتا دەمانچەم نەکڕیوە و نەکەوتوومەتـە نووسـینەوەی ڕۆژانـە یاداشـتان." (بڕوانـە نامـەی بـە روارى ١٨٨٦/٢/١٤). دوای دوو هەفتە لە نامەیەکی دیدا پێی دەڵێت: "ئیدی باسی ئەوت بۆ ناکەم. ڕەنگە هەق بە تۆ بێ کە دەڵێی من هێشتا وەختی ژن هێنـانم نیـە... هەرچـەندە من تـەنیا سـاڵێك لـە تۆ بچووکترم، بەڵام کابرایـەکی جیکڵدانـە تـەنگ و سەرشـێتم. هەنـدێجار وا هەسـت دەکـەم هێشـتا لـە قوتابخانـەم، دەترسم مامۆستا بۆ دەرس هـەڵم بستێنێ و دەرسەکەم لەبەر نـەبێ و نـەیزانم... بە هـەرحاڵ من هێشتا منداڵێکی هەرزەکارم." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٦/٣/١١).

هەرچـەندە ژنـی لـە ماڵـەوە نـەبوو، بـەڵام بـە تـەنیاش نـەبوو. چـیخوف هەرچـەندە لـە ژاوەژاو و هەراو زەناو هاتووچۆ و قەرەباڵغی نـاو شوقەکەی بێـزار و بەگلـەیی بـوو، بـەڵام بـە تـەنیاش هـەڵی نـەدەکرد و هەنـدێجار حـەزی لـەم قـەرەباغی و جەنجاڵیـە دۆستانەیەی دەورووبـەری خـۆی دەکـرد. ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، دەڵێت: "بەبێ قەرەباڵغی و میوان هەڵناکەم. نازانم بۆچی کاتێ بـە تـەنیا دەبم دەترسـم، وەکـو ئـەوە وام لـە بەلـەمێکی شـکاوی ناوەنـدی دەریاچـەیەکی سـامناکدا بم." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٦/٦/٩.)

ئەو هاوینە، دیسان هاتەوە بۆ بابکینو، چوو بۆ ماڵی ماڵباتی کیسلیوف و بە لیڤیتان و میوانـە هەمیشەیی و زۆر و زەبەندەکانی ئەوێندەر شاوشکور بووەوە. بە دڵ و بـە گیـان بەشـداری کـۆڕ و کۆبوونەوە و شەوبێریە خۆشەکانی ئـەوانی دەکـرد، ئـەو کۆڕانـەی کـە زۆربـەی کـات بـە خۆشـی و پێکـەنین دەشـکایەوە و کۆتـایی دەهـات. ئـەوەی لـەم کـۆڕ و ئاهەنگانـەدا، نەشـاز و ناسـاز بـوو، سەرودڵی چیخۆڤ دەگرت، ئەو پێشوازیە ڕۆژنامەوانیە بوو کە لـە کۆچیرۆکە تازەکـەی (چیرۆکێن هەمەڕەنگ) دەکرا. ڕەخنەگری ڕۆژنامەی "گاڵتە و گەپ" ئەم کۆچیرۆکەی بە "وڕێنەی کابرایـەکی شێت" وەسف کردبوو، بەڵام ڕەخنەگری ڕۆژنامـەی "پـەیکی بـاکوور" نووسـی بـووی، کتێبەکـەی چـیخونتی: "دیمـەنێکی تراجیـدی خۆکـوژی بەهرەیـەکی گـەنج"مان نیشـان دەدات. نووسـەری چیرۆکەکانیشـی بـەوە شـوبهاندبوو کـە " لیمۆیـەکی گوشـراوە و لەبەر تەویلەیەکدا فڕێ دراوە و خەریکە دەرزێ" هەرچەندە ئەم جۆرە چرنۆکانە، چەند مانگێك لەمە پێشتر کاریان لـە چیخوف نەدەکرد، بەڵام حاڵی حازر ئازاریان دەدا. بە تایبـەتی کـە دەیزانـی خـەڵکانی وەکـو گریگـورفیچ و سوڤورین دڵبەندی بەرهەمـەکانین و ستایشـی دەکـەن، بۆیـە بـە کـەمترین ئیراد و ڕەخنـەی خـەڵکی دەپەشۆکا و، لە بەردەم ئەواندا خۆی بە تەریق و شەرمەزار دەزانی. بێگومان ئازاری مایەسیری و دان یەشەی بە ترف، هێندەی دی هەستیار و کەم حەوسەڵەیان کردبوو. ئیدی لە هـەوەڵی مـانگی ئەیلولدا، بە مەبەستی چارەسەر بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە.

هەر کە بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، جارێکی دی ماڵی گواسـتەوە، ئەمجارەیان شـوقەی بـەکرێ نـەگرت. بـەڵکو مـاڵێکی سـەربەخۆی لـە شـەقامی سـاردوڤایا – کودرنسـکایای نزیکـی ناوەنـدی مۆسـکۆ بـەکرێ گـرت. ئـەم خـانووە، خانوویـەکی دوو نهـۆمی سووربوو، دوو بانیـژەی چکۆلـەی هـەبوو،

چیخۆف گوتەنی خانووەکەیان وەکو کومەدیەکی چەکمەجەدار لێکردبوو. کرێی ساڵانەی ئەم خانووە شەش سەد و پەنجا ڕۆبڵ بوو، چیخوف پارەی نەبوو، بۆ ئەوەی قیستێکی کرێیەکەی بدات کە لە توانای چیخۆفدا نەبوو هەم سەعاتەکەی لای خاوەنانی "جبل التقوی" خستە بارمتەوە و هەم بڕێك پارەی لە لیکین قەرزکرد.

پێشتر هەرگیز لە شوێنی واباش و واخۆش نە ژیابوو. ژووری کارکردنەکەی خۆی، کە هەر لەوێش. نەخۆشەکانی دەبینی، لە نهۆمی خوارەوە بوو، هەروەها ژووری نووستنەکەی خۆی و ژوورەکەی میخائیل و ژووری کارەکەر و ئاشپەزەکەش لە قاتی خوارەوە بوون. دایکی و خوشکەکەی لە قاتی یەکەما دەژیان کە هۆڵی میوان و ژووری نان خواردن و پیانۆیەکی بەکرێ و ئەستێلێکشی تیابوو. کۆمەڵێك وێنە و ڕەسمی دەگمەن و ڕەفەی بە دیوارەکانەوە هەڵواسی بوون و ڕەفەکانی بەو کتێبانە پڕکردبوون کە کاتێ پوپودوگلوی برادەری مردبوو بۆی بەجێهێشتبوو*.
(*- لە ساڵی ١٩٥٤دا ئەم خانووە کرا بە موزەخانەی چیخوف.)

وێڕای هەموو ئەم ئاسوودەییە تازەیە، دایکی چیخۆف کە بە هۆی هەڵکشانی تەمەن و پیربوونەوە، بە تەواوەتی دڵی ناسك بووبووەوە و لە بچووکترین شت دەڕەنجا و، هەر خوتە و بۆڵەی بوو، خەمی ئایندەی بوو و گلەیی ئەوەی دەکرد کە سەرکەوتنی ئانتون، بووەتە مایەی ئەوە کە لەو، یانی لە دایکی دوور بکەوێتەوە. بەدەم خوتە و بۆڵەوە، بێزاری خۆی بۆ میوانان دەردەبڕی و دەیگوت: "وا هەست دەکەم ئانتون، ئیدی هی من نیە!" بە حەز و خۆزیای ئەو باشترین و شایستەترین کاری ئانتون هەم بۆ خۆی و هەم بۆ ماڵباتەکەیان ئەوەبوو کە کیژی بازرگانێکی دەوڵەمەند بێنێ کە هەموویان بحەسێنەوە. باوکیان، کە لە جێیەکی دی دەژیا و بەڵام زوو زوو بۆ ماڵ دەهاتەوە، تەواو گۆڕابوو، زۆر لە جاران نەرم و نیان تر بوو، زۆر بە سەرکەوتن و ناوبانگی کوڕەکەی، ئانتون، دەنازی. دڵبەندی ئانتون بوو، هەرچەندە پابەندی ئاین نەبوو، بەڵام هەوڵی دەدا چاوپۆشی لێبکات و لەو ڕووەوە گلەیی لێنەکات. بەڵام گواستنەوەی خانەوادەی چیخوف بۆ شوێنە تازەکەیان، چیخوف گوتەنی، بۆ کومەدییە چەکمەجەدارەکە، عادەتی میوانپەروەری پڕ هەرا و هەنگامەی لەلا نەگۆڕین. هەموو شەوێك دنیایەك میوانی هەمەجۆر لە دەوری چیخوف، کە نەیدەتوانی دەرگا لە ڕووی کەس دابخات، خڕدەبوونەوە. ئەو میوانانە نیگارکێشی گەنجی، دۆستی نیکولاو لیڤیتان، ڕۆژنامەنووسی عەودالی بابەت، خەڵکانی گومناو بە خۆ و دەستنووسیانەوە، و نووسەرێن بە توانایان تیابوو. چەپکە کیژانی شۆخیان تیابوو کە ماریا دەعوەتی دەکردن. ئەنجام هەر هەموو ئەمانە بەدەم هەراو زەناوە لە دەوری پیرە سەماوەر خڕدەبوونەوە و لە کەش و هەوایەکی پڕ جۆش و خرۆشدا، دەکەوتنە گەنگەشە و مشت و مڕ و هەر کەسە و قسەی خۆی دەکرد. شەوێك، لە یەکێك لەم کۆڕانەدا کە نووسەری ناسراو، ڤلادیمیر کورولینکو، لە نووسینەکانی چیخۆڤ پرسی، چیخوف، لە وەڵاما گوتی، ئەمانە هەر هەمووی بۆ سەرگەرمی و خۆ خافڵاندنە. هەنگێ پێی گوت: "دەتەوێ بزانی چۆن چیرۆکەکانم دەنووسم؟ ئاوها." چاوێکی بە سەر مێزەکەدا گێڕا و چاوی بە تەپڵەکە سیغارێك کەوت، تەپڵەکەکەی هەڵگرت و لەبەردەم کورولینکۆدا داینا و گوتی: "سبەینێ ئەمە دەبێت بە چیرۆکێك! بە ناوی

(تەپڵەك)."‌. پاشان كورولینكو لە یاداشتەكانی خۆیدا دەنووسێت: "لە پڕ چاوەكانی بە شادی كرانەوە، وەك بڵێی كۆمەڵێك وێنەی تاریك، بەسەر تەپڵەكەكەدا كەوتنە تەراتێن و هێشتا بە تەواوەتی شێوە و فۆرمی خۆیان وەرنەگرتبوو، بەڵام لە حاڵی چێبوونێكی تەنز ئامێزدا بوون... كە ئێستا ئەو گفتوگۆیەم بیردەكەوێتەوە و ئەو هۆڵە چكۆلەیە دێنمەوە بەرچاوی خۆم كە دایكە پیرەكەی چیخوف، بە دیار سەماوەرەكەوە دانیشتبوو و ئیدارەی دەدا، كە زەردەخەنەی خوشك و براكانی چیخوف و ئەو كەش و هەوا خێزانیە یەكگرتووە دێنمەوە بەرچاو كە هەموو لە دەوری گەنجێكی جوانی بەهرەمەندا دانیشتبوون، گەنجێك كە بەوپەڕی گەشبینی دەیڕوانیە بوون و ئاینده، وا هەست دەكەم كە ئەو سەردەمە، خۆشترین سەردەمی قەدەر و چارەنووسی ماڵباتی چیخوف بووە." (بڕوانە یاداشتەكانی كورولینكۆ). زۆربەی كات، گەنگەشەی نێوان هونەرمەندەكان، بێئەوەی هیچ پەیوەندیەكیان پێكەوە هەبێ، تا حەوت نیوەشەو درێژەی دەكێشا و لە نزیكی بەرەبەیاندا، بە گۆرانی و فشقیات و نوكتە و پێكەنین كۆتایی دەهات. شەوێك، لە یەكێك لەم كۆڕ و كۆبوونەوە خۆشانەدا، نووسەری پیر، گریگوروفیچ، باڵابەرز، شیك و بە ویقار، بە لاجانگێن خۆڵەمێشی شینباوەوە ئامادەبوو. ئەو گەنجانەی كە لەوێ كۆبووبوونەوە، هەوەڵجار، كە چاویان بەم پەیكەرەی مەڵبەندی خواوەندانی ئەدەب كەوت، دەستەونەزەر، بەرێزەوە، كڕوكپ لە بەردەمیا وەستان، بەڵام زۆری نەبرد، كە گەڕانەوە سەر بەزم و شادی خۆیان. هەنگێ گریگوروفیچ-ش بەگەڵیان كەوت و بەجۆرێ كەوتە جۆش و خرۆش كە بە ئاشكرا تۆڵازی دەگەڵ كچاندا دەكرد. كاتێ كە بۆ سان-پترسبۆرگ گەڕابووەوە، بۆ ژنەكەی سۆڤۆرینی گێڕابووەوە و گوتبووی: "خۆزیا دەتزانی لە ماڵی چیخوفدا چ دەگوزەرێ گیانە! هەموو شەوێك بەزم و شادییە! بەزم و شادی نەگاڵتە!"

چیخوف، هەندێجار كە دەی بیست نیكولای برای مەست و كەلەلا لە مەیخانەیەكدا كەوتووە، ناچار دەبوو بۆ ماڵی بێنێتەوە. نیكولا لەو سەروبەندەدا مەیخۆرێكی ئالوودە بوو، نیگاركێشی تەرك كردبوو، قژی شانە نەدەكرد، بەرەڵڵا دەسوڕایەوە، لە دووی ئەم سۆزانی و ئەو سۆزانی بوو. بەڵام ئانتون، دەستبەرداری نەدەبوو، بەردەوام هەوڵی دەدا بیهێنێتەوە سەر ڕێگا و ئامۆژگاری دەكرد، لێ نیكولا گوێی نەدەدایە. ئیدی چیخوف لە نامەیەكیا بۆی دەنووسێت: "دڵنیابە كە من وەكو برا و برادەرێكی نزیك لێت دەگەم بە دڵ و گیان هاوخەم و هاوسۆزی تۆم، هەموو خەسڵەتە چاكەكانی تۆ وەكو ناولەپی خۆم دەناسم... تۆ میهرەبانیت، میهرەبانیت ناخۆش كردووە، بەخشندەیت، دڵاوا و بێ فیزیت، دووریت لە هەر خۆپەرستیەك، ڕاستگۆیت... بەخششێكی ئاسمانیت پێدراوە كە بە خەڵكانی دی نەدراوە، ئەویش بەهرەمەندییە. ئەم بەهرەمەندییە، ئەم بە هرەداریە، دەتخاتە سەرووی ملیۆنان كەسەوە." تكای لە براكەی دەكرد كە ڕێزی ئەم بەهرەیە بگرێت، بیپارێزێت و خۆی بۆ تەرخان بكات و "تەمەڵی و مێبازی و ئاشقێنی و شەراب و بەرەڵڵایی بكات بە قوربانی ئەم بەهرەیە." و دڵنیای دەكاتەوە كە هونەرمەندانی ڕاستەقینە "ناتوانن بە جل و بەرگی دەرەوە بخەون و بەبێ موبالاتی بڕواننە درزی دیوارێكی پڕ لە پێشكان. و هەوای گەن هەڵمژن و بەسەر ئەرزی بەلغەماویدا ڕێبكەن. یان لەسەر تەباخێكی

نەوتی دوکەڵاوی خواردن بۆ خۆ چێبکەن. ئەوپەڕی هەوڵدەدەن کە غەریزەی سێکسی خۆ ڕام بکەن و ئاستێکی مرۆڤانی بەرزی پێببەخشن. تەنیا هاوخەوی و سێکسی حەیوانی لە ئافرەتدا نابینن، بەڵکو بەو چاوە لێیان دەڕوانن کە سەرچاوەی ناسکی، جوانی، سۆزی مرۆڤانی و دایکایەتین، نەك سەرچاوەی سۆزانیەت و تەڕداوێنی. هونەرمەندان لە هەموو بۆنەیەکا، ڤۆدکا ناخۆنەوە. وەکو بەراز، بەدەم بۆن کردنەوە خۆ بە هەر کون و کەلەبەرێکا ناکەن." ( بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٣).

به کورتیەکەی، مەبەستی چیخوف، لەم هەموو هەوڵ و کۆششە ئەوەبوو کە براکەی، خۆی گوتەنی بکات بە "پیاوێکی پیاوانە". ئەم نامەیەی کە بۆ نیکولای نووسی بوو و ئومێدێکی ئەوتۆی نەبوو کە بتوانی بەو نامەیە بهێنێتەوە تایم، لە ڕاستیدا ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی ئەخلاقی بوو. لە تەمەنی بیست و شەشساڵیدا، بە ئاشکرا کەسێکی ڕەواقی ڕێباز بوو: باوەڕی بە نەفس پێتی و خود کۆنترۆڵ کردن و، ئابڕوومەندی و میانڕەوی لە هەموو شتێکدا هەبوو. لەو ڕوانگەیەوە زۆر لە خۆی دەکرد کە زۆر نەخواتەوە، جگەرە کەم بکێشێت. ڕژیمی دەکرد و زیاتر شیرەمەنی دەخوارد تا قەڵەو نەبێت و کێشی زیاد نەکات. پێی وابوو، کار باشترین فاکتەرە بۆ ئەوەی هونەرمەند لە هەر زێدەڕۆییەك بپارێزێت و دووربخاتەوە.

هەرچەندە چیخوف، هیچ ئومێدێکی بەوە نەبوو کە نیکولای بەد مەست بەگوێی بکات و بێتەوە تایم، بەڵام هێشتا ئومێدی بەوە هەبوو کە ئەلکساندر لە خەوی مەرگ ئاسا، بێدار بکاتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەلکساندر خەریك بوو ئاقڵ دەبوو و بەرەو ئەوە دەچوو، براکەی گوتەنی، کە "ببێ بە پیاوێکی پیاوانە". حاڵێ حازر لە سان پترسبۆرگ دەژیا، ئانتونی برای دوای هەوڵێکی زۆر وەکو پەیامنێر و ڕاستکەرەوە، لە "ڕۆژگاری نوێ"دا دایمەزراندبوو. لە پاڵ ئەوەشدا، لەوێندەر، لە پایتەختا، جۆرە نوێنەرایەتییەکی چیخۆفیشی دەکرد، پاداشتی نووسینەکانی، لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەوێندەر بۆ وەردەگرت، پەیام و نامەکانی، دەگەیاندنە سەرنووسەران و هاوکاران و دۆستەکانی، پەیگیری فرۆشی کتێبەکانی دەکرد. هەڵبەتە هەم ستایشی ئانتونی برا بچووکی دەکرد و هەم بەغیلیشی پێدەبرد. هەڵبەتە بە خۆیشی، ناوبە ناو خۆی لە نووسین دەدا، چیخوف بە ئامۆژگاریەکانی خۆی، کە ئەویش لە ئامۆژگاریەکانی گریگورفیچەوە، هەڵی هێنجابوون، یارمەتی دەدا و دەیگوت: "بیکە بە خاتری خوا کەمێك ڕێزی بەهرەی خۆت بگرە! کاتێ کە مێشکت کارناکات، دەست بۆ قەڵەم مەبە... کە نووسیت ئاگات لە هەر دێڕێکت بێ، شتی بێ سەر و بەر مەخە سەریەك." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٨٨٦/٤/٦). هەروەها لە هەندێ تەکنیکی نووسینیش ئاگاداری دەکرد: " لە وەسفی تەبیعەتدا، دەبێ شتە وردەکان بە جۆرێ بدەیتە دەم یەکەوە و ئاوێتە و مۆنتاجیان بکەیت، کە دوای خوێندنەوە، کاتێ چاو دەنوقێنین، وەکو تابلۆیەك بێتە بەرچاومان... نابێ بواری سایکولوژیش فەرامۆش بکەیت، خواوەند لە شتی ساواو و پواو و کلێشەیی بتپارێزت. باشترین شت ئەوەیە خۆت لە شیکردنەوەی باری دەروونی قارەمانەکان بپارێزیت، چونکە ئەم شتانەدا دەبێ لە کار و کردەوەکانیاندا، ڕەنگ بدەنەوە و هەڵ بهێنجرێن." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٦/٣/١٠).

هونەری چیخوف هەر هەمووی لەو ئامۆژگاریانەدا چڕبووبووەوە. وێڕای ئەوەش هەمیشە بۆ هەمان برای دووپات دەکردەوە، کە تا سەر لە سەر نووسین بەردەوام نابێت و ئەوەتا لە نامەیەکیا دەڵێت: "جگە لە نوژداری کە هاوسەری شەرعیمە، ماشقەیەکیشم هەیە کە ئەدەبە، بەڵام باسی ئەمە ناکەم، چونکە ئەوانەی لە ناشەرعیەتدا دەژین، لە ناشەرعیەتدا دەمرن" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/١/١٧) ئەلهەقی ئەم " ماشقە ناشەرعیە" لەزەتێکی پتری پێدەخشی لە (هاوسەرە شەرعیەکەی ). ئیدی چیخوف شۆرەتی تەواوی پەیداکرد. بەخۆی دەیگێڕێتەوە کە چۆن هەندێ کەس لە خورانگەکاندا "ئاماژەیان بۆ دەکرد". لە نامەیەکیا بۆ خاتو کیسلیوفا، بەوە دەنازێت کە بۆ یەکەمجار لە ژیانیا، لە یەکێك لە خوارنگە بە ناوبانگ و پڕ مشتەریەکاندا، خۆراکی سەدەڤ خواردووە و دەڵێت: "خۆش نەبوو! خۆ ئەگەر شەرابی سپی و ترشی دەگەڵ نەبوایە، پیاو دڵی لێتێك هەڵدەهات." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٨٨٦/٩/٢١)

لە ئاخر و ئۆخری مانگی ئەیلولی ١٨٨٦دا ماریای خوشکی دەگەڵ خۆیدا بۆ سان–پترسبۆرگ برد، تا هەم پایتەخت بدینێ و هەم ناوبانگ و شۆرەتی براکەی بژنەوێ. ئەمجارەش ڕادەی پێشوازی هەوادارانی لە تەسەور بەدەر بوو. لە نامەیەکیا بۆ خاتو کیسلیوڤا، سوێندی بۆ دەخوات کە ئەو هەموو ستایشەی پێناخۆشە و دەڵێت: "بەداخەوە، سەد حەیف و مخابن! من لە پترسبورگدا شۆرەت و ناوبانگێکی زیاد لە پێویستم پەیداکردووە، کەچی کورولینکۆ، ئەو نووسەرە گەورەیە، ناوێکی ئەوتۆی نیە، زۆربەی سەرنووسەرەکان نایناسن، هەموو شار، سەرانسەری پترسبۆرگ وڕێنەکانی من دەخوێننەوە... ڕەنگە ئەمە مایەی شانازی بێ، بەڵام ئاسیو بە هەستیاری ئەدەبیم دەگەیەنێ، بە ڕاستی من بەزەییم بەو جەماوەرەدا دێتەوە کە تولەیەکی پەروەردەی پەراوێزی ئەدەب دەبینن و بەدەوریا دێن، کەچی ناتوانن فیلانی ئەو مەیدانە بدینن، بۆیە قەناعەتی تەواوم هەیە هەرکە دەستم دایە کاری جدی، تاقە کەسێك لام بەلادا ناکاتەوە." ( بڕوانە نامەی بە رواری ١٣/ك١٨٨٦/١).

هەر هەموو بڵاڤۆکەکان، لە ناکاوا کەوتنە بایەخدان بە چیخونتی. ڕەخنەگری بە ناوبانگ ئوبولنسکی لە گۆڤاری (سەرمایەی رووس)دا وتارێکی دەربارەی چیخوف بڵاوکرەوە، کە پێگەیەکی ئەدەبی باڵاتر لە پێگەی کورولینکوی پێ دا. چیخوف بە ماوەیەکی کەم پاش گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ، نامەیەکی لە ئەلکساندری برایەوە پێگەیی، باسی ئەوە دەکات کە خەڵکی بە چ ڕێز و ستایشێکەوە باسی دەکەن، دەڵێت: " خەڵکی بە جۆرێ لای من باست دەکەن، وەکو ئەوەی قەناعەتی تەواویان کردبێت کە تۆ مەشخەڵێکی خوایی و ئاسمانیت تیایە، یانی چاوەڕوانی شتێکت لێدەکەن کە بە خۆشیان بە دروستی نازانن چیە."

چیخوف، کاتێ لە سەرەتای ئازاری ساڵی ١٨٨٧دا بیستی کە ئەلکساندر تووشی گرانەتا بووە، یەکسەر چوو بۆ سان–پترسبۆرگ. تاقە سەلوای نێو قیتاری، خوێندنەوەی "ئانای ئازیز و نازدار"= ئانا کارنینا بوو. کە گەییە جێ، سەیری کرد ئەلکساندر عەلەمی نیە. چیخوف، لەمبارەیەوە نامەیەك بۆ خاتو کیسلیوڤا دەنووسێت و دەڵێت: "لە ساتێکی بێتاقەتیدا، هەستی بە نەخۆشی کردووە، ترساوە و دەم و دەست بروسکەی بۆ من ناردووە." ( بڕوانە نامەی

ڕێکەوتی ١٠/٣/١٨٨٧) بەڵام ژنەکەی بە ڕاستی تووش بووبوو. ئیدی چیخوف فریای دەکەوێ باشترین دەرمانی دەکات و چاك دەبێتەوە. گرانەتا، لە پترسبۆرگدا بڵاوبووبووەوە، شار کڕوکپ، شەقامەکان چۆڵ و هۆڵ بوو، نەخۆشخانەکان پڕبوون لە نەخۆش. خەڵکی تازیەبار بوون و هەر ماتەمگێڕان بوون لێرە و لەوێ، بە شەقامەکانا، جەندەکی ئازیزانیان بەڕێ دەکرد. چیخوف، چووە دیدەنی گریگورفیچ کە ئەویش نەخۆش بوو. پیرەمێر ماچی کرد، لە هەمێزی گرت و بەسەریا گریا، بەجۆرێ هەڵچوو کە سووکە جەڵتەیەکی دڵ لێی دا و خەریك بوو بیکوژێت. تاقە تروسکەی ئەم سەفەرە تاریك و خەمناکەی چیخوف، ئەو گفتووگویە بوو کە چیخوف لەگەڵ سوڤوریندا کردبووی، کە لە سەعات نۆی شەوەوە تا یەکی بەرەبەیانی خایاندبوو و، بەوە شکابووەوە کە "ڕۆژگاری نوێ" کۆ چیرۆکێکی بۆ بڵاوبکاتەوە و پیشەکی سێ سەد ڕۆبڵی دابویە، هەقی ئەو چیرۆکانەی کە قەرار بوو دواتر بۆ بڵاوکراوەی ناڤبری ڤڕێ بکات.

دیارە چیخوف، کە مودەتێك بوو کەڵکەڵەی سەفەری باشووری کەوتبووە سەر و پارەی نەبوو، بەم دەست پێشکەرییە چاوەڕوان نەکراوە زۆر خۆشحاڵ بوو. هەرکە گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ، بەدەم پەسیو و هەڵامەتەوە کەوتە ڕایی کردنی کارەکانی، چەند دەقێکی بەپەلە نووسی: (گرانەتا، غەمگینی ژیان، و نهێنی) ناونیشانی شازدە چیرۆکی، لەو چیرۆکانەی کە حەزی دەکرد لە کۆچیرۆکەکەیدا هەبن، کرد بە لستێك و دەستنووسەکەی بۆ سوڤورین نارد. بە هەستێکی ئاڵۆزەوە کەسوکارەکەی لێرە بەجێ هێشت و بە یادی ڕۆژگاری منداڵیەوە بەرەو تاگانروگ وەڕێکەوت. دیتنی شار و زاگەی خۆی، دوای هەشت ساڵ دووری و دابڕان ئەزموونێکی هەم خۆش وهەم خامناك بوو. چونکە دەگەڵ جم و جوڵ و چالاکی و چەلەنگی و زندوویەتی مۆسکۆ و سان-پترسبۆرگدا ڕاهاتبوو، هەستی دەکرد خەڵکی ئێرە زۆر خاون، تەمەڵن، بە زۆر خۆیان بکێش دەکەن، لە کەش و هەوایەکی زۆر قورسترا دەژین. لە تۆ وایە لە سەدەیەکی دیدا دەژین، جگە لە سووکە بە ڕژەوەندی مادی، هیچ خەم و خولیایەکی تریان نیە. هەرچەندە میوانداریە گەرم و گوڕەکەی هاپۆ میتروڤانی زۆر پێخۆش بوو، بەڵام چەنەبازی ئامۆژنی تەحەمول نەدەکرد، هەروەها چەپەڵی کارەکەرەکان، بۆنی ناخۆشی ئاوی حەمامەکەیان، بچووکی تەختە خەوەکە و ئەو کۆنە لێفە پەمەییەی کە پێی دەنووست بێزاریان دەکرد. خواردنە ناخۆش و قورسەکەیان بە مەعیدەی نەدەکەوت، تووشی سکچوون بوو، دەبوا شەوێ هەستێ و بەپەلە خۆی بگەیەنێتە ئابخانە،( کە زۆر دوور بوو و لە تەنیشت ئاغەڵەکەوە بوو) کە زۆرجار دزان لەو پەناو پەسارانەدا خۆیان مات دەدا و چوون بۆ ئەوێ "لە ژەهرخواردن خەتەرتر بوو". " بە ڕۆژ و بە شەو بۆ ئەوێ غار دەدەم، بە ڕاستی بەشەو عەزابێکە لەو گۆڕە: تاریکی، با، تەقوهوڕی دەرگا کە زۆر بەزەحمەت دەکرێتەوە، هەنگاونانی کوێرانە لەو تاریکستانەدا، بێدەنگی ترسناك، نەبوونی ڕۆژنامانی کۆن"... لە سەری دەڕوات و دەڵێت: " لەگەنی میز تێکردن، مەگەر بە خەو ببینرایە، لە سەرانسەری تاگانروکدا تەنیا دوو کەس شتی وایان لە ژوورەوە هەبوو: جەنابی فەرمانڕەوای شار و ئالفراکی (کابرایەکی یونانی دەوڵەمەندی تاگانرۆك بوو). ئەوانی دی هەر هەموو ناچاربوون یان میزەکە بکەن بە خۆدا یان بێنە دەرێ و بۆ میزکردنێ بگەنە ئەوپەڕی دنیا."

چیخوف، جگە لە سکچوونەکەی، بەدەست هەوی بۆری هەناسە و ئاوسانی دەماری لاقی چەپ و، مایەسیریشەوە دەی ناڵاند. چیخوف، کاتێ بە ڕۆژەوە دەچووە دەرێ، لە هەر کوچە و کۆڵانێك، لە هەر گۆشە و کەنارێك، لە هەر جادە و شەقامێك تووشی خەڵکانی ئاشنا و ناسیاو دەبوو، بۆ ماڵی خۆی دەعوەتیان دەکرد و ئیدی بە پرسیاران دایان دەگرتەوە و ماندوویان دەکرد. جا چونکە چوونەکەی بۆ ئەوێندەر ڕێکەوتی ڕۆژانی جەژنی پاك بوو، چوو بۆ کڵێسا و لە ڕێوڕەسمی ئاینیدا بەشداری کرد، لە میانەی بۆنی بخورد و هەڵگیرسانی مۆمانەوە، ڕۆژانی تاڵی منداڵی خۆی، کە لە تیپی سروودخوانی کڵێسادا بوو، وەبیر هاتەوە. هەرچەندە هەموو شتێکی تاگانرۆك ئەزیەتی دەدا، دەی ڕەنجاند، دەی تۆراند و لە تاگانرۆکی دوور دەخستەوە و نەیدەزانی بە چ ئەقڵێکەوە ملی بۆ ئەم سەفەرە دژوار و درێژە دابوو، کەچی وێڕای ئەوەش حەزی نەدەکرد، بەرلەوەی جارێکی دی تێر بە چاوانی دەشتی ستێپ بدینێ، بۆ مۆسکۆ بگەڕێتەوە.

بە هەرحاڵ، ستێپ، بەلای کەمەوە تووشی نائومێدی نەدەکرد. ئەم دەشتە پان و بەرینە، تا چاو بڕیکات سەوزەڵان و مێرگوزارە، لە ژێر ئاسمانێکی تاحەزکەی فراوان و مەنگدا، بێ خەم و خەیاڵ ڕاکشابوو، مەگەر جارجار واشەیەك مەنگی ئاسمانەکەی بشڵەقاندایە، ئەم دیمەنە هەستێکی ئاوێتە لە شادی و خەمینی پێدەبەخشی، گیانی دەفڕی بەرز دەفڕی، لێ جەستە پێیا نەدەگەیی. بەشداری زەماوەندێکی دوو ڕۆژەی خانەوادەیەکی قۆزاقی کرد، ئیدی دەهۆڵ و زوڕنا، مۆزیقا و هەڵپەڕکێ، کوڕ و مەجلیسی خواردنەوەی برایانە هەر مەپرسە. لە نامەیەکی بەرواری ١٨٨٧/٤/٢٥دا بۆ ماریای خوشکی، لەوبارەیەوە دەڵێت: "ئەوەندە مەست بووم، ئەوەندە خەیاڵ بووم کە شووشەکانم لێ بووبوون بە کیژان و کچەکانم لێ بووبوون بە شووشە." بووك و زاوا، بە بەرچاوی ئەوەوە، هێندە بە ئاو و تاو یەکدیان ڕادەمووسی، لە تۆ وایە، هیچ ڕۆژ و سبەینێیەکی تریان لە پێش نیە و بەو پەڕی تامەزرۆیی دەمولێویان بە ماچ و مووچ سپاردبوو. " تەمەشای ئەو ماچانە، تامی ترێی زۆر شیرینی دەخستە دەمم، دەماری لاقی چەپمی گرژ دەکرد، هێندەی دی لاق یەشەکەمی زیاد دەکرد.". کیژە گوندیانی شۆخ و شەنگ، وەکو مێشی دەوری کاسەیەك هەنگوین، دەوروخولی چیخوفیان دەدا. یەکێك لەو کیژانە، کە یەکپارچە ناز و عیشوە بوو، بە غەمزەوە، ناوبە ناو بە باوەشێنەکەی دەیکێشا بە بازووی چیخوفدا و بە شۆخیەوە پێی دەگوت: "کە لادێیت !"

چیخوف، بە میوانی لە ماڵی کرافیتسوف لایدا، کە کاتی خۆی، بە گەنجی، دەرسی تایبەتی بە (پیوتەر)ی کوڕیان گوتبووەوە، ئەوێ ی دیتبوو. لێرەش هەر نارەحەت بوو، خواردنی بریتی بوو لە سوپی سیر، دەیانبرد بۆ ئاهەنگی ڕاو کە لە ڕاستیدا ڕاو نەبوو، قەسابخانە بوو، یانی بەم میواندارییە دێهاتیانەیە زۆر خۆشحاڵ نەبوو، ئەوەی قەرەبووی ئەم نارەحەتیەی بۆ دەکردەوە و دڵی خۆش دەکرد، نزیکی دەشت و مێرگی ئەفسووناوی ستێپ بوو لێیانەوە. چیخۆف، لە ماڵی کرافتسوفەوە، بەرەو دێری کێوانی پیرۆز، کە لە ڕەخی روباری دونتس بوو کەوتە ڕێ. کە پازدە هەزار زیارەتچی هاتبوونە ئاهەنگ و جەژنی یادی قەدیس نیکولا. چیخوف، لە دێرەکەدا شوێنێکی بۆ مانەوە پەیداکرد: دۆشەکێکی تەنك لە ژوورێکی ڕووتا. لە ڕێ پێوانی گشتی،

ڕێوڕەسمی هەڵگرتنی خاچ، بە سەرانسەری ڕەخی ڕووبارەکەدا، بەشداری کرد. باقی کاتەکەی، بە تەماشاکردنی هاتوچۆ (کە زۆربەی هەرە زۆریان پیرەژن بوون) و گوێگرتن لە نوێژ و نزای زیارەتچییانەوە بەسەر برد. لە نامەیەکیا بۆ خوشکەکەی، لەو بارەیەوە دەڵێت: "باوەڕم نەدەکرد ئەم هەموو پیرەژنە لە دنیادا هەبن، دەنا لە مێژبوو مێشکی خۆم داغان کردبوو." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٧/٣/١١). لە گەڕانەوەدا، لە تاگانرۆك لایدا، پشوویەکی کورتی دا و هەنگێ سواری قیتار بوو و بەرەو مۆسکۆ بەڕێکەوت. هەڵبەتە سواری فارگۆنی نمرە سێ بوو، چونکە پارەی لە تەواوبووندا بوو. لە نامەیەکیا بۆ لیکین دەڵێت: "جۆرەها تێبینی و سەرنج و کەرەستە و دەستمایەم لا کۆبووەتەوە، پەشیمان نیم لەوەی کە مانگ و نیوێکم بەم سەفەرەوە کوشتووە... تاقە شتی ناخۆش ئەوەیە، کە دەگەمەوە مۆسکۆ و تاقە کوبیکێکم پێ نەماوە..." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٧/٣/١٤).

یەك ڕۆژ لە مۆسکۆ مایەوە و ئەوسا بەپەلە بۆ بابکینو ڕۆیی، کە گەییە ئەوێندەر، ئەو خۆشی و جوانی و ئاوەدانیەی ساڵانی پێشووی تیا نەبینی. گەرمکردنی خانووەکە خراپ بوو، هەواکەی ناخۆش بوو. چیخوف، ڕۆژ بە ڕۆژ حاڵی خراتر دەبوو. لە ١٨٨٧/٩/١١دا لە نامەیەکا بۆ لیکین، دەڵێت: "ماوەیەکی زۆرە هیچم نەنووسیوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نیە کە کانیەکە کوێر بووەتەوە. وشکی کردووە. سێ دانە هەفتەیە زۆر بێتاقەت و پەست و غەمگینم. لە ماڵ ناچمە دەرێ، دەستم قەڵەم ناگرێت، بە کورتیەکەی مەسەلەکە ئەعسابە، کە تۆ باوەڕت پێی نیە، لە قەیرانێکی دەروونی ئەوتۆدام کە دەستم ناچێتە هیچ کارێك. تاقە وشەیەکم بۆ نایەت." دوای دوو ڕۆژ، لە نامەیەکی دیدا، ئەم حاڵەی خۆی بۆ خاتوو کیسلیوڤا شەرح دەکات و دەڵێت: "هیچ بیرێکی تازەم پێ نیە، کۆنەکانیش لە مێشکمدا لوولیان خواردووە و تێك ئاڵاون، دەڵێی ئەو کرمانەی ناو قوتووە سەوزە ڕاویەکەی منن و پێنج دانە ڕۆژە لەبەر هەتاون." کۆچیرۆکە تازەکەی (ئەلەند)، بڵاوبووەوە، سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا. بەڵام ئەم سەرکەوتنە پەریشانی دەروونی چیخوڤ نەڕەواندەوە: "ئەو شتانە دەخوێنمەوە کە دەربارەی ئەم کتێبە دەنووسرێن، بەڵام تێناگەم ئاخۆ ئەمانە ستایشن یان شێوەنن و، بۆ ڕوحی لەدەستچووم دەیگێڕن. (بەهرە! بەهرە! بەڵام خودایا ئارامی و هەدار بە ڕوحی نووسەر ببەخشە) ئەمە مانای ڕاستەقینەی ئەو نووسینە ڕەخنەییانەیە. وێڕای ئەمەش کۆچیرۆکی ئەلەند، باش دەفرۆشرێ."

ئەم بێ ئومێدیە، دەربارەی بێهودەیی هەموو دڵخۆشیەکانی دنیا، لە نامەیەکی پاریشیا، بۆ هەمان خاتوو کیسلیوفا دووبارە بووەتەوە و دەڵێت: "ژیان چیرۆکێکی کرێت و پیسە، بۆ هەموو کەسێك هەروایە. کە بە جدی بیری لێدەکەمەوە، هەستدەکەم ئەوانەی کە لە مردن دەترسن، خەڵکانێکی نالوژیکین، ئەوەندەی من لە ژیان گەیشتووم، جگە لە قێزەونی، دژایەتی، ترس، ململانێ و سووکی و چروکی پەیا پەی، هیچی تری تیا نیە... ئێمە لەوپەڕی ڕوتیندا دەژین، کەسی شادمان نابینین." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٦/٩/٢٩).

پاشان کەوتە بیری ئەوەی کە لە ڕێگەی نووسینەوە، ئەم بێ ئومێدی و ڕەشبینییە لە خۆی بتارێنێ. بۆچی ئەم حاڵەتە دەروونیەی خۆی نەکات بە تیمە و بابەتی شانۆنامەیەك؟ خۆ لەمێژ

بوو سەودای شانۆنامەی لە سەرابوو. خۆ کۆرشی بەڕێوەبەری شانۆیی کورش، بە هاری ڕابردوو، دوو چەلان داوای لێکردبوو دەقێکی بۆ بنووسێت. هەڵبەتە چیخوف لە هەوەڵەوە، ئەو داوا و پێشنیازەی بە هەند نەگرتبوو و تەنانەت لە نامەیەکیا بۆ خاتو کیسلیوڤا، گوتبووی: "هەڵبەتە شانۆنامە نانووسم، چم داوە لە شانۆ و جەماوەری شانۆ... عەمریان نەمێنێ." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٧/٩/١٣.)

کەچی زۆر بەخێرایی بێ گوێدان بە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك ئیشی لەسەر ئەم کارە کرد. دوای سێ هەفتە بە یگۆڤی ڕۆماننووسی ڕاگەیاند: "شانۆنامەکەم ئامادەیە." پاشان لە نامەیەکیا بە ئەلکساندری برای دەڵێ کە ئەو کارەی زۆر بە ئاسانی و بەخێرایی لەبەر ڕۆیی و بە جوانی کۆتایی هات: "شانۆ نامەکەم، بێئەوەی هیچ بیرۆکە و تەسەورێکی ڕوونم دەربارەی هەبێت، تەواوکرد. دوای ئەوەی چەند گفتوگۆیەکم لەو بارەیەوە دەگەڵ کورش دا کرد. چووم نووستم، بیرم لە بابەتەکە کردەوە و یەکسەر دەستم بە نووسینی کرد... لە زەرفی دوو هەفتەدا تەواوم کرد، نا دە ڕۆژ، چونکە لە میانەی ئەو دوو هەفتەیەدا، ڕۆژ هەبوو کارم لە سەری نەدەکرد یان خەریکی نووسینی شتی دی دەبووم. هەڵبەتە من ناتوانم ستایشی شانۆنامەکەم بکەم. بەڵام پێموایە زۆر کورتە. بە دڵی خەڵکی دەبێت. کورش زۆری بەدڵە، دەڵێت لە ڕووی تەکنیکی درامیەوە هیچ کەم و کوڕییەکی تێدا نیە. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی دروستی خوێندنەوەی منە بۆ بابەتەکە. ڕاستە بونیاد و پلۆتەکەی هەندێ ئاڵۆزە، بەڵام گەوجانە و بێ تام نیە. هەر پەردەیەکی بە هەمان شێوە کۆتایی پێ دێنم کە لە چیرۆکەکانما پەیڕەوی دەکەم. پەردەکان زۆر بە هێمنی و ئارامی دەڕۆن، بەڵام لە کۆتاییدا، تەمەشاڤانان تووشی شۆك دەکەم. هەموو توانای خۆم لە چەند بەشێکی گرینگ و بەهێزدا چڕکردووەتەوە. بەڵام ئەو پردانەی ئەم دیمەنانە پێکەوە دەبەستن، هیچ مانایەکیان نیە، دڵگیر نین، سست و لەقن. وێڕای هەموو ئەمەش دڵم پێی خۆشە، چونکە ئەگەر تەنانەت شانۆنامەیەکی خراپیش بێت، ئەوا نموونەیەکم داهێناوە کە بایەخی ئەدەبی خۆی هەیە و دەور و ڕۆڵی وام تیا داهێناوە مەگەر ئەکتەری وەکو داڤیدیوڤ دەرەقەتی بێن و بتوانن بەرجەستەی بکەن و هەموو توانایەکی خۆیانی تیا بخەنە کار." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٠ – ١٨٨٧/١٠/١٢).

شانۆنامەی ناڤبری، شانۆنامەی (ئیڤانوف) بوو. دیارە کەسیەتی ئیڤانوڤ، کە هاوناوی شانۆنامەکەیە، یانی شانۆنامەکە بە ناوی ئەوەوە ناونراوە، هێمایە بۆ نیگەرانی و دەستەپاچەیی ڕۆشنبیران، لە هەنبەر سیاسەتی سەرکوتکارانەی حکومەت و هەرەس و داڕوخانی بار و ڕەوشی کۆمەڵایەتی لە ڕووسیادا. ئەم قارەمانە نەرێنییە، کە ناتوانێ خەونە جوانەکانی بێنێتە دی و دەگەڵ واقیع و پێویستیەکانی واقیعدا بیان گونجێنێ هەست بە جۆرە گوناحێك دەکات، نائومێدی و ورە ڕوخان، وەکو مۆریانە تێی دەدەن. ئەم پیاوە قارەمانێکی نەرێنیە، کەوتووەتە داوی دنیایەك کەڵکەڵەی مرۆڤانی، نە گوێ بە موڵکە زۆرەکەی دەدات و نە بە سارەی هاوسەری کە زۆر نەخۆشە (سارە، بن جووە، چووەتە سەر مەزەبی ئەرتەدۆکسی ڕووسی و ناوی گۆڕیوە بۆ ئاننا پتروڤنا) لە گوندی، کیژە دراوسێکەیان کە ساشای ناوە، حەزی لێدەکات و، بێ چەند و

چوون دڵی بۆ دەکاتەوە و ئەوەی پێدەڵێت. ساشا، بێگوێدان، بە هیچ قسە و قسەلۆکێك، وا تەسەور دەکات، دەتوانێ ئەو پیاوە لە گێژاوی ئەو خەمینیە دەربێنێ کە تێی کەوتووە. ئیڤانۆڤ، دەکەوێتە ژێر کاریگەری بێ ڕتوشی کیژەوە و ڕێگەی دەدات بێ پەرستێ. بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە دەڵێت: "شەو و ڕۆژ هەست بە عەزابی ویژدان دەکەم. خۆم زۆر بە گوناحبار دەزانم، بەڵام نازانم چ گوناحێکم کردووە؟" ئەنجام ئاننا پتروڤنای هاوسەری دەمرێت. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم، ئەم بێوەپیاوە لاجانگ سپییە، دەگەڵ ساشای ناسکەکچۆڵەدا زەماوەند دەکات. بەڵام کاتێ دکتۆر لڤوف، لە ڕۆژی زەماوەندەکەیا و بە بەرچاوی خەڵکییەوە سووکایەتی پێ دەکات و لە عەلەیی دەدوێ و بە گەماری ناودەبات، یەکسەر لە گواستنەوەی ساشا ژێوان دەبێتەوە و گوللەیەك بە خۆوە دەنێ و خۆی دەکوژێت.

لە میانەی بونیاد و تانوپۆی میلودرامی ئەم شانۆنامەیەوە، سێ جۆرە تەبع هاتووەتە بەرجەستەکردن. تەبعی ئیڤانۆڤ، کە تەبعێکی نەکلۆك و ناسازە چ دەگەڵ خۆی و چ دەگەڵ دنیادا. تەبعی ساشای منداڵکار، کە شایی ئەوەی بە خۆ دیت، کە گوایە دەتوانێ بە زەبری ئەشقی خۆی ئەم پیاوە لەو زەلکاوە دەربێنێ کە تێی کەوتووە. تەبعی دکتور لڤوڤ، کە پزیشکێکی گەنجی ئەبڕومەند و سەر ڕاستە، بەڵام کابرایەکی کورتبینە و پێی وایە کێشەکانی ئیڤانوف، چارەسەردەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئاڵۆزی دەکات.

ئیدی ئەم شانۆنامەیە بەپێچەوانەی شانۆنامەی (بلاتونوف)ەوە، کە شانۆنامەیەکی یەکجار تەنز ئامێز بوو، شانۆنامەیەکی تەواو تەقلیدی و ڕیالیستیە و لەسەر بناغەی تەکنیکی ڕووبەڕووبوونەوەی تەبیعەتان هەڵچنراوە. لە کاتێکا، لە کارە شانۆییەکانی دواتری چیخوفدا، شەقڵ و مۆرکی شانۆی ئوتموسفیر زاڵ دەبێت، هەمووشتێك ناڕاستەوخۆ و، کڕ و کپ و، هێما ئامێزە. بەڵام لەم شانۆنامەیەدا، "ئیڤانوف"، ڕەنگەکان تۆخ و زەقن، هەڵوێستەکان ڕاستەوخۆ و بێ پەردەن، وردەواڵە بێ بایەخەکانی ژیان، لە بەردەم گۆڕانکاریە دیارەکاندا خۆ ناگرن. ڕەگەزی زاڵ زەمان نیە، بەڵکو کەسیەتی ئیڤانۆڤە، کە جۆرە هاملێتێکی ڕووسیە، کە گیرۆدەی داوی خەونەکانی خۆیەتی و ناتوانێ هەست بە هیچ خۆشی و سۆزێکی ڕاستەقینە بکات و پاش هەر زڕە سۆزێك، دووبارە دەگەڕێتەوە سەر بێزاری و ناڕەزاییە هەمیشەییەکانی خۆی.

گومان لەوەدا نیە کە چیخوف، سیفەتی مێبازانەی ئەم قارەمانەی، لە براکانی خۆیەوە، واتا لە ئەلکساندر و نیکولاوە هەڵێنجاوە. بەڵام هەندێ خەسڵەت و سیفەتی خۆیشی تیا بەرجەستە کردووە. هەڵبەتە نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە ئەم شانۆنامەیە لە کاتێکا نووسراوە، کە چیخوف بەخۆی لە جۆرە قەرانێکی خەمینی و دڵتەنگیدا دەژیا. هەندێ لە قسە و گفتوگۆکانی قارەمانەکەی گوزارشت بوون لە بێزاری و بێتاقەتی خۆی. بەڵام چیخوف، بە ڕادەیەك پابەندی کەرامەت و خۆشەویستی کار بوو، کە هەرگیز لە کۆتاییدا، ملی بۆ نائومێدی نەدەدا. جۆرە مێرەڤانیەکی تایبەتی دەرهەق بە (ئیڤانوف) هەبوو، میهرەبانیەکی خزمانە. یانی بە ئاشکرا دەیویست خەڵکی ئەم مرۆڤە شڕ و شەپڕێوە، ئەم پیاوە داڕوخاوە، ئەم بەشەرە بێ کەڵکەیان خۆشبوێ و هاوسۆزی دەگەڵ بکەن. ئەوەتا لە نامەیەکیا، بە سوڤورین دەڵێت: "ئەگەر ئیڤانوف،

لەم شانۆنامەیەدا، وەکو پیاوێکی هەڵە و هەرزە و بێکەڵك دەرکەوتبا و دکتۆر وەکو پیاوێکی گەورە و کەس نەیزانیبا بۆچی سارە و ساشا ئیڤانوڤیان خۆشدەویست، هەنگێ شانۆنامەکەم، هیچ داهێنانێکی تیا بەدی نەدەکرا." (بڕوانە نامەی بەرواری ٣٠/ك١/١٨٨٧) . ئیدی چیخوف، بە دوور و درێژی ئەوە بۆ سوڤورین باسدەکات کە بۆچی ئیڤانۆڤی کڵۆڵ و نائومێد، شایستەی هەر هاوسۆزی و چاوپۆشیەکە، بۆچی لڤوف، چاکەکارێکی گەوجە و ناتوانێ لە ئیڤانۆف تێبگات، بۆچی ساشا، بە خەیاڵی ئەوەی کە دەتوانێ بە زەبری ئەشقی خۆی، ئیڤانوف، لە هەرەس و فەوتان ڕزگار بکات، ئاشقی دەبێ و ئەم کارەی بەلاوە کارێکی پیرۆزە.

پاش ئەوەی شانۆنامەکە، لە کۆڕێکی گشتیدا خوێنرایەوە، کورش بێ چەند و چوون قەبووڵی کرد. ئیدی چیخوف کەوتە حیسابی دەرامەتی خۆی لە شانۆنامەکە، ئەگەر وەکو قەرار بوو، لە سەدا هەشتی فرۆشی بلیتەکانی پێ درابا، مانای وابوو هەشت هەزار ڕۆبڵی وەردەگرت. ئیدی بە خۆشی ئەو دەرامەتەوە، بە سەعاتان گەنگەشەی دەرهێنان و دەورەکانی دەگەڵ داڤیدوفدا، کە قەرار بوو ئەو دەوری قارەمانی سەرەکی ببینێ، دەکرد. جا بۆ ڕیکلام و بانگەشەش، داوای لە ئەلکساندری برای کرد کە لە بڵاوکراوەی "ڕۆژگاری نوێ"دا، لە لاپەڕەی شانۆدا ئەم ئاگادارییە بڵاوبکاتەوە: "ئا.ب.چیخوف شانۆنامەیەکی کۆمیدی چوار پەردەی نووسیوە بە ناونیشانی (ئیڤانوف) کە لە کۆڕێکی ئەدەبیدا، لە مۆسکۆ خوێندراوەتەوە، زۆر بە دڵی گوێگران بووە. بابەتێکی تازەیە. قارەمانەکانی، قارەمانی سێ ڕەهەندین." (بڕوانە نامەی بەرواری ٦ – ٨/ت١/١٨٨٧)

بەڵام هەرکە دەست بە پرۆڤە کرا، تەواو ساردبووەوە، هەستی کرد، نووسەر لەم "پڕۆژە دەستەجەمیەدا" هیچ دەورێکی ئەوتۆی نیە، کەس گوێی ناداتێ، ئەکتەرەکان، ئەویان لە دەقەکە دەرکردووە و بەڕیوەبەر و دەرهێنەرەکە هەمەکارەیە . لەو دە پڕۆڤەیەی کە قەراریان کردبوو بکرێت، تەنیا چوار پرۆڤەیان کرد. چیخوف کە لە هۆڵی نمایش دانیشتبوو و گوێی لە ئەکتەرەکان دەگرت کە لە دوای تەلقینکارەکەوە، دەورەکانی خۆیان ناشیانە دەگوتەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو. هەستی دەکرد شتاقیان لە مەبەست و مانای شانۆنامەکە نەگەییوون و ناگەن. ئەوەندەی خەمی خۆیان بوو، خەمی نووسەریان نەبوو، زیاتر ڕۆڵەکانیان دەگێڕا، تا دەگەڵیا بژین و بەرجەستەی بکەن. کاتێ بە شەرمێکەوە شەرحی باری دەروونی ئەم کاراکتەر یان ئەو کاراکتەری بۆ دەکردن، خۆیان لە گێلی دەدا و بەگوێیان نەدەکرد. ئەوەبوو لە ٢٤/ت١/١٨٨٧دا نامەیەکی بۆ ئەلکساندری برای نارد، کە گلەیی دەکات و دەڵێت: "هەوڵمداوە، بێلایەن بم، لە شانۆنامەکەمدا نە فریشتەم دروست کردووە و نە تاوانبار (بەڵام نەمتوانیوە خۆ لە لیبۆکان ببوێرم) نە کەسم مەحکوم کردووە و نە داکۆکیم لە کەس کردووە، جا نازانم سەرکەوتووم یان نا؟ کورش و ئەکتەرەکان دڵنیان کە شانۆنامەکە سەرکەوتوو دەبێت. بەڵام من زۆر دڵنیا نیم. ئەکتەرەکان هیچ نازانن، لە خۆیانەوە قسەی هەلەق و مەلەق دەکەن، بە ڕاستی دەورەکانیان لە گەڵیاندا ناگونجێ... من لە شەڕی بەردەوام دام... ئەگەر بمزانیبا، هەرگیز خۆم لە قەرەی ئەم کارە نەدەدا."

یەکەم نمایشی، لە مۆسکۆ، شەوی ١٩/ت٢/١٨٨٧ کرایەوە. ئیعلانەکە ناوی چیخۆڤ لەسەر بوو نەك ناوی چیخونتی. هەڵبەتە دوای چەندین هەفتە نیگەرانی و دوودڵی، چیخۆف زۆری پێ سەیربوو، کە بەر لە کردنەوەی پەردەکە، لە ڕووی دەروونیەوە زۆر هێمن و ئارام بوو. هەموو خانەوادەکەیان، نیگەران و نیوەگیان، لە لۆجیکدا کەڵەکە بووبوون، چیخوف لە پشت پەردەوە، لە نزیکی تەختەی شانۆکەدا، لە ژوورێکی پەناگە ئاسادا، دانیشتبوو. ئەکتەرەکان بە بەردەمیا دەهاتن و دەچوون و نیشانەی خاچیان دەکێشا، تا ترس و سامی شانۆ و بەدشانسی لە خۆ بڕەوێننەوە. هۆڵەکە لەبەر قەرەباڵغی کەسی تری نەدەگرت، ئەنجام پەردە کرایەوە.

پەردەی یەکەم، وەکو چاوەڕوان دەکرا، بە باشی و ئاسایی ڕۆیی، هەرچەندە یەکێك لە ئەکتەرەکان، کیسیلیفسکی، زۆرجار ئەو شتانەی کە لە بیری دەچوون، بە خۆی و ئیرتیجالی پڕی دەکردنەوە. هەڵبەتە لە پەردەی دووەمیشدا، ئیرتیجالیەت بەردەوام بوو، ئەمجارەیان لەلایەن ئەکتەرە سەرەکیەکانەوە نا، بەڵکو لەلایەن ئەو ئەکتەرە لاوەکیانەوە، کە دەورەکانی خۆیان لەبەر نەکردبوو و هەر چەنەچەنیان بوو. بەڵام لەوە نەدەچوو هیچ یەکێك لە تەماشاڤانان هەستیان بەمە کردبێت. لە کۆتایی پەردەی سێیەمدا جەماوەری تەمەشاڤان دەستیان بە چەپڵەلێدانێ کرد و بە ناو داوای نووسەریان کرد. وا دیاربوو سەرکەوتن مسگۆرە یان چیخوف وای تەسەور دەکرد، ئیدی بەدەم دڵە خورپەوە چاوەڕوانی پاشماوەکەی دەکرد. هەنگێ پەردەی چوارەم دەستی پێکرد، ئەکتەرەکان کە لە بەینی پەردەکانی دیدا سەرو چەند پێکیان لێدابوو نمایشەکەیان کرد بە گاڵتەبازاڕ. کیسیلیفسکی کە مەستی مەست بوو، بە خۆیشی نەیدەزانی چ دەڵێت و چ دەکات. لە جیاتی نواندن لێبۆکبازی دەکرد. خۆکوژی ئیڤانوف، هەندێ لە تەماشاڤانەکانی هەژاند و هەندێکی تری هێنانە پێکەنین. ئیدی هۆڵەکە بوو بە هەرا و زەنا و ژاوەژاوێك ئەو سەری دیار نەبوو: فیکەکێشان و چەپڵە، تەوس و ئافەرین. هەندێ لە تەماشاڤانان کەوتنە شەڕە مست. پولیس ناچار هەندێ لە ئاژاوە چیەکانیان لە هۆڵەکە دەرکرد. خوشکەکەی چیخوف کە چاوی بەم فەرتەنەیە کەوت خەریك بوو ببورێتەوە. یەکێك لە برادەرەکانی چیخوف "کە تووشی نەفەس تەنگی بوو، بە پەلەپڕوزێ لە هۆڵەکە وەدەرکەوت." یەکێکی دی سەری لە نێو هەردوو دەستی نا و، بە دەم ناڵینەوە گوتی: "ئێستا چی بکەم؟" چیخوف، لە ناوەندی ئەم هەرا و هەنگامەیەدا مایەوە و هیچ خۆی شێلو نەکرد، هێمن و ئارام وەکو ئەوەی مەسەلەکە، لە بنی پەیوەندی بەوەوە نەبێت. هەرچەندە لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندر دەڵێت: "هەرچەندە هەست بە ماندوویەتی دەکەم، بەڵام هەست بە خۆشیش دەکەم. شانۆدۆستان دەڵێن، قەت، هیچ کاتێك ئەم جۆش و خرۆشە، ئەم هەموو چەپڵە و ئەم فیکەکێشانەیان نەدیتووە، لە هیچ شوێنێکی دی ئەم هەموو گەنگەشەیەیان نەدیتووە کە دەربارەی شانۆنامەکەی من کراوە." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ٢٠/ت٢/١٨٨٧). دوای یەك دوو ڕۆژێك، لە ٢٤/ت٢/١٨٨٧دا نامەیەکی دی بۆ ئەلکساندری برای دەنووسێت و گاڵتە بە خۆی دەکات و نامەکە بەمجۆرە ئیمزا دەکات: "شیلر شەکسپیروفیچ گوتە"

ڕەخنەگری بڵاوکراوەی "هەواڵەکانی مۆسکۆ" لە وتارێکدا دەنووسێت: "شانۆنامەکە هەڵەی زۆری تیایە، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کەم ئەزموونی و نابەڵەدی نووسەر. من تا کۆتایی چاوەڕوانی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەبع و تەبیعەتی کەسێتی ئیڤانوڤم کرد، بەڵام شتی وا ڕووی نەدا و نەدا.". ڕەخنەگرەکەی "هەواڵەکانی مۆسکۆ" ڕایگەیاند کە "ئیڤانوف بریتییە لە گەوجەگەوجێکی ناشیرینی گۆساخانەی، بێ ئەخلاقانەی قێزەون." دوو نمایشی دیکەی شانۆنامەکە لە کەش و هەوایەکی ئارامترا کرا و ئیدی وازیان لە نمایشکردنی هێنا.

چیخوف، ئەم ناکامیەی ، فەیلەسوفانە وەرگرت. هیچ ڕقێکی لە کورش هەڵنەگرت، کە زوو دەستبەرداری نمایشی شانۆنامەکە بوو، یان هیچ گلەییەکی لە ئەکتەرەکان نەکرد کە خیانەتیان لە بیرۆکەی ئەسڵی ئەو کرد، هیچ گازندەیەکی لە جەماوەری تەمەشاڤانان نەکرد کە قەدری کاراکتەرانی شانۆنامەکەیان نەدەزانی. هەرکە هەرا و هەنگامەکە نیشتەوە هەستی بە ئارامیەکی سەیر کرد، وەکو ئەوەی ئەم جەزرەبە بە ئازارە، وەخۆی هێنابێتەوە و هاوسەنگی بۆ گێڕابێتەوە. جارێکی دی بە ئاسوودەیی، دەستی دایە قەڵەم تا بە ناوی چیخونتییەوە چیرۆکێن تەنز ئامێز بۆ ڕۆژنامە و بڵاڤۆکان بنووسێت.

پەراوێز:

١ – "... ژنانی تەمەن بالزاکی ...": مەبەستی چیخوف لەو دەستەواژەیە ژنانی تەمەن سی ساڵ و زیاترە.

## ژیانی بێزاری

گومان لەوەدا نەبوو کە چیخوف، جۆرە کەڵکەڵە و ئارەزوویەکی خۆڕسکی شانۆی لەسەردابوو، هەرچەندە سوێندی دەخوارد کە ناکامی شانۆنامەی (ئیڤانوف) بۆ هەتاهەتایە ئەو خولیایەی لە لاسرِییەوە، بەڵام ویڕای ئەوەش، نەیدەتوانی شانۆنامەی ناڤبری، کە ڕەنجێکی زۆری پێوە کێشابوو و، ئومێدێکی فرەی لە سەر ڕۆنابوو، فەرامۆش و لەبیر بکات. بە تایبەتی کە سەیری کرد فرۆشی هەردوو کۆچیرۆکەکەی، "چیرۆکێن هەمەڕەنگ" و "بولێڵ" زۆر خراپە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر شانۆنامەی "ئیڤانوف" کە لە مۆسکۆدا ناکام بوو، بدرێتە دەرهێنەرێکی باش و لە پترسبورگ پێشکەش ونمایش بکرێت، دەستکەوتێکی دارایی باشی دەبێت. جا بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە خاوەن شانۆیەك بدۆزێتەوە، کە ئامادەیی ئەم کارەی هەبێت. ئەوەبوو چیخوف بەو مەبەستە لە ١٨٨٧/١٠/٢٩دا سەفەری پایتەختی کرد.

بۆ ئەوەی مەسرەفی زۆر نەبێت، لەسەر داوای ئەلکساندری برای، چووە ماڵی ئەو، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم لەو کارەی خۆی ژێوان بووەوە. ئەلکساندری هەمیشە پەست و بێزار ،توڕە و ترۆ، تەمەڵ وکەللەڕەق دەگەڵ ماشقەکەیدا کە نەخۆش بوو، لە کوختەیەکی پەرپووتا دەژیا، ئەلکساندر، زۆر دەم بە گلەیی بوو، لە هەموو کەس و لە هەموو شتێك بە گلەیی و گازاندە بوو. چیخوف لە نامەیەکیا بۆ میخائیلی برای، لەو بارەیەوە دەڵێت: "پیسی و پۆخڵی، بۆن بۆگەنی، فرمێسك و درۆ. ئەگەر هەفتەیەك لە نك ئەو بمێنیتەوە، ڕێك شێت دەبیت، وا هەست دەکەیت وەکو پەڕۆی قاپسڕینی موبەق پیس دەبیت." (بڕوانە نامەی ٣/ك١/١٨٨٧).

چ جیاوازیەك لە نێوان ماڵە بچووك و پەرپووتەکەی ئەلکساندری کلۆڵی دەم بە گلەیی و ئەو هۆڵە ڕازاوە و چراخان ئاسا و پڕ ئەتەکێت و خۆش مەجلیسانەدا هەبوو کە زۆربەی شەوەکان چیخوفیان بۆ دەعوەت دەکرا! ئاسمان و ڕێسمان بوو! پێش ئەوەی لە مۆسکۆوە بکەوێتە ڕێ، نوسخەیەکی لە شانۆنامە ناکامەکەی، "ئیڤانۆف"ی بۆ دۆستانی پترسبورگ ناردبوو، کە گەییە ئەوێندەر سەیری کرد شانۆنامەکەی دەستاودەستی دەکرد. سەیر ئەوەبوو، هەموو ئەوانەی خوێندبوویانەوە، دڵبەندی بووبوون و بە ئاو و تاو باسیان دەکرد. چیخوف لە هەمان نامەدا بۆ میخائیل، لەمبارەیەوە دەڵێت: "سوڤورین لەوە توڕە و پەستە کە من ئەو شانۆنامەیەم داوە بە کورش. بە بۆچوونی ئەو نە تیپەکەی کورش و نە جەماوەری تەمەشاڤانانی مۆسکۆیی، ناتوانن لە ئیڤانوف تێبگەن. خەڵکی ئێرە گاڵتەیان بە بلاڤۆکەکانی مۆسکۆ دێت. هەموو بە تاسەوە چاوەڕوانن کە شانۆنامەکە لێرە، لە پترسبورگ، پێشکەش و نمایش بکرێت، دڵنیان کە لێرە سەرکەوتن بە دەست دێنێ." (بڕوانە هەمان نامەی پێشوو)

چیخوف، بەدەم شادی و سەرمەستی ئەو هەموو ستایشەوە، لەسەری دەڕوات و دەڵێت، پترسبورگ شارێکی زۆر جوانە، لێرە، هەست دەکات بە ئاسمانی حەوتەما دەسوڕێتەوە.

شانۆنامەکەی لە کۆڕێکی ئەدەبیدا دەخوێنێتەوە. بەجۆرێ چەپڵەبارانی دەکەن کە ناچار، لەبەریان هەڵدەستێ و سەری ڕێز و ستایشیان بۆ دادەنەوێنێ. هەڵبەتە زۆری شایی بەو وتارە دوور و درێژ و پڕ ستایشە هات کە لە "پۆستەی ئەوروپا"دا دەربارەی ئەو بڵاوبووەوە و بەشداری کۆمەڵێك ئێوارەخوانی کرد کە بەو بۆنەیەوە بۆ ئەویان سازکردبوو. نیگارکێشی بەناوبانگ، ریپینی بینی، دەگەڵ لیونتیف – شچگلوڤ نووسەردا شیڤی خوارد، لە ڕێگەی ئەوەوە ئاشنایەتی دەگەڵ شاعیری پیر ئەلکسی پلشچیفدا پەیدا کرد کە سی و هەشت ساڵ لەوەپێش بە تۆمەتی ئەندامبوون لە شانەی شۆڕشگێڕیی پتراشڤسکیدا، دەستگیرکرابوو و دەگەڵ دۆستویفسکیدا لەبەردەم جۆخەی ئیعدامدا ڕاگیرابوو کە تیرباران بکرێت، ئیدی لە دوا ساتدا نیکۆلای یەکەم، فریا کەوتبوو، حوکمی ئیعدامەکەی بۆ سووك کردبوو وبە حەپسی هەواڵەی سیبریا کرابوو. کورولینکو، کە بۆ جاری دووەم چیخوف لە سان – پترسبورگ دەبینێ، جۆرە زیرەکی و هوشمەندیەکی ڕۆشنبیرانەی ئاوێتە بە شەرمی دێهاتیانەی تیا بەدی کردبوو و پاشان لەو بارەیەوە نووسی بووی: "تەنانەت چاوە شینە[1] "*" پرشنگدار و مەنگ و قووڵەکانی چیخوف، مەندی بیر و بێگەردی و بێ ڕیایی منداڵانەیان لێهەڵدەقوڵا، سادەیی بە کردار و هەڵوێست و گوتاریەوە، هەروەها بە نووسینەکانیەوە، دیاربوو... بە نۆڕینی من ژیان و جۆشی ژیان لە قوڵایی ناخیا ڕەگی داکوتابوو، دڵی بە ژیان خۆش بوو[2]."

لە ڕاستیا چیخوف، دڵی "بە ژیان خۆش" نەبوو، مەگەر ناوبەناو لە کۆڕ و مەجلیسی دۆستاندا، خەمی خانەوادە و کێشەی دارایی و تەنیایی خۆی لە بیر بکردایە. گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ، لێبڕا سەرلەنوێ بە ئیڤانۆفدا بچێتەوە و بەرلەوەی بیدات بە شانۆیەکی پترسبورگ، دەسکاری بکات. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم پرۆژەیەکی دیکە بەرۆکی گرت، ئیدی لە ١/ك١٨٨٨/٢وە دەستی بەو پرۆژەیە کرد کە چەند مانگێك و بگرە چەند ساڵێك بوو بیری لێدەکردەوە و دەگەڵیا دەژیا. ئەویش چیرۆکێك بوو بە نێوی (ستێپ = پێدەشت)، دوا سەفەری بۆ دەشتەکانی دون، زۆر یادگار و بیرەوەری پرشنگداری منداڵی لا زندوو کردبووەوە و هەر ئەوەندەیان مابوو لە قاڵبی چیرۆکدا بێنە داڕشتن. پلشچیفی بەڕێز داوای لێدەکرد کە دەقێکی سەنگین و جدی بۆ بنووسێت تا لە (پۆستەی باکوور)دا بۆی بڵاوبکاتەوە. گریگورفیچش، لە نیسەوە نامەیەکی تازەی بۆ ناردبوو، داوای لێدەکرد کە خۆی بە نووسینی شتی بچووکەوە خەریك نەکات و بیر لە نووسینی ڕۆمانێك بکاتەوە. تەنانەت بابەتێکی بۆ پێشنیازکردبوو، کە بە بۆچوونی ئەو شتێکی باش و کاریگەر دەردەچوو: مەینەتی و ئازاری گەنجێکی هەڤدە ساڵە، کە لە کلۆڵی و نائومێدیدا خۆی دەکوژێت. چیخوف، وەڵامی دەداتەوە کە بێگومان بابەتێکی باش و ناوازەی لێدەردەچێت، بەڵام حاڵێ حازر دەستی بە نووسینی دەقێکی تەواو جیاواز کردووە: گێڕانەوەی واریڤاتی سەفەرێکی دوورودرێژە بە ستێپ دا، کە دەکرێت بە جۆرە "ئانسکلوپیدیایەکی ستێپ" دابنرێت.

هەموو ڕۆژێك زۆر بە جدی کاری لەم دەقەدا دەکرد: دەیویست دەقێکی پوختە دەربچێت. بەدەم ئەو کارەوە، بە نەبەدڵی چەند سەعاتێکی بۆ نووسینی کورتە چیرۆکێکی زۆر سادە و

هەستیار، بە ناوی (خەوالّو)وە، بۆ گۆڤاری "سان – پترسبورگ" تەرخان کرد و جارێکی دی بە نەفەسێکی تازەوە گەڕایەوە سەر چیرۆکی (ستێپ) کە زۆری خەم بوو. جا ئەوێك کە لەسەر نووسینی کورتە چیرۆکێن چەند لاپەڕەیی ڕاهاتبوو، هەنووکە زۆر زەحمەت بوو، بە ئاسانی، لە میانەی بیرەوەری منداڵیەوە، هەزاران نهێنی و، دیمەنی ڕەنگاوڕەنگی ستێپ کەشف و بەرجەستە بکات و ژیانی پێ ببەخشێت. نەبوونی پلۆت و نەخشەیەکی دیار، هێندەی دی بابەتەکەی لێ دەئاڵۆزاند: پێویستی بەوە بوو لە جیاتی وەرچەرخانی درامی ڕووداوەکان و هەڵکشان و داکشانی کوت و پڕی ڕووداوەکان، وێنەی خەڵکەکە و شوێنەکان، بە جۆرێ بگرێت، کە هەم لە ڕووی سۆزدارییەوە و هەم لە ڕووی کەشفی دەروونیەوە، پەسەند بێ. لە نامەیەکیا بۆ کورولینکو دەڵێت: "تیمە و بابەتێکی باشە، بە لەزەتەوە کاری لەسەر دەکەم، بەڵام بۆ نەگبەتی چونکە فێری نووسینی دەقی درێژ نیم، دەترسم زیاد لە پێویست درێژ دادڕی بکەم و، کاریگەرییەکەی پێچەوانە بکەوێتەوە: هەر لاپەڕەیەك دەقێکی چکۆلەی سەربەخۆیە، دیمەنەکان بەسەر یەکدا کەڵەکە دەبن و لەبەر تەنگی جێگا دەکەونە پاڵەپەستۆ و یەکتر وەدەرنان و کاریگەریی گشتی دەقەکە خاو و کاڵ دەکەنەوە... خوێنەر لێی بێزار دەبێت و تف بارانی دەکات." (بڕوانە نامەی بەرواری ٢٢/ك١٨٨٨/٢). هەروەها لە نامەیەکی دیدا کە لە ٢٢/ك١٨٨٨/٢ دا بۆ لیونتیف – شچگلوڤ دەنێرێ، دەڵێت: "ئەوەی شێتم دەکات، ئەوەیە کە چیرۆکەکەم هیچ شەقڵ و مۆرکێکی (ڕۆمانس)ی، واتە خەیاڵ و ئافرەت و ئاشقێنی تیا نیە. چیرۆکی بێ ئافرەت، وەکو ئامێری بوخاری، بێ بوخارە" (بڕوانە نامەی ٢٢/ك١٨٨٨/). وێڕای ئەمەش، تا زیاتر لە کارەکەیدا دەچووە پێشێ، پتر متمانە و باوەڕی بە خۆی پەیدا دەکرد. بە ئیعتراف خۆی (ستێپ)ی وەکو چۆن: "کەسێکی خۆش خۆر، بە تاسوقەوە سوێسکەیەك دەخوات" بەو ئاوایە، بە تاسوقەوە، بە کاوەخۆ نووسیوە، لە نامەیەکیا بۆ پلشچیف دەڵێت: "کاتێ کە دەمنووسی، هەستم دەکرد چواردەورم هەر هەمووی بۆنی هاوین و ستێپی گرتووە." هەروەها لە (١٨٨٨/٢/٤دا) لە نامەیەکیا بۆ هاوڕێی نووسەر، ئەلکساندر لازاریف – گرورنسکی دەڵێت: "لە نووسینی ستێپ دا زەحمەتی زۆرم کێشاوە، فسفۆڕی دنیام سەرف کردووە و بە شیلەی ڕوح گۆشم کردووە: بە دڵ و بە گیان ئیشم تیا دەکرد، گوشارێکی دەروونی زۆرم لەسەربوو، هەرچی هێز و توانام هەبوو لێی دەرهێنام، زۆری ماندووکردووم، بەجۆرێ خۆم گوشیوە، کە وشکم کردووە، ئیدی ئاخۆ سەرکەوتووم یان بەسەر سەرا کەوتووم؟ نازانم. بە هەرحاڵ، ئەمە شاکار و توحفەی منە، لەوە باشترم بۆ نانووسرێت" نووسینی چیرۆکەکە، یەك دانە مانگی خایاند و، یەکسەر بۆ پلشچیفی نارد و تکای لێکرد، ڕاستگۆیانە و بێهیچ چاوپۆشی و خاترانەیەك، بە ڕاشکاوی ڕاوبۆچوونی خۆی، لەبارەیەوە دەربڕێت. ئەوەتا لەو بارەیەوە دەڵێت: "تو زاتی خوا، شەرم مەکە، بێ لە ڕوودامان، پێم بڵێ ئاخۆ چیرۆکەکەم خراپە یان نا، هەستدەکەم، زۆرم پێویست بەوەیە کە حەقیقەت بزانم". نامەکە بەمجۆرە ئیمزاکرابوو: "بچووك و دڵسۆزی ڕاستگۆ و تازەکاری ئێوە، ئانتون چیخوف." (بڕوانە نامەی ١٨٨٨/٢/٣).

دوای پێنج ڕۆژ، وەڵامێکی گەرم و گوڕی نامەکەی درایەوە: "بە تاسەوە چیرۆکەکەتم خوێندەوە، هەرکە دەستم پێکرد، ئیدی نەمتوانی دای بنەم. کورولینکوش هەمان بۆچوونی منی هەیە. شتێکی زۆر سەیر و ئەفسووناویە، شیعریەتێکی ئەوتۆی تیایە، کە دەتخاتە سەما، بەرهەمێکی جوانە و، پێشبینی ئایندەیەکی پڕ شکۆ و پرشنگدارت بۆ دەکەم."

دیارە ئەم ستایشەی پلشچیف، کاریگەری و بایەخێکی تایبەتی هەبوو، چونکە چیخوف بە خۆیشی چیرۆکی "ستێپ"ی بە باشترین بەرهەمی تا ئەوکاتەی خۆی دەزانی و لە هەموو کارەکانی تری، خۆشتری دەویست. بە بیرەوەری و یادگاریەکانی سەردەمی منداڵی خۆی موتوربەی کردبوو، زۆری پێخۆس بوو کە دەیبینی وێنە سادە و فولکلۆریەکانی ئەو، دەتوانن کار لە خەڵکانی بێگانە بکەن و هەستیان بهەژێنێ. هەروەها زۆریش دڵی بەو پاداشتە خۆش بوو، کە ئیدارەی "پۆستەی باکوور" لە سەر بەرهەمێك دابوویانێ کە بە کەمتر لە مانگێك نووسی بووی: هەزار ڕۆبڵ، لەلای هەموو هاوڕێکانی بە شانازیەوە باسی ئەمەی دەکرد.

چیرۆکی ستێپ، لە ژمارەی مانگی سێی (پۆستەی باکووردا) بڵاوبووەوە، ڕەخنەگران و خوێنەران، یەکسەر و بێدرەنگ پێشوازیەکی گەرم و جدیان لێکرد. لیکسوف، باسی بلیمەتی کرد، سالتیکوف — شچدرین و ئوستروفسکی لەوە هێوەتر ڕۆیشتن. بەڵام (بورنین)ی ڕەخنەگری (ڕۆژگاری نوێ) نووسەری بە گوگول و تولستوی بەراورد کرد. گارشین، کە گەنجێکی دیار و بەهرەمەند بوو، چیرۆکەکەی لە کۆڕ و مەجلیسە ئەدەبیەکاندا خوێندبووەوەو ڕای گەیاندبوو کە: "ئەمە نووسەرێکی دەرەجە یەکە، خەنی لە ڕووسیا... وەکو چۆن دومەڵێك دەردەبێ، بەو ئاوایە هەنووکە هەست بە ئارامی و ئیسراحەت دەکەم."

دیارە، ئەم دەنگدانەوە و ستایشە نیمچە گشتیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو داهێنان و ئەفراندنە هونەریەی کە چیخوف لەم کارەدا بەرجەستەی کردبوو. لە چیرۆکێکی سادە، بەڵام دڵگیر و خوێنەرگردا واریقات و سەربهووردی سەفەری منداڵێکی نۆ ساڵان بە نێوی ییگۆر دەگێڕێتەوە، کە مامە بازرگانەکەی بە گالیسکە، بە دەشتی ستێپدا بەرەو شاری دەبات، شارێك کە منداڵەکە، لەوێندەر دەچێتە یەکێك لە قوتابخانەکانی. هەوراز و نشێوی ئەم سەفەرە دوور و درێژە دەبن بە زنجیرە چیرۆك و حیکایەتێك، کە لە کەسایەتی ییگۆری چکۆلەدا یەکانگیر دەبنەوە. ییگۆر بیری دایکی دەکات، نیگەرانە لەوەی کە لە دایکی دادەبڕێت، نیگەران و ناڕەحەتی ئەو چارەنووس و ژیانە تازەیەیە کە چاوەڕوانیەتی، ئەفسوونی دیمەنە بەشکۆ و جوانەکانی سروشتی دەرێی شار دەبێت. دەگەڵ هەر پیچێکدا، زیاتر ئەفسوونی جوانیەکانی سروشت دەبوو. ییگۆر، بێداری (ستێپ) لە ئاونگی بەیانیاندا تەمەشا دەکات کە چۆن لە نەرمە گەرمای نیوەڕۆدا، خاو دەبێتەوە، لە باهۆزی کتوپڕدا دەهاڕوژێ و لە شەوانی سارد و خامۆشدا ئارام دەگرێت. تەنیا هەندێ بەرخورد دەگەڵ خەڵکانی نەناس، هەندێ ڕووداوی بچووك و بڕێك گفتوگۆی لامسەرلایی بەدەم ڕێگاوە، یەکنەوایی ئەم سەفەرە خاو و دوور و درێژەی دەڕەواندەوە. ناوبە ناو، لە وەخت و ناوەختا، ئیدی بەگوێرەی واقیعی دەشتی ستێپ، چەند جووتیارێك، یان چەند عارەبانچییەك یان چەند بازرگانێك لەو دەشتە یان و بەرینەدا دەردەکەوتن و خەیاڵی ییگوری چکۆلەیان

دەشڵەقاند، هەر هەموو ئەو قارەمانانەی کە زۆر بە وردی وێنەگیراون چ موسای میوانخانەدار و سلێمانی برای، چ قەشە کریستوفەر، هاپۆ کوزینکوف، چ ڤارلاموڤ دەوڵەمەندی ستێپ، یان دیموڤ جووتیاری موزیر و بێپەروا، هەر هەموو ئەم کاراکتەرانە، هەم جوان بەرجەستەکراون و هەم لە ژیانی ڕاستەقینەوە نزیکن. پلشچیف دەربارەی دیموف دەڵێت، بە تاقی تەنیا ئەوە دێنێ، بکرێت بە بابەتی شانۆنامەیەکی سەربەخۆ. چیخوفیش لە وەڵامیا دەڵێت: "ڕۆژگار خەڵکانی وەکو دیموڤ بۆ لە دین دەرچوون یان ئاوارەیی و گومڕایی، یان ئاکنجی بوونی شاران دروست نەکردووە، بەڵکو خوا دای ناون بۆ شۆڕش، کەچی وێڕای ئەوەش هەرگیز شۆڕش لە ڕووسیادا ڕوونادات. بۆیە دیموف تا مردن سەر دەکاتە خواردنەوە و بە ئالوودەیی دەمرێت، یان خۆی لە زنداندا دەبینێتەوە، کەسێکی زیادە" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٢/٩) هەر هەموو ئەم کاراکتەرانە، بە دەوری ییگۆری چکۆلە و شەرمن، هەستیار و خەمیندا دەسوڕێنەوە. هەرچییەك دەبینێ و دەژنەوێ لە یادگەیدا نەخش دەبێت و گیانی شاد دەکات. لە زاگە و زێدی خۆی دەرکەوتووە تا دنیای دەرەوە، دنیای خەڵکانی دی کەشف بکات و ببینێ. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ستێپ دەبێ بە قوتابخانە و فێرگەی ژیانی. لە کۆتایی سەفەرەکەیدا، کە ناچار دەبێ لە هاوسەفەرەکانی جیابێتەوە و بچێتە ئەو خانووەوە کە دەبێ لە ماوەی خوێندنەکەیدا تیایا بمێنێتەوە، دڵی پڕدەبێت و بەری فرمێسکانی پێناگیرێ: هەست دەکات، هەموو ڕابردووی، لە دڵیا ڕیشەکێش دەکەن: "شەکەت و ماندوو، خۆی دا بەسەر کورسیەکدا و بەدەم فرمێسکی خوێنینەوە، پێشوازی ئەو ژیانە نادیارەی کرد کە لە بەردەمیا بوو. چ ژیانێك بوو ئەو ژیانە، لەچی دەچوو؟"

چیرۆکی ستێپ، بە ستایلێکی سادە، جوان و دوور لە هەر ڕازانەوەیەکی زمانەوانی دەستکرد، نووسراوە، یانی وەکو هەندێ لە نووسینەکانی پوشکین، وەختێ پیاو لە خوێندنەوەی دەبێتەوە، هەست دەکات، مەحاڵە ئەم چیرۆکە بە هیچ زمانێك، جگە لە وشە و زمانی خودی چیرۆکەکە بێتە گێڕانەوە. یانی تێکڕا پەخشانە شیعرێکە لەو گۆڕە، گەشتنامەیەکی ناوازەیە. چیخوف لە سەرەتاوە وای نیازبوو، زیاتر لە سەر گێڕانەوەی سەربهوردو واریقاتەکانی ییگۆری چکۆلە بڕوات، بەڵام دوودڵ بوو لەم کارە، لە دڵی خۆدا دەیگوت ئەگەر لەوەی پتر لە سەری بڕوات و تا تەمەنی سەرووی منداڵیەتی دەگەڵ قارەمانی چیرۆکەکەیدا بڕوات، سیحر و جوانی و هاوئاهەنگی و هاوسەنگی پاك و بێگەردی نێوان قارەمانی چیرۆکەکە و دەشتی ستێپ بەتاڵ نابێتەوە؟ ئەم هاوسەنگیە جوانە، لە زەینی خوێنەردا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ناسڕێتەوە؟ ئەوەبوو ئەنجام دەستبەرداری ئەم کارەبوو. دەیگوت، لە هەموو چیرۆکەکانی تری، زیاتر کاری لەسەر دەقی (ستێپ) کردووە و هەستی دەکرد، هەموو شتێکی گوتووە و ستێپ کارێکی پوختە و تەواوە و، هەنووکە نۆرەی ئەوەیە بێخەم و خەیاڵ، لە سەر گازی پشت لێی ڕاکشێ و ڕووسان گوتەنی " تف لە سابیتە و بن میچان بکات." وێڕای ئەوەش، هەر بۆ خۆشی و سەرگەرمی، شانۆنامەیەکی تاك پەردەیی بە ناونیشانی "ورچ" نووسی. ئەوسا، بە ئومێدی سەرکەوتنی زیاتر، لە ٣/١٣دا، جارێکی دی بەرەو سان – پترسبۆرگ کەوتە ڕێ.

ئەمجارەیان، لە شوقە گەورە و بەشکۆکەی سوڤۆرین، هەواری خست، نەك لە کوختە پەرپووتەکەی ئەلکساندری برایدا. دوو ژووری مۆبێلەکراوی جوانی، بە پیانۆیەکی گەورەوە، هارمۆنیکایەك، قەنەفەیەك، ژووری حەمام و تەوالێتی تایبەتیەوە لە خزمەتا بوو، دەگەڵ گالیسکەیەکی حازر و ئامادەدا تا بۆ هەر شوێنێکی شاری بوێ، بیبات. خزمەتکارێکی تایبەتیشی بۆ تەرخان کرابوو. چیخوف لە نامەیەکا بۆ میخائیلی برای، لەمبارەیەوە دەڵێت: "ڤاسیلی، خزمەتکاری من، لە من پۆشتە و پەرداخ ترە، سیمایەکی تایبەتی هەیە، بە ئەدەبەوە بە دەورما دێت، بە سەری پەنجە دەڕوات، هەوڵ دەدات بزانێ چیم پێویستە تا بۆمی جێبەجێ بکات." (بڕوانە نامەی ١٨٨٨/٣/١٥). خانەخوێیەکانی، بۆ بازاڕ و دوکانە تازەکانیان دەبرد و بۆ شیڤ دەعوەتیان دەکرد و بەدەم شیڤەوە شامپانیایان دەرخوارد دەدا، بۆ هەرکوێ دەڕۆیی، مەدح و ستایش دەکرا. دیارە ئەمە هەم دڵخۆش و هەم بێزاری دەکرد، هەم شاد و هەم شەرمەزاری دەکرد، ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ خاتو کیسلیوڤا، دەڵێت: "هەستم دەکرد بەرەڵڵا و مشەخۆرێکی ڕاستەقینەم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٣/١٥). ناخۆشترین شتی ئەم سەفەرەی ئەوەبوو کە ناچاربوو گوێ لە قسە هەلەق و مەلەق و بێسەر و بەرەکانی خاتوو سوڤۆرین بگرێت، کە هەر جارەی لە ئاشێکی دەکرد، بۆ نموونە لە باسی ترسی خۆیەوە لە تیرەی بەشەر، بازی دەدایە سەر باسی کڕینی چاکەتێك کە بە سەد و بیست ڕۆبڵی کڕی بوو، ئەوسا کورت و پڕ دەچووە سەر باسی ژانەسەری خۆی. چیخوف، هەمیشە بە کورتی، بەڵام بە ڕێز و حورمەتەوە وەڵامی دەدایەوە. بە پێچەوانەوە سات بە سات پتر خۆشی بە رەفاقەت و دۆستایەتی دوڤۆریندا دەچوو. زۆری پێنەچوو کە ئەم دوو پیاوە لەسەر چاپی تازەی کۆچیرۆکی "بولێڵ" و بڵاوکردنەوەی کۆچیرۆکێکی تازە ڕێکەوتن. سوڤۆرین، بەڕادەیەك متمانەی بە چیخوف و ئایندەی چیخوف بوو، کە بەوپەڕی جدی، پێشنیازی کرد، کیژەکەی خۆی بداتێ. ئەو کیژەی کە ئانتون دەربارەی بە ئەلکساندری گوتبوو: "هێشتاش، بەبێ ئەوەی خۆی دابنەوێنێ، دەتوانێ بەژێر مێزەکەدا بڕوات". ئەگەر ئەم کیژەی خواستبا، لە ماوەی چەند ساڵێکدا بە گوتەی خەزووری دەبوو بە خاوەنی نیوەی دەستمایە و دەرامەتی گۆڤاری (ڕۆژگاری نوێ). چیخوف لە هەنبەر ئەم پێشنیازەدا تەنیا پێکەنی بوو و هیچی تر.

سوڤۆرین، بە هەموو ڕاشکاوی و لووتبەرزی و لاف و گەزاف و هەلپەرستیەکی خۆیەوە، چیخوڤ، لە دڵەوە خۆش دەویست و هەستی دەکرد ژیانی لێهەڵدەقوڵێت و گیانی تازە بوونەوە و نوێخوازی تیایە. ئیدی بەرەبەرە پەیوەندی مەعنەوی و ڕۆشنبیری نێوانیان گۆڕا و بوو بە پەیوەندی دۆستایەتی. سوڤۆرین کە بیست و شەش ساڵ لە چیخوف گەورەتربوو، لە ڕووی دەسکەوتی دارایی و ئەزموونی ژیانەوە، زۆر لە چیخوف زیاتر بوو. بەڵام هەردووکیان بە ڕەگ و ڕەچەڵەك، دەچوونەوە سەر چینی ڕەش و ڕووتی جەماوەری خەڵك. باپیری سوڤۆرین، کۆیلەی زەوی بوو، بابی بە سەربازی لە جەنگی برودینودا*[3] بەشداری کردبوو، بەخۆیشی، پاش ئەوەی خوێندنی سەرەتایی تەواو کردبوو، لە گوندا بووبوو بە فێرکار و بەڕێوەبەری قوتابخانە. ئیدی لەوێوە ڕێی کەوتبووە دنیای ڕۆژنامەگەری. نووسینەکانی سەرەتای، تۆن و زمانێکی زۆر

لیبراڵانەی هەبوو. بەڵام زۆری پێنەچوو گەییە ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر ئەو لە دووی سەروەت و حورمەت و دەسەڵاتە، دەبێ مەرایی و ستایشی حکومەت بکات. لە ساڵی ١٨٦٧دا، پاش ئەوەی ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی بچووك و کەمبایەخی پایتەختی، یانی "ڕۆژگاری نوێ"ی زۆر بە هەرزان کڕی و بێهیچ شەرم و شورەییەك کەوتە ستایش و پیاهەڵدانی دەسەڵاتی وەخت. ئەم بادانەوەیەی ئەو ڕق و بێزاری ڕۆشنبیران و پشتیوانی باوکانەی دەسەڵاتی لێکەوتەوە. (ڕۆژگاری نوێ) لە ماوەی دە ساڵێکدا گەشەی کرد و بوو بە گەورەترین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی سەرانسەری ڕووسیا. زۆری نەبرد سوڤۆرین، وەشانخانەی تایبەتی خۆی دامەزراند، مۆڵەت و ئیمتیازی کردنەوەی کوشك و کتێبفرۆشی هەموو وێستگاکانی قیتاری سەرانسەری ڕووسیای، لە دەسەڵاتی تزاری وەرگرت. ئیدی وەکو ملیونێرێك، های لایف دەژیا. بە شانازیەوە یادی ئەو ڕۆژگارانەی دەکردەوە، کە چۆن هاوسەرەکەی بەپێی پەتی بە ناو گوندا دەسوڕایەوە، تا پێڵاوەکانی کۆن نەبن و نەدڕێن. ئەم دەوڵەمەندییەی ئەو، زادەی خیانەتی بەردەوامی بوو، لە قووڵترین هەستی خۆی. لە ڕۆژانە یاداشتەکانی خۆیا، هۆڤیگەری و دکتاتۆریەتی دەسەڵاتی ڕیسوا دەکرد و لەسەر لاپەڕەکانی (ڕۆژگاری نوێ)شدا، یا دەیتوانی بە شان و باڵیا هەڵیدەدا و ستایشی دەسکەوتەکانی دەکرد. بابایەك بوو، خۆی خۆی پێگەیاندبوو، ڕۆژنامەوانێکی بەهرەمەندی شانۆنامەنووس بوو. کابرایەك بوو بە گومان، باوەڕی بە شتێن ئایدیالی نەبوو، سەنگی مەحەك لای ئەو کردار بوو نەك گوتار، خەڵکی، بە کردەوەکانیانا هەڵدەسەنگاند نەك بە گوتارەکانیان. تاقە تەسەلا و سوکنایی، شکست و نائومێدییەکانی، تاقە دڵخۆشی ئەو، خۆشەویستی هونەر و ئەدەب بوو.

کاتێ چیخوف بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، ئەلکساندری برای ڕاسپارد کە لە جیاتی ئەو زۆر سوپاسی ماڵباتی سوڤۆرین بکات، کە میوانداریەکی بەشکۆیان کردبوو... لە نامەیەکیا بۆ خاتوو کیسلیوڤا، بە شۆخیەوە دەڵێت: "وەکو نووسەرێکی گەورە، لە سان – پترسبورگدا نانم کەوتبووە ڕۆنەوە، غەرقی ناز و نیعمەتیان کردبووم. بەردەوام بە گالیسکەیەکی سەرپۆشراو بە پترسبورگ دا دەسوڕامەوە، شامپانیا کڵاشەی دەکرد، بە ناهەق ناویان نابووم پوتیمکین٤*، هەرچەندە هیچ یکاترینایەکم لەگەڵ نەبوو. بە ئاشکرا منیان بە گەوهەریی یەك دانەی خواوەندانی هونەر دەزانی." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٨٨٨/٣/٢٥).

چیخوف، پاش ئەوەی تێکەڵاوی ئەم جۆرە ژیانە جڤاکی و کۆمەڵایەتیە بوو، زۆر زەحمەت بوو، بتوانێ جارێکی دی بە ژیانی خانەوادەیی ناو، خۆی گوتەنی خانووە (کومەدییە چەکمەجەدارەکە) قایل ببێ، بە تایبەتی کە هەنووکە هەشت سەرخێزان بوون، بە تایبەتی کە نیکولا هاتبووەوە و، مەست و سەرخۆش، بە لارەلار و، نیمچە ڕووت و قووتی ئەم ژوور و ئەو ژووری دەکرد. ئیڤانیش دەهات و، لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆوە تا درەنگانێکی شەو بە دەوروبەری ئانتوندا دەسوڕایەوە. پاول یگوریفیچش هەموو شەوێك سەرێکی دەدا و بە ڕیشە درێژەکەیەوە، دەکەوتە وەعزدادان. چیخوف لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندر دەڵێت: "خۆ هەموویان خەڵکی میهرەبان و ڕووخۆش و خۆش مەشرەبن، بەڵام زۆر خۆپەرست و فشەکەر و بە لاف و

گـەزافن، لـە ڕادە بـەدەر زۆر بلـێ و چـەنەبازن، خشەخشـی ڕێکردنیـان هـەر مەپرسـە، هـەموو لات پاڵـەوانی خـوان. تووشـی سـەرەگێژکێ بـووم." (بڕوانـە نامـەی ١٨٨٨/٤/٢٦). هـەروەها لـە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلوف، دەڵێت: " تۆ ژنێکت هەیە ئەگەر پارەشت نەبێ، لە گەڵتا هەڵدەکات و بەسەرتا نابۆڵێنێ، بەڵام من عوربانێکم بە ملەوەیە، ئەگەر مانگانە بڕێك ڕۆبڵ بە دەست نەیەنم، هـەرەس دێـنێ، بە سـەرما و دەڕوخێـت، وەکو گاشـەبەردێك بـە سـەرما هـەرەس دێنێ." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٤/١٨).

جا چیخوف، بۆ ئەوەی لەو هاماجە تەنگە خێڵەکیە دەرباز ببێ، بە تەگبیری دۆستێکی خۆی بە نێوی ئەلکساندر ئیڤانکو، لە ئۆکرانیادا، لە ناو مۆڵکەکانی ماڵباتی لنتڤارییڤ دا، شوقەیەکی هاوینەی بەکرێ گرت. ئەم شوقەیە نزیکی گونـدی لوکـای بەسـتێنی ڕووبـاری پسـیول بـوو. پـێش ئەوەی شوێنەکە بدینێ و بگوازێتەوە بۆ ئەوێندەر، بەپەلە دەعوەتی سوڤورین و پلشچیفی کرد، تـا بـێن و میـوانی ئـەو بـن و لای ئـەو بمێننـەوە. خـەمی ئەوەشـی بـوو کـە نـەباد، بەمـە کـارێکی نەشـیاوی کردبێـت و ڕووگـیری ئـەوان ببێـت. ئـەوەبوو لـە ١٨٨٨/٣/٧دا گـەییـە گونـدی لوکـا و هەنگێ هەستی بە ئاسوودەیی کرد. ئەو خانووەی بۆ ئەو تەرخان کرابوو، خانوویـەکی گـەورە، و بـەر و مـاوە فـراوان و کـراوە و دڵگـیر بـوو، پـاك و خـاوێن و پۆشـتە و مۆبێڵـەکراو بـوو، بـاخێکی گەورەی هەبوو، بۆن و بەرامەی شکۆفە و گوڵی کێوی پیاوی مەست دەکرد، بێدەنگی و کـڕی و کپـی تەبیعـەت مەسـتی دەکردیـت. جگـە لـە ڕووبارەکـە، ئەسـتێڵێکی گەورەشـی تیـابوو کـە درێژییەکەی کیلۆمەترێك دەبوو. پڕبوو لـە ماسـی. ئـەو ژینگەیـەی زۆر پێخۆش بـوو: ئیـدی ئـەو دەوروبەرە، ڕێك زەمینە و هاماجی ڕۆمانی ڕووسی وەیاد دێنایەوە، کە کاتی خۆی باوبوو، پـڕبن لە "باخی کۆنی تەرك کراو، خانووی کۆنی زۆر خەمناك و شاعیرانەی پڕ لە ڕۆحی ژنانی جوان خزمـەتکارانی نیمچە مردووی سـەردەمی کۆیلایـەتی، کچۆڵانی جـوان، کـە بـە عـەزرەتی ئاسـایی ترین جۆری ڤیانەوە دەپوکانەوە" (بڕوانە نامەی ١٨٨٨/٣/٣٠ کە بۆ سوڤورینی ناردووە.)

چیخوف، کە بە تەبیعەت کەسێکی کۆمەڵامێز بـوو، زوو بـە زوو دەگـەڵ خـاوەنی ئـەم مۆڵکـەدا، واتا دەگەڵ ماڵباتی لینتڤاریڤدا دۆستایەتی پەیداکرد. ئەم خانەوادەیە لەو کۆنـە خـان و ئاغایانـە بـوون، کـە ئەسـتێرەیان کـەوتبووە لێـژی و نیمچـە نـابووت بووبـوون و بـە پاشمـاوەی سـەروەت و سامانی کۆنیان دەژیان و بەگوێرەی توانا، بە باشترین شێوە ڕۆژگاریـان بـەڕێ دەکرد و بەوپـەڕی ڕووخۆشـی، بـەردەوامیان بـە داب و نـەریتی کـەلتووری و میوانپـەروەری جـارانی خۆیـان دەدا. دایکەکەیان، واتە خاتو لینتڤاریڤ، بێوەژن بـوو، لـەزەتێکی زۆری لـە خوێندنـەوەی بەرهەمـەکانی شـوپنهاوەر بـە زمـانی ئەسـڵی دەبـینی، زۆر خۆشـحاڵ بـوو بـەوەی کـە نووسـەرێکی گـەنجی بەهرەمەند، دەبێت بە دراوسێیان و لـە نزیکـی ئـەوان دەژی. کیـژە گەورەکـەیان، زینایـدا، پزیشـك بوو، جووتیاران بە فریشتەیان دەزانی، دەیانپەرست. لویەك لە مێشکی هاتبوو، بە هۆی ئـەوەوە، بـە تـەواوەتی کـوێر بووبـوو، تووشـی پەرکـەم و سەریەشـەی بـەردەوام بووبـوو. بەوپـەڕی خوێنساردی باسی مەرگی نزیکی خۆی دەکرد. کیژە ناوەڕاستینەیان، هیلین، ئەویش پزیشك بوو، کچێکی ناسك و میهرەبان بوو، دڵاوا و دەسکراوە، بەڵام ناشرین بوو. زۆری حـەز لـە ژیـانی

خێزانی دەکرد، بەڵام چیخوف پێی وابوو "بۆ تاقە ساتێکیش خۆشی و شادی نابینیٚ." کیژە بچووکەکەیان، ناتاشا کچێکی تەبیعەت منداڵانە، هەر پێست و ئێسقان بوو، ڕەشتاڵەیەکی دەم بە هاوار بوو." شەیدا و دڵبەندی کەلتووری ئۆکرانی بوو. لەسەر حیسابی خۆی قوتابخانەیەکی کردبووەوە، لەو قوتابخانەیەدا منداڵە گوندیانی فێری حیکایەتەکانی کریلوف دەکرد، کە بە زمانێکی ئاسان پاچڤەی ئۆکرانی کرابوون. "هەرچەندە کتێبی سەرمایەی مارکسی خوێندبووەوە. ئەوجاش ئامادەبوو شوویەکی فیوداڵانە بکات" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٣/٣٠ بۆ سوڤورین). ئەم خانەوادەیە دوو کوریانش هەبوو: گەورەکەیان پاڤلی نابوو، کە لە زانستگە دەریان کردبوو، ئەمە پیاوێك بوو هێمن و، بێ فیز و، زاهیری ڕازی بە قەدەر و چارەنووسی خۆی. کوڕی دووەمیان، ئیگۆری ناو بوو، لە پەیڕەوانی ڕێنماییە ئینجیلییەکانی، تولستۆی بوو.

چیخوف، تەنیا دڵبەندی باشی و، داب و نەریت و هزرینی کۆنی ئەم بنەماڵەیە نەبوو، بەڵکو شەیدا و دڵبەندی جووتیارانی ئۆکرانی خۆش مەشرەب و زیرەك و حازر وەڵامیش بوو. ئیدی بۆ خۆی دەچووە گەشت و گەڕان، لە ڕووبارەکەدا مەلەی دەکرد، بە هەفتەبازاڕە جەنجاڵ و پڕ هەرا و زەناکاندا دەگەڕا، سەردانی موڵکەکانی دەوروبەری خۆی دەکرد، بەشداری شەوانی موزیکی دەکرد، چاوبازی دەگەڵ کیژاندا دەکرد، ڕاوەماسی و قرژاڵ و ڕۆبیانی دەکرد.

یەکێك لە میوانەکانی ئەو هاوینەی چیخوف، پلشچیفی پیرەمێرد بوو، کە کیژانی لنتڤاریڤ زۆریان بە دڵ بوو، گوڵیان پێشکەش دەکرد، بە بەلەم دەیانبردە گەشت و گەڕان، گۆرانی و ئاوازی پڕ سۆزیان بۆ دەگوت. ئەویش لە هەنبەردا، شیعری هێندە ناسکی بۆ دەخوێندنەوە کە هۆن هۆن بە دەمیەوە دەگریان. چیخوف لە هەمان نامەدا بۆ سوفورین، دەربارەی بلشچیف دەڵێت: "ئەو لێرەشدا، وەکو سان – پترسبۆرگ، ڕەمزە، یانی ئیکۆنەیەکە لەبەر کۆنی خەڵکی کڕنۆشی بۆ دەبەن، دەیپەرستن، ئیکۆنەیەکە کە جاران، لە ڕابردوودا، شان بە شانی ئیکۆنانی موجیزاتکاری دیکەدا هەڵواسرابوو." (بڕوانە هەمان نامەی ١٨٨٨/٥/٣٠ بۆ سوڤورین)

ئەلکساندر، کە تازە هاوسەرەکەی مردبوو، بە خۆ و منداڵەکانیەوە خۆی گەیاندە لوکا، ئانتون بە خۆی دەعوەتی کردبوو. ئیدی لێرە، سەری کردە ڤۆدکا خواردنەوە، گوایە بە ڤۆدکا خەمی خۆی لە بیردەکرد. چاوبازی و ئاشقێنی دەگەڵ هیلیندا دەکرد، تەنانەت هاتە سەر ئەو بیرەی کە خوازگاری بکات. چیخوف زۆری هەوڵدا تا ئەو خەیاڵەی لە مێشکی دەرکرد و ژێوانی کردەوە. هەڵبەتە ئەلکساندری، بێباك و بێپەروا، لە هەمان کاتدا، چاوەچاوی ئەوەی بوو کە پەیوەندییەکی ناشەرعی دەگەڵ کیژێکدا بە نێوی ناتالیا گولدن، بەرقەرار بکات، ئەم کیژە خەشکی ئەو ژنە بە مێردە بوو، کە دەگەڵ نیکولای برای ئەلکساندرا دەژیا. پاشان کە ئەلکساندر ڕۆیی، هەموو بە جارێ ئاسوودە بوون. چیخوف، بە خۆیشی، وێڕای جوانی و دڵگیری لوکا، خۆی ئامادە دەکرد، ماڵاوایی لە ماڵباتی لنتڤاریڤ بکات. لەوە دەچوو بە هۆی نەخۆشیەکەیەوە، کە وەکو موریانە سەری تێژەندبوو، وا بخوازێ، ناوبە ناو ژینگە و کۆمەڵگەی خۆی بگۆڕێت، پێدەچوو حەزبکات تا زووە و کار لە کار نەترازاوە هەموو دنیا ببینیٚ، لەوە دەچوو قەناعەتی

وابێ، کە ئارامی و ئاسودەیی و سەلامەتی ئەو تەنیا لەو شوێنانەدا بێ کە ئەوی لێ نیە. ئەوە بوو لە ١٨٨٨/٧/١٠دا. کوت و پڕ، بەرەو فیودوسیای قرم ڕۆیی، مالّباتی سوڤۆرین، لەوێ کۆشك و ڤیلایەکی گەورەیان لە ڕەخی دەریادا هەبوو. دوو هەفتەی، بەوپەڕی خۆشی و ئاسودەیی، لەوێندەر بردەسەر، سەعات یازدە لە خەو ڕادەبوو، سەعات سێی بەرەبەیان دەنووست، لەم بەینەدا، باشترین خواردنەوەی دەخواردەوە، بە لەزەت ترین خۆراکی دەخوارد، بەمجۆرە کاری نووسەریی فەرامۆش کرد. لە نامەیەکیدا بۆ خوشکەکەی، لەوبارەیەوە دەڵێت: "یەك حەرفم نە نووسیوە، تاقە کوپیکێکم پەیدا نەکردووە، تەمەڵی گرتوومی، ئەگەر ئەم تەمەڵیە بێ مانایەم هەفتەیەك یان دوو هەفتە بەردەوام بێ، تاقە پولێکم پێ نامێنێ، دەکەومە سەر ساجی عەلی. هەنگێ مالّباتی چیخوف، ناچار دەبن، زستان لە لوکا بەرنەسەر." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٧/٢٢).

دنیا زۆر گەرم بوو، چیخوف، بۆ خۆ فێنککردنەوە، ڕۆژی چەند جارێك، خۆی بەم دەریا جوان و بە شکۆیەدا دەکرد، کە لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلوف (١٨٨٨/٧/١٨) بەمجۆرەی وەسف کردووە: "شینی شین، نەرم وەکو گێسوی کچێکی پاکیزە." خانمی خانەخوێی، کە لە سان پترسبورگ، بێزار و پەستی کردبوو، هەنووکە لێرە، لە فیدوسیا، مجامەلە و سەرگەرمی دەکرد، بەردەوام "وەکو کەناری" هەر جوکەجوکی بوو، هەر سەعاتەی جلێکی لەبەردەکرد، بەیانیان پێدەکەنی، عەسران گۆرانی قەرەجانەی دەگوت، ئێواران بە تەنیا، لە کەناری چۆڵ و هۆڵی دەریادا، دادەنیشت و دەگریا. بەڵام سوڤۆرین، میوانەکەی خۆی هێنابووە پای گفتوگۆی زۆر جدی، گفتوگۆ دەربارەی هەموو جۆرە بابەتێك. چیخوف لە هەمان نامەدا بۆ لیونتیف – شچگلوف دەڵێت: "خەریکە بەرەبەرە دەبم بە ئامێرێکی قسەوێژ. ئێستا هەموو مەسەلە باوەکانمان چارەسەر کردووە، خەریکی باسی هەندێ مەسەلەی تازەین کە جاران شتی وانەبووە. ئیدی دەم لێك نانەین، ئەوەی دەیلێین نایلێینەوە. بلێ، بلێ، و بلێ. ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێ، دوور نیە بەهۆی ئاوسانی زمان و ژێیەکانی گەرووەمانەوە بمرین." و لەسەری دەڕوات: "سۆڤورین پیاوێکی گەورەیە. لە هونەردا، وەکو تولە تاژیە لە ڕاوا، یانی کەپوویەکی بە بۆن و هەستیاری هەیە. دەزانێ چۆن ختووکەی هەست و سۆز دەدات... کە پیاو شارەزای شێوەی قسەکردن و ڕاستگۆیی قسەکانی دەبێت، کە کەم کەس ئەو بەهرە و توانایەیان تێدایە، هەنگێ، لەزەت لە گفتوگۆ و قسەکانی دەبینێ." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/٧/١٨).

سوڤۆرین حەزی دەکرد، میوانەکەی تا مانگی ئەیلول گل بداتەوە، بەڵام چیخوف نەیدەتوانی لەوێ بمێنێتەوە، بیانووی ئەوەبوو کە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لوکا و، بە ئیش و کارەکانی ڕابگات. بەڵام زوو بە زوو بیری گۆڕی و دەگەڵ ئەلکسی کوڕی سوڤۆریندا، سەفەرێکی دەریایی دەست پێکرد، کە تا سنووری قەفقاز نەوەستایەوە. لە فیدوسیاوە بە سواری بەلەمێکی بوخاری وەڕێکەوت، سەری دێرە تازەکەی ئاتوس، سوخومی، باتوم، تەفلیسی و باکۆی دا، باکۆ و بۆنی نەوت و خاکی نەوتاوی باکۆ زۆریان بێزارکرد.

**لە یەکی مانگی ئابدا بۆ لوکا گەڕایەوە و بە دۆستەکانی، یانی ماڵباتی لنتڤاریڤ، شا و شکور بووەوە. بە ڕادەیەك ئەفسوونی، جوانی و دڵگیری دێهاتی ئۆکرانیا بووەوە، کە لێڕا، لەو دەڤەرەدا، موڵك و مەزرایەکی چکۆلە بکرێت و بارەگا و پاتۆقێکی چکۆلەی بۆ نووسەران تیا بکاتەوە. بەڵام پارە لە کوێ بێنێ؟ باشترین کار ئەوەبوو، جارێ دەسبەرداری ئەو پڕۆژەیە ببێ و بۆ مۆسکۆ بگەڕێتەوە. لە نامەیەکیا بۆ بلشچیف دەڵێت: "ئاه چەندم پێ ناخۆشە کە ئەم شوێنە بەجێ دێڵم، ڕووباری نارەسەنی بسیول، ڕۆژبە ڕۆژ جوانتر دەبێ، دەڵێی بە ئانقەست خۆی جوان دەکا، چ کەش و هەوایەکی خۆشی هەیە، جووتیاران، سەرگەرمی دروێنەی گەنم و کۆکردنەوەی خەلە و خەرمانن... کە بیر لە مۆسکۆ و سەرما و سۆڵەی ئەوێ، شانۆنامە خراپەکانی، باڕ و خوارنگە سەرپێییەکانی، بیروبۆچوونە ڕووسیەکانی دەکەمەوە، لەرزم لێدێ... خۆزگە دەمتوانی، زستان، لە دووری ئەم شارە بەرمە سەر." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٣/٨/١٨٨٨).**

**ئەنجام لە ٢/٩/١٨٨٨دا لێڕا، جارێکی دی بۆ کۆمەدیە چەکمەجەدارەکەی شەقامی سادوڤایا – کودرنسکایا بگەڕێتەوە. لە جیاتی ئەوەی بە هاوینە گەشتەکانی کەمێك وەخۆبێتەوە و لە باری تەندروستیەوە باش ببێت، خراپتر بووبوو. هێشتا بە تەواوەتی نەگەیی بووەوە مۆسکۆ، تووشی خوێن هەڵینان بووەوە. جاوەکو خووی هەمیشەیی و بۆ ئەوەی ڕادەی ترسناکی ئەم نیشانانە کەم بکاتەوە، پاساوی بۆ خۆی دێنایەوە و دەیگوت، ئەگەر بەڕاستی سیلی بوایە، ئێستا لەمێژبوو مردبوو و لەژێر گڵا دەبوو. یانی بە گوتەی خۆی، هەرچەندە ناوبە ناو خوێن هەڵدێنێ، بەڵام هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی سیل و دەردەباریکە لە خۆیدا نابینێ. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین دەڵێت: "هیچ ترسێکم نیە، تەنیا ئەو دەمانە دەترسم کە خوێن دەبینم، ئەو خوێنەی کە وەکو بڵێسەی ئاگر لە دەممەوە دەڕژێ، خەبەرێکی شوومی پێیە. بەڵام کە خوێنەکە تەواو دەبێ، هیچ نیگەرانی و ترسێکم نیە کە خەسارەتێکی تازە لە ئەدەبی ڕووسی بدەم!" (بڕوانە نامەی ڕیکەوتی ١٤/ت١/١٨٨٨).**

**ئایا ئەم بۆچوون و نۆڕینە غەریب و نامۆیە، لە بابایەکی پزیشکەوە نیشانەی ترسان بوو لە حەقیقەت یان نیشانەی ڕازی بوون بوو بە ئەمری واقیع؟ شتێکی بەڵگە نەویستە چیخوف بۆیە خۆی بە نەخۆس نەدەزانی و دانی بە نەخۆشیەکەی خۆیدا نەدەنا، چونکە دەیزانی تەمەنێکی کورتی ماوە و دەیویست ئەو تەمەنە بە خۆشی بەرێتە سەر. چیخوف،بەبێ ئەوەی ئیعتیراف بکات، دەیزانی درۆی دەگەڵ خۆیدا دەکرد، چونکە دەیزانی بەبێ ئەو درۆیە، مەحاڵە هیچ شادیەکی ڕواڵەتی لەم دنیایەدا بەدەست بێنێ. بە ئانقەست خۆی لە گێلی دەدا و چاوپۆشی لە وەزعی خۆی دەکرد، تا شەوق و زەوقی کارکردن، لەزەتی دۆستایەتی و سەرکەوتن لەدەست نەدا.**

**کێشە و ئاژاوە و پێداویستی خانەوادەیی، ڕێگەی نووسین و پێشکەوتنیان نەدەدا. نیکولا، ئیش و کارێکی ڕێك و پێك و بەردەوامی نەبوو، ناسنامەی نەبوو، فیراری سەربازی بوو، پۆلیس تاقیبیان دەکرد کە بیگرن و بۆ خزمەتی سەربازی بنێرن. چیخوف، ناچار ڕووی لە هەندێ برادەر و دۆستی پایە بەرز نا، کە بۆی تێکەون و لە خزمەتی سەربازی مەعاف بکەن. ئەلکساندرش،**

دەگەڵ سوڤۆریندا بە شەڕ هاتبوو. هەستابوو چیرۆکێکی خراپی لە (ڕۆژگاری نویٚ)دا، بە ناو و ئیمزای ئال.چیخوف بڵاوکردبووەوە، کە ئەگەری ئەوەی هەبوو، سەر لە خوێنەران بشێوێنیٚ و خوێنەران ئەم چیرۆکە خراپەش بە هی چیخوف، کە ناوبانگێکی پەیداکردبوو، بزانن و لیٚی بتۆرێن. سوڤۆرین، بەم ڕەفتارە پەست و تووڕە دەبێت، نامەیەکی زۆر توند دەکاتە سەر ئەلکسندر، بەوە تاوانباری دەکات کە ناو و ناوبانگی براکەی دزیوە و لەکەرداری کردووە، کە دەبوایە ڕێز و حورمەتی ئەو ناوە بگرێت. جا ئانتون کە لەم کەین و بەینەدا، زەرەرمەندی سەرەکی بوو، دەیتوانی ئەویش وەکو سوڤۆرین تووڕە ببێت و بڕەنجیٚ، بەڵام بەپێچەوانەوە لە جیاتی ئەوەی تووڕەبیٚ، کەوتە ناو بژیوانی و هێورکردنەوەی شەڕەکە. ئیدی نامەیەکی خەمینی بۆ براکەی نارد، کە زۆر مدارای مجێزی نەخۆشی ئەوی کردبوو: "لەبەر ئەوەی کەسمان ناتوانین لە مەرگ و ئەجەل هەڵێین و، کەسیشمان زۆر ناژین، بۆیە من نە گویٚ بە نووسینەکانم، نە بە ناو و ناوبانگ، نە بە هەڵە ئەدەبیەکانم نادەم . تکات لێدەکەم تۆش وەکو من بکە. تا بە سادەیی و ئاسانی بڕوانینە وردە مەسەلێن، وەکو ئەوەی سوڤۆرین وڕوژاندوویەتی، ژیان و پەیوەندیمان دروست تر و بیٚ کێشە تر دەبێت. ئان.چیخوف یان ئال.چیخوف، فەرقیان چیە؟" (بڕوانە نامەی بەرواری ٢٤/٩/١٨٨٨)

دوای ماوەیەکی کەم هەمان ئەلکساندر، بە مەستی سووکایەتیەکی زۆر بە دەستەی نووسەرانی (ڕۆژگاری نویٚ) دەکات. ئیدی چیخوف، لە ترسی ئەوەی نەبا براکەی دەربکەن، هەڵدەستێت پۆزشنامەیەك بۆ سوڤۆرین دەنووسێت و هەوڵدەدات هۆیەکانی ئەم کارە نابەجێیەی بۆ ڕوون بکاتەوە: "نازانم چی لە براکەم بکەم، چی دەگەڵدا دەکرێت؟ کە نەخواتەوە کوڵێك باشە، زیرەك و شەرمنە، ڕێك و پێك و ڕاستگۆیە، بەڵام کە دەخواتەوە ئیدی کەس دەگەڵیا هەڵناکات... بێگومان ئالوودەبووە... ئالوودەبوون چیە؟ نەخۆشیەکی دەروونیە، نەگونجانە دەگەڵ کۆمەڵگەدا، شتێکە وەك ئالوودەبوون بە مورفین، بە دەستپەڕ و جوڵق، بە داوێن تەڕی لای ژنان... هتد ئەم حاڵەتە بە زۆری لە باب و داکەوە، یان لە باپیرە و داپیرەوە، نەقڵ دەبێت. بەڵام لە بنەماڵەی ئێمەدا ئالوودەمان نەبووە. ناوبە ناو باوە گەورە و باوکم دەگەڵ میوانانی خۆدا دەیانخواردەوە. بەڵام قەت لە کاری خۆ دوا نەدەکەوتن، شەوەکی بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستان. شەراب و ڤەخارن ئارامی و ڕوح سووکی پێدەبەخشین، شاد و خوڕەمی دەکردن. من و مامۆستاکەی برام، ئیڤان هیچ کاتیٚ بە تەنیٚ ناخۆینەوە، هیچ بەدمەستیەك ناکەین، چەنمان مەیل لیٚ بوو دەخۆینەوە و، بە زەین و مێشکی ساف و ڕوونەوە لە خەو ڕادەبین... بەڵام ئەلکساندر و هونەرمەندەکەمان (نیکولا) دوای دوو سیٚ پێك، ئیدی لێدەبنەوە، مەست و سەرخۆش دەبن، هەندێجار خەریکە بۆ چۆڕی مەشوورب سوێیان دەبێتەوە... بە کێیان کردووە، نازانم. ئەوەندە دەزانم کە ئەلکساندر هەمیشە بیانووی پێیە بۆ خواردنەوە و مەست بوون! کە پەست و نائومێد بیٚ دەخواتەوە، پیس دەخواتەوە، سەرخۆش دەبیٚ. من ئەدرەسی ئەوم لا نیە، بە ئەرك نەبیٚ بۆمی بنێرە، گلەیی نامەیەکی بۆ دەنێرم، هەم دبلۆماسیانە و نەرم بیٚ، هەم سەرزەنشتئامێز، نامەکانم کاریگەرییان بە سەریەوە هەیە." (بڕوانە نامەی ١٠/ت١/١٨٨٨).

چیخوف، لە گەرمەی ئەم کێشە و سەریەشە خانەوادەییانەدا بوو کە هەواڵێکی خۆشی پێ گەیی. ماوەیەکی کەم بوو کە چیرۆکێکی "برێك مەبەستدار"ی بە ناونیشانی "ئاهەنگی ناونان" بۆ بڵاڤۆکی "پۆستەی باکوور" ناردبوو و، خەریکی ئەوەبوو کە جارێکی دی بە (ئیڤانۆڤ)دا دەچووەوە، لە ١٨٨٨/١٠/٧دا، زۆر بە سەرسووڕمانەوە هەواڵی زانی کە بەشی ئەدەبیاتی ئەکادیمیای سان پترسبورگ، بە تێکڕای دەنگ بڕیاریان داوە خەڵاتی پوشکینی لەسەر کۆچیرۆکی "بولێڵ" بدەنێ. هەر لەخۆوە، بێئەوەی متمانەیەکی ئەوتۆی بەخۆ بێ چەند هەفتەیەك بوو، خۆزیای دەخواست کە ئەو خەڵاتەی بدرێتێ. کە ئەو هەواڵەی زانی، لە خۆشیا لە پێستی خۆی نەدەهێوری، دەتگوت " گرفتاری داوی ئەشق بووە." هەموو خانەوادەکەیان بەم سەرکەوتنە خۆشحاڵ بوون. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین. دەڵێت: "دایك و باوکم، لە خۆشیا کەوتوونەتە وڕاوە. لە کەیفان لە پێستی خۆ ناهێورن... خوشکەکەم، بە سەر یەك بە یەکی دەستە خوشکەکانیا دەگەڕێ و ئەم هەواڵەیان دەداتێ، دەگاتە هەرکەس و شوێنێ، جاڕ دەدا. من، هێندە خۆم بە بەختیار و بەختەوەر دەزانم، دەمەوێ وەکو گوناحکاران، بە چاوی نیوەکراوەوە، سەیری ئاسمان بکەم. دەمەوێ بەپەلە بڕۆم و خۆم وەژێر مێزێك بدەم، لەوێندەر خۆم بشارمەوە و کڕوکپ، مات و بێدەنگ، ئارام و گوێڕایەڵ دابنیشم و فزەم لێوەنەیت... بڕی خەڵاتەکە پێنج سەد ڕۆبڵە، ئەم پارەیە لەلایەکەوە دادەنێم،لە ئوکرانیا موڵك و مەزرایەکی پێدەکڕم." هەر لە هەمان نامەدا لە سەری دەڕوا و دەڵێت: "هەر هەموو ئەوەی تا ئێشتا نووسیومە و ئەم خەڵاتەم لەسەری وەرگرتووە، ئەوپەڕی تا دە ساڵی دی لە بیری خەڵك دەمێنێ." (بڕوانە نامەی ١٠/١٠/١٨٨٨).

هەڵبەتە گریگورفیچ، کە ئەندامی ئەکادیمیابوو، دەورێکی زۆری هەبوو لەوەی کە ئەم خەڵاتە بە چیخوف بدرێ، چیخوفیش بەمەی دەزانی و لەو ڕووەوە خۆی بە قەرزارباری ئەو دەزانی، بۆیە بە خۆشکێنی نووسەرێکی تازە کارەوە، سوپاس وەفاداری خۆی لە نامەیەکدا بۆ دەردەبڕێت و لەو نامەیەدا بەڵێنی دەداتێ کە بەو زووانە دەست بە نووسینی ڕۆمانێك دەکات. ئەوەشی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەم ڕۆمانەش وەکو هەموو نووسینەکانی دیکەی بێ لایەنانە دەبێت و داشداری لە هیچ بابەت و کێشەیەکی ڕۆژ ناکات. لەو نامەیەدا (١٨٨٨/١٠/٩) دەڵێت: "من تاکو ئێستاش هیچ هەڵوێستێکی سیاسی، یان ئاینی، یان فەلسەفی جێگیرم نیە، مانگ بە مانگ دەگۆڕێم، بۆیە بە ناچاری لەو سنوورەدا کار دەکەم کە چۆنیەتی ئاشقێنی قارەمانەکانم بگێڕمەوە، چۆنیەتی زەماوەند و ویساڵیان، زوڕیەت خستنەوەیان، مردنیان و چۆنیەتی ئاخاوتن و گفتوگۆیان بگێڕمەوە."

چیخوف، سەرباری ئەو هەموو پێشوازی و دەعوەت و دەعوەتکاری یەی کە بە بۆنەی وەرگرتنی خەڵاتی پوشکینەوە دەکرا، وێڕای ئەو کۆڕ و باسانەی بەو بۆنەیەوە دەگێران، هێشتا تیامابوو و لەخۆی دەپرسی کە ئایا پزیشکە یان نووسەر. لە نامەیەکیا (١٨٨٨/٩/١١) بۆ سوڤورین، هەمان بەراورد و شوبهاندنە دڵخوازەکەی خۆی، کە پزیشکی هاوسەری شەرعیەتی و ئەدەب ماشقەیەتی، دووبارە دەکاتەوە و دەڵێت: "کە یەکێکیان دەمتۆرێنێ، شەو دەگەڵ

ئەویتریان بەسەردەبەم. ڕەنگە ئەمە جۆرە ئاژاوە و پەرێشانیەکی لێبکەوێتەوە، بەڵام ناخۆش نیە."

لە ڕاستیا لە دنیای نووسەرانی گەنجی دیکە، لە دەستەبەندیان، پیلانبازیان، خۆپەسەندی و بەرزەفڕیان، لە مەرایی و ڕوپامایيان بێزار بوو، قەناعەتی وابوو، ئامادەن، لە پێناوی وتارێکی ستایشئامێزدا، خۆ لەبەر پێیان باوێن، پێی سەیر بوو، ئەوان، بە هەموو تازەکاریەکی خۆیانەوە ئەوەندە تینوو و تامەزرۆی شۆرەت و ناوبانگ بوون، لە کاتێکا ئەو، دوای هەشت ساڵ لە کاری نووسین، هێستا نەیدەزانی بۆچی دەنووسیت؟ بۆیە بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەی دەروبەریەوە، خۆی لە هەر دار و دەستەیەکی بەدڕا و بەدخوا و بەدنیهاد دووردەگرت و، دەیویست کەسێکی میانڕەوی خاکی و سەربەخۆ بێت. لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف شچگلوف دەڵێت: "با خەڵکێکی ئاسایی بین، بە هەمان هەڵوێست و نەفەسەوە ڕەفتار دەگەڵ هەموو خەڵکیدا بکەین، بۆ ئەوەی پێویستمان بە دەستەبەندی دەستکرد نەبێت." (بڕوانە نامەی ١٨٨٨/٥/٣) و لە نامەیەکی دیدا بۆ پلشچیف، بە پێداگرییەکی زیاترەوە دەڵێت: "ئەو خەڵکانەی من لێیان دەترسم، ئەوانەن کە لە بندێڕی نووسینەکانی مندا، بۆ هەڵوێستێکی تایبەتی دەگەڕێن و سوورن لەسەر ئەوەی کە بە لیبراڵ یان محافەزەکارم لە قەڵەم بدەن. من نە لیبراڵم نە محافەزەکار، نە پەیڕەوی پێشکەوتنی بەرەبەرە، نە ڕەبەنم، و بە بێموبالات بەرانبەر بە جیهان. حەزدەکەم هونەرمەندێکی ئازاد بم و هیچی تر. بەداخەوەم کە خوا ئەو توانا و بەهرەیەی نەداومەتێ، تا ئاوابم. لە درۆ بێزارم، زۆرداری و نەهەقیم، بە هەر شێوە و ناوێك پێ قەبووڵ نیە... مەرایی و ڕوپامایی و کەودەنی و درۆ و زۆرداری هەر لە ماڵی بازرگاناندا زاڵ و باو نیە، بەڵکو لە پولیسخانە و لە زندانان، تەنانەت لە ناوەندێن ڕوشنبیری و ئەدەبی، لە نێو لاوانیشدا، زەق و دیارە. بۆیە، بۆیە دڵم نە بە پاسەوانان و قەسابان، نە بە دانایان و نووسەران، نە بە نەوەی نوێ خۆش نیە. هەرچی ناو و ناوبانگ هەیە، بە زادە و بەرەنجامی داوەری دەستکرد و پێشوەختەی دەزانم. بۆیە پیرۆزترین شت لای من، بوونی مرۆڤە، نایابترین ئازادی، ئەوەیە ئازادانە ڕووبە ڕووی زەبروزەنگ و درۆ ببیتەوە". (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/١٠/٤).

چیخوف، داوای سەربەخۆیی تەواوی دەکرد، هەر لە نێو دۆستانی نووسەر و ڕەخنەگر و جەماوەری خەڵکدا، بانگەشە بۆ سەربەخۆیی نەدەکرد، بەڵکو، سەبارەت بە کاراکتەر و قارەمانێن چیرۆکەکانیشی خوازیاری سەربەخۆیی بوو و، بە هەمان نەفەسەوە بەرخورد و مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن. بە چاولێکەری پوشکین و تولستوی ( هەڵبەتە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە و ڕووبکاتە دین و دینداری) هەستی دەکرد، ئەرکی ئەو ڕانانی پرس و مەسەلەکانە، نەك چارەسەرکردنیان. نە وەعزی ئەخلاقی، نە پەیامی تایبەتی و نە هیچ ئەنگێزەیەکی پەنامەکی لە بەرهەمە ئەدەبیەکانیدا نیە. تەنیا ژیان و ژیاندوستی تیایە و هیچی دی. بە ڕای ئەو نووسەر دەبێ لە خزمەتی کاراکتەر و قارەمانەکانیا بێ، نەك بە پێچەوانەوە، کاراکتەر لە خزمەتی نووسەردا بن. دەبێ ئەوەندەی جورئەت هەبێ کە لە نێوان حوزوری ئەوان و خۆیدا، یەکێکیان هەڵبژێرێ. نووسەر ئەگەر خۆی لە کاروباری کاراکتەران هەڵقورتێنێ، پاکانەیان بۆ بکات یان مەحکومیان بکات، یان خۆی بکات

به شەریکی هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانیان، مانای وایە لە ئەرکی نووسەرایەتی خۆی لادەدا و پێ لە بەرەی خۆی وەکو نووسەر، پتر ڕادەکێشێت. تا کەمتر دەربکەوێ و زیاتر خۆی لە پشتی ئەوانەوە وەشێرێت، ئەگەری زندوویەتیان، تەنانەت دوای مەرگی نووسەرەکەش، پتر دەبێت. چیخوف لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، دەڵێت: "بە باوەڕی من، کاری نووسەر ئەوە نیە کە پرس و مەسەلێن وەکو خوا، ڕەشبینی، و ئەو جۆرە شتانە چارەسەر بکات... ئەرکی نووسەر تەنیا پیشاندانە، ئەوە پیشان بدات کە لە چ حاڵێکا و چۆن، کەسانێك باسیان لە خوا یان ڕەشبینی کردووە یان بیریان لێکردوونەتەوە. هونەرمەند بۆی نیە داوەر و قازی و ئەوقاتی کردار و گوتار و هەڵوێستی کاراکتەرەکانی بێ، لە کردار و گوتاری ئەوانیش بەرپرسیار نیە... بەڵکو دەبێ شایەد و بینەرێکی بێ لایەن بێت... چونکە ئەو ئەنجامگیری و هەڵسەنگاندن و داوەریە ئەرکی خوێنەرانە. بەڵام سەبارەت بە من، مەرجی بنەڕەتی ئەوەیە بەهرەیەکم هەبێ، شتی گرینگ لە شتی بێ بایەخ جیابکەمەوە، کاراکتەرەکانم بە دروستی بەرجەستە بکەم و بزانم بە زمانی ئەوان قسەبکەم". (بڕوانە نامەی ١٨٨٨/٥/٣٠). دوای چەند مانگێك لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، دێتەوە سەر باسی هەمان بابەت و دەڵێت: "خراترین شت بۆ هۆنەرمەند ئەوەیە خۆی لە قەرەی بابەتێك بدات کە دەرەقەتی نەیەت، کە تێی نەگات. پرسە تایبەتیەکان، شارەزا و پسپۆڕی خۆیان هەیە، چارەسەری ئەو جۆرە پرسانە، کاری شارەزا و پسپۆڕانە، ئەرکی ئەوانە لە ئەنجوومەنانی هەرەوەزی جووتیاران، لە چارەنووس و ئایندەی سەرمایەداری، لە زیان و مەترسیەکانی بادەنۆشی، لە جزمە و چەکمە، لە نەخۆشی ژنان بکۆڵنەوە و تاوتوێی بکەن و داوەری دەربارە بکەن. بەڵام هونەرمەند، دەبێ بە گوێرەی تێگەییشتن و نۆڕینی خۆی مامەڵە دەگەڵ بابەتەکاندا بکات." (بڕوانە نامەی ٢٧/ت١/١٨٨٨).

بابەتگەرایی چیخوف لە چیرۆکدا، بەو مانایە نەبوو، کە لە بواری وەسف و گفتوگۆ و دیالۆگ دا، بایەخ بە وردەکاری و جوانکاری هونەری نەدات و بە هەندی وەرنەگرێت. لە کاتێکا کە خۆی بە نووسەرێکی ڕیالیستی ناودەبرد، لە کرداردا، بەلای ئەمپرسیونیزمدا دایدەکێشا، بایەخی بە شێواز، بە وەردەکاری و بە هێما و ئاماژەێن بروسکەیی دەدا. لازاریف — گروزنسکی هاوڕێی، ئامۆژگاری دەکرد کە خۆی لە شێوازی تەقلیدی و باو دووربگرێت. لە نامەیەکیا پێی دەڵێت: "خەتا دەکەیت کە زیاد لە پێویست بە چیرۆکەکانتا، دەچیتەوە، هەر شتێ بە خەیاڵی خۆت، زەق و بێ پەردە بێ، مشت وماڵی دەدەیت. تۆ بەهرە و توانای خۆت لغاو دەکەیت، گیانی داهێنانت تیا نیە. کە وەسفی ژنان دەکەیت، دەبێ وای وەسف بکەیت کە خوێنەر هەست بکات بۆینباخت لە مل نیە، قۆپچەی ئێلەکەکەت کراونەتەوە. یانی دەبێ بەوجۆرە هەم وەسفی ژنان و هەم وەسفی تەبیعەت بکەیت... ئازادی تەواو بە خۆت بدە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٨/١٠/٢٠).

ئازادی و ئازادی دانی تەواو بە خۆ، لە ڕوانگەی چیخۆفەوە دەکاتە ڕەفزکردنی هەر وەعزدادانێکی سیاسی یان فەلسەفی، دەکاتە دوورەپەرێزی لە هەر بەند و باو و یاسا و ڕێسایەکی ڕێباز و قوتابخانە ئەدەبیەکان، دەکاتە پابەندبوون بە شێوە و شێوازی تایبەتی خۆتەوە، دەبێ ئەمانە بەرنامەی کاری هەر نووسەرێکی ڕاستەقینە بن. ئەم دوورە پەرێزیە لە

پێوەر و پێوانەێن کلێشەیی و ئامادە، بە ئاشکرا لەو نامەیەیدا، کە دەربارەی چیرۆکێکی خۆی بە ناوی (ئاهەنگی ناونان) بۆ پلشچیفی ناردووە، دیارە: "پێموایە، خەڵکی دەتوانن بە نەوسنی و زۆرخۆری، بە مەستی و سەرخۆشی، بە هەرزەیی و سووکی، بە ساردی و بێ مەیلی، بە هەر ناو و ناتۆرەیەك. کە خۆیان بیانەوێ تۆمەتبارم بکەن، ئەمە باشترە لە ئارەزووی خۆدەرخستن یان خۆشاردنەوە... من قەت ڕازپۆشی خۆم نەبووم." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ٩/١٠/١٨٨٨).

چیخوف، لە کاتێکا کە داکۆکی لە زەرورەتی بێلایەنی و بێ ئیلتیزامی ڕۆماننووس و چیرۆکنووس دەکرد، ئەوەیشی لەبیر نەدەکرد، کە بەخۆی ئەهلی شانۆنامەشە، لێرەشا و بۆ ئەم ژانرە ئەدەبییەش باوەڕی بە پرەنسیپی بێ ئیلتیزامی نووسەر بوو. لەمەشا بێ لایەنی و بێ ئیلتیزامی بە یاسای زێڕین دەزانی. دیارە چیخوف وەکو نووسین ئەهلی شانۆ بوو. هەڵبەتە هەرچەندە لە عەلەیی وەزعی شانۆ دەدوا، نەشی دەتوانی لە داوی زەروورەتی ڕازانەوەی شانۆ، هەڵێت. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین دەڵێت: "دەبێ هەموو توانایەکی خۆمان بخەینە کار کە شانۆ لە دەستی بە قاڵ و دوکانداران دەربێنین و بە دەستی ئەهلی ئەدەبی بسپێرین، دەنا هونەری شانۆ مەحکوم بە نەمانە." (بڕوانە نامەی بەرواری ٣/ت١/١٨٨٨). هەروەها لە نامەیەکیشیا بۆ لیونتیف – شچکلوف، دەڵێت: "شانۆی هاوچەرخ، نەخۆشی ئاوڵەیە، نەخۆشیەکی پیسی شارانە. دەبێ ئەم نەخۆشیە بن بڕ بکرێ، خۆش ویستنی ئەم نەخۆشیە قەباحەتە." (بڕوانە نامەی ٧/١١/١٨٨٨). هەڵبەتە وێڕای ئەو قسانەش، یەکێك بوو لە شانۆ دۆستانی جدی و دەچووە تەماشای زۆربەی هەرە زۆری ئەو شانۆنامانەی کە پێشکەش و نمایش دەکران، جاری وا هەبوو چەندین شەوی دەگەڵ ئەکتەراندا دەگوزەراند، شانۆنامانی کۆمیدی ئامێزی وەکو (ورچ، ئاوازی قوو، خوازگاری) دەنووسی، هەروەها دەسکاری شانۆنامەی ئیڤانوفی دەکرد، گۆڕانکاری تیا دەکرد، دەیویست لە ڕێگەی ئەو دەسکاری و گۆڕانکاریانەوە، چەمك و مانایەکی ڕوونتری پێببەخشێت. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، لەبارەی شانۆنامەی ئیڤانۆڤەوە دەڵێت: "شانۆنامەی (ئیڤانوف)م ئێستا زۆر مەفهومترە" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٩/ك١/١٨٨٨).

پێی وابوو، ساشای چکۆلە، پاش ئەوەی پێیدا چووەتەوە و دەسکاری کردووە، بووە بە کەسایەتیەکی زۆر تازە، یەکێکە لەو ژنانەی کە "مەیل دەدەنە ئەو پیاوانەی کە لە حاڵی هەرەس و شکستدان." (ئیڤانوف)ش کە خۆی دەکوژێت، لەبەر ئەوە نیە کە بە ئاشکرا تانە و تەشەرانی لێدەدرێ، جنێوی پێدەدرێ و بە خوێڕی دەزانرێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە "گەییوەتە کۆتایی ڕێگا". سەرباری ئەمەش، چیخوف مجێز و تەبیعەتی ئیڤانۆڤی، بە نموونەی تەبیعەتی مرۆڤی ڕووسی دەزانی. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەڵچوون، هەست کردن بە گوناح، تەمەڵی و بێزاری و ماندوویەتی، ئەمانە خەسڵەتی تایبەتی ڕووسین، ئەڵمانەکان هەڵناچن، لە ئەڵمانیادا خەڵکی بێزار، بێتاقەت و نائومێد و خەواڵو نابینین... حەماس و هەڵچوونی فەرەنسیەکانیش لە یەك ئاستدایە، لە ناکاوا بەرز و نزم نابێتەوە، بۆیە فەرەنسی تەنانەت لە پیریشدا، بە شێوەیەکی ئاسایی ڕەفتار دەکەن." (بڕوانە نامەی بەرواری ٣٠/ك١/١٨٨٨).

کاتێ نوسخە هەموارکراوەکەی شانۆنامەی (ئیڤانوف) خرایە بەرنامەی شانۆنامەکانی، شانۆی ئەلکساندرینسکی سان – پترسبورگەوە، کە شانۆیەکی زۆر بە ئیحتوبار بوو. چیخوف لە مانگی کانوونی دووەمی/١٨٨٩وە، چوو بۆ پایتەخت تا لە کاتی پرۆڤەدا، ئامادەبێت. لە لای سوڤورینی برادەری لایدا. ئەمجارەش، لە شێوەی بەرخوردی ئەکتەرەکان ناڕازی و نیگەران بوو، لەوە توڕەبوو کە هەستی دەکرد ئەکتەرەکان، بە دروستی دەورەکانیان نابینن. لە هەموو ئەمانەش ناخۆشتر ئەوەبوو کە داڤیدوڤ، کە دەوری کاراکتەری سەرەکی درابویە و دەبوایە دەوری ئیڤانوڤ بدینێ، هەمیشە گلەیی لەو گۆڕانکاری و دەسکاریانە دەکرد کە نووسەر لە دواساتەکاندا، لە دەقەکەدا دەیکردن و، هەڕەشەی دەکرد کە وازدێنێ و دەورەکە نابینێ، چیخوف زۆری هەوڵ دەگەڵدا دەدا، دەیویست، ئەنگێزە و مەبەستەکانی ئیڤانۆڤ تێبگەیەنێ. ئەم دوو پیاوە ڕۆژی دە جاران بە شەڕ دەهاتن و ئاشت دەبوونەوە. چیخوف، چاوەڕوانی لەوە خراتری لەم ئەکتەرە خۆپەسەندە دەکرد. ئەوەبوو چیخوف، ئێوارەی پێش کردنەوەی شانۆکە، نامەیەکی بۆ میخائیکی برای نووسی کە بەش بە حالێ خۆی وا تەسەور دەکات کە شانۆنامەکەی سەرکەوتوو نابێت. کەچی شانۆنامەی ئیڤانوف کە لە ٣٠/ك١٨٨٩/٢دا نمایشکرا نەك هەر ناکام نەبوو، بەڵکو سەرکەوتنێکی سەیر و باوەڕنەکردەنیشی بەدەست هێنا. لە کۆتایی یەکەمین شەوی نمایشەکەدا، چیخوف بە لاقە لەرزێ و دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە، چووە سەر شانۆکە و لە ناوەڕاستی ئەکتەرەکاندا وەستا و، کڕنۆشی بۆ جەماوەری ناو هۆڵەکە برد، کە هەموو بەیەك دەنگ و بە جۆش و خرۆشەوە هورایان بۆ دەکێشا. ڕۆژی دوایی بە خۆشی ئەوەوە، دەعوەت و خوانێکیان بەرپاکرد، خانەخوێ و خاوەن دەعوەتەکە، بە دەم بەرزکردنەوەی پێکەکەیەوە، چیخوڤ بە گریبییدوڤی نەمر بەراورد کرد. چیخوف، حایر لەم سەرکەوتنە چاوەڕوان نەکراوە، یەکسەر بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە. بە گوتەی خۆی، حەزی کردووە لە کونێکا خۆی وەشێرێ. لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلوف، دەڵێت: "ستایش و سەرکەوتنش هێندە، بە ژاوە ژاو و هەرا و هەنگامەیە، ئەگەرچی خۆشیەکی کەمی تیایە، بەڵام لەکۆتاییدا، بە جۆرێ ماندووت دەکات، خواخواتە بە زووترین کات هەڵێیت و هەڵێیت." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٩/٢/١٨).

وێڕای ئەوەش، وەختێ گەڕایەوە ماڵی خۆی، بە جۆش و خرۆشەوە کەوتە پەیگیری ڕۆژنامان و بڵاڤۆکان. بە شێوەیەکی گشتی دنیای ڕۆژنامەوانی، هاوڕەئی جەماوەری خەڵکەکە بوون و ستایشی شانۆنامەی (ئیڤانوف)یان دەکرد. تەنیا ڕەخنەگرانی چەپگەرای وەك: میخائیلوفسکی، کورولینکو و، ئوسپنسکی، گلەییان لە نووسەر هەبوو کە گوایە هیچ پەیامێکی کۆمەڵایەتی لە شانۆنامەکەیدا نەخستووەتە ڕوو. چیخوف بەم تۆمەت و گلەییە نەك هەر شێلو نەبوو، بەڵکو سوورتر بوو لەسەر ئەو باوەڕەی خۆی کە دەبێ هونەر لە سیاسەت جیابێ، لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، دەڵێت: "بە ڕاستی ڕۆژنامەوانی بچکۆلە غەدر لە شانۆنامەکەم، ئیڤانوف دەکەن. بەجۆرێ بەرخوردی دەگەڵ دەکەن وەکو ئەوەی قارەمانەکەم ئیڤانوف نەبێ، بەڵکو جەنەراڵ بولانجیە بێت." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٩/٢/٦). لە لایەکی ترەوە، گەلێك لەو کەسانەی کە نمایشەکەیان بینی بوو، نامەی دەستخۆشیان بۆ دەنارد و پیرۆزباییان لێدەکرد، کە کاراکتەری

واقیعی داهێنابوو. کاراکتەرانێك کە ڕەنگدانەوەی کەڵکەڵە باوەکانی ڕۆژ بوون. لیسکوڤ بە ناوبانگ لە ڕۆژانە یاداشتەکانیا، دەڵێت: "بە ڕاستی شانۆنامەیەکی زیرەکانەیە. بەهرەیەکی شانۆیی گەورەیە."

جەماوەری، نمایشی شانۆنامەکە لە سان – پترسبورگدا، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو، هۆڵی تەمەشا هەموو شەوێك پڕی پڕ دەبوو. کار گەیی بووە ئەوەی، هەر کەسێك خۆی بە هاوچەرخ زانیبا، دەبوایە شانۆنامەی ئیڤانوف ببینیٚ. بە ڕاستی سەرکەوتنێکی یەجگار خۆش بوو، بە تایبەتی لە دوای ئەو شکستەی کە پێشتر لە مۆسکۆدا ڕووبە ڕووی نمایشی هەمان شانۆنامە بووبووەوە. لە نامەیەکیا بۆ خات کیسلیوڤا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئیڤانوف، سەرکەوتنێکی گەورە و بەرچاوی بەدەست هێناوە. حاڵی حازر دوو قارەمانی دیار لە سان – پترسبورگا هەن، یەکێکیان فرینای ڕووتی سیمیرادسکی*[٥] یە و ئەوی تریان منی پۆشتەیە. هەردووکمان جەماوەری خەڵکمان هێناوەتە جۆش." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٨٨٩/٢/١٧).

وێڕای ئەوەش، چیخوف، کە لەم هەموو ستایش و پێیاهەڵدانە بێزار و بێتاقەت بوو، بە جۆرە فریوێکی پوچی دەزانی، بیری لەوە دەکردەوە، لە شار هەڵیٚ و لە دەرێی شارا و لە گۆشەیەکی چەپەکدا، خۆی بە وەرزشە دڵخوازەکەی خۆیەوە، واتە بە ڕاوەماسیەوە خەریك بکات. لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلوف، دەلێت: "پاڵکەوتن لەسەر پووش و پەڵاش، دیتنی ماسیەك کە بە سەری قولاپەکەمەوە هەڵدەپلیٚ، زۆر لەوە خۆشحاڵترم دەکات، کە وتارێکی ستایش ئامێز لە ڕۆژنامەیەکدا بخوێنمەوە، یان لە هۆڵێکدا بە چەپڵەڕێزان پێشوازی بکرێم." (بڕوانە نامەی ١٨٨٩/٢/١٨). نائومێدی و کول و کۆڤان بەرەبەرە بەسەر نامەکانیا زاڵ دەبوو. لە نامەیەکیا بۆ سۆڤورین، دەڵێت: "من بۆ کیٚ و چی دەنووسم؟ بۆ جەماوەر؟ من هیچ جەماوەرێك نابینم، ئەمانە! من باوەڕم بە دوموڤی*[٦] زیاترە تا لەم جەماوەرە. نەخوێنەوارن، پەروەردە نەکراون، هەرە باشەکەیان درۆزنە... ئایا من بۆ ئەم جەماوەرە پێویستم یان نا؟ من سەریان لێدەرناکەم... کە بیر لەم شتانە دەکەمەوە، لە ژیان بێزار دەبم. وام لێهاتووە خەریکە ڕقم لە هەموو شتێك دەبێتەوە، جاران وا نەبووم، تازە وام لێهاتووە. گفتوگۆی دوورودرێژ و گەوجانە، میوان و میوانداری، لاڵانەوە و پاڕانەوە و کۆمەکخوازی، دەست گرتنەوە بۆ ئەو دوو سیٚ ڕۆبڵەی (کە لە بری معایەنەی پزیشکی دەمدەنیٚ) لە تۆ وایە خێرم پێدەکەن، دانی کرێی گالیسکەی ئەو نەخۆشانەی کە هیچ کاتێك پولێکیان پیٚ نیە. بە کورتیەکەی ئەوەندە بێزار و وەڕزم، ئەگەر بە قسەی خۆم کردبا، لە مێژبوو دەبوا سەری خۆم هەڵگرم و ماڵ بەجیٚ بێڵم. خەڵکی قەرزم لێوەردەگرن و نامدەنەوە، کتێبەکانم دەدزن، وەختم لێدەگرن، کەس ناڵیٚ ئاخر ئەم کابرایە ئیش و کاری هەیە... تەنیا لە ئاشقێنیەکی ناکامم کەمە". (بڕوانە نامەی بەرواری ٢٣/ك١/١٨٨٩)

لەو سەروبەندەدا، چیخوف، حەزی نەدەکرد بچێتە ژێر باری هیچ پەیوەندیەکی جدی یا ناجدی ئاشقێنی... هەرچەندە مجامەلەی ئەو ئافرەتانەی دەکرد کە دەگەڵ ماریای خوشکیا دەهاتنە ماڵیان، بەڵام قەت نەیدەگەیاندە ئاستی ئاشقێنی جدی. بۆ نموونە دڵبەندی لیدیا میزینوفای شۆخ و شەنگ بوو، کە بە لایکا ناسرابوو، ئەمە کچێکی سووکی، هەژدەساڵەی،

قەڵـەوی، سـپیلکەی، قـژ زەردی، چـاو مـامزی، چـاوگەش بـوو، یاریـدەدەری مامۆسـتا بـوو لـەو قوتابخانەیـەی کـە ماریـا دەرسـی مێـژوو و جوگرافیـای تیـا دەگوتـەوە. چـیخوف، بـە بـەهرە و، سیمای جوان و، پێکەنینە شیرینەکەی خۆی، دڵی کچەی ڕفاند، بەڵام تا لیدیا زیاتر لێی نزیك دەبووەوە و پتر بایەخی پێدەدا، چیخوف، زیاتر لێی دووردەکەوتەوە و مەسەلەکەی دەکرد بە فشقیات. دوای ئەو خووی دایە دەستە خوشکێکی دیکەی ماریا. ئافرەتێکی ژنانە بوو، ماتماتیك زانێکی ناسراو بوو، ناوی ئولگا کونداسوفا بوو، هەرچەند کەمێك کەتە و کەلەش پیاوانە بوو، بەڵام ڕوو ڕوخسارێکی جوان و دڵفرێنی هەبوو. ئەم ئافرەتە کەم و زۆر گوێی بە مۆدبازی و مۆدپەروەری نەدەدا، هەمیشە هەمان جلکی ڕەشی، یەخە سپی لەبەردەکرد و پشتێنێکی چەرمی پانی لەسەر دەبەست. حەزی لە ئەستێرەناسی بوو. چیخوف ناوی نابوو "ئەستێرەناس" و بەو ناوە بانگی دەکرد. ئەم ئافرەتە لە دڵی خۆیدا و بەڕاستی حەزی لە چیخوف بوو، وەختێ بە ئاماژە چیخۆڤ حاڵی کرد، کە ئەوەی لە دڵیایە، شتێکە لە دۆستایەتی زیاترە. چیخوف، یەکسەر، پاشەکشەی کرد، لەوە دەچوو ژنان بیترسێنن، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەو بەخۆی لە ژنان دەترسا، خۆی کێشە و سەریەشەی کەم نەبوو، تا کێشەی ژنێکیش لە خۆی بکات بە سەربار.

ئیدی لە مۆسکۆ و سان پترسبورگدا، بوو بە قاو کە چیخوف، عەیب و شورەیی خۆی بە سوڤورینی پیاو و هەواداری دەسەڵاتی دکتاتۆری فرۆشتووە و، لێبڕاوە کە کچەکەی سوڤورین بخوازێت (کە ئەو کیژە لەوکاتەدا، دە ساڵان بوو) و بەو زووانە دەبێ بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نوێ). ئەوە بوو پلشچیف، کە ئەم مقۆمقۆیانەی بیست خێرا چیخۆڤ ئاگادارکردەوە کە هەر هاوکاریەك دەگەڵ ڕۆژنامەیەکی ئەوەندە نزیك لە دەسەڵات، بۆ هەتاهەتایە لەکەداری دەکات و دەخرێتە سەنگەری کۆنە پەرستانەوە. هەڵبەتە چیخوف، لەلایەن گەلێك لە دۆستە لیبراڵەکانی دیکەشیەوە، لە ئاقیبەتی ئەم کارە ئاگادار کرایەوە. بۆیە لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلیوف، دەڵێت: "ئەم ژاوە ژاوەم زۆر لا ناخۆشە، ئەزیەتم دەدا، نەك لەبەر ئەوەی تۆ لە نامەکەتا باست کردووە و ئاگادارت کردومەتەوە. بەڵکو لەبەر ئەوەی هەموو خەڵکی دەربارەی دەنووسن و خوێندکارانی زانکۆکانیش هەموو باسی ئەوە دەکەن کە من بە نیازم کیژێکی ملیۆنێر بخوازم. کە بوختانێکی ناڕەوا و نەنگینە!" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٩/٣/١٦).

سەرباری ئەم هەموو خەم و پەژارەیەی خۆی، خانەوادەکەشی بە هیچ کلۆجێ ئامانیان نەدەدا. ئیسراحەتیان لێ هەڵگرتبوو. ئەلکساندری نالەبار، وێڕای ئەوەی تەمەنی گەیی بووە سی و سێ ساڵ، هێشتا هەر ئامادە نەبوو ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت و تۆزێ خۆی چاك بکات. چیخوف، کە لە مانگی دوازدەدا سەفەرێکی سان پترسبورگ دەکات، کاتێ براکەی بە نیمچە مەستی و بە توێی دەرپێ کورتەکەیەوە لە بەرانبەر ئاشپەزەکەدا دەبینێ، خەریکە لەبەردەم منداڵەکاندا، جنێوی پیس و بازاری بە ماشقە تازەکەی دەدات ، تووشی شۆك دەبێ. هەرکە دەگاتەوە مۆسکۆ، نامەیەکی (١٢/٢) بۆ دەنێرێت و پێی دەڵێت: "ببوورە کە ئەم قسەیە دەکەم، بەڵام پیاوی پیاوانە و بە حەیا و حورمەت ئەو جۆرە ڕەفتارە دەگەڵ ژناندا، هەرکێیەك بن، ناکات. ئاخر چ هێزێکی

ئاسمانی یان زەمینی ئەو مافەی داویتەتێ کە بیانکەیت بە کەنیزەك و قەرەواشی خۆت؟ بەردەوام سووکایەتیان پێبکەی، جنێویان پێبدەی، ناشرینترین جنێو، هاواریان بەسەردا بکەی، لەسەر نانخواردن، داوای ڕابواردن و سێکسیان لێبکەی. هەمیشە خوتە و بۆڵەی ئەوە بکەی کە ژیانت، زیندانە، دۆزەخە. ئایا ئەمە نیشانەی خۆسەری و بێ ئینسافیەکی دزێو نیە؟ ژن چەندیش ناچیز یان گوناهکار بێ، چەندیش لێتەوە نزیك بێ، ماڤ ئەوەت نیە بە بێ پانتۆڵ، لە حوزوریا بگەڕێی، لە حوزوریا مەست بی، جنێوی وای پێبدەی کە کرێکارانی کارخانانش، ئامادەنین لە حوزوری ژنا ئەو جنێوە ناشرینانە بە کاربەرن. تۆ دەبێ ڕێز و حورمەتی بێ دەسەڵاتی ژن و منداڵ بگریت، دەبێ مدارای شیعری ژیان بکەیت، ئەگەر پەخشان دادی نەدا... منداڵان، پاك و پیرۆزن... نابێ لە حوزوری واندا دەمپیسی بکەین... لە کاتی خۆشیدا ماچیان بکەین و لەکاتی توڕەییدا، لێیان بدەین... ئەگەر خۆشت نەوێن زۆر باشترە، لەوەی دکتاتۆریانە خۆشت بوێن." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٩/١/٢).

سەبارەت بە نیکولای بەدمەست و ئالوودە، زۆر لە ئەلکساندر، خراتر بوو، سەلامەتی و تەندروستی، ئەم کوڕە مەی ئالوودەو خۆشەویستە، دەمێ بوو مایەی نیگەرانی خانەوادەی چیخوف بوو، لە ناکاوا لە مانگی ١٨٨٩/٣دا تەندروستی خراپ بوو: تووشی گرانەتایەکی سووك بوو، بەڵام بە هۆی ئاوسانی سییەکانەوە، لێی پیس کرد. چیخوف بەپەلە کەوتە دەرمانکردنی، پاش ئەوەی تایەکەی دەرمانکرد و چاکی کردەوە، سەیری کرد، تووشی سیل و دەردەباریکە بووە. دوای ئەوەی پرسی بە چەند پزیشکێکی برادەری کرد و ئەوانیش گەیینە هەمان ئەنجامگیری ئەم. ئیدی لێبڕا فریای براکەی بکەوێ. ئەوە بوو لە کۆتایی مانگی نیساندا، دەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ڤێلاکەی لوکا، کە بۆ ماوەیەکی تازە، لە ماڵباتی لنتڤارییڤ بەکرێی گرتبووەوە، بە ئومێدی ئەوەبوو لەوێ ئیسراحەتێ بکات و نەخۆشیەکەی زیاد نەکات. کە بینی لەوێ بەهار لە هەڕەتی شکۆفایی خۆیدایە، هەر چواردەوری دار سێو و گێلاسی تازە خونچە کردووە، بولبول و کوکوختیان پڕ بە دەشت و دەر دەخوێنن و دۆست و برادەر، بە خەمیانەوەن و زەمینەی گەشت و گەڕانیان بۆ سازدەکەن، زۆر شادمان و خۆشحاڵ بوو.

بەڵام ئەم شادمانیە زۆری نەخایاند، نیکولای ڕۆژبە ڕۆژ لاوازتر دەبوو و تایەکەی ڕوو لە زیادی بوو. وای لێهات نەیدەتوانی پاڵ بکەوێ، ناچار بە دانیشتنەوە لەسەر کورسیەك دەنووست. چیخوف کە ئەوی دەبینی وەکو مۆم دەتوێتەوە، بە ناچاری بیری لە حاڵەتی خۆیشی دەکردەوە. هەرچەند سەیری ئەو کوڕە چەلەنگ و بزێوەی دەکرد کە بەو جۆرە، دەپوکایەوە، ترسێکی خەمناك دایدەگرت و پێشبینی مەرگی ئەوی دەکرد. لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندر (١٨٨٩/٥/٨) دەڵێت: "نیکولای سیلیەتی، سیلی درێژخایەن، نەخۆشیەکە کە چاکبوونەوەی نیە، بۆیە پرسیار ئەوە نیە کەی چاك دەبێتەوە، بەڵکو ئەوەیە ئەم نەخۆشیە چەند درێژە دەکێشێت؟ دوای هەفتەیەك لە ١٨٨٩/٥/١٤دا، نامەیەك بۆ سوڤۆرین، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "نیگارکێشەکەی من هەرگیز چاك نابێتەوە. ڕەشە سیلیەتی... تاقە پرسیار ئەوەیە کە ئەم نەخۆشیە تاکەی بەردەوام دەبێت؟"

وەختێ کە بەدیار برا نەخۆشەکەیەوە بوو، هەوڵی دەدا بە خوێندنەوە نیگەرانی و خەمی خۆی لە بیر بەرێتەوە . ڕۆمانی (ئوبلوموف)ی گونجاروف، نائومێدی دەکرد، گۆگول، مەستی مەستی دەکرد، ڕۆمانی (موریـد)ی ڕۆماننووسـی ئـەو ڕۆژگـارەی فەرەنسـا، پـوڵ بـورژێ، هەرچـەندە لـە جۆری خۆیدا دڵگیر و سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام بەلایەوە ناواقیعی و خراپ بوو. هەرچـەند سـەری دێنا و سەری دەبرد، نەیدەزانی ئەم ڕۆمانـە، بە چ نیاز و مەبەستێك ئـەم "جیهادە سـەڵیبی یـەی دژی ڕێبـازی مــەتریالی ڕاگەیانـدووە." لــە نامەیــەکیا (١٨٨٩/٧/٧) بــۆ ســوڤۆرین دەڵێــت: "ڕەفزکردنی مەتریالیزم، وەکو ئەوەیە ڕێگەی حەقیقەت دۆزی لە ئینسان بگریت. چونکە هیچ ئەزموون و هیچ زانیاریەك لە دەرێی مادەدا نییە، ئەمەش بە مانای نەبوونی حەقیقەتە... پێموایە کاتێ کە جەندەکێك توێکاری دەکەین، تەنانەت ڕوحانیترین ڕوحانیش دەبێ بپرسێت کە ڕوحەکە لە کوێدایە".

نیکولا، تا زیاتر بێهێز و توانا دەبوو، میهرەبانتر و گوێڕایەڵتر دەبوو. چیخوف، هەرچـەندە لـە ناخی دڵەوە بەزەیی پێدا دەهاتەوە، بەڵام زۆری پێناخۆش بوو کە نەیدەتوانی بە بست لێی دوور بکەوێتەوە و بەجێی بێڵێ. وەکو تاوانبارێك خەوی بەوەوە دەبینی کە هەوایەك بگۆڕێ، بای باڵێك بدات، یانی لەو جێگا و بانە پیسە، لەو بەڵغەمدانە هەڵێت و بڕوات بۆ ئودیسا، ئەگەر بکرێ بۆ پاریس. لە نامەیـەکیا بـۆ تیخونـوڤ نووسـەر، دەڵێت: "خۆزگە دەمتـوانی و سـەفەرێکی پاریسـم دەکـرد و لەسـەر بـورجی ئیڤڵـەوە تەماشـای دنیـام دەکـرد. لـێ مخـابن مـن لێـرە دەسـت و پـێم بەستراوەتەوە، ناتوانم بە بست دوور بکەمەوە." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٩/٥/٣١)

ئەلکساندر، لـە نیـوەی حوزەیراندا/١٨٨٩، خۆی گەیانـدە لوکا. ئیڤان، لـە پێش ئـەودا گـەیی بووە ئەوێندەر. ئیدی بە نۆرە بەدیار براکەیانەوە دەبوون. چیخوف، بە هاتنی ئەوان کەمێك وەخو هاتەوە، هەستی کرد، هەقی ئەوەی هەیە مۆڵـەتیان لێوەربگرێ و پشوویەك بدات. بـەرەو پوڵتاڤا بەڕێکـەوت تـا بـە خـەیاڵی خـۆی چوار پێنج ڕۆژێـك لـەوێ، دەگـەڵ دۆسـتانیا، ماڵبـاتی سماگین، بەسـەر بـەرێت و پشـوویەك بدات. بـەڵام لـە ڕێگـادا بـا و بارانێـك گرتـی، ئـەمما بـاو بـۆران، وەکـو ئەوەی ئاسمان، بیەوێ، خۆی گوتەنی بە تاوانی ئەوەی شوێنەکەی بەجێهێشتووە، سزای بدات. ڕۆژێك دوای گەیشتنی، جووتیارێك تەلەگرافێکی تەڕ وخوساوی گەیاندێ: "کولیا مرد." (کولیا، سـووکەڵە نـاوی نیکولایـە). هەرچـەندە چـیخوف، پێشـبینی ئـەم هەواڵـەی دەکـرد، بـەڵام زۆر خەمباربوو. یەکسەر، بەو باران و ڕەهێڵەیە، بە نیازی گەڕانەوە خۆی گەیاندە نزیکترین وێستگە. بـە ڕاسـتی سـەفەرێکی نـاخۆش و خـەمناك بـوو. ناچـار بـوو لـە وێسـتگەی ڕومـنی دا، کـە وێستگەیەکی چکۆلەبوو، لە سەعات حەوتی ئێوارە و تا دووی بەرەبەیان چاوەڕوانی قیتار بکات. ئیـدی بـەدەم چاوەڕوانی قیتـارەوە، شـەکەت و مانـدوو، تـا سـەر مـۆخ سـەرمابردوو، لـە بـاخێکی گشتیدا، دانیشـت و گـوێی لێبـوو چـەند ئەکتـەرێك لـەودیو دیـواری بـاخەکەوە، خـەریکی پرۆڤـەی شانۆنامەیەکی میلودرامی بوون.

کـاتێ گەییـە لۆکـا، سـەیری کـرد کەسـوکارەکەی زۆر شـەکەت و ماتـەمبارن. ئەلکسـاندر، لـە (١٨٨٩/٦/١٩) نامەیــەك بــۆ بــابی دەنووســێت، دەڵێــت: "هــەموو پەریشــانین، ســەرمان بــە

هەنسکانەوە هەڵدەگیرێ، کوڵی گریانمان لە جۆش ناکەوێ، هەموو هاوار و برا ڕۆمانە، تەنیا ئانتون ناگری، چاوانی وشکن، دیارە ئەمە نیشانەیەکی خراپە." چیخوفیش لە نامەیەکیا بۆ پلشچیف دەڵێت: "خانەوادەی ئێمە مەرگی نەبینی بوو، ئەمە یەکەمجاریان بوو کە تابووت بدینن." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٨٩/٦/٢٦).

هەرچەندە چیخوف، زۆر شەکەت و ماندوو بوو، بەڵام بە خۆی سەرپەرشتی هەموو کار و بار و ڕێوڕەسمەکانی کرد. بەگوێرەی داب و نەریتی ئەوێندەر، تەرمەکەی نیکولایان، بە تابووتەوە خستە سەر سان و بۆ کلێسا چکۆڵەکەی لوکایان برد. ئەوجا بردیان بۆ گۆڕستانی گوندەکە، لە نێو بۆن و بەرامەی خۆشی گیا و گوڵاندا بە خاکیان سپارد. پاشان چیخوف، لە نامەیەکا بۆ دیوکوفسکی، کە برادەرێکی نزیکی براکەی بوو، دەڵێت: "ئەگەر لە ڕابردوودا هەر خەتایەکیشی بێ، بەدەم ئازاری دوا ڕۆژەکانی ژیانەوە، سزاکەی داوە." (بڕوانە نامەی ١٨٨٩/٦/٢٤).

چیخوف، کە بیری لە شوێنی خاڵی براکەی دەکردەوە، هەم بە جۆرە شەرمێکەوە، ئاسوودە بوو و هەم لە ناخی ناخەوە خەمبار بوو. لە نامەیەکیا بۆ لایکین دەڵێت: "ئەوەندە خەمبار بووم، لە ناخی دڵمەوە، قێزم لە هاوین، لە ڤێلاکە و لە ڕووباری بسیول دەکردەوە." (بڕوانە نامەی ١٨٨٩/٨/١٣).

لەلایەکی دیکەشەوە، دوودڵ بوو لەوەی کە خانەوادەکەی بەو کۆستەوە، بەو تازیە بارییەوە بەجێ بێڵێ. بۆیە ناچار بوو تا ١٨٨٩/٧/٢ چاوەڕوان بکات و ئەوجا بچێتە سەفەر. لە گەرمەی ئەو پەشێوی و پەریشانیەدا، بە خۆیشی نەیدەزانی بەرەوکوێ بڕوات، بەرەو قەفقاز، فەرەنسا، یان بەرەو نەمسا، کە ماڵباتی سوڤۆرین، بۆ ئەوێندەریان دەعوەت کردبوو. ئەنجام چوو بۆ ئودیسا، دۆستێکی ئەکتەر بە ناوی ئەلکساندر لسنکی دەعوەتی کردبوو، کە دەگەڵ تیپی شانۆیی، شانۆی (مالی)دا بە گەشتێکی شانۆیی چووبوونە ئەوێندەر. ئەم سەفەرە غەریب و چاوەڕوان نەکراوە، دەگەڵ ئەو تیپە شانۆییەدا، کردیە کارێك کە خەم و پەژارەکانی لە بیربکات. چیخوف، لە هەمان ئوتێلی ئەکتەرەکاندا، لە ئوتێلی باکوور ژوورێکی گرت. هەموو ڕۆژێ لە دەریادا مەلەی دەکرد. بەستەنیەکی زۆری دەخوارد، ئێواران، پاش تەواوبوونی نمایشەکە، تا سەعات دووی پاش نیوەشەو، بەدەم گەنگەشەوە دەگەڵ دۆستەکانیا دادەنیشت. یەکێك لە خانمانی ئەکتەر کە ناوی کاراتیگینا بوو، زۆری پێ سەیر بوو کە پیاوێکی وەکو ئەو، کە دەستێ جلی کەوەیی شیکی لەبەردا بوو، زۆریش ناسك ڕەفتار بوو، وەکو هەر جووتیارێکی دێهاتی گوڵەبەڕۆژەی دەخوارد. دوای دە ڕۆژ، لەم گەنگەشە و خۆکاوێژکردنەوانە، کە لە سەرەتاوە زۆری پێخۆش بوو، بێزار و بێتاقەت بوو. بۆیە لێبڕا سەفەری یاڵتا بکات. ئەندامانی تیپی شانۆیی مالی، تا ناو بەلەمەکەش بەڕێیان کرد و دوو بۆینباخیشیان بە دیاری پێشکەش کرد.

هەرکە گەییە یاڵتا، هەرچی دەکرد نەیدەزانی بۆچی بۆ ئەوێندەر هاتووە. گەرماکەی لەکێشا نە بوو، پیاوی دەتاساند. هەواداران و دڵبەندان ئامانیان نەدەدا. ژنان، بە پەچەوە بە شەقامەکاندا دەسوڕانەوە، بۆنێکیان لێدەهات وەکو بۆنی ئایس کرێم. لە نامەیەکیا بۆ پلشچیف (١٨٨٩/٨/٣) دەڵێت: "بەیانیان مەلە دەکەم، بە نیوەڕۆان لە گەرما لوول دەبم، ئێواران شەراب دەخۆمەوە،

شەوێ دەنووم. دەریا زۆر جوان و بەشکۆیە، ڕووەکان مایەی بەزەیین. ئێرە پڕە لە جولەکە. خەڵکەکە نەخۆشێکی زۆریان تیایە. هەموو ڕۆژێ بڕیاری سەفەر دەدەم و سەفەر ناکەم، لەوە دەچێ پێم ڕێ دانەگرێت... ویژدان عەزابم دەدا، کەمێك هەست بە شەرمەزاری دەکەم کە من ئەمە ڕەفتارمە لە کاتێکا کەس و کارەکەم لە پرسە و ناخۆشیدان."

وێڕای گەرما و، ئەفسوونی دەریای شینباوی بێسنوور، دەرفەتی ئەوەی هێنا بەشی هەرە زۆری چیرۆکێکی سەیری ڕەشبینانە بە نێوی: "چیرۆکێکی هیچ" بنووسێت، کە بۆ مۆسکۆش گەڕایەوە، لە نامەیەکیا (١٨٨٩/٩/١٣) بۆ فلادیمیر تیخونوڤ نووسەر، دەڵێت: "بە ڕاستی دەقێکی قورسە، ئەوەندە قورسە پیاودەکوژێت. زۆر پچڕپچڕ و ناڕەوانە. لێرەدا مامەڵەم دەگەڵ بابەت و نێوەرۆکێکی تازەدا کردووە." ئەم "بابەت ونێوەرۆکە تازەیە" وەکو بە خۆی بۆ سەرنووسەری (پۆستەی باکوور)ی ڕوونکردووەتەوە، زادەی "ئەو بارە دەروونیە ناڵەبارە بوو، کە بە درێژایی هاوینەکە نەمتوانی لە خۆمی دوور بخەمەوە." بەڵام لە نامەیەکیا (١٨٨٩/١٠/١٧) بۆ سوڤورین، هەمان بیروبۆچوونی خۆی دووپات دەکاتەوە کە شەریکی بیروبۆچوونی قارەمانەکەی نیە و، لە دەقی نامەکەدا دەڵێت : "ئەگەر یەکێك قاوەی دایتێ، بە چاوی بیرە سەیری مەکە. کە من بیروبۆچوونی مامۆستایەکت عەرز بکەم، باوەڕم پێبکە و، وا خەیاڵ مەکە کە ئەمە بیروبۆچوونی چیخۆفیشە... لە سەرانسەری ئەم چیرۆکەدا تەنیا یەك بیرۆکە هەیە کە من تیایا شەریك بم. ئەویش ئەو بیرۆکەیەی زاوا خوێڕیەکەی مامۆستا، یانی گینکرە، کە دەڵێت: "پیرەمێر خەڵەفاوە! " ئیدی هەموو چیرۆکەکە زادەی خەیاڵە."

لە ڕاستیدا، بابەتی (چیرۆکێکی هیچ) بابەتێکی خەیاڵیە. مامۆستایەك بە نێوی نیکولا ستیپانوفیچ، کە هەست دەکات زۆر ماندووە، دوا دواییەتی و بەو زووانە دەمرێت، هەڵدەستێ جەردێکی هەموو کار و چالاکییەکانی ژیانی ڕابردووی خۆی دەکات، دەگاتە ئەو ئەنجامگیریەی کە ئەو ژیانەی ئەو گوزەراندوویەتی: بێدەنگی و هێوری، زانست دۆستی، ڕەفتاری دەگەڵ ژنەکەیا، دەگەڵ کچەکەیا، دەگەڵ کاتیای دایەنیا، ڕاوبۆچوونی دەربارەی هاوکار و خوێندکارەکانیا، نووسینەکانی، سەرکەوتنە ڕواڵەتیەکانی، هەر هەمووی "پوچ و بێ مانایە." و ئیدی تووشی هەرەس و شکستێکی دەروونی ئەوتۆ دەبێ، کە ناتوانێ دەگەڵ ماڵ و منداڵەکەیدا هەڵبکات، ئیدی لێیان جیادەبێتەوە و تەنانەت پەیوەندی دەگەڵ کاتیای دڵبەندی خۆشیا دەبڕێ، دەڕوات بۆ خارکوف، لەوێ، ژوورێك لە ئوتێلێکدا بەکرێ دەگرێت و بەدەم چاوەڕوانی مردنەوە لەو ژوورەدا دەژی.

بە گوتەی چیخوف، نیگەرانی و تەنیایی مامۆستای پیر، تا ڕادەیەکی زۆر لە نیگەرانی و تەنیایی ئەوسەر و بەندەی خودی چیخوف چووە. چیخۆفیش هیچ ئامانج و بەهایەکی ئایدیالی نەبووە، پۆچی سەرکەوتنی بۆ دەرکەوتووە، زۆر بە بێموبالاتی و خوێنساردی ڕوانیویەتیە مەرگ و مردن، مەرگی ناوادەی نیکولای برای، گەیاندبوویە ئەو قەناعەتەی کە موتڵەقناسی کارێکی ئاسان نیە و قەدەر و چارەنووسی ئادەمیزاد دەچێتەوە سەر بێهودەیی.

خەڵکانێکی ئەهلی ئەدەب هەبوون، کە بەناهەق ئەم چیرۆکەیان دەگەڵ چیرۆکی "مەرگی ئیڤان ئیلیچ"ی تولوستۆیدا، کە سێ ساڵ لەوەپێش بڵاوبووبووەوە، بەراورد دەکرد، کە بە ڕاستی بەراوردێکی نابەجێ بوو. ڕاستە قارەمانی هەردوو چیرۆکەکە ڕووبە ڕووی مەرگ دەبنەوە، بەڵام ئەم ڕووبە ڕووبوونەوەیە لای قارەمانی چیرۆکەکەی تۆلستۆی، تا ئەو کاتە ترسناکە کە وەعدی نوری خوایی بۆ کەشف دەبێ و ئیدی ئاسوودە و دڵنیا دەبێت. بەڵام قارەمانی چیرۆکەکەی چیخوف، مامۆستای پیر، هیچ ئاسوودەیی و ئۆخژنێك لە دڵ و دەروونی نەگەڕا. دەبوایە بە تاقی تەنیا ڕووبە ڕووی ئەو ڕۆژە ڕەشە ببێتەوە کە چاوەڕوانی بوو. وەك بڵێی چیخوڤ گوماندار لێرەشا ڕووبە ڕووی تولستۆی ئیماندار ببێتەوە. یەکەمیان، واتە چیخوف بەوپەڕی گومانداری و بێباوەڕی خۆیەوە، هێدی و هێمن، ژیانی بەڕێدەکرد. بەڵام دووەمیان، واتە تولستوی، بە باوەڕداری عەزاب ئامیزی خۆیەوە، بانگەوازی ئەوەی دەکرد، هەر کەسێك ڕزگاری ڕوح و ئاسودەیی دەروونی خۆی مەبەست و خوازیار بێ، دەبێ خۆی لە هەر لەزەتێکی دنیایی دووربگرێت.

وەکو چیخوف، خۆی پێشبینی کردبوو، ڕەخنەگران، زۆر بە توندی سەنگەریان لە دەقی (چیرۆکێکی هیچ) گرت. کەچی میخائیلوفسکی بە ناوبانگ، کە تا ئەو کاتە، بە دەگمەن ئاوڕی لە بەرهەمی ئەدەبی چیخوف دابووەوە، ئەمجارەیان ستایشی چیرۆکی ناوبراوی کرد و بەمجۆرە وەسفی کردووە: "جوانی و زندوویەتی ئەم چیرۆکە لەوەدایە کە نووسەر، بە عەزابە تایبەتیەکانی خۆی ئاودێری کردووە.". بەڵام بلشچیف، لە نامەیەکا بۆ نووسەر (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٨٩/٩/٢٧) دەڵێت: "تا ئێستا هیچ بەرهەمێکی لەمە بەپێزتر و قوڵترت نەنووسیوە. تۆنی زمانی مامۆستا و زانا پیرەکە، لە سەرانسەری چیرۆکەکدا زۆر بە جوانی هاتووە. تەنانەت باری سەرنجە شەخسیەکانیش کە تۆی تیا دەبینینەوە، ئاسیوی بە ڕەوت و ڕیتمی یەکێتی و یەکپارچەیی چیرۆکەکە نەگەیاندووە."

تازە، هەوەڵێن کاردانەوەی جەماوەر دەربارەی چیرۆکی (چیرۆکێکی هیچ) دەردەکەوت، چیخوف دەستی بە نووسینی شانۆنامەی "دێوی جەنگەڵی" کرد. لە هەوەڵەوە بە تەمابوو بە هاوکاری دەگەڵ سوڤورىندا بینووسێت، بەڵام چونکە سوڤورین، سەرقاڵی کارێن دی بوو، ئیدی لێڕا بە تەنیا بینووسێت. ئەمجارەیان ڕێك بە پێچەوانەی شانۆنامەی ئیڤانوفەوە، دەیویست خۆی لە هەر وەرچەرخان و بویەرێکی کوت وپڕ و چاوەڕوان نەکراو دووربگرێت. زیاتر بایەخ بە کاری دەروونی بدات تا بە کاری بێرونی. دەیویست تەمەشاڤانان زیاتر لە ڕێگەی سایکولوژیەوە ڕابکێشێت تا لە ڕێگەی تەکنیك و ئەدای شانۆییەوە. کارێکی وەها بکات تەمەشاڤانان ژیان بە هەمان ڕۆتینیەت و سادەیی خۆی، وەکو چۆن هەیە، ئاوها ببینێ. بە کورتیەکەی دەیویست ئەوەی لە چیرۆکی (چیرۆکێکی هیچ دا) بە وشە و لەسەر کاغەز کردبووی، هەمان شت لەسەر شانۆ، دووبارە بکاتەوە.

چیخوف، شانۆنامەی ناڤبری لە ١٨٨٩/١٠/٥دا تەواوکرد. یەکسەر دایە سانسۆر، پاشان دای بە لیژنەی ئەدەبی شانۆی ئالکساندرنسکی، لە سان – پترسبورگ. لیژنە شانۆنامەکەیان بەو

بیانووه ڕەفز کرد کە: "هیچ کاریگەری و هەڵوێست و کەسایەتیەکی بەرجەستە و سەرنجڕاکێشی تیا نیە". پاشان لنسکی پێی گوت: "با من ئامۆژگارییەکت بکەم: تۆ چیرۆك بنووسە. تۆ ڕقت لە شانۆ و ژانری درامی یە، بە ڕادەیەك بە کەم بایەخیان دەزانی، کە نەتوانی شانۆنامە بنووسیت. نووسینی شانۆنامە، زۆر قورسترە لە نووسینی چیرۆك و ئەدەبیاتی خەیاڵی، ببورە ئەگەر بڵێم سەرکەوتن بە ڕادەیەك مەغروورى کردویت، کە نەتوانیت لە سفرەوە دەست پێبکەیت و بە تەواوەتی بچیتە قوڵایی شانۆ و تیایا قاڵ بیتەوە و خۆشت بوێ." فلادیمیر نەمیر وفیچ — دانچنکۆی شانۆنامەنووس، کە ئەویش شانۆنامەکەی خوێندبووەوە، هەمان بۆچوونی لنسکی، بە زیادەوە دووپات کردەوە: "لنسکی لەسەر هەقە، تۆ هیچ شتێك لەمەر شانۆ و مەرجەکانی شانۆ نازانیت، بەڵام من هەست ناکەم تۆ هیچ ڕقێکت لە شانۆ هەبێ، بەڵام بە ئاشکرا، شارەزای شانۆ نیت."

چیخوف، هەرچەندە ئەم حکومەی پێ سەیربوو، بەڵام خۆی شێلو نەکرد، بەڵکو سوپاسی لنسکی و نامەکەی کرد و بەڵێنی دایە کە جگە لە هەندێ سووکە دەقی وەکو "زەماوەند"، هەرگیز خۆی لە قەرەی نووسینی شانۆنامە نەدات. هەرچەندە بە ڕواڵەت ئەو قسانەی لەبەرگران نەبوو، بەڵام لە ناخا زۆری پێناخۆش بوو و، چونکە لە نامەیەکیا بۆ سۆڤورین، گلەیی دەکات و بڕیارەکەی لیژنەی هەڵسەنگاندن بە بڕیاری "دادگایەکی عورفی = سوپایی" دەشوبهێنێ و دەڵێت: "دژی خۆم و شانۆنامەکەم، دێوی جەنگلی یە" (بڕوانە نامەی ١٣/١٠/١٨٨٩ بۆ سۆڤورین).

ئەوەی زۆری پەست دەکرد و بەلایەوە ناخۆش بوو ئەو دەنگۆیە بوو، کە لە سان — پترسبورگ دا دەماودەمی دەکرد و دەگوترا، کە مامۆستا سربریاکوڤ پیر، کە یەکێك بوو لە کاراکتەرەکانی (دێوی جەنگەڵی) نموونەیەکی کاریکاتۆری سوڤورینە. لە نامەیەکیا، تکا لە سۆڤورینی دۆستی دەکات کە باوەڕ بەو قسە و قسەڵۆکە ڕقاویانە نەکات و دەڵێت: "چەندیان حەز دەکرد زەڕنیخم بۆ لە چایەکەت کردبا، یان وەکو سیخوری سەر بە دەزگای سێیەم (ئەمن) لە قاوم بدایتایە، ئەم قسە و قسەڵۆکانە تەواو نابن، هەر هەمووی قسەی قۆڕ و بێ مانایە، ئەم قسە بێ مانایانە، هەرچەندە بایەخیان نیە، بەڵام ژیان، هەرچەندە بە خۆی زۆر جوان نیە، ناشیرین دەکەن و لە بەرچاوانی دەخەن." (بڕوانە نامەی ١٧/١٠/١٨٨٩).

هەرچەندە، هیچ متمانەیەکی بە شانۆنامەکەی، (دێوی جەنگڵی) نەمابوو، بەڵام لەسەر قسەی نەمیروفیچ — دانچنکو، جارێکی دی نووسییەوە و دای بە تیپی شانۆیی، شانۆی ئەبرامۆڤ لە مۆسکۆ، کە ئەنجام پەسندی کرد. بەڵام هەرکە لە شەوی ٢٧/ك١/١٨٨٩دا یەکەم نمایش کرا، ڕەخنەگران، شانۆنامەیەکیان پێ قەبووڵ نەبوو، کە بە پێچەوانەی یاسا و ڕێسا و مەرجەکانی شانۆنامان نووسرابوو و لاف ئەوەی لێدەدا کە ژیان بە هەموو تورەهاتەکانیەوە وێنە دەگرێت، بەڵێ ڕەخنەگران ئەم شانۆنامەیەیان پێ قووت نەچوو، لە هەموو لایەکەوە داخی خۆیان بەسەرا هەڵڕشت. چیخوف ڕەخنەکانی بەهەند وەرگرت. شانۆنامەکەی لە چەکمەجەیەك ناو بڕیاری دا

هەرگیز چاپ و بڵاوی نەکاتەوە. چەند ساڵێك دواتر، پیرە شانۆنامەی دەرهێنایەوە، بە دەست نووسەکەیدا چووەوە و، یەکێك لە شاکارە شانۆییەکانی خۆی (لالۆڤانیا)ی لێوە هەڵێنجا.

مەرگی نیکولا و پێشوازی ساردوسڕی ڕەخنەگران لە چیرۆکی (چیرۆکێکی هیچ) و ناکامی و شکستی تەواوەتی شانۆنامەی (دێوی جەنگەڵی)، بەتەواوەتی ورەی مەعنەویان داڕوخاند. بەڵام هەندێ خاڵی دڵخۆشکەرەش لە ژیانی ئەم قۆناغەیدا هەبوون، بۆ نموونە یەکێك لەو خاڵانە ئەوەبوو کە دۆستایەتی و ناسیاوی دەگەڵ چایکوفسکی دا پەیدا کرد، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بەلای ڕەشبینی و گۆشەگیریدا مایل بوو. زۆربەی هاوعەسرانی تووشی نائومێدی و ڕەشبینیان دەکرد، کە یەکێك لەوانە تولوستوی بوو: تولستۆی هونەرمەندی پێ قەبووڵ بوو، بەڵام تولستۆی هزرڤانی پێقووت نەدەچوو. ڕەخنەی لە تازەترین ڕۆمانی هونەرمەندی پیر، (سۆناتای کروتزر) دەگرت و دەیگوت جەنگێکی دەستکرد و ناواقیعی هەڵگیرساندووە. لە نامەیەکیا (١٨٨٩/٢/١٥) بۆ پلشچیف دەڵێت: "شتێك هەیە ناتوانم چاوپۆشی لێبکەم و نووسەر ببەخشم، ئەویش ئەوەیە کە تولستوی زۆر بە بێپەروایی باسی شتانێك دەکات کە هیچیان دەربارە نازانێ، و نەگبەتی لەوەدایە سووریشە لەسەر ئەوەی تێیان نەگات. بۆ نموونە بیر و بۆچوونەکانی دەربارەی سفلیس، خانەی منداڵانی بێسەپەرشت، بێزاری ژنان لە ئەشقی بەدەنی و... هتد نەك هەر قابیلی گەنگەشە و پێداچوونەوەن، بەڵکو نیشانەی ئەوەن کە لەو ڕووانەوە، پیاوێکی زۆر نەزان و غەشیمە و لە سەرانسەری تەمەنی درێژی خۆیدا، هیچ کاتێك و لە هیچ قۆناغێکدا زەحمەتی ئەوەی بە خۆ نەداوە، دوو سێ نامیلکە، لەو نامیلکانە بخوێنێتەوە کە خەڵکانی شارەزا و پسپۆڕ، لەو بارانەوە نووسیویانە." هەڵبەتە چیخوڤ نووسەر، بەو پاشخانە زانستیەوە کە هەی بوو، نەیدەتوانی تاریك بیری خۆسەرانەی تولستوی قەبووڵ بکات. هەڵبەتە هەمان ڕاوبۆچوونی سەبارەت بە دۆستویفسکیش هەبوو. لە نامەیەکیا (١٨٨٩/٥/٥) بۆ سوڤورین، دەربارەی دۆستویفسکی دەڵێت: "زۆرباشە، بەڵام لە بەرهەمەکانیا درێژدادڕییەکی زۆر دەکات، لەخۆبایی و خۆهەڵکێشە، زۆر بە خۆی دەفشێ." لە لایەکی تریشەوە، هەستی بە نزیکی لە لیبراڵانی بیر تەماوی، نەدەکرد. ڕێزی تایبەتی بۆ کەلتوور و ڕۆشنبیری هەبوو، بەڵام لە ڕۆشنبیران بە گومان و دڕدۆنگ بوو. ئەگەرچی خۆی لە تولستوی و دوستویفسکی دوور دەگرت، بەڵام نزیکی دەگەڵ لیبرالەکانیشدا نەبوو، ئەوەتا لە نامەیەکیا (٢٧/ك١/١٨٨٩) بۆ سوڤورین بەمجۆرە باسیان دەکات: "ڕۆشنبیرانی تەمەڵ، تەوەزەل، بێ موبالات، ناجدی و سارد و سڕی ئێمە، کە جگە لە قسەی ڕووت و فەلسەفەڕێسی، هیچی تریان لە دەست نایەت، خەڵکانێکن نانیشتمانی، بێزار و بێتاقەت، سست و خاو، بێ ڕەنگ و ڕەونەق، بە پێکێکی بچووك مەست و سەرخۆش دەبن، هەمیشە بەڕێی قەحپەخانە پەنجا کوپێکیەکانەوەن. هەر خوتەخوت و بۆڵەبۆڵیانە، لە هیچ ڕازی نین، هەموو شتێك ڕەت دەکەنەوە (چونکە بۆ ئەقڵ و ئەقڵیەتی تەمەڵ، ڕەتکردنەوە ئاسانترە لە قەبوڵکردن.) خۆ لە ژن هێنان و منداڵ پەروەردەکردن، دەدزنەوە... هتد روح مردوو، جەستە سست، تەمەڵ و بێ جوڵە، هزر و هزرینی ناپایەدار."

چیخوف، تەنانەت لە خۆیشی ڕازی نەبوو، ئەوەتا لە نامەیەکیا (١٨٨٩/٥/٤) بۆ سوڤۆرین دەڵێت: "لەم دنیایەدا پیاو دەبێ بێلایەن بێ، پێویستی بە کۆڵنەدان و بێ لایەنیە. تەنیا بێ لایەنان دەکارن شتەکان بە ڕوونی ببینن، بەئینسافبن و کاربکەن... ئاگری دەروونی من، زۆر کزە، بێ کڵپە و بڵێسەیە، بۆیە هیچ شەوێك لە چوار پێنج پەڕە زیاترم پێ نانووسرێت، یان ئەوەندە سەرقاڵی نووسین نابم، کە قیروسیا لە خەو بکەم و نەخەوم. بۆیە تا ئێستا نە کاری زۆر خراپ و نە شاکارێکی ئەوتۆم نەنووسیوە کە جێگەی سەرنج بێ... بە ڕاستی ئەشق و تاسەیەکی زۆر کەمم هەیە." ئەم ڕستەیەی (ئەشق و تاسەیەکی زۆر کەمم هەیە) زۆرجار و، لە قۆناغە جیاوازەکانی کاری ئەدەبی خۆیدا، دووبارە دەکردەوە. دوای چەند مانگێك، لە نامەیەکیا (١٨/ك١٨٨٩/١) بۆ سوڤۆرین، دەڵێت: "چەند حەزدەکەم، بۆ ماوەی پێنج ساڵان، بچمە خەڵوەتی تەنیاییەوە و خۆم بۆ نووسینی کارێکی جدی و دژوار تەرخان بکەم. من پێویستم بە خوێندنەوەیە، دەبێ لە سفرەوە تێ هەڵبچمەوە، هیچ نازانم، پێویستە وەکو نووسەر، فێری هەموو شێوەیەکی قەڵەمڕانی ببم، من پێویستە بە هۆشمەندییەوە خەریکی نووسین ببم، نەك مانگی پێنج دەفتەر ڕەش بکەمەوە، بەڵکو بە پێنج مانگ دەفتەرێك بنووسم." هەروەها لە نامەیەکی دیکەیدا (٧/ك١٨٨٩/١) دەڵێت: "لە مانگی کانوونی دوودا، دەبم بە سی ساڵ، سڵاو تەنیایی، سڵاو ئەی تەمەنی ئازیزی بێهودە!"

ئەوسا لەپڕ، لە ناوجەرگەی ئەم تاریکی و تەمتومانەوە، تروسکەیەك بریقایەوە. ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٨٨٩ بوو، کە چیخوف، بەڕێکەوت، یاداشتنامەکانی میخائیلی برای، خوێندەوە، کە کاتی خۆی وەکو ڕاپۆرت بۆ دوا قۆناغی خوێندنی بەشی قانونی سزا، ئامادەی کردبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئێمە هەموو هۆش و گۆشمان لای تۆمەتبارە تا حوکمەکەی دەردەچێت. بەڵام کە خرایە زندانەوە، ئیدی بە تەواوەتی لەبیری دەکەین! ناپرسین ئاخۆ لە زنداندا چ ڕوودەدا و چ باسە؟" لەوساتەوە ئیدی نەیتوانی ئەم بیرۆکەیە لە مێشکی خۆی دەربکات. ئیدی ئێرە، مۆسکۆ جێی ئەو نەبوو. دەیویست پشت بکاتە ئەم دنیای دوو زمانی و تەڵەکەبازیە و ڕووبکاتە ئەوپەڕی سیبریا ودانەجیڕێی نووسەرانی بەغیل و بوغزن لە بیربکات و لە نزیکەوە و ڕاستەوخۆ، عەزابی ڕاستەقینەی بەشەر بدینێ، پەردە لەسەر عەزابی زندانیانی دوڕگەی ساخالین، لە باسیفیکی، هەڵماڵێ. ئیدی ئەم سەفەرە تا قورستر دەهاتە بەرچاو، زیاتر دەبوو بە خولیای، خۆشحاڵ بوو بەوەی ئاقیبەت مەبەست و ئامانجێکی بۆ ژیانی خۆی دۆزی بووەوە! دڵخۆش بوو بەوەی دەیتوانی بە ئەشق و سەرفرازییەوە خەون بە ئایندەوە بدینێ...

پەراوێز:

١ – (... چاوە شینە...): لە ڕاستیدا چاوانی چیخوف، قاوەییەکی کاڵی، گەشی، پرشنگ ئامال شین بوون.

٢ – (... دڵی بە ژیان...): بڕوانە یادگارییەکانی کورولینکو.

٣ – (... **برودینو...): گوندێکی نزیکی مۆسکۆیە، شەڕی ١٨١٢ی نێوان ناپلیۆن و ڕووسیا لەوێندەر ڕووی دا.**

٤ – (... **پۆتیمکین** ١٧٣٩ – ١٧٩١) **فیلد مارشاڵی ڕووسی و ماشوقی یکاترینای دووەم بوو، لە پیلانی ساڵی ١٧٦٢دا دەستی هەبوو، کە یکاترینا لەو ڕێگەیەوە بوو بە تزاری ڕوسیا.**

٥ – (... **فرینای ڕووت...): تابلۆیەکی سیمیرادسکی بوو ئەو ڕۆژگارە لە ئەکادیمیای هونەر جوانەکانی سان – پترسبورگ دا هەڵواسرابوو.**

٦ – (... **دوموڤی...): بە گوێرەی فولکلوری ڕووسی، جنۆکەیەکی ماڵییە و لە ماڵاندا دەسوڕێتەوە و کاردەکات.**

"٨"

## له ساخالینەوە بۆ پاریس

هەموو دۆست و برادەرەکانی چیخۆف، پرۆژە و بەرنامەکەیان، بەجۆرە شێتایەتیەك دەزانی، دەیانگوت: چۆن کەسێکی ئەوەندە نەخۆش و لەش بەبار، کەسێك کە بۆ هونەرو لە پێناوی هونەردا دەژیا، دەیتوانی ئەم ریسکە بکات و مل بەم سەفەرە ترسناك و بێهودەیەوە بنێ؟ جا بۆ پاکانەی ئەم کارەی، جارێ پاساوی ئەوەی دێنایەوە کە لە ململانێ و کێشماکێشی ناوەندو ئەنجومەنە ئەدەبیەکان بێزارە، جارێ دەیگوت پێویستی بەوەیە هەوایەك بگۆڕێ و بای باڵێکی خۆی بدات. جارێك دەیگوت، نووسەر لەسەرێتی، واقیعی ژیانی ڕووسی، بە هەموو جوانی و ناشرینییەکیەوە بجەڕبێنێ. جارێ دەیگوت حەز دەکات، توێژینەوەیەکی زانستی لەمەڕ چارەنووسی زاندانیانی تاراوگەکانی سیبریا ئەنجام بدات. ئیدی هەر هەموو ئەو بیرۆکانە، لە هزر و بیریا یەکانگیر دەبوون و هێندەی دی لە سەر بڕیارەکەی سوور دەبوو.

بە هەرحاڵ، هەندێ لەو کەسانەی کە لێیەوە نزیك بوون، وایان زەن دەبرد، بۆیە دەیەوێ سەری خۆی هەڵگرێ و بۆ ئەو پەڕی دنیا بڕوات تا خەم و جەفای ئەشقێکی ناکام لە بیر خۆی بەرێتەوە، هەڵبەتە لە ناو ئەوانەدا، ژنێك هەبوو بەناوی لیدیا ئەڤیلوڤا کە قەناعەتی تەواوی بەو بۆچوونە هەبوو. ئەم ژنە*١، دوای مردنی چیخۆف، بەچل و سێ ساڵ، لە یاداشتەکانی خۆیدا، ئەوە دەگێڕێتەوە کە گوایە چیخۆف، شەیدایانە ئاشقی بووەو لە نائومێدیدا، سەری خۆی هەڵگرتووە و بۆ ساخالین ڕۆیوە. هەڵبەتە هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەم قسەیەی خۆی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، کە بە گەنجی زۆر جوان و دڵڕفێن بووە. کە یەکەمجار لە ساڵی ١٨٨٩دا چیخۆڤ دیتووە، ژنێکی گەنجی بیست و شەش ساڵانی، خشکۆکی، شیکی، قژ زەرد بووە، مێردەکەی فەرمانبەر بووەو یەك منداڵی هەبووە.*٢ ژنێك بووە ناسك خەیاڵ، قەڵەمێکی ڕەوانی هەبووەو چیرۆکی سادەو ساکاری هەبووەو، بە خەیاڵی ئەوە ژیاوە کە لە دنیای ئەدەبدا جێیەك بۆ خۆی بکاتەوە. کە یەکەمجار لە هۆڵێکی سان پترسبۆرگ، چیخۆڤ دیتووە، هەستی کردووە "شتێك لە ڕوحیا، لە ناخیا تەقیوەتەوە." هەڵبەتە ئەم هەستە دوو لایەنە نەبووە، چونکە کاتێ چیخۆف لە ساڵی دواترا بۆ سان پترسبۆرگ گەڕاوەتەوە، تەنانەت هەوڵی دیتنیشی نەداوە. لیدیا، نامەیەکی بۆ دەنووسێت، چیخۆف وەڵامی نەداوەتەوە. دوای سێ ساڵ تەوازۆیەکی هەندێ توندو زبری بۆ دێنێتەوە: "کاتێ خۆی نامەیەکی تۆم پێگەیی، دەربارەی یەکێك لە چیرۆکەکانم، بیرم نەماوە کام چیرۆکە بوو، پرسیاری ئەوەت کرد بوو کە مەبەستم لەو چیرۆکە چی بووە. چونکە ئەوسا وەکو پێویست نەمدەناسیت و ناوو شۆرەتی مێردارییەکەتم، بیر چوو بوو کە ئەڤیلوڤایە، ئیدی نامەکەتم فڕێ داو، پولەکەیم کردەوەو خستمە گیرفانمەوە. بەو شێوەیە وەڵامی هەموو نامەکان، بە تایبەتی ئەگەر نامەی خانمان بێ، دەدەمەوە." ( بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٢/٣/١٩).

ئەگەر ئەم ئارەزووی ڕاکردن و هەڵاتنەی چیخۆف، لە بنەڕەتدا، جۆرە نائومێدییەکی تیا بووبێ، نا ئومێدی ئاشقینی نەبووە، بەڵکو جۆرە نائومێدیەکی ئەخلاقی و ئەدەبی بووە. چونکە

چیخۆف نە لە ژیان و نە لە هونەرەکەی ڕازی نەبوو، هەستی دەکرد پێویستە لە کاری سەخت و ڕۆتینی ڕۆژانە دوور بکەوێتەوە، لە خەڵکی دابڕێ، لە میانەی هەژانێکە وە خۆی تازە بکاتەوە. بەجۆرێ شەکەت و ماندوو و بێزار بوو بوو، دەبوا لە ڕێگەی شوکێکەوە چاری خۆی بکات، لە نامەیەکیا بۆ سوڤۆرین، ئەو سوڤۆرینەی تا کۆتایی هەوڵی دا لەم کارە مەترسیدارە ژێوانی بکاتەوە، دەڵێت: "من ئەو سەفەرە هەر دەکەم، بەڵام دڵنیام هیچ خێرێکی بۆ ئەدەب یا زانست تیا نابێت... دەمەوێ بەلای کەمەوە سەد تا دوو سەد لاپەڕەیەك بنووسم تا بە شێك لەو قەرزە بدەمەوە کە نۆژداری و پزیشکی بەسەرمەوەی هەیە، ئەو نۆژداریەی وەکو بە خۆت دەزانی، وەکو بەراز ڕەفتارو مامەڵەم لە تەکدا کردووە... بە مەزەندەی خۆم ئەم سەفەرە کە کارێکی جەستەیی و فیکری زۆر سەختەو شەش مانگێك دەخایەنێت، بۆ من زۆر پێویستە چونکە من بابایەکی ئۆکرانیم و خووم بە تەمەڵیەوە گرتووە. پێویستم بەوەیە تۆزێ خۆم گورج بکەمەوە. ڕەنگە ئەم سەفەرەم بێهودەبێ، جۆرە سەرسەختیەکی تیابێ، هەواو هەوەسێکی لە ناکاو بێ، بەڵام من ناڵێم تۆ بڵێی، لە مانەوەدا چیم دەست دەکەوێ کە لە ڕۆیشتنا لە دەستی بدەم... بۆ نموونە دەڵێی ساخالین نە سوودی بۆ کەس هەیەو نەکێشە و خەمی کەسیشە. ئایا بە ڕاستی وایە؟ ساخالین مەگەر تەنیا بەکەڵکی کۆمەڵگەیەك نەیەت، کە هەزاران کەسی ڕەهەنەی ئەوێندەر نەکرابێ و ملیۆنان پارەی لێ خەرج نەکردبێ... ساخالین، جگە لە ئوستراليا و کاییینی جاران، تاقە شوێنە کە بشێت وەکو کۆڵۆنیەکی تاوانباران نشین، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت... ساخالین، مەڵبەندی عەزاب و ئازارێکە مەگەر تەنیا بەشەر، چ ئازاد بێ چ کۆیلە، تەحەمولی بکات... مخابن من کەسێکی عاتفی نیم، دەنا دەمگوت، ئێمەمانان لە سەرمانە، بە هەمان باوەڕو نەفەسەوە زیارەتی ساخالین و ئەو جۆرە شوێنانە بکەین، کە تورکان (موسوڵمانان) زیارەتی مەکە دەکەن... ئەمە جگە لەوەی دەبێ دەریاوانان و مافناسانیش بەو چاوە بڕواننە ساخالین، کە سوپا دەڕوانێتە سیڤاستوپۆل. بەگوێرەی ئەو سەرچاوانەی من خوێندوومنەوە، ئێستا دەیخوێنمەوە، بۆم دەرکەوتووە کە ئێمە شەرعیەتمان بەوە داوە ملیۆنان خەڵك لە زنداندا دابڕزێن، لە ڕووی بێ فیکری و هۆڤیگەریەوە شەرعیەتمان داوە کە بەبێ هیچ هۆیەك، بێ هیچ خەتایەك لە زنداندا دابڕزێن. خەڵکیمان بەکۆت و زنجیرەوە بە ناو سەهۆڵبەنداندا و بە درێژایی دەیان هەزار کیلۆمەتر ڕێگاوە بەڕێ کردوە، تووشی هەزارویەك دەردی وەکو سفلیس و بێ ڕەوشتیمان کردوون. تاوانبارانمان پەروەردە کردووەو هەموو خەتاکانیشمان بە ملی سەرپەرشتیارانی کەپوو سووری زنداندا داوە. ئێستا هەموو ئەوروپای ڕۆشنبیر دەزانن کە کێ بەرپرسیارەو دەبێ کێ بە بەرپرسیار بزانرێ: هەڵبەتە دەبێ ئێمە مانان بە بەرپرسیار بزانرێین نەك سەرپەرشتیارانی زندان. باشە ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە. گرنگ نیە، خەمی ئێمە نیە. لە ساڵانی پڕ شکۆو ڕەونەقی شەستدا (قۆناغی ڕیفۆرمکاری) هیچ کارێکیان بۆ نەخۆشان و زندانیان نەکردو بەمجۆرە فەرمانی گەورەی مەدەنیەتی مەسیحیان بە تاڵ کردووە. لە ڕۆژگاری ئێمەدا هەندێ شتی کەم بۆ نەخۆشان دەکرێ، بەڵام بۆ زاندانیان هیچ ناکرێت، چۆنیەتی بەڕێوەبردنی زندان، سەرنجی مافناسان ڕاناکێشێت، هەستیان ناجوولێنێ. نا، دڵنیات دەکەم کە ساخالین گرنگە، جێی بایەخ پێدانە،

بەڵام من داخی ئەوە دەخۆم کە من بۆ ئەوێندەر دەچم نەك کەسێکی لە من بە تواناتر، کە بتوانێ هەست و ویژدانی جەماوەری خەڵك بێدار بکاتەوەو. بجووڵێنێ.. چوونەکەی من شتیکی ئەوتۆ نیە..." (بڕوانە نامەی ١٨٩٠/٣/٩)

چیخۆف، کە بڕیای دا، بە شێوەیەکی ئەکادیمی لە ژیان و گوزەرانی زندانیانی دورگەی ساخالین بکۆڵێتەوە، هەستی کرد پێویستە هەر هەموو ئەو سەرچاوانە بخوێنێتەوە و بپشکنێ کە باسی ئەو جۆرە گرفت و کێشانە دەکەن. ئیدی ماری و دەستە خوشکەکانی لە کتێبخانەی ڕومیانتسفدا کەوتنە نووسینەوەی ئەو پەرەگرافە بنەڕەتیانەی کە چیخۆف لەم سەرچاوەو لەو سەرچاوانەدا بۆی دیاری دەکردن. ئەلکساندریش لە ڕۆژنامە کۆنەکانەکانی سان – پترسبۆرگ دا، ئەوانەی باسی ئەو جۆرە بابەتیان بڵاو کردبووەوە، بۆی دەگەڕا. چیخۆف هێندەی زانیاری و ڕاپۆرت و ئامارانی لا کەڵەکە بوو، وای دەزانی زیاتر جوگرافیازان و جیولوجی و زانای کەشناسی و توێژەری نەژاد ناسیە تا ئەدیب بێ و ڕایگەیاند کە تووشی نەخۆشیەکی تازە بووە کە ناوی "شێتی ساخالینی یە".

لەوسەرو بە ندەدا، لە گەرمەی ئەو سەرقاڵیەدا، دەرفەتی هێناو کۆچیرۆکی حەوتەمی لە ژێر سەرناڤی (خەڵکی ئاڵۆز)دا بڵاوکردەوە کە بەچایکوفسکیی پێشکەش کرد بوو، هەر لەو کاتەدا چیرۆکێکی درێژیشی بۆ سوڤورین نارد لە ژێر سەرناڤی (ئەهریمەنان) تا لە ڕۆژنامەکەیدا (ڕۆژگاری نوێ) بڵاوی بکاتەوە، (کە پاشان ئەو ناونیشانەی گۆڕی بە دزان). ئەم چیرۆکە باسی دوو ئەسپ دزی تەڕدەستی، چاو نەترسی، حیلەباز کە پزیشکیارێکی، گەوجی، ساویلکەی، هەوایی فریو دەدەن. کاتێ کە سوڤورین، دۆستانە گلەیی ئەوەی لە چیخۆف کرد بوو گوایە وەکو پێویست سەرزەنشتی هەوڵوێست و ڕەفتاری دزەکانی نەکردووە. چیخۆف، بە توندی وەڵامی دابووەوە کە نووسەر دەبێ سەبارەت بە ڕەفتاری قارەمانەکانی بێ لایەن بێ: " تۆ گلەیی لە بابەتگەرایی من دەکەیت و بەبێ موبالاتی دەربارەی خێرو شەڕو بە نەبوونی ئایدیایەکی باڵای لەقەڵەم دەدەیت.. هتد. تۆ دەتەوێ کاتێ کە من باسی دزەکانم دەکەم بڵێم:دزی کارێکی خراپە. بەڵام هەموو خەڵکی لە مێژە ئەمە دەزانن و پێویستیان بەوە نیە، من ئەوەیان پێ بڵێم. با دەستەی داوەری ئەو شەرعە بکەن. ئەرکی من تەنیا ئەوەیە وەکو خۆیان، وەکو چۆن هەن، بەو ئاوایە نیشانیان بدەم و بنووسم: ئێوە سەروکارتان دەگەڵ ئەسپ دزاندا هەیە. ئاگادارین کە ئەمانە هەژارو بێنەوا نین، تێر خۆرو تێر شۆرن، ئیدی ئەمەیان کردووە بەجۆرە پیشەیەك، ئەسپ دزیی وان، شتێکە لە سەرووی دزی ڕووتەوە، دزی لە پێناوی دزیدا نیە، بەڵکو جۆرە حەزو هیوایەتێکە. موتوربەکردنی هونەر بە وەعزان خۆش و دڵگیرە، بەڵام بەلای منەوە، لەبەر هۆو فاکتەرێن تەکنیکی، یەجگار قورسە، بەڵکو نیمچە مەحاڵە. ئەگەر بمەوێ باسی دزەکانم لە حەوت سەد دێڕدا بگێڕمەوە، دەبێ بە درێژایی ئەو ماوەیە وەکو ئەوان قسە بکەم، وەکو ئەوان بیربکەمەوە، هەمان هەستی ئەوانم هەبێت. ئەگەر کەمترین باری سەرنجی خۆمیان بۆ زیاد بکەم، هەنگێ قارەمانەکان کاڵ دەبنەوە و چیرۆکەکە ئەو سخی و چڕییەی تیا نامێنێ کە بۆ چیرۆکی کورت پێویستە. کاتێ کە دەنووسم، زیرەکی خوێنەران لە بەرچاو دەگرم، بەو ئومێدەم کە

خوێنەر، ئەو بۆشاییە فیکریانە پڕ بکاتەوە کە لەچیرۆکەکەدا هەن." ( بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٤/١).

جا سوڤۆرین، ئەگەر لەم گەنگەشەیەدا، قەناعەتی بە زەرورەتی بابەتگەرایی داهێنەرانەش لە کاری نووسیندا کردبێت، بەڵام بە هیچ جۆرێك قەناعەتی بەم سەفەرە مەترسیدارە بۆ ساخالین نەبوو. وێڕای ئەوەش زۆری یارمەتی چیخۆف دا بۆ ئەم سەفەرەی، هەرچەندە لەگەڵ سەفەرەکەیدا نەبوو. کاتێ چیخۆف بە مەبەستی زەمینە سازی سەفەرەکەی هات بۆ پترسبۆرگ، سوڤورین بە ڕێزێکی زۆرەوە میوانداری کردو لە ماڵی خۆی گلی دایەوە. کارتی ڕۆژنامەوانی ڕۆژنامەکەی خۆی (ڕۆژگاری نوێ)ی بۆ کرد، کە دەیتوانی بەو کارتە خۆی بە دایەرە پەیوەندیدارەکانی ئەو بوارەدا بکات، هەروەها دۆست و برادەرە دەسەڵاتدارو دەستڕۆکانی خۆی ڕاسپارد کە ئاگایان لێبێ و ئاسانکاری بۆ بکەن. گەورەترین کەسێك کە چیخۆف بەو بۆنەیەوە، سەردانی کرد گالکین – ڤێراسکی بوو، کە بە ڕێوەبەری گشتی زیندانەکان بوو. دیارە ئەم پیاوە بە ڕێزو حورمەتێکی زۆرەوە پێشوازی کردو وای نواند کە پرۆژەکەی چیخۆڤ بە دڵە، هەرچەندە نە هیچ ئامۆژگاریەکی کردو نە هیچ نامەیەکی ڕاسپێری دایە. لەوەش خراتر هەرکە چیخۆف، وەڕێ کەوت، خێرا لە دوای ئەوەوە نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەری ناوخۆی زیندانەکانی ساخالین نارد، کە ڕێگەی چیخۆف نەدات، پرسوجۆ و گفتوگۆ دەگەڵ زیندانیە سیاسیەکاندا بکات.

کاتێ چیخۆف، بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، سەرانسەری شار یەکپارچە خۆپیشاندانی خوێندکاران بوو، خۆپیشاندەران داوای خۆیبوونی تەواوەتی زانستگەکانیان دەکرد، داوای هەڵوەشاندنەوەی چاودێری پۆلیسیان دەکرد، داوایان دەکرد جولەکە، بەبێ دیاریکردنی ژمارەیان، لە زانستگەکان وەربگیرێن. ئیدی لە هەموو مەیدانەکاندا میتینگ و کۆبوونەوەی گەورە دەکرا، شار خرۆشا بوو، پێکادان دەگەڵ قۆزاقاندا ڕووی دەدا، خەڵکی ڕەشبگیر دەکران. چیخۆف زۆر بە وردی پەیگیری ئەم ڕووداوانەی دەکرد، بەڵام بە ئاشکرا هاودڵی و هاوسۆزی دەگەڵ خۆپیشاندەرەکاندا نەدەکرد. دیار بوو هێشتا هەمان ڕاوبۆچوونی ئەوسای هەبوو کە خۆی خوێندکاری زانستگە بوو: خوێندکاران پێویستە خەریکی خوێندنی خۆیان بن و خۆ لە کاروباری گشتی کۆمەڵایەتی هەڵنەقورتێنن. بەرە بەرە کاتی سەفەرەکەی نزیك دەبووەوە ( بە نیاز بوو لە سەرەتای بەهارا، لەوکاتانەدا کە سەهۆڵبەندانی ڕوبارەکانی سیبریا دەتوانەوە، سەفەر بکات.) هەستا ساڵنمایەکی ژیان و بەرهەکانی خۆی ڕێکخست. لە ساڵنمای ناوبراودا هەمان بۆچوونەکانی جارانی دووپات دەکاتەوە: کە نووسەر بۆی نیە بکەوێتە ئامۆژگاری و دەرسدادانی خوێنەر. دووپاتی دەکاتەوە کە ئەویش بە شەرێکە وەکو هەموو بەشەرەکانی دی، ڕقی لە هیچ هاوڕەگەزو هاو نەژادێکی خۆی نیە. لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف – شچگلوف دەڵێت: " ئەگەر بشێت ویژدانی خۆم بەشایەد بگرم، دەتوانم بڵێم بە عەمرانم، نە بە گوتار، نە بە کردار، نە بەخەیاڵ، نە لە چیرۆکەکانماو نە لە شانۆنامە کۆمیدیەکانمدا قەت نە چاوی تەماحم بڕیوەتە ژنی هاوسێکەم، نە کارەکەرەکەی، نە بەغیلیم بە سەروەت و سامان، گاو گۆتاڵ، نە بەڕان پەزەکەی نەبردووە. نە دزیم کردووە نە مەرایی، نە مەتح و ستایشی خاوەن دەسەڵاتانم کردووەو نە چاوم لەوە بووە شتێکم لێیان

دەست بکەویٚ، نە چاو بەرە ژێری کەس بووم، نە دەسەندەخۆری ئەم و ئەو. ڕاستە تەمەنی خۆم بە تەمەڵی بە سەر بردووە، بێخەم و خەیاڵ پێکەنیووم، زۆرم خواردووەو خواردووەتەوە، مێبازی و داوێن پیسیم کردووە، بەڵام هەموو ئەمانە تەنیا پەیوەندیان بە خۆمەوە هەبووە، نەم هێشتووە زەرەریان بۆ کەس هەبێت. دەتوانم بڵێم ئەوەندەی پەیوەندی بە ئەخلاقەوە هەیە، کەسێکی میانڕەوم، نە لە خەڵکی دیکە زیاترم نە کەمترم. نە کەسێکی ناوزڕاوم، نە کەسێکی ناودار: وەکو زۆربەی خەڵکی وام." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٣/٢٢)

کەمیك دوای ناردنی ئەم ئیعترافنامەیە، لە گۆڤاری "هزری ڕووسی"دا وتارێکی زۆر توندی خوێندەوە، کە بەوە تۆمەتباری دەکرد گوایە "نووسەرێکە پابەندی هیچ پڕەنسیپێك نیە" ئەم وتارە لە لایەن ڤوکۆل لاڤرۆڤی سەرنووسەری گۆڤارەکەوە نووسرا بوو. چیخۆف، عادەتی وابوو، زۆر بە شێنەیی هەر ڕەخنەیەك وەربگرێت و تا بۆی بکرێت وەڵامی نەداتەوە. بەڵام شێوەی بەر خوردەکەی لاڤرۆڤ، بە جۆرێ تووڕەی کرد کە نەیتوانی لیی بێدەنگ ببێت. بۆیە لە نامەیەکیا بۆ لاڤرۆڤ بە تووڕەییەوە دەڵێت: "ڕەخنە شتێکی ئاساییە و عادەتەن پیاو وەڵامی ناداتەوە. بەڵام مەسەلەکە لێرەدا ڕەخنە نیە، بەڵکو بوختان و ئیفتیرایە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر لەسەر سەفەر نەبوایەم، لەگێن بوو چاوپۆشی لە بوختانەکەشت بکەم، بەڵام چونکە لەسەر سەفەرم و بەتەمام بەو زووانە ڕووسیا بەجێ بێڵم و بڕۆم بۆ شوێنێك و لەگینە هەر نەیەمەوە، بۆیە نەمتوانی وەڵامت نەدەمەوە. من هەرگیز نووسەرێکی بێ پڕەنسیپ، یان بێ هەڵوێست و بێ ئابڕوو، کە هەمان مانای بێ پڕەنسیپی دەگەیەنێت، نەبووم... گەلیك لەو چیرۆك و وتارانەی کە نووسیومن، ئاساییە لەبەر خراپیان لە ناویان بەرم، بەڵام تاقە دێڕێکم نە نووسیوە کە مایەی شەرمەزاریم بێ... من هەمیشە کەسێکی لاتەریك و گۆشەگیر و کەم تێکەڵ بووم، خۆم لە شەوکۆڕی ئەدەبی، ئاهەنگ و سووکە شەوبێریان، کۆڕو کۆمەڵ دوور گرتووە... هەمیشە هەوڵی ئەوەم داوە دۆست و برادەرەکانم زیاتر بە پزیشکم بزانن تا بە ئەدیب: بە کورتی نووسەرێکی شەرمن و بێ فیز بووم. ئەم نامەیەی کە حاڵی حازر بۆ تۆی دەنووسم یەکەمین پەرچە کرداری بێ شەرمانەیە کە دوای دە ساڵ نووسەرایەتی دەی نوێنم. هەڵبەتە ئاساییە لە دوای ئەو بوختان و ئیفتیرایەی کە تۆ بۆ منت کردووە، هیچ پەیوەندییەکی پیشەیی و تەنانەت کۆمەڵایەتیش لە نێوان من و تۆدا نەمێنێ." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٤/١٠).

دوای ئەوەی بەو جۆرە داخی دڵی خۆی هەڵڕشت، ئەوسا گەڕایەوە سەر بەرنامەی سەفەرەکەی. کە دەیبینی کەسوکارو دۆستەکانی نیگەرانی ئەو مەترسیانەن کە لەگینە لەم سەفەرەدا بێنەڕێی، بە پێکەنینەوە وەڵامی دەدانەوەو دەیگوت تاقە خەم و پەژارەی ئەو، ئەو ددان یەشەیەیە کە چەند ڕۆژێکە تووشی بووە. کەچی وێڕای ئەوەش لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (١٨٩٠/٤/١٥) وەسێتی کرد بوو کە: "' ئەگەر خنکام، یان هەر شتێکم بەسەرهات، بێزەحمەت ئاگاداربە کە هەرچیەکم هەیە یان لەگینە لە ئایندەدا بمبێ، بۆ خوشکەکەمە. ئەویش قەرزەکانم دەداتەوە.". ئەوسا جانتایەکی چەرمی گەورەی، کە میخائیلی برای دابوویێ، پڕکرد لە جل و بەرگ و کەرەستە و تفاقی سەفەر، کە تازە کڕی بوونی، ئیدی بەو شتانەوە ڕێك لەو گەڕیدانە

دەچوو کە بە دارستانەکانی سیبریادا دەسوڕانەوە: پۆستین، پاڵتۆ بارانیەکی ئاو نەدەر، لەو پاڵتۆیانەی کە ئەفسەرانی سوپا لەبەری دەکەن. جووتێ پووتی ناو تووکن، دەمانچەیەك، کێردێکی گەورە، خۆی گوتەنی "بۆ گۆشت جنین و ڕەواندنەوەی پڵینگان". سوڤورین —ش، لە سەر داوای خۆی وامێکی هەزارو پێنج سەد ڕۆبڵی دایێ، کە قەرار بوو لە بری ئەوە، باری سەرنج و تێبینییەکانی ئەم سەفەرەی بۆ ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نوێ) بنێرێت تا بڵاوی بکاتەوە.

ڕۆژی ١٨٩٠/٤/٢١ کەوتەڕێ . ئەو ئێوارەیە هەموو کەسوکارەکەی و هەندێ لە دۆستەکانی تا وێستگەی یاروسلاڤل لە گەڵیا چوون. هەموو لە هۆڵی چاوەڕوانیدا، بە تورەییەوە قسانیان دەکردو دەیانویست خەم و پەژارەی ئەو دابڕانە لە خۆ بڕەوێننەوە. دکتۆر کوفشینیکوف، یەك مەتارە کۆنیاکی پڕی بە دیاری دایە چیخۆف و سوێندی دا کە تا دەگاتە باسفیك (ئۆقیانووسی ئارام) یەك قەترەی لێنەخواتەوە. دایکی ئانتون و ماریای خوشکی دەگریان. لیکامیرینوفای شۆخ و شەنگ، بەچاوانی تەماویەوە هەولی دەدا، بە تۆبزی بزە بخاتە سەر لێوانی خۆی. ئەو بەیانیە چیخۆف وێنەیەکی خۆی بەم نووسینە تەنزئامێزەوە پێشکەش کردبوو: "بۆ ئەو شۆخە جوانەی کە لە دەستی ئەو بۆ ساخالین هەڵدێم." لە دوا ساتدا ئیڤان، لڤیتان و، ئۆلگا گونداسوڤای ئەستێرەناسی بێپەروا، کە هێشتا، ژێراو ژێر دڵبەستەی چیخۆف بوو، بڕیاریان دا کە دەگەڵیا سواری قیتار بن و تا سیرکییڤوی شەست و شەش فەرسەخی مۆسکۆ بە ڕێی بکەن. ڕێڕەوی سەفەرەکەی چیخۆف بەمجۆرە بوو: لە مۆسکۆوە تا یاروسلاڤل بە قیتار، لە یاروسلاڤەوە تا پرم بە بەلەم، بە ڕوباری ڤولگاو کامادا، لەپرمەوە تا تیومن دیسان بە قیتار، لە تیومنەوە تا دەریاچەی بایکاڵ بەجۆرە گاریەك کە پێیان دەگوت تارانتاس. لە بایکاڵەوە تا ئۆقیانووسی ئارام جارێ بە بەلەم و جارێ بە تارانتاس، یانی ڕێگایەکی نزیکەی دە هەزار فەرسەخی بوو، دەبوایە چوار هەزار فەرسەخی بە تەق و هۆڕی شڕە عەرەبانە ببڕێ، کە ئەمە بۆ ساغترین ڕێبواریش، سەفەرێکی دژوارو پشت شکێن بوو. چیخۆف، لە ناو ئەو بەلەمەدا کە لە یاروسلاڤلەوە بۆ پرمی دەبرد، هەستی بە جۆرە ئارامیەك کرد، یانی لە هەنبەر ئەو دیمەنە ڕۆتینیانەدا نە هەستی بەشادی و نە بەخەم نەدەکرد. بەڵام دەوروبەری شار ناخۆش بوو، هەستی دەکرد کەوتووەتە ناو "خۆراکی جیلاتینی ماسیەوە"و "کاتێ بایەکی سارد هەڵدەکات و ئەو ئاوەی کە بە هۆی سێڵاوی بەهارەوە تەواو لێڵ بووە، دەخاتە شەپۆلدان، من هەست بە سەرماو خەم و پەژارەو دڵتەنگی دەکەم. ئاوازێکی خەمناك لە ئوکوردیونانی کەنارەکانەوە هەڵدەستێ، دیمەنی ئەو تاپۆو شەبەنگە بێ جوڵانەی، بەشڕە پۆستینانەوە، لەسەر بەلەمە بارییەکان وەستاون، وا دەنوێنێ کە بە سەر ئازارو ژانێکی بێ سنوورەوە داکوتراون. شارو شارۆچکانی ڕەخی کاما، بۆر دەچنەوە، لە تۆ وایە خەڵکی ئەو شارانە خەریکی دروستکردنی هەورو خەم و پەژارەو پەرژینی تەڕو قوڕو چڵپاوی شەقامەکانن، وەك ئەوەیە جگە لەو کارانە، هیچ کارێکی دیکەیان نەبێ." (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٩٠/٤/٢٩ بۆ خوشکەکەی). وێڕای هەمو ئەمەش کە هاوسەفەرێکی بینی (کە حاکم بوو) لە کتێبخانەی کەشتیەکەدا چیرۆکی (بولێڵی=ئەلەند) دەخوێندەوەو دەگەڵ هاوسەفەرەکانیا گەنگەشەی دەکات، زۆر خۆشحاڵ بوو.

ئەوجا لەپڕمەوە بەرەو یەکاترین بۆرگ سواری قیتار بوو، لەوێ لە ئوتێلێکی ئەمەریکیدا ژوورێکی گرت. پێویستی بە ئیسراحەت بوو، تا "کۆکەکەی و مایەسیریەکەی هەندێ هێور ببنەوە." هەرکە هەستی بە سووکە ئیسراحەتێك کرد، سواری قیتار بوو و بەرەو تیومن وەڕێکەوت، لە ٥/٣٠دا گەییە ئەوێ و بۆ یەکەمجار چاوی بە دەشتی سیبریا کەوت. (ئەوسا هێشتا سکەی قیتاری سەرانسەری سیبریا دروست نەکرابوو.) قۆناغی دواتری سەفەرەکەی وابوو کە دەبوایە سەرانسەری ئەو دەشتە بە تارانتاسێکی شڕە، یان چیخۆف گوتەنی بە تارانتاسێکی سەبەتە ئاسا تا سنووری تومسك ببڕێت، ئەم تارانتاسە دوو ئەسپی لێ بەسترا بوو و عەرەبانچیەکی پیر لێی دەخوڕی، بەخۆی دەڵێت لە نێو ئەم تارانتاسەدا، خۆی وەکو بولبولێکی ناو زندانی قەفەز دەهاتە بەرچاو کە هایم و حەیران لە بەینی شیشەکانەوە زەق زەق دەڕوانێتە دەرێ و بیر لە هیچ ناکاتەوە. بایەکی زۆر سارد گۆناکانی دەڕوشاند. هەرچەندە پاڵتۆیەکی چەرمی تازەی لەبەرا بوو، کەچی لە سەرما هەڵدەلەرزی، دوو پانتۆڵی بەسەریەکا لەبەرکردبوو تا لاقی گەرم ڕابگرێت. لەگەڵ هەر تەکانێکی تارانتاسەکەدا ئازارێکی تیژ بەسیەکانیا دەهات. لە نامەیەکیا (١٤ –١٨٩٠/٥/١٧) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "هەر دەڕۆین، غل دەبینەوە، کێلە بەردی قۆناغ ژمێر، گۆلاو و گژوگیاو دەوەنانی کەناری ڕێ، جیلوە دەفرۆشن... کۆمەڵێك ئاوارەی ماڵ بەکۆڵمان بینی کە هەریەکەیان کۆمەڵێك مەنجەڵ و قاپ و ئامانیان بەکۆڵا دابوو. ئەم بەڕێزانە، بێ هیچ کۆسپێك بەسەر شەقامە ڕێی سیبریادا دەسوڕێنەوە. جاری وا هەیە تووشی پیرەژنێکی کلۆڵ دەبن، گۆشاو گۆش سەری دەبڕن، تا تەنورەکەی ببەن و لە لاق و پێیانی بپێچن. جاری وا هەیە، ئەو تابلۆ تەنەکەیەی سەر کێلی قۆناغ ژمێرەکان هەڵدەکەنن (نازانم بۆ چیانەو بەکەڵکی چی دێت). جاری وا هەیە لە ڕێگادا تووشی گەدایەك دەبن و مێشکی دەپژێنن، یان چاوی بابایەکی ڕەهەنە و دوورخراوە دەردێنن، بەڵام هەرگیز دەست لە ڕێبواران ناکەنەوە." هەڵبەزو دابەزی پیرە تارانتاس هێزو توانای لە بەربڕی، دەنگی بەردەوام و یەکنەوای زەنگۆڵان مێشکی سەریان بردا گوێیان کەڕ کرد، ئەم ئەشکەنجەیە دوازدە ڕۆژی دەخایاند بە جۆرێ وەڕەزو بێزار بوو، لەدڵی خۆیدا دەیپرسی تۆ بڵێی تا کۆتایی، تا سەر بەرگەی ئەم ئازارو ئەشکەنجەیە بگرێت. لە کۆتایی ڕۆژی سێیەمەدا، پشتی بە ڕادەیەك دایە ژان کە لە تارانتاسەکە (عەرەبانە) دابەزی نەیدەتوانی ڕێك ڕابوەستێ، یان بە ئیسراحەت ڕابکشێت. بەڵام بەرە بەرە بە تێپەڕبوونی ڕۆژ بەدەنی لەسەر ئەم عەزابە ڕاهات، سەریەشەکەی و ئازاری مایە سیریەکەی و، خوێن هەڵهێنانەکەی پەڕین.

بەیانییەك گالیسکەیەکی گەورەی پۆستەبەر، دەگەڵ تارانتاسەکەی چیخۆفدا تامپۆنی کرد، چیخۆف کەوتە خوارەوەو هەمو بارو بنەکەی بەسەریا ڕووخا، کە هەستایەوە، زۆری پێ سەیر بوو کە هیچ شوێنێکی نەشکا بوو. بەڵام هەمو شفتەکانی عەرەبانەکەی ئەم شکان، هەردوو عەرەبانچیەکە، لەو دەشت و بیابانەدا هەرچی جنێوی دنیا هەیە بەیەکیان داوە. ئیدی بەهەر شێوەیەك بوو، بە قایش و قروشان، پارچەکانی (سەبەتە شکاوەکەیان) پێکەوە نایەوەو چیخۆف لەوێندەرەوە گەییە قۆناغی دواتر.

بارانی سیبریایی دایکرد ئەمما داکردن. ڕوباری ئیرتیش هەستا، ئاو جادەو بانی گرت. جار جار ئەم ڕێبوارەو (چیخۆف) عەرەبانچیەکە، ناچار دەبوون لە تارانتاسەکە دابەزن و ئەسپەکان ڕابکێشن و لە دەریاچەی ڕاستەقینەی قوڕاویان بپەڕێننەوە.

لەو گوندانەی کە دەوەستان. چیخۆف سەری لە جیاوازی نائاسایی خەڵکی گوندەکان دەسوڕما: ڕووسی موهاجیر، ئۆکرانی، تاتار، پۆڵۆنی، جولەکە، هەر هەموو ئەو نەژادە جیازانە پاش ماوەی مەحکومیەتەکەیان تەواو کرد بوو، زۆر بە تەبایی و ئاشتی دەگەڵ یەکترا دەژیان و بۆ خۆ فەلاحەتیان دەکرد. زۆر لە خەڵکی ئەو بەری ئۆراڵ شارستانی تر دەهاتنە بەرچاو. چیخۆف لە نامەیەکا (١٤ – ١٧/٥/ ١٨٩٠) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "پیاو کە بە شەوان ڕێی دەکەوێتە ماڵێك کە خەڵکەکەی نووستوون، بۆنی گەوڕت بە سەرا نایەت. ڕاستە پیرەژنێك کەوچکێکی دامیٚ کە تازە بە سمتی پاکی کردبووەوە، بەڵام هیچ کاتیٚ بە بیٚ سفرە لە سەر مێزی چا خواردنەوە دات نانیشێنن. بە بەرچاوتەوە قرقێنە لێنادەن. بە بەرچاوتەوە، سەریان نادۆزن. کە ئاو یان شیرت دەدەنیٚ، نیوەی قامکیان ناخەنە ناو پەرداخەکەوە."

وێڕای ئەوەش گلەیی لە خواردنەکە یان دەکرد، دڵی لە خواردنەکەیان تێك هەڵدەهات، خواردنی هەرە باوی ئەو دەڤەرە مەرگەی "سۆنەی کێوی" بوو. ئەمە بریتی بوو لە گۆشتاوێکی بۆگەن، پڕیان دەکرد لە قیمەی سۆنەو پیازی خاو، لە هەمان نامەدا (١٤ – ١٧ /٥/١٨٩٠) دەڵێت: "جارێك داوام کرد گۆشتاوێکم بۆ ئامادە بکەن دەگەڵ ماسی سورەوە کراو. گۆشتاو ومەرگەی چی! چڵکاوێکی سوێری بیٚ تامیان بۆ هێنام، لە جیاتی گۆشت، شتێکی تیا بوو، لەچەرم دەچوو. ماسییان هێنا، ماسی چی، پولەکەکەیان لێنەکردبووەوە." چایەکەشیان لەمە باشتر نەبوو، نەدەخورایەوە: " تامی گوڵە مریەم و قالۆنچەی کوڵاوی دەدا. ڕەنگی ڕەنگی چای نەبوو، زەردکاوێك بوو لەو گۆڕە." بە درێژایی ڕێگا، بارانێکی توندی سارد دایکردو، تا چیخۆف لە ١٥ –٥ –١٨٩٠)دا نەگەییە تومسك، خۆشی نەکردەوە. ماوەی چەند ڕۆژێك بۆ ئیسراحەت لەوێندەر مایەوەو، پێنج وتاری کورتی، بەگوێرەی خوێندنەوەی خۆی بۆ ئەو شتانەی کە دیتبوونی، بۆ "ڕۆژگاری نویٚ" نووسی. چیخۆف ئەوێندەری بە دڵ نەبوو: شار، شاری مەستان بوو، ژنی جوانی تیا نەبوو، هەوڵی دەدا ڕۆشنبیرانی شار نەبینیٚ. بەڵام نەیتوانی تکای یاریدەدەری سەرۆکی پۆلیس، ڕەت بکاتەوە کە داوای لە چیخۆف دەکرد یەکێك لە چیرۆکەکانی بۆ بخوێنێتەوەو ئەم خاوەن پایەیەش ڕێگەی بدات بە قەحبەخانەکانی شارا بگەڕیٚ. لە نامەیەکی (١٨٩٠/٥/٢٠) بۆ سوڤورین دەڵێت: "ئا ئێستا لە قەحبەخانەکان گەڕاومەتەوە. بە ڕاستی مایەی داخە. پیاو دڵی دەگیرێت. سەعات دووی بەرەبەیانە." ئەم لادانەی تومسکی بە هەلزانی، تۆزیٚ باروبنەکەی ڕێك خستەوە، جانتاکەی میخائیلی کە شڕو وڕ بوو بوو، گۆڕی بە جانتایەکی چەرمی گەورەتر ونەرمتر. چونکە لە تارانتاسە، سەبەتە ئاساکەی بێزار بوو بوو، هەستا گالیسکەیەکی چکۆلەی سووکەڵەی بەسەدو سی ڕۆبڵ بۆ خۆی کڕی، بەو نیازەی لە کۆتایی سەفەرەکەیدا بیفرۆشێتەوە.

له ۱۸۹۰/٥/۲۱دا بەم گالیسکە تازەیە، لە تومسکەوە، بەرەو ئیرکوتسک کە هەزار و پێنج سەد فەرسەخ لەوێندەرەوە دوور بوو، کەوتە ڕێ. دوو مولازم و پزیشکێکی سوپاییش بە گالیسکەی خۆیان بەگەڵی کەوتن. ڕێگاکە یەکپارچە قوڕ بوو، پێچکەی گالیسکەکان، بە جۆرێ لەو قوڕە خەستە دەچەقین و ڕۆدەچوون، وەکو ئەوەی لە "مرەبایەکی خەست بچەقن." شفت و ئەکسلی گالیسکەکان، هاواریان لێهەستا بوو. دەبوایە لە هەر قۆناغێکدا، کۆڵێك پارە بدەن تا دایان بگرنەوەو تەعمیریان بکەنەوە. لە نامەیەکیا (۱۸۹۰/٥/۲۸) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "زیاد لە پێویست پارە خەرج دەکەم، شتێك دەکەم کە نابێ بیکەم، شتێك دەڵێم کە نابێ بیڵێم، هەمیشە چاوەڕوانی شتێکم کە ڕوو نادات." جاری وا هەبوو، ناچار دەبوایە لەو ڕێگاو بانەدا، لەبەر باو سەرمادا بوەستێ و چاوەڕوانی چاك کردنەوەی عەرەبانەکەی بکات. یان دەبوایە بەپێیان بڕوات و هەرچۆنێ بووە خۆی بگەیەنێتە قۆناغی دواتر. ئیدی شەکەت و ماندوو کە بە لاقی لەرزۆك و جل و بەرگی قۆڕاویەوە دەگەییە مەنزڵ و، خۆی بەسەر جێگەو بانێکی کۆنا دەدا، بەدەم ماندوویەتی ڕێگاو مەستی هەوای ئازادەوە، خەوێکی قووڵی لێدەکەوت. لەودیو کراسنویارسکەوە، ئیدی جەنگەڵ و چڕە دارستانی بێ کۆتایی سیبریا دەستی پێدەکرد. هەرجارێ کە عەرەبانەکە دەگەییە سەر تەپۆڵکەیەك، چیخۆف چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە دارستانەکە تەواو ببێ، کەچی تا چاو هەتەری دەکرد، هەر سنۆبەر و دار کاژو دەوەن و دەوەنەجاڕ بوو. ئەوەتا لە (چەند سەرنجێ لە سیبریاوە) کە لە هەردوو مانگی حوزەیران و ئابی ۱۸۹۰دا لە (ڕۆژگاری نوێ)دا بڵاو بووەتەوە، دەڵێت: "پیاو وا هەست دەکات، هەرگیز لەم لێڕە بێ سەروبنە دەرباز نابێت." زۆری پێنەچوو، هەوا گۆڕا، سەرماو سۆڵە و باو بۆران، بوو بە گڕەو گەرما، گێژەڵوکە و تۆزوبا. گەردو تۆز، دەم و لووت و قورگ و تەنانەت گیرفانەکانیشی پڕ کرد، بەڵام چیخۆف، هەر کوڵی نەدەداو بەو پەڕی سەبرو هەدارەوە، ڕووبەڕوی ئەو ڕەوشە خراپە دەوەستا. لە نامەکیا بۆ لیکین دەڵێت: "زۆر شتم بینی و جەڕباند، هەر هەموو ئەمانە لای من و بۆ من جوان و دڵگیر و تازە بوون، زیاتر بۆ چیخۆڤ مرۆڤ، نەك چیخۆڤ نووسەر، ڕوباری یەنیسی، لێڕەوارو جەنگەڵان، کاروانسەراکان، عەرەبانچیەکان، سروشتی خۆڕسك، ماندوویەتی لە ڕادەبەدەری ڕێگاو بانی سەخت و ناخۆش، لە زەتی پاش پشوودان و ئیسراحەت. هەموو ئەمانە، تێکڕا، هێندە جوانن کە لە وەسفکردن نایەن." (بڕوانە نامەی ۱۸۹۰/٦/٥).

ئەنجام کە لە ۱۸۹۰/٦/٤دا گەییە ئیرکوتسك، شادو دڵخۆش خۆی لە باوەشی ئاسانکارییەکانی شاردا بینییەوە: حەمامی گەرم، جێگەو بانی نەرم و نۆڵ، جل و بەرگی پاك و خاوێن، پیاسەی ناو شار، کە شانۆیەك و باخێکی خۆشی، پڕ ڕاڕەوی لمەڵانی نەرمی، تیا بوو. سەکۆی مۆزیك و ساڤانانی تیا بوو... ئیدی یەکسەر نامەیەکی بۆ کەسوکاری نارد، تا هەم لە وەزع و حاڵی وان بپرسێت و هەم لە وەزع و حاڵی خۆیشی ئاگاداریان بکاتەوە: ئایا دایکیان وەکو بەڵێنی دابوو، پارێزگاری لاقە نەخۆشەکەی دەکات؟ ئاشقێنیەکەی میخائیل گەییە چی؟ پورە فیدوسیاو کوڕەکەی چۆنن؟ ئایا وەکو بە نیاز بوون، لە ٦/١٧/ ۱۸۹۰دا، ساڵانە بۆ نیکولا دەکەن؟ داوای کرد بوو کە ساڵیادێکی باشی بۆبکەن. هەروەها داوای کرد بوو، لە ٦/٢٩ دا ساڵوەگەڕێکی

خانەوادەیی شایستە بە بۆنەی جەژنی لە دایکبوونی باوکیەوە بگێڕن. هەر وەها لە لایکا میزینوڤای شۆخ و شەنگیشی پرسی بوو، بە سوعبەتەوە گوتبووی لەوە دەچێ دڵبەستەی بووبێ، چونکە لەو شەوانەدا خەوی پێوە دیتبوو. ئەمە جگە لەوەی کە لەچاو ژنانی سیبریادا کە "نە دەزانن جل لەبەر بکەن، نە دەزانن گۆرانی بڵێن و نە دەزانن پێبکەنن" "شابانۆیەك بوو لەو گۆڕە" ئەوانە، وەکو لە نامەیەکیا (١٨٩٠/٦/٧) بە دایکی گوتبوو، "وەکو ماسی بەستوو وان، مەگەر پیاو فیلی دەریا، فەقمە بێت، بتوانێ دڵداریان دەگەڵدا بکات."

دوای ئەوەی لە ئیرکوتسکدا عەرەبانەکەی، کە زەدەی هێنا بوو، بە زەرەر فرۆشتەوە، دەگەڵ ئەو سێ ئەفسەرەدا کە بەگەڵی کەوتبوون، سوار بوو. هەر زوو لە هاوڕێیاتیان بێزار بوو، بە ڕاستی خەڵکانێکی نەزان و لەخۆبایی بوون، یان گۆرانیان دەگوت یان پێدەکەنین یان زۆر بە جدی و جۆش و خرۆشەوە گەنگەشەیان لەسەر هەموو بابەتێك دەکرد. تاقە سوکنایی و تەسەلای چیخۆف جوانی دیمەنانی سروشت بوو. کە چاوی بە دەریاچەی بایکال کەوت بە جارێ واقی وڕ بوو، (دەریاچەیەکی داخراو بوو کە پانیەکەی هەشتاو شەش فەرسەخ بوو) لە نامەیەکیا (١٨٩٠/٦/١٣) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "ئاوێنەیە... کەنارەکانی ئەوبەری دیار نیە، بەرزو بەردین و ڕکن، یەکپارچە دارو درەختە. ڕێك لە قرم دەچێت." بەد بەختانە دەبوایە سێ دانە ڕۆژ چاوەڕوان بکات تا بەلەم بێت. چیخۆف لە "عەمارێکی دانەوێڵەدا کە بۆ پێشوازی ڕێبواران ئامادە کرابوو" لایدا بوو، خواردنی بریتی بوو لە قەرەخەرمان و خواردنەوەی بریتی بوو لە ڤۆدگای خراپ، سەرباری گەنگەشەی بێ تامی سێ ئەفسەرەکە، کێچ و مێشوولەش حەوانەوەیان لێ هەڵگرتبوو. لە نامەیەکیا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "خەو، هەر باسی مەکە. هەموو ڕۆژێ چاکەتەکەم بە ڕووە چەرمەکەیا ڕادەخەم، پاڵتۆکەم لوول دەدەم و دەگەڵ بالیفێکی چکۆلەدا دەینەمە ژێر سەرم. ئیدی بە پانتۆڵ و ئێلەکەکەمەوە لەسەر عاردی دەخەوم... شارستانیەت لەکوێیە؟" (بڕوانە هەمان نامەی پێشوو.).

بە سواری کەشتیەکی چکۆلەی سەوڵدار، بەخۆو گالیسکەو ئەسپەکانەوە، کەوتنە بڕینی دەریاچەکە، چیخۆف، خۆی دابوو بەسەر موحەجەرەی بەلەمەکەداو بەواقی وڕەوە دەیڕوانیە ئاوە ساف و زوڵاڵ و پیرۆزەییەکەی دەریاچەی بایکاڵ، ئاوەکە هێندە ساف و ڕوون بوو، بنەبانی دەریاچەکەی لێ دیار بو، کە پڕ بوو لە گابەردو ڕوەکێن سەیر. دوای ئەم سەفەرە دەریاییە کورتە، دیسان هاتنە سەر وشکایی تا چاو بربکات لێڕەوارو جەنگەڵ و دەشت و هەردە بوو، گالیسکەی ئەفسەرەکان، خۆش خۆش دەڕۆیی. لە کاروانسەراکاندا، هەر ئەوەندە ماتەڵ دەبوون تا ئەسپەکانیان دەگۆڕی. عەرەبانچیەکان کە بەخشیشێکی باشیان وەرگرتبوو، بەپەلە، گالیسکەکەیان داژۆ. لە ٦/٢٠دا گەیینە ستریتنسك. سەعاتێك بەرلەوەی کەشتی یەرماك، ئامادەی دەرچوون بێ، گەیینە ئەوێ، ناخۆشترین ڕێگای زەمینی سەفەرەکەیان بڕی بوو. لە نامەیەکیا (١٨٩٠/٦/٢٠) بۆ دایکی، دەڵێت: "خۆزگە، خوا سەفەرێکی وەکو ئەم سەفەرە سەلامەتەی منی بە نسیبی هەمو کەسێك دەکرد! تاقە جارێك نەخۆش نەکەوتووم، لە ناو هەموو ئەو شتانەدا کە دەگەڵ خۆمم هێنا بوون. جگە لە قەلەمبڕێك و قایشێکی جانتاو، شووشەیەك

زەیتی کاربولیك (بۆنبڕە) هیچی ترم لیٚ ون نەبووە... پارەو پوولەکەم بەدەقی خۆیەوە ماوە. کەم کەس بۆی دەلویٚ بەم شیٚوەیە بیٚ هیچ سەریەشەیەك، سەفەریٚکی وا دوورو دریٚژ بکات. بەجۆریٚ خووم بە ڕیٚگاو بانی دووروودریٚژەوە گرتووە، کە بەخۆیشم سەر لە خۆ دەرناکەم. باوەڕ ناکەم کە ئیدی لە نیٚو تارانتاسدا (جۆرە عەرەبانەیەکی تایبەتە..وەرگیٚڕ ) نیم، گویٚم لە زەنگی زەنگۆڵان نیە. کە پالٚ دەکەوم پیٚم سەیرە کە ڕادەکشیٚم، دەتوانم بە کەماڵی ئیسراحەت لاقان ڕاکیٚشم، و تەپو تۆز لە سەرو چاوم نانیشیٚت."

بۆ ئەوەی لە کەشتی یەرماك دا، شویٚنیٚکی تایبەتی بە تەنیا بۆ خۆی بگریٚت، چوو بلیتیٚکی نمرە یەکی کڕی. بە ڕاستی لەو سیٚ ئەفسەرە چەنەبازە بیٚزار بوو بوو، سەدو پەنجا ڕۆبڵیانیش لیٚ قەرز کردبوو، کەم و زۆر باسی دانەوەیان نەدەکرد. بە تاقی تەنیا لە کابینەکەی خۆی دانیشتبوو، بە ئومیٚدی ئەوە بوو چەند وتاریٚك بۆ "ڕۆژگاری نویٚ" بنووسیٚت. بەڵام کەشتیەکە بەجۆریٚ هەڵدەلەرزی و تەکانی دەدا لە تۆ وایە "تووشی لەرزو تا هاتووە." بۆیە ناچار بوو دەستبەداری هەر کاریك بیٚت و ئیدی دانیشت و کەوتە تەمەشاکردنی ئەو دیمەنە جوانە سروشتیانەی کە سووك و ئارام بە بەرچاویا تیٚدەپەڕین. لە نامەیەکیا بۆ پلشچیف، دەڵیٚت: "بە ڕاستی شاریٚکی جوانە، دەتوانریٚ بگوتریٚ شیعری سیبریا لە دەریاچەی بایکاڵەوە دەست پیٚدەکات. ئەوشتانەی پیٚش بایکالٚ هەموو پەخشانە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٦/٢٠).

کاتیٚ کەشتیەکەیان ڕوباری شیلکای بەرەو ڕوباری ئاموور بەجیٚهیٚشت، چیخۆف، هیٚندەی دی کەیفی ساز بوو، گیٚچی زەوقی نمرەیەك بەرز بووەوە. دووربینەکەی نا بەچاویەوەو، چوار چاو دەیڕوانیە کەنارە خۆڕسکەکان و تاقیبی، سەقاقوش و شینەشاهۆو ماسیگرانی دەکرد. کە کەشتی یەکە لەویٚستگەکاندا دەوەستا، چیخۆف دادەبەزی و پیاسەیەکی گوندەکانی بەری ڕووسیاو بەری چینی دەکرد. چونکە دۆزینەوەو کەشفی تازەی زیٚڕو تەڵا، میٚشکی هەموو خەڵکی مژوول کرد بوو، بۆیە هەرکەسیٚکت دەبینی، لە ئاوارەو نەفی کراوان، جووتیاران، و تەنانەت کەشیشانیش، تەنیا بیریان لە گەڕان، لە زیٚڕ دەکردەوە. بە گوتەی چیخۆف، ئەوانەی کە لەم ڕیٚگەیەوە گەیی بوونە سەروەت و سامان، تەنیا شامپانیایان دەخواردەوە و پارەیەکی خەیاڵیان کۆ دەکردەوە، بۆ ئەوەی یەکسەر لە سەر میٚزی قومار بیدۆڕیٚنن. ئەم شویٚنە مەڵبەندی ئازادی تەواو بوو. کەس گویٚی بە ڕۆژانی، ڕۆژوو گرتنی ئاینی ئەرتەدوسکی نە دەدا، ژنان سیخاریان دەکیٚشا، خەڵکی، بیٚئەوەی لە سیخوڕو خەفیٚیان بترسن، هەرچیەکیان بە میٚشك و خەیاڵدا بهاتبایە، بیٚ پەروا دەیانگوت و بە ئاشکرا گەنگەشەی هەموو بابەتیٚکیان دەکرد. هیچ کەشتیوان و بەلەمەوانیٚکی ڕوباری ئاموور، ئامادە نەبوو، بابایەکی زندانی هەڵاتووی سەر کەشتیەکەی خۆی، ڕادەستی دام و دەزگاکانی دەسەڵات بکات. چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین دەڵیٚت: "من ئاشقی ڕوباری ئاموور بووم. خۆزگە دەمتوانی یەك دوو ساڵی دی لەم دەورومەکانە ژیابام. ڕوباریٚکە جوان، بەرین، ئازادو گەرم. سویسراو فەرەنسا هەرگیز ئەم جۆرە ئازادییەیان بەخۆوە نەدیتووە. کام زندانی و دوورخراوەی ئەم دەڤەرە، دەڤەری ئاموور بگریت، لە گەورەترین جەنەڕاڵی ڕووسیا ئازادترە." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٦/٢٧). لە

١٨٩٠/٧/٩دا، پاش ئەوەی دووجار کەشتی گۆڕی لە تەنگەی تاتاریا تێپەڕی، لە دوورەوە، بەوپەڕی شادی و خۆشحاڵییەوە، چاوی بە کەنارەکانی ساخالین کەوت. دوای دوو ڕۆژ، کەشتیەکە لە ئەلکساندروفسکدا، یانی لە پایتەختی کارگێڕی دورگەکەو، ناوەندی زندانەکە، لەنگەری گرت. چیخۆف، یەکسەر لە کەشتیەکە دابەزی، بە ڕێکەوت، هاوکات دەگەڵ دەستەیەك زندانیدا دابەزی. ئیدی لای هاوکارێکی پزیشك شوێنی حەوانەوەی دەستکەوت. دانیشتوانی ئەلکساندروفسك، نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، شارێکی خەمناك، پاك و بێدەنگ بوو. تاقە دەنگی ناو شەقامەکان، زڕەی زنجیری زندانیان بوو کە بۆ بێگار دەبران یان لە بێگار دەهێنرانەوە. ساخالین پێنج گرتووخانەی تیا بوو. کاتێ کە زندانییەك، سزاکەی خۆی تەواو دەکرد، دەبوایە وەکو موهاجیرێك لە دورگەکە بمابایەوە. ئەو ژنانەی کە دووی مێردەکانیان دەکەوتن و بۆ تاراوگەکە دەهاتن، ڕێگەیان دەدرایە لەوێ و لای مێردەکانیان ئاکنجی بن.
جەنەڕاڵ کونونوفیچ، فەرمانداری سوپایی ئالکساندروفسك، کە زۆر بە گەرمی پێشوازی چیخۆفی کرد بوو، ئەو زانیاریانەی بۆ چیخۆف گێڕابووەوە. هەروەها بەڵێنی دابوویە کە لە لێکۆڵینەوەکانیا یارمەتی بدات و دۆسیەکانی زندانی ناوەندی بخاتە بەر دەستی. هەروەها بارونکوف فەرمانداری گشتی دەڤەری ئاموور، ڕێگەی چیخۆفی دا، بە کەماڵی ئازادی سەرانسەری دەڤەرەکە بگەڕێ و تەمەشای دیکومێنتە فەرمیەکان بکات و جگە لە زندانیانی سیاسی، پرس و جۆو گفتوگۆ دەگەڵ هەر کەس و هەر زندانیەکی دیکەدا بکات. جەنەڕاڵ، کە زۆر بەخۆی دەنازی گوایە بە میهرەبانی ڕەفتاری دەگەڵ، خۆی گوتەنی ئەو خەڵکە "بەدبەخت و بێ نەوایەدا" دەکرد و ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە ژیانی زندانیان لە ساخالیندا لە "هەر شوێنێکی دیکەی ڕووسیا و تەنانەت ئەوروپاش ئاسانترو باشترە. کەس نیە هیوای بەوە نەبێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان مافی تەواوی خۆی وەربگرێتەوە. شتێك لەوێ نیە بە ناوی حوکمی ئەبەدی. حوکمی ئەبەدی و بێگارە زندان لە بیست ساڵ تێناپەڕێ، بێگارەکەشیان قورس نیە." (بڕوانە دورگەی ساخالین، فەسڵی دووەم. بە ڕووسی).
چیخۆف وێڕای ئەو قسانەش کە بەوپەڕی گەشبینیەوە بۆی دەکراو بۆی دەگێڕایەوە، هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی، زۆر بە وردی وەکو زانایەك نەك وەکو گەڕیدەیەك تاقیب و پرس و جۆی خۆی بکات. جا لە هەوەڵەوە هەستا چەند پرسیارێکی لەسەر کارتێك، لە چاپخانەی زنداندا چاپ کرد، تا بە بیانووی سەرژمێری زندانیەکانەوە و لە ڕێگەی ئەم کارتەوە تەماس دەگەڵ هەموو زندانیەکاندا، تەنانەت دەگەڵ بە ئەزموونترین زندانیشدا بگرێت. ئەم کارتە سیازدە خاڵی لە خۆگرتبوو. دوای ئەوە یەکسەر، بە تەنیا و بێ کۆمەکی هیچ کەسێك دەست بە کاربوو. بەیانیان سەعات پێنج هەڵدەستا، بە تەنیا یان دەگەڵ پاسەوانێکی چەکدار، سەری هەموو کوختەو کەپروماڵەدارینەکانی دەدا، هەروەها سەری زندانەکانیشی دەدا. خۆی بەکانەکاندا دەکرد، گفتو و گۆی دەگەڵ خەڵکانی نیمچە کێوی، بێ سیواتا دەکرد، کە بێئەوەی لێی تێبگەن زەق زەق تەمەشایان دەکرد. پرسیاری لە پیاوکوژانی نیگا گومناوی، لە دزانی ڕوح سووك و سڵۆك، لە پیاوانی ساویلکەی پێ بەکۆت و زنجیرە دەکرد. چیخۆف بە زمانی شیرین و نەرم بە ڕاستگۆیی و

ڕاشکاوی خۆی لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا، متمانەی بەدەست دەهێنان و وەکو دۆست و ئاشنایەك قسەیان دەگەڵ دەکرد و وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە. بەو جۆرە نزیکەی دە هەزار کارتی بە دەستی خۆی پڕکردەوە (هەموو ئەو کارتانە ئێستاش لە کتێبخانەی لینیندا، لە مۆسکۆ پارێزراون). بە ڕاستی ئەم تاقیب و تاقیبکاریە، زۆریان ماندوو کرد، چاوانی هەڵنەدەهاتن ناو بە ناو ژانە سەرێکی توند دەیگرت وێڕای ئەوەش هیچ ئیسراحەتێکی بەخۆی نەدەدا. تا زیاتر دەچووە بنج و بناوانی لێکۆڵینەوەکانیەوە، زیاتر بۆی دەردەکەوت کە ساخالین، بە پێچەوانەی قسەکانی بارون کروفەوە، مەڵبەندی ستەمکاری و درۆیە.

کونونوفیچی فەرماندار، کە بە قسە دژمنی سەرسەختی ئەشکەنجەی بەدەنی بوو، کەچی "ڕۆژ نەبوو لە دووری دوو سەد سێ سەد مەتریماڵەکەیەوە، شەلاقکاری ئەنجام نەدرێ" باشە ماقووڵە ئاگاداری ئەوە نەبووبێ؟

هەندێ لە زندانیەکان، کە دەبران بۆ بێگار لە کانەکاندا، بە عەرەبانە دەستیەکانەوە دەبەسترانەوەو دەبوایە بەسکەخشکێ کار بکەن. خەستەخانەی ئەلکساندروفسك، هیچ دەرمانێکی تیا نەبوو. نەخۆشان یان لە سەر تەختەدار یان لەسەر عاردی دەخەوتن، زندانیان بۆیان نەبوو بچنە کڵێسا. دیارە پاسەوانان و زندانە وانەکان، زۆر ستەمکارانە مامەڵەیان دەگەڵ زندانیەکاندا دەکرد، بەرپرسانی زیندان هەموو ماف و دەسەڵاتێکیان هەبوو، بەڵام زندانیەکان هیچ مافێکیان نەبوو. ئیدی بەمجۆرە، ئەو زندانییانە لە ماوەیەکی کەمدا، هەموو ئابڕوو کەرامەتێکی مرۆڤانیان لەدەست دەدا. دزییان لە یەکدی دەکرد، مەرایی پاسەوانە زاڵمەکانیان دەکرد، زمانیان لە یەکتر دەدا، ڤۆدگایان دەخواردەوەو مەست دەبوون، شەوان لە بەر ڕووناکی مۆمدا قوماریان دەکرد. چیخۆف لە فەسڵی بیست و یەکەمی کتێبی "دورگەی ساخالین"دا دەڵێت: "قومار، وەکو نەخۆشیەکی گیرۆ (پەتا) هەموو زندانیەکانی گرتبوو. زندانەکان بوو بوون بە قومار خانەێن گەورە، هەروەها هەموو موهاجیرنشینەکان و مەخفەرو سەربازگەکانیش تووشی ئەم پەتایە بوو بوون."

چیخۆف، کە حەزی دەکرد، قوڕی بنی دۆزەخی ساخالین دەربێنێ، داوای کرد، کە ڕێی بدەن لە نۆرە شەلاخکارییەکدا ئامادە ببێ. ڕێگەدرا، بە ترسێکی یەجگار زۆرەوە، دەیڕوانیە ئەو پزیشکەی کە معایەنەی تاوانبارێکی دەکرد، تا بزانێ و بڕیار بدات کە ئاخۆ یارۆی تاوانبار، کە نەوەد شەلاخی بۆ بڕا بووەوە، بەرگەی ئەو نەوەد جەڵدەیە دەگرێت یان نا. هاو زندانیانی یارۆی تاوانبار، بە کونجکاویەکی سادیانەوە، لە ئەشکەنجەگاکەدا کۆدەبوونەوە، یاریدەدەرانی جەلادەکە، بە کاوەخۆو بەپێی ڕەوشی باو، بە تەختی ئەشکەنجەدانیانەوە دەبەستەوە. ئیدی چیخۆف دەی بینی کە کابرای جەلاد، چەند بە خوێنساردی، جەڵدەکانی دەژماردو گوێی لە هاواری یارۆی تاوانبار دەگرت و بە چاوی خۆی دەی بینی کە چۆن جەستەی ڕووتی بەدەم شەلاخانەوە هەڵدەپلاو دەبوو بە تۆپەڵە گۆشتێکی هەڵماسیاو.

چیخۆف لەو بارەیەوە دەنووسێت: "کابرای ئەشکەنجەچی، لە لایەکەوە دەوەستا، بەجۆرێ قامچیەکەی دەوەشان، کە پانەو پان جەستەی یارۆی تاوانبار بگرێتەوە. دوای هەر پێنج

جەڵدەیەك، بە كاوەخۆ، شوێنەكەی دەگۆڕی، دەهاتە ئەم دیوی یارۆی تاوانبار، مۆڵەتی نیو دەقیقەیەكی بە قوربانیەكەی بەردەستی دەدا، كە نەفەسێك تازە بكاتەوە. دوای پێنج شەش جەڵدە، ئازای بەدەنی شیدەبووەوە، شین و مۆر، هەڵدەگەڕا، لە گەڵ هەر جەڵدەیەكی تازەدا توێژاڵێك لە پێستی بەدەنی دەبووەوە، ئەوجا بەدەم هاواری ئازارەوە دەپاڕایەوە: " قوربان گیان تۆبە، قوربان گیان، پایە بەرز ڕەحمێ بە حاڵم بكەن!" دوای بیست سی جەڵدە، دەستی بە گریەو زاری كرد لە تۆ وایە سەرخۆشە، وڕێنە دەكات: "من بەدبەختم، ماڵ وێرانم... بۆچی وام لێدەكەن؟ من بێ تاوانم." لەپڕ گەردنی یارۆی قوربانی، بە شێوەیەكی نا ئاسایی درێژ بووەوە لە پڕ دەنگی قوڵپی ڕشانەوە بەرز دەبووەوە. ئیدی هیچی نە دەگوت، تەنیا بەدەم لرخە لرخەوە دەیناڵاند.."

چیخۆف، خەمبارو دڵتەنگ، زۆر پێش ئەوەی سزایەكە تەواو ببێ، بە هەڵاتن لەوێندەر هەڵدێ و خۆی دەگەیەنێتە سەر جادەكە. لەو دوورەشەوە، دەنگی یارۆی ئەشكەنجەچی كە جەڵدەكانی دەژمارد لە گوێیدا، دەزرینگایەوە: "بیست و چوار... بیست و پێنج..." پاشا ن لەنامەیەكیا (١٨٩٠/٩/١١) بۆ سوڤۆرین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "تا سێ چوار شەو لەوە دواش خەوم بە یارۆی ئەشكەنجەچی و تەختە قێزەونەكەی ئەشكەنجەدانەكەوە دەبینی."

جۆرە ئەشكەنجەیەكی ئەهوەنترو نادیاتر هەبوو، كە چیخۆف لێی بوو بوو بە مەراق. ئەویش مەسەلەی ژیانی ساخالین بوو، ئەو ژنانەی كە یا بەخۆیان زندانی بوون، (كە ڕێژەیان كەمێك لە سەدا دەی تێكڕای زندانییەكان پتر بوو) یان دوای مێردە زندانییەكانیان كەوتبوون و لە ساخالین گیرسابوونەوە. هەردوو گروپەكە، بۆ گوزەرانی ژیان و بژێوی، پەنایان وەبەر لەشفرۆشی دەبرد. زندانەوان و پاسەوانەكان، گەنجترین و جوانترین ژنانیان بۆ خۆ هەڵدەبژارد و ئەوانی تریان بۆ زندانییەكان بەجێ دەهێشت. دایكان، كیژانی خۆیان بە دانیشتوانی دەوڵەمەند یان بە گەڕیدەو گەشتیاران دەفرۆشت، هەڵبەتە ئەمە بۆ ئەوان و لای ئەوان كارێكی ئاسایی بوو. چیخۆف لە فەسڵی بیست و یەكی كتێبی دوڕگەی ساخالین دا، لەمبارەیەوە دەڵێت: "چونكە داواكارییان لە سەر زۆر بوو، ئیدی نە پیری نە ناشرینی و تەنانەت سوزەنەكی زۆر خەتەر و نە منداڵیەتی، ڕێگەیان لە كاری درێوی لەشفرۆشی نەدەگرت. دەرفەتێكم بۆ هەڵكەوت كە لە یەكێك لە جادەكانی ئەلكساندروفسكدا كیژێكی شازدە ساڵان ببینم، وەكو بۆیان گێڕابوومەوە، ئەم كیژە لە تەمەنی نۆ ساڵییەوە، دەستی دابووە لەشفرۆشی... هەروەها بۆیان گێڕامەوە، كە لە دەوروبەری ئەلكساندروفسك، ژنێكی ئازاد هەبوو، جندەخانەیەكی كردبووەوە كە تەنیا كیژەكانی خۆی تیا بەكرێ دەدا..."

زۆربەی منداڵانی دوڕگەكە، لەڕو لاواز، سەگەردان و نە خوێنەوار، و جل و بەرگ شڕۆڵەو كەچڕەو بوون. زۆربەیان ئەسڵ و فەسڵی خۆیان نەدەزانی. ڕۆژێ چیخۆف، بە ڕێكەوت، بێ هیچ مەبەستێك خۆی بە كوختەیەكی داریندا دەكات، لەوێ چاوی بە كوڕیژگەیەكی دە دوازدە ساڵان دەكەوێ، پێ پەتی، دەموچاو زیپكاوی، شان خوار وەكو ئەوەی بیەوێ خۆی لە جەزرەبەیەك

بپارێزێ. چیخۆف بۆ ئەوەی غافڵگیری نەکات، ناوی باوکی لێدەپرسێت. کوریژگەکە بەرسڤی دەداتەوە:

– نازانم.

– چۆن؟ یانی دەگەڵ بابتا دەژیت و ناوی نازانی؟ شەرمە!

– ئاخر باوکی ڕاستەقینەی من نیە.

– مەبەستت چیە؟

– نەخێر، تەنیا ماشوقی دایکمە.

– دایکت بە مێردە یان بێوەژنە ؟

– بێوەژنە. بە هۆی مێردەکەیەوە ڕێی کەوتووەتە ئێرە

– یانی چی، بە هۆی مێردەکەیەوە؟

– کوشتویەتی، مێردەکەی خۆی کوشتووە.

– بابی خۆت لەبیرە ؟

– نەخێر، من حەرامزادەم. دایکم لە زندانی کارادا منی بووە."(بڕوانە دوڕگەی ساخالین، فەسڵی بیست و دوو).

چیخۆف. لە ١٨٩٠/٩/١١دا لە سەر ڕێگای خۆیەوە و لە کۆتایی سەفەرەکەیدا، سەرێکی باشووری دوڕگەکە دەدات و، هەر ئەو ڕۆژە نامەیەك بۆ سۆڤورین دەنێرێ و پێی ڕادەگەیەنێ کە زۆر لە ئەنجامی سەفەرو لێکۆڵینەوەکانی ڕازی و خۆشحاڵەو بە شانازییەوە دەڵێت: "هیچ زندانیەك، یان ئاکنجییەك لە ساخالیندا نیە کە قسەی دەگەڵ مندا نەکردبێت." لە سەری دەڕوات و دەڵێت: "کەبیر لەوە دەکەمەوە دە هەزار فەرسەخ لە دنیاوە دوورم، بەجارێ ورە بەردەدەم و وا هەست دەکەم سەد ساڵم دەوێ تا بگەمەوە ماڵێ" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/٩/١١). لە نامەیەکی ترا، باسی هەمان ماندوویەتی و ڕەشبینی و نائومێدی بۆ دایکی دەکات و دەڵێت: "بیرت دەکەم، بە ڕاستی ماندووم، لە ساخالین بێزار بووم. سی دانە مانگە جگە لە زندانییان، یان خەڵکانێك کە سەری زمان و بنی زمانیان باسی زندان و بێگارو جەڵدە و مەینەتیە، کەسی ترم نەدیتوە. بە ڕاستی ژیانێکی تاریك و مەینەتبارە." ( بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٠/١٠/٦) ئەنجام کاتی گەڕانەوە هات، چیخۆف لە ١٨٩٠/١٠/١٢ دا سواری کەشتی پترسبۆرگ بوو، کە بەدەوری کەنارەکانی ئاسیادا دەسوڕایەوە و بەرەو ئودیسای دەبردەوە . سەفەری گەڕانەوەی نزیکەی دوو هەیڤی خایاند، بەڵام لەچاو سەفەرەکەی ناو سیبریادا، سیاحەتێکی خۆش بوو لە کوت و پڕێکا هات بە سەریا کە لە ڕێگای ویلایەتە یەگکرتووەکانەوە، بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە، بەڵام پاشان لەبەر گرانی کرێی ڕێگاوبان لەو بیرۆکەیە ژێوان بووەوە. لە ڕێگەی ژاپۆنیشەوە نەرۆیی، چونکە نەخۆشی کولێرای تیا بڵاو بوو بووەوە. هۆنگکۆنگ و کەنداوە بە شکۆکەی زۆر لەلا جوان و خۆش بوو، بەڵام کاتێ لە هاوسەفەرەکانی بیست کە گوایە ئینگلیزەکان، خەڵکی شارەکە دەچەوسێننەوە، زۆر پەست و نیگەران بوو. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (١٨٩٠/ك٢/٩) دەڵێت: "لە دڵی خۆدا بیرم دەکردەوە، ڕاستە ئینگلیز، چینیان و هندوان دەچەوسێننەوە، بەڵام لە هەقی

ئـەوەدا ڕێگـاو بانیـان بـۆ دروسـت دەکـەن کـە نـاڵی ئاویـان بـۆ دەکەنـەوە، مۆزەخانـەیان بـۆ دادەمـەزرێنن، کـەلتووری مەسـیحییەتیان بـۆ دێنن. خـۆ ئێمـەش دەیـان چەوسێنینەوە، ئەدی لـە هەقی ئەوەدا چییان دەدەینێ؟" هاتوچۆی کەشتیە چینییەکانی لـە بەندەرەکـەوە بۆ بەندەرەکە زۆر بەلاوە جوان بوو. ئەو پاس و قیتارانەی لا جوان بوون کە بە قەد پاڵی کێوەکاندا هەڵدەگەڕان، ماوەیـەك سـواری ڕیکشا بـوو (ڕیکشـا جـۆرە کەڕاوەیـەکی هندییـە، کـە بەشـەر ڕای دەکێشـێت) هەڵبەتە پێی شـەرم بوو"، "سـواری کەڕاوەیـەك بـێ کـە بەشـەری هاوڕەگـەزی خـۆی ڕایکێشـێت." ئیدی بڕێك توحفەو وردەواڵـەی چینی کڕی. دوای ئـەوەی هونگکونگیـان بەجێهێشـت، کەشتی پترسبۆرگ تووشـی گـەرداوێکی ئـەوتۆ بـوو، کـەس بـاوەی نـەدەکرد بـە سـەلامەتی دەربـاز ببـێ. کاپتنی کەشتیەکە، چیخۆڤ ئامۆژگاری کرد کە دەمانچەکەی بەدەستەوە بگرێت، بۆ ئەوەی ئەگەر کەشـتیەکە نقـووم بـوو خـۆی بکوژێـت، چـونکە ئاوەکـە پـڕ بـوو لـە کۆسەماسـی "قـرش" بـەڵام کەشتیەکە، کە جیڕە جیڕو تەقە تەقی پـێ کەوتبوو، بە تەکانێکی پـەرجوو ئاسا، بـە سـەلامەتی لـە گەرداوەکـە دەربـاز بـوو و درێـژەی بـە ڕێـی خـۆی دا. چـیخۆف زۆر بـەخۆی دەنـازی کـە تەنانـەت تووشـــی ســـەرەگێژەکەی دەریـــاییش نـــە بـــوو بـــوو. بـــەڵام کـــە بـــینی جەنـــدەکی دووان لـــە هاوسەفەرەکانیان، کە مرد بوون، هەڵدایـە دەریاکـەوە، زۆر خـەمبار بـوو، هەسـتی کـرد، دڵـی تێـك هەڵـدێت. هـەر لـە هـەمان نامـەدا بـۆ سـوڤۆرین، لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: "کـاتێ دەبـینی چـۆن جەنازەیەکی لە قوماشەوە پێچراو، سەرەو خوار، بە شێوەیەکی بازنـەیی بۆنـاو ئاوەکـە دادەکشـێ و، سوور دەزانی قووڵی ئاوەکە لە چەند فەرسەخێك کەمتر نیە، ترسـێکی سـەیرت لێدەنیشـێت و، وا خـەیاڵ دەکەی، تۆش لە ئاسـتانەی مەرگدایت و تـۆش فـڕێ دەدەنـە دەریاکـەوە" ئـەم ڕووداوە، خەیاڵی دەبزوێنێ و کورتە چیرۆکێك بە ناونیشانی "گوسیف" دەنووسێت. قارەمـانی چیرۆکەکە لـە دەریـادا دەمرێـت و لەسـەر کەشـتیەکەوە، هـەڵی دەدەنـە دەریـاوەو کـە دەکەوێتـە ئاوەکـەوە، یەکسەر کۆسەماسییەك "قرش"ی دڕ دەرفەت دێنێ و پەلاماری دەدا.

هەرچەند چیخۆف، سەنگافورەی زۆر لا خـەمناك و نـاخۆش بـوو، بـەڵام سیلانی بـە بـە هەشـتی سەر ڕووی زەوی دەهاتە بەرچاو و دڵی پێدەکرایەوە، دەیگـوت دارخورما و فیل و مـاری کـوبرای زۆر زۆرە، سیحر بازانی هندو کاری پەرجوو ئاسا دەنوێنن، لە هەموو ئەمانە زیاتر ژنـانی جـوانی ڕەشـتاڵەی لێـو بـەبزەی ڕاز ئـامێزی زۆرە. لـە نامەیـەکیا ١٨٩٠/١٢/٩/ ئـەم ڕازە بـۆ سـوڤۆرین دەدرکێنێ و دەڵێت: "کـە منـداڵم بـن، بـێ هـیچ خـۆ هەڵکێشـانێك پێیـان دەڵـێم، سـەگبابینە، مـن ڕۆژێ لە ڕۆژان، دەگەڵ کیژە هندویەکی چاو ڕەشدا، پەیوەندیەکم بووە، لە کوێ؟ لە دارسـتانێکی گوێز هندیدا، لە شەوێکی هەیڤە شـەودا." کـە بەکـەش و فشـەوە، ئـەو ئەشـقبازیە ڕەوتەنیـەی بـۆ ئەلکساندرش گێڕابووەوە، ئەلکساندر بەرسڤی دەداتەوە: "سەلام لە هاوسەرە گوم ناوەکەت، لـەو منداڵانەی لەم سەفەرەی دەوری دنیادا، خستوونتەوە! وا تەسـەور دەکـەم هەنووکـە لـە شـوێنێکی سـیلاندا نەوەیـەکی چـکۆلەی ماڵبـاتی چـیخۆف، دەسـوڕێتەوە." چـونکە نـاتوانێ ئـەم دلبـەرە سیلانیە دەگەڵ خۆیدا بێنێ، لە پڕ بیرۆکەیەکی دێت بە مێشکاو سێ سمۆرە دەکرێت و بە نیـازی ئەوەی دەگەڵ کەش و هەوای ڕووسیادا ڕایان بێنێ، دەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێ.

دوای ئەوەی لە سیلان وەڕێکەوت، سیازدە ڕۆژی تەواو، بێ وەستان لە کەشتیدا بوو. ئەم سیازدە ڕۆژەی بە سەدەیەك لێڕۆیی. تاقە دڵخۆشی ئەو ئەوە بوو، کە لە دەریاداو شان بەشانی کەشتیەکە و بە بەرچاوی شاگردو کەشتیوانەکانەوە مەلە بکات، هەڵبەتە دیمەنی چیای سیناو قەستەنتینەی زۆر بەلاوە جوان و دڵگیر بوو، بەڵام چونکە دەمێ بوو لە سەفەردا بوو و زۆر شوێن گەڕا بوو، بە دڵ و بە گیان بیری ڕووسیای دەکردو خوا خوای بوو ڕۆژێ زوتر بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە.

ئەنجام لە ١/ك١/١٨٩٠دا، گەییە شاری ئۆدیساو بە خاکی ڕووسیا شاوشکور بووەوە. پێشووەختە بروسکەی بۆ کەس و کارەکەی نارد بوو، بۆیە یەکسەر بەرەو مۆسکۆ سواری قیتار بوو، دایکی و میخائیلی برای بە مەبەستی پێشوازی هاتبوون بۆ تولا. لە خوارنگەی وێستگەکەدا، دەگەڵ هەندێ لە هاوسەفەرەکانیا، دۆزیانەوە. کۆمەڵێك خەڵکی فزوڵ بەدەوریانەوە وەستا بوون و تەمەشای سمۆرەکانیان دەکرد، کە لەسەر مێزەکەی ئانتون و دەگەڵ ویدا خواردنیان دەخوارد. دوای چاکو خۆشی و دەسومۆچ و، ڕشتنی فرمێسکی شادی، ماڵباتی چیخۆف بەرەو مۆسکۆ، کە مەسافەیەکی کەمی مابوو، سواری قیتار بوون و وەڕێکەوتن، کە گەیینە مۆسکۆ لە جیاتی بەرەو شەقامی سادوڤایا – کوردنسکایا بڕۆن، بەرەو شەقامی مالایا – دمتروڤکا ڕۆیشتن، تومەز لە پایزی ئەو ساڵەدا، لەبەر بێ پارەیی، بۆ شوێنێکی تازە باریان کرد بوو.

چیخۆف، دوای گەشت و گەڕانێکی حەوت مانگەی پڕ زەحمەت، زۆر خۆشحاڵ بوو، کە جارێکی دی خۆی لە نێو کەسوکارو دۆستان و کتێبەکانیدا دەبینییەوە. ئەوەتا لە نامەیەکیا (٩/ك١/١٨٩٠) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "ئۆخەی، وا جارێکی دی هاتمەوە ئێرە، لەپشت مێزەکەمەوە دانیشتووم و شوکرانە بژێرو دوعا گۆ، ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم. لە ناخی دڵەوە هەست بەخۆشی و شادمانی دەکەم، خۆشی و شادیەك وەکو ئەوەی قەت لەم ماڵە دەرنەچووبم و، باری تەندروستیم یەجگار باشە." خۆشی و شادییەکەی، زیاتر لەو ڕووەوە بوو کە گوایە بە پەیامێکەوە، بۆ هاووڵاتیانی گەڕابووەوە. ئەو چیخۆفەی کە جاران دەیگوت نووسەر نابێ ئامۆژگاری خەڵکی بکات و وەعزیان دابدات، لەپڕ بە پەیامێکەوە گەڕایەوە، خواخوای بوو بە زووترین کات بیگەیەنێ و لە کۆڵی خۆی بکاتەوە. ئەوەتا پەیتا پەیتا دەڵێت: "دنیا جوانە، تەنیا یەك عەیبی هەیە، ئەو عەیبەش لە خۆمانە، لە ئێمەی بەشەردایە، خۆمان خراپین." ئەو بەڵگەنامانەی لەسەر ساخالین گردو کۆی کردبوونەوە هێندە زۆر بوون، هەموو جارێ بە گاڵتەو شۆخیەوە دەیگوت هەر کیژێك بتوانێ ئەو کاغەزو بەڵگەنامانەی بۆ ڕێك بخات و پۆلێنیان بکات. ئامادەیە زەماوەندی دەگەڵ بکات. پاش ئەو سەفەرەو دیتنی دنیا، گاڵتەی بەو گەنگەشەو مشت و مڕە ئەدەبیانە دەهات کە دەکران. لە نامەیەکیا (١٧/ك١/١٨٩٠) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "بەر لە سەفەرەکەم، سوناتای کروتیزەرم" بە ڕووداوێکی گرینگ دەزانی، بەڵام ئێستا گاڵتەم پێی دێت. یا ئەم سەفەرە ئاقڵ و پوختەی کردووم، یان شێتی کردووم."

حەزی دەکرد، بە زووترین کات، دەست بە نووسین و ئامادە کردنی ڕیپۆرتاژەکەی، دەربارەی ساخالین بکات (پەردە لەسەر ناڕەوایی پێشێلکاریەکانی ئیدارەی زندانەکان، ڕەفتاری نامرۆڤانەیان دەگەڵ زندانەکاندا، وەزع و حاڵی نالەباری ژنان و منداڵان هەڵماڵێ." بەڵام سوکنا تازەکەی بۆ ئەم کارە لەبار نەبوو. بریتی بوو لە خانوویەکی چکۆلەی حەوشەداری پڕ هەراو هەنگامە، کە قەت لە خێڵی دۆستان و ڕۆژنامەوانان و فزولڵ وکونجکاوان چۆڵ نەدەبوو، لە هەموو ئەمانەش خراتر سمۆرەکان بوو، تەواو هار بوو بوون، شەڕیان بەسەگ و پشیلەکان دەفرۆشت. چونکە ماری کۆبرایان دەست نەدەکەوت بیخۆن، ئیدی بە تەبیعەت دەکەوتنە دزین و خواردنی پێڵاو، جل و بەرگ. خۆراك، مەرەکەب و گوڵدان، دەستکێش، شەپقەو کەرەستەی ئارایشتی ژنان. چیخۆف لە نامەیەکیا (١٠/ك١/١٨٩٠) بۆ لیونتیف شچگلوف، دەڵێت: "ئەم حەیوانانە بە ئەندازەی پشیلەیەکی چکۆلە دەبن، زۆر ڕووخۆش و زیتەڵن... کە کەسێك دەبینن، یەکسەر پێیا هەڵدەگەڕێن و گیرفانەکانی دەپشکنن تا بزانن چی تیایە، کە بە تەنیا لە ماڵەوە بەجێیان بێڵی، دەکەونە شین و گریان." ئیدی هەراسیان لە ماڵەوە هەڵگرت، بۆیە چیخۆف، هەستا دوو دانەیانی دا بەباخی گیانداارانی مۆسکۆ، بەڵام وێڕای ئەوەش نەی دەپەرژایە سەر بەخێوکردنی ئەو دانەیەی تریان، ڕەوشی دارایی خانەوادەکەیان زۆر خراپ بوو، بۆیە ناچار بە پەلەپرۆزێ دەستی بە پاکنووسکردن و داڕشتنەوەی چیرۆکی "گوسیف"کرد کە لە ماوەی سەفەرەکەیا نووسی بووی، تا بۆ ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نوێ)ی بنێرێت. پاشان، وازی لە ڕیپۆرتاژەکەی لەمەڕ ساخالین، هێناو یەکسەر کەوتە نووسینی چیرۆکێکی درێژ لە ژێر سەرناڤی "دوئێل". لە نامەیەکیا (٢٤/ك١/١٨٩٠) بۆ سوڤورین دەڵێت: "کاری دابینکردنی بژێوی ڕۆژانە، دەرفەتم نادات دەست بە ڕیپۆرتاژەکەی لەمەڕ ساخالین بکەم." لەم وردە خەم و مەشغەڵاتانەش بترازێت، خەمێکی گەورەتریشی هەبوو، کە خەمی خراپی باری تەندروستی خۆی بوو. هەرکە گەییەوە مۆسکۆ، تووشی ژانە سەرو، نۆرە کۆکەو دڵەکوتێ بوو. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین دەڵێت: "مەگەر شەیتان سەر لە دەردم دەربکات، دڵم دەوەستێ، هەر سانا ساتێ بۆ ماوەی چەند چرکەیەك دەوەستێ ئەوجا لێدەدات." (بڕوانا نامەی بە ڕواری ٢٤/ك١/١٨٩٠).

میزاجی تەواو تێکچوو بوو، میوانی ناوەخت و دۆستەکانی شەکەت و بێزاریان دەکرد. تەنانەت لە میخائیلی برایشی کە تازە بەرز کرابووەوە بۆ فەرمانبەری نمرە شەش و بەجل و بەرگی فەرمیەوە، بە کەش و فشەوە دەهات و دەچوو، بێزار بوو. لەوەش قەڵەس بوو کە دایك و باوکی، زۆر بەو سەرکەوتنە ئیداریە بچووکەوە دەنازین.

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٩١وە، دیسان کەڵکەڵەی سەفەری کەوتەوە سەر. ئەوەبوو لە ٨/ك٢/١٨٩١ دا خۆی گەیاندە پترسبۆرگ و لای سوڤورین هەواری خست. تە نانەت لەوێش نەیان دەهێشت بحەوێتەوە، خەڵکانێك دەهاتن و هەواڵی سەفەرەکەیان لێدەپرسی کە نەیدەناسین. لە نامەیەکیا (١٦/ك٢/١٨٩١) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "کار دەکەم، بەڵام بە زەحمەتێکی زۆر، کە دەست دەدەمە قەڵەم و تا دێڕێك دەنووسم، لە دەرگا دەدرێ، کاتێ دەزانی یەکێ خۆی بە ژوورا دەکات، تا باسی ساخالینم دەگەڵ بکات. بە ڕاستی نەگبەتیە." بە خۆیشی

لەم کۆڕەوە بۆ ئەو زیافەت دەڕۆیی، دەربارەی ماندوویەتی خۆی دەڵێت: "بە قەد سەماکارێکی بالیٚ کە لەپێنج پەردەو هەشت تابلۆدا بەشداری کردبێت، ماندووم." کە ئەو هەموو دەعوەت و دەعوەتکاریەشی قەبووڵ دەکرد تەنیا بۆ ئەوە بوو دەیویست ڕایەکی گشتی گەڵاڵە بکات کە هاوسۆزیەك دەگەڵ منداڵانی ساخالیندا بکەن، ئومێدی ئەوەی هەبوو، کە بۆ نموونە خانەخوێیەکانی، بەلای کەمەوە کتێبی دەرس بۆ منداڵانی کلۆڵی زندانیان فەراهەم بکەن و بۆ ساخالینی بنێرن. وێڕای سڵکردنەوە و دوودڵی لە دەسەڵاتی گشتی، توانی نزیکەی دوو هەزار کتێب کۆبکاتەوە و هەر هەمووی لە سەندوقاندا بۆ منداڵانی نەخوێندەواری ئەوپەڕی دنیا بنێرێت. ئەگەر ئەم سەفەرەی چیخۆف بۆ ساخالین، لای دڵبەندانی چیخۆف بە نمونەی شەهامەت و لەخۆبردەیی دەزانرا، ئەوا بەلای هەندێ لەو نووسەرو ڕۆژنامەوانانەی کە بە هەڤڕکی خۆیان دەزانی، مایەی پێکەنین و تەوس و توانج بوو. لە بەینی خۆیاندا تەشەری ئەوەیان لێدەدا کە بەچاو لێکەری دۆستوفسکی سەری زندان و حەپسخانەکانی داوەو بەوە تۆمەتباریان دەکرد کە ویستویەتی لەسەر حیسابی زندانییەکان بانگەشە بۆ خۆی بکات و ناوبانگ پەیدا بکات. چیخۆف هەر لە هەوەڵ ڕۆژانی چوونیەوە بۆ پایتەخت، هەستی بەم ڕقە کردو دەیزانی هەرچەند بە ڕواڵەت، بە ڕووخۆشی پیرۆزباییان لێدەکرد، لیٚ لە دڵەوە بەغیلی و حەسوودیان پێدەبرد. ئەوەتا لە نامەیەکیا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "خەڵکی زیافەتم بۆ دەکەن، ئێوارە خوانم بۆ دەڕازێننەوە، بە شان و باڵمدا هەڵدەدەن، بەڵام وێڕای ئەوەش ئامادەن هەم گۆشتم بخۆن و هەم ئێسقانم بشکێنن. بۆچی؟ خوا بمگریٚ ئەگەر بزانم بۆچی! باوەڕ بکە ئەگەر گوللەیەك بنەم بە تەپڵی سەری خۆمەوە، لە سەدا نەوەدی برادەرو دڵبەندەکانم لە خۆشیا خەنی دەبن." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٤/ك٢/١٨٩١).

بە تایبەتی لە وتارێك پەست بوو کە ڕەخنەگری ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نوی) بورنین، نووسی بووی کە چیخۆڤ دەگەڵ کورولینکۆ و ئۆسپنسکیدا پۆلێن کرد بوو و بە نووسەرانێکی دانابوون کە لە"ئاستانەی وشك کردندان." بورنین لە سەری ڕۆیی بوو: "بە هەرەێن مامناوەندی وەکو بەهرەی چیخۆف، خۆ لە دیتنی ڕاستەوخۆی ژیان و ژینگەی دەوروبەری خۆ دەدزنەوەو دەڕۆن بۆ شوێنانی مەگەر هەر خوا بزانیٚ کوێیە، بۆ سیبریایە بۆ ئەودیوی سیبریایە، بۆ فلادیفوستوکە، بۆ ساخالینە." ئیدی زوو بە زوو ئەو قسەیەی کە گوایە سەرچاوەی خەیاڵی وشکی کردووەو نووسەر بۆ بابەتی تازە دۆش داماوە، دەگوترا و دەگوترایەوەو تەنانەت چوونەکەشی بۆ ساخالین، بەوە لێکدەدرایەوە کە سەرچاوەی خەیاڵی وشکی کردووەو بێهوودە ویستوویەتی بابەتی تازە بە دەست بێنیٚ و بەهرەکەی دەمەزەرد بکاتەوە. دەنگۆیەکی دیکەش کە دەماو دەمی دەکرد ئەوە بوو کە هەموو سەرکەوتن و ناوبانگێکی چیخۆف، بە هۆی سەرنووسەرە میلیۆنێرەکەی ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نویٚ)وە بووە. ئیدی لیونتیف – شچگلوف، لە یاداشتەکانی خۆیدا ئەو بۆچوونەی، کە ڕەئی و بۆچوونی هەندیٚ هاوڕێی گەنجی بەد نیهادە بەم شێوەیە تۆمار کردووە: "چیخۆف سویتلی سوڤورینە.".

دیاره ئەم قسەو قسەڵۆك و دەنگۆیانە زەرەیەك چیخۆفیان لە دۆستایەتی و رێزو حورمەتی برادەرەکەی سارد نەکردەوە. کاتێ کە سوڤۆرین، پێشنیازی کرد، کە بەدوو قۆڵی سەفەرێکی دوورو درێژی ئەوروپا بکەن، چیخۆف بە دڵ و گیان پێشنیازەکەی قەبووڵ کرد. لە نامەیەکیا (١٨٩١/٣/٥) بۆ سوڤۆرین، دەڵێت: "دەڕۆین. بۆ هەر کوێیەك و هەرکاتێ تۆ بڵێی دەڕۆین. من لەکوێ و کەی دەرفەتی وەهام بۆ دەرەخسێت." ماری خوشکی سەبارەت بەم جۆش و خرۆشە منداڵانەیەی، زۆر خەمبارانە پیی دەڵێت: "ئانتوشا، تۆ بۆ لە شوێنێ ئۆقرە ناگریت؟"

چیخۆف، بەرلەوەی بۆ ئەم سەفەرەی بڕوات، چووە تەمەشای خاتوونی ئەکتەری بە ناوبانگ، کە لەوسەرو بەندەدا، بوو بوو بە داستانی سەرزاری وردو درشتی پترسبۆرگ، چووە تەمەشای نواندنی خاتوونی ناوبراو لە شانۆنامەی (ئانتونی و کیلۆپاترا.) لە ١٨٩١/٣/١٦دا نامەیەك بۆ خوشکەکەی دەنووسێت و دەڵێت: "من ئیتاڵی نازانم، بەڵام نواندنەکەی ئەوەندە جوان بوو، وام هەست دەکرد، وشە بە وشەی حاڵی دەبم. ئەکتەرێکی گەورەیە. قەت شتی وام نەدیتووە." ڕۆژی دوایی ١٨٩١/٣/١٧، دەگەڵ سۆڤۆرین و ئەلکسی کوڕیا، بەرەو ئەوروپا وەڕێکەوت.

چیخۆف، بەر لەچەند مانگێك بەگالیسکەیەکی شەق و شڕ سیبریای تەی دەکرد، دەگەڵ هەر سووکە تاسەیەك یان پێچێکدا، لەقە لەقی پێدەکەوت، بەڵام هەنووکە بە قیتارێك و لە فارگۆنێکا سەفەری دەکرد کە تەختە خەوی تیا بوو "ئاوێنەی تیا بوو، پەنجەرەی زۆر گەورەو فەرشی تیا بوو." لە ناو ئەم فارگۆنەدا هەستی دەکرد قارەمانی ڕۆمانی "نانا"ی زولایە. کە گەییە نەمسا ئەم شادیەی گۆڕا بە حەپەسان و سەرسامی. هەموو شتێك لەوپەڕی جوانیدا بوو. دوکانی کەمالیات، چاویان دەخستە ڕێشکەوپێشکە، پیاو نەیدەزانی سەیری چی بکات. کڵێسا گەورەکان، هێندە بە نەخش و نیگار و خۆش ئەندازە بوون، لە تۆ وایە لە قوماش چنراون، عەرەبانچیان بە کڵاوە درێژەکانیانەوە، بەدەم چاوەڕوانی نەفەرانەوە، ڕۆژنامانیان دەخوێندەوە (کە ئەمە لە ڕووسیادا باو نیە) لە هەر شەقامێکدا کتێبفرۆشیەك هەبوو. لە ١٨٩١/٣/٢٠دا نامەیەك بۆ خوشکەکەی دەنووسێت و دەڵێت: "سەیرە، لێرە دەتوانی هەموو شتێك بخوێنیتەوە، بە کامی دڵ، بەوپەڕی ئازادی هەموو قسەیەك بکەیت."

پاش ئەوەی دیاری و سەوقاتی بۆ کەسوکارەکەی و چەند بۆینباخێکی بۆ خۆی کڕی، دەگەڵ سوڤۆرین و کوڕەکەی ئەودا بەرەو ڤینیسیا وەڕێکەوت. لە ئوتێلی بویر دابەزی، عاجبایەتی لەم شارە دەهات: توحفەیەکی ناسکی جوان بوو، بەسەر ئاوەوە، بینا کۆنەکانی، جادە و کۆڵانە تەنگ و پێچاو پێچەکانی، بەلەمە باریکەلە درێژ و ڕەشباوەکانی، کە نەرم نەرم بەسەر ئاوی ئارامی کەناڵەکانەوە دەگەڕان، پیاویان مەست دەکرد. لە نامەیەکیا بۆ ئیڤانی برای (١٨٩١/٣/٢٤) لەمبارەیەوە دەڵێت: "لە ژیانما شاری جوانتر لە ڤینیسیام نەدیتووە، شارێکە بە پرشنگ و بریق و باق، درەخشان و دڵگیر، ژیانی لێهەڵدەقوڵێ... بابایەکی ڕووسی بە سەزمان، لەوەیە لەم جیهانی جوانی و خۆشی و ئازادیەدا، شێت بێ. پیاو حەزدەکات هەتا هەتایە هەر لێرەبێ، کاتێ کە دەچیتە کڵێسا و گوێ لە نەوای ئۆرگۆن دەگرێت، لە دڵەوە حەزدەکەی ببیت بە کاتۆلیك." نووسەری لاو دیمتری میرسکوفسکی، کە بە ڕێکەوت ئەویش لەو ڕۆژانەدا لە ڤینسیا

دەبێت، باسی هەمان شادمانی و خۆشی ئەو مەملەکەتە دەکات. لە کاتێکا ئەم زیاتر سەرسام و دڵبەندی شێوەی تەلارکاری و دیمەنە هونەرییەکانی شار بوو، چیخۆف، بایەخی بە وردە شتانێك دەدا کە بایەخێکی ئەوتۆیان نەبوو، وەکو: سەری سافی کابرای ڕێنما، بانگی گوڵفرۆش، ئاوازی دەمەو بەیانی ماندولین، درینگە درینگی بەردەوامی زەنگان، یان پۆلە کۆترانی مەیدانی سان (قەدیس) مارکۆ، بەڵام دەگەڵ یەکەم باراندا ئەم کەیف و شادمانیەی ڕەوییەوە. لە نامەیەکا بۆ خوشکەکەی (١٨٩١/٣/٢٦) دەڵێت: "ڤینسیای جوان، ئێستا جوان نیە. ئەم هەموو ئاوە، خەمینی لێهەڵدەقوڵێ، بەشەر خوا خوایەتی خۆی بگەیەنێتە شوێنێکی هەتاو."

لەم سەفەرەدا سەری پولونیاو فلورەنسا، ڕۆما و ناپۆلیشی دا، بەڵام لە جیاتی دڵی خۆش بێ، زیاتر دڵی تەنگ دەبوو. چیخۆف، سیاحەتچیەکی هۆشیار بوو، سەری هەموو شوێنێکی شایستەی دەدا. بەڵام بەرە بەرە لە دیتنی شتە جوانەکان تێر دەبوو، ئەوەندە ئەم شوێنەوارو ئەو مۆزەخانەی کرد، کە لاق و پشتی دایانە ژان. لە کۆتایی هەر ڕۆژێکدا هەستی دەکرد یەك (بیدکر)ی خواردووە بێئەوەی هەرسی کردبێت. کە گەییە ڕۆما، هەستی دەکرد حەزی لە خواردنی ماسی چکۆلەو قەرە خەرمانی ڕووسیە. ئەم پایتەختە دێرینە، خارکۆڤی وەبیر دێنایەوە. گەییە ناپۆلی، کەنداوەکەی ناپۆلی زۆر بەلاوە جوان و دڵگیر بوو، بەڵام داخی بۆ پیس و پۆخڵی شەقامەکانی دەخوارد. وێڕای هەموو ئەمانەش، وای دەهاتە بەرچاو، کە ئیتاڵیا بە شێوەکی گشتی، وڵاتێکە سایەو سێبەری خواوەندانی بە سەرەوەیەو خواوەندان پیرۆزییەکی هەتا هەتاییان پێبەخشیوە. لە نامەیەکیا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: " ئیتاڵیا سەرباری جوانییە سروشتییەکەی و ئاو وهەوا خۆشەکەی، تاقە وڵاتیکە هەست دەکەیت کە هونەر بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، کە ئەمە شتێکی زۆر دڵخۆشکەرەیە.".

چیخۆف، زۆر نیگەرانی خەرجی سەفەرەکەی بوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر هەر خۆی با، بە تەنێ با، لەوە بوو بە چوارسەد ڕۆبڵێك دەربچێت، بەڵام لە گەڵ سوڤوریندا، هیچ چارێکی نەبوو، دەبوایە وەکو (دۆك یان کاردینالێ) لە باشترین ئوتێل لابدات ولە گرانترین خواردنگەدا نان بخوات، یانی دەبوایە پاشایانە بژی. پێی وابوو، بەلای کەمەوە هەزار ڕۆبڵی سوڤورینی، دێتە سەر، ئیدی دەبوایە دیسان خەمی دانەوەی ئەو قەرزە بخوات و مل بداتە کاری نووسین. قۆناغی دواتری سەفەرەکەیماڵباتی سوڤورین فەرەنسا بوو، سەری مۆنتیکارلۆیان دا، چیخۆف، جەوی ئەوێندەری بە دڵ نەبوو. هەر هەموو ئەوانەی لەوێ بوون، بۆ پارە و قومارو ڕواڵەتبازی دەژیان. یانی ژیانی ئەوێ تەنیا پارەو قومارو ڕواڵەتبازی بوو. تەنانەت ئاو و هەواکەشی قوماراوی بوو. کەچی وێڕای ئەمەش، چیخۆف خۆی بە قومارخانەکەدا کرد، خۆی پێنەگیرا و ڕۆڵێتی کرد، پێنج سەد ڕۆبڵی دۆڕاند. لە نامەیەکا (١٨٩١/٤/١٥) بۆ میخائیلی برای دەڵێت: "هەڵبەتە پێم دەڵێی، زۆر شەرمە! ئێمە لە چ تەنگانەیەکدا دەژین و ئەویش دەچێ ڕۆڵێت دەکات! ڕاست دەکەی، نەهەقت نیە. ڕێگەت دەدەم سەرم ببڕیت. بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، دڵم خۆشە، بەلای کەمەوە، دەتوانم بە نەوەکانم بڵێم کە من ڕۆڵێتم دۆڕاندووە و دەزانم کە ئەم یاریە چ هەستێکت پێ دەبەخشێت."

به هەرحاڵ ئەم کەڵکەڵە کوتوپڕەی قومار، نەیکردە کارێ کە دەستبەرداری هەڵسەنگاندنی ئەم ژینگە گەندەڵە ببێت: کە ژیان بریتی بوو لە پارە و قومار ڕواڵەتبازی. لە هەمان نامەدا دەڵێت: "من حەز لە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و دەوڵەمەندی دەکەم، بەڵام ڕۆڵێت، هەمان هەستی لا دروست کردم، کە ئاودەستێکی گەورە پێتی دەبەخشێت. شتێك لەم کەش و هەوایەدا هەیە کە کبریای بەشەریت ئازار دەدات، سروشتت لە بەرچاو دەخات، نەوای خێزاو و جوانی مانگت لە بەرچاو دەخات." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩١/٤/١٥). هەرچەندە مۆنتیکارلۆی (سۆزانی) پەست و خەمباری دەکرد، بەڵام پاریسی (دایکی مەدەنیەت)گەشکەی بەروحی دەبەخشی. بە هەرحاڵ لە گەڵ ئەوەشدا یەکەم تەماسی دەگەڵ ئەم شارەدا زۆر دژوارو ناخۆش بوو. لە کاتێکا کە بۆ تەمەشای پێشانگای جیهانی دەڕۆیی، لە ڕێگا تووشی بوو بە تووشی خۆپیشاندانێکی کرێکارییەوە بە بۆنەی یەکی ئایارەوە و پۆلیس زۆر بە توندی دەڵەکیان داو لێیان دا، بەڵام ئەم ڕووداوە بچووکە، بەرنامەکەی لێ تێکنەداو، لەسەر گەڕانەکەی خۆی بەردەوام بوو. بە پێشانگاکاندا گەڕا، بورجی ئیڤلی "بەرز، بەرز"ی زۆر لا جوان بوو. پەیکەرە مۆمینەکانی مۆزەخانەی (گریڤن)ی زۆر بە دڵ بوو. لە کۆبوونەوەیەکی پڕ هەراو زەنای ئەنجوومەنی نوێنەراندا ئامادە دەبێت، ئەو ڕۆژە وەزیری ناوخۆ، بانگ کرابوو بۆ ئەنجوومەن، تا دەربارەی ڕووداوەکانی یەکی ئایار لە شارۆچکەی فورمی، لێپێچینەوەی دەگەڵ بکرێت، چونکە پۆلیس تەقەیان لە خۆپیشاندەرەکان کرد بوو و، نۆ کەسیان کوشتبووو، شەست کەسی دیکەشیان زامدار کرد بوو. دیارە ئەمە بەلای هاوڵاتیەکی ڕووسییەوە سەیر بوو کە نوێنەرانی ئاسایی گەل بتوانن، بەو توندییە لە حکومەت بپێچنەوەو حیساب و کیتابی دەگەڵ بکەن. دیار بوو کە شۆڕشی ١٧٨٩، هێشتا دانەمرکابووەوە.

چیخۆف، بەیەك دوو ڕۆژێك بەر لە گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ چووە تەمەشای پێشانگایەکی بە نێوبانگ کە لە هۆڵی خۆیبوونخوازان کرابووەوە، گەییە ئەو قەناعەتەی کە نیگارکێشانی ڕووس لە نیگارکێشانی فەرەنسی، زەبەر دەستترن. لە نامەیەکا (١٨٩١/٤/٢١) بۆ خوشکەکەی، لەو بارەیەوە دەڵێت: "لیڤیتان، لە چاو ئەو تابلۆ و دیمەنانەی کە دوێنێ من دیتمن، پاشایە." هەرچەندە عەینەکەکەی شکابوو و بە هۆی نزیك بینییەوە، نەیدەتوانی وەکو پێویست تابلۆکان بدینێ و بە دروستی هەڵیان بسەنگێنێ و هەقی تەواوەتی خۆیانی بداتێ. لە نامەیەکیا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "من بەبێ عەینەك شەهیدی ڕاستەقینەم." هەروەها تکا لە میخائیلی برای دەکات، کە عەینەکێکی تری، لەماڵەوە هەیە، بۆی چاك بکاتەوە. جگە لەوانە، ئەوەی بەلایەوە مەبەست و گرنیگ بوو، مۆزەخانان نەبوو، بەڵکو زیاتر هەزارو یەك دیمەنی دیارو، پەنهانی شەقامە قەرەباڵغ و پڕ ژاوەژاو و جەنجاڵ و، پڕ جم و جوڵەکان بوو، لەوانە: دیمەنی ئەو فەرەنسیانەی کە لە گازینۆی سەر شۆستەکاندا، بە کۆمەڵ لە دەوری مێزە چکۆلەکانیاندا بێ خەم و خەیاڵ دادەنیشتن و، لە تۆ وایە "لە ماڵی خۆیاندان". بە پێچەوانەی ڕووسیا، لێرەدا یونیفۆرمی، یەکچەشنی سوپ ایی، یەجگار کەمە. دیارە ئەمە بەمانای ئەوپەڕی ئازادی، ئازادی تا ڕادەی بەرەڵایی بوو... بۆیە چیخۆف دەڵێت: "بە ڕاستی گەلێکی جوانن". بەڵام کاتێ هەندێ

لە ڕووسانی ئاکنجی ئەویٚ دەگەڵ خۆدا بردیان تا "پاریسی شەوانە" بدینیٚ. لە گەڕانەوەدا، لەو شەوگەشتەی خۆی پەشیمان بووەوە. لە نامەیەکیا (١٨٩١/٤/٢٤) بۆ خوشکەکەی، لەو بارەیەوە دەڵێت: "پیاوان، ماری بوایان لە قەدی خۆ ئاڵاندووە. ژنان لنگیان تا ئاسمان هەڵدەبڕن، پاڵەوانبازی، شێران، گۆرانی و چەقەنە، ئاهەنگی شیڤ و خواردن. دڵم لە هەر هەموو ئەم دیمەنانە، تێك هەڵدیٚ."

ئەمە یەکەمجاری بوو کە جەژنی پاك لە دەرێی وڵات و دوور لە کەسوکاری بکات. ئەو ئاهەنگە ئاینییەی کە بەم بۆنەیەوە لە کڵێسای سەفارەتخانەی ئەرتەدۆکسیدا، گێڕدرا، قەرەبووی ڕێوڕەسمی شەقامە قەرەباڵغ و جەنجاڵەکانی مۆسکۆ، زەنگی زەنگەکانی کرملین، شەوخوانی ڕازاوە بەجۆرەها خۆراکی بەلەزەت و شیرینی و نوقڵی جەژنی پاك و، ڕامووسانی سیانی، خەڵکانی نەناس و درودو هوڕاکێشانی "مەسیح ڕابوو"ی نەدەکردەوە. سوڤورین، هێشتا پەلەی ڕۆیشتنەوەی نەبوو. چیخۆف، تا پێش ٤/٢٧ نەیدەزانی کەی دەگەڕێنەوە، بەڵام لە ٤/٢٧/ دا بە نامەیەك ئیڤانی ئاگادار کردەوە کە: "ئەمڕۆ بۆ ڕووسیا دەگەڕێمەوە... لە سەفەران تێر بووم .حەز دەکەم کەمێك کاربکەم." لە کۆتایی نامەکەدا ناوی خۆی بە فەرەنسی نووسی بوو: "ئانتوا نەك"

لە ١٨٩١/٥/٢، دوای ئەوەی نزیکەی شەش هەفتەی لە هەندەران بەسەر برد، گەیشتەوە مۆسکۆ. لە ساخالیندا ئەوپەڕی کۆیلایەتی دیتبوو و لە هەندەراندا، لوتکەی ئازادی و مەدەنیەت. ڕووسیا، کە چیخۆف بە گوێڕایەڵییەکی فەرزەندانەوە بۆ باوەشی دەگەڕایەوە، لەچاوی ئەودا، پێگەیەکی مامناوەندی هەبوو لە نێوان ئەو دوو حاڵەتە هەڤدژەدا.

پەراوێز:

١- "... لەیاداشتەکانی خۆیدا...": بڕوانە یاداشتەکانی لیدیا ئەڤیلوڤا. ئا. ب. چیخۆف لە ژیانی مندا، لە ساڵی ١٩٤٧دا لە مۆسکۆ بڵاوبووەتەوە.

٢- "... یەك منداڵی هەبووە...": پاشان دوو منداڵی تری بووە.

"٩"

## خاوەن موڵك

چـيخۆف، ڕۆژێ دوای گەڕانـەوەی بـۆ باوەشـی خانـەوادە و کەسـوکارەکەی، بەرلـەوەی فریـا بکەوێ جانتاکانی بکاتەوە، دەگەڵ کەسوکارەکەیدا، لە مۆسکۆوە بەرەو لکسین، کە نزیك بـوو لـە مۆسـکۆوە، وەڕێکـەوت. میخـائیلی بـرای، لـە غیـابی ئانتونـدا، ئـەم هـەوارە هاوینەیـەی بـەکرێ گرتبوو: ئەم خانووە، بریتی بوو لە ڤیلایەکی چکۆلەی چوار ژووری، دەیڕوانیە سەر ڕوباری ئوکاو هیلێکی ئاسنی ناوچەیی. چیخۆف هەر لە هەوەڵەوە وای هەست دەکرد کە لە زندانداو ئەم شوێنە "خـەم و بێزاری لێهەڵدەقوڵێت." دوای دوو هەفتە بڕیـاری دا باروبنـە تێکبنێ و بـار بکات، ئەوە بوو عێل و عەشرەتی دووی خۆی داو بەرەو (بۆگیموڤۆ)، بۆ گوندێك باریـان کـرد کـە چەند کیلۆمەترێك لەو لاترەوە بوو. بە ڕاستی شوێنێکی کراوە و خۆش و دڵگیر بوو، خاوەنەکەی قاتی یەکەمی دەربەست خستە خزمەتی وان. ژوورەکانی گەورە، هۆڵەکەی بە ستوون و کۆڵەکـەی کەنـدەکاری ڕازابـووەوە، سـەکۆیەکی تایبـەتی سـازڤانی تیـا بـوو. بـاخ و باخچـەیەکی خـەیاڵاوی، ڕاڕەوەکانی تا چاو بڕبکات هەر ڕیزە دارکاژ بوو، ئەستێڵیکی تیا بوو پڕ لـە ماسـی. ئاشـەبایەك و تەنانەت کڵێسایەکی چکۆلەشی تیا بوو کە داك و بابە پیرەکەیان دەیانتوانی نوێژو نزای خۆیـانی تیـا بکـەن. بـە کورتیەکـەی پەناگایـەکی بـاش بـوو هـەم بـۆ ئیسـراحەت و حەوانـەوە و هـەم بـۆ کارکردن.

چیخۆف، وەکو هەمیشە گرفتاری بێ پارەو پوولی بوو. لەسەفەرەکەی ئەوروپایدا، پارەیـەکی زۆری لـە سـوڤۆرین قـەرز کردبـوو، یـانی تـا بیناقاقـای لـە قـەرزا بـوو. ئیـدی چیخۆف، دەبوایـە، هەرچەندە ماری خوشکی و میخائیل و ئیڤانی برای بژێوی خۆیان دابین دەکرد، دەبوایە یارمەتی ئەلکساندری برای بدات، چونکە لە دوای لە دایکبوونی کوڕە تازەکەیەوە (میخائیل چیخۆف، کە پاشـان بـوو بـە ئەکتـەرێکی بـە ناوبـانگی شـانۆی هونـەری مۆسـکۆ) بـە دەسـت نەبوونیـەوە حـاڵی پەشێو بوو. هـەروەها دەبوایـە یارمـەتی بابیشـی بـدات، کـە دوای ئـەوەی دەسـتبەرداری کارەکـەی خۆی، لە لای گافریلوف بوو، گەڕابووەوە ناو ماڵ و منداڵ و دەگەڵ ئەواندا دەژیا. جا چیخۆف، بۆ ئەوەی فریای بەخێوکردنی خانەوادەکەیان بکەوێ، لێڕا سـێ کار پێکـەوە بکات: ڕۆژانـی دوو شەمە و سێ شەممەو چوار شـەممە کـاری لـە سـەر کتێبی "دوڕگـەی سـاخالین" دەکرد، تـا ئـەوە بسەلمینێ و نیشانی بدات کە زندانییان کـاتێ کـە هـیچ ئومێـدێکیان نـامێنێ کـە جارێکـی دی بـۆ زێدو زاگەی خۆ بگەڕێنەوە، خۆ بە خۆ و لە هەمان کاتدا هەر وابەستەگیەکی ئەخلاقی واقیعـی لـە دەسـت دەدەن. ڕۆژانـی پێـنج شـەممەو هـەینی و شـەممەش کـاری لـە سـەر چـیرۆکە درێژەکـەی (دوئێـل) دەکـرد، یـەك شـەممونیش، بـۆ سـەرگەرمی و ئیسـراحەت، کورتـە چیرۆکـی دەنووسـی. بەرەبـەیان (یـانی دەوروبـەری سـەعات چـوارو پێـنج) کـە لـە خـەو ڕادەبـوو، بـۆ خـۆی قـاوەی دەم دەکرد، پاشـان دەسـتی بـەکار دەکـرد. بـۆ نووسـین لـە جیـاتی مێـز، قـەراخی پەنجەرەکـەی بـەکار دەبرد، بەو جۆرە هەر کاتێ سەری لە سەر کاغەزەکانی بەردەمی هەڵدەبڕی، نیگای دەکەوتە سـەر

باخچەکەی بەردەمی. سەعات یازدە دەچووە قارچك کۆکردنەوە یان ڕاوە ماسی. دوای فراڤین، کە لەسەعات یەکدا دەخورا، ڕێگەی بەخۆ دەدا چاوێك گەرم بکات. بەڵام هەرکە ڕادەبوو، دەستی دەدایە قەڵەم و تا ئێواریٚ بەردەوام کاری دەکرد. زۆری پێناخۆش بوو کە نەیدەتوانی بە هەمان گەرم و گوڕی جۆش و خرۆشی نووسینی (دوئێلە)وە کار لەسەر دوڕگەی ساخالین بکات. بۆیە زۆرجار فێڵی لە خۆی دەکرد، ڕۆژێکی لەمیان دەدزییەوە بۆ ئەوی تریان. یانی لە ڕیپۆرتاژەکەی دەدزییەوە بۆ چیرۆکەکەی. کاری ڕیپۆرتاژەکەی زۆر بەخاوی دەڕۆیی، زۆرجار سارد دەبووەوەو دەکەوتە گومانەوە. چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، لە مبارەیەوە دەڵێت: "خەریکی نووسینی ساخالینم، بەڵام زۆر بێتاقەتم، بێزارم." دوای چل و هەشت سەعاتان، جارێکی دی نامەیەك بۆ سوڤورین دەنووسێت و دەڵێت: "هەندێجار وام دێت بەسەرا سیٚ تا پێنج ساڵی بۆ تەرخان بکەم، هەندێجاریش دەکەومە گومان و نائومێدییەکی ئەوتۆوە، کە بە یەکجارەکی توڕی بدەم و جارێکی دی نەچم بەلایەوە." (بڕوانە نامەی ١٨٩١/٨/٢٨) دوای ئەوەی لە بەیانیەوە تا دەمەو ئێواریٚ کاری دەکردو تەواو شەکەت دەبوو، ئیدی خواخوای بوو، کاتی شیڤ بێت و بچێت دەگەڵ کەسوکارو میوانەکانیاندا دانیشێت و کەمێك لە کار دووربکەوێتەوە. پاش شیڤ خواردن، هەموو لە هۆڵە گەورەکەدا لە دەوری یەکدی خڕدەبوونەوە و کۆڕی مەجلیس و قسە و باسیان گەرم دەکرد، بە شێوەی ڕووسی و، بێگوێدان بە وەخت، بیٚ بەرنامە، لە هەزارویەك ئاشیان دەکردو هیچیانیش نەدەگوت. ئیدی ماڵەکەیان لە میواندا جمەی دەهات. چیخۆف لەم جۆرە کۆڕو مەجلیسانەدا، وای هەست دەکرد قرژاڵێکە و کەوتووەتە تۆڕێکی پڕ لە قرژاڵەوە (ڕۆبیان). ئەوانەی هاتوچۆیان دەکردن و بە زۆری لەو مەجلیسانەدا ئامادە دەبوون، بریتی بوون لە: ناتاشانتڤاریڤای خەندەران، ڤاگنەر، کە زانایەکی ناوداری گیانەوەر ناسی بوو، و پسپۆڕی بواری جاڵجاڵۆکەناسی بوو، تا شەکەت دەبوو، باسی بابەتی بۆماوەیی و بەقای ئەسڵەحی دەکرد، ئەوسا دەهاتە سەر باسی ماڵباتی کیسلیوف، لیڤیتانی شێوەکارو نیگارکێش، ئەوجا سەرە دەهاتە سەر لایکامیزینوڤا. ئەم خانمە شۆخە، لەو یەك دوو ساڵەی دواییدا، بوو بوو بە یەکێك لە دۆست و ئاشنا نزیکەکانی خانەوادەی چیخۆف. ئەم خانمە دەساڵێك لە چیخۆف بچووکتر بو و ژێراوژێر چیخۆڤ خۆشدەویست و ڕۆژ بە ڕۆژ چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، چیخۆف ڕازی دڵی خۆی بۆ بدرکێنیٚ و ئەشق و ڤیانی خۆی بۆ ئاشکرا بکات. بەڵام چیخۆف هەرچەندە لە دڵەوە حەزی لێدەکرد، بەڵام زیاتر وەکو برا گەورەیەکی میهرەبان و هەندێجار سوعبەتچی ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد. کە گاڵتەی پێدەکرد، زیاتر بۆ ئەوە بوو کە خۆی لە جوانی و شەنگوڵی و ئەشق و ڤیانی ئەو بدزێتەوە. هێندەی لە توانایدا بوو، هەوڵی دەدا. ئەو تەنیایی و گۆشەگیرییە دەرونییەی خۆی، کە بۆ کارەکانی پێویست بوو، بپارێزێت. ئاخر ژن بۆ ئەو – با بەدڵی خۆشی بیٚ – بۆ ئەوێك کە ژیانی بۆ کاغەزو مەرەکەب تەرخان کرد بوو، بە کەڵکی چی دەهات؟ تیا مابوو، هەرچەندە لە ناخا ئەم ئەشقە پەنهانەی پێخۆش بوو، بەڵام کیژەی لە مۆڵەقا هێشتبووەوە، نەهانی دەدا، نە ئیزنی دەدا. نامەی سوعبەت ئامێزو نێشداری بۆ دەنووسی، نازناوی کۆمیدی لێدەنا. ئامۆژگاری دەکرد کە لە لیڤیتانی ژنبازی داوێن تەڕ نزیك نەبێتەوە.

گلـەیی لێـدەکرد کـە شـیرینی زۆر دەخـوات، جگـەرە دەکێشـێت، بێموبـالات و خەمسـاردە. لەنامەیەکیا (١٨٩١/٥/٧) پیی دەڵێت: "لایکا گیان، گوڵەکەم، زێرکفتەکەم، سەدەفەکەم، کاتیٚ کە سەرت خستبووە سەر شانی ڕاستم و فرمێسکت بە سەرا دادەباران، من جیٚ فرمێسکەکانم بە بەنزین لابرد. کاتیٚ نان و گۆشتەکەت پاروو پاروو دەخوارد، ئێمە بە نیگا دەمووچاوو گەردنمان دەخـواردی، ئـاخ لایکـا، لایکـا گیـان، ئـەی دۆزەخـی جـەماڵ!" لەنامەیـەکی تریـا (٦ –١٨٩١/٧) دەڵێت: "شێت و شەیدای تۆم، عەینی پڵنگ، دەستی تکاو تەمەنات بۆ درێژ دەکەم.".

بەڵام لـە ڕاستیا، لـە هـەموو کاتیٚ زیـاتر سوور بـوو لـە سـەر ئـەوەی ئـەو دەستانە بـۆ نووسین تـەرخان بکـات. حـەزی دەکـرد، بـە سـەڵتی وەمێنیٚ، تـە نانـەت ئـەو کاتانـەش کـە لایکـای دڵفـڕێن لەماڵی ئەودا دەژیا، هەر توخنی نەکەوت و بەسەڵتی مایەوە. ئـەوەتا لـە نامەیـەکیا (١٨٩١/٥/١٠) بۆ سوڤەرین، دەڵێت:"بە نیازی ژن هێنان نیم، دەمەویٚ ببم بە پیرەمێرێکی سەر ڕووتاوە، لەپشت مێزێکی گەورەی نووسینەوە لە ژوورێکی جواندا دانیشم."

جـا بـۆ ئـەوەی شـەوانی بوگیموفۆیـان بەخۆشـی لێبگـوزەریٚ، هەنـدێجار ڕۆڵێتیـان دەکـرد، چیخۆف، بە خۆی دەزگایەکی بۆ ئەم مەبەستە دروستکرد بوو هەر خۆیشی گەمەکەی بەڕێوە دەبرد. هەندێجار شانۆنامەو دیمەنی شانۆیی زندووشیان پێشکەش و نمایش دەکرد. منداڵان بە واقـی وڕەوە، نـوقمی تەمەشـای سمۆرەکـە دەبـوون. ڕۆژیٚ هـەواڵیان هێنـا، کـە سمۆرەکـە لـە نـاو دارستانەکەدا دیار نەماوە. خانەوادەکە تەواو خەمیان لێهات، بەڵام کە کاتێکیان زانی سمۆرەکە بەخۆی هاتەوە، هەموو دڵیان خۆشبوو. جووتیـارانی دەوروبـەر بـۆ دەواو دەرمـان دەهـاتن بـۆلای دکتـۆر چـیخۆف، ئـەو دکتـۆرەی کـە خـوا بـۆی ناردبوونـە نـاو ماڵـەکانی خۆیـان. جارێـك ژنـە جووتیارێك لە عەرەبانە دەکەوێتە خوارەوەو بریندار دەبێت، بە هەڵەداوان دەیگەیەننە لای دکتۆر چیخۆف، ژنە بەدەم ئاهوناڵینەوە کە گوایە خەریکە بمرێت، پەیتا پەیتا مێردەکەی ڕادەسپێریٚ، کە زوو فریای جۆیەکەیان بکەویٚ و بیدورێتەوە. چیخۆف لە نامەیـەکیا (١٨٩١/٨/١٨) ئـەوە بـۆ سـوڤورین دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: "پێگـوت تـۆ واز لـە جۆومـۆ بێنـە، شـتی گـرینگتر هەیـە دەبـیٚ مشوری بخۆین و باسی لێوە بکەین، وەڵامی دامەوە: "تۆ نازانی چ جۆیەکی باشمان هەیە! بە ڕاستی بەغیلیم بەم ژنە دەبرد، چەند وڕەیان بەرزە، خۆ لەمردن ناترسن!".

چیخۆف دەگەڵ ئەم نامەیەدا، دەستنووسی چیرۆکی "دوئێل"یشی کە ئاخری تەواوی کرد، بۆ سوڤورین نارد. بەڵام کتێبی "دورگەی ساخالین" هێشتا تەواو نەبوو بوو. لە چیخۆف بوو بوو بە بێگار. وای لێهاتبوو بە دەست ئەو ڕیپۆرتاژەوە لە گیانی خۆی بێزار بوو بوو. لـە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەندێجار وا هەست دەکەم، پانتۆڵەکەم بە هەڵـەوگێڕاوی لـەپیٚ کردووە. نووسینم بۆ نایەت، ئەوەی دەمەویٚ بۆم نانووسرێت. تەنانـەت دەرمـانی هەڵـە دەدەم بە نەخۆشەکانم. لەوە دەچیٚ تووشـی حەواسپەرتی بـووبم." دوای چـەند دێرێـك لەسـەری دەڕوات و دەڵێـت: "خۆزگـە چـەند مافورێـك و وەجاخێـك و بـڕیٚ حـەوجۆش، دەمـوودوویـەکی ڕۆشـنبیرانەم دەبوو. بەدبەختانە هەرگیز نابم بە پـەیڕەوی تولستۆی. ئـەوەی لـە ژنانـا، لـە هـەموو شـتیٚ زیـاتر حەزی لێدەکەم جوانیە. ئەوەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا حـەزی لێدەکـەم، ئـەو شارستانیەتەیە کە

لـە مـافورو، گالیسـکەی سـپرینگدار و، لـە فیکـری زنـدوودا، خـۆی دەنـوێنێ." (بڕوانـە نامـەی بەرواری ١٨٩١/٨/٢٠).

ورده ورده لە بوگیموڤۆ بێتاقەت بوو. هەرکە هەستی بە هاتنی پایز کرد، ئارەزووی دەکرد، دەگەڵ کۆچی قەتاری قولینگانی کۆچەریدا، ئەویش کۆچ بکات. بەڵام بۆ کوێ؟ بۆ قرم. بۆ نەرویج، بۆ ئەمریکا؟

لە سەرەتاکانی ئەیلولدا، خۆی لە مۆسکۆ، لە کۆنە هەوارەکەی ماڵباتی خۆیاندا لە شەقامی مالایا دمیتروفکایەدا، بینیەوە. ژیانی لە لادێ و تەماسی دەگەڵ سروشت و جووتیاراندا، هێندەی دی ڕۆشنبیرانی، چەنەبازو زۆر بڵێ و ئاشوفتە بیری ڕووسی، لە بەرچاو خستبوو. تەنانەت ڕقی لە "تولستوی"ش هەستا بوو، کە "چیخۆف" تازە لە خوێندنەوەی ئەو پاشکۆیە بوو بووەوە کە بۆ کتێبی "سوناتای کرویتزر"ی نووسی بوو. لە نامەیەکیا (١٨٩١/٩/٨) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "نەفرەت لە فەلسەفەی گەورە پیاوانی ئەم دنیایە. هەر هەموو ئەو گەورە فەیلەسوفە ناودارانە، سەرکوتکارن، بێ ئەدەبن، بێ هەست و سۆزن وەکو جەنەڕاڵان، چونکە دڵنیان کەس نیە لێپێچینەوەیان دەگەڵ بکات. دیوجین تفی لە ڕدێنی خەڵکی دەکرد، چونکە دەیزانی هیچ شتێك ڕوو نادات. تولستوی پزیشکان بە خوێڕی و بەرەڵڵا دەزانێ، بە ئاشکرا بێ ئاگایی خۆی لەمەڕ بابەتێن گرینگ و گەورە دەنوێنێ، چونکە ئەویش دیوجینێکی دیکەیە نەکەس خەبەری پۆلیسی لێدەدات و نە لە ڕۆژنامانندا هێرشی دەکرێتە سەر. بۆیە نەفرەت لە فەلسەفەی گەورە پیاوانی ئەم دنیایە."

وێڕای ئەمەش، زۆری نەبرد کە ناچار بوو لە هەنبەر خانەدانی و پیاوەتی و دڵاوایی و توانای ئەم ڕدێن چەرمووەدا کڕنووش بەرێ کە لە کونجی خەڵوەتخانەکەی خۆیەوە، لە یاسنایا پولیاناوە، حوکمی سەرانسەری ڕووسیای دەکرد. بە هۆی وشکە ساڵییەکەوە، گرانی و قات و قڕی سەرانسەری وڵاتی گرتەوە ، حکومەت لە ترسی ئەوەی نەبا جەماوەری خەڵك ڕاپەڕن، زۆربەی وتارە توندەکانی، لە ڕۆژنامانندا سانسۆر دەکرد. کۆکردنەوەی پیتاکیشی بۆ لێقەوماوان قەدەغە کرد. تەنیا خاچی سوورو دامودەزگای ڕوحانیەتی مەسیحی بۆیان هەبوو ئەو کارە بکەن و کۆمەك بۆ لێقەوماوانی وشکە ساڵی کۆبکەنەوە. تولستۆی یەکسەر هاتە دەست و بە زەبری ئیحتوبارو سەنگ و پێگەی لە ڕادەبەدەری خۆی، کە دەیزانی کەس ناتوانێ لێپێچینەوەی دەگەڵ بکات. بە مەبەستی کۆکردنەوەی پیتاك و باربوو بۆ خەڵکانی برسی و لێقەوماو، بانگەواز لەسەر بانگەوازی بڵاودەکردەوە. پارەیەکی زۆری کۆکردەوە، بە خۆی سەردانی ناوچە لێقەوماوەکانی دەکرد، بە کۆمەك و یارمەتی کیژەکانی سەدان زیافەت و خوانی میللی بۆ جەماوەری خەڵکی ساز کرد. زۆری نەبرد کە چیخۆف بینی تولستۆی تاقە سوارە، بە بەرچاوی حکومەتەوە، فەرهادانە لە خەمی کۆکردنەوەی پیتاکە بۆ لێقەوماوان لە نامەیەکیا (١١/ك١/١٨٩١) بۆ سوڤورین، لە ستایشی تولستوی دا دەڵێت:" تولستوی! بە پێوەری ئەمڕۆکە، بەشەر نیە، لە سەرووی بەشەرەوەیە، فریاڕەسە، خوایە."

چیخۆف، وەکو پزیشك حەزی دەکرد، بە هانای هەزاران جووتیاری برسییەوە بچێت .بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی بە دۆستێکیەوە بە ناوی ئیگۆرۆف کرد، کە سەرۆکی "زمستوڤو"ی نیژنی نوڤگورود بوو، بەڵام بە هۆی سەرماو سۆڵەوە، تووشی پەسیوو سینگ یەشە بوو و چەند هەفتە لە جێدا کەوت. نەخۆشیەکەی، مردنی کۆمەڵێك لە خزم و کەسوکارو ناسیاوانی بەسەرا هات کە هێندەی دی باریان گران کرد لەوانە: مردنی پورە ڤاسیا، مردنی پالمینی شاعیر، و مەرگی زینابیدا لینتڤاریڤ... پورە ڤاسیا، بە هەمان مەرگی باوی خانەوادەکەیان، واتە بە سیل مرد. چیخۆف، ئیدی سەبارەت بە نەخۆشیەکەی خۆی، دڵنیا بوو، چیتر خۆی نە دەخەڵەتان، بەڵام وێرای ئەوەش خۆی لە هەر مالیجەیەکی جدی و بەردەوام دەبوارد. لە نامەیەکیا (١٨/ت٢/١٨٩١) بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "باوەڕ ناکەم جارێکی دی هەرگیز بگەڕێمەوە دۆخی جاران. ئیدی ئەوە تەقدیری خوایە. دەواو دەرمان بێزارم دەکات. هەست بە ناڕەحەتیەکی زۆر دەکەم. ئاوی مەعدەنی دەخۆمەوە، حەبی کینا دەخۆم، بەڵام ڕێگە نادەم کەس بەسەماعە سینگم فەحس بکات."

هەرکە توانی خۆی بە پێوە بگرێت، هەرچەندە هێشتا خۆی گوتەنی "لە کەسیك دەچوو تازە لە خنکان ڕزگار کرابێ" یەکسەر کەوتە یارمەتیدانی یگوروف بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە ڕزگارکاریەکەی، کە بریتی بوو لەوەی لە گوندەکانی دەوروبەری شار، هێندەی دەتوانرێ ئەسپ و وڵاخی بەرزە بکڕن و لە زستاندا بە خێویان بکەن و لە بە هاردا، لە کاتی کشتوکاڵدا، بیاندەنەوە بە جووتیارەکان. دیارە ئەم پرۆژەیە دەسمایەیەکی زۆری دەویست. چیخۆف، بۆ ئەم مەبەستە بانگەوازی لە گۆڤارو بڵاڤۆکەکاندا بڵاوکردەوە، سەدان نامەی بۆ دۆستان و ناسیاوانی خۆی نارد، سەردانی ئەوانەی دەکرد کە لیی ڕادەبینین بە دەنگیەوە بێن. لە نامەیەکیا (١٤/ك١/١٨٩١) بۆ شیکتیل، ئەندازیاری تەلار کاری، دەڵێت: "من ڕۆڵی خانمێکی بەرپرسی دەزگایەکی خێرخوازی دەبینم" پارەیەکی کەمی، بە چکەچك پێدەگەیی، ئەویش زۆر بەدیقەت و بەوپەڕی مەسئولیەوتەوە، حیسابی ڕادەگرت، هەرکە چەند ڕۆبڵێکی لا کۆدەبووەوە (قەترە لە دەریا) یەکسەر دەینارد بۆ یگوروڤ دۆستی لە نیژنی نوڤوگرود.

بە مەبەستی کۆکردنەوەی پارەو پولێکی زیاتر، لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمدا، چوو بۆ پترسبۆرگ. هەرکە گەییە ئەوێندەر، لە دەیان لاوە دەعوەت کرا، لە سەر خوانی نیوەڕوان و ئێواران، شان بە شانی خەڵکانێك دادەنیشت، نەیدەناسین و نەیدەزانی هاونیشینی ئەوان قەبووڵ یان ڕەفز بکات. لە سەری ساڵی تازەدا، لە ئێوارە خوانێکی ماڵباتی کودکۆفدا، کە بە بۆنەی بیست و پێنجەمین ساڵیادی گۆڤاری (سان – پترسبۆرگ)ەوە سازکرا بوو، جارێکی دی لیدیا ئەڤیلوڤای بینی. هەرچەندە سێ ساڵ بەسەر یەکەم دیداریاندا بوری بوو، بەڵام وەکو ئەو ژنە دەیگێڕێتەوە، گفتوگۆیەکی ڕۆمانتیکیانەیان لە نێواندا چێبوو. ئەگەر ڕاست بکات و زۆری پێوە نەنابێت، گوایە زۆر بە سۆزەوە باسی ئەگەری ئەوەیان کردووە کە لە ڕۆژگارانی کۆندا یەکیان دیتووەو وردە وردە و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، لێکدی نزیك بوونەتەوە و دوای سەدان ساڵ وا ئێستا ڕووبە ڕوی یەك بوونەتەوەو گەییونەتە یەك. هەڵبەتە ئەمە لە قسەی چیخۆف ناچێت، کە

ئەگەر قسەی واشی کردبێت، بۆ گاڵتە کردوویەتی و بەڵام لیدیا ئەڤیلوڤا بە ڕاستی، وەرگرتووە. تەنانەت دووپاتی دەکاتەوە کە وەختێ چیخۆڤ بە مێردەکەی ناساندووە، هەستی کردووە ئەو دوو پیاوە زۆر بە ساردی تەوقەیان دەگەڵ یەکدیدا کردووە. کە بە چیخۆڤ گوتووە، هەوڵی نووسینی هەیە، زۆر بە نەزاکەتەوە قایل بووە، دەستنووسەکانی بخوێنێتەوە. شتەکە لەمەش هێوەتر دەڕوات و لیدیا ئەڤیلوڤا، دوای پەنجا ساڵ لە کتێبی "چیخۆف، لە ژیانی مندا" دەڵێت: "ئەمە چیرۆکێکی دڵداریە، هەرچەندە دەساڵی خایاندووە، بەڵام هەرگیز کەس پیی نەزانیوە."

چیخۆف، تەنانەت بە هەستیش لەم چیرۆکە دڵداریەدا بەشدار نەبووە، بۆ نموونە لەو ماوەیەدا کە لە پترسبۆرگ بووە، کەم و زۆر هەوڵی نەداوە جاریکی دی ئەم ژنە گەنجە ئاگرینە ببینێ. بەڵکو لە نزیکەوە بایەخی بە ئەکتەریکی ئۆکرانی یەجگار دڵڕفێن، بە ناوی ماریا زانکوفتسکایا داوەو بەڵێنی داوەتێ کە شانۆنامەیەکی تایبەتی بۆ بنووسێت، شەوێکی بەدەم شامپانیا خواردنەوەوە لەگەڵیا بردبووە سەرو، دەگەڵیا چوو بووە خزاك سواری لە سەر بەفرو بەستەڵەکی هەزارو نشێوەکانی قەراخ پایتەخت.

ئەدی لە گەرمەی ئەم ئاهەنگ و دەعوەت و دەعوەتکاریانەدا، مەسەلەی برسێتی و پیتاك کۆکردنەوەکە چی بە سەرهات؟ هەڵبەتە چیخۆف، ئەو مەسەلەیەی لەبیر نەکرد. هەرکە گەیشتەوە مۆسکۆ، یەکسەر بەرەو نیژنی نوڤگورود ڕۆیی تا یگوروۆڤ برادەری بدینێ و پێکەوە بیر لە نەخشەیەکی تازە بکەنەوە بۆ یارمەتیدانی جووتیاران. کاتێ کە لەوێ دەگەڵ یگوروفدا کاری دەکرد، هەستی دەکرد ئەمە درێژەی هەمان کارە کە لە ساخالیندا بۆ کۆمەك و خزمەتی زندانیەکانی دەکرد. هەر دوو کارەکەی چ لێرەو چ لەوێ لە پێناوی پاراستنی ئابڕو و کەرامەتی مرۆڤدا بوو. وێڕای سەرماو سۆڵە، بە خزاك. لەم گوندی لێقەوماوەوە بۆ ئەو گوند دەچوو. لە یەکیك لەم سەفەرانەیدا، بەفرو زریان گرتی، خەریك بوو ڕێی لێگوم ببێت. و بە گوتەی خۆی "زۆر ترسابووا!". بە ڕاستی کارەساتەکە زۆر گەورە بوو. هەرچەندە حکومەت، کە جڵەوی مەسەلەکانی لە دەست بەربوو بوو، ڕێگەی لە هەوڵێن تایبەتی خەڵکی نەدەگرت، وێڕای ئەو هەموو هەوڵەی کە چیخۆف دەیدا، کۆمەك و پیتاك و باربوو، بەرە بەرە لە کزی دەداو کەم دەبووەوە. لە نامەیەکیا (٢٢/ك٢/١٨٩٢) بۆ سوڤورین دەڵێت: "ئەگەر خەڵکی سان — پترسبۆرگ و مۆسکۆ، ئەوەندەی قسان دەکەن، کاریان کردبا، هیچ جۆرە قات و قڕییەك لە نیژنی نوڤگورود ڕووی نەدەدا." چیخۆف، دوای حەوت هەشت ڕۆژ، ڕاکە ڕاك بە نێو بەفرا، بۆ ئەم گوندو ئەو گوند، سەرما و پشت یەشە بەجۆرێ کەسیرەیان کرد، ناچار بوو بۆ دەرمانکردن بۆ مسکۆ بگەڕێتەوە.

کە هاتەوە ماڵێ، تەمەشای کرد، سمۆرەکە زەرەرو زیانێکی زۆری لە ماڵەکەداوە. بە نەبەدڵی و بەجۆرە عەزابێکی دەروونیەوە بڕیاری دا، ئەم گیانلەبەرە موزیرەش، وەکو دوانەکەی دی، بدات بە باخی گیانلەبەرانی مۆسکۆ. هەرکە پشوویەکی کەمی داو دەرفەتی هێنا چەند نامەیەك بۆ ئەم و ئەو بنووسێت، دیسانەوە بارگەی تێکناو لە ١٨٩٢/٢/٢ دا دەگەڵ سوڤوریندا، ئەمجارەیان بەرەو دەڤەری ڤوروفیچ کەوتەڕێ. هەڵمەتی کۆکردنەوەی پیتاك و کۆمەك لێرە زۆر باشتر بوو وەك

لە نیژنی نوڤگورود. بەڵام ئامادەبوونی سوڤورین لەم سەفەرەدا، شەقڵێکی فەرمی ناپەسەند و ناخۆشی بەسەفەرەکە دەدا. سوڤورین وەکو سەرنووسەری "ڕۆژگاری نوێ" پێگەو متمانەیەکی تایبەتی لای حکومەت هەبوو، و باوەڕپێکراوی حکومەت بوو، بۆیە دەسەڵاتە ناوچەییەکان زۆر بە گەرمی پێشوازیان کرد، بە بۆنەی چوونیەوە بۆ ناوچەکە زیافەت و دەعوەت و ئێوارە خوانی گەورەو ڕازاوەیان بۆ ساز دەکردو چیخۆف، ناچار بوو لە کاتێکا لەو دەعوەتە بەشکۆو جەلالانەدا بەشداری بکات، کە جووتیارانی ناوچەکە – گوایە ئەم دوانە بۆ کۆمەك و یارمەتیدانی ئەوان چوو بوون بۆ ئەوێندەر – لە برسا دەمردن. چیخۆف زۆر تووڕە بوو. هاوڕێکەی خۆی لە دەوری کارگوزارو کارگێڕێکی پایەداری، بی هیچ دەسەڵاتێك، کۆمیدی و گەوجانە دەهاتە بەرچاو.

پاش دە ڕۆژێك، چیخۆف تاقەتی چوو و بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، خەفەتی لەوە دەخوارد کە ئەو هەموو وەختەی بە خۆڕایی بە چەنەبازی بەسەر برد بوو. هەوڵەکانی تولستۆی دژی برسیەتی لە چاو هەوڵە نیمچە ناکامەکانی چیخۆفەوە، یەجگار بەرچاوترو پرشنگدار دەیاننواند. ئەو پیرە پێغەمبەرە تۆباویە، هەوڵەکانی خۆی دژی برسێتی، زۆر باشتر لە هەوڵەکانی ئەم پزیشکە واقیعگەراو ڕیالستە ڕێك خستبوو. ئەوەی ڕاستی بێ چیخۆف ساڵ بە ساڵ کەمتر خۆی بە پزیشك دەزانی و زیاتر خۆی بە نووسەر دەزانی. بەڵام هەستی دەکرد، کەش و هەواو هاماج و ژینگەی پێویستی بۆ هونەرەکەی نەسازاندووە. بۆیە لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین پێش ئەوەی سمۆرەکەی بدات بە باخی گیانلەبەرانی مۆسکۆ دەڵێت: "ئەگەر پزیشکم، پێویستم بە نەخۆشان و بەخۆشخانەیە، ئەگەر ئەهلی ئەدەبیشم دەبێ لە ناو خەڵکیدا بژیم، نەك لە مالایا – دمیتروفکایا، دەگەڵ سمۆرەکەیدا. پێویستم بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیە، ئەگەر کەمۆکەیەکیش بێ هەر باشە . ژیانی نێو ئەم چوار دیوارە، دوور لە سروشت، دوور لە خەڵکی و دوور لە ڕووسیا، بەم نەخۆشی و بێ ئیشتیاییەوە، هەرگیز ناکاتە ژیان". (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٩١/١٠/١٩).

ئەدی چارە؟ چار هەر ئەوە بوو، کە لە لادێدا خانوویەکی باش بکڕێت و بەمجۆرە، یەکەم: مەسرەفی کەمتر دەبێتەوە، چونکە هەمو کەس دەزانێ کە مەسرەفی لادی، لە چاو شارا کەمترە دووەم: هەوای ئازاد بۆ نەخۆشیەکەی زۆر باشەو سیحەتی باشتر دەبێ. سێیەم: لە هەراو زەناو ژاوەژاو و جم و جوڵی بێهودەی شار ڕزگاری دەبێت. چوارەم: کە دەوروبەری چۆڵ بێت و کونجی خەڵوەت بگرێت دەتوانێ خۆی بۆ نووسینی کاری گەورە ترو درێژتر تەرخان بکات، و ئەگەر لەگوندیدا گۆشەگیریش با، دەیتوانی زستانان سەفەری سان پترسبۆرگ بکات و لەوێندەر سەری دۆست و ئاشنایانی بدات و بچێتە تەمەشای نمایش و نواندنی دوا شانۆنامان. لە نامەیەکیا (٢٢/ت١٨٩١/٢) بۆ سوڤورین دەڵێت: "ئاهـ ئازادی، ئازادی! ئەگەر ساڵی تەنیا بە دوو هەزار ڕۆبڵ بژیم، کە ئەمە تەنیا لە گوندیدا مەیسەر دەبێ، بەوە دێتە دی لە گوندیدا موڵکێکم هەبێ، هەنگێ هیچ کێشەیەکی داراییم نامێنێ و ئازادو سەر ڕەحەت و ئاسوودە بیر، خۆم بۆ کارو بۆ خوێندنەوە تەرخان دەکەم! ئیدی ئەوە لە ژیان دەردەچێ دەبێ بە حەڵوا."

چونکە حەزی لە ئۆکراین بوو، داوای لە دۆستێکی خۆی بە نێوی ئەلکساندر سماگین کرد کە لە دەوروبەری ڕوباری پسیول موڵکێکی بۆ بدۆزێتەوە. سماگین، دوو مەزرای باشی، یەك لە دوای یەکی بۆ دۆزییەوە، بەڵام بە هۆی دیار نەمانی فرۆشیارەکانەوە، هەردوو مەزارەکەی لە کیس چوون. چیخۆف، سەبری سوا، بە تاسەوە ئاگادارییی ناو ڕۆژنامانی دەخوێندەوە، لەپڕ چاوی بە ئاگادارییەك کەوت دەربارەی جێگایەك، کە تەنیا هەشت کیلۆمەتریك لە مۆسکۆوە دوور بوو. یەکسەر میخائیل و ماریای نارد بۆ تەمەشای جێگاکە، هەرچەندە بەفرێکی زۆر کەوتبوو و نەیانتوانی بوو بەباشی و وەکو پێویست، شوێن و هەڵکەوتەی جێگاکە بدینن، بەڵام بە ڕەئێکی ئەرێنی باشەوە گەڕابوونەوە. چیخۆف، پێش ئەوەی بەخۆی بچێتە سەیرو تەمەشای موڵکەکە، بەخۆشحاڵیەوە، کەوتبووە مامەڵە دەگەڵ خاوەن موڵکەکەدا. کاتێ دوای دوو هەفتان، دەچێتە تەمەشای موڵکەکە، زۆری بەدڵ دەبێت. ئەمە هەر مەزرایەکی بچووك نەبوو، بەڵکو موڵکێکی گەورە بوو، لە نزیکی گوندی میلیکۆڤۆ، کە بە قیتار دوو سەعات و نیو لە مۆسکۆوە دوور بوو. پانتاییەکەی دوو سەدو بیست و پێنج هیکتار بوو. نیوەی دڕك و داڵ و دەوەن بوو، نیوەکەی تری بریتی بوو لە مێرگوزارێکی گەورە، باخچەیەك، جۆگایەك و دوو گۆلاو، زەوییەکی تەختانی بە دەوری خانوویەکدا، خانووەکە تا ڕادەیەك تازە بوو، بەڵام جوان دروست نەکرابوو ئاودەست و تەوالێتی تیا نەبوو. هێم و بناغەو ژوورەکانی تری باش دیار بوون. ئەو ژوورەی کە چیخۆف بۆ کاری خۆی دانابوو، سێ پەنجەرەی گەورەو ڕووناکی هەبوو، کە دەیانڕوانیە سەر باخچەکەو، ژوورەکە لە پێشەوەی خانووەکە بوو. چیخۆف لیستێکی بە هەموو ئەو شتانە گرت، کە دەگەڵ خانووەکەدا کڕی بووی و، بۆ ئەلکساندری نارد: سێ ئەسپ، یەك پیانۆ، مانگایەك، چوار قاز، دوو سەگ، دە مریشکی ڕووتەڵە، چەند عەرەبانەیەکی دەستی و یەك خزاکی سەر بەفر. خاوەنەکەی دەیگوت، ئەگەر ئەم موڵکە بە باشی بەڕێوە ببرێت، ساڵانە دوو هەزار ڕۆبڵ فڕێ دەدات، لەبەر ئەوە داوای ئەم نرخە زۆرەی لێدەکات: سیازدە هەزار ڕۆبڵ. چیخۆف، بە خەویش تەسەورو وێنای ئەوەی نەکرد بوو، کە پارەیەکی وا مۆڵی پێ هەڵبسووڕێت. ئاخر لە کوێ دەیتوانی، تەنیا لە ڕێگەی قەڵەمەوە ئەو پارە مۆڵە پەیدا بکات؟ دیسان نۆرەی سوڤورینی فریارەس هاتەوە. بانکی "ڕۆژگاری نوێ" نەك هەر ئەو چوار هەزار ڕۆبڵەی بە وام دایە کە بۆ گرێ بەستی مامەڵەی فرۆشتن و کڕینی موڵکەکە پێویست بوو، بەڵکو قەراردادێکی ڕەهنی پێنج ساڵەشی دەگەڵ مۆرو ئیمزا کرد. ئیدی چیخۆف کەوتە ناو مامەڵە دەگەڵ دادنووسان و بانکداران و نوێنەرانی بیمەو زۆر "مشەخۆری دیکەی لەو بابەتە" کە خواست و داوای پڕ وردەکاری ئەوانە دەهری دەکرد. کە خۆی لە بەرانبەر ئەو بیرۆکراتانەدا دەبینی، هەستی دەکرد "بابایەکی گەوجە، هیچ کارێك نازانێ، ملی بەمەیدانێکەوە ناوە کە مەیدانی ئەو نیە" زیاتر لەوە پەست بوو کە دەبوایە جگە لە ڕاستە نرخی موڵکەکە، هەزار ڕۆبڵیش هەقی ڕەسم و پول و معامەلاتی جۆراو جۆر بدات. بەڵام دوای ئەوەی هەموو ئەوراق و معامەلاتەکان ئیمزا کران و تەواو بوو، هەستی بە ئاسوودەییەکی گەورە کرد! لە نامەیەکیا (١٨٩٢/٣/٣) بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "پەح کە خۆشحاڵم ئێستا هیچ سوکنەیەکم لە مۆسکۆ نیە! بە عەمرانم خۆشی وام بەخۆوە نەدیتووە."

لـه ١٨٩٢/٥/٤دا، دەگـەڵ دایـك و بـاوكی و خوشـكەكەی و میخـائیلی بـرا بچـووكیا، ماڵیـان كۆكردەوەو، هـەموویان لـە سـەندوق و بوخچـە و پریاسـكە نـاو، بڕێـك دەرمـانی زۆری هـەڵگرت و بـەرەو میلیكوڤـۆ، وەرێكـەوتن. بـەفرو سـەهۆڵبەندانی باخچـەو مێـرگ و كێڵگـەكان، هێشـتا نەتوابووەوە. ماڵەكە، كە دەمێ بوو چۆڵ بوو و خزمەت نەكرا بوو، لە بەرچاوی ئـەوان دیمـەنیكی دزێوو سارد و سڕی هەبوو. بەڵام هەركە گەرمیان كردو گەردو تۆزەكەیان مـاڵی بـەجۆرێ دەگـەڵیا ڕاهـاتن، لـە تـۆ وایـە چـەندین سـاڵە مـاڵی خۆیـان بـووە. هـەموو ئەنـدامانی خێزانەكـە پێكـەوەو بەدڵخۆشی دەستیان بە ماڵەكەدا دێناو هەوڵیان دەدا بیكەن بە ژینگەیەكی شایستە بە ژیـان. بـۆ ڕۆژی دوایی چیخۆف نامەیەكی بۆ ئیڤانی برای نـارد كە بەپەلە ئـەم پێویستیانەی بۆ بنێرێت: "گسكیك، ڕنەكێك بۆ ئەسپەكان، هەشت كیلۆ گۆشتی گا، دە كیلۆ نان، پێنج كولێرەی فەرەنسی، ڕەسمی دیمەنێك، لە گەڵ شێرێكی برونزی چكۆلەدا" ڕۆژی دواتر واتە ١٨٩٢/٥/٦، نامەیەكی بۆ سوڤورین نـارد: "لـە ژووره گـەورە سـێ پەنجەرەییەكـەی خۆمـا دانیشـتووم، هەسـت بەخۆشـحاڵی دەكەم، ڕۆژی پێنج جار دەچمە دەرەوە بۆ خۆ بـەفر هەڵدەدەمـە ئەسـتێلەكەوە، چۆڕاوگـەی ئـاو لـە سـەربانەكانەوە دەتكێتـە خـوارەوە... هـەوا بەهاریـە، بـەڵام شـەوان زۆر سـاردە، دەگاتـە دوازدە سیازدە نمرەی ژێر سفر. حاڵی حازر كەیفم قنجە. زۆر سـەرقالین. ئیـدی خـەریكی پـاك كردنـەوە، شـۆردن، بۆیـە كـردن، ڕێكخسـتنەوەی تەختـەی نـاو ژوورەكـان، گواسـتنەوەی موبـەق بـۆ بەشـی خزمـەتكاران، و هـەزارو یـەك كـاری دیكـەین. ئەگـەر بـەكاری خۆمـەوە مـژول نەبوایـەم، هـەموو ڕۆژەكەم لە حەوشەكەی دەرەوە دەبردە سەر."

لـە گەرمـەی ئـەم هـەراو زەنـا خۆشـەدا، لـە گەرمـەی كوتـەكوتی چـەكوش و بزمـار داكوتانـا، لـە هـەڕەتی پـەردە هەڵواسـیندا، لـە جەرگـەی شـت گواسـتنەوەدا چیخـۆف، نامەیـەكی چـاوەڕاوان نەكراوی لە لیدیا ئەڤیلوڤاوە پێگەیی. لیدیا پێشتر چەند كورتە چیرۆكێكی بۆ چیخۆف نـارد بـوو كە بۆی تەمەشا بكات و هەڵیان بسەنگێنێ. ئەویش دووجار زۆر بە ناسـكی و میهرەبـانی وەڵـامی دابووەوە، سووكە ئیرادێكی لەمەیان گرتبوو و سووكە ستایشێكی ئەوەی تریانی كرد بوو، وەكـو چۆن ئەمەی دەگەڵ زۆربەی ئەو تازەكارانە دەكرد، كە داوای ڕاو بۆچـوونی ئەویان دەكـرد. بـەڵام لیدیا ئەمجارەیان ئەدەبیاتی مەبەست نەبوو، بە توڕەیی و نیگەرانی بۆی نووسی بـوو، كە گوایـە لە سان —پترسبۆرگ دەنگۆیەكی حەیابەرە بڵاوبۆتەوە و گەیوەتە مێردەكـەی. دەنگۆیەكـەش وایـە كە گوایە چیخۆف لە هەمان شەودا كە بۆ دواجار دەگەڵ لیدیادا یەكیان دیتووە، كە بۆ دوو مـانگ پتر دەچێت، لە باڕێك خواردوویەتیەوەو مەست بووەو لای دۆستەكانی گوتویـەتی بـە تەمایـە ئـەو ژنە لە ڕێ دەربكات و كارێكی وەها بكات تەڵاقی خۆی لە مێردەكەی بسەنێ و شوو بەم بكات.

هەڵبەتە چیخۆف، زۆر بە توندی وەڵامی دایەوە. نەیـدەتوانی بوختـان و ئیفتیرای هیسـتریانەی ئەم ژنە جوانە قەبووڵ بكات كە گوایە ئەم "ناوی زڕاندووە." لە نامەیەكیا (١٨٩٢/٣/١٩) دەڵێت: "بـە ڕاسـتی كەرامـەتم ڕێنـادات هـیچ پاكانەیـەكت بـۆ بكـەم. ئـەوەی تـۆ دەیڵێیـت بوختانـە، بوختانەكەشت هێندە ئاڵۆزە، نازانم لە چ خاڵێكیا، بەرگری لەخۆم بكەم. ئەوەندەی من لیی حاڵی بووبم، هەر هەمووی بوختان و هەرزەگۆییە. وایە؟ زۆر بەجدی داوات لێدەكەم(ئەگەر بەقەد قسـەو

دەنگۆی ئەو بوختانچیانە متمانەت بە من هەیە) باوەڕ بەو درۆ ودەلەسانە مەکە کە لە سان –پترسبۆرگدا، بۆ ئەم و ئەو هەڵدەبەستن. یان ئەگەر باوەڕ دەکەی، ئەوا باوەڕ بە هەمووی بکە. باوەڕ بەوەش بکە کە لە پێناوی پێنج ملیون ڕۆبڵدا ژن دێنم، باوەڕ بەوەش بکە کە ئاشقێنی و دڵداری دەگەڵ ژنی باشترین هاوڕێیانی خۆمدا دەکەم... هتد.بە هەرحاڵ خوا ئاگادارت بێ. پاکانەو بەرگری لەخۆم، لە هەنبەر بوختان و قسەو قسەلۆکان، وەکو داوای قەرزە لە جولەکە، بێهودەیە. جوان بیر لە قسەکانم بکەوە ئەوجا بڕیاری خۆت بدە، چۆنم تێدەگەی تێم بگە."

چیخۆف، کە هیچ کاتێ ڕقی لە کەس هەڵنەدەگرت، لە هەوەڵی هەمان نامەدا، چەند ئامۆژگاریەکی ئەدەبی ئەم ژنەی کرد بوو، کە ڕەنگدانەوەی بۆچوونی تایبەتی خۆی بوون دەربارەی ئەدەب: "کاتێ قەرەبەختان و بێنەوایان وێنە دەگریت و دەتەوێ هاوسۆزی خوێنەران بهاڕوژێنی، هەوڵبدە ساردبی سارد: چونکە ئەمە کلۆڵیان زیاتر بەرجەستە دەکات. هەموو قارەمانەکانت دەگرین و تۆش دەگەڵیاندا دەناڵێنی و ئاهـ هەڵدەکێشیت! بەڵێ ساردبە."

بەڵام هەمو ئەو قسانە وەکو ئەوە وابوو، بێی ئامۆژگاری مەنجەڵێك ئاوی سەر ئاگر بکەیت کە مەکوڵێ.

خۆشبەختانە، ئەو قسەو قسەلۆکانەی سان –پترسبۆرگ دەگەڵ توانەوەی بەفری میلیکوڤۆدا، وردە وردە توانەوە. دەگەڵ سەرەتای بەهارا، دوای ماوەیەکی کەم گیای بسك سەوز، کەوتنە چاوبڕکێ. جۆگەلان، بەرەو ڕوبار پەل بوونەوە، ڕیشۆڵان، بەسەر دارانەوە، لە نێو هەوەڵین چرۆی سەرەتای بەهارا، کەوتنە نەغمەخوانی. چیخۆف، لە نێو ئەو واقیعەدا، باوەڕی نەدەکرد کە ئەنجام خەونەکەی هاتووەتە دی: لە تەمەنی سی و دووساڵیدا، نەوەی کۆیلەیەك بووە بە خاوەنی موڵك و ماڵی خۆی، وەکو تولستوی! ئەم زەوی و زار، دارو درەخت و بەردو بارەشی بە میرات بۆ نەمابووەوە، لەمەدا قەرزارباری کەس نەبوو، تەنیا قەڵەمەکەی نەبێ. ئەمە دیاریی قارەمانەکانی بوو، لە گەورەیانەوە تا بچووکیان، لە خراپیانەوە تا باشیان. ئەم ئەزموونە، کە بە ڕاستی ئازایەتی دەویست، وای لێکرد باوەڕ بەوە بێنێ کە ژیانی بە خۆڕایی نەبردووەتە سەر. بەدەم پێکەنینەوە خۆی دەگەڵ کوانتیکوس سنسناتوسدا بەراورد دەکرد. دەگەڵ ئەو ڕۆمانیە زەحمەتکێش و سادەیەی کە ڕەنج و کاری سەر کێڵگەی خۆی بە هەزار پلەوپایەی سوپایی نەدەگۆڕییەوە. لەنامەیەکیا بۆ ئەلکساندری برای (١٨٩٢/٣/٢١) بەشانازیەوە دەڵێت: "ئێمە لە موڵك و ماڵی خۆماندا دەژین، وەکو سنسناتۆسێکی سەردەم، نانم بەرەنجی شان و ئارەقی ناوچەوان پەیدا دەکەم. دایکە ئەمڕۆ بە ڕۆژو بوو، بە سواری ئەسپی خۆمان چوو بۆ کڵێسا... باوکە لە خزاك کەتووەتە خوارێ، چونکە خێرا دەڕۆیی... باوك لەسەر فەلسەفەڕێسی خۆی بەردەوامە... وەکو هەموو تاگانروگییەك بە کەڵکی هیچ نایەت تەنیا هەڵکردنی چرای نەوتی نەبێت.. زۆر بە زبری قسان دەگەڵ جووتیارەکاندا دەکات... سەعات پێنجی بەیانی هەڵدەستم، سوور دەزانم نە هیچ شوێنێکم بەدەستەوەیەو نە میوانمان دێت، بەو بەیانی شەبەقیە هەڵدەستم گوێ لە ئاوازی ڕیشۆڵەو کڵاوکوڕە و تەیروتو دەگرم." بەمجۆرە کۆتایی بە نامەکەی هێنا بوو: "دڵسۆزت، کینکیناتوس".

که ورده ورده خووی به ژیانی تازەیەوە، وەکو خودان موڵکێك، گرت، کەمتر لە جاران کاری نووسینی دەکرد. پاش ئەوەی بە کەڕەتێك و یەکنەفەس چیرۆکی "ژنانی چەناباز"ی نووسی، کە تیمەو بابەتەکەی ژیان و دنیای لادێ بوو و بە تەکنیکێکی زۆر سەرکەوتوو هاتبووە نووسین، لە (ڕۆژگاری نوی)دا کورتە ڕۆمانی "دوئێل"ی بڵاوکردەوە، کە بە ئیعترافی خۆی زۆر پێوەی ماندوو بوو بوو، قارەمانانی ئەم چیرۆکە سەر بەدوو تەبیعەتی جیاواز و هەڤدژن: لایڤسکی ترسنۆك و بێدەسەڵات (ڕۆشنبیری ڕوخاوی نائومێدو "هاملێتی مۆسکۆیی") لە لایەك و ڤون کورینی، زانای گەنجی بواری زیندەوەرناسی، کە لایڤسکی هەڤڕکی خۆی بە مێملڵ دەزانێت و سەزەنشتی دەکات کە بۆچی خەتای، هەرەسی ئەخلاقی خۆی، بە ملی زەمانەو کۆمەڵگەدا دەدات. (هەندیك لە قسەو بۆچوون و گەنگەشەکانی فون کورن، بە ئاشکرا لە گفتوگۆیەکانی چیخۆفەوە، کە لە یوگیموفودا دەگەڵ زانای زندەوەرناس ڤانگەردا کردبوونی، وەرگیراوە.). هێندە ڕقی لە ڕیاکاری و ساختەچیاتی و سستی و خاوی لایفسکی هەڵدەستێ، کە داوای دوئێلی لێدەکات. بەڵام کە دێنە مەیدان، سەروگوللە بە یەکترەوە دەدەن و نەك هەر یەکتر ناپێکن، تەنانەت یەکدی بریندارش ناکەن. بەڵام ئەم شەڕەیان بێ سوود نابێت. چونکە وەختێ ڕوو بە ڕووی مەرگ بوونەوە، هەستیان کرد گۆڕانێکی قووڵ، لە تەبع و تەبیعەتیاندا ڕووی دا: لایڤسکی بڕیار دەدا ڕێگەی ژیانێکی شایستەتر و پیاوانەتر بگرێتەبەر، (فون کورین)ش بڕیار دەدا، لە داوەیەکانیا هەندێ نەرمتر بێ. فون کورن، بەر لەوەی بڕوات، دەچێت بۆ لای ئەو پیاوەی کە بە نیازی کوشتنی بوو و پیی دەڵێت: "لایفسکی گیان گلەییم لێمەکە، گەردنم ئازا بکە... من زۆر بەختەوەرم کە ئێستا بۆم دەرکەوت،کە بەرانبەر بە تۆ هەڵە بووم، بەڵام ئیدی ئەوە بەشەرە، شیری خاوی خواردووە، جاری وا هەیە لە ڕاستە ڕێگاشدا هەڵدەنوتێ..." کاتێ لایڤسکی، دەیڕوانیە ئەو بەلەمەی کە دژمنەکەی ئەمی دەبرد، لە فکران ڕاچوو: "بەشەر لە واری حەقیقەت دۆزیدا، دوو هەنگاو بۆ دواوە دەنەن و یەك هەنگاو بۆ پێشەوە. ئازارو هەڵەو بێزاری بۆ پاشەوەیان دەبات، بەڵام حەقیقەتدۆستی و نیاز پاکی و کۆڵنەدان هەمیشە بۆ پێشەوەیان دەبات. ئیدی ئەمە دنیایە، کێ دەزانێ؟ لەوەیە بگەنە حەقیقەتی تەواو."

بەڵام ئەم کۆتاییە بە ڕواڵەت خۆشە، تاڵی و ناخۆشی و مەینەتیەکانی بندێڕی چیرۆکەکەی پێ ناشاردرێتەوە. چیخۆف، لە پێشی لایڤسکی دا، لە پشت پەردەی لایڤسکییەوە، حیسابی خۆی دەگەڵ زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەدا، پاك دەکاتەوە. بە ناو زلی دێی وێران، ڕۆناکبیری بێ کردار، دڵ مردووی چەنەبازیان وەسف دەکات. ئەوە بوو وتارێکی توندی دژی ڕۆشنبیرانی بێ سەرو بەر نووسی و ناردی بۆ سوڤۆرین و داوای لێکرد بە ناوی خوازراوەوە بۆی بڵاوبکاتەوە، ناونیشانی وتارەکە "لە مۆسکۆدا"بوو و بە ناوی خوازراوی "بێزار" .چیخۆف لەم وتارەدا دادەبارێتە سەر ڕۆشنبیرانی لە خۆڕازی، قسە زلی بێکردار، کاتێ یەکێك لەو ڕۆشنبیرە فشەکەرانە، وەکو نوێنەری توێژی ڕۆشنبیران، دەکەوێتە گلەیی و بێزاری خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت: "من لە ژێر جێگاوە بەردەوام گینگڵ دەدەم، ئەم دیوو ئەو دیوو دەکەم، خەوم لێناکەوێ، تێناگەم بۆ ئەوەندە لەم بێزارە قەڵسم" ."بێزار"ی نەناس لێی دێتە دەست و ئامۆژگاری دەکات:

"باشترین شت ئەوەیە وایەرێکی تەلەفۆن هەڵگریت و خۆت بە نزیکترین عاموودی تەلەفۆنەوە هەڵبواسیت!"

ئایا دەرمانی ئەم دەردی نەهلیزمە، لە ئامۆژگاری و ڕێنماییە ئاینی و ئینجیلییەکانی تولستوی دا بوو؟ چیخۆف وەڵام دەداتەوە: نەخێر. چیخۆف چاری دەردەکانی لە زانست و پێشکەوتنی زانستیدا دەبینی، زانستی بە تاقە سەرچاوەی پێشکەوتنی مادی و مەعنەوی تیرەی بەشەر دەزانی، جا ئەو پێشکەوتنە مادی و مەعنەوییە لە ڕێگەی زانستەوە دەهاتە دی، نەك لە ڕێگەی ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی تولستوی، حەکیم و فەیلەسوفی یاسنایا پولیاناوە، کە کەسانی ڕۆشنبیر، بێنە خوارەوە بۆ ئاستی جووتیار. چیخۆف، قەناعەتی بەوە نەبوو لە ڕێگەی بانگەواز بۆ داوێنپاکی و میانڕەوی و دژایەتێکردنی خواردنەوەو، جنێودان بە پزیشکان و حەرامکردنی هونەرو، بایەخدان بە کشتوکاڵ و لە ڕێگەی نەزانیەوە، بشێت دنیایەکی نوێ دابمەزرێنرێ. پیی وابوو پشت کردنە کەشفکاریە پەڕجووئاساکانی زانست کارێکی بێهودەیە، پێی وابوو ئایندە لە تاقیگە زانستیەکانەوە دروست دەکرێت، نەك لە مەزراکانەوە. تولستۆی بە هاندانی تاریك ئەندێشی، نکوڵی لە هێزو توانای مرۆڤانی مرۆۆ دەکرد، بەشەری سارد دەکردەوە، مەیلی ئاسایی ڕۆشنبینی و خۆشگوزەرانی و ژیاندۆستی لای مرۆۆ دادەمرکاندەوە. هەرچەندە مەبەست و مەرامی ئەوە بوو کە داکۆکی لە چەوساوەو مەزلوومان بکات. بەڵێ پارێزەری خەڵکانی چەوساوەو بێنەوا، لە گوتارو کردارا تووڕە بوو، پێی دادەگرت، هاواری دەکرد. هەڕەشەی دەکرد، مەحکومی دەکرد، حەرامی دەکرد. دیارە چیخۆف ئەم هەڵوێستە بنچ بڕانەی قەبووڵ نەبوو، پێیوابوو هیچ کەسێك مافی ئەوەی نیە، دەربارەی هاونەوعانی خۆی حوکم بدات. ئەوەتا لە نامەیەکی (١٨٨٨/٦/٩) بۆ لیونتیف – شچگوف، دەڵێت: "دەبێ ڕێك و ڕاست دان بەوەدا بنەین، کە هیچ کەسێك لەم دنیایەدا ناتوانێ هەموو شتێك بزانێ و لە هەموو شتێك تێبگات. تەنیا شێت و لێبۆکان هەموو شتێك دەزانن و هەموو شتێك تێدەگەن."

بەڵام ئەم یاخی بوونە لوژیکییەی چیخۆف، ئەم یاخی بوونە لە تۆباویەتی تولستوی، نەیکردە کارێك کە بەوپەڕی ڕێزو میهرەوە نەڕوانێتە هونەروەری تولستۆی. دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم جەنگ و ئاشتی دەخوێنێتەوە، نامەیەك (١٨٩١/١٠/٢٥) بۆ سوڤورین دەنێرێت و لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەموو شەوێك هەڵدەستم و جەنگ و ئاشتی دەخوێنمەوە. هەست وحیرەتێکی هێندە سەیرو بێ ڕتوشم لا دروست دەکات، لە تۆ وایە یەکەمجارە دەیخوێنمەوە بە ڕاستی شاکارە." تا زیاتر لە تولستۆی ڕۆماننووس نزیك دەبووەوە، پتر لە تولستۆی هزرڤان دوور دەکەوتەوە. لەوە دەچوو وا هەست بکات کە دوورکەوتنەوەی تولستوی لە ئەدەبیات نەك هەر خیانەتە لە بەهرەو توانا ئەدەبیەکەی خۆی، بەڵکو خیانەتە لە چیخۆفیش، لەو چیخۆفەی کە ئەوی بەگەورەترین نووسەری ڕووسیا دەژمارد. کاتێ کە تولستۆی هاودەنگ دەگەڵ پرودون دا هاواری دەکرد: "سەروەت و سامان دەکاتە دزی." و بە هۆی موڵکە زۆرو زەبەندەکانیەوە، بە عەزابی ویژدانەوە دەتلایەوە، چیخۆف، لە نێو ئەو موڵکەدا کە تازە بە دەستی هێنا بوو، چەلەنگ و چالاك دەسوڕایەوەو بەدەم پێکەنینی خۆشیەوە، دانی بەوەدا دەنا، کە زۆری پێخۆشە دوای عومرێ

کاری سەخت، لەپڕا بووە بەسەرمایەدار. ئەویان بە هەڵچوون و توڕەییەوە، دژی ڕەوتی ڕۆژگار و سەردەمی خۆی دەوەستا و ئەمیان هەوڵی دەدا وەکو شایەدێك بەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگاری خۆی بکەوێ.

پەراوێز:

١- (زمستوڤو): ئەنجوومەنێکی هەڵبژێردراوی ناوچەیی گوندەکانی ڕووسیای پێش شۆڕشی ١٩١٧ بوە.

٢- پرودون (١٨٠٩-١٨٦٥) هزرڤان و پسپۆڕیکی فەرەنسی بواری مەسەلە سیاسی و جڤاکیەکان بووە.

((١٠))

## میلیکوڤو

ئیدی چیخوف، عادەتی وابوو، دوای هەر جۆش و خرۆشێکی سۆزداری کوێرانە، وەخۆ دەهاتەوە و هێور دەبووەوە و واقیعیانە تەماشای شتەکانی دەکرد. لێرەشا، لە میلیکوڤودا، پاش ئەوەی وەخۆ هاتەوە و هەر هەموو کەموکوڕییەکانی خۆی گوتەنی "دۆك نشینەکەی" بۆ دەرکەوت: ئەم خانووە یەك نهۆمە، دە ژوورییە، لە هەموو لایەکەوە درزی بردبوو و لە حاڵی داڕووخان و هەرەس هێنانا بوو، یەکپارچە پێشکە و سیسرك بوو، دەتگوون هەڵدەقوولێن. شەوێ تەڵەی مشکیان دەنایەوە، هەموو بەیانییەك کە هەڵدەستان، چەندین مشك بە تەڵەکانەوە بووبوون. جا چیخۆف چونکە دڵی نەدەهات بیان کوژێ، دەیبردن و لە پووشەڵانێکی نزیکی خۆیانا، بەرەڵای دەکردن، بەو ئومێدەی دەرسیان وەرگرتبێ و جارێکی دی نەیەنەوە بە ماڵی ئەودا. بۆ ئەوەی دەستێك بە ماڵەکەدا بێنێ، کەمێك نۆژەنی بکاتەوە، چەند دارتاش و بۆیاخچی و نیگارکێش و بەنایەکی بە کرێ گرت، ئەمانە لەسەر قسە و ڕێنوێنی چیخۆف، کەوتنە نۆژەنکردنەوەی بن میچ و تەختەی ناو ژوورەکان، ژوورەکانیان بۆیەکرد، دیوارەکانیان کاغەز پۆش کرد، موغەیەریەکانیان سەر لە نوێ چیمەنتۆکاشی کردەوە، بیرێکی تازەیان هەڵکەند، گەوڕ و کەپرەکانیان لابرد، دەرگایەکی دیکەیان، بۆ مەدخەلی ژووری کارکردنەکەی دانا، تا تەوژمی با وەژوور نەکەوێ. پاشان تەوالێتێکی گەورە و مۆدێرنیان بۆ دروستکرد. هەر هەموو ئەندامانی خانەوادەکە بەشدارییان لەم نۆژەنکردنەوەیەدا کرد: دایکیان کاروباری ماڵەکەی ڕادەپەڕاند، باوکیان، پاول یگوروفیچ، گیاکەڵەی ڕاڕەوانی باخچەکەی بژار دەکرد. ماری، سەوزەجاتی دەڕواند، میخائیل سەرپەرشتی کاری کێڵگەکانی دەکرد. ئانتون سەرپەرشتی میوەزار و باخی گوڵانی دەستۆگرتبوو. هەشتا دار سێو، شەست دار گێلاس و یەك دنیا داری سنۆبەر و نارەوەن و گوڵەباخ و سۆرگوڵ و یاسی شینی ڕواند. تەماشای گوڵان، گەشکە و ئۆخژنی وەدڵ و دەروونی دەبەخشی. زۆر دڵی بەوە خۆشبوو کە ڕۆشنبیرێکی دەست و پێ سپی وەکو ئەو بتوانێت بەشداری لە گەشاندنەوە و شکۆفانەوەی سروشتدا بکات. با بەشداریەکی بچووکیش بێ. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (١٨٩٢/٣/١٧) لەو بارەیەوە دەڵێت: "لە سروشتدا شتێکی سەیر و کاریگەر ڕوودەدات، زۆر خۆش و تازە، کە قەرەبووی هەموو ناڕەحەتییەکی ژیانی گوند دەکاتەوە. هەموو ڕۆژێ شتێکی تازە و چاوەڕوان نەکراوی پێیە، یەك لە یەك خۆشتر. ڕیشۆڵان هاتوون، ئاو لە هەموو لایەکەوە تەقیوە و خوڕەخوڕ ڕێدەکات، لەو شوێنانەدا کە بەفر چووەتەوە، گیا سەری دەرێناوە.. کە چاوم بە بەهار دەکەوێ، خۆزیا دەخوازم کە لەو دنیا بەهەشت هەبێت".

جگە لەو دوو وەرزێرەی کە کاروباری زەوی کێڵان و کشتوکاڵیان بۆ دەکردن، ئاشپەزێك و کارەکەرێکیشیان هەبوو. چیخۆف گوتەنی خانەوادەکەیان "وەکو لۆرت دەژیان" هەر هەمووان، دایك و باوك و براکانی و خوشکەکەی بەڕادەیەك دڵیان بەم موڵکە خۆشبوو، هەریەکەیان بە

موڵکی ڕاستەقینەی خۆیی دەزانی. هەر ژوورێك ڕێك بە گوێرەی تەبیعەتی ئەو کەسە بوو کە تیایا دەژیا: پاول یگوروفیچی باوکیان، ژوورێکی ڕەبانانەی هەبوو پڕبوو لە ئیکۆنان و کتێبی ئەستووری ئاینی، کتێبی نوێژ، بۆنی توندی بخورد و داری عوود. ژوورەکەی یوگنیا باکوڤلڤنا (دایکیان) ژوورێك بوو ڕوناك، دڵگیر، ڕازاوە بە پەردەی جوان و بەدەق، تەشتی جلشۆری و مەکینەیەکی خەیاتی. ژوورەکەیماریای سەلار و سەنگین، تەختێکی باریك و ریزێك گوڵدان و وێنەیەکی گەورەی چیخۆڤ تیابوو کە زۆری خۆش دەویست. ژوورەکەی چیخۆف ژوورێکی گەورە بوو، سێ پەنجەرەی گەورە و بەرز و بێپەردەی تیابوو، تەختێکی پانی تیابوو کە زۆری خۆشدەویست. ژوورەکەی چیخۆف، ژوورێکی گەورەبوو، سێ پەنجەرەی گەورە و بەرز و بێ پەردەی تیابوو، تەختێکی پانی گەورە کە ماندوو دەبوو، لەسەری پاڵدەکەوت و چاوێکی گەرم دەکرد. چەند دۆڵابێکی خانە خانەی پڕ لە کتێبان لەگەڵ مێزێکی نووسیندا، کە لەبەر کاغەزان دیار نەبوو. یوگنیا پاکوڤلڤینا، کوڕە ناودارەکەی، نووسەرە بە ناوبانگەکەی زۆر خۆش دەویست، زۆربەی کاتی خۆی بە دروستکردنی خواردنی دانسقەوە بۆ ئەو بەسەر دەبرد. باوکیانیش، هەرچەندە لە دڵەوە پێی ناخۆش بوو کە پێگەی خێزانداری دابوویە کزی، بەڵام چیخۆڤ بەسەرگەورەی خێزانەکەیان دەزانی. چیخۆفیش، لەلای خۆیەوە، هەرچەندە بە تەبیعەت کەسێکی دڵپاك بوو، ئەوەی لە بیر نەدەچووەوە کە بابی بە منداڵی چەند دەگەڵیا بە زەبر و زەنگ بوو. لە لایەکەوە بە ڕەفتار و گوتاری نەرمونیانی دایکی دڵی خۆش دەبوو، بە کردار و قسەکانی بابی قەڵس و تووڕە دەبوو. سەری لەوە دەسوڕما، چۆن پیاوێك کە بە درێژایی تەمەنی دەستی بۆ هەر کارێك بردبێ شکستی هێنا بێ، دەبێ تا تەمەنی پیریش هەر خۆی بە گەورە بزانێت، ڕۆڵی پیاوی گەورە بدینێ، قسە لە هەموو شتێکا بکات، ئەمر بکات، نەهی بکات و بەو شادیە گەوجانەیەوە حوکم لەسەر هەموو شتێك بدات . پاول یگوروفیچ، دەفتەرێکی هەبوو، زۆر بە جدی هاتوچۆی میوانان و بەرزی و نزمی گەرمای دنیای تیا تۆمار دەکرد، دەگەڵ هەڵکشانی تەمەندا، زیاتر خووی دابووە دین و دینداری و سەری چووبا نوێژ و نزای نەدەچوو، بەشداری هەموو قوداسێکی دەکرد، بە دەنگی بەرز لە ژوورەکەی خۆیدا نوێژی دەکرد، مزمارانی بە دەنگ و ئاوازەوە دەخوێند، لە ڕۆژانی جەژندا بخوردانێکی هەڵدەگرت و بە سەرانسەری ماڵەکەدا دەیگێڕا.

هەر سێ براکەی چیخۆف ئێستا کاریان دەکرد و وەزعیان باش بوو، ئیڤان بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو، مووچەکەی باش بوو، میخائیل فەرمانبەری دەوڵەت بوو، ئەلکساندەر کە کاری ڕۆژنامەوانی دەکرد، گەیی بووە ئاستێك کە بیەوێ موڵکێکی بچووك بۆ خۆی بکڕێت. ئەمانە هەموویان بۆ بەسەر بردنی پشووی هاوینان، بۆ میلیکۆڤۆ دەهاتن. هەندێجار لە پشووی کۆتایی هەفتەشدا پەیدا دەبوون. چیخۆف هەرچەندە هەموویانی خۆش دەویست، بەڵام بەینی دەگەڵ ماریای خوشکیا، لە هەموویان خۆشتر بوو. ماری لە کێڵگەکاندا کاری دەکرد، جووتێ جزمەی قورسی لە پێ و، لەچکێکی سپی لەسەر دەکرد و ملی بە کارەوە دەنا و ئیشی چوار پیاوی دەکرد، وێڕای ئەمەش، زۆر مدارای چیخۆڤ دەکرد. لە ڕادە بەدەر خۆشی دەویست، تا ڕادەی

فیداکاری خۆشی دەویست. خۆشەویستییەکی وا کە شووکردنی لە بیری خۆیدا سڕی بووەوە. نەیدەتوانی تەسەوری ئەوە بکات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە پێناوی شووکردنێکی ئاسایی و عاتیفیدا ، دەستبەرداری ئەم کەڵە پیاوە ئازیزەی ژیانی ببێت.چیخۆفیش گیرۆدەی هەمان بیرکردنەوە بوو: کە ماریا هەبێ، بۆچی ژن بێنێ؟ بۆچی خۆی بە ژنەوە ببەستێ، دڵدارییەکی ڕەوتەنی، ئاشقێنیەکی سەرڤە سەرڤە لێرەو لەوێ، ئەگەر هەبێ خراپ نییە، بەڵام نابێ بێڵێ لەوە هێوەتر بڕوات.

ماریا، لە دڵی خۆیدا، ئەم هەڵوێستەی براکەی پێخۆش بوو، چیخۆف لە نامەیەکیا (١٨/ت١/١٨٩٢) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "با باسی خۆم بکەم. نە بەتەمای ژن هێنانم، نە تا ئێستا ئافرەتێکی وام دۆزیوەتەوە کە زەماوەندی دەگەڵ بکەم، بەڵام وێڕای ئەوەش ئاشقێنی شتێکی خراپ نییە".

ئەلکساندەر، کە نیگەرانی چارەنووسی چیخۆف بوو، لە نامەیەکیا گلەیی لەم هەڵوێستە نەرێنییەی چیخۆف دەکات و پێی دەڵێت: "تۆ وەکو ڕەبەنان دەژیت، کاتێ بە خۆ دەزانی قۆناغی زێڕینی تەمەن بەسەرچووە و هیچ شوێنەوارێکت لە دوای خۆ بەجێ نەهێشتووە. هەر ئەوەندەت بۆ دەمێنێتەوە، بڕۆی بۆ باخی گیانلەبەران و بە چپە دەگەڵ سمۆرەکەتدا، باسی لەزەتی زگورتیاتی بکەیت". و لەسەری دەڕوات: "ئەوەی کە زۆر بە ڕوونی دیارە، پەیوەندی تۆ دەگەڵ ماریادا، ڕاست نییە. بە یەك قسەی میهر ئامێزی تۆ، بە یەك قسەی نەرمی تۆ، بە تەواوەتی ڕام دەبێت، ئامادەیە ملکەچی هەر فەرمانێکی تۆ ببێت، یانی لێت دەترسێت و تەنیا لایەنە ئەرێنییەکانی تۆ دەبینێ، تەنیا ئەو لایەنانەی کە شایستەی ستایشن". . ئەوەبوو لە ڕێگەی بویەرێکی بچووکەوە دروستی ئەو بۆچوونەی ئەلسکاندر دەرکەوت. لە هاوینی ساڵی ١٨٩٢دا، گەنجێکی قۆز، کە کاتی خۆی خانەوادەی چیخۆف، لە ماڵی لنتارییف دا دیتبوویان،بە میوانی هاتە ماڵی چیخۆف لە میلیکۆڤۆ، ئەم گەنجە قۆزە ناوی ئەلکساندر سماگین بوو. کە یەك دوو قسەی ئاشقانەی ڕەوتەنی بە گوێی ماریادا دا، یەکسەر حەزی لێکرد و داوای لێکرد شووی پێ بکات. ماریا، هایم و حەیران، دوو دڵ و هەراسان، نەیدەتوانی بڕیار بدات، پێویستی بە کەسێك بوو ڕاوێژی پێبکات، پرس و شێرەت بە کێ؟ بە باوکی؟ هەڵبەتە نەخێر. بە دایکی؟ نا، بەویش نا! بەڵکو بە ئانتون، ئەدی ئەو گەورە و ئاقڵ و دەمسپی خێزانەکە نەبوو؟ ئەوەبوو، هەموو ترسێکی وەلاوەنا و چوو لە ژوورەکەی خۆیدا بینی و ڕووبە ڕوو پێی گوت: "دەزانی ئانتون، لێبڕاوم شوو بکەم". چیخۆف کە دەیزانی خوازگارەکەی کێیە، لەو بارەیەوە هیچی نەپرسی، بەڵام ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و هیچی نەوت. ماریا، لە بێدەنگی براکەی ترسا. لە یاداشتەکانی خۆیدا دەڵێت: "کە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، یەکسەر زانیم کە هەواڵەکەی پێ ناخۆشە، جا وەڵامی چی بداتەوە؟ زانیم نایەوێ بە زەقی بڵێ ڕۆیشتنی منی لە ماڵەکە بۆ ماڵێکی تر و پێکەوەنانی خێزانی تازە بۆ خۆم، بۆ ئەو یەجگار ئەستەم و ناخۆشە..." ماریا بێئەوەی هیچ وەڵامێکی براکەی وەربگرێت، حایر و سەرسام، ناکام و نائومێد بۆ ژوورەکەی خۆی گەڕایەوە و ما بگری. چیخۆف لە ڕۆژانی دواتریشدا، خۆی لە گێلی دا و، ئەو باسەی دەگەڵ خۆشکەکەیدا

نەکردەوە. ماری لەو بارەیەوە دەڵێت: "زۆرم بیر لەو مەسەلەیە کردەوە، ئەنجام خۆشەویستی براکەم، بەسەر بڕیارەکەمدا زاڵ بوو. نەمدەتوانی کارێك بکەم کە دڵی بڕەنجێ، یان ئاوەڕۆی ژیانی لێڵ بکات، یان هەلومەرجی کاری ئەفراندن و نووسینی لێتێك بدەم کە هەمیشە لە خەمی ئەوەدابووم ئەو هەلومەرجەی بۆ بڕەخسێنم. ئەوەبوو سماگینم ئاگادار کردەوە کە بۆ یەك نابین، کە هەڵبەتە زۆری لەبەرگران و ناخۆش بوو".

پاش ئەوەی مەسەلەکە بەو جۆرە کۆتایی هات، ئیدی چیخۆف هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشا. بە ڕاستی زۆر ترسابوو. تا ئەو ڕۆژە قەت وێنای ئەوەی نەکردبوو، کە خوشکەکەی چ دەورێکی گرینگی لە ڕاگرتنی هاوسەنگی ژیانی ڕۆژانەی ئەودا هەیە.چ کۆڵەکەیەکی ژیانی ئەوەو،چۆن ژیانی بەبێ ئەو دادەڕوخێ و هەرەس دێنێ. هەڵبەتە مەسەلەکە بۆ چیخۆف، مەسەلەی غیرە نەبوو، بەڵکو زیاتر خۆپەرستی بوو. هەر بۆ خۆشی و شادمانی خۆی، حەزی دەکرد، کە ماریای ڕۆشنبین، کۆشیار، میهرەبان و بێدەنگ هەر لەگەڵیان بمێنێ و هیچ خوازگارێك نەیەت داوای بکات و گیانی خوشکایەتی لە بیر بەرێتەوە. ئەم دووانە بۆ یەکدی دروست بووبوون و پێویستیان بە سۆز و میهری بێگانە نەبوو، مەسەلە جەستەییەکەی لێدەرچێ، ئیدی هاولفی تەواو بوون، چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، سەرسامی خۆی دەردەبڕێت کە چۆن ئەم کیژە، بیست و حەوت ساڵانە، خوازگارێکی ڕەفز کردبوو کە بە قەناعەتی ئەم لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر لەبار و گونجاو بوو. شرۆڤە و ڕاڤەی چیخۆف بۆ ئەم هەڵوێستەی خوشکەکەی ئەوەبوو کە گوایە ئەویش، وەکو ئەم حەزی بە ژیانی سەڵتایەتیە. دەبینین دوای چەند هەفتەیەك لە نامەیەکیا (١٨/ت١٨٩٢/١) بۆ سوڤورین، بەرگری لەو شرۆڤە و بۆچوونەی خۆی دەکات و دەڵێت: "شووکردنەکەی خوشکم سەری نەگرت، هەرچەندە پێموایە، گەنگەشە و گفتوگۆ، لە ڕێگەی نامەوە بەردەوامە، من سەر لە هیچ دەرناکەم. وا هەست دەکەم جارێکی دیکەش ڕەفزی کردووە. من کیژی وام نەدیتووە، یەکەم ئافرەتە کە نایەوێ شوو بکات، ڕاستگۆیانە شووکردن ڕەفز دەکات". هەڵبەتە قازانجی چیخۆف لەوەدا بوو کە قەناعەتی وابێت، کە خوشکەکەشی وەکو ئەو حەزی لە ژیانی سەڵتایەتی بێ.

بە هەرحاڵ، سەربهوردی ئەشقە ناکامەکەی ماریا و سماگین، بە بێدەنگی و بێئەوەی خەڵکێکی ئەوتۆ هەستی پێبکەن، تێپەڕی. میوانێکی زۆر لەوێ بوون، کەس ئاگای لە کەس نەبوو. ئیدی ماڵەکە پڕبوو لە ئاشنایانی چیخۆف و ماری، دەرودراوسێ، لاپرەسەنان، پزیشکانی ناوچەکە، خزمانی دوور بە منداڵەکانیانەوە. میوانەکان هەر چوار کەس و لە ژوورێکدا دەنووستن. هەندێکیان لە ڕاڕەوەکاندا دەخەوتن. چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ سوڤۆرین (٨/ك١٨٩٢/١) دەڵێت: "خۆزگە دەتزانی چەند ماندووم، هێندە ماندووم لە گیانی خۆم بێزارم، میوان، میوان، میوان، میوان نابڕێتەوە... هەر ڕۆشنبیرێك بەم دەڤەرەدا ڕەت دەبێ، وا دەزانێ لەسەرێتی سەرێکی من بدات، تاوێ لێرە لابدات و هەندێجار شەویش بمێنێتەوە.. خۆ میوان و میوانپەروەری خۆشە، شتێکی جوانە، بەڵام هەموو شتێ بە خوێ و خوێش بە مانا، من بۆیە لە مۆسکۆ بارم کرد تا لە میوانان ڕزگار بم".

هەڵبەتە لە نێو ئاپۆرای میوانانداا، هەندێکی زۆر ئازیز و خۆشەویستیان تیابوو، لەوانە: "لایکامیزینوڤای خشیك و، شاعیرێکی گەنج بە نێوی ناتیاناشچپکینا- کوپرنیك، ناتاشا لنتڤاریڤای خەنۆڵ و، لیڤیتانی نیگارکێشی تووڕە و تڕۆ. لیڤیتان دیمەنە ڕووسیەکانی میلیکۆڤی زۆر بە دڵ بوو، بە ئیلهامی ئەو دیمەنانەوە چەند تابلۆیەکی ناسکی خەمئەنگێزی کێشا. ڕۆژێك کە دەگەڵ چیخۆفدا، لە مێرگوزارێکدا خەریکی ڕاو بوون، بە گوللە سۆسکەیەکی پێکا و برینداری کرد، بەڵام هەرچی کرد و کۆشا، دڵی نەهات بیکوژێت: چاوانی درشت و ڕەشی باڵندەکە بە حەیرانی لەوانی دەڕوانی. لیڤیتان کە چاوانی نووقاندبوو و برۆکانی وێك هێنابوونەوە تکای لە چیخۆف کرد، کە بە قۆناغی تفەنگەکەی سەری باڵندەکە پان بکاتەوە. چیخۆف لە سەرەتاوە ملی بۆ ئەم کارە نەدا، بەڵام پاشان لە ژێر گوشاری لیڤیتان دا، ملی داو باڵندەکەی کوشت. لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (١٨٩٢/٤/٨) دەڵێت: "لەو کاتەدا کە دوو کەودەن بۆ ماڵ دەچوونەوە و لەسەر خوانی ئێواریێ دادەنیشتن، یەك ئافەریدەی جوان و دڵڕفێن لە دنیا کەم بوو بووەوە".

چیخۆف لەو ڕۆژانەدا چیرۆکێکی درێژی بە ناونیشانی زیك زیکە نووسی بوو و ناردبووی بۆ بڵاڤۆکی "باکوور" لە پیاسە و گەڕانەکانیاندا ئەمەی بۆ لیڤیتان باس نەکردبوو. ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە پەیوەندی لیڤیتانەوە دەگەڵ سۆفیا کوڤشینیکوڤای ژنی ئەو برادەرە پزیشکەوە وەرگرتبوو، کە چیخۆڤ تا ساخالین بەڕێ کردبوو. دروستە کە تەمەن و سیمای جەستەیی قارەمانەکان لە نموونە واقیعیەکان جیاواز بوو، هەرچەندە چیخۆف هەوڵێکی زۆری دابوو، نیشانە و قەرینەکان بشارێتەوە، بەڵام هێشتا لێکچوونەکان زۆر دیار و زەق بوون. قارەمانە خشکۆکەکەی (زیك زیکە) ئۆلگا، وەکو نوسخە ئەسڵە واقعییەکەی خۆی ژنێکە گەنج و کراوە و ژنی ناو کۆڕ و کۆمەڵان، لە مێردەکەی خۆی، دکتۆر دیمۆف، کە پیاوێکی زۆر کۆشیار و زیرەك و سەنگین و جدیە، بێزارە. ئەم ژنە هاتوچۆی هونەرمەندان دەکات و تێکەڵیان دەبێت، وا وێنا دەکات بەمە گەورە دەبێت. بەهرەی نیگارکێشی لا دەڕسکێ و دەبێت بە نیگارکێش. ئیدی دەگەڵ ریابوفسکی نیگارکێشدا سەفەرێکی کەنارەکانی ڤۆلگا دەکات و فریو دەخوات و دەبێ بە ماشقەی ڕیابوفسکی، لە سەرەتادا وا هەست دەکات بە بلیمەتی خۆی پیاوێکی زۆر ئاسایی لە گەڵ بلیمەتێکدا فریو دەدات، بەڵام کە مەرگی مێردەکەی دێتە پێشێ، و هەمووان سووی لێ دەخۆن و بە زانایەکی گەورەی ناو دەبەن، هەنگێ دەزانێ چ هەڵەیەکی گەورەی کردووە. چیخۆف لەم چیرۆکەدا کە بە ڕاستی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، زیرەکانە داڕێژراوە، جارێکی دی ڕووبە ڕووی بریق و باقی سەرکەوتن دەوەستێتەوە و ستایشی تەوازعی ئەو دکتۆرە زانایە دەکات کە بە کپی و بێدەنگی دوور لە هەر خۆ نواندنێك ئابڕوومەندانە کار دەکات.

ڕاستە جەماوەری خەڵك ئەم چیرۆکەیان زۆر بە دڵ بوو، بەڵام ناوەندە هونەرییەکە لێی ڕازی نەبوون، لیڤیتان، کە خۆی لە کەسایەتی ریابوفسکی شاقارەمانی چیرۆکەکەدا بینی بووەوە، نەك هەموو پەیوەندییەکی دەگەڵ چیخۆفدا بڕی، بەڵکو لەزگ بوو داوای دوئێلیشی لێبکات، هەڵبەتە زیزك زیکە ڕاستەقینەکەش (واتا ژنی دکتۆرەکە) کە هەستی دەکرد بە شێوەیەکی کاریکاتۆری

ڕیسوای کردووە، ئامادە نەبوو ڕووبداتە چیخۆف و لە ماڵی خۆیدا پێشوازی لێبکات. هەرچەندە چیخۆف زۆر چاك دەیزانی کە هەوێنی چیرۆکەکەی لە ژیان و کەسایەتی ئاشنایانی خۆیەوە وەرگرتبوو و چیرۆکەکەی پێ ڕازاندبووەوە، وای دەنواند کە نازانێ هۆی ئەم تۆران و تووڕەبوونە چییە. چیخۆف لە نامەیەکیا (١٨٩٢/٤/٢٩) بۆ لیدیا ئەڤیلوڤا دەڵێت: "تەسەور بکە، خانمێکی ئاشنای خۆم، کە تەمەنی چل و دوو ساڵە، خۆی لە کلێشەی قارەمانە بیست و دوو ساڵانەکەی چیرۆکی "زیك زیکە"دا بینیوەتەوە کە لە ژمارە (١، ٢)ی بڵاڤۆکی باکووردا بڵاوبووەتەوە". هەموو مۆسکۆی لێ تێگەیاندووم، هەموو مۆسکۆ گلەییم لێدەکەن. بەڵگەشیان تەنیا ئەوەیە کە بە ڕواڵەت و کار و کردارەوە لێکدی دەچن: خانمەکە نیگارکێشی دەکات و مێردەکەی پزیشکە و ژنەش بووە بە ماشقەی کابرایەکی نیگارکێش".

هەرچەندە چیخۆف، تۆرانی برادەرەکەی زۆر پێناخۆش بوو، بەڵام دانی بە تاوانباری خۆیدا نەنا. بە بۆچوونی ئەو، نووسەر هەقی خۆیەتی و، بگرە لەسەرێتی کارە ئەدەبیەکەی بەو ڕەگەزانەش موتوربە و بارگاوی بکات کە ژیانی واقیعی بۆی فەراهەم دەکات. ئەدەب، ئەگەر واقیع و خەیاڵ ئاوێتە نەکات وشك دەکات.

چیخۆف هەرچەندە، دۆستایەتی لیڤیتانی لە دەست دا، بەڵام دۆستایەتییەکی دیکەی خۆشتر ئەو بۆشاییەی بۆ پڕکردەوە، ئەویش دۆستایەتی لایکای شۆخ و جوان بوو، کە هاتوچۆی ئەو بۆ میلیکوڤو، گەیی بووە ئاستێك کە بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانی چیخۆفدا پڕ کردبووەوە.لەو نامانەدا کە چیخۆف بۆی دەنارد، لە ژێر پەردەی تەنزا هەستی ڕاستەقینەی خۆی بۆ دەردەبڕی. دەینووسی: "چاوەڕوانت دەکەم، خەو بە گەیشتنتەوە دەبینم، وەکو چۆن عەرەبێکی سارا گەڕ، لە بیاباندا خەو بە ئاوەوە دەبینێ". یان: "بیرت دەکەم، ئامادەم پێنج ڕۆبڵ بدەم تا دەرفەتێکی قسەکردنم لەگەڵ تۆدا بۆ بڕەخسێت، ئەگەر تەنیا بۆ پێنج دەقیقەش بێ" یان: "وەرە، دەزانی چەند پێویستم بە تۆیە، لیکوسیا، تکایە دڵم مەشکێنە، وەرە".

دیارە، ماری هەستی بەم پەیوەندییە تازەیەی چیخۆف لەگەڵ لایکادا دەکرد. لە نزیکەوە چاودێری و پەنگیری ئەم ڕاز و نیازەی دەکرد، کە براکەی زۆری لەزەت لێدەبینی. چیخۆف جاری وا هەبوو هەنگاوێك لە کیژێ نزیك دەبووەوە و ئەوجا، لە پڕێکا، وەکو ئەوەی بترسێت دەگەڕایەوە، لەسەرەتای بەهارا نامەیەکی ڕەشبینانە (١٨٩٢/٣/٢٧) بۆ لایکا دەنووسێت، هەوڵ دەدات، ژێوانی بکاتەوە، دەڵێت: "مخابن، من ئێستا گەنجێکی پیرم، خۆشەویستی من هەتاو نییە و هیچ مژدەیەکی خۆشی پێ نییە، نە بۆ من و نە بۆ ئەو تەیرەی خۆشم گەرەکە. لایکا من زیاتر کوڵ و کوڤانی ڕابردووی خۆم و گەنجایەتی بەهەدەرچووی خۆم لە تۆدا خۆشدەوێ، نەك خودی تۆ" کەچی دوای دوو ڕۆژان بادەداتەوە و بە زمانێکی دی دەڵێت: "بۆم بنووسە، ئەگەر دوو دێریش بووە قەیدی نییە، وا زوو بە فەرامۆشیمان مەسپێرە، کارێکی وەها بکە، بەلای کەمەوە وا هەست بکەین، لە بیرت ماوین، هەڵمان بخەڵەتێنە، لایکا، فریودان لە فەرامۆشکردن باشترە... لە تەپڵی سەرەوە تال بنی پێ، بە دڵ و بە گیان، تا گۆڕ، تا خۆ لە بیرکردن، تا بێ ئاگایی و شێتی دەگەڵتا ڕاست و ڕاستگۆم".

لایکا، بە دەنگی نامەکەی چیخۆفەوە دەچێت بۆ میلیکوڤا، بەڵام یەکسەر هەمان دوودڵی و ڕاڕایی و چپە چپەکانی جاران دەستی پێکردەوە. ئەم وەزعە ئاڵۆزە، لایکای زۆر نیگەران و پەشێو دەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە چیخۆفیش هیچ لەوە نەدەچوو بە دیدار کێژێ شاد بێت. ئەوەبوو لە نامەیەکی (١٨٩٢/٦/٢٨) دا هەڵوێست و هەستی خۆی بۆ ڕوونکردەوە، کە تیا مابوو، لە لایەکەوە پەیوەندییە سۆزدارییەکەی پێخۆش بوو لە لایەکی ترەوە لە خواستنی لایکا دوودڵ بوو و دەترسا، لە نامەکەیا دەڵێت: "لایکای بەڕێز و حورمەت، هەرکە ئاگادارت کردمەوە، کە نامەکانم هیچ مەسئولیەتێکم ناخەنە ئەستۆ، ئیسراحەتم کرد، ئێستا حاڵی حازر خەریکم نامەیەکی دووردورێژت بۆ دەنووسم، بێئەوەی ترسی ئەوەم هەبێ کاتێ پورێکی پیر، ئەم دێڕانە دەخوێنێتەوە، ناچارم بکا کە هیولاودێوێکی وەکو تۆ بخوازم. منیش لای خۆمەوە پەلەمە تا تۆ دڵنیا بکەم: کە نامەکانت لای من گوڵی بۆندارن، نەك بەڵگەنامە.. بە گوتەیەکی دی تۆ ئازادی..هەڵێ، بۆ خۆت هەڵێ بۆ دوور، دوور لە من! بەڵام نا، هەرچۆنێ بووە، لێگەڕێ با بە بۆنی تۆ مەست بم، یارمەتیم بدە، با ئەو داوەی لە ملت کردووم، زیاتر لە ملی خۆمی بجەڕێنم. لە بەرچاومە کە کاتێ ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە چۆن ڕێوی ئاسا پێدەکەنی... خودایا... ئەم شتە قۆڕانە چییە کە من دەینووسم! ئەم نامەیە بدڕە پیشانی کەسی مەدە... کەواتە خواحافیز، ئەی عەزابی ڕۆحی من. وەکو لات و لەوێران، کیفی مکیاجەکانت دەلێسمەوە، خۆزگە بە پێڵاوە کۆنەکانت دەخوازم  کە هەموو ڕۆژێ دەتبینن".

چیخۆف، وێڕای ئەم سوعبەت و شۆخیانەی دەگەڵ لایکا و وێڕای زۆری میوان، لە کار و نووسینیش غافڵ نەدەبوو، لێرەدا لە میلیکۆڤۆ، نووسین بۆ ئەو جۆرە خۆشی و سەرگەرمییەك بوو. ئەم هاوینە، چەند چیرۆکێکی نووسی لەوانە: (هاوسەرەکەم، دراوسێکان) و لەوانەش گرنگتر، (قاوشی ژمارە شەش) بوو کە بویەر و ڕووداوەکانی لە خەستەخانەیەکی گوندیدا ڕوودەدەن.

چیخۆف، وێڕای سەرکەوتنی لە بواری نووسین و نووسەرایەتیدا، کاری پزیشکیشی پشت گوێ نەخستبوو. نەخۆشان لێرەش، لە لادێ، وازیان لێ نەدەهێنا و پەنایان بۆ دێنا، ژمارەی نەخۆشانی ئێرەی زۆر زیاتر بوو لە هی شار. ڕۆژانە، جووتیار و وەرزێر و کرێکار و ژنان بە خۆو منداڵەکانیانەوە، لە دووری بیست و پێنج کیلۆمەترەوە، پەنایان بۆ ئەم دێنا. بەیانیانی زوو لەبەر ماڵەکەیاندا ڕیزیان دەبەست و زۆری پێنەدەچوو، ماڵەکەیان دەبوو بە عیادە و ئەویش زۆر بە وریایی معایەنەی دەکردن، ڕەچەتەی بۆ هەر یەکێکیان دەنووسی، ئەو دەرمانەی کە لە مۆسکۆوە هێنابووی، بە خۆڕایی بەسەریدا دابەش دەکردن، بە دەگمەن نەخۆشیان تیا هەبوو، هەقی معایەنە و ماندووبوونەکەی بداتێ. ناوبانگی دکتۆری چیخۆف، هێندە خێرا، لە هە چوار نکالی میلیکۆڤۆ بڵاوبووەوە، کە ئەنجومەنی گوند، لە ساڵی ١٨٩٢/٦دا، وەختێ دەنگ و باسی پەیدابوونی کۆلێرا لە دەڤەرەکەدا بڵاوبووەوە، داوایان لێکرد، فریا بکەوێ و تەگبیری ئەوە بکات کە نەیەڵێت نەخۆشییەکە تەشەنە بسەنێ. ئەویش یەکسەر ئەو ئەرکەی قەبووڵ کرد، کەوتە خوێندنەوەی تازەترین لێکۆڵینەوە و سەرچاوە لەسەر ئەو نەخۆشییە. یەکەم ئیشی ئەوەبوو

قەرەنتینەی بۆ نەخۆشانی بیست و پێنج گوند و چوار کارخانەی سەر بەو دەڤەرە کردەوە. جا چونکە خۆی پارەی نەبوو و دەرەقەتی مەسرەفی ئەو کارە قورسە نەدەهات، بە زمامی گەدایان، کەوتە پاڕانەوە و لاڵانەوە لە دۆستان و دراوسێیان و کارخانەدارانی دەوڵەمەندی دەڤەرەکە. بە گالیسکەیەکی چکۆڵەی شەق و شڕ، لەقە لەق، لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەڕۆیی، جوتیارە نێگەران و هەراسانەکانی ئامۆژگاری دەکرد، کە چۆن خۆیان بپارێزن و سەرباری ئەمەش، چارەسەری لەرز و تاو قوڕگ یەشە و سی ڕۆژەشی دەکرد. لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، نزیکەی هەزار نەخۆشی معایەنە کرد. لە نامەیەکیا (١٨٩٢/٨/١٦) بۆ سوڤەرین دەڵێت: "لە باری دەروونییەوە زۆر ماندووم، بێزارم. زۆر ناخۆشە خاوەنی خۆت نەبی، ئیش و کارت ببێ بەوەی هەر بیر لە سکچوون و بەلەفیڕێ بکەیتەوە، شەوێ، هەرکە گوێت لە حەپەی سەگێك، یان تەقەی دەرگا بێت، خێرا لە خەو ڕاپەڕیت (تۆ بڵێی بە دوو منا هاتبن؟) سەفەر بە ئەسپەلات، بە ڕێگا و بانی هات و نەهاتدا، هیچ شتێك نەخوێنیتەوە تەنیا ئەو شتانە نەبێ کە باسی کۆلێرا دەکەن، پیاو چاوەڕوانی هیچ نەکات تەنیا کۆلێرا نەبێ و، ئەوجاش بەرانبەر بە نەخۆشییەکە و بەو کەسانەی کە معایەنەیان دەکەی زۆر خەمسارد و بێموبالات بێ، بە ڕاستی ئەمانە کێشە و گرفتن، وات لێدەکەن لە گیانی خۆت بێزار بی.

لە نامەیەکی پێشووترا (١٨٩٢/٨/١) بۆ سوڤۆرین گوتبووی: "ئەم جوتیارانە، پاشکەوتوون، پیس و پۆخڵن، خۆ ناپارێزن و لە دەرمان و مالیجە بە گومانن، بەڵام ئومێدی ئەوەی کە ئەم هەموو ڕەنجەمان بەفیڕۆ ناڕوات، دەبێتە هۆی ئەوەی تەحەمولی ئەم هەموو زەحمەتە بکرێت. من لە هەموو دکتۆرەکانی دەڤەرەکە، داماوترم. گالیسەکەکەم خراپە، ئەسپەکانم، لەڕولاتن، شارەزای ڕێگاوبانەکان نیم. شەوان هیچ نابینم، بێ پارە و پولم، زۆر زوو شەکەت دەبم، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، هەمیشە لە خەمی نووسیندام، بۆ تاقە ساتێك نووسینم لە بیر ناچێتەوە. زۆرجار دێمە سەر ئەوەی واز لە کۆلێرا بێنم و بۆ خۆ دانیشم و دەست بە نووسین بکەم".

بە هەر حاڵ، وێڕای بێزاری و بێتاقەتیش، دەستبەرداری بەگژاچوونی کۆلێرا نەبوو، بە هۆی بەرەکەتی پێداگری ئەوەوە، کۆلێرا لە کوڵ دەڤەرەکە بووەوە، نەك منەتی بەسەر کەسدا نەدەکرد، بەڵکو بە هۆی گومانداری خۆیەوە، لە خۆیشی ڕازی نەبوو. ئەوەی لە میانەی کاری نۆژداردی ئەو هاوینەیدا، دڵی خۆش دەکرد، ئەوەبوو کە بۆی دەرکەوت لە نێو خوردە زەویداران و کارمەندانی ناوچەییدا خەڵکانێکی زۆری چاکەخواز و خۆڕاگر و ورە بەرز هەبوون. زۆری پێ سەیر بوو کە چینێکی ڕۆشنبیری مەردانەی دەست و دڵ تێر لە گونددا هەبوو، کە زۆر لە چینی ڕۆشنبیرانی پیسکە و تەماعکاری شاری جیاواز بوو. لە نێو چینی ڕۆشنبیرانی شاریدا، زۆر لەوانە قەڵس بوو، کە دەیانویست سەرهەڵدانی کۆلێرا بکەن بە بیانووی دەستیان بۆ بەرپاکردنی ناڕەزایی سیاسی. هەر لە هەمان نامەی سەرێڕا، کە بۆ سوڤۆرینی ناردبوو، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر سۆسیالیستانی ئێمە، بە ڕاستی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا، بۆ خزمەتی ئامانجەکانی خۆیان بەکاربێنن، من بەش بە حاڵی خۆم لە ئێستا بە دواوە بە خوێریان دەژمێرم. هەر ئامانجێکی ڕەوا لە ڕێگەیەکی ناڕەواوە بێتەدی، ڕەوایی خۆی لە دەست دەدات... ئاخر ئەم

درۆیـە دەگـەڵ میللـەتا بۆچـی و لـە پـای چـی؟ ئەگـەر مـن سیاسـی بـام هـەرگیز قـەزای ئاییـنـدەم نەدەخسـت لـە ئێسـتا، ئەگـەر لـەبری هەردەنکـە درۆیـەك، سـەد خـەروار خۆشـی جاویـدانم، بدوریباوە".

چیخۆف، لەگەڵ نزیکبوونەوە و دەستپێکی زستاندا، وەکو هەمیشە مجێزی تێکچوو و ،دڵی تـەنگ بـوو. دیمـەنی کێڵگـە چۆڵ و هـۆڵ و بـەفر پۆشـەکان، دار و درەختـانی ڕووت و گـەڵاڕژاو، جوتیارانی ڕووتە و ڕەشپۆش هێندەی دیکە دڵیان دەگوشی و خەم دایدەگرت. بە مەبەستی خـەم بە بادان، چەند سەفەرێکی کورتی مۆسکۆی کرد، کە سەفەرەکانی مۆسکۆ هیچ دادێکیـان نـەدا، بیری لەوە کردەوە بچێ بۆ پترسبۆرگ و چەند ڕۆژێك لای سوڤورین بەسەر بەرێت. کە سۆڤۆرین لـە پـاییزدا نـەخۆش کـەوتبوو، چـیخۆف کـە زۆر ترسـابوو سـۆڤۆرین شـتێکی بەسـەر بێـت، لـە نامەیـەکیا (٣٠/ت١/١٨٩٢) بـۆ لیونتیـف-شچـکلوف، دەڵێـت: "لـە دەسـتدانی ئـەو بـۆ مـن خەسارەتێکی گەورە دەبێت، وا تەسەور دەکەم بە ئەندازەی دە ساڵ پیرم دەکات". دوای چەند مانگێـك، کـە سـوڤورین بـە تـەواوەتی چـاك دەبێتـەوە، چـیخۆف، نامەیـەکی (١٨٩٣/٨/٧) بـۆ دەنووسێت و دەڵێت: "لەکاتی خەمباریدا، کاتێ کە مرۆڤ هەست دەکات پێویستی بەوەیە بە قسە یان بە نووسین، دڵی خۆی بۆ کەسێك بکاتەوە، تۆ تاقە کەسیت کە دڵم پێت دەکرێتەوە و نامەت بۆ دەنووسم و قسەت دەگەڵ دەکەم". وێڕای ئەوەش لە کۆتایی ساڵی ١٨٩٢دا بڕیاری دا کە چیتر بۆ (ڕۆژگاری نوێ نەنووسێت و بەرهەمەکانی لە گۆڤاری "هزری ڕووسی"دا کە هەندێ لیـبڕالتر بـوو، بڵاوبکاتـەوە. هەڵبەتـە سـوڤورین (هەرچـەند ئەمـەی لەبـەر گـران بـوو، بـەڵام دۆستایەتییەکەیان هەر بەردەوام بوو.

چیخۆف، کاتێ لە ٢٩/ك١٨٩٣/٢دا بۆ میلۆکۆڤۆ گەڕایەوە، دیسان لە دنیای بەفرا نقوم بوو. دنیا، تا گوێ هەڵخەیت بێدەنگی و تا چاو بڕ کات سپی بوو، وای تەسەور دەکرد کە جارێکی دی هـەرگیز نـە هـەتاو هەڵدێتـەوە و نـە دنیـا سـەوز دەبێتـەوە. لـە نامەیـەکیا بـۆ سـوڤورین (٢٢/ت١٨٩٣/٢) دەڵێـت: "زسـتانان لـە دێهاتـدا، چـونکە کـار زۆر کەمـە و هـیچ کـارێکی فیکـری ئەوتۆش لە ئارادا نییە، ئیدی مرۆڤ خۆبە خۆ، سەردەکاتە خواردن و خواردنەوە، دەبێت بە کەسێکی زۆرخۆر و مەینۆش. بەفرەو و بەستەڵەك، دار و درەختی ڕووتی گەڵاڕژاو، شەوانی درێژ، هەیڤەشەو، بێدەنگی مەرگباری شەو و ڕۆژ، ژنانی جوتیار، گەنج و پیر، هەر هەموو ئەمانە دەبنە مایەی تەمەڵی و خەمساردی و بێموبالاتی و جگەر ئاوسانی بەشەر".

ئیـدی چـیخۆف،لەم کـەش وهەوایـەدا، خـەوی بـە وڵاتـانی بێگانـەوە دەبینی:هندسـتان، ژاپۆن،ئەفریقیای باشوور، مادێرا و تەنانەت (جابۆنا؟) ساخالینش. لە سان-پترسبۆرگدا تووشی لیڤ لیوڤیچی کوڕی تۆڵستۆی بوو، هەردووکیان بیریان لەوە دەکردەوە کە پێکەوە، لە بەهاردا بە بۆنـەی کردنـەوەی پێشانگای جیهانی ساڵی ١٨٩٣، سەفەرێکی شیکاگۆ بکەن. بەڵام چیخۆف لەبەر گرانی مەسرەفی سەفەرەکە زوو ژێوان بووەوە، هەرچەندە ئەگەر پارەشی هەبوایە، لەبەر خراپی باری تەندروستی نەیدەتوانی بچێتە ئەو سەفەرە: کۆکەکەی ئازاری دەدا و ڕوو لە زیادی بوو. کاتێ کە میخائیلی برای دێ بەسەرا و دەبینێ، خوێن هەڵدێنێ، چیخۆف، بە هەڵچوونەوە

پێی دەڵێت: "ئەمە هیچ نییە، بۆ ماری  یان دایکەی باس نەکەی ها". بە هیچ جۆرێ نەدەچووە ژێـر بـاری دەرمـان و مالیجـە، لـە نامەیـەکیا (١٨٩٣/٨/٢٤) بـۆ سـوڤورین، لەمبارەیـەوە دەڵێـت: "ئەوەی ترسناکە، ئەوەیـە کـە لێـی ناترسین، کەواتـە ئـەوەی ترست لا دروست دەکات، ترسناك نییە... من دەزانم کە بە نەخۆشییەك دەمرم کە لێی ناترسم، ئەگەر بترسابام، نەدەمردم".

کێشەی چیخۆف تـەنیا سیل و دڵـەکوتێ نـەبوو، بـەڵکو نەخۆشـییەکی تـری هـەبوو، زۆر لەوانـە "خراپتر و قێزەونتر بوو" جگە لە ئەلکساندەر و سوڤورین ڕووی نەدەهات بۆ کەسی دیکەی بـاس بکـات. لـە نامەیـەکیا بـۆ سـوڤورین (١٨٩٣/٤/٢٦) لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: "سـوزەنەك نییـە، زۆر خراتـرە: مایەسیریە... ئـازار، خـوروژن، گوشـار، نـە دەتـوانم دابنیشـم، نـەڕێ بکـەم، خارشـتێکی ئەوتۆم لە بەدەندایە، بـە مـن بـێ خـۆم بکـوژم". ئـەم نەخۆشییە بـە ڕادەیـەك بێـزاری دەکـرد کـە بـە ناچـاری و زۆر بەزەحمـەت، تەحـەمولی دەم و دووی بـاوکی، گلـەیی و گریـانی دایکـی و ژیـانی ڕۆتـینی ماڵەکـەی دەکـرد. میخائیـل کـە لـە گەرمـەی ژن گوێزانـەوەدا بـوو، لـەپڕ کارەکـەی هەڵوەشـایەوە، ئـانتوان وای هەسـت دەکرد لەناوجەرگـەی کارەسـاتێکی بـێ وێنـەدا دەژی. ئیڤـان خۆی ئامادە دەکرد کە دەگەڵ کێژۆڵەیەکی ئەرستۆکراتی "جوانکیلەی کەپوو درێژدا" زەماوەنـد بکات. منداڵەکانی ئەلکساندر، هەر هەراوزەنایان بـوو. تەنانـەت خوێندنـەوەش تـوڕەیی و بێـزاری لێ نەدەڕواندەوە. خـوی دایـە خوێندنـەوەی بەرهەمـەکانی تورگینـف. لە نامەیـەکیا بـۆ سـوڤورین (١٨٩٣/٢/١٣) لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: "شـتێکی جوانـە، بـەڵام ناگـات بـە تۆڵستۆی، زۆر لـە خـوار تۆڵستۆوەیە. لەو باوەڕەدام تۆڵستۆی قـەت پیـر نـابێ، زمانەکـەی پیـر دەبێـت، بـەڵام خـۆی هـەر بـە گەنجی دەمێنێتەوە". لە نێو هەموو ڕۆمانـە گرنگـەکانی تورگینیـف دا تـەنیا "باوکـان و کوڕان"ی بە شاکار دەزانی. بە شێوەیەکی گشتی قارەمانە ژنەکانی ئەم نووسەرەی  بە دڵ نەبوو. "ئەوەنـدە دەسـتکرد و درۆینـەن" کـە "بـاوەڕ نـەکردەنین" لـە نامەیـەکی (١٨٩٣/٢/٢٤)دا بـۆ سـوڤورین، لـەو بارەیــەوە دەڵێــت: "کــاتێ بــیر لــە ئانــا کارنینــای تۆڵســتۆی دەکەیتــەوە، هــەموو ژنــە ســەلار و سـەنگینەکانی چیرۆکەکـانی تـۆڕگینیڤ، بـە شـان و ملـی جـوان و ئـارەزوو بزوێنیانـەوە، دەبـن بـە هەڵم و دەچن بە ئاسمانا".

کە لە نێو کتێبەکانیا، کە سەدان جار هەڵی دابوونەوە و خوێندبوونییەوە، دادەنیشت، خـەیاڵی دەفـڕی، بـۆ سـەفەرانی دوور، کـۆڕی ئەشـق و دڵـداری بـە دەم ئێوارەخوانانـەوە. لـە نامەیـەکیا بـۆ سوڤورین، دەڵێت: "حـەزت لـە ڕابواردن هەیـە.؟ خەریکـە سـوێم دەبێتـەوە بۆ ڕابواردن. دەریـا بـە هێزێکی ئەهریمەنانەوە بـانگم دەکـات. بەسـەربردنی هەفتەیـەك لـە یاڵتـا یـان لـە فیدوسـیا، بـۆ مـن ئەوپەڕی خۆشییە. خۆشە پیاو لە ماڵ و لـە وڵـاتی خـۆی بێت، بـەڵام ئەگـەر لـە کەشتیەکدا بیت، زۆر خۆشـترە. چـەند خۆشـە، ئـازاد و دارا، لـە سـەر کەشـتیەك دانیشـم، پێـك هەڵبـدەم و شـەراب بخۆمەوە، باسی ئەدەبیات بکەم، شەوانیش، ژنان" (بڕوانە نامەی بە رواری ١٨٩٣/٦/٢٨).

وێـڕای ئـەم کەڵکەڵـەی سـەفەرە، هەسـتی دەکـرد لـە ڕووی ئـەرکی فرزەندییـەوە بـە ماڵەکەیـەوە بەستراوە. هەرچەندە شتێکی ئەوتۆ دەگەڵ دایك و باوك و کەسوکارەکەیدا، وەکو خەڵکانی کورت بین و پابەنـدی دابـو نـەریتی سنووردار، کـۆی نـەدەکردەوە، بـەڵام نەیـدەتوانی پشـتیان تێبکـات.

ئەلکساندری برای، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لە میلیکۆڤۆ لەلای مایەوە، هانیدا کە سەفەر بکات: "واز لە هەموو شتێك بێنە، ژیانی لادێ، خۆشەویستی میلیکۆڤۆ، هەر هەست و کارێك کە بە وێندەرەوە گرێت دەدات، خۆ ئەم دنیایە هەر میلیکۆڤی تیا نییە، بۆچی بە دیار ئەم بەقاڵەوە* دادەنیشت، وەکو چۆن جرجان مۆم دەخۆن، بەو ئاوایە ڕۆحت بخوات؟" بەڵام چیخۆف وێڕای ئەو ئامۆژگاریانەش، میلیکۆڤۆی بەجێ نەهێشت و لە ناو کەسوکارەکەیدا مایەوە.

هەرکە هەوا خۆشی کرد، ئاسمانی دەروونی ئەویش ڕووناك بووەوە، درەختانی تازەی ڕواند، سۆرگوڵی تازەی ڕواندن و جارێکی دی کەوتەوە کارکردن لەسەر دەستنووسی (دورگەی ساخالین) کە سێ دانە ساڵ بوو، پێوەی گیرۆدە بوو بوو. تەنانەت ئەگەری سەرهەڵدانەوەی کۆلێراش، ساردی نەکردەوە، ئەمجارەش وەکو پار هەرچییەکی لە توانادا بوو، بۆ کۆمەك و ڕزگاری جووتیاران، کردی. زۆرجار کە لە گوندێك دەگەڕایەوە، لە حەوشەی خۆیاندا ژنە جووتیارێکی دەبینی، کە چاوەڕوانی ئەوە تا بۆ گوندێکی دیکەی ببات. بە هۆکاری نۆژدارییەوە، زۆرجار کارە ئەدەبییەکانی پەکیان دەکەوت، هەرچەندە ئەم خاڵەی زۆر پێناخۆش بوو، بەڵام نەشی دەتوانی لەو تەنگانەیەدا دەستبەرداری ئەرکە نۆژدارییەکانی خۆشی ببێت. خۆشبەختانە ئەم ساڵیش، نەخۆشییەکە تەواو بوو بوو و لەو دەڤەرەدا هیچ قوربانیەکی لێنەکەوتەوە.

هاوین هات و جارێکی دی گەشتیاران و میوانانی خۆشخوو پێیان کرایەوە، میلیکۆڤۆ بووەوە بە مەڵبەندی هاتوچۆو سەردان و کۆڕ و کۆبوونەوە و گەمە و یاری و شادی و خۆشی.

چیخۆف، دوو تولە تاژی چکۆڵەی هەبوون، کە وەکو سێبەر بە دوویەوە بوون. لیکین ئەم تاژیانەی بە دیاری بۆ ناردبوو. یەکێکیان ناوی برومید و ئەویتریان ناوی کینین بوو. چیخۆف لە نامەیەکیا (١٨٩٣/٧/٢٨) بۆ سوڤورین، بەمجۆرە باسیان دەکات: "ئەم تاژیانە زۆر ناحەزن، لاقیان خوارە، بەدەنیان درێژە، بەڵام لە ڕادەبەدەر وریا و زیرەکن". هەموو شەوێك، لەکاتی شیڤ دا، دایکە خەمی لە خۆی دێنا کە ئاخۆ میوانەکان چێشت و خواردنەکەیان بە دڵ دەبێت یان نا، باوکەش، لێکدا لێکدا، بە ڕیشە پانەکەیەوە، نموونە و ئایەتی تەورات و ئینجیلی بەگەڵ قسەکانی دەخست. چیخۆفیش هەندێجار پەست و هەندێجار کراوە و ڕووخۆش، هەوڵیدەدا، ئاستی گفتوگۆیەکان بەرز بکاتەوە. ئەوجا دەچوون بۆ هۆڵی میوان تا بە دەم ئیسراحەتەوە، جگەرە بکێشن، قسان بکەن و گوێ لە مۆسیقا بگرن. لایکا بە دەم پیانۆ لێدانەوە گۆرانی دەگوت، پۆتاپنگۆی نووسەر و تازە ئاشنا، کە پیاوێکی قۆز بوو یا کەمانچەی دەژەن، یان بە دەنگێکی گەرم و مامناوەندی، نە بەرز و نە نزم ڕۆمانسەکانی چایکۆفسکی و گلینکای* دەگوتەوە.

چیخۆف، دەگەڵ هەموو ئەمانەدا میرەبان بوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، کەمێك دوورەپەرێز دیاربوو، بایەخی تایبەتی بە هیچ کەسێکیان نەدەدا. کە پوتاپنکو، دەیبینی لە لایەکەوە میهرەبان و مەردم ئامێزەو لە لایەکی دیکەوە گۆشەگیر و دوورە پەرێزە، لەبەر خۆیەوە دەیپرسی تۆ بڵێی پیاو بتوانێ دۆستایەتی نزیك لەگەڵ مرۆڤێکی وادا، پەیدا بکات. تەنانەت هەندێجار کە لەوە دەچوو چیخۆف، زۆر بە جدی دەگەڵ مەجلیسەکەی دەوروبەریا بژی، گوێیان لێبگرێت، بەڵام لە ڕاستیدا هەموو هۆش و گۆشی لای ئەو دەستنووسە بوو کە بە کراوەیی لەسەر مێزەکەی

بەجێی هێشتبوو، جاری وا هەبوو، لە پڕێکا هەورێك سێبەری دەخستە سەر چاوی، هەڵدەستا، مەجلیسەکەس بەجێدەهێشت، دەڕۆیی تا بە پەلە ئەو ڕستەیە تۆمار بکات کە بە بیریا هاتبوو، کە دەگەڕایەوە بۆ لای میوانەکان بەدەم عوزرخواییەوە، بە شۆخییەوە دەیگوت بۆیە ڕۆیی "چونکە شەست کۆپیکی بە دەست هێنا" هەندێجاریش، دوور نەبوو بە دەم خەیاڵەوە گفتوگۆیەکی جدی، بۆ نموونە دەربارەی مارکسیزم، بە پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراوی وەك "ئایا قەت چوونەتە تەویلەی ئەسپان؟" ببڕێت و پاشان بە سووکە شەرمێکەوە بگەڕێتەوە سەر ئەسڵی قسە و باسەکە. زۆر بە دەگمەن باسی خۆی دەکرد، هەمیشە حەزی دەکرد لە پشت پەردەوە بێ. وا دەهاتە بەرچاو پشتی بە شتێکەوە دابێت و تەماشای تێپەڕبوون و گوزەری ژیان بکات. هەموو کاتێ حەزی دەکرد تەماشاڤان بێ نەك ئەکتەر.

ئەمەی زیاتر لە بواری ئەڤینداریدا پێوە دیار بوو. هەرچەندە هاونشینی ژنانی جوانی زۆر پێخۆش بوو، بەڵام هەمیشە لە هەوڵی ئەوەشدا بوو کە نەکەوێتە داوی ئەشقی جدی هیچ یەکێکیانەوە. لایکای شۆخ و شەنگوڵ، کە چیخۆف زۆرجار بە نامەێن تەنزئامێز و هەندێجار بە نامەی ئاگرین بەسەری دەکردەوە، تیا مابوو، نەیدازانی بە چ نەزمێکی ئەو هەڵپەڕێ.ئەو هاوینە، هاوینی ١٨٩٣ لایکا، دوو دڵ بوو لەوەی کە سەفەری میلیکوڤۆ بکات یان نا، چیخۆف نامەیەکی بۆ دەنێرێت (١٨٩٣/٨/١٣) و دەڵێت: "وەرە ئەی زەری جوانکیلە ، وەرە سەرمان بدە، بۆ خۆ قسان دەکەین، شەڕ دەکەین و ئاشت دەبینەوە... وەرە گۆرانی بڵێ، دەرکەوە ئەی جوانی جوانان وەرە گۆرانی بڵێ... ئەگەر حەزت لە کەسێك کردووەو منت لە بیرچووە، ئەوا پێمان ڕامەبوێرە، بەلای کەمەوە بە من، ڕامەبوێرە".

هات، زوو بە زوو ئەودیوی قسە شیرینەکانی چیخۆڤ خوێندەوە و پەی بەوە برد، کە ئاقڵانە پێی دەڵێت، نیازی نییە بیخوازێت. لایکا، هەر بۆ ئەوەی چیخۆف بهاڕۆژێنێ و تاقی بکاتەوە، بە ئانقەست دەوروخوونی پوتاپنکوی دەدا. بەڵام چیخۆف، هیچ غیرە و حەسوودییەکی نەنواند. کاتێ کە پۆتاپنکۆ گۆرانی دەچڕی و لایکا پیانۆی بۆ لێدەدا، چیخۆف بەدەم زەردەخەنەوە بە جۆرێ تەماشای دەکردن، لە تۆ وایە هیچ شتێك بە ئەندازەی دیتنی ئەو دوو ئینسانە پێکەوە خۆشحاڵی نەکردووە.

لایکا، خەمبار و سەرگەردان، لاواز، نائومێد، سەرسام بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، ملی بە ژیانێکی بێ سەر و بەرەوە نا. لە نامەیەکا بە چیخۆف دەڵێت: "سەراپای بوونم لە خۆزیادا دەسووتێ. وەرە یارمەتیم بدە، تا هەرچی زووترە بیسووتێنم. تا زووتر بسووتێ، باشترە". لەمەش ئاشکراتر دەڵێت: "تەنیا یەك کەس لە دنیادا هەیە کە بتوانێ لەم خود وێرانییە هۆشیارانەیە ڕزگارم بکات، بەڵام ئەو کەسە کەم و زۆر لام بە لادا ناکاتەوە... بەهەرحاڵ.. تازە درەنگە... کار لە کار ترازاوە.. ئەو کیژە لە بیر مەکە کە لە کۆڵ خۆت کردەوە" لە ئەنجامدا بە ڕاشکاوی دەڵێت: "تۆ بە خۆت چاك دەزانی من بۆ تۆ چۆنم ، چ هەستێکم هەیە بەرانبەرت، بۆیە هیچ شەرمم نایەت کە نامەت بۆ بنووسم، دەشزانم هەڵوێستی تۆ بەرانبەر بە من چۆنە، چەند بێ موبالاتی، چەند خۆت بە گەورە دەزانی لە حانای من. زۆر حەزدەکەم خۆم لەم حاڵەتە نائومێدییە ڕزگار بکەم.

بەڵام زۆر زەحمەتە بە تەنیا ئەم کارەم پێبکرێ. تکا دەکەم یارمەتیم بدە. تکایە لەمرۆ بەدواوە داوام لێمەکە بێمە دیدەنیت، تکات لێدەکەم هەوڵ مەدە بمدینی". جا بۆ ئەوەی لە جازیبەی ئەفسوونی چیخۆف، لە دووری دوورەوەش هەڵێیت و دەربچێت، بوو بە ماشقەی پۆتاپنکۆ.

پاییزی ئەو ساڵە، چیخۆف، لە مۆسکۆدا تووشی ئافرەتێك دەبێت و حەزی لێدەکات، ئەم ئافرەتە، ئەکتەرێکی گەنجی بە نازو عیشوە دەبێت بە ناوی لیدیا یاڤورسکایا. عیشوەگەرییەکانی، دەنگی هەندێ کەرخی، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دەستکرد و چاوەڕوان نەکراوی، ڕێك پێچەوانەی مجێزی چیخۆف بوو کە زۆر حەزی لە سادەیی و ساکاری دەکرد. لەوە دەچوو چیخۆف حەزی لەم حاڵەتە دەستکردانەی کردبێت. بەڵێ، لە ماوەیەکی زۆر کەما، پەیوەندی نێوانیان بۆ بە داستانی سەر زاری ناوەندە ئەدەبییەکانی مۆسکۆ، چیخۆف، بەڵێنی دا کە شانۆنامەیەك بۆ کیژێ بنووسێت، کیژەش ناسکەنامانی بۆ دەنووسی کە بەم وشانە: "لەگەڵ خۆشەویستی و ماچ دا، دڵسۆزت لیدیا" کۆتایی پێدێنا.

لایکا، هەر زوو پەی بەوە برد کە یاڤروسکایای هەڤڕکی، بۆ ئەوە هاتووە، جێی ئەم لە دڵی چیخۆفدا بگرێتەوە. ئەمە کردیە کارێك کە لایکا بچێتە ڕیزی ئەو گروپە بچووکەوە کە هەر جارێ چیخۆف دەهاتە مۆسکۆ، بە خۆشییەوە پێشوازیان دەکرد و دەوروخونیان دەدا. هەموو ئەو کیژانەی کە کەم و زۆر دڵبەندی چیخۆف بوون، یەکتریان دەناسی و یەك بە یەکیانیش لە ژێر پەردەی بە ڕواڵەت دۆستایەتییەوە یەکیان دەکورهاند و ڕقیان لە یەکدی بوو.لایکا، بە مەبەستی تێکدانی ئەو پەیوەندییە، هەستا بە بیانووی ئەوەی کۆنە دەنکی چیخۆف بووە، نامەیەکی (٧/ت٢/١٨٩٣) بۆ چیخۆف نووسی: "خانم یاڤوروسکا، دوێ شەو دەگەڵ ئێمەدا بوو، دەیگوت چیخۆف پیاوێکی جوانە و بڕیارم داوە هەرچۆنێ بووە شووی پێبکەم... داوای لە من کرد کە یارمەتی بدەم، منیش بەڵێنم دایە هەر چییەکەم لە دەست بێت درێغی نەکەم تا شادمانی دوو قۆڵی ئێوە دابین ببێت.. یەك دوو وشان بنووسە و بڵێ کە ئاخۆ خۆشت دەوێ یان نا... هەڵبەتە بۆ منی بنووسە، نەك بۆ ئەو. بە هێڤی دیدار، ئەی جەلادەکەی ڕۆحی من تکایە وەڵامم بدەوە".

چیخۆف، زوو لە فیکەی خۆی حاڵی بوو، یەکسەر زانی ئەم ماستە چ موویەکی تیایە. دوای چەند ڕۆژێك، پێنج دێڕێکی لەسەر کارتێك بۆ نووسی، کە لە وێدا لایکا بە "دەڵاڵە ئازیزەکەم" ناودەبات، بێئەوەی هیچ بەڵگە و نیشانەیەکی هەستی خۆی سەبارەت بە یاڤروسکایا، بە دەستەوە بدات. پێی ناخۆش نەبوو کە ئەم هەموو کیژە بە جۆش و خرۆشانە، مەمنوون بوون کە شووی پێبکەن. ئەوانەی بە گەلە کەشتی خۆی ناودەبرد و خۆیشی بە دەریا سالاری ئەوان. ئەوانیش، ئەمیان ناونا بوو "ئاڤیلان" بە ناوی ئەو میرالایەوە کە ڕێبەری گەلە کەشتی ڕووسی دەکرد و، لە ساڵی ١٨٩٣دا بە مەبەستی ڕێکەوتنی نێوان فەڕەنسا و ڕووس چوو بوو بۆ تولون.. چیخۆف کە دەگەییە مۆسکۆ، لە "ئۆتێلی گەورە" هەواری دەخست، هەمیشە ژووری ژمارە پێنجیان بۆ دادەنا، ئیدی هەوادارانی لە ژن و لە پیاو لەوێ سەریان دەدا و لێی خڕ دەبوونەوە، بەدەم خواردنەوەوە تاکو بەرەبەیان گفتوگۆ و گەنگەشەیان دەکرد. چیخۆف لە نامەیەکیا (١١/ت٢/١٨٩٣) بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "قەت لەوە پێشتر هەستم بەوە نەکردبوو کە

من وام. کچان، کچان، کچان..." وێڕای ئەوەش شچپکینا کوپرینگی شاعیر دەڵێت، چیخۆف هەمیشە لەو جۆرە کۆڕ و مەجلیسانەدا، حەپەساو و پەرت حەواس دەهاتە بەر چاو وەکو گەورەیەك دەگەڵ منداڵاندا یاری بکات. جارێك قاییل دەبێ وێنەیەك دەگەڵ کوپرنیگ و یاڤورسکایادا بگرێت، کە وێنەکەی خۆی، بەر لە شۆردنەوە، بە ڕوو گرژی لە کامێراکەدا دەبینێ، لە بەینی دوو کچی بەناز و عیشوەدا وەستاوە، پێشنیاز دەکات ئەو وێنەیە ناو بنەن "مەینەتییەکانی قەدیس ئانتونیوس". لە لایەکی دیکەشەوە هەرچەندە قەناعەتی وابوو کە غەریزەی سێکسی ڕەگی لە قوڵایی ئەشقدایە و بناغە و بنەمای ئەشق پێکدێنێ، بەڵام بە پێویستی نەدەزانی کە مرۆڤ بە ئەشقی جەستەییەوە بنازێ. هەڵبەتە بە خۆیشی لەو بارەیەوە زۆر لە خەمی ئەشقی بەدەنیدا نەبووە و زیاد لە پێویست لە دووی نەبووە. لە هەمان نامەی گۆڕیندا (١١/ت٢/١٨٩٣) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "هەموو هزرڤانان تا تەمەنی چل ساڵی توانای سێکسیان دەبێ، لەو تەمەنەدا لە پیاوەتی دەکەون، کەچی هۆڤیان، تا تەمەنی نەوەد ساڵی هەر دەعباکەیان بەکارە و یەکی نەوەد ژن پیر دەکەن".

بە بۆنەی چەژن و ئاهەنگەکانی سەری ساڵی تازەوە (١٨٩٤)، ئیدی لە ڕووی دڵپاکی خۆیەوە بوو، یان لەڕووی فیتنە ئەنگێزییەوە بوو، لایکا و پوتاپنکۆی بۆ میلیکۆڤۆ دەعوەت کرد.

لەو سەروبەندەدا، گۆڤاری "هزری ڕووسی" بە زنجیرە "دورگەی ساخالین"ی بڵاو دەکردەوە، چیخۆف زۆر ئاسوودە بوو کە ئەم ئەرکە قورس و دژوارەی لە کۆڵ بوو بووەوە. لە نامەیەکیا (٢/ك٢/١٨٩٤) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "پیشەی پزیشکی چیتر ناتوانێ بە خیانەت تۆمەتبارم بکات. من باجی خۆم بە زانست و بەوەی نووسەرانی کۆن پێی یەژن (زانستخوازی)دا، خۆشحاڵم بەوەی کە پاڵتۆی مەحکومێکی لەندە هۆر لە دۆڵابی جلە ئەدەبییەکانی مندا هەڵواسراوە، با هەر لەوێ بێ".

ئیدی بوو بە گەورەترین پەخشاننووسی نەسلی خۆی. ڕەخنەگران ستایشی هونەرەکەی و، نۆڕینی بۆ ئاکار و دابونەریتی ڕۆژگاری خۆی دەکرد. هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بە دەوریا دەهاتن کە دەقێکی بڵاونەکراوەیان بداتێ تا بڵاوی بکەنەوە.کتێبەکانی زوو زوو چاپ دەکرانەوە و بۆ زمانانی فەڕەنسی، ئینگلیزی و ئەڵمانی پاچڤە دەکران. خوێنەران بە تاسەوە "دوڕگەی ساخالین" یان دەخوێندەوە. بەڵام زۆربەیان کە لە خوێندنەوەی دەبوونەوە، پەشیمان دەبوونەوە. چونکە چاوەڕوانی بەرهەمێکی درامی، پڕ جۆش و خرۆشی هاوتای "یادگارییەکانی خانەی مردوان"ی دۆستۆیفسکیان لێدەکرد. بەڵام ئەوەی دەیان خوێندەوە، ڕاپۆرتێکی بێ لایەنانە بوو دەربارەی هاونشینی نووسەر دەگەڵ زندانیاندا، هەرچەندە هەندێ کەس ئەم ڕاپۆرەیان بە کارێکی وشك دەزانی، ئیدی وابوو یان وانەبوو، زوو بە زوو سەرنجی دام و دەزگا فەرمییەکانی دەسەڵاتی ڕاکێشا. ئەوەبوو حکومەت لیژنەیەکی تایبەتی بۆ ساخالین نارد، تا لە دروستی و ناردوستی قسەکانی چیخۆف بکۆڵنەوە . دوای ئەوە هەندێ ریفۆرمکاری لە هەلومەرج و وەزع و حاڵی زندانیاندا کرا. ئیدی چیخۆف دەیتوانی خاترجەم بێ، کە هەوڵ و ڕەنجەکەی بەفیڕۆ نەچووە.

هەرچەندە "دورگەی ساخالین"ی کەوتە گۆمی بێ موبالاتی خوێنەرانەوە، بەڵام چیرۆکی "قاوشی ژمارە شەش" کە پار بڵاوی کردبووەوە، بە پێچەوانەوە، وێڕای ئەوەی ڕەنگە تاریکترین چیرۆکی چیخۆف بێت، خوێنەرێکی زۆری بەلای خۆیدا ڕاکێشا. شوێن، لەم چیرۆکە درێژەدا بریتییە لە بەشی نەخۆشانی سایکۆلۆژی و ئەقڵی شارۆچکەیەك. بەڕێوەبەری ئەم دەزگایە، کابرایەکی دەغەزاری بێتاقەتە بە نێوی دکتۆ راگین. لە مێژە کونجی خەڵوەتی گرتووە و بە دەم خەون و خەیاڵاتەوە سەری کردووەتە ڤۆدکا خواردنەوە و ترشیاتی خەیار. ئیدی ئەم دکتۆر ڕاگینە، چووەتە قاوغی خۆی و کەم و زۆر ئاگای لەو بەرتیل و بەرتیلکاری و زەبر و زەنگ و گەندەڵی و بەدبەختیانە نییە کە بەسەر دەوروبەرەکەیدا زاڵە. کە باسی مەینەتی و داماوی نەخۆشە کلۆڵ و فەرامۆشکراوەکانی بۆ دەکەن. تەنیا ئەوەندە دەڵێت: "چ قەیدیە؟" پاسەوانێکی سەرسەختی زاڵم، بە نێوی نیکیتا، بە زەبری شەق و زللە، نەخۆشەکان کۆنترۆڵ دەکات.ڕاگین، کاتێ وەخۆ دێتەوەو دەیەوێ، مومارەسەی مەسئولییەتی خۆی بکات، کار لە کار ترازاوە: ڕەفتاری سەیر و نامۆی ئەو، وا لە خەڵکی دەکات بە شێتی لە قەڵەم بدەن و ئەنجام دەخرێتە هەمان قاوشی شێتەکانەوە، قاوشی ژمارە شەش و، لەوێ شەق و زللەی نیکتیا بەسەری ئەویشدا دادەبارێت، ئیدی لە دەمی مەرگا پەی بە گوناح و خەتای خۆی دەبات، گوناح و خەتای ئەوەی، کەمتەرخەمی کردووە و ڕێگەی داوە ئەو هەموو نەهەقیە ترسناکانە کراوە و گوێی نەداوەتێ.

ڕاستە ئەم چیرۆکە زۆر دیمەن و ڕەگەزی واقیعیانەی لەخۆ گرتووە، بەڵام زۆر لایەنی سەیر و غەریب و پاتۆلۆژی ئەوتۆشی تیایە، کە خوێنەر وەکو پێویست پەی بە مەبەست و چەمك و مانای چیرۆکەکە نەبەن . بۆیە چیرۆکی (قاوشی ژمارە شەش) بەلای هەندێکیانەوە، ڕەخنەیەکی پەنامەکیە لەو بیروبۆچوونە دەستکرد و کۆنە پەرستانەیەی تۆڵستۆی کە نابێ بە توندوتیژی ڕووبە ڕووی توندوتیژی ببینەوە. هەندێکی دیکە، بە پەیامێکی سیاسی ڕەخنەییان دەزانی دژی ڕژێم. گوایە (قاوشی ژمارە شەش) ڕەمزی ڕووسیایە، نەخۆشخانە ئەقڵییەکە و پاسەوانە هۆڤی و دڕندەکەشی، نیگیتا ڕەمزی دەسەڵاتی تزاریەو، پزیشکە نائومێد و بێ هەڵوێستەکەش، ڕەمزی ڕۆشنبیرانی خەسیو و دەستەمۆ و گومڕان. بەڵام چیخۆف وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، خۆی لە ڕوونکردنەوە و شەرحی مانای ژێراوژێر و پەنامەکی چیرۆکەکەی، دوور دەگرت، چونکە بە ڕای ئەو، ئەرکی نووسەر تەنیا ئەوەیە بەرهەمەکە بخاتە ڕوو، نەك شەرح و شرۆڤەی بکات.

بە هەرحاڵ، هەرچەندە چیرۆکی "قاوشی ژمارە شەش" سەرکەوتنێکی یەجگار گەورەی بە دەست هێنا، کەچی سوڤۆرین بە دڵی نەبوو، هەستی دەکرد "گیانی تیا نییە" مەبەستی لەمە چی بوو؟ چیخۆف زۆر خاکیانە، لە نامەیەکیا (٢٥/ت٢/١٨٩٢)، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "تۆ ئەوەش ڕەچاو بکە، ئەو نووسەرانەی کە ئێمە بە نەمر، یان بە نووسەری چاکیان ناو دەبەین و دەزانین، یانی ئەو نووسەرانەی کە مەستمان دەکەن، خاڵ و نیشانەیەکی زۆر گرینگی هاوبەشیان لە نێواندا هەیە: ئەمانە بەرەو ڕووی شتێکی دیاریکراو دەڕۆن و ئاماژەت دەکەنێ کە دوویان بکەوێ، تۆش نەك هەر بە بیر و ئەقڵ، بە سەراپای بوونتەوە، هەست دەکەیت کە ئامانجێکیان

هەیە. وەکو ڕۆحی باوکی هاملێت، کە لە هاتنەکەی و شڵەقانی خەیاڵی هاملێت دا، مەبەستێکی خۆی هەبوو. ئیدی ئەو نووسەرانە، هەر کەسە و بە گوێرەی توانای خۆی، هەندێکیان مەبەست و ئامانجی نزیکیان هەیە وەکو: (هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلایەتی، ڕزگارکردنی نیشتمانی خۆ، سیاسەت، جوانی یان ڤۆدگا و مەینۆشی و بەس، هەندێکی دی مەبەست و سیاسەت و ئامانجی دووریان هەیە وەکو: (خوا، میتافیزیکا، ئەو دنیا، شادمانی تیرەی بەشەر). باشترینیان ئەو ڕیالیستانەن کە ژیان وەکو خۆی، وەکو چۆن هەیە، بەو ئاوایە وێنە دەگرن، بەڵام چونکە هەر دێڕێکیان هەڵگری ئەو مەبەست و ئامانجەیە کە هەیانە، تۆ وا ژیان دەبینی کە دەبێ هەبێ نەك وەك چۆن هەیە. ئیدی بەو جۆرە ئەفسوونیان دەبیت. بەڵام ئێمە؟ ژیان وەکو خۆی، وەکو چۆن هەیە وەسف دەکەین و ئیدی ئاو بێنە و دەستان بشۆ، بە کوتەك لێمان بدەی لەوە زیاترمان لێ هەڵناوەرێ، مەبەست و ئامانجی نزیك یان دوورمان نییە. ڕۆحمان وەکو بیابانە. هەقمان بەسەر سیاسەتەوە نییە، باوەڕمان بە شۆڕش نییە. خەڵکانێکی خوا نەناسین، لە شەبەنگ و تاپۆیان ناترسین. من، بەش بە حاڵی خۆم، لە هیچ شتێك ناترسم، تەنانەت لە مردن و لە کوێریش ناترسم. ئەوەی ئارەزووی شتێك نەکات، ئومێدی بە شتێك نەبێت و لە شتێك نەترسێت، ناتوانێ ببێت بە هونەرمەند".

ڕاستە چیخۆف، حەزی نەدەکرد خۆی بە نووسەر و هونەرمەند لە قەڵەم بدات، بەڵام کەس بەو دوعایەی نەدەگوت ئامین، وەختێ دواتر چیرۆکی "سەربوردی پیاوێکی نەناس"ی بڵاوبووەوە، لە نێو خوێنەراندا، دەنگدانەوەیەکی باشی بوو و گەنگەشە و مشتومڕێکی زۆری نایەوە. چیخۆف پێنج ساڵ لەوەپێش دەستی بە نووسینی ئەم چیرۆکە کردبوو، بەڵام لە ترسی سانسۆر، لە چاوی مێزەکەیدا هەڵی گرتبوو، بەڵام کە ناردی بۆ بڵاوکردنەوە، زۆر بە ئاسانی و بێئەوەی وشەیەکی لێ سانسۆر بکرێ، بەسەر سانسۆردا تێپەڕی و لە ساڵی ١٨٩٣دا بێ هیچ دەسکارییەك لە گۆڤاری (هزری ڕووسی) دا بڵاوبووەوە.

ئەم چیرۆکە، بە ڕاناوی یەکەم کەس نووسراوە و باسی شۆڕشگێڕێکی تیرۆریست دەکات، کە چۆن دەبێ بە خزمەتکار و هاودەمی فەرمانبەرێك، بەو نیازەی باوکی، کە پیاوێکی پایە بەرزی دەوڵەتییە، تیرۆر بکات. بایەخ و بەهای ئەم چیرۆکە لەوەدایە کە نووسەر توانیویەتی لایەنە سایکۆلۆژییەکانی شاقارەمانەکانی وێنە بگرێت و بەرجەستە بکات. لەوانە: ئۆرلوف، کە پیاوێکی سێ بەندی و گۆساخە، زینا کە ژنێکی دۆخین شلی بە ئالۆشە. دەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژاندا، کابرای تیرۆرست، وردە وردە دەکەوێتە داوی عەشقی ماشقەکەی ئاغایەوە، واتە دەکەوێتە داوی ئەشقی زینای خشکۆك و جوانکیلەوە و دەستبەرداری کارە تیرۆریستییەکەی دەبێت، هەڵبەتە هەرەسهێنانی ئەم کابرا چەپە ئایدیالە، بە ڕاستی ڕەخنەگرە لیبراڵەکانی لە چیخۆف، توڕە کرد: گلەییان لە نووسەر دەکرد کە قارەمانێکی هێندە ترسنۆکی هەڵبژاردووە، کە نەیتوانیوە تا سەر لەسەر بیروباوەڕ و قەناعەتەکانی خۆی بەردەوام بێت.

هەڵبەتە چیرۆکی دواتری چیخۆف (ڕەبەنی ڕەشپۆش) لەلای خوێنەرانی، لەبەر هۆی جیاوازتر، ئاڵۆزتر و سەیرتر بوو. ئەم چیرۆکەی لە ژێر کاریگەری خەونێکی ناخۆشدا نووسیوە. عەسرانێك

له كاتێكا، هەمووان جگە لـه میخائیل، خـەریكی عەسرە خـەوبوون، چیخۆف، بە سـەر و سیمای شپرزە و نیگەرانەوە، بە پەلە لە ژوورەكەی خۆی وەدەردەكەوێت و بە براكەی دەڵێت: "خـەوێكی زۆر ترسناكم بینی! ڕەبـەنێكی ڕەشپۆش هـاتبووە خـەوم!" ئـەم خـەوە بـوو بـە مـەراق و خولیـای، دوای ڕۆژێك كەوتە هەوڵی ئەوەی بە نووسینی بسپێرێ و لـە كۆڵ خـۆی بكاتـەوە. بۆ یەكـەمجار خـۆی لـە قـەرەی بابـەتێكی میتـافیزكی دەدا. بـە بۆچـوونی چـیخۆف "ڕەبـەنی ڕەشـپۆش" شـیكردنەوەیەكی دەروونییـە، دەربـارەی كەسـێك كـە تووشـی دەروون نەخۆشـی بـووە: كـوڤرین، فەیلەسـوفێكی مامناوەندییـە، بـە هـۆی مانـدووبوونی ئـەقڵی و زەینییـەوە، تووشـی نەخۆشـی دەروونـی بـووە، ڕۆژێك بە دەم خەیاڵاتـەوە، ڕەبەنێكی ڕەشپۆش دەبینێ كە بەسـەر كێڵگەكانـدا دەفڕێت. ئەم خەیاڵاتە وای لێدەكات، قەناعەت بێنێ كە یەكێكە لە هەڵبژاردە نەمرەكانی خوا و بۆ هەتا هەتایە لەپێناوی خزمـەتی حەقیقـەتی سـەرمەدیدا دەژی. ئیدی ئـەم كوفرینـە، زۆر لـە خـۆی بایی دەبێت و خۆی لە خەڵكانی ئاسایی، كە هەموو گیای مردنن، بە زیاتر و گەورەتر دەزانێ، تا بە زۆری ژنەكەی و خەزووری ناچار دەچێتە لای پزیشـك، كـە چاك دەبێتـەوە و دەگەڕێتـەوە سـەر دۆخی ئاسایی خۆی، هەست بە ئازار وناڕەحەتییەكی زۆر دەكات و، دەڵێت: "بـەردەوام هەسـتی خۆم لە دەست دەدا، تووشی شێتاتی مـەزناهی بووبووم، بەڵام دڵـم خـۆش بـوو، كـەیفم سـازبوو. هەمیشـە بـە كـەیف بـە دەمـاخ بـووم، تەنانـەت بەختـەوەریش بـووم. ئەفسـوون و كەسـایەتی خـۆم هـەبوو. ڕاسـتە ئێسـتا مـاقووڵتر و بـە ویقـارترم. بـەڵام وەكـو هـەموو خـەڵكانی تـرم: كەسـێكی ئاساییم، مامناوەندیم، لە ژیان بێزارم". لـە ژنەكـەی تـوڕە دەبێـت كـە ناچـاری كـردووە بچێتـە لای دكتۆر و دەرمان وەربگرێت، ئیدی واز لە ژنەكەی دێنێ، تا بكەوێتە شوێن و تـاقیبی خەونەكـەی. ڕەبەنە ڕەشپۆشـەكە دەدۆزێتـەوە. بـەڵام كوڤرین كە نەخۆشـی سیلی دەبێـت، لەگـەڵ دۆزینـەوەی ڕبەنە ڕەشپۆشەكەدا، بە دەم خوێن هەڵهێنانەوە، دەمرێت.

هەندێ كەس ئەم چیرۆكەیان بە شاكاری قەڵەمڕەو و دنیای خەیاڵ لە قەڵـەم داوە، هەنـدێكی تـر بـە تـەوس و توانجیـان زانیـوە دژی ئـەو ڕۆشـنبیرانەی كـە خۆیـان لـە عـەوامی خـەڵكی بـە زیـاتر زانیووە و لاف و گەزافی ئەوەیان لێداوە كە ڕاز و نهێنی شادمانی دنیا لە دەستی ئەواندایە. كـاتێ كە برادەرێك بـۆ چیخۆڤی دەگێڕێتـەوە كـە گوایـە تۆڵسـتۆی ئـەم چیرۆكـەی زۆر بـە دڵ بـووە، كـاتێ خوێندویەتییەوە، ئەو تۆڵسـتۆیەی كـە زۆر دژ پەسـەندبووە، پـڕ بـە دەم و بـە جـۆش و خرۆشـەوە هاواری كردووە: "پەح كە جوانە، پـەح كـە دڵگیرە!" چیخۆف كـە گـوێی لـەم قسـەیە دەبێـت، دڵـی خۆش دەبێت. وا هەست دەكات نمرەیەكی زۆر باشی، لە مامۆسـتایەكی بـە ناوبـانگی جیهانیـەوە وەرگرتووە. بەڵام چیخۆف لە ڕاستیدا دژی ئامۆژگاری و ڕێنماییەكانی فەیلەسووفەكەی یاسـنایا پالیانا بوو (مەبەست تۆڵستۆیە). هەرچەندە جاران كاریگەری ڕێنماییەكانی تۆڵستۆی بەسـەرەوە بوو، وەكو خۆشەویستی چەوساوە و بێنەوایان، دژایەتی توندوتیژی، و ئـارەزووی دادپـەروەری، بـەڵام ئەمڕۆكـە كـەم و زۆر بـاوەڕی بـە "جووتیـاری پـیرۆزی ڕووس" نـەبوو، لـە نامەیـەكیا (١٨٩٤/٣/٢٧) بۆ سوڤورین، لەو بارەیـەوە دەڵێت: "من بـە خـۆم خـوێنی جووتیـارم تیایـە، بەڵام سەرسـام و دڵبەنـدی هـیچ شـتێكی جووتیـار نـیم، هـەر لـە منداڵییـەوە بـاوەڕم بـە پێشـكەوتن

هەبووە... فەلسەفەی تۆلستۆیزم کاریگەری بە سەرمەوە هەبووە، بۆ ماوەی شەش حەوت ساڵێك لەژێر باندۆرو کاریگەری ڕاستەوخۆی فەلسەفە و ڕێنماییەکانی ئەودا بووم. من زیاتر لە ژێر کاریگەری شێوازی ئەفسووناوی و مەیلە و هیپنۆتیستی دەربڕین و نووسینەکانیا بووم، تا لە ژێر کاریگەری پرەنسیپ و فەلسەفە و ڕێنماییەکانیا بم. بەڵام ئێستا وا نەماوم، ئەقڵ و دادوەری پێم دەڵێن، خۆشەویستی تیرەی بەشەر لە دۆزینەوەی کارەبادا و سەنعەتا زیاترە تا لە داوێن پاکی و نەخواردنی گۆشتا.جەنگ خراپە، ڕژێم و دەسەڵاتی فەرمی خراپە، بەڵام ئەمە بەوە چارەسەر نابێ کە بەپێ خاوسی، یان بە پێڵاوی لە تویکڵەدارانەوە بسوڕێمەوە یان لەبەر سۆپا نەنووم و بچم دەگەڵ وەرزێر و ماڵ و منداڵی ئەودا لە گوێ تەنووریانان بخەوم. مەسەلەکە ئەمە نییە، مەسەلەکە ئەوە نییە، لایەنگری یان دژایەتی نییە، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تۆڵستۆی، دوورکەوتۆتەوە، ئەو جێگەیەی جارانی لە دڵی مندا نەماوە. ئەوسا لە دڵی من دەرچوو کە گوتی: "ئێستا ماڵەکەت چۆڵ دەکەم" من ئێستا لە هەموو کرێچییەك ڕزگار بووم". پاش "ڕەبەنی ڕەشپۆش" گۆڤاری (هزری ڕووسی) چیرۆکێکی تازەی چیخۆڤ بەناونیشانی "قەڵەمرەوی ژنێك" بڵاوکردەوە، کە بە تۆن و شێوازێکی تەواو جیاواز نووسرابوو. (ئانا)ی قارەمانی چیرۆکەکە، کارخانەکەی بابی بە میرات دەبات، لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدایە و لەو تەمەنەدا دیل و ئەسیری سەروەت و سامان و پێگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی دەبێت. بیر لەوە دەکاتەوە کە دەگەڵ پمیینوڤدا، کە یەکێکە لە کرێکارەکانی خۆی، زەماوەند بکات، بە جدی بیر لەم مەسەلەیە دەکاتەوە، بەڵام پاشان لە ترسی لۆمەی ئەو ژینگەیەی کە مەحکومە تیایا بژی، ژێوان دەبێتەوە و هەست دەکات ئەو خەون و خەیاڵەی، کەڵکەڵە و خولیایەکی ناواقیعی و گەوجانە بووە... دیارە هەست و خەون و خولیای سەبارەت بە پیمینوڤ، ڕاستگۆیانە وپاك و ئابڕوومەندانە بووە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەستی دەکرد، کە لیسیڤیچ و کریلین، زیاتر لێوەی نزیکن تا پیمینوڤ و هەموو کرێکارەکانی دیکە".

ئەمەش چیرۆکێکی دیکەی هەرەسهێنانی بەها و ئایدیالە سادە و ساکارەکەنە لە هەنبەر واقیعی تفت و تاڵدا. لەم سەروبەندەدا چیرۆك لە دوای چیرۆك ،پتر نائومێدی و ڕەشبینی چیخۆف دەردەکەوت. بە ڕاستی تەندروستی ڕۆژ بە ڕۆژ خراتر دەبوو، بەیانیانی زوو کە کۆکە دەیگرت، بە سەعات بەری نەدەدا و جاری وا هەبوو بە سەعاتان لە پەلوپۆی دەخست. دیارە هەقی خۆی بوو لە سۆنگەی ئەمەوە هەندێك ڕەشبین بێت. لە نیوەی شوباتی ١٨٩٤دا لەپڕ لێبڕا سەفەری باشووری گەرمەسێر بکات، بەرەو قرم کەوتە ڕێ، لە ١٨٩٤/٣/٥دا گەییە یاڵتا. کە لە هەڕەتی گەرمی خۆیدا بوو. جارێکی دی خۆی لە هەنبەر ڤێلا سپییەکانی قەراخی دەریا و، دار سەروانی بەرز و بڵند، ئاسمانی هەمیشە شیندا دیتەوە و زۆر دڵی کرایەوە، لە (ئوتێلی ڕووسیا) هەواری خشت، بە ئومێدی ئەوەبوو، دەرفەت بێنی و شانۆنامەیك بنووسێت. بەڵام زۆری پێنەچوو، کە دەوروبەری پڕبوو لە دۆستان و ڕۆژنامەنووسان و ئەکتەرانی گەڕۆك و وەختێکی زۆریان لێ بەفیڕۆ دا، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە قسە و باسی دەگەڵ دەکردن، داخی بۆ ئەو کاتە دەخوارد کە لە دەستی دەچوو. کە گەییە یاڵتا، دوای چەند ڕۆژێکی کەم نامەیەکی

سەیر و پڕ لە نائومێدی لە لایکاوە پێگەیی. لایکا لە بەرلین بوو، لەبیری ئەوەدا بوو بچێ بۆ پاریس بۆ لای پوتاپنکۆ، تا دەورەی گۆرانی و ئاواز بدینێ. لایکا لە نامەکەیدا گلەیی ئەوەی دەکرد کە چیخۆف بۆ جاری دووەم پولی پێوە ناوە و حەزی کردووە هەموو پەیوەندییەکی خۆی، یەکسەر دەگەڵ ئەمدا بپڕێت. ئێستا زۆر نائومێدە و مەرگی خۆی بە ئاوات دەخوازێ. بەڵام چیخۆف کە پیاوێکی کارامە و قاڵبووی بۆتەی ئەزموون بوو، زۆر ترسی لەم گلەییە هەڕەشە ئامێزە نەبوو، بە هەمان زمانی تەنزئامێزی جاران وەڵامی دایەوە: "هەرچەندە نامەکەت دەمترسێنێ و، دەڵێی بەو زووانە دەمریت و گلەییم لێدەکەیت کە گوایە دەستم پێوە ناویت و لە کۆڵ خۆم کردوویتەوە. بە هەرحاڵ سوپاست دەکەم. زۆر دڵنیام کە نامریت و کەسیش دەستی پێوە نەناویت". پاشان بۆ لایکای گێڕایەوە کە چۆن یارمەتی گروپێکی شانۆیی ناپیشەیی داوە کە "فاوست" نمایش بکەن و چۆن دەگەڵ خانمێکی بەڕێوەبەری قوتابخانەدا گۆشتی سورەوە کراوی بەرخی خواردووە و چۆن حاڵی حازر لەو ژنانەی دەروبەری بێزارە و ئێستا هەموو ئاواتێکی ئەوەیە بێ ئیش و بێکار بێ و ئاشقێنی و دڵداری دەگەڵ کچێکی نەرم و نۆڵ و گۆشتندا بکات". هەر لەو نامەیەدا تکا لە لایکا دەکات، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بوو بە گۆرانی بێژێکی گەورە و دەوڵەمەند بوو، هەنگێ شووی پێبکات، تا مێردەکەی ناچار نەبێت کار بکات. لە کۆتایی نامەکەیدا داوای لێدەکات کە بە پەلە بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە: "قسە دەگەڵ پوتاپنکۆ بکە، دەگەڵ ئەوا ڕێك بکەوە، ئەویش هاوین بۆ ڕووسیا دەگەڕێتەوە. ئەگەر لەگەڵ ئەودا سەفەر بکەی بۆت هەرزان دەکەوێ، سەفەرەکەت دەکەوێتە بەلاش. با ئەو بلیتی سەفەرەکەت بۆ بکڕێت. خۆت لە گێلی بدە و پارەی بلیتەکەی مەدەوە. هێشتا هەوەڵی دڵداری و ئەشقتانە". (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٤/٣/٢٧).

جا چونکە نەکەش و هەوای گەرمی یاڵتا و نە هەوای دەریا، دادیان نەدا و تەندروستی باشتر نەبوو، دوای نزیکەی مانگێك لە ١٨٩٤/٤/٣دا بەرە و میلیکۆڤۆ، گەڕایەوە. لەوێندەر جارێکی دی، ئالکاوی جوانی بەهاری دەشتەکانی ئەو دەڤەرانەی ڕووسیا بووەوە. بە بیجامەوە دەهاتە دەرێ و بە ناو باخ و باخچەکەدا دەسوڕایەوە. بە دیار ئەستێڵ و حەوزەکەوە دەخەیاڵەوە دەچوو. گوڵی دەڕواند، ڕێگەی تازەی دەکردەوە، ئەسپ سواری دەکرد و برومید و کوینین دوای دەکەوتن. بۆنی گیای تازە ڕواو و مەستی دەکرد. لە نامەیەکیا (١٨٩٤/٧/٥) بۆ لیونتیڤ-شچگلوف دەڵێت: "دوو سەعاتێك لای قۆپەنە گیایەکەوە ڕاوەستی وا هەست دەکەیت لە باوەشی ژنێکی ڕووتایت. لە نامەیەکی دیکەیدا (١٨٩٤/٥/٩) بۆ سوڤورین دەڵێت: "پێموایە کە ژیان لە باوەشی سروشتدا و کار نەکردن، لە مەرجە بنەڕەتییەکانی شادمانین".

ڕای سپارد، لە پشت دار گێلاسەکانەوە، بە دار و تەختە خانوویەکی چکۆڵەی بۆ دروست بکەن کە سەد و بیست و پێنج ڕۆبڵی تێچوو. ئەم خانووە بریتی بوو لە دوو ژوور و گەنجینەیەکی ئازووقە و دانەویڵە کە ناوی نابوو "خانەی بووکەڵان" کاتێ کە میوانی زۆریان دەهات، دەبوو بە هەرا و زەنا و قەرەباڵغی، خۆی دەدزییەوە و بۆ کارکردن پەنای وەبەر ئەو ژوورۆچکەیە دەبرد، لەم کوختەیەدا بوو کە شانۆنامەی "نەورەسی" نووسی.

هەرکە هاوین هات، دیسان کێچی سەفەر کەوتە کەوڵی.پێشنیازی بۆ سوڤۆرین کرد کە پێکەوە سەفەرێکی کەنارەکانی ڤۆلگا بکەن کە دەشێت لەو سەفەرەیاندا، سەردانی دێر و گۆڕستانە کۆنەکان بکەن، یان پێکەوە سەفەری ڤدوسیا یان سویسرا بکەن. چیخۆف بە هەر سەفەرێك قاییل بوو، گرینگ سەفەرەکە بوو نەك شوێنەکە: "دەڵێی هێزیك، پێشبینی ڕووداوێکی ناخۆش،هانم دەدات لەزێ بکەم، هەرچەندە لەوەشە ئەمە زادەی پێشبینی ڕووداوێکی ناخۆش نەبێ، بەڵکو زادەی ئەو ئەفسووسە بێ کە دەبینم تەمەن بەو ڕۆتینی وبێ مانابیە بە فیڕۆ دەڕوات، دەتوانم بڵێم سکاڵا و ناڕەزایی ڕوحە" (بڕوانە نامەی ١٨٩٤/٧/١١).

لەوە دەچوو سوڤۆرین زۆری دڵ بەم پێشنیاز و سەفەرەوە نەبووبێ، بۆیە چیخۆف ڕووی کردە پوتاپنکو کە لەو ماوەیەدا، بەبێ لایکا، لە هاندەران گەڕابووەوە... پوتاپنکو، زۆر دڵی بەوەوە نەبوو کە باسی پەیوەندی خۆی و لایکا بکات. چیخۆفیش، هیچ شتێکی لەو بارەیەوە لێنەپرسی. ئەمانە هاوڕێتی یەکتریان پێخۆش بوو و بە دوو قوڵی ڕێگای سەفەرێکی ناو ڕووسیایان گرتەبەر، بەو ئومێدەی بە کەنارەکانی ڤۆلگادا شۆڕ ببنەوە. بە ڕێکەوت لە پێشانگاکەی نیژنی نوڤگورودا تووشی سرگینکۆ بوون، سرگینکۆ، کابرایەك بوو تا بڵێی چەنەباز و زۆربڵێ بوو، یەکێك بوو لە موریدەکانی تۆڵستۆی، زۆر فشەکەر بوو، دیتنی ئەو، سەفەرەکەی لێتێکدان، چیخۆف، باروبنە و جانتا و شتەکانی پێچایەوە و، بەوپەڕی دڵتەنگی بۆ میلیکۆڤۆ گەڕایەوە. هەرکە گەییەوە میلیکۆڤۆ و زانی هاپۆ میترۆڤانی حاڵی شڕە، یەکسەر سواری ڤیتاربوو و تاگانرۆگ خۆت بگرە هاتم، هەرچەندە زیاتر بۆ لای مامی و خانەوادەکەی هاتبوو، "دەبێ بڕۆم بیدینم، چاودێری بکەم، دڵخۆشی خۆی و خانەوادەکەی بدەمەوە"، بەڵام لە دڵی خۆشیا پێی خۆش بوو کە بەم بیانووەوە، دووبارە سەفەر بکات. کەچی هەرکە گەییە زێد و زاگەی خۆی لە سەفەرەکەی ژێوان بووەوە. هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئەو و ماڵی مامیا نەبوو. چونکە ڕۆژنامە لۆکاڵییەکان هەواڵی ئامادەبوونی "نووسەری ناودار" یان بڵاوکردبووەوە، هەمیشە کەسێك لەبەر دەرگادا لە چاوەڕوانی ئەودا بوو. شەش دانە ڕۆژ بە دیار مامیەوە مایەوە، کە زانی هیچ کارێکی پێناکرێ، بەلەز بەرەو ڤیدۆسیا کەوتەڕێ. لەوێ سوڤۆرین، لە کۆشکەکەی خۆیدا پێشوازییەکی شاهانەی لێکرد. کەچی لەوێش، وێڕای پێشوازی ومیواندارییە گەرم و گوڕەکەی سوڤۆرینش، هەر بێتاقەت بوو. دەریا خرۆشابوو، بایەکی سارد لە بنی دەرگاکانەوە خۆی بە ژووردا دەکرد، ئەو ماڵە گەورەیە، سوپا و موغەیری تەواوی تیا نەبوو. چیخۆف لە سەرما هەڵدەلەرزی. بە جۆرێ دەکۆکی، لە تۆ وایە هاکا سیپەلاکەکانی هاتنە دەرێ. تەنانەت قسە خۆشەکانی سۆڤۆرینش نەیانتوانی ئەو بێزاری و بێتاقەتیەی لێ بڕەوێننەوە. ئیدی بە سواری کەشتی بەرەو یاڵتا کەوتەڕێ. لەوێ هەواڵی مردنی هاپو میتروڤانی پێگەیی و پرسەنامەیەکی (١٨٩٤/٩/٩) بۆ گریگۆری ئامۆزای نارد کە: "من لە ناخی دڵەوە مامم خۆش دەویست، خۆشم دەویست و ڕێزم دەگرت". کە بیری لەم پیاوە ساڵحانە باشە دەکردەوە، منداڵییەتی خۆی بیردەکەوتەوە کە چەند منداڵێکی کلۆڵ بوو، چۆن لە شارە خەواڵووەکەی تاگانروگدا دەژیا، بە کەسەرەوە بیری لەو ڕابردووە دەکردەوە. دوای تۆزێك سەودای سەفەر دای

لە کەللەکەی ،دەگەییە هەر جێیەك، لە تۆ وایە زەوی لە ژێر پێیا دەسووتێ و ئەو ناگرێتە خۆی. بە پەلە پەل هانای بۆ دەریا دەبرد. لە یاڵتاوە بۆ ئۆدیسا، لە ئۆدیساوە بۆ هەندەران: بۆ ئابازیا. ئەمە کۆمەڵێك گەڕاو و سەرچاوەی ئاوی گەرم و سوێر بوو لە کەناری دەریای ئەدریاتیك. لەم سەفەرەدا سوڤورینشی لەگەڵ بوو. بە خۆیشی سەری لەم سەفەرە سەیرەی خۆی دەر نەدەکرد. لای کەسوکارەکەی باسی نەکردبوو، تەنانەت لە ماریاشی، کە مەحرەمی ڕازی هەمیشەیی ئەو بوو، شاردبووەوە. سەبارەت بە خەرجی سەفەرەکەی هەستی بە گوناح دەکرد، هەستی دەکرد دەرهەق بە هەموو کەسوکارەکەی، کە بە تەنیا لەوێندەری بەجێ هێشتبوون، کەمتەرخەمە. کە گەییە ڤێنا لە ۱۸۹٤/۹/۱۸دا نامەیەکی بۆ لایکا نارد کە: "تکایە، بە هیچ کەسێکی ناو ڕووسیا مەڵێ کە من لە هەندەرانم. من بە دزییەوە لە وڵات وەردەکەوتووم. ماری وا دەزانێ لە فیدوسیام. ئەگەر بزانن من لە هەندەرانم نیگەران و تووڕە دەبن، ماوەیەکە لە سەفەرەکانم بێزاربوون. حاڵم باش نییە. تەقریبەن بەردەوام دەکۆکم. وا دیارە وەکوچۆن ڕێگەم دا تۆم لە دەست بچێت، بەو ئاوایەش ڕێگەم بە سەلامەتی و تەندروستی خۆ داوە کە لە دەستم بچێت".

دوای سێ ڕۆژی دی، لە ئابازیاوە، نامەیەکی بۆ لایکا نووسی، کە وا دیارە کەش و هەوای ناخۆش و نالەبار لەوێندەری وەدەردەنێت، و ئومێدەوارە لە نیس هەتاو ببینێ و گەرمی ببێتەوە، بە دەم ڕێگاوە لە تریستا، ڤێنیسیا، میلانۆ و جەنەوا، وەستان. لە میلانۆوە، عەزابی ویژدان ناچاری کرد نامەیەکی دوورودرێژ و خەمناك بۆ خەشکەکەی ڤڕێ بکات و ئاگاداری بکاتەوە کە چۆن هەڵاتووە و ملی بەو سەفەرەوە ناوە، لەو نامەیەیدا پرسی بووی کە: "ئاخۆ پارەی پێویستی بۆ مەسرەف و خەرجی خانەوادەکەیان هەیە؟" پاشان تێبینییەکانی ئەم سەفەرەی و ئەو شتانەی کە کڕی بوونی بەمجۆرە و بە کورتی بۆ باس کردبوو: لە ڤێنا کڵاوێکی گوێچکەداری سوارکاری کڕیوە.، لە ڤێنیسیا جامێکی نەخشینی ڕەنگین بە ڕەنگێن بە هەشت و سێ بۆینباخی کڕیوە، لە میلانۆ چووەتە تەماشای نمایشێکی تاوان و سزا، کە ئەکتەرانی ئیتاڵیایی، لە ئەکتەرانی ڕووس باشتر پێشکەشیان کرد بوو.هەروەها سەری کوورەی جەستە سووتاندنی داوەو بە نیازە بەو زووانە سەرێکی گۆڕستانی جەنەوە بدات. سوڤورین، سەری لەم ئارەزووی سەردانی سەرقەبرانەی هاوسەفەرەکەی دەسوڕما. هەرچەند چیخۆف وای دەنواند کە گوێ بە مەرگ نادات و بەلایەوە گرنگ نییە، بەڵام هەمیشە مەرگی لە بیر بوو.

کە لە ۱۸۹٤/۱۰/۲دا گەییە نیس، چەند نامەیەکی لایکای، کە مۆر و نیشانەی پۆستەی سویسرایان پێوە بوو، پێگەیی، ئیدی ئەم نامانە لە ئەدرەسێکەوە بۆ ئەدرەسێکی دی بە دوایەوە بوون. لایکا بڕیاری دابوو، هەموو شەرم و ڕووگیرییەك وەلاوە بنێت و گشت ناکامییەکانی ئەشق و ڤیانە تازەکەی خۆی بۆ چیخۆف بگێڕێتەوە. پاش ئەوەی چیخۆف، دەستی پێوە نابوو، لە کۆڵ خۆی کردبووەوە، ڕەدووی پۆتاپنکۆ کەوتبوو و دەگەڵیا بۆ پاریس چووبوو، بەڵام زۆری پێنەچوو بوو کە پۆتاپنکۆ لە لایکا تێر بوو بوو و بەجێی هێشتبوو و گەڕابووەوە بۆ لای ژنەکەی و ئاشت بووبوونەوە و بە دوو قۆڵی چووبوون بۆ ئیتاڵیا. لایکاش، بە تەنیا و نائومێد، بە سکی پڕەوە لە سویسرا مابووەوە. بۆیە لە نامەیەکیا بۆ چیخۆف، بەمجۆرە دەردەدڵ دەکات:

"ئاشكرايه كه من مەحكومم، بێچارەم و ئازیزانم گاڵتەم پێدەکەن .بۆیە حەز دەکەم ئەمڕۆ بە دووردرێژی قسەت بۆ بکەم. زۆر بێزار و دڵتەنگم. لایکاکەی جاران نەماوە. چەند سەر دێنم و دەبەم، ناتوانم بڵێم، تۆ سەبەبکاری ڕاستەخۆی ئەم وەزعەی منی."

چیخۆف بۆ سبەینێ نامەیەکی دیکەی لایکای پێدەگات کە لێی دەپاڕێتەوە بچێ سەردانی بکات: "ئەگەر لەوە ناترسیت، دیتنی لایکای کۆنە دۆستت، خەفەتبارت بکات وەرە. لایکاکەی جاران شتێکی ئەوتۆی لێنەماوەتەوە... بەڵێ، ئەم شەش مانگە، بە ڕاستی سەراپای ژیانی گۆڕیم. هەڵبەتە چاوەڕوانی ئەوەت لێناکەم کە هاوخەمیم بکەیت. چونکە وا تەسەور دەکەم تۆ هەمیشە لە هەنبەر خەڵکی و کێشەکانیاندا خەمسارد و بێموبالات بوویت".

چیخۆف، زۆر لەو ڕەفتارەی پۆتاپنکۆ، پەست و توڕەبوو، لە نامەیەکیا (١٨٩٤/١٠/٢) بۆ ماریای خوشکی دەڵێت بە ڕاستی ئەم پیاوە "بەرازە". بەڵام لە هەمان کاتدا خۆی لەوە بواردبوو کە بۆ لایکا بپاڕێتەوە و بە لەز فریای بکەوێ. بۆیە وەڵامەکەی چیخۆف بۆ لایکا هەندێك سارد بوو: "مخابن، من ناتوانم بۆ سویسرا بێم، چونکە من لەگەڵ سوڤورینداm کە دەبێ بڕوات بۆ پاریس. یانی شەش حەوت ڕۆژێك لە نیس و دوو سێ ڕۆژێك لە پاریس دەمێنمەوە و پاشان بۆ میلیکۆڤۆ دەگەڕێمەوە..غەدرت کردووە کە بە من دەڵێی لە هەنبەر خەڵکیدا خەمسارد و بێ موبالاتم... جوێنم پێ مەدە، خەفەت مەخۆ، دڵخۆشی خۆت بدەوە و ئاگات لە تەندروستی خۆت بێ".

لە ١٨٩٤/١٠/١٩دا، دوای ئەوەی بە بەرلین، و پاریس و مۆسکۆدا تێپەڕی، جارەکی دی گەیشتەوە میلیکۆڤۆ. هەرچەندە لە دڵی خۆیدا، کەمێك ژێوان بوو لەوەی کە گوێی بە چارەنووسی لایکا نەدابوو. بەڵام وێڕای ئەوەش زۆری لێ پەست بوو، کە بە کەمتەرخەم و بێ موبالاتی بەرانبەر بە خەڵکی ناو بردبوو. لە لایەکی دیکەشەوە دەترسا ئەگەر بەو حاڵەوە بیدێنێ بەزەیی پێدا بێتەوە و باوەش بۆ ژنێکی چاو بەگریان بکاتەوە کە ئێستا خۆشی نەدەویست. بۆیە بڕیاری یەکجارەکی دا کە چیتر نامەی بۆ نەنووسێت. دەگەڵ ماری خوشکیشیا باسی نەدەکرد. بەڵام ماری بەردەوام نامەی بۆ ئەم کلۆڵە دەنارد، لە ڕێگەی نامە و نامەکارییەوە بۆی دەرکەوت کە لایکا کچێکی بووە. جارێکی دی پۆتاپنکۆی لە پاریس دیتووە، بە نیازە بەو زووانە بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە.

بەڵام لایکا هەر دەستبەردار نەبوو، لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٨٩٤دا، لە نامەیەکیا بۆ چیخۆف، دەڵێت: "نزیکەی دوو مانگە لە پاریسم، تاقە وشەیەکی تۆم پێ نەگەییوە. ناشێت لە من زویر بی؟ بێ تۆ خۆم بەسەرگەردان و تڕۆکراو دەزانم. ئامادەم نیوەی تەمەنم بدەم و لە میلیکۆڤۆ بم، دەگەڵ تۆدا لەسەر تەختێك دانیشم، بۆ دە دەقیقە قسەت دەگەڵ بکەم، شیڤت دەگەڵ بخۆم. بە کورتییەکەی بە جۆرێ بژیم وەکو ئەوەی ئەم ساڵە لە بنی نەبووبێ، وەکو ئەوەی لە ڕووسیا دەرنەچووبم و هەموو شتێك وەکو جاری جاران بە دەقی خۆیەوە مابێت".

بەڵام چیخۆف، ئەمجارەش وەڵامی ئەو هاوارەی کە لە هەندەرانەوە بۆی هێنرابوو، نەدایەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەگەڵ پۆتاپنکۆی بەرەڵڵا و "بەراز"دا ئاشت بووەوە و بێ چەند و چوون

پەیوەندی دەگەڵدا تازە کردەوە. ئیدی لایکای بەستەزمان، لە هەموو بەرەکاندا دۆڕا. ماری کە دەیویست لە بیروبۆچوون و هەڵوێستی براکەی تێبگات، لە "یاداشتەکانیا" دەڵێت: "نازانم چی لە مێشکیا بوو، بەڵام پێموایە هەوڵی دەدا بەسەر هەستی خۆیا دەرهەق بە لایکا، زاڵ بێت. هەندێ لایەنی تەبیعەتی لایکای بە دڵ نەبوو. لایکا کەسێکی بێ شەخسیەت بوو، زۆری حەز لە ژیاتی هیپیانە و قەرەجانە بوو".

ئەنجام، عیشوەگەرییەکانی لایکا، دادیان نەدا، چیخۆف و ئاشقێنی چیخۆف دەگەڵ ئەودا، لە سنووری قسەی دڵداری هێوەتر نەڕۆیی، چونکە کەسێکسی سێکسباز نەبوو و ئەشقی جەستەیی زۆر لا مەبەست نەبوو، ماچ و موچ و دەستبازی لە هاوباخەڵی و هاوخەوی پێ خۆشتربوو. لە ساتێکی ڕاستگۆیانەی خۆیدا، لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (٢١/ك٢/١٨٩٥) لەو بارەیەوە دەڵێت، ریسکی ئەڤینداری کەم بووە، لە چاو کاترینی گەورەدا، کە پەیوەندی یەجگار زۆری هەبووە دەگاتە "توێکڵە گوێزێك لە تەنیشت کەشتیەکی جەنگییەوە". پۆتاپنکۆی دەمدەمی مجێز و ڕەقیبی چیخۆف، لە "یاداشتەکانی خۆیدا" پاکانەیەکی باش و ماقووڵ، بۆ ئەم دوورە پەرێزییە سێکسییەی چیخۆف دەکات و دەڵێت: "چیخۆف نەیدەویست خۆی بە ژیانێکی تایبەتییەوە ببەستێتەوە، باوەڕی وابوو، ئەو جۆرە پەیوەندی و ژیانە، جۆش و خرۆشی داهێنانی دەروونی داهێنەر، خاو دەکاتەوە". (بڕوانە یاداشتەکانی پۆتاپنکۆ).

کە لایکا بۆ ڕووسیا گەڕایەوە، دوای ماوەیەکی کەم، منداڵە ساواکەی مرد. پۆتاپنکۆ، کە بەزەیی بە لایکادا دەهاتەوە، ئەمەی بەهەل زانی، خۆی لە لایکا دزییەوە و، گەڕایەوە بۆ سان-پترسبۆرگ و لەوێ دەگەڵ خێزانەکەیدا، ئاکنجی بوو. بەڵام چیخۆف، لە دڵی خۆیدا بیری لە هەوراز و نشێوی ئەم تراژیدیا خەمناکە دەکردەوە، کە هەموو ئەکتەرەکانی دەناسی و، دەیپرسی تۆ بڵێی نەبێت بە هەوێن و ئامیانی شانۆنامەیەك. هەڵبەتە تا زیاتر دەچووە تەمەنەوە، ژیان پتر بۆ نووسینی هاندەدا، ئیدی بە شێوەیەکی یەجگار سەیر هەر کەسێکی دەبینی، هەر ڕووداوێکی تووش دەبوو، خۆ بە خۆ دەبوون بە پەیڤ و وشەی هاوئاهەنگ و دەڕژانە سەر کاغەز.

پەڕاوێز:

* ".. بە دیار بەقاڵەوە": برایانی چیخۆف ئەو ناوەیان لە بابیان نابوو.

* "میخائیل ئیڤانۆڤیچ گلینکا (١٨٠٤-١٨٥٧)": موزیکزانێکی ڕووس بوو، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ڕۆمانتیزمی بواری مۆسیقای ڕووسیا.

## نەورەس

شەوێکی ساردی کانوونی دووەمی ١٨٩٥ بوو. خانەوادەی چیخۆف هەموو لە میلیکۆڤۆ بوون. تازە لە شێڤخواردن بووبوونەوە و هێشتا لە سەر خوانەکە هەڵنەستابوون، حەپەی سەگەکان بەرز بووەوە، لە تەقەی دەرگا درا. ماری، چوو دەرگا بکاتەوە و بزانێ کێیە، لە بەر ڕووناکی چراکەی دەستیا، سیمای پرشنگداری تاتیانا شچپکیناکوپرنیك دەرکەوت، لیڤیتناش، مات و پەشۆکاو لە دوایەوە بوو. دوو دانە ساڵ بوو کە لیڤیتانی نیگارکێش لە چیخۆف زویر بوو بوو و هاتوچۆی نەدەکرد، چونکە چیخۆف لە چیرۆکی "زیك زیکە" دا وەکو کەسێکی مەیخۆری بەرەڵڵای داوێن پیس وێنەی گرتبوو. بەڵام تاتیانا، زۆری لێکردبوو ئەو شتە لە بیر بکات و دەگەڵ چیخۆفدا ئاشت ببێتەوە، ئیدی لەسەر قسەی تاتیانا، نیوە تووڕە و نیوە شاد، هاتبوو بۆ میلیکۆڤۆ.

چیخۆف، کە غافڵگیر بوو بوو، بە پەلە بە پیرییەوە دێتە دەرێ، دوای کەمێك بێدەنگی تەوقەی دەگەڵ دەکات. ئیدی کەسیان، کەم و زۆر باسی ڕابردوو ناکەن، بە گوتەی ئەوانەی کە لەوێندەر دەبن، دوای چەند قسە و گفتوگۆیەکی ئاسایی ڕووندك لە چاوە ڕەش و گەشەکانی لیڤیتاندا قەتیس دەمێنن و چاوانی چیخۆفیش بە شادییەکی منداڵانە دەردەوشێنەوە. کاتێ لیڤیتان بۆ مۆسکۆ دەگەڕێتەوە، لە وێندەرەوە نامەیەك بۆ برادەرەکەی کە تازە دەگەڵی ئاشت بوو بووەوە دەنووسێت کە: "ئەمە دیداری گەڕانەوەم بوو بۆ لای کەسێك کە زۆر لام ئازیز بوو، کە لە ڕاستیدا هەمیشە لام ئازیز بووەو ئازیزە".

دوای چەند ڕۆژێك، لە مۆسکۆ یەکتریان بینییەوە. لە کاتێکدا چیخۆف، بە سەرسامی تەماشای تابلۆکانی لیڤیتانی دەکرد. هەستی بە شتێکی دەستکرد کرد. لە نامەیەکیا (١٩/ك٢/١٨٩٥) بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەو هەستە گەنجانەیەی جاران لە تابلۆکانیا بەدی ناکرێن. جۆرە دەستکردیەکی وەستایانە بە تابلۆکانییەوە دیارە.پێموایە ژنان چۆڕ بڕیان کردووە. ئافرەت، ئەم بوونەوەرە جوانانە، خۆشەویستی بە پیاو دەبەخشن، بەڵام لە بری ئەمە شتێکی بچووکی لێدەسەنن: ئەویش گەنجایەتییە. ڕەسم و دیمەن و تابلۆ بەبێ جۆش و خرۆش نایەتە کێشان. جۆش و خرۆش مەحاڵە لای پیاوی تێر پەیدا ببێ، ئەگەر من شێوەکاری دیمەنان بام، زۆر دەروێشانە دەژیام: ساڵی شەوێك دەگەڵ ژناندا دەخەوتم و، ڕۆژی ژەمێك نانم دەخوارد".

هەڵبەتە چیخۆف، بۆ خۆیشی خەوی بە ژیانی قەلەندەرانەوە دەبینی. یانی ئەو ژیانە قەلەندەراتیەی پێخۆش بوو. ئەوەتا دوای ساڵێك، لە نامەیەکیا (١/ك١/١٨٩٥) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "ئەگەر دێرەکان خەڵکی بێ دینیان قبووڵ بکردایە و ڕێگەیان بدایە کە نوێژ نەکات، بۆ خۆم دەبووم بە ڕەبەن". ئاخر ژیان و نووسین چۆن پێکەوە هەڵدەکەن؟ ئایا ژیانی ئاسایی ڕۆژانە لە گەڵ ژیانی قەڵەمڕانیدا تێك دەکەنەوە؟ ئەمجۆرە پرسیارانە، لە سەرەتای کاری نووسینەوە، چیخۆفیان عەزاب دەدا.

لەم سەروبەندەدا چیرۆکێکی درێژی بە ناونیشانی (سێ ساڵ) تەواو کرد، ئەم چیرۆکە باسی هەرەسهێنانی خانەوادەیەکی بازرگانە، لە سایەی ژیانی بازرگانی گەندەڵی شاری مۆسکۆدا. خۆی لە چیرۆکەکە ڕازی نەبوو، بەڵام هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی پێیدا بچێتەوە یان دەستکاری وچاکی بکات، بۆیە هەر بەو دەقەوە دای بە گۆڤاری "هزری ڕووسی" ئیدی سانسۆر بەربووە دەقەکە و چەند پەرەگرافێکی، کە پەیوەندییان بە ئایینەوە هەبوو، لێ لابرد. بۆیە نامەیەکی (١٩/ك٢/١٨٩٥) بۆ سوڤورین نووسی کە: "سانسۆر، هەر ئارەزوویەکی ئازادی دەربڕینت هەبێ، لێتی زەوت دەکات، پیاو کە دەست دەکات بە نووسین، هەست دەکات کە ئێسقانێك لە گەرووی گیراوە". بەڵام ئەم قسەیەی بەو مانایە نەبوو کە لە نووسین سارد ببێتەوە. لە بابەتی کەم نەبوو، بەڵام نەخۆشی ، ماڵانی زۆر بوو، بە هەر چوارنکالی گەڕەك و بانا بڵاوبووبوونەوە، دەبوایە سەری هەموویان بدات، وێڕای ئەم کارانەش، سەرپەرشتی بینای قوتابخانەیەکی تازەی گوندی تالیژی دراوسێشیانی دەکرد. دوای ئەوە سەرەتا بە ئەندام وپاشان بە سەرۆکی ئەنجوومەنی دادگای سرپۆخۆف هەڵبژێردرا، یانی هێندەی دی سەری قاڵ بوو. ئەمە جگە لەوەی نووسەرانی تازە کاریش دەستنووسەکانی خۆیان بۆ دەنارد و تکایان لێدەکرد، بۆیان بخوێنێتەوە و ڕێنوێنیان بکات، کە ئەویش دڵی نەدەهات، دەست بە ڕوویانەوە بنێ و لە ئامۆژگاری و ڕێنیوێنییەکانی خۆی بێبەشیان بکات. سەرەنجام کەوتە بیری ئەوەی کە خزمەتێکی کتێبخانەکەی شارەکەی خۆی، تاگانرۆگ بکات و ناوبە ناو کتێبی بۆ بنێرێت. بۆیە بەردەوام ئەو بەستە کتێبانەی کە وەشانخانەکان بە دیاری بۆیان دەنارد، یان بە پارەی خۆی دەیکڕین، بۆ تاگاترۆکی دەنارد، کە ئەوەش بۆ خۆی جۆرە سەرقاڵییەکی بۆ چێدەکرد.

کاتێ کە سوڤورین، بەو حاڵەوە دەیبینێ و هەست دەکان زۆر ماندووە، جارێکی دی ئامۆژگاری دەکات کە بۆ خۆی ژنێك هەڵبژێرێ، تا بەلای کەمەوە پێی ڕابگات و کار و بارەکانی بۆ ڕێك بخات. چیخۆف ڕێك و ڕوان وەڵامی دەداتەوە (١٨٩٥/٣/٢٣) کە: "زۆر باشە، ئەگەر تۆ بتەوێ، من ژن دێنم، بەڵام بەم مەرجانە: دەبێ هەموو شتێك بە دەقی خۆیەوە وەکو جاران بەردەوام بێ، واتە ژنەکەم دەبێ لە مۆسکۆ بژی و من لە لادێ. من ناو بە ناو کە دەرفەتم بۆ ڕەخسا سەری دەدەم. بە ڕاستی من تەحەمولی ئەو جۆرە شادمانییە ناکەم کە لەم ڕۆژەوە تا ئەو ڕۆژ، لەم بەیانییەوە تا ئەو بەیانی بەردەوام بێ، لەم حاڵەدا بەڵێن دەدەم کە مێردێکی نموونەیی بم. بەڵام تۆ ژنێکم بدەیە کە وەکو مانگ هەموو شەوێ لە ئاسمانی مندا هەڵنەیەت. ئەگەر ژن بهێنم باشتر نانووسم". دوای چەند مانگێك لە نامەیەکی تریدا (١٠/ت٢/١٨٩٥) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "من لە ژن دەترسم، لە پابەندی و ئیلتیزاماتی خێزانداری دەست و پێگیر، دەترسم. کە هەرگیز دەگەڵ دنیای بێ نەزم و نیزامی مندا تێکناکاتەوە. بەڵام ئایا ژن هێنان لەوە باشتر نییە کە پیاو بە بەلەمێکی شەق و شڕەوە بە ناو دەریای تەمەن بکەوێ و خۆی بخاتە بەر پێل و شەپۆلانی بێ ئامانی ڕابواردن و عەیش و نۆش و خۆشگوزەرانی؟ من بەش بە حاڵی خۆم لە گراوی وماشقان تێربووم و ئارەزووم لێیان هەڵناستێ".

هەرچەندە چیخۆف، تاڕادەیەکی زۆر پەیوەندی دەگەڵ ئافرەتان کەم کردبووەوە، بەڵام ژنان هەر دەوروخولیان دەدا و بە ناز و عیشوە فریویان دەدا. هەڵبەتە لیدیا ئەڤیلوڤا، لە هەموویان گۆساختر و بێ پەرواتر بوو. هەرچەندە چیخۆف، بە درێژایی ساڵی ١٨٩٤ تاقە نامەیەکی بۆ نەناردبوو، بەڵام ئەو لە دڵی خۆیدا قەناعەتی تەواوی هەبوو کە چیخۆف، هێشتاش ژێراوژێر لە دڵی خۆیدا دڵبەستەی ئەوە و دەری نابڕێت. جارێك لە شوباتی ١٨٩٥ دا چیخۆف ڕێی دەکەوێتە سان پترسبۆرگ. لیدیا، لە غیابی مێردەکەیا، دەعوەتی دەکات بۆ ماڵەوە، کە بە دوو قۆڵی نانی ئێواریێ بخۆن. لە کاتێکا لیدیا بە تاسەوە چاوەڕوانی چیخۆف دەکات، لە پڕ چەند دۆستێکی لە ناوەختا خۆ بە ژووردا دەکەن، ئیدی وەکو کوللە دەدەن بەسەر هەموو ئەو بەرکوڵانەدا کە بۆ چیخۆف ئامادەی کردبوون. ئەوجا بە قسە و باس و چەنەبازی بێ تام و مانا سەریان هێنایە ژان. کە ئەنجام چیخۆف هات، یەکسەر بە پرسیار و تەشەران گەمارۆیان دا. لیدیا، پاش ئەوەی توانی دەست بە میوانەکانەوە بنێ و بەڕێیان بکات، هەنگێ خۆی دەکەوێتە نازفرۆشی بەسەر میوانە بە ناوبانگەکەیدا. دوای ئەوە بەنیو سەدە، لە یاداشتەکانی خۆیدا، لاڤ ئەوە لێدەدا کە گوایە چیۆخف لەو بۆنەیەدا، بە ڕاشکاوی، هەمان ئەشقی جارانی بۆ دەربڕیوە: "یەکەمین دیدارمانت لە بیرە؟ دەزانی کە بە دڵ و گیان خۆشم دەویستی؟ بە ڕاستی ئاشق و شەیدای تۆ بووم، وام هەست دەکرد، هیچ ژنێکی دیکە لەم دنیایەدا نییە کە بتوانم بەو جۆرە خۆشم بوێ. تۆ زۆر خشیك و جوان بووی. ناسکی و پاراویت پیاوی مەست دەکرد!.. بەڵام من دەمزانی تۆ وەکو ژنانی دیکە نیت، وەك ئەو ژنانەی کە وازم لێهێنان یان ئەوانەی وازیان لێهێنام نەبوویت.دەمزانی ئاشقێنی دەگەڵ تۆدا دەبێ پاك و پیرۆز بێ و بە درێژایی تەمەن بەردەوام بێ. دەترسام دەست تێوەدەم".

هەڵبەتە ئەو نامەیەی کە چیخۆف، دوای ئەم دیدارە بۆ لیدیای نووسیوە، مخابن هێندە سارد و سڕ و وشکە، کە مۆری درۆ بە قسەکانی لیدیاوە دەنێت: "تۆ هەڵەیت کە دەڵێی من زۆر ڕەنجام، لە تۆ پەست بووم، پەست نەبووم، بەڵام کە هەستم کرد ماندووی دەستی میوانەکانتی لە ناخی دڵەوە زۆرم پێناخۆش بوو". (بڕوانە نامەی ١٨٩٥/٢/١٤). ڕۆژی دواتر (١٨٩٥/٢/١٥) چیخۆف نامەیەکی وشکتر لە نامەی یەکەمی بۆ دەنێرێت و ئەو دەستنووسەشی بۆ دەنێرێتەوە، کە دابویە بۆی بیخوێنێتەوە و بۆی هەڵسەنگێنێ، لە نامەکەدا، بە ڕاشکاوی و بێ هیچ خاترانەیەك بە لیدیا دەڵێت: "بە کورتییەکەی، تۆ بەهرەت تیایە، بەڵام زۆر شاش و واشیت، یانی بابەتەکانت سواو و پـواون. لـە گروپـی نووسـەرە ناجدییـەکانی، شـێوازەکەت لـە شـێوازی پیرەمێـردان دەچـێت". نامەکەی بەمجۆرە کۆتایی پێ هێنابوو: "دڵسۆزت چیخۆف" دەگەڵ ئەم نامەیەدا، نوسخەیەکی لـە کتێبـە تازەکـەی خـۆی "حیکایـەت و چیرۆکان" بـۆ نـارد بـوو، کـە بـەم شـێوەیە پێشەکەشـی کردبوو: "بۆ ل. ئا. ئەڤیلوڤا... لە نووسەرەوە".

ئەوجا چیخۆف، بەبێ ئەوەی کەمترین هەوڵی دیتنی ئەڤیلوڤا بدات، کە لە قسان چەندین ساڵ بوو ژێراوژێر خۆشی دەویست، یەکسەر بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە. ئەڤیلوڤا، کە هیچ هۆیەکی بۆ ئەم هەڵاتنەی چیخۆف شك نەدەبرد، لێبڕا بە شێوەیەکی شاعیرانە دوای بکەوێ و لێی نەبێتەوە،

ئـەوە بووچـوو بـۆ لای زەڕەنگـەرێك و ڕای سـپارد قـاوغی سـەعاتێكی زنجـیرداری تایبـەت بـە نووسەری دڵخوازی خۆی، بۆ دروست بكات. كە لە دیوێكیا و لـە شێوەی كتێب دا، ئەم عینوانـە بنەخشێنێ: "حیكایەت و چیرۆكان، ن: ئا. چیخۆف" و لە دیوەكەی تریا: "ل٢٦٧، دێڕی ٦، ٧" بنەخشێنێ، كە ئاماژەیە بۆ ئەم ڕستەیەی چیرۆكی "هاوسێكان" كە لـە هـەمان لاپـەڕە و دێڕانـدا دەڵێـت: "هـەر كـاتێ پێویسـتت بـە گیـان و ڕۆحـی مـن بـوو، مـاڵی خۆتـە، وەرە بیبـە". ئیـدی ئـەم دیاریەی بە براكەیدا نارد بۆ نووسینگەی گۆڤاری (هزری ڕووسی) تـا بیـدەن بـە چیخۆف. ئـەوجا بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی وەڵامی دەكرد. چیخۆف بە تاقە وشەیەكیش وەڵامی نەدایەوە، تا بەلای كەمەوە دڵنیـای بكـات كـە دیارییەكـەی پێگەیشـتووە. ئەڤیلوڤا زۆر بـە خۆیـا شـكایەوە. یەكسـەر ڕۆیی بۆ مۆسكۆ، لە وێندەرەوە نامەیەكی بۆ میلیكۆڤۆ نارد، داوای لە چیخۆف كرد كە پەیوەندی پێـوە بكـات. ئـەمجارەش هـیچ وەڵـامێكی پێنەگـەیی. جـا چـیخۆف بـۆ ئـەوەی خـۆی لـە ئـەڤیلوڤا بدزێتەوە، بە نووسەرانی "هزری ڕووسی" گوتبوو، كە ئەگـەر ئـەڤیلوڤا، لێـی پرسـی، بڵـێن چـووە بـۆ تاگـانرۆك، هەڵبـەتـە بـۆ ئاكـانرۆگ نەچـووبوو، بـەڵكو لـە میلیكۆڤـو و لـە مـاڵی خۆیـدا بـوو و چاوەڕوانی هـاتنی وەرزی بەهار بـوو. ئـەنجام دوای چـەندین مـانگ لـە بـەفر و گۆشـەگیری و مـت بوون و تەنیایی، لە ١٨٩٥/٤/١٨ نامەیەكی بۆ سوڤۆرین نووسـی كـە: "كلاۆكـوڕە، لـە كێڵگەكانـدا دەخوێنین، تەیرو توو لە دارستانانـدا دەجریوێنن، هەوا گەرم و خۆشە".

وەكو هەمیشە، دەگەڵ هەوەڵی بـەهارا، میـوان بـە سـەریا دابـارین، دوای ماوەیـەكی كـەم هـەموو ئەندامانی خانەوادەكە، جارێكی دی لە "دۆكنشینەكەی"ی ئانتوندا یەكیان گرتەوە. میخائیل كـە بـۆ یاروسـلاڤل گوێزرابـووەوە و لـە ئیـدارەی شـارەوانیدا كـاری دەكـرد و لـە ڕووی پلـەی فەرمانبەرییـەوە گـەورە بووبـوو. ئیڤـان وەكـو مامۆسـتا لـە ناوەنـدە پەروەردەییەكـەی مۆسـكۆدا ناوبـانگی دەركردبـوو، ماریـا، لـە پـەیمانگای رایفسـكیدا دەرسـی دەگوتەوە.بـەڵام لـە پـاڵ دەرس گووتنەوەشدا، دەورەو خولی نۆژداریشی دەبینی تا لە چارەسەری جووتیاراندا، یارمەتی براكەی بدات.

ئەلكسـاندەرش، وەكـو ڕۆژنامـەنووس، هـەر لـە "ڕۆژگـاری نـوێ"دا كـاری دەكـرد و بـە نـاوی خـوازراوی (سیدۆی)شـەوە چـیرۆكی بڵـاودەكردەوە و بـە شـانازییەوە بـە ئـانتۆنی دەگـوت كـە حیسابێكی بانكی بۆ خۆی كردووەتەوە و بە نیازە بـۆ خـۆی ڤێلایـەكی هاوینـە بـە كـرێ بگرێـت.. بەڵێ هەموو لە دەوری یەكدی خڕبوونەوە.

لایكـا، لـە مـاوەی ئـەو هاوینـەدا، سـێ كـەڕەتان سـەری میلۆكۆڤـۆی دا، بـەڵام وەكـو جـاران دەوروخولی چیخۆڤ نەدەدا، نەیدەویست بیخاتـە داوی ئەشـقەوە. دوای سـاڵانێك لەسەركێشـی و بێ پـەروایی، پەیوەندییەكـەیان، بـوو بـە پەیوەندییـەكی دۆسـتانەی ڕوون و ئاشـكرا. چیخۆف بـە هەمان شادی و گەرم و گوڕی جارانـەوە، پێشـوازی لـە گەڕانـەوەی لایكـا بـۆ كـۆڕی دۆسـتان كـرد. هـەروەها زەڕەیـەك ڕقـی لـە پۆتـاپینكۆی "بـەراز و فریبـۆك" لـە دڵـا نـەمابوو، ئێسـتا بەلایـەوە ئـەو ڕەقیبە نەبوو كە لایكای لە خشتە بردبوو، وەكو دۆستێكی دڵسـۆز و خـۆیی تەماشـای دەكـرد، لـە هاونشینی ئەو ڕازی بوو.

لیڤیتان، برادەرە نزیکەکەی دیکەی، کە چیخۆف تازە دەگەڵی ئاشت بووبووەوە، لە "زیك زیکە"کەی تۆرابوو و حاڵی حازر کەوتبووە داوی ئاشقێنی ژنێکی بەتەمەنی زۆر دەوڵەمەندەوە بە ناوی (ئانا تورچانینوڤا). لە پرێکا، چیخۆف، لە تەمموزی ساڵی ۱۸۹۵دا نامەیەکی لە تورچانینوڤاوە پێگەیی کە گوایە ئەو شێوەکار و نیگارکێشەی کە دەگەڵ ئەمدا و لە موڵکەکەی ئەمدا، لە گورکا دەژیا، لە هەوڵێکی خۆکوژیدا خۆی بریندار کردووە. ئیدی تورچانینوڤا نووسی بووی، هەرچەندە لیڤیتان تەنیا بریندار بووە و هیچی تر، بەڵام لەو ساوە زۆر بێزار و بێتاقەت بووە، مەگەر تەنیا چیخۆف بتوانێ فریای بکەوێ و دڵخۆشی بداتەوە و ئەم کلۆڵە بێنێتەوە تایم. ئەوەی کە تورچانینوڤا لە نامەکەیدا باسی نەکردبوو، ئەوەبوو کە تورچانینوڤا و کچەکەی لەسەر لیڤیتان لێیان بوو بوو بە شەرێکی توند و لیڤیتان، تەحەمولی نەکردبوو و پەنای وەبەر خۆکوژی بردبوو. ئیدی چیخۆف کە هەمیشە برادەرێکی بە ئەمەك بوو، لە ڕووی وەفای دۆستایەتییەوە، بەلەز بەرەو موڵکەکەی تورچانینوڤا، لە گۆرکا، لە دەڤەری نوڤگورود، کەوتە ڕێ، کە گەییە ئەوێندەر، سەیری کرد لیڤیتان، چاوە ڕەشەکانی بە قوڵا چووبوون، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو، سەری بە سارغییەك پێچابوو، ئیدی چیخۆف، لە ماوەی پێنج دانە ڕۆژدا هەرچییەکی لە دەست هات کردی تا ئەم پیاوەی کە کەوتبووە نێوان بەرداشی، هەڤرکی ئەم دایك و کیژەوە، بێنێتەوە تایم. هەرکە گەیشتەوە میلیکۆڤۆ، نامەیەکی لە لیڤیتانەوە پێگەیی: "نازانم بۆچی، بەڵام ئەو چەند ڕۆژەی کە تۆ لێرە بوویت، بۆ من ئارامترین ڕۆژانی هاوین بوو".

چیخۆف، ڕێك دوو هەفتە دوای سەردانی لیڤیتان، بڕیاری سەفەرێکی دیکەی دا، سەفەری ئەمجارەی بۆ چارەسەری نەخۆش نەبوو، بەڵکو سەفەری زیارەت و حەج بوو: پێوە بوو بچێت بۆ یاسنایاپالیانا، تا سەردانی تۆڵستۆی بکات. زۆربەی نووسەرانی ڕووس و گەلێك لە ئەدیبانی بیانی و فەرەنگی، چ وەکو ڕێز و حورمەت و چ وەکو کونجگاوی و فزوڵیەت، سەردانی تۆڵستۆیان کردبوو و دەکرد. چیخۆف هەرچەندە، یەکێك بوو لە دڵبەندانی "جەنگ و ئاشتی" و "ئاناکارنینا" بەڵام تا ئەو کاتە لە خۆی نەگرتبوو کە کڕنووش بۆ ئەم پێغەمبەرە بەسامە ببات، کە پێشکەوتنی ڕۆحی بەسەر پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیدا پەسند دەدا. ئەنجام یەکێك لە موریدان و هەوادارانی تۆڵستۆی، بە ناوی ئیڤان گوربونوڤ پاسودوف، چیخۆڤ هێنایە ڕەدا و، لە ۱۸۹۵/۸/۸دا بۆ یەکەمجار، ڕووبەڕوو تۆڵستۆی هزرڤانی بینی. لە بەینی ئەو ڕیزە درەختە زەلامانەدا کە دەچوونەوە بەر ماڵەکەی، یەکیان بینی. تۆڵستۆی کراسێکی هاودامانی کەتانی سپی لەبەربوو، خاولیەکی دابوو بە شانیا، لەوێندەرەوە دەڕۆیی بۆ گوێی ڕووبارەکە تا مەلە بکات. داوای لە چیخۆف کرد کە لەگەڵیا بڕوات، جلەکانیان لەبەر داکەند و خۆیان بە روبارەکەدا کرد، بەو جۆرە، لە کاتێکا، بە ڕووت و قووتی لە ئاوەکەدا بوون و ئاو تا بیناقاقایان هاتبوو، لە باوەشی سروشتدا، یەکەم گفتوگۆیان دەستی پێکرد، سادەیی و ساکاری تۆڵستۆی بە جۆرێ سەرسامی کرد، کە خەریك بوو لە بیری بچێت کە لە خزمەتی یەکێك لە سەرئامەدە گەورەکانی ئەدەبی ڕووسیدا وەستاوە. پاشان بە دوو قۆڵی کەوتنەڕێ تا بە قەراخ جادەی تولادا پیاسەیەك بکەن. تۆڵستۆی کەوتە ستایشی پاسکیل سواری کە بەو تەمەنەوە، بە تەمەنی هەفتاوحەوت

سالیشەوە، هێشتا هەر پاسکیل سواری دەکرد. ئێوارەی ئەو ڕۆژە گوربونوف پاسادوف، لە بەردەم کۆمەڵێك لە ئەندامانی خێزانەکە و میوانان و دۆستاندا، چەند فەسڵێکی ڕەش نووسی ڕۆمانی "ژیانەوە"ی خوێندەوە، کە تۆڵستۆی تازە تەواوی کردبوو و لە ڕەشنووسەکەی بوو بووەوە. ئەو پێشوازییە گەرمەی کە خانەخوێ لە میوانەکەی خۆی، لە چیخۆڤ کرد، کردیە کارێك کە چیخۆف پرکێشی بکات و بڵێت، هەرچەندە دیمەنی دادگاییەکەی زۆر بەلاوە جوانە، بەڵام باوەڕ ناکات (کاتیا ماسلوڤا)ی قارەمانی ڕۆمانەکە، تەنیا حوکمی دووساڵ زندانی بدرێت، چونکە دادگاکانی رووسیا، کە کارێکی وا قورس لە ئارادا بێت، حوکمی قورس دەدەن. هەڵبەتە تۆڵستۆی ڕەخنەکەی چیخۆڤ قەبووڵ کرد و ڕستەکەی بە گوێرەی پێشنیازەکەی ئەو ڕاست کردەوە.

دوای ئەم یەکەمین دیدارە، تۆڵستۆی لە نامەیەکیا (١٨٩٥/٩/٤) بۆ لیونی کوڕی، دەربارەی چیخۆف دەڵێت: "پیاوێکە لێوان لێو لە بەهرە، بێگومان خاوەن دڵێکی پاك و ناسکە، بەڵام پێدەچێ تا ئێستا، دید و بۆچوونێکی ڕوونی دیاری دەربارەی ژیان نەبێت". چیخۆفیش، داخی بۆ ئەوە دەخوارد کە قارەمانانی ڕۆمانی "ژیانەوە" بە زەقی پەیڤداری خودی نووسەرن.

وێڕای ئەمەش تۆڵستۆی بە نموونەی ئەخلاقی بەرز و دەگمەن دەزانی، لەو بارەیەوە دەڵێت: "پیاو کاتێ کە دەگەڵ لیون نیکولایوفیچدا قسان دەکات، وا هەست دەکات دەربەست کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ئەوەوە. من بە عەمرانم کەسی وا ئەفسووناوی وەك دەڵێن هارمۆنیم نەدیتووە، پیاوێکە نزیك بە کەماڵ".(بڕوانە: ب:گ. شچتینین، ستوونی مێروستانی ئەدەبی، لە بڵاوکراوەی پۆستەی مێژوویی، ١٩١١) چیخۆف لە نامەیەکیا (١٨٩٥/١٠/٢١) بۆ سوڤورین، دەربارەی تۆڵستۆی دەڵێت: "سەردانەکەم بۆ لای تۆڵستۆی ڕۆژ و تاقێکی خایاند، کارێکی زۆری تێکردم، زۆر ئاسوودە و ئازاد بووم، وام هەست دەکرد لە ماڵی خۆمدام، قسەکردنیشم دەگەڵ لیون نیکولایوفیچدا، زۆر ئازادانە بوو". لە نامەیەکی دیکەیدا (١٨٩٥/١٠/٢٦) هەر بۆ سوڤورین، لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "کیژەکانی تۆڵستۆی یەجگار ڕۆح سووك و ڕەزا شیرین و بەڕێزن، بابیان دەپەرستن، لە ڕادەبەدەر باوەڕ و متمانەیان پێیەتی. ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە تۆڵستۆی بە ڕاستی هێز و نیرویەکی ئەخلاقی مەزنە. ئەگەر دڵسۆز و ڕاستگۆ نەبوایە، کە لەو ڕووەوە گەردی پێوە نییە، کیژەکانی بەر لە هەموو کەسێك بە گومانەوە لێیان دەڕوانی و ڕەفتاریان دەگەڵ دەکرد: بە ڕاستی کچەکانی زیرەکن، ناتوانی چاو و ڕاویان لێبکەی... دەتوانی دەنکێك، دەزگیرانێ، ماشقەیەك، بە کەیفی دڵی خۆت فریو بدەیت، لە چاوی ژنی ئاشقدا دەشێت کەریش وەکو فەیلەسوف بنوێنێ، بەڵام ئەم کچانە، بە ڕاستی شتێکی دیکەن".

هەڵبەتە ئەم دیدارەی چیخۆف دەگەڵ تۆڵستۆی دا، کەم و زۆر ڕای چیخۆڤ دەربارەی زەرووڕەتی بێ ئیلتیزامی ئەدەبی و، بێ لایەنی نووسەر سەبارەت بە قارەمانەکانی نەگۆڕی. بەڵام دوای نووسینی چەند چیرۆکێکی وەکو: "هاوسەر، ئاناگەردن، برۆسپی، پیاوکوژی، ئاریادنا" چیخۆف لەپڕ هەست دەکات، جارێکی دیکە کەوتووەتە داوی شانۆوە.

له ۱۸۹٥/۱۰/۲۱دا له نامەیەکدا مژده به سوڤۆرین دەدات و دەڵێت: "ئیدی باوەڕ دەکەی، یان نا، کەیفی خۆتە، حاڵی حازر خەریکی نووسینی شانۆنامەیەکم، که باوەڕ ناکەم تا پێش کۆتایی نۆڤەمبەر تەواوی بکەم. ئەوەی ڕاستی بێ لەزەت لە نووسینی دەبینم، هەرچەندە خۆم لە بنەما سەرەکییەکانی شانۆ دوور دەگرم. ئەمە کۆمیدیایەکە، سێ ڕۆڵی ژنانە و چوار ڕۆڵی پیاوانەی تیایە، چوار پەردە و، یەك دیمەنە "دیمەنی دەریاچەیەك، کۆمەڵێك گەنگەشە و گفتوگۆی دەربارەی ئەدەبیات تیایە، حەرەکە و ڕووداوی کەم تیایە، پێنج خەروار ئەشقی تیایە" دوای چەند هەفتەیەك ئەم شانۆنامەیەی ناونا (نەورەس).

دوای کەمتر له مانگێك، له نامەیەکیا (۱۸/ت۲/۱۸۹٥) مژدەی به دۆستێکی نووسەر، به ناوی یەلینا شاڤروڤا دا کە: "شانۆنامەکەم تەواو کرد... هەڵبەتە شتێکی ناوازە نییە، یانی بە شێوەیەکی گشتی من شانۆنامە نووسێکی مامناوەندیم". وێڕای ئەم خۆ بە بچووك زانینەش، هەمیشە بە دەقەکەیدا دەچووەوە، دەستکاری دەکرد و مشت و ماڵی دەدا. هەڵبەتە لە پاڵ ئەمەشدا کارەکانی دیکەی فەرامۆش نەدەکرد، کەسێك بوو یەجگار مژوول و سەرقاڵ، ئەرکەکانی زۆر قورس بوون: لەلایەکەوە خەریکی کاروباری قوتابخانەی تالیژ بوو، نەخشەی بۆ دادەنا، دیزاینی دەگۆڕی، بابەتی هەمەجۆری بۆ گۆڤاری نۆژداری (ساڵنامەی نەشتەرگەری) دەنووسی تا نەوەستێ، کۆمەك و پیتاکی بۆ ئاتاجان کۆ دەکردەوە، وەکو جاران، نەخۆشانی بە خۆڕایی معایەنە دەکرد. بۆیە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ کاری لە پێداچوونەوە و مشت و ماڵدانی شانۆنامەکەیدا دەکرد، تا ئەنجام له پاکنووسی دەستنووسەکەی بووەوە و به تایپی ڕیمینگتون، دوو نوسخەی لێ تایپ کرد، نوسخەیەکیانی دەگەڵ نامەیەکدا (۱۸۹٥/۱۰/۲۱) بۆ سوڤۆرین نارد. که له نامەکەیدا دەڵێت: "شانۆنامەکەم به تۆنی بەرز دەست پێکرد و به پێچەوانەی هەموو یاسا و ڕێسایەکی هونەری درامیەوە، به تۆنێکی یەجگار نزم و نەرم کۆتاییم پێهێنا... ئەوەی ڕاستی بێ زیاتر لێی ناڕازیم تا ڕازی بم. کاتێ که شانۆنامە تازەکەم خوێندەوە جارێکی بۆم بە دیار کەوت که من شانۆنامە نووس نیم... پیشانی کەسی مەدە"

چیخۆف، ئەمجارەش، وەکو عادەتەکەی جارانی، ماك و ڕەگەزە سەرەکییەکانی شانۆنامەکەی له ژیانی دۆست و ئاشناکانی خۆیەوە هەڵدەهێنجێ، ئایا نووسەر بەبێ دزینی زۆر یان کەمی موتیڤانی ژیانی واقیعی، دەتوانێ ڕاستگۆیانە بنووسێت و سووچێکی حەقیقەت کەشف بکات؟

بێگومان بابەتی شانۆنامەی (نەورەس) لە پەیوەندییە دڵدارییەکەی لایکا و پۆتاپنکۆوە، هەڵێنجرابوو. نینا، قارەمانی خەمبار و عاتیفی، وەکو لایکا لەلایەن نووسەرێکی وەکو پۆتاپنکۆوە، به ناوی تریگۆرین، له خشتە دەبرێت و پاش ئەوەی دەستی پێ گەرم دەکاتەوە، دەستبەرداری دەبێت و وازی لێدێنێ. نینا، منداڵێکی لە تریگۆرین دەبێت، کە بە ساوایی دەمرێت. بایەخ و گرینگی ئەم شانۆنامەیە زیاتر لە دیالۆگە وردەکانی، لە هێما و ئاماژە ناڕاستەوخۆ و درکە و کینایەکانیدایە، تا له پلۆت و گرێیەکەیدا بێ کە زۆر ئاسایی و تەقلیدیە. لەم شانۆنامەیەدا هاماج و ئۆتمۆسفیری سایکۆلۆژی جێگەی ڕووداو دەگرێتەوە. ئەوەی تەماشاڤان، یان خوێنەر ڕادەکێشێت جوڵە و هاوار نییە، بەڵکو جیلوەی بارە دەروونییەکانە،

پەرەسەندنی گۆنگ و کپی هەستەکانە. نەك گۆڕانی کوتوپڕی هەڵوێستەکان. بە کورتییەکەی نووسەر نایەوێ وەرگر غافڵگیر بکات. بەڵکو ئەفسوونی دەکات.

هەرکە چیخۆف بۆ یەکەمجار، (نەورەس)ی بۆ کۆمەڵێك لە ئاشنا و دۆستانی خۆی خوێندەوە، هەر هەموو ئەوانەی لەوێ بوون، یەکسەر زانیان کە ناوەرۆکی شانۆنامەکە لە چیرۆك و بەسەرهاتەکەی لایکاوە هەڵێنجراوە، نەك هەر ئەوەندە و بەس، بەڵکو پەیان بەو لێکچوونە نزیکەش برد کە لە نێوان یەکێك لە کاراکتەرەکان، بە ناوی ئارکادینا و، هاوسەرە شەرعییەکەی پۆتاپنکۆدا، هەبوو. کاتێ کە شانۆنامەکە بۆ جاری دووەم لە مۆسکۆ، لە شوقەکەی خانمی ئەکتەر، یاڤۆرسکایا خوێنرایەوە، گوێگرانی ئێرەش، هەمان ڕاوبۆچوونیان دەربارەی شانۆنامەکە هەبوو. هەروەها کاتێ کە نیمیروفیچ- دانتچنکوش دەستنووسی دەقەکە دەخوێنێتەوە، دەڵێت لێکچوونەکە نەك زۆر زەقە بگرە، زۆریش ناخۆشە. کاتێ کە سوڤورینش، لای خۆیەوە ئاماژە بۆ ئەو کۆسپە دەکات، چیخۆف، بەوپەڕی نیگەرانی و پەستی لە نامەیەکا (١٦/ك١/١٨٩٥) وەڵامی دەداتەوە کە: "وا دیارە شانۆنامەکەم، نەورەس، بەر لەوەی نمایش بکرێت، شکستی هێناوە، ئەگەر بە ڕاستی وێنە و سیمای پۆتاپنکۆی تیا دیار بێت، ئەوا نابێ بە هیچ جۆرێ نە نمایش بکرێ و نە بڵاوبکرێتەوە".

بەڵام نیگەرانی دۆستانی چیخۆف، هەر ئەوە نەبوو کە شانۆنامەکە لە چیرۆکی پەیوەندی نێوان لایکا و پۆتاپنکۆوە هەڵێنجرابوو، بەڵکو وێڕای هەموو ڕێز و حورمەتێکیان بۆ چیخۆف، پێیان وابوو، ئەمجارەیان ڕێڕەوێکی هەڵەی گرتووەتەبەر. پێیان وابوو لە شانۆدا نووسەر ناتوانێ لە ڕێگەی کێشماکێشی دەروونییەوە، سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت. قەناعەتیان وابوو، لە شانۆدا، هەر شتێك ڕاستەوخۆ لە خزمەتی گرێ و حبکەدا نەبێ، بێ مانایە. خەڵکی لەم شانۆنامەیەدا لە جیاتی کردار، قسەی دەروونی خۆیان دەکەن. دیارە چیخۆف، ئەم سەرنج و تێبینیانەی لە دڵ گران بوو. ئەوەتا لە نامەیەکیا (١٣/ك١/١٨٩٥) بۆ سوڤورین، دەڵێت: "وا دیارە، بەهرەی شانۆنامە نووسینم تیا نییە. بەختم نییە. بەڵام بەلامەوە گرینگ نییە، چونکە درێژە بە چیرۆکنووسی دەدەم، لەو مەیدانەدا هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. بەڵام کاتێ کە شانۆنامەیەك دەنووسم، هێندە ناڕەحەتم، دەڵێی بێگارم پێدەکەن".

هەڵبەتە هێز و توانا و ورەیەکی بەرزی دەویست تا بەسەر ئەم نائومێدی و بێزارییەدا زاڵ بێت و جارێکی دی بگەڕێتەوە سەر شانۆنامەکەی و پێیدا بچێتەوە. ئەوەبوو لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٩٦دا، سەرلەنوێ شانۆنامەکەی داڕشتەوە و دەستکاری تەواوی کرد، لە ڕووی ڕاستگۆیی و ئەمانەتدارییەوە ، کۆپییەکی لێنارد بۆ پۆتاپنکۆ. پۆتاپنکۆ، هیچ ڕەخنە و ئیرادێکی لێی نەبوو، لەم کاتانەدا، مێردێکی نموونەیی بوو، دەگەڵ خێزانی خۆیدا دەژیا و، هیچ پەیوەندییەکی بە لایکاوە نەمابوو. کاتێ چیخۆف لە مانگی یەکی ١٨٩٦دا چوو بۆ سان پترسبۆرگ، خانەوادەی پۆتاپنکۆ، دەگەڵ خۆیاندا، بردیان بۆ ئەو شانۆیەی کە سوڤورین تازەکردبوویەوە تا شانۆنامەی "دۆتمیری دوورە وڵات" بدینن. ئەم شانۆنامەیە لە نووسینی ئیدمۆند ڕۆستاند بوو و شچپکینا- کوپرینك کردبووی بە ڕووسی. چیخۆف لە نامەیەکیا

(٩/ك١٨٩٦/٢) بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "هەموو ڕۆژێ سەری ماڵی پۆتاپنکۆ دەدەم، زۆر دڵی بە ژیان خۆشە، شادی لێ هەڵدەقوڵێ، ژنەکەشی وایە"

چیخۆف لە ئوتێلی، (د/ئانگلتر) هەواری خستبوو. وەختێ خۆی بە دیدەنی دۆستان و چوونە ئێوارەخوانی ئەدەبی بەسەر دەبرد. قەرەباڵغی و جەنجاڵی پایتەختی پێخۆش بوو، زۆری کەیف لێبوو، ماوەیەکی دیکەش لەوێندەر بەسەر ببات، بەڵام ناچار بوو دەبوا بۆ میلیکۆڤۆ بگەڕێتەوە، تا بەشداری زەماوەندی میخائیلی برای لە ٢٢/ك١٨٩٦/٢دا دەگەڵ "شیرینە ژنێکی دەستکراوەدا، کە کابانێکی لێهاتووش بوو" بکات.

دوای تەواو بوونی ڕێورەسمی شایی و زەماوەندەکە بە پەلە بۆ پترسبۆرگ گەڕایەوە. لەوێ لە ٢٧/ك١٨٩٦/٢دا، لە ئاهەنگێکی دەمامکبازی ڕەقس و سەمادا، کە لە شانۆکەی سوڤۆرین دا، ساز دەکرێت، بەشداری دەکات. لیدیا ئەڤیلوڤاش لە ئاهەنگەکەدا دەبێت و بە دیزداشەیەکی سەراپا ڕەش و دەمامکێکی قەدیفەی ڕەشەوە، خۆی لێدەگۆڕێت و لێی دەچێتە پێشەوە. وەکو ئەڤیلوڤا پاشان نووسیوویەتی، ئەو لە چیخۆف چووەتە پێشەوە و باسی دڵداری و ئەڤینی لەگەڵدا کردووەتەوە. هەرچەندە پێدەچێ چیخۆف لیدیا ئەڤیلوڤای ناسیبێتەوە، بەڵام خۆی لە گێلی داوە و وای نواندووە کە بە ژنێکی دیکەی زانیوە. کاتێ ئەڤیلوڤا لێی پرسیوە ئایا دیارییەکەی ئەوی پێگەییوە، چیخۆف، بە شێوازێکی گۆنگ وەڵامی داوەتەوە کە وەڵامی ئەو پرسیارەی لە شانۆنامەی (نەورەس)دا کە بەو زووانە لە یەکێك لە شانۆکانی، پایتەختدا پێشکەش دەکرێ، دەست دەکەوێت.

چیخۆف، کە لە سان پترسبۆرگ گەڕایەوە، لەسەر ڕێگاوە لە مۆسکۆ لایدا و دەگەڵ سوڤۆرین دا سەری تۆڵستۆی دا. سەیری کرد تۆڵستۆی زۆر لە شاعیرانی تازەی ڕووسی سەر بە قوتابخانەی سەمبولیزم پڕو تووڕەیە، بە "خوێری" ناو دەبردن. ژنەکەشی هەر تووڕە دیار بوو، بەڵام لە نیگارکێشی ئایینی "گای" تووڕەبوو.

بەڵام چیخۆف، کە بینی، دوان لە کیژانی ماڵەکە، بەوپەڕی هێمنی، لە گەرمەی ئەو هەرا و هەنگامە و تووڕەییەدا، خەریکی وەرەق بازی خۆیانن، زۆر ئاسوودە بوو.

چیخۆف، پاش ئەوەی کاتێکی باشی لە شار بردە سەر و ئیسراحەتی تەواوی کرد، گەڕایەوە بۆ گوند و، کەوتەوە کارکردن، کارەکانی هەر کاری ئەدەبی ڕووت نەبوون. هەرچەندە مۆڵکەکەی خۆیشی پێویستی بەوە بوو نۆژەن بکرێتەوە و دەستی پێدا بهێنرێ، بەڵام حەزی نەدەکرد تەنیا دەستکارییەکی ڕواڵەتی بکات. بۆیە دەگەڵ حکومەتی ناوچەییدا، لە کێشماکێشی ئەوەدابوو کە ڕێگاوبانەکان چاك بکرێنەوە، نووسینگەیەکی پۆستە و تەلەگراف بکرێتەوە. پردێکی تازە دروست بکرێ، کڵێسای گوندەکەی دراوسێیان نۆژەن بکرێتەوە. بینای قوتابخانە تازەکەی تالیژ تەواو بکرێت و ئەم پرۆژەیەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو. هەرچەندە بە مەبەستی پارە کۆکردنەوە بۆ ئەو پرۆژەیە، زۆرجار کۆنسێرتی مۆزیك و گۆرانی سازدا بوو، شانۆنامەی ناپیشەیی پێشکەش کردبوو، پارە و پولی کۆکردبووەوە، زۆرجاریش ناچاردەبوو لە گیرفانی خۆی بۆ ئەم پرۆژەیە خەرج بکات. چیخۆف، بە خۆی نەخشە و دیزاینەکانی دانابوو، کەرەستەی پێویستی بۆ کڕی

بوو و سەرپەرشتی دارتاشان و بە ناو وەستایانی دەکرد. لە ئابی ١٨٩٦ بینای قوتابخانەکە تەواو بوو. لە ڕۆژی کردنەوەکەیدا سێ کەشیش دیوارەکانیان تەبەڕۆك دا، جووتیاران، ئیکۆنەیەك و دوو خوێدانی پڕ لە خوێ و ورتکە نانیان پێشەکەش بە چیخۆف کرد، نان و خوێ دوو ڕەمزی ئاسایی میوانپەروەرییە لە ڕووسیا.

باوەڕی وابوو بە دروستکردنی قوتابخانان، کردنەوەی کتێبخانان و دەرمانکردنی جووتیارانی نەخۆش، پتر خزمەتی خاك و خەڵکی وڵاتی خۆی دەکات، تا ڕەخنە لە هەر کار و هەڵوێستێکی تزاری تازە، نیکۆلای دووەم بگرێت، کە سەرباری ئەوەی گەنج بوو، پێنەدەچوو، ڕێڕەوێکی سیاسی لیبراڵتر لە ئەلکساندەری سێیەمی بابی، بگرێتەبەر. وێڕای ئەوەش چیخۆف کە لە حوزەیرانی ١٨٩٦ لە مۆسکۆ دەبێت، دەچێتە سەردانی گۆڕستانی قوربانیانی خودینکا،ئەم سەردانەی لە یاداشتنامەکەی خۆیدا، کە تازە دەستی پێکردبوو تۆمار کردووە.قوربانیانی خودینکا، پتر لە هەزار کەس بوون، کە بە هۆی بێ سەروبەری و خەمساردی هێزی پۆلیسەوە، لە کاتی ئاهەنگی تاجگوزاری دا، کەوتبوونە ژێر دەست و پێیان و مردبوون. کە خەڵکی ئەو نیسبەت و بەڵایەیان، بە نیشانەی نەحسی و شوومی تزار و هاوسەرەکەی دەزانی، کە هەڵبەتە چیخۆڤ سکولاریست، باوەڕی بەو جۆرە ئەفسانە و خورافاتانە نەبوو.

دوای ئەوەی چیرۆکێکی کورتی بە ناونیشانی "خانووە شێروانیدارەکە" دا بە ڕۆژنامەی "هزری ڕووسی"، هەنگێ یەکسەر دەستی بە نووسینی چیرۆکێکی درێژ بە ناونیشانی "ژیانم" کرد. لەم چیرۆکەدا یادگاریانی منداڵیەتی گەنجێکی تاگانرۆگی دەگەڵ تەجروبە و ئەزموونی دروستکردنی قوتابخانەدا تێکەڵ دەکات. بەڵام چیرۆکەکە لە بنەڕەتدا، چیرۆکی یاخیبوونی کوڕێکە لە بابی کە کابرایەکی بورژوازی کورت بینە. کوڕەکە کە بە تەواوەتی لە پاشخانی کۆمەڵایەتی خۆی، کە ڕقی لێیەتی، دابڕاوە، دەیەوێ ببێ بە کرێکار یان بۆیاخچی خانووبەرە. هەرچەندە زوو بۆی دەردەکەوێت، وێڕای هەمووو هەوڵ و تەقەلایەکی، وا زوو بە زوو و بە ئاسانی لەناو عەوامی خەڵکی و ڕەمەکی مەردمدا قەبووڵ ناکرێ، بەڵام ئەم ناکامییەی پێ باشترە لەو بەناو سەرکەوتنەی کە دۆستانی کۆنی ئەو، کوڕانی چینە دەوڵەمەندەکان بە دەستیان هێناوە. ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری (نوڤا)دا بڵاوبووەوە، لە ناوەندە ئەدەبییەکاندا وا ڕاڤە و شرۆڤە کرا کە دژایەتی تۆڵستۆیزمە. هەڵبەتە چیخۆف، هیچ چارەسەرێکی ئامادە ناخاتە ڕوو، دووپاتی دەکاتەوە کە تێکەڵاوی دەگەڵ جەماوەری ڕەش و ڕووتی خەڵکیدا، ناکاتە چارەسەری ئایدیالی و نموونەیی دەرد و نەخۆشییەکانی ژیانی لادێ.

هەر بە گوێرەی ڕێبازە گومانداریيەکەی، نایەوێ هیچ کۆتاییەکی فەلسەفی بەو حیکایەتە ببەخشێت کە گێڕاویەتییەوە. تەنیا ڕووداوەکانی خستووەتەڕوو، و ئازادی تەواوی بە قارەمانەکانی داوە، کە لە میانەی هەزار و یەك ڕەنج و عەزابەوە، بگەنە حەقیقەتێك کە سوکنایيان پێ ببەخشێت.

چیخۆف، لە شانۆنامەی (نەورەس)یشدا سەبارەت بە کاراکتەرەکانی، هەمان بابەتگەرایی ڕەچاوکردبوو. شانۆنامەی ناڤبری درایە دەزگای سانسۆر، بەڵام لەبەر ئەوەی دەترسا، هەندێ

پەرەگرافی هەستیار و سەرەکی لێ لاببرێ، پەنای وەبەر پۆتاپنکۆی دڵسۆز برد کە لە دەزگای سانسۆردا، پەیگیری بۆ بکات. بەڵام لە ١٨٩٦/٨/٢٠دا، پاش سووکە دەستکارییەکی کەم، دەقی شانۆنامەکە، لە سانسۆر دەرچوو.

لە ١٨٩٦/٩/٨دا، لە کاتێکا چیخۆف، چەند ڕۆژێك بوو، چوو بووە فیدوسیا، بۆ لای سوڤۆرین، بروسکەیەکی لە پۆتاپنکۆوە پێگەیشت، کە شانۆنامەکە، لەلایەن شانۆی ئەلکساندرینسکی پترسبۆرگەوە پەسەند کراوە و ئەکتەرانی زۆر ناودار بەشداری لە نمایشکرنیدا دەکەن، لە ١٧/ت١٨٩٦/١دا پرۆڤەی یەکەم دەکرێت.

چیخۆف، زۆری دڵ بەم یەکەمین سەرکەوتنە خۆش بوو، و جورئەتێکی زۆری پەیدا کرد، بەڵام وێڕای ئەوەش نیگەرانی ئەوەبوو کە ئاخۆ ڕاوبۆچوونی جەماوەری تەماشاڤانان دەربارەی شانۆنامەکە چی و چۆن دەبێت. تەنانەت ئەوانەش کە ستایشی کۆپلە شیعرەکانی ناو دەقەکەیان دەکرد، پێیان وابوو کە شانۆنامەیەکی زۆر وشك و ڕاوەستاوە. وەڵامی چیخۆف بۆ ئەوانە ئەوەبوو کە ویستوویەتی ژیان وەکو خۆی، بە هەموو ئەرێنی و نەرێنییەکییەوە، بە شادی و خەمناکییەوە، بە خۆشی و ناخۆشییەوە، بە بەرزی و نزمییەوە، بە جدیەت و بێهودەییەوە، بە هەموو ڕاز و ڕەمزەکانییەوە، وێنە بگرێت و پیشان بدات، بەڵام ئاخۆ زۆربەی خەڵکی لەو تەحەدا هونەرییە دەگەیشتن؟

چیخۆف لە ١٨٩٦/١٠/١٧دا بەرەو سان پترسبۆرگ ڕۆیی، هەرکە گەییە ئەوێندەر، خۆی بە ژوورە تاریکەکەی شانۆی ئەلکساندرینسکیدا کرد،لەوێ لێی دانیشت و کەوتە تەماشای پرۆڤەی شانۆنامەکەی. ئەوەی لەوێوە دەیبینی و گوێی لێی دەبوو، زۆری نیگەران دەکرد. ئەم نیگەرانییەشی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو، دڵی پێشبینی، پێشهاتێکی زۆر ناخۆشی دەکرد. شەوانە خەوی یەجگار ناخۆش و ترسناکی دەبینی. لە نامەیەکیا بۆ سیمینکوفیچ (ت١٨٩٦/١) کە لە میلیکوڤۆ، دراوسێی بوو، دەڵێت: "خەو دەبینم، لە خەوەکەما بە تۆبزی ژنێکم بەسەردا دەسەپێنن کە خۆشم ناوێ، لە ڕۆژنامە و بڵاڤۆکاندا جنێوم پێدەدەن". کاربوف بەڕێوەبەری شانۆکە و دەرهێنەری شانۆنامەکە، لە وردەکارییەکانی شانۆنامەکە نەگەییوە. ئەکتەرەکان، کە کاربۆف نەیدەتوانی بە باشی بەڕێوەیان بەرێ، بە پێچەوانەی حەزی نووسەرەوە، هەر هات و هاواریان بوو. چیخۆف، زۆرجار ڕایدەگرتن و تکای لێدەکردن کە ئاسایی بن: "برادەرینە، پێویستە ئاسایی بن، ئەم هات و هاوارە سوودی نییە، دەبێ زۆر ئاسایی بن، چونکە کاراکتەرەکان خەڵکی سادەن، خەڵکی ئاساییێن". بەڵام ئەکتەرەکان سەرنجەکانی ئەویان بە هەند نەدەگرت و دەیانگوت ئەوان ئیشی خۆیان باشتر دەزانن، ئیدی درێژەیان بە هات و هاواری خۆ دەدا، چیخۆف جارێك کە لە دوای یەکێك لە پرۆڤەکان، شانۆکە بەجێدێڵێ بە دزییەوە بە پۆتاپنکۆ دەڵێت: "ئەم کارە هیچی لێدەرناچێت. پیاو بێزار دەکات،بێ ڕەنگ و بۆیە. سەرنجی کەس ڕاناکێشێت، ئەکتەرەکان، بە زەوقەوە دەورەکانیان نابینن، ئەمە دەکاتە ئەوەی کە تەماشاڤانانیش، زەوقیان نەبێت". هەروەها لە نامەیەکیا (١٢/ت١٨٩٦/١)دا بۆ ماری، دەڵێت: "سان پترسبۆرگ ناخۆشە... خەڵکەکەی بێزارن، سپڵەن، درۆزنن. دنیا دەمێ هەتاوە، دەمێ تەم.

شـانۆنامەکە تـاپێش نۆڤەمبـەر پێشـکەش ناکرێـت. پێمۆایـە نمایشـەکەی زۆر بـە بێـدەنگی و خـەمناکی تێدەپـەڕێ. مجێـزم، بـە شـێوەیەکی گشـتی لـە خـوار مامناوەندییەوەیـە". و داوا لـە خوشکەکەی دەکات کە بۆ نمایشی یەکەم بۆ پترسبۆرگ نەیەت.

سوڤۆرین، کـە چیخۆف میوانی ئـەو دەبێـت، لـە یاداشـتەکانی خۆیـدا دەنووسێت، میوانەکـەی دیسان کەوتووەتە خوێن هەڵهێنان.

لە ١٢/ت١/١٨٩٦دا، واتـە پێنج ڕۆژ بـەر لـە کردنـەوەی شـانۆنامەکە، ماریـا سـاڤینا، کـە دەوری سەرەکی پێ درابوو، لە پڕێکا بڕیاری دا کە دەوری (نینا) دەگەڵ ئەودا ناگونجێت و دەبێ بۆ خـانمێکی دیکـە بگـەڕێن کـە ئـەو دوره بـدینێ. ئـەوەبوو لـە گەرمـەی ئـەم هـەرا و هەنگامەیـەدا ئەکگتـەری گـەنج، خـاتوو ڤێرکومیسـار جفسـکایا، قاییـل بـوو کـە دەوری نینـا بـدینێ. ئیـدی ئـەم خانمە کـە ئافرەتێکی وردیلـە، چاوڕەشـی چاوگەش، سـەر و سیما منداڵانـە، دەنـگ خـۆش بـوو، تـوانی زۆر ڕاسـتگۆیانە کەسـایەتی نینـا بەرجەسـتە بکـات و بگـرە هـەموو ئەنـدامانی تیپەکـەی هەژاند و سەرسام کرد.

پۆتاپنکۆ، کە دەورەکەی ئەم خانمەی زۆر بە دڵ بوو، دەڵێت: "وەکو تیشکی هـەتاو ڕووناکی بـە شـانۆکە دەبەخشـێت". چـیخۆفیش لـە نامەیـەکیا بـۆ میخائیـل (١٥/ت١/١٨٩٦) دەڵێـت: "کومیسار چڤسکایا بە ڕاستی حەشر دەکات".

لـێ مخـابن، ئەکتـەرەکان بـۆ ڕۆژی دوایـی گەڕانـەوە سـەر سسـتی و بـێ موبالاتیەکـەی خۆیـان. چیخۆف پاش ئەوەی ئومێدی بەوە نەما کە بتـوانێ، بیـان هێنێتـە سـەر ڕێگـا، پێشـنیازی ئـەوەی کرد کە شانۆنامەکە بپێچنەوە و پێشکەشی نەکەن. بەڵام پاش ئەوەی تێیان گەیاند کـە ئـەم کـارە سەریەشـەی زۆری لێدەکەوێتـەوە، لـە پێشـنیازەکەی خـۆی ژێـوان بـووەوە. چـیخۆف بـەیانی ١٧/١٠/١٨٩٦، کە ڕۆژی یەکەمی پێشکەشکردنی شانۆنامەکە بوو، چوو بۆ وێستگەی قیتـار بـە دوای ماریای خوشکیا. ماریا دەگەڵ لایکادا بە قیتاری شەو هاتبوون.

چیخۆف، نەخۆش و ماندوو دیار بوو، بە ڕاستی کۆکە گیانەسـەری کردبوو. بە ماریـای گـوت: "ئەکتـەرەکان هیچیان تیا بەسـەر نییـە. گـوێ نـاگرن، دەورەکـەی خۆیـان نـازانن، تـەنیا کومیسـار جڤسـکایایان تیایـە. ئـەم شـانۆنامەیە سـەرکەوتوو نـابێ، تـۆ بـە خـۆڕایی هاتوویـت! پێویسـتی نەدەکرد بێی!".

(نەورەس) کۆمەڵێك کاراکتەری تیایە، لە مەزرا و مۆڵکێکی کـەنار دەریاچـەیەك کۆبوونـەتـەوە و گەنگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە چـۆن لـە ژیـانی ڕۆتینی خۆیـان ڕزگـار بـبن. یـەکێك لـە کاراکتـەرەکان خانمێکی ئەکتەر بە ناوی ئارکادینا، ئەم ژنە خەمی پیربوونییەتی و لە پیری دەترسێت. سورینی برای بە تەمای شتی زیاترە لە ژیان. تریگورینی نووسەر، کە ناوبانگێکی هەیە، دەیەوێ جگـە لـە دنیـای نووسـین، بوارەکـانی دیکـەی ژیـانیش تـاقی بکاتـەوە. بـرادەرە گەنجەکـەی، بریبلیـف، نووسەری تازەکار، تەماحی ئەوەی هەیە، فۆرمێکی تازەی هونەری دابهێنێ و بیسەپێنێ. نینـای تـازە هەڵچـوو، ناسـك و جـوان، خـەون بـەوەوە دەبـینێ کـە ببێـت بـە ئەکتـەرێکی گـەورە و: "ناوبانگێکی ڕاستەقینە و گەورە" بە دەست بێنێ. ئارەزووی شۆرەت و ناوبانگ بە جۆرێ لـە دڵ

و دەروونیـا کڵێـە دەسـەنێ، کـە ئەشـقی ڕاسـتگۆیانە و پـاکی تریبلیـف ڕەتدەکاتـەوە، تـا لـە تریگۆرینی بەناڤودەنگ نزیك ببێتەوە، بەو خەیاڵەی تریگورین دەتوانێ ڕێگەی بۆ خۆش بکات کە بگاتە ئاواتەکەی کە شۆرەت و ناوبانگی ڕاستەقینەیە. ئیدی تریبلیف، نووسەری گەنج، تووشی نائومێدی دەبێت و هەوڵ دەدات خۆی بکوژێت، بەڵام هەوڵەکەی سەرناگرێت. ئیدی نینا ڕەدووی تریگـۆرین دەکـەوێ و بـۆ مۆسـکۆ دەڕوات. دوای دوو سـاڵ و لـە دوا پـەردەدا، کاراکتـەرەکان یـەك لـە دوای یـەك دان بـەوەدا دەنـێن کـە هـەموو خـەون و خەیاڵـەکانیان، لەسـەر تاوێری ژیانی ڕۆژانەدا، هەڵوەرین. سورین کە ترسی ئەوەی هەبوو "وەکو کۆنە دار جگەرەکی کۆنی بۆگەن لە سووچێکدا بکەوێ" حاڵی حازر کەسێکی نائومێد و گۆج و ئیفلیج بوو. ماشا کە لـە دڵـی خۆیـدا تریبلیفی خۆش دەویست، شـوو بـە مامۆسـتایەکی گومنـاو دەکـات و بۆ ئـەوەی خەمەکانی خۆی لە بیر بکات، خوو دەداتە خواردنەوە. تریگۆرین، لە جاران پتر، نقومی کارە ئەدەبیە تەقلیدییەکانی خۆی بووە و لەو ڕووەوە هەست بە نائومێدی دەکات. بەڵام نینا، کە نەك هەر تریگۆرین، بەڵکو منداڵەکەشی لە تریگۆرینـە، لـە دەسـت دەدات، کە لـە بواری شانۆدا هیچ سەرکەوتنێك بە دەست ناهێنێ، هەنووکە دەگەڵ تیپێکی شانۆیی چکۆڵەی گەڕۆکدا کاردەکات. ئەو شەقامە ڕێگایەی خەونی پێوە دەبینی. بوو بە باریکە ڕێگار و وێڕای ئەوەش دانی بە ناکامی خۆیدا نەدەنا. کە تریبلیف جارێکی دی دەیبینێتـەوە، بۆی دووپات دەکاتـەوە کە هێشتا هـەر خۆشـی دەوێ، بـەڵام دیسـان ڕەفـزی دەکاتـەوە، ئـەویش لـە داخـا پـەنا وەبـەر خۆکـوژی دەبـات و ئەمجارە خۆی دەکوژێت.

سەراپای شانۆنامەکە، بێهودەیی و پوچی ژیـانی بەشـەر بەرجەسـتە دەکات، بـە ڕای نووسـەر، هیچ پڕۆژە و بەرنامەیەکی گەورە نییە، درەنگ یـان زوو شکسـت نەیـەنێ. بۆیـە هێـز و توانایـەکی نائاسایی پێویستە، بۆ ئەوەی پردێك لەسەر ئەو بۆشاییە دروست بکات کە خەیاڵ لە واقیع جیا دەکاتـەوە. لـە پـەردەی چوارەمدا سورینی پیرەمێرد چیرۆکێك بۆ تریبلیف پێشنیاز دەکات. بـە ناونیشانی "ئەو پیاوەی دەیویست" پیاوەکە دەڵێت: "جاران کـە گـەنج بـووم، دەمویسـت ببم بـە نووسەر، کە نەبووم بە نووسەر.. دەمویست ژن بێنم کە نەم هێنا. دەمویست لە شارا بژیم، کەچی ئەوەتا لە لادێدا ژیان بەسەر دەبەم".

دیارە ئەم دەستەواژەیە، زۆر باشتر لە دیمەنی نەورەسەکە کە بە دەسـتی ڕاوچییەکی بـێ بـەزەیی دەکوژرێ، پوختـە و کاکڵـەی نێوەڕۆکی شـانۆنامەکە دەنوێنێ. (چیخۆف، لێرەدا بـە شـێوەیەکی هونـەری دیمـەنی ئـەو سوێسـکەیەی کـە لیڤیتـان کـاتی خـۆی برینـداری کـرد و چـیخۆف ناچـار کوشتی، دووبارە دەکاتەوە).

هـەر هـەموو ئـەو کاراکتەرانـەی کـە لـەم هامـاج و ئۆتمۆسـفیرە تەماویـەدا دەژیـن، لـە خـاڵێکی هاوبەشدا یەك دەگرنەوە کە ئـەویش ترسـی شکسـت و ناکـامی سایکۆلۆژییە، لـە هـەردوو بـواری ئاشقێنی و هونەردا. خەون بە ئارەزووەکانیانـەوە دەبیـنن، باسـی دەکـەن، بەڵام دەگـەڵیا نـاژین و پێی ناگەن. سەبارەت بە هەردوو کاراکتەری نووسەر، تریگۆرین و تریبلیـف، چیخۆف بەشێك لـە مـۆرکی نیگـەرانی داهێنەرانـەی خـۆی، پـێ بەخشـیون. بـۆ نموونـە تریگـۆرینی بـەناڤ و دەنـگ

لەجیاتی ئەوەی دڵی بە شۆرەت و سەرکەوتنەکانی خۆش بێ، نووسین و کاری نووسین، بە کارێکی ڕۆتینی پڕ عەزاب دەزانیّ و وەکو ئەوەیە پیری بەرۆکت بگرێت و بە ناچاری تەحەمولی دەردی پیری بکەیت.

چیخۆف بە زمانی تریگۆرینەوە و بە کەسەرێکی ئاشکرا و ڕاستگۆیانەوە دەڵێت: "چ ژیانێکی بێهودە و بێ مانایە!... کە دەڕوانمە ئاسمان و ئەو هەورە دەبینم کە لە شێوەی پیانۆیەکی گەورەدا تێدەپەڕێ، لە دڵی خۆدا دەڵێم، دەبێ لە چیرۆکێکمدا لە شوێنێکی چیرۆکێکمدا، جێگایەك بۆ ئەم هەورە بکەمەوە، کە لە پیانۆیەکی کلکدار دەچێت. هەر وشەیەك، هەر ڕستەیەك لە دەمی ئێوە دەردەچێت، یان بە خەیاڵی خۆمدا دێت، لە گەنجینەی ئەدەبی خۆمدا هەڵی دەگرم، لەوەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە کەڵکم بێت.. هەمیشە ئەمە حاڵمە. یەك تۆزقاڵ ئیسراحەت بە خۆ نادەم، هەست دەکەم ژیانی خۆم دەخۆم... بەڵێ، لە کاتی نووسیندا دڵم خۆشە.. کە ڕەشنووسی نووسینەکانم دەخوێنمەوە ئاسوودە دەبم، بەڵام... هەرکە نووسینەکەم بڵاوبووەوە، ئیدی لەبەرچاوم دەکەوێ، هەست دەکەم ئەوە نییە کە من دەمویست، هەر هەمووی هەڵەیە، نەدەبوو بینووسم، ئیدی خەم دامدەگرێت و لە خۆم بێزار دەبم. ئەمە جگە لەوەی کە جەماوەری خەڵك دەیخوێننەوە، بە کەیفی خۆ دەڵێن: "بەڵێ، جوانە، ناسکە، دڵگیرە، کارێکی هونەرمەندانەیە، بەڵام هاوتای تۆڵستۆی ناکاتەوە، تامی تۆڵستۆی نادات". یان دەڵێن: "کارێکی زۆر باشە، بەڵام ناگات بە باوکان و کوڕانی تورگینیف". ئیدی ئەم قەوانە "جوانە، هونەمەندانەیە، دڵگیرە" تا ئەو ڕۆژەی دەمرم لێدەدرێتەوە. کە مردیشم، وەختێ ئاشنایانم بەلای گۆڕەکەما تێدەپەڕن، دەڵێن: "ئەمە گۆڕی تریگورینە، نووسەرێکی باش بوو، بەڵام لە ئاستی تورگینیفدا نەبوو".

بەڵام تربیلیف، کە وێنەیەکی دیکەی خودی چیخۆفە، گلەیی لە تریگورین، کە لەو بەتەمەنترە و نەوەی پێش ئەوە، دەکات کە پابەندی ڕێبازی ڕیالیستی کۆن و لە باوکەوتەیە. لە کاتێکا هونەر دەبێ لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە تازە ببێتەوە و بگۆڕێت، کەچی خۆی هەچەندە خەو بە شوڕشێکی ئەدەبییەوە دەبینێ، ئەنجام بە ناچاری دان بەوەدا دەنێ، وێڕای هەموو هەوڵێکی یاخیانەی خۆی، نەیتوانی لە کۆت و بەندی ئەو سوونەت و تەقلیدە، ڕزگار بێت، کە لە بنەڕەتدا ڕەفزی دەکرد. بۆیە لە شەوی خۆکوشتنەکەیدا بە داخ و کەسەرەوە دەڵێت: "زۆرم باسی تازە و تازەگەری کرد، باسی فۆرم و شێوەی مۆدێرن کرد، کەچی بە خۆیشم خەریکە دەخزێمە دنیای شێوازی تەقلیدی و قەراردادییەوە... سەرمامە، لە تۆ وایە لەژێر زەمینێکی ساردا دەژیم. هەرچییەك دەنووسم، وشك، مردوو، بێتام و لەزەتە، تاریك، تروسکەی تیا نییە. بێهودە لە جێی خۆمم بە دەوری خۆما دەخولێمەوە، لە گێژاوی خەون و خەیاڵاتا دەسوڕێمەوە، باوەڕم بە هیچ نییە، ئاستی بەهرەی خۆم نازانم، نازانم کار و پیشەم چییە". دەشیا ئەو دێڕانە لە نامەیەکی چیخۆفەوە بۆ سوڤورین وەبگیرێت. هەڵبەتە ئەمە ڕەنگدانەوەی دڵساردی و نائومێدیەکی درێژخایەنە.

ئەم دڵساردی و نائومێدیە، چەند سەعاتێك بەر لە یەکەم نواندنی (نەورەس) گەییە ئاستێکی ئەوتۆ، کە چیخۆف دوو دڵ بوو لەوەی بچێت بۆ شانۆکە یان نا. هەڵبەتە نواندن و نمایشی ئەو

شەوە، بۆ سوود و قازانجیی ئەکتەری کۆمیدی زۆر بەناوبانگ و خۆشەویستی جەماوەر، خاتوو یەلیزاڤێتالڤیکیابوو. (لە ڕووسیادا، بە گوێرەی ڕیوڕەسم و داب و نەریتی شانۆیی، وا باو بوو کە نواندنی یەکەمی هەر شانۆنامەیەك، لە سەر شانۆ بۆ قازانج و سوودی ئەکتەرێکی بە ناوبانگ بێت. زۆرجار لە هەمان شەودا، دوو شانۆنامە پێشکەش دەکران، ئەوەبوو لە شەوی ١٨٩٦/١٠/١٧دا، نەورەس و شانۆنامەیەکی دیکەش پێشکەش کران). قەرار بوو لڤیکیڤا، لە شانۆنامەکەی دوای نەورەس دا، کە شانۆنامەیەکی سێ پەردەیی کۆمیدی بوو، دەور ببینێ. زۆربەی تەماشاڤانان بۆ دیتنی ئەو هاتبوون. بە کورتیەکەی بۆ پێکەنین هاتبوون. بۆیە وەختێ پەردە لەسەر کاراکتەرە خەواڵو و سارد و سڕەکانی شانۆنامەکەی چیخۆف لابرا، تەماشاڤانان، واقیان وڕما، هەر حەپەسان. چونکە بۆ پێکەنین هاتبوون، نەك بۆ ئەم قەساسە.

کاتێ کە ڤێراکومیسار جیڤسکایا، لە دەوری نینادا، کەوتە مەنەلۆگ: "جەماوەری خەڵکی، شێر وشەپالان، هەڵو و داڵان، کەڵەکێویانی شاخدار، قاز و قولنگان، جاڵجاڵۆکان، زندەوەران و ماسیانی بێدەنگی قوڵایی دەریا و ئاوان". هەرکە لە مەنەلۆگەکەی بووەوە، دوای سووکە پێکەنینێکی کەم، هورا و فیکە کێشان دەستی پێکرد. لە کۆتایی پەردەی یەکەمدا، دوای چەپڵە لێدانێکی کەم، دەمڕێژی جنێوان دەستی پێکرد. لە هەوەڵی پەردەی دووەمدا هەرا و هەنگامەی تەماشاڤانان گوێی کەڕ دەکرد. خەڵکی لە خەمناکترین ساتی شانۆنامەکەدا، قاقا پێدەکەنین. یان پشتیان دەکردە شانۆکە و بۆ خۆیان قسەیان دەکرد. ئەکتەرەکان، پەشۆکابوون، دیالۆگەکانی خۆیان بیرچووبووەوە و لە خۆیانەوە، قسانیان دەکرد. ئەو نووسەر و ڕۆژنامەوانانەی کە لەوێ بوون، ئەم ناکامییەی هاوپیشەکەی خۆیان، کە نووسەرێکی بەناوبانگ بوو (چیخۆف)، پێخۆش بوو. لە بەینی خۆیاندا لە ناوبڕەکاندا گاڵتەیان پێدەکرد و تەشەریان لێدەدا: "سەمبولیزمی لەنگەیە!" و "باشە بۆچی خەریکی کورتە چیرۆکی خۆی نابێ؟" بە تێکڕایی دەنگ، ڕامان وابوو کە شانۆی ڕووسی هەرگیز ئەم جۆرە ناکامییەی بە خۆوە نەدیتبوو. چیخۆف لە کۆتایی پەردەی دووەمدا، نیگەران و هەراسان، هۆڵەکەی بەجێ هێشت و خۆی بە ژووی ئارایشتەکەی لیڤیکیڤادا کرد.

دوو پەردەکەی دیکەش نەك لە یەکەم و دووەم باشتر نەبوون، بەڵکو قوڕەکەیان هێندەی دیکە خەست کردەوە. هەرکە پەردە دادرایەوە جەماوەرەکە، لە توڕەییدا بەردیان بە با دەکرد. چیخۆف، هەر بە هەڵاتن لە هۆڵەکە هەڵات. بە ماتە مات و کڵاوی پاڵتۆکەی دابوو بە سەریا و هەڵات. لەو کاتەدا کە بەلەز بە نێو خەڵکەکەدا دەڕۆیی، گوێی لە پیاوێکی کورتە باڵا بوو کە بە تووڕەیی هاواری دەکرد: "من سەر لە کاری ئەم دەرهێنەرانە دەرناکەم. بە ڕاستی دەرهێنانی ئەمجۆرە شانۆنامانە سووکایەتییە". چیخۆف،خۆی بە خوارنگەی ڕۆمانوفدا کرد، بە تاقی تەنیا شیڤی خوارد، ئەوجا بە تاقی تەنیا بە نێو شەقامە بەفرگرتووەکانی سان پترسبۆرگ کەوت و هێندە سوڕایەوە تا شل و کوت بوو.

لەم کاتەدا، ماریای خوشکی و لایکا، کە ئەوانیش ڕەوشەکەیان زۆر پێناخۆش بوو، لە ئوتێل چاوەڕوانیان دەکرد، چونکە چیخۆف بەڵێنی دابوو، دوای نمایشەکە بچێت بۆلایان.. ئەم دوو

ئافرەتـە، بـە دەم چـاوەڕوانییەوە، سـات بـە سـات لـە دواکـەوتنی چـیخۆف نیگـەرانتر دەبـوون. ئەلکساندریان نارد تاقیب و سۆراخێکی ئەم پیاوە هەڵاتوە بکات، بەڵام دەست لە گونان شۆڕتر گەڕایەوە و ئەم چەند دێرە نووسینەی بۆ براکەی بەجێهێشت: "قەدری نەورەسەکەتم نەدەزانی، تا ئەمشەو لەسەر شانۆ دیتم: بەڕاستی شانۆنامەیە نەگاڵتە، یەجگار جوانە، لێوان لێوە لە شیکاری قووڵی دەروونی، شانۆنامەیەکە تا حەز بکەی دڵگیرە". شەو درەنگ بوو، سەعات گەییە یەکی شەو، چیخۆف هەر نەگەڕایەوە. ماریا بەو نیوە شەوە چوو بۆ ماڵی سوڤورین، کە لە ئەپارتمانێکی تایبەتی و سەربەخۆ، جێیان دابووە براکەی، لیّ ئانتۆن لەوێش نەبوو. بۆیە ماری، بە مێشکی ماندووەوە، ناچار بوو یان گویّ لە قسە هەلق و مەلەقەکانی هاوسەرەکەی سوڤورین، دەربارەی کۆمەڵ بگرێت یان گویّ لە سەرنجە بنجبڕەکانی سوڤورین بگرێت، دەربارەی چۆنیەتی دەسکاریکردنی شانۆنامەی نەورەس، تا بشێت و لەسەر شانۆ نمایش و پێشکەش بکرێت.

ئەنجام چیخۆف، لە سەعات دووی دوای نیوە شەو گەڕایەوە، بەڵام کاتیّ سوڤورین پێی ڕاگەیاند کە ماری لەوێیە، چیخۆف، بە بیانووی ئەوەی زۆر زۆر ماندووە، ئامادە نەبوو بیبینیّ. کە سوڤورین لێی دەپرسێت لە کویّ بوو، لەبن لێوانەوە و بە مینگە مینگ دەڵێت: "بە شەقاماندا دەسوڕامەوە، لێرەو لەویّ دادەنیشتم. هەرچیم دەکرد و دەکۆشا، نەمدەتوانی ئەم نمایشە فەرامۆش بکەم. تۆبە جارێکی دی خۆم لە قەرەی شانۆنامە بدەم، ئەگەر سەد ساڵیش بژیم، جارێکی دی شانۆنامە نانووسم، لەم بوارەدا هەر بەشم ناکامییە". (بڕوانە یاداشتە تایبەتییەکانی سوڤورین).

بۆ سبەینیّ، بە نیازی مۆسکۆ سواری قیتار بوو، بە تەمابوو لەوێوە بۆ میلیکۆڤۆ بڕوات، حواحافیزی لە کەس نەکرد، لە دۆست و لە دوژمن هەڵدەهات، دەگەڵ ئەوەشدا، چەند دێڕێکی بۆ ماری نووسی: "ڕووداوەکانی دوێنێم پیّ سەیر نەبوو، پەستی نەکردووم، چونکە لە کاتی پرۆڤەکەدا پێشبینی ئەمەم کردبوو، هەست ناکەم حاڵم زۆر خراپ بیّ".

هەروەها چەند دێڕێکی بۆ میخائیلیش نووسی کە: "شانۆنامەکە زۆر خراپ کەوتەوە، حەیا چوون بوو. ئەکتەرەکان هەموو گێل و گەمژە بوون، بە ڕاستی پیاو قێزی لێدەکردنەوە. چار هەر ئەوەیە تۆبە بکەم و جارێکی دی خۆم لە قەرەی نووسینی شانۆنامە نەدەم". ئەم چەند دێڕەشی بۆ سوڤورین نووسی کە: "هەرگیز دویّ شەوم لە بیر ناچێت، بەڵام وێڕای ئەوەش زۆر باش خەوتم. ئێستا بە مجێزێکی باشەوە سەفەر دەکەم. لە ئێستا بە دواوە نە شانۆنامە دەنووسم و نە شانۆنامە دەدەمە هیچ تیپێك بۆ دەرهێنان و نواندن". (بڕوانە نامەی ١٨/١٠/١٨٩٦) هەروەها داوای لە سوڤورین کرد، بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە ڕابگرێت کە قەرار بوو (نەورەس) یشی لەگەڵ بێت.

پۆتاپنکۆ، تا وێستگە بەڕێی کرد. بە دەم چاوەڕوانی هاتنی قیتارەوە، بە تۆبزی چەند نوکتەیەکی گوت. نەوێرا ڕۆژنامە بکڕێت، نەبا ڕەخنەیەکی توندیان لەسەر بڵاو کردبێتەوە. پۆتاپنکۆ پاشان لەو بارەیەوە دەڵێت: "داخ و کەسەر بە چاوانییەوە دیاربوو". چیخۆف، بە

ڕادەیەك پەست و غەمگینی ئەو ڕووداوە ناخۆشە بوو کە جانتاکەی لە قیتارەکەدا لەبیرچووبوو، ئیدارەی قیتارەکە بۆ سبەینێ بۆیان ناردبووەوە.

لە کۆتایی ئەو نامەیەدا کە بۆ ماریای خوشکی نووسی بوو، ئەم ڕستەیەشی زیادکردبوو: "کە هاتیتەوە بۆ میلیکۆڤۆ، لایکاش لەگەڵ خۆتا بێنە". ماریا ئەو پێشنیازەی زۆر پێخۆش بوو، چونکە لێبڕابوو، بەبێ ئەو پێشنیازەش لایکا لەگەڵ خۆیدا بباتەوە. ئەوەبوو بە دوو قۆڵی گەڕانەوە بۆ گوند، ئامادەبوون وەکو دوو پەرستار، سەرپەرشتی و خزمەتی نەخۆشێك بکەن، کە لە باری دەروونییەوە، زۆر نەخۆش بوو. چیخۆف یەکسەر و بە ڕاشکاوی پێی گوتن: "باسی ئەو نمایشە نەکەن". بۆیە تەنیا لە بەینی خۆیانا، بە دوو قۆڵی باسیان دەکرد.

لەوەبوو لایکا، ئەم نەورەسە ڕاستەقینەیە، بە دیتنی گواستنەوەی ئەزموونی خەمناکی خۆی دەگەڵ پۆتاپنکۆدا، زویر ببێت، تووشی شۆك ببێت، بەڵام کەسایەتی لایکا، لەم شانۆنامەیەدا هێندە بە گەورەیی و جوانی وێنەگیرابوو، کە کاری لە خۆیشی کرد، یانی کرابوو بە تابلۆیەکی جوان، هەموو حەقارەتێکی پەیوەندییەکانی دەگەڵ نووسەردا لابرابوو، ئەوەی مابووەوە، وێنەی ئافەریدەیەکی، هەستیار، بریندار، بەویقار و ژیاندۆست بوو. لایکا چەند هەفتەیەك دوای نمایشەکە، نامەیەك بۆ چیخۆف دەنێرێت کە: "بەڵێ، لێرە، هەمووان دەڵێن، گوایە نەورەس لە ژیانی منەوە هەڵێنجراوە، گوایە تۆ کەسێکی تایبەتیت ڕاکێشاوەتە پای تەحقیق و لێکۆڵینەوە".

ژنێکی دیکەش، لیدیا ئەڤیلوڤا، بە تاسەوە، لە شەوی یەکەمی نمایشەکەدا، پەیگیری ڕووداوەکانی شانۆنامەکەی دەکرد. ئەوەی لە بیر نەچووبوو، کە نۆ مانگ لەوەپێش، لە ئاهەنگە دەمامکبازییەکەدا، چیخۆف، بەڵێنی دابۆیە، کە لە شانۆنامەی نەورەس دا، بۆی دەردەکەوێت، کە دیارییەکەی ئەمی (لیدیا ئەڤیلوڤا) پێگەییوە یان نا. ئایا لە ئاهەنگی دەمامکبازییەکەدا لیدیا ئەڤیلوڤای ناسیوەتەوە یان نا. ئیدی دیالۆگ لە دوای دیالۆگ تێدەپەڕێت و هیچ وەڵامێکی ئەو پرسیارە دەرناکەوێت کە ئەم ژنەی ئازار دەدا. ئەنجام لە پەردەی سێیەمدا، لیدیا ئەڤیلوڤا، نینا دەبینێ کە میدالێك بە تریگورین پێشکەش دەکات، کە هەوەڵێن پیتەکانی ناوی نووسەر لە دیوێکی نەخشێنراوە و، ناونیشانی یەکێك لە کتێبەکانی و ئاماژە بۆ لاپەڕە ۱۲۱ و هەردوو دێڕی ۱۱ و ۱۲، لە دیوەکەی تری نەخشێنراوە. بەڵام ئەم ژمارانە، دەگەڵ ئەو ژمارانەدا تێکیان نەدەکردەوە، کە لیدیا ئەڤیلوڤا، ڕای سپیار بوو لە سەر دیاریەکەی خۆی بۆ چیخۆف، بنەخشێنرێن. لیدیا بەم دیمەنە زۆر پەست بوو، چیتر پەیگیری ڕۆڵی ئەکتەرەکانی نەکرد، تەنیا بیری لەو خەمە تایبەتییەی خۆی دەکردەوە. کە بە پەستی بۆ ماڵ گەڕایەوە، خوای نەمابوو، ئەقڵی بە هیچ کوێ ڕا نە دەگەیی، دەبوایە بە ناچاری چاوەڕوان بکات، تا مێردەکەی بخەوێ و هەنگێ بچێ لە کتێبەکانی چیخۆفدا بۆ ئەو ڕستەیە بگەڕێت. چونکە ئەو دێڕانەی لە شانۆنامەکەدا ئاماژەیان بۆ کرابوو، مانای دڵخوازی ئەویان نەدەگەیاند. بە نائومێدییەوە چووە ناو جێگا، خەوی لێنەکەوت. لەپڕ بڵاچەیەکی بە مێشکا هات کە دوور نییە ئەو دەستەواژەیەی لە یەکێك لە چیرۆکەکانی ئەمەوە، لە یەکێك لەو کۆ چیرۆکەوە، وەرگرتبێ، کە ناردبووی بۆ چیخۆف، تا بیخوێنێتەوە و ڕاوبۆچوونی خۆی لە سەر بدات! نوێنەکانی لەسەر خۆی لادا، بە لەز چوو

بەلای کتێبخانەکەوە، کتێبەکەی دەرهێنا، لاپەڕە سەد و بیست و یەکی کردەوە، هەردوو دێڕی یازدە و دوازدەی خوێندەوە: "چوونە ئاهەنگی دەمامکبازی بۆ ژنانی گەنج باش نییە". سەرەتا پەشۆکا، بەڵام دوای تۆزێك هێور بووەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: "پەی بە هەموو شتێك بردووە، هەموو شتێك دەزانیٚ!" هەڵبەتە مەسەلەکە لێرەدا، سەبارەت بە چیخۆف ڕەفز دەگەیەنیٚ، ڕەفز بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز. ئیدی عادەتی وابوو، ئەگەر ویستبای دەستپێشکەری دڵداریی، هەر ژنێك ڕەفز بکات، بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز و نەرم ڕەفزی دەکرد، ئیدی غروور چاوی لیدیا ئەڤیلۆڤای، لە حانای ئەو نیازە لۆژیکیەی چیخۆف نابینا کردبوو. دەنا چیخۆف ویستبووی بەو شێوەیە سنوورێك بۆ ئەو پەیوەندییە دابنێت و ئەو ژنە لە خۆی دووربخاتەوە. بۆیە ئەو میداڵەی هێندە بەلاوە بیٚ بایەخ بوو کە دوای ماوەیەك پیشکەش بە ڤێراکومیسار جفسکایای ئەکتەرە هەرە باشەکەی شانۆنامەی (نەورەس)ی کرد کە بەوپەڕی جوانی دەوری نینای دەبینی. ئەویش دەکەوێتە گومانی ئەوەوە بڵێی چیخۆف مەیلێکی ئاشقێنی بۆی هەبێت! بەڵام چیخۆف، بەڵێن بە لایکاش دەدات کە دیارییەکی لەو بابەتە، پێشکەش بەوش دەکات کە ئەم دەستەواژەیەی لەسەر نەخشێنرا بێت: "پێڕستی شانۆنامانی ئەندامانی کۆمەڵەی شانۆنامەنووسانی ڕووس، ١٨٩٠، ل٧٣، دێڕی یەکەم" کاتیٚ لایکا لە پێڕستەکەدا تەماشای لاپەڕەی ناوبراوی کرد، ناوی شانۆنامەیەکی هەزەلی بەرچاو کەوت، بە ناوینشانی "ئیگناشای گەوج، یا گەوجایەتییەکی چاوەڕوان نەکراو" کە ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ ئیگناتی پۆتاپنکۆ. دیارە ئەم ژنانە هەموویان، لایکا، لیدیا ئەڤیلوڤا و ڤێراکومیسار و چفسکایا، حەزیان دەکرد چیخۆف زۆر بە جدی ئاشقێنیان دەگەڵ بکات، بەڵام چیخۆف وانەبوو، بە بۆکردن و سووکە دەستبازی و جوانی و ڕۆحی سووکی ئافرەت تێر و ئاسوودە دەبوو وحەزی دەکرد ئافرەتان لەوە زیاتری لیٚ چاوەڕوان نەکەن.

ناکامی و شکستی "نەورەس" چیخۆڤ، هەم لە باری دەروونی و هەم لە باری جەستەییەوە تێك شکاند. هەرچی دەکرد، نەیدەتوانی ئەوە لە بیر خۆی بەرێتەوە، کە لە کاتی نمایشی شانۆنامەکەیدا، ئەو شانۆنامەیەی کە زۆری پێوە ماندوو بوو بوو، چۆن ئەو خەڵکە بەدەم قاقای تەوسامێزەوە کەوتنە هۆیها و فیکە کێشان. سوڤۆرین لە نامەیەکیا بە "ترسنۆکی" ناودەبات، چونکە دوای ناکامیەکە یەکسەر هۆڵەکەی بەجێهێشتووە و هەڵاتووە. کە چیخۆف لە نامەی بەرواری ١٨٩٦/١٠/٢٢دا بە توڕەیی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "ئەگەر ترسنۆك بام، بە هەڵەداوان دەچووم بۆ بارەگای ڕۆژنامەکان، بەلەز دەچووم بۆ لای ئەکتەرەکان و داوای لێبوردنم لێدەکردن، بە پەلەپڕوزیٚ هەندیٚ دەسکاری بیٚ مانای دەقەکەم دەکرد، دوو سیٚ هەفتەی دیکەش لە سان پترسبۆرگ دەمامەوە و دەچوومە تەماشای نمایشەکە، خەفەتم دەخوارد، ئارەقەی شەرمەزاریم دەکردەوە، گلەیی و سکاڵام دەکرد... کاتیٚ کە شەوی دوای نمایشەکە هاتیتە دیدەنیم، تۆ خۆت گوتت، باشترین کار ئەمەیە کە من لەویٚ بڕۆم، بۆ سبەی بەیانیش نامەیەکی خوداحافیزیت بۆ ناردبووم. ئاخر ئەم ڕەفتارە چ ترسنۆکییەکی تیایە.. من وەکو پیاوێك کە دەچێتە خوازبێنی و خوازگارییەکەی ڕەفز دەکریٚ، هیچ چارێکی نامێنیٚ جگە لەوەی بە ئاقڵی و

ئاغری لەوێندەر بڕوات، منیش هەمان ڕەفتارم کرد.. ڕاستە ئەو ڕەفزە غرووری برینندار کردم، بەڵام غافڵگیری نەکردم، چاوەڕوان و پێشبینی شکست و ناکامیم دەکرد، خۆیشم بۆ ئامادە کردبوو، ڕاستگۆیانە ئەمەم بە تۆش گوتبوو... لە ماڵەوە کەمێك ڕۆن گەرچەکم خوارد، بە ئاوی سارد خۆم شت و، حاڵی حازر ئامادەم دەست بە نووسینی شانۆنامەیەکی تازە بکەم".

ڕاستە جۆرە دلێری و بێ منەتییەك بە قسەکانییەوە دیاربوو، بەڵام لە جز و چڕنۆکی ڕەخنەگرانیش پەست بوو. هیچ کەسێك کەمترین ستایشی ئەم شانۆنامەی نەکرد، جگە لە ئاگادارییەك کە لە گۆڤاری سان پترسبۆرگدا لە ژێر پیتێن یەکەمی ناوی لیدیا ئەڤیلوڤادا، لەو بارەیەوە بڵاوبووبووە، تەنیا سوڤۆرین، لە ڕۆژگاری نوێدا وتارێکی بە قازانجی نەورەس بڵاوکردەوە، ئیدی تێکڕایی گۆڤار و بڵاڤۆکەکانی دی بێ مروەتانە و بە خۆشی و شادییەکی لەزەت ئامێزەوە کەوتنە ئاوەڕووت کردنی نەورەسەکە. یەکێك بە شانۆنامەیەکی "زۆر بێ مانا"ی لە قەڵەم دەدا، یەکێکی دی بە "گۆنگ و شاش و واشی" وەسف دەکرد، یەکێکی دی دەیگوت هەر پەردەیەکی بە کۆمەڵێك کاراکتەری نائومێد و بێزار و وەڕەز و درۆزن و هەرچی و پەرچی پڕکراوەتەوە. هەڵبەتە تۆڵستۆیش هەمان ڕاو بۆچوونی هەبووە وگوایە لای سوڤۆرین گوتوویەتی (نەورەس) لاسایی کردنەوەیەکی ئەپسنە، سوڤۆرین لە یاداشتە تایبەتیەکانی خۆیدا ئەم بۆچوونەی تۆڵستۆی بۆ نموونە تۆمار کردووە: "نووسەر، لەم کارەدا کۆمەڵێك ڕەگەزی شانۆنامەی داوتە پاڵ یەك بێئەوەی هیچ پەیوەندییەکی دەروونی (داخلی) یان ئامانجێکی دیاریکراو یەکیان بخات... چیخۆف، بەهرەمەندترین نووسەری ڕووسیە، بەڵام نەوڕەس، شانۆنامەیەکی زۆر خراپە".(بڕوانە دەروازەیەك بۆ مێژوو ١٨٩٧/٢/١١).

وێڕای دەنگدانەوەی خراپی نمایشی یەکەمی شانۆنامەکە، سەرباری جز و چڕنووکی بێ مروەتانەی ڕۆژنامە و بڵاڤۆکان. نمایشی دووەمی نەورەس، کە دوای چەند ڕۆژێك، یان لە ١٠/٢١دا ئەنجام درا، سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا. چیخۆف ئەوەی ڕاستی بێ، بە گوێی سوڤۆرینی کردبوو و سووکە دەسکارییەکی دەقەکەی کردبوو، جەماوەرەکەش، وەکو جاری یەکەم بە نیازی دیتنی شانۆنامەیەکی هەزەلی و بە مەبەستی پێکەنین نەهاتبوون، بۆیە زۆر بە جدی و ویقارەوە پێشوازییان لەم کارە سەنگین و زەنگین و ڕەنگینە کرد. ڕاوبۆچوونی خەڵکەکە دەرهەق بە دەقەکە بە ڕادەیەك گۆڕا، کردیە کارێك ڤیراکومیسارچڤسکایا نامەیەك بۆ چیخۆف بنووسێت: " ئا ئێستا لە هۆڵەکە هاتوومەتەوە، خۆمان براوەین.شانۆنامەکە سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەستهێناوە، دەنگی داوەتەوە. بوو بە ڕووداوی ڕۆژ. خۆزگە ئێستا لێرە دەبووی، تا بە خۆت گوێت لەو خەڵکە بوایە، کە بە چ هوراکێشانێکەوە ستایشی ئەم کارەی تۆ دەکەن! پۆتاپنکۆش، ئەم بروسکەیەی بۆ نارد: "ڕووداوێکی زۆر گەورەیە، سەرکەوتنە ئەمما سەرکەوتن. دوای هەر پەردەیەك، هەڵهەڵە لێدان و هۆراکێشان و ئافەرین و ستایشێکە هەر مەپرسە، دوای پەردەی چوارەم، هەر باس ناکرێت، ئەکتەرەکان، هەر هەموویان تکام لێدەکەن پیرۆزبایی ئەوانت پێبگەیەنم".

هەروەها چەندین نامەی دیکەی دۆستان و ئاشنایانی پێگەیی کە هەموو پیرۆزباییان لێدەکرد و تکایان لێدەکرد بگەڕێتەوە بۆ سان پترسبۆرگ، تا بە چاوی خۆی سەرکەوتنەکەی بدینێ.

ئەو پیرۆزباییەی کە لە هەموو پیرۆزباییەکانی دیکە پتر کاری تێکرد. پیرۆزباییەکەی ئانوتولی کونی بوو، ئەم پیاوە مافناسێکی بەناوبانگ و زانایەکی گەورەی بواری دەروونناسی بوو. لە نامەیەکی ٧/ت٢/١٨٩٦دا بۆ چیخۆف دەڵێت: "نەورەس، لە رووی شێوەو ناوەڕۆکەوە، لە ڕووی تازەیی بیرەوە، شانۆنامەیەکی نابارە، زۆر هۆشیارانە هەڵوێستە ڕۆژانەکانی ژیان ڕاودەکات. خودی ژیانە، لە سەر شانۆ. ژیان بە هەموو کارەساتەکانییەوە، بە گشت بێهودەیی و توڕەهاتە زەقەکانییەوە بە تێکڕای عەزابە کڕوکپەکانییەوە، ئەو ژیانە ڕۆژانەیەیە کە هەموو کەسێك موومارەسەی دەکات، بەڵام کەس لە ناوەڕۆکە پەنهان و گەپ ئامێزەکەی تێناگات. چیخۆف لە ١١/ت٢/١٨٩٦دا وەڵامی دەداتەوە کە ئەو نامەیە بوژاندیەوە و دەڵێت: "چونکە من زۆرم متمانە بە تۆیە، ڕای تۆم لە ڕای تێکڕایی ڕەخنەگرەکان پێکەوە، بەلاوە گرنگترە".

بەڵام لە ڕاستیدا، زامەکەی لەجیاتی ساڕێژ ببێتەوە، دەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژدا، زیاتر دەکولایەوە و دەهاتەوە سوێ. ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەگەییە ئەو قەناعەتەی کە ئەوەی لە شەوی کردنەوەی شانۆنامەکەدا، ڕووی دا پیلانێك بوو هەم دژی شانۆنامەکە و هەم دژی خۆیشی، گەلێك لەو کەسانەی کە ئەو بە دۆستی دەزانین، دەگەڵ دوژمن و ناحەزەکانی ئەو دەستیان تێکەڵ کردبوو، چەند کەسێکی مەرد و ڕەند و پیاوانە نەبێ، تێکڕایی خێڵی ڕۆژنامەوانان و نووسەران، تەگبیریان کردبوو، بە جۆرێ بیشکێنن کە بە ئاسانی نەیاتەوە تایم. ئەوەی زیاتر ئەم قەناعەتەی لای چەسپاند، وتارێك بوو کە لە ژمارەی نۆڤەمبەری گۆڤاری (تەماشاڤان) دا بڵاوبووەوە و دەڵێت: "هەم شانۆنامە نووسەکە و هەم ئەکتەرەکان، کران بە مەزەی ڕابواردن و قەشمەرجاڕ، هەندێ لە تەماشاڤانان لە ڕووی بەدنیهادی خۆیانەوە، کردبوویان بە هەرا و زەنا و خۆشی و شایی. لەوە دەچوو نیوەی خەڵکی ناو هۆڵەکە لە ناحەزانی چیخۆف بن... خراپترین ناحەز و دوژمن ئەوانە بوون کە سەر بە ئەنجومەنی برایانی ئەهلی قەڵەم بوون و بۆ ئەوە هاتبوون بۆ ئەوێندەر کە کۆنە حیسابی شەخسی خۆیان پاك بکەنەوە".

چیخۆف، زۆر بە نە بە دڵی قایل بوو کە نەورەس چاپ بکرێت. لە نامەیەکیا (١٤/ك٢/١٨٩٦)دا بۆ سوڤورین، بەمجۆرە باری هزری خۆی وەسف کردووە: "سەبارەت بە شانۆنامەکانم، جگە لە بێزاری هەست بە هیچی دی ناکەم، وێڕای ئەمەش دەبێ بە ناچاری بە نموونە چاپییەکانیاندا بچمەوە. ڕەنگە دیسان بڵێی کە ئەمە هەستێکی ئاقڵانە نییە، سواری سەری گەوجێتی بووم، بەڵێ دەزانم، بەڵام چی بکەم؟ خۆزگە دەمتوانی خۆم لەم هەستە گەوجانەیە ڕزگار بکەم. بەڵام ناتوانم، بە ڕاستی ناتوانم. مەسەلەکە ئەوە نییە کە شانۆنامەکەم شکستی هێناوە.چونکە پێشتریش زۆربەی شانۆنامەکانم شکستیان هێناوە و هەر بە خەیاڵیشما نەهاتووە. بەڵام شکستەکەی ١٠/١٧، شکستی شانۆنامەکەم نەبوو، بەڵکو شکستی خودی خۆم بوو. لە سەرەتای پەردەی یەکەمەوە ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەمە بوو کە: ئەو خەڵکەی من ١٠/١٧ دڵم بۆ کردبوونەوە، بەوپەڕی بێ فەرقی، لە ئێوارەخواندا بەشداریم دەکردن، گەنگەشە

و مشتومڕم لەسەر دەکردن (بۆ نموونە یاسنسکی)، ئەوانە سەنگەریان لێگرتبووم، بە شێوەیەکی ترسناک سەیریان دەکردم...، من حاڵی حازر ئارامم، مجێزم ئاساییە، گەڕاومەتەوە تایمی خۆم. بەڵام ناتوانم ئەوەی کە ڕوویدا لە بیربکەم، وەکو چۆن یەکێك بۆکسێك بە دەم و چاوما بکێشێت ناتوانم لە بیری بکەم، بەو ئاوایە ناتوانم ئەو ڕووداوە لە بیربکەم".

دیارە ئە ئەزموونە تاڵە، کردیە کارێك کە زیاتر لە یارانی هاوقەڵەمی بسڵەمێتەوە. تەنانەت لە قۆناغێکدا هاتە سەر ئەو قەناعەتەی کە پەیوەندی بە ڕیزی سوپاوە بکات بۆ ئەوەی بە یەکجارەکی لە ناوەندە ڕۆشنبرییەکە دابڕێ و دووربکەوێتەوە. کە لە ساڵی ١٨٩٦دا بیستی ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ڕووسیا و ئینگلتەرادا، لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناڤین، لە ئارادایە، لە ٢/ك١٨٩٦/١دا نامەیەکی بۆ سوڤورین نووسی کە "ئەگەر ئەم بەهارە شەڕ دەست پێبکات، بەشداری دەکەم. لە ماوەی ئەم ساڵ و نیو و دوو ساڵەی دواییدا، زۆر شت لە ژیانی شەخسی مندا ڕوویداوە، (تەنانەت لەم ڕۆژانەدا ماڵەکەشمان ئاگری گرت) یانی تەنیا ئەوەم بۆ ماوەتەوە کە وەکو ڤرۆنسکی*، بڕۆم بۆ بەرەی شەڕ، هەڵبەتە نەك بۆ شەڕکردن، بەڵکو بۆ تیمارکردنی زامداران. (ڤرۆنسکی: یاری ئاناکارنینا بوو، کە دوای خۆکوژی دڵبەرەکەی (ماشقە)، بە شێوەی خۆبەخش چوو بۆ بەرەی شەڕی نێوان سربیا و عوسمانیان)...

هەڵبەتە ئەم شەڕە هەڵنەگیرسا، بەڵام چیخۆف، دوور لە خەڵکی و وەکو دوورخراوەیەك لە میلیکۆڤۆدا کونجی تەنیایی گرت. ئیدی دەستی دایە نووسینی چیرۆکێکی درێژ لە ژێر سەرناڤی (جووتیاران) کە جۆرە بەرجەستەکردنێکی زۆر بێ بەزەییانەی ژیانی جووتیاری ڕووسیە. لە کاتێکا کە دڕەندەیی ژیانی گوندی لەسەر کاغەز مەحکوم دەکرد، لە هەوڵی بەردەوامدا بوو بۆ چاك کردنی ڕەوشی ژیانی گوندەکانی دەوروبەری خۆی و لەو پێناوەدا کۆی لە هیچ نەدەکردەوە. لە یاداشتە تایبەتییەکانی خۆیدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "خۆزگە هەر یەکێك لە ئێمە، قوتابخانەیەك، بیرێکی ئاو، یان هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتەی لە دوای خۆی بەجێدەهێشت، و بە گومناوی نەدەمردین".

ئەم زستانە ئەرکی دروستکردنی قوتابخانەیەکی تازەی لە گوندی نوفوسلکیی دراوسێیان گرتە ئەستۆ. بە هەمان شێوەی قوتابخانەی ئتلیژ، کەوتە کۆکردنەوەی پارە، بە خۆیشی پارەی داو، پارەیەکی زۆری کۆ کردەوە، بە خۆیشی ڕۆڵی ئەندازیاریی سەرپەرشتیاری دەبینی. دەستنووسەکانی، دەگەڵ ئەو نەخشانەدا کە بۆ قوتابخانەی ناڤبری کێشابوون، لەسەر مێزەکەی کەڵەکە بووبوون. سەرباری ئەو هەموو مەشغەڵەتەش، قاییل بوو لەو سەرژمێریە نەتەوەییەدا بەشداری بکات کە حکوومەت لێبڕا ئەنجامی بدات. لە ١٠/ك٢- ١٨٩٧/٢/٣دا بە ماڵە جووتیارەکانی ئەو دەڤەرەدا گەڕا، دەچووە هەر ماڵێکەوە، ئەوەندە نزم بوو، سەری بەر سەردەری دەرگاکانیان دەکەوت. سەرباری ئەوەش، سەرپەرشتی کاری پازدە ئامارگەری دیکەی لە ئەستۆ بوو و دەبوایە دوا ڕاپۆرتیش لەو بارەیەوە ئامادە و گەڵاڵە بکات.

سەدان کارت لە چەکمەجەکانیا کەڵەکە دەبوون. کاتێ لەم کارە بووەوە، چیخۆف لە یاداشتنامەکانی خۆیدا زۆر بە کورتی ئەمەی تۆمار کردووە: "بە بۆنەی ئەم سەرژمێرییەوە میدالیان دامێ".

ئەوەی کە چیخۆف، زۆری لا مەراق و مەبەست بوو، دروستکردنی "کۆشکی گەل" بوو لە مۆسکۆ، کۆشکێك بۆ هاوڵاتیانی مۆسکۆ کە ببێ بە مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری بۆ خەڵکی و شانۆ، کتێبخانە ، مۆزەخانە و، هۆڵی خوێندنەوە و کۆبوونەوەشی تیابێ. بە ئومێدی هاتنە دی خەونە دێرینەکەی چوو بۆ مۆسکۆ، وەختێ تەمەشای بەرنامە و نەخشەکانی کرد، داچڵەکی، چونکە خەرجی ئەم پڕۆژەیە ئەوەندە زۆر بوو، بە داخەوە کە بە هیچ جۆرێ لە کۆکردنەوە نەدەهات، بۆیە دەبوایە دەستبەرداری ئەم بیرۆکەیە ببێت.

ئەوەبوو لە ١٨٩٧/٢/١٩دا جارێکی دی بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە تا لە ئاهەنگێکی بە شکۆدا لە ئوتێلی کۆنتیننتاڵ دا، بە بۆنەی ساڵوەگەری ئازادی کۆیلان دەگێردرا، بەشداری بکات. وەختێ کە بۆ ئوتێلەکەی گەڕایەوە، ئەم سەرنجانەی لە یاداشتەکانی خۆیدای تۆمار کرد: "بەڕاستی شتێکی ناخۆش و کۆمیدیە، خواردن، شامپانی خواردنەوە، گەنگەشە و چەنەبازی بە دەنگی بەرز، وتار خوێندنەوە دەربارەی خەڵك و هۆشیاری خەڵك، هەستی نیشتمانپەروەری و ئازادی و ... هتد. لە کاتێکا خەڵکانی پۆستین لەبەر، ئێستاش وەکو جاری جاران، کۆیلە ئاسا بە دەوری مێزەکاندا دەسوڕێنەوە، گالیسکەچیان لە دەرەوە و لەبەر سەرما چاوەڕوان دەکەن، ئەمە ڕێك وەکو ئەو درۆیانەیە کە دەدرێنە پاڵ خوا". دوای شازدە ڕۆژ، لە ئاهەنگی پێشوازی، ئێوارە خوان و زیافەتی تێر و تەسەل، چیخۆف بۆ میلیکۆڤۆ گەڕایەوە و دەستی بە نووسینی چیرۆکی (جووتیاران) کردەوە. زۆر ماندوو بوو، دیسان کەوتەوە خوێن هەڵهێنان، بەڵام دانی بە نەخۆشییەکەی خۆیدا نەدەنا. دوای مانگێك سواری قیتاربوو و چوو بۆ مۆسکۆ تا لەسەر ڕێگاوە سەرێکی سوڤۆرین بدات و ئەوسا بە دوو قۆڵی بۆ سان-پترسبۆرگ بڕۆن.

لە ٣/٢١دا گەییە مۆسکۆ و لە (گراند ئوتێل) هەواری خست. ئێوارێ کە تازە دەگەڵ سوڤۆرین دا، لە خوارنگەی ئارمیتاج دەستیان بە شیڤ خواردن کردبوو، لەپڕ خوێنی هەڵهێنا. خوێنەکە هێندە زۆر بوو تەنانەت بەکارهێنانی ئاقڵانەی سەهۆڵیش نەیوەستانەوە. چیخۆف، هەرچەندە نەخۆشییەکەی خۆی نەك هەر لە خەڵکی بەڵکو لە خۆیشی دەشاردەوە، زۆری پێناخۆش بوو کە بە بەرچاوی خەڵکییەوە تووشی ئەو حاڵەتە بوو. ئیدی بە ناچاری قاییل بوو، سوڤۆرین بردییەوە بۆ ئۆتێلەکەی خۆی (سلاڤنسکی بازاڕ) و لەوێوە ناردی بە شوێن دکتۆر نیکۆلای ئوبولنسکی دا، کە هەردووکیان دەیانناسی، تا ڕاوێژ و تەگبیرێکیان بۆ بکات و فریایان بکەوێ. بۆ ڕۆژی دوایی چیخۆف، هەردوو پێی لێکردە تاکێ کەوشەوە کە بۆ ئۆتێلەکەی خۆی (گراند ئۆتێل) دەگەڕێتەوە، چونکە وەکو دەیگوت دەبوایە کۆمەڵێك نامە بنووسێت و چەند کەسێکیش ببینێ. بەڵام چونکە خوێنڕێژییەکەی دووبارە دەستی پێکردەوە، دکتۆر ئوبولنسکی هەواڵەی عیادەکەی دکتۆر ئوستڕۆموڤی کرد، کە پزیشکی پسپۆڕی نەخشی سینگ بوو. چیخۆف خەجاڵەت و شەرمەزاری ئەو وەزع و ڕەوشە بوو کە لە خوانگەکە تووشی بووبوو، بەو حاڵەشەوە، سووربوو لە

سەر ئەوەی کە وەزعی خراپ نییە. سوڤورین پاش ئەوەی لە عیادەکەی دکتۆر ئوستروموف، سەردانی دەکات، ئەم سەرنجانە لە دەفتەری یادگارییەکانی خۆیدا تۆمار دەکات: "نەخۆشەکە بە دەم پێکەنین و گاڵتە و نوکتە گوتنەوە، خوێنی دەتکانە لەگەنێکی گەورەوە". سوڤورین، بۆ ئەوەی نەخۆشییەکەی لە بیر بەرێتەوە و دڵخۆشی بداتەوە، بیری دەخاتەوە کە سەهۆڵبەندانی ڕوباری مۆسکۆڤا، خەریکە دەتوێتەوە. چیخۆف هەرکە گوێی لەو قسەیە بوو، یەکسەر ڕەنگی هەڵبزڕکا، وەکو ئەوەی ئەو قسەیە ئاگادارکردنەوەیەکی دەروونی بێ بۆی.

لێرەدا سوڤورین، یەکسەر و بە کەسەرەوە، ئەوەی بیرکەوتەوە کە چیخۆڤ دۆستی، چەند ڕۆژێك لەوەوبەر بۆی گێڕابووەوە کە: "وەختێ جووتیارێکی دێهاتی تووشی سیل دەبێت، دەڵێت: چار نییە، تازە کارم کراوە، لەگەڵ توانەوەی بەفری بەهارا، منیش دەتوێمەوە و دەمرم".

چیخۆف، هەرکە داخڵی خەستەخانە بوو. هەموو خەیاڵێکی چاکبوونەوەی لە مێشکی خۆی دەرکرد، بەڵام داوای لە خوشکەکەی و براکانی کرد، ئەنجامی معایەنەی پزیشکەکان لە داك و بابی بشارنەوە. هەروەها حەزی دەکرد، وێڕای سەختی نەخۆشییەکەی، وا بیر بکاتەوە، کە چەند ساڵێکی دیکەش دەژی. دکتۆر ئوستراموف بە ناوی پارێزەوە، گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە ژیانیا کرد: دەبوا لە دەرێی شار بژی. زۆر بە جدی ئاگاداری خۆی بکات و، واز لە کاری پزیشکی بێنێ. چیخۆف، لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین (١٨٩٧/٤/١) لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەم کارە هەم خۆشە و هەم ناخۆش. واز لە هەموو کارێك دێنم، بیجامەیەك دەکرم و لەبەر هەتاو دادەنیشم و دەخۆم و دەخۆم. پزیشکەکانم بۆیان داناوم ڕۆژی شەش ژەم نان بخۆم. زۆریان پێناخۆشە کە دەبینن ئەوەندە کەم دەخۆم. قسەکردنی زۆر، مەلەکردن و ئەو جۆرەکارانەیان لێ قەدەغە کردووم، جگە لە سییەکانم، ئازای بەدەنم ساغە...".

هەواڵی سیلەکەی چیخۆف، لە سەرانسەری مۆسکۆدا بڵاوبووەوە. هەر دۆست و ئاشنابوو و دەهاتە دیدەنی .چیخۆف، بە قسەکانیان ماندوو دەبوو. لە نامەیەکیا (١٨٩٧/٤/٧) بۆ سوڤورین دەڵێت: "پێویستە ژن بهێنم، ڕەنگە ژنێکی پەتیارەی شڕشێت. نیوەی ئەم قەرەباڵغییەم لە کۆڵ بکاتەوە. دوێنێ وەکو لافاو دەهاتن، وەکو ئافەت. دوو دوو دەهاتن، هەموو بە منیان دەگوت قسە مەکە، کەچی خۆیان بە پرسیار دایان دەگرتمەوە."سەر مێزەکەی کەنار تەختە خەوەکەی پڕ بوو لە چەپکە گوڵ، قوتوی خاویار، بوتڵە شامپانیا، نامە و دەستنووسی نووسەرانی تازەکار و گەنج، کە داوای ئامۆژگاری ئەویان دەکرد. دەستنووسەکانی بە وردی دەخوێندەوە و زۆر هەوڵی دەدا بە نامە وەڵامی هەر یەکێکیان بداتەوە. کیژێك کە خوێندکاری خوێندنگەی مامۆستایەتی بوو، چەند چیرۆکێکی بۆ ناردبوو. چیخۆف، چیرۆکەکانی دەگەڵ ڕەخنەیەکی کەمێك توندا بۆ ناردەوە. کاتێ کیژێ دووبارە نامەیەکی تری بۆ نارد، گلەیی کردبوو کە چاوەڕوانی "چاوەڕوانی هاوسۆزیی و دڵ فراوانییەکی زیاترم لێ دەکردیت". چیخۆف، وەڵامی دایەوە کە بەر قەراری نامە و نامەکاری لە کاتێکا کە یەکێك لە دوو لایەنەکە نەخۆش بێ و لە جێدا کەوتبێت، کارێکی ئەستەم و دژوارە، وێڕای ئەوەش، زۆر بە نەرمی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکی تازەی کرد.

بە ڕێکەوت، لەو کاتانەدا، لیدیا ئەڤیلۆڤای نەسرەوت، ڕێی دەکەوێتە مۆسکۆ و هەواڵ دەزانێ کە چیخۆف داخڵی خەستەخانە کراوە، ئیدی بە لەز دەچێت بۆ دیدەنی. هەرچۆنێ دەبێ مۆڵەتی دیدارێکی سێ دەقیقەیی دەدەنێ. بەو مەرجەی نەخۆشەکە، واتە چیخۆف نەیەنێتە قسان، بەڵام لیدیا ئەڤیلۆڤا، دەڵێت گوایە گفتوگۆیەکی گەرم و گوڕی دەگەڵ چیخۆفدا کردووە، بە هەر حاڵ بۆ ڕۆژی دوایش سەری دەدات و گوڵی بۆ دەبات. کە لە هەمان ڕۆژدا ڕێگەی ماریاش درابوو دیدەنی براکەی بکات و لەوێندەر بە دیارییەوە دانیشتبوو. لیدیا ئەڤیلوڤا، لە یاداشتەکانی خۆیدا لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئانتون باڤلوفیچ، لەسەر پشت پاڵ کەوتبوو، قسەکردنیان لێ قەدەغەکردبوو، پاش سڵاو و چاکوخۆشی، بەرەو تەبەڵەکە چووم تا هەستی خۆم پەنهان بکەم و بە خەفەتباری نەم دینێ. لەسەر تەبەڵەکە، تەختیتێکی سییەکانیم بینی کە بە قەڵەمی شین کێشابوویان. بەشەکانی سەرەوەی سییەکانی سوور بوون، ئیدی بۆم دەرکەوت کە ئەو بەشانەی نەخۆشن".

دوو ڕۆژ لەوە دوا، چیخۆف هێشتا لە خەستەخانە کەوتبوو، تۆڵستۆی لە ناکاوا دەچێتە دیدەنی. ئیدی پزیشك و پەرستارەکان نەیانتوانی دەرگا لە ڕووی پیاوێکی وا بە نێوبانگ نەکەنەوە. چیخۆف کە پیاوێکی خاکی بوو، وەختایەك بینی ئەو کەڵە پیاوە، پەرۆشی ئەوە و زەحمەتی کێشاوە و هاتووەتە دیدەنی، هەستی بە جۆرە خەجاڵەتییەك کرد. نووسەری پیر لەسەر کورسییەکی مشەمای دەسکدار، لە تەنیشت ئەو تەختە باریکەوە کە چیخۆڤ لەسەر ڕاکشابوو، دانیشت، بێئەوەی گوێ بەوە بدات کە لە نەخۆشخانەیە و هاتووەتە دیدەنی پیاوێکی زۆر نەخۆش، سەری باسێکی گەرمی دەربارەی نەمری ڕۆح کردەوە.

چیخۆف، دوای دوو سێ هەفتە لە نامەیەکیا بۆ میخائیل مەنشیکوڤ هاوڕێی، بە تەوسەوە لەو بارەیەوە دەڵێت: "گەنگەشە و گفتوگۆیەکی گەرممان کەوتە نێوان، بەتایبەتی گەرم بۆ من، چونکە من زیاتر، گوێدێر بووم، تا قسەکەر ... تۆڵستۆی نەمری لە شێوە کانتی یەکەیدا دەبینێ، قەناعەتی وایە هەمووومان "بەشەران و زندەوەران تێکڕا" لە چوارچێوەی پرەنسیپی "ئەقڵ یان ئەشقدا" درێژە بە ژیان دەدەین و جەوهەر و کرۆکی ئەم پرەنسیپە لە ئێمە پەنهانە. هەڵبەتە ئەو پرەنسیپ یان هێزە، بە لای منەوە، شتێکی دەڵەمەی جەلاتینییە و من ئەقڵم نایبڕێت و من بەش بە حاڵی خۆم ئەو جۆرە نەمرییەم ناوێ و باوەڕم پێی نییە. لیف نیگولایوفیچ، سەری سوڕمابوو کە تێی نەدەیشتم". (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٧/٤/١٦).

دوای ئەوەی چیخۆڤ نەخۆش، ماندوو و بێدەنگ دەبێت، مامۆستای پیر، سەری باسێکی دی دەکاتەوە: بیروبۆچوونی خۆی دەربارەی هونەر. بە چیخۆف دەڵێت بە شێوەیەکی کاتی وازی لە "ژیانەوە" هێناوە و نزیکەی شەست سەرچاوەی لەمەڕ ئیستاتیکا و زانستی جوانناسی خوێندووەتەوەو بە نیازە بە خۆی باسێك لەو بارەیەوە بنووسێت. بە بۆچوونی ئەو هەر هونەرێك لە خزمەتی ئەخلاق و ئاییندا نەبێت زیادە.کە دەبینێ چیخۆف خۆی ئامادە دەکات ڕەدی بداتەوە، بە دەنگی بەرزتر لەسەری دەڕوات: ئەگەر هونەری هاوچەرخ بە هەمان نەفەس بڕوات، دەپوکێتەوە و بەرەو گەندەڵی دەڕوات و دەبێ بێ چەند و چوون مەحکووم بکرێت. ئیدی ئەم

پێغەمبەرە توند و بێ هەڤرکە، بە ڕدێنە جوان و چاوەگەش و درەخشانەکانیەوە، دەستبەرداری بیروبۆچوونی خۆی نەدەبوو، بۆیە چیخۆف، بێدەنگی لێدەکات، بەڵام دواتر لە ١٨٩٧/٤/١٧ دا لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندەر ئێرتیلی نووسەری برادەری، لەو بارەیەوە دەڵێت: "بیر و بۆچوونەکانی تۆڵستۆی تازەنین. هزرڤانان، لە هەر سەردەم و ڕۆژگارێکا، ئەم قەوانەیان بە شێوە و شێوازی جۆراو جۆر لێداوەتەوە، پیرەمێردان هەمیشە بەلای ئەوەدا دایان کێشاوە کە دنیا ڕوو لە ئاخرە، ئاکار و ئەخلاق داویەتێ کزی، ڕوو لە قاتیە، هونەر کاڵ بووەتەوە، تاڵکێش بووە. خەڵکی وەکو جاران نەماون، شەهامەت و پیاوەتی دوایەتیە کزی... تۆڵستۆی گەرەکییەتی لە کتێبەکەیدا ئەوە بە خەڵکی بڵێ کە هونەر لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، گەییوەتە کوێرە کۆڵان و دەرچوونی نییە، هیچ چارێکی نییە دەبێ بۆ دواوە بگەڕێتەوە".

چیخۆف، دوای ڕۆیشتنی ئەم هێرشکەرە ڕۆشنبیرەش، هەر ئارامی نەگرت، خەوێکی پچڕ پچڕی کرد، لە بەرەبەیاندا دیسان کەوتەوە خوێن هەڵهێنان.

ئەنجام دکتۆرەکان، ڕێگەیان دا، هەر لەو ناوە، کەمێك بجوڵێ، ئیدی وردە وردە بە ڕاڕەوەکانی خەستەخانەکە و بە باخچەکەیدا کەوتە پیاسە. ڕۆژێك بە دەم پیاسەکردنەوە، تا گۆڕستانەکەی دێری نوڤودیڤی کە لە خەستەخانەکەوە نزیك بوو، ڕۆیی. لەوێ ماوەیەکی زۆر بە دیار گۆڕەکەی پاشچیڤی هاوڕێیەوە کە چوار ساڵ لەوەبەر بە خاکیان سپاردبوو، بە دەم ڕامانەوە وەستا.

بە سوڤورین، کە سوڤورین هەمان ئەو قسانەی ئەوی لە یاداشتەکانی خۆیدا تۆمار کردووە، دەڵێت: "بیرۆکەی مردن، شتێکی گەورەتر لە ترسمان لا دروست دەکات. کە دەتبەن بۆ گۆڕستان و بە خاکت دەسپێرن، خەڵکی خێرا دەگەڕێنەوە تا بە دەم چا خواردنەوەوە، بکەونە ڕیا بێژی".

دەیزانی دەبێ لەوە دوا، وەکو بابایەکی نەخۆشی نیوە پەککەوتە ژیانی بگوزەرێنی. وێڕای ئەوەش خەمی ئایندەی بوو، پتر خەمی کەسوکارەکەی بوو تا خەمی خۆی. خەمی ئەوەی بوو ئاخۆ دەتوانێ لەسەر نووسین بەردەوام بێ و پێویستی کەسوکارەکەی دابین بکات؟ بە تایبەتی کە دکتۆران بۆیان دانا بوو ئیسراحەت بکات و خۆی ئەزیەت نەدات. وەختێ سوڤورین، بە گاڵتەوە دەڵێت چیخۆف، لەمەودوا بۆ خۆی لەزەتی تەمەڵی و بێکاریش دەجەڕبێنێ، چیخۆف وەڵامی دەداتەوە: "من ڕقم لە تەمەڵی و بێکاریە، بە سەرچاوە و فاکتەری هەموو سستی و لاوازییەکی دەروونی و ڕۆحی دەزانم". (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٧/٤/٧). زۆر بە تاسەوە بوو بە زووترین کات بگەڕێتەوە سەر کارەکانی تا خۆی دڵنیا بکات، کە ئەو قەیرانە تەندروستییەی تێپەڕاندووە، کاری لە توانا و وزەی داهێنەرانەی نەکردووە.

دکتۆرەکان، تا ١٨٩٧/٤/١٠ لە نەخۆشخانە مەرەخەسیان نەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی ١٨٩٧/٤/١١، دەگەڵ ئیڤانی برایدا بۆ میلیکۆڤۆ گەڕایەوە. کە چاوی بە دایك و باوك و کەسوکارەکەی، بە گوندی هەمێزی هەتاوی گەرم، بە دارودرەخت، بە دەفتەر و کتێبەکانی خۆی کەوت، لە خۆشیا، لە پێستی خۆی نەدە هێوری.

ماریا، هەموو جووتیارەکانی ئەو دەوروبەرەی ئاگادار کردەوە کە لەمڕۆ بە دواوە بە تەمای ئەوە نەبن براکەی معایەنە و دەرمانیان بکات. چیخۆفیش قاییل بوو کە دەستبەرداری پیاسە و

گەڕانی دووورودرێژ ببێ، واز لە کاری قورسی باخەوانی بێنێ، و تەنیا جار جارێك بۆ بێتاقەتی، بنجە گوڵێك، دەوەنێك پەرچ بکات و شادانە بە کێشکە و چۆلەکان بدات. بەڵام سەبارەت بە کۆمەڵێك کار و ئەرکی دیکە، هەرچی دەکرد و دەکۆشا، نەیدەتوانی دەستبەردار بێ. ئیدی بە پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی خۆشکەکەیەوە، بەردەوام بوو لەسەر ناردنی بەستە کتێبان بۆ کتێبخانەی تاگانرۆگ، سەرپەرشتی دروستکردنی قوتابخانەی نوڤوسکی، تاقیکردنەوەی خوێندکارانی ئامادەیی خوێندنگەی تالیژ، پێشوازیکردنی میوانانی ڕەوتەنی، بەرقەراری نامە و نامەکاری دەگەڵ دۆستان و نووسەران و هەموو فزوڵێکی دیکەدا.

سەربارى ئەرك و سەریەشە و ژیانی ڕۆژانە، خەمی چیرۆکە تازەکەشی (جووتیاران)، کە تازە لە ڕۆژنامەی (هزری ڕووسی)دا بڵاو بووبووەوە، بە ملدا هات.ئەو وەسفەی لەم دەقەدا دەربارەی ژیانی جووتیارانی ڕووس، کرابوو، بە سانسۆرچیان قووت نەدەچوو، لە ترسا زۆر شتیان لێ چز کردبوو، کەچی بەو هەموو جزکردنەشەوە، خوێنەران سەرسامی ئەو جورئەتە بوون کە لە دەقەکەدا هەبوو. ئەم چیرۆکە لە ڕێگەی ژنێکی گەنجی شارییەوە، پەردە لەسەر ژیانی گوندی هەڵدەماڵی. ئەم ژنە ناوی ئولگایە، لە مۆسکۆ شوو بە شاگرد ئوتێلێکی، بە ئەسڵ جووتیار دەکات. کاتێ پیاوەکەی نەخۆش دەکەوێت و کارەکەی لە دەست دەدات، ژنە، هەڵیدەگرێت و دەیباتەوە بۆ گوندەکەی زاگەی خۆی. ئەوەی ژنەی تاین لەوێندەر دەیبینێ، دنیایەکی دیکەی زۆر جیاوازە، دنیایەك نقوم لە هەژاری، لە کلۆڵی، لە خورافەگەرایی، لە پیسی، لە نەزانی و بێ ویژدانی و بێ کاری، لە تەمەڵی و دڵڕەقی. دەبینێ لەوێ، دە، دوازدە کەس بە جارێ، لە کوختەیەکی پڕ لە مێش و مەگەساندا دەژین. خواردنی سەرەکیان نانی جۆ و ئاوە. ژنان وەکو حەیوانات دارکاری دەکرێن. پیاو بۆ ئەوەی لە نائومێدی خۆی هەڵێ و خۆی لە بیر بکات، پەنا وەبەر ڤۆدکا دەبات. ژنان مەحکوومن بەوەی لەم دۆزەخە حەیوانییەدا بژین.ئۆلگای نەرم و نیان لەم دۆزەخە حەیوانییەدا هەڵناکات، دوای مردنی شووەکەی، کچەکەی هەڵدەگرێت و ڕێ و ڕێ بۆ مۆسکۆ دەگەڕێتەوە و، ئیدی دەکەونە سەر ڕێگە و بانان و دەست لەم و لەو پان دەکەنەوە.

بە هەرحاڵ، چیرۆکی "جووتیاران" هەر کە بڵاو بووەوە وەکو ڕووداوێکی ئەدەبی، دەنگی دایەوە. لە ڕۆژنامە و بڵاڤۆکاندا مشت و مڕێکی توندی لەسەر کرا. بەڵام لە مەیدانی ڕەخنەدا، بە شێوەیەکی گشتی، پشتوانی لێکرا. ڕەخنەگری پۆستەی باکوور لەو بارەیەوە دەڵێت: "سەرکەوتنی (جووتیاران) ئەو ڕۆژگارانەمان وەیاد دێنێتەوە کە ڕۆمانێکی تازەی تورگنیف یان دروستویفسکی دەکەوتە بازاڕەوە". چیخۆف، لە ماوەیەکی کەمدا چەند نامەیەکی پیرۆزبایی و دەستخۆشی پێگەیی، یەکێك لەوانە، نامەیەکی لیکین بوو، کە دەڵێت: "جووتیارانم خوێندەوە، بە ڕاستی توحفەیە! بە یەك شەو، بە کەڕەتێك خوێندمەوە، دوای خوێندنەوە، تا ماوەیەکی زۆر نەمتوانی بخەوم".

ئەلکساندەر سومباتوف- یوجین-ی شانۆنامەنووس و دەرهێنەر، هاوڕێی چیخۆف، لە نامەیەکیا، لەوەش هێوەتر دەڕوات و دەڵێت: "ئەم چیرۆکە، یەکێکە لەو شاکارانەی کە ساڵانێکی زۆرە دنیا شتی وای بە خۆوە نەدیتووە... لێوان لێوە لە تراژیدیای حەقیقەت، پلۆتە خۆڕسك و

خۆ بەخۆکانی شەکسپیر وەبیر دێنێتەوە... من لە جووتیاران دا، هەست بە کەش و هەوای هەمان ڕۆژی ناو چیرۆکەکە دەکەم، هەست بە شوێنی هەتاو دەکەم، هەست بەو سەرەو لێژگەیە دەکەم کە بەرەو کەناری ڕووبارەکە دەکشێت. هەموو شتێك دەبینم بێ ئەوەی وەسف کرابێت". (بڕوانە نامەی ٥/١٨٩٧).

بەڵام خەڵکانی دی، بە تایبەتی پۆپۆلیستان و مورید و پەیڕەوانی تۆڵستۆی، چیخۆفیان بەوە تۆمەتبار دەکرد، کە گوایە بە ئانقەست، وێنەی جووتیاری ڕووسی شێواندووە. هەڵبەتە چیخۆف، دەیتوانی وەڵامیان بداتەوە کە دوای پێنج ساڵی خشت، لە تەماسی ڕۆژانەی دەگەڵ جووتیاران و تیمار و دەرمانکردنی نەخۆشیان، کەس توانای ئەوی نییە لە نیشاندان و بەرجەستەکردنی زەبوونی و ڕاڕایی جووتیاردا. بەڵام ئەمجارەش وەکو پیشەی هەمیشەیی کە بەشداری ئەو گەنگەشە و مشت و مڕانەی نەدەکرد کە لە بەرهەمەکانی دەکەوتنەوە، خۆی دوور گرت و بێدەنگی هەڵبژارد. چاك دەیزانی ئەم بەرهەمەی، تەنانەت ئەوانەشی، کە زۆر لێی ناڕازی بوون و هەرا و هەنگامەی دنیایان لەسەر نابووەوە، لە ناخا هەژاندووە. دیارە سەرکەوتنی چیرۆکی "جووتیاران" تۆڵە و قەرەبووی کارەساتی شکستی نەورەسی بە زیادەوە بۆ کردەوە. بە گوتەی ئەلکساندر، چیخۆف بەم چیرۆکە گەییە لوتکەی شۆرەتی ئەدەبی و ئەوپەڕی خۆشەویستی جەماوەری. بەڵام ئەم شۆرەت و سەرکەوتنە هەم مایەی دڵخۆشی بوو هەم سەرچاوەی نیگەرانی و ترس، دەترسا، دوای ماوەیەکی کەم بکەوێتەوە بەر سێبەر. ڕاستە پڕۆژەی ژمارەیەك چیرۆك و شانۆنامانی تازەی بە دەستەوە بوو، بەڵام نەخۆشی کەسیرەی کردبوو. جاری وابوو ماوەیەکی زۆر بە دیار پەڕە کاغەزێکی سپییەوە، دەبیر و خەیاڵەوە دەچوو. کە هەوا خۆشی دەکرد و سووکە پشوویەکی وەبەر دەهاتەوە. میوانانیش سەریان دەکرایەوە، بەسەر میلیکۆڤۆی ئازیزدا دادەبارین. برا ژندارەکانی، هەموو هەفتەیەك بە ژن و منداڵەکانیانەوە سەریان دەدا، جاری وا هەبوو چەندین ڕۆژ دەمانەوە. ڕاستە چیخۆف بە هاتنی هەندێ لە دۆستانی وەك لیڤیتان و لایکا و ئەلکساندر ئیڤانکۆ، خۆشحاڵ و شادمان دەبوو. بەڵام جاری واش هەبوو، خەڵکانی قیرسچمە و لاپڕەسەن، سك لەوەڕێن و مێملش دەهاتن، کە دەبوایە بە ناچاری مدارا و خزمەتیان بکات، ماڵ لە خۆی نەبێ، میوانیش ڕووی تێبکات.

جارێك لای لیونتیف-شچگلوف گلەیی دەکات: " تەسەورکە، لەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا، پتر لە دە میوانمان هەبوون، هەر هەمووشیان لە مۆسکۆوە، هاتبوون، وەکو ئەوەی ئوتێلم هەبێ، ئەوجا وەرە خواردنیان بۆ ئامادە بکە، مێزی خواردنەوەیان بۆ بڕازێنەوە، جێگەی نووستنیان بۆ ئامادە بکە". لە ناو هەرا و زەنای ماڵەکەدا کاری بۆ نەدەکرا.

زۆرجار دەبوایە چاوەڕوان بکات، تا هەموو میوانەکان دەچوونە جێگاوە و دەخەوتن، ئەوسا، بە کاوەخۆ بکەوێتە نووسین. بە گوتەی شچگلوف، ڕەنگی زەرد و سیمای گرژ، نیگای نیگەران بوو و زۆر دەکۆکی. دەنگی کەرخ و ئازار ئامێز بوو. شەوان ئەگەر هەواش خوش بوایە، پاڵتۆیەکی دەخۆوە دەپێچا.

سەفەرە کەمەکانی بۆ دەرێی میلیکۆڤۆ، چی بۆ مۆسکۆ و چ بۆ شوێنانی دیکە، زۆریان ماندوو دەکرد. وەکو جاران تاقەتی گەشت و گەڕانی نەمابوو. پاش ئەوەی لەگەڵ لیڤیتان و لەسەر پێشنیاری ئەو، سەردانێکی مەزرا و موڵکی کابرایەکی بازرگانی دەوڵەمەندی، بە نێوی سێرگی موروزوف کرد، لە گەڕانەوەدا نامەیەك بۆ سوڤورین دەنووسێت و بەمجۆرە باسی ئەو موڵك و مەزرایە دەکات: "خانووەکەی لەوەدا نییە، بە قەد ڤاتیکان گەورەیە. خزمەتکارەکانی هەموو بەرکۆشەی ئاوریشمی سپییان لەبەربوو، زنجیری زێڕ بە بەرۆکیانەوە شۆڕ بووبووەوە. بەڵام ناو ماڵەکەی زوق بێ زەوق و سەلیقە بوو. خاوەن ماڵەکە، زۆر سارد و سڕ بوو، هەر بە هەڵاتن هەڵاتم". (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٧/٦/٢١).

چیخۆف، هەرچەندە کەمی دەنووسی، بەڵام زۆری دەخوێندەوە. زۆر دڵی بە موپاسان دەکرایەوە، لەزەتی لە بەرهەمەکانی ئەو دەبینی، هەرچەند فەرەنسی بە باشی نەدەزانی، بەڵام بە نیازی پاچڤەی چەند چیرۆکێکی ئەوبوو. هەروەها زۆر شیفتە و شەیدای تەکنیکی غەریبی شانۆنامەکانی مەتەرلینگ بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت باشە بۆ سوڤورین، لە شانۆخانەکەی خۆیدا، شانۆنامەی (کوێران)ی مەتەرلینگ، پێشکەش و نمایش ناکات. ئەوەبوو لە ١٨٩٧/٧/١٢دا، نامەیەکیی لەو بارەیەوە، بۆ سوڤورینی هاوڕێی نارد، هەر لەو نامەیەدا دەڵێت: "لەبەرئەوەی تەماشاڤانان نیمچە گەوجن، بۆ ئەوەی شانۆنامەکە لە شکست و ناکامی دوور بێت، دەکرێت پوختەیەکی چڕی نێوەڕۆکی شانۆنامەکە، لە ئاگادارییەکدا بڵاوبکرێتەوە". هەر لە هەمان نامەدا دەڵێت: "من لێرە میوانێکی زۆرم بە سەرا کەوتوون. ئەلکساندەر منداڵەکانی بەسەر مندا بەجێهێشتووە، هەموو ڕووت و ڕەجاڵ، تەنانەت جلی پێویستیشی بۆ نەهێناون. حاڵی حازر لێرە دەژین و خوا دەزانێ کەی دەڕۆن، لەوە دەچێ تا کۆتایی هاوین لێرە بمێنن، لەوەشە تا هەتا هەتایە هەر لێرەبن. ئافەرین بۆ دایك و باوکیان! بەڕاستی لوتفی دایك و باوك هەروا دەبێ!". لە ١٨٩٧/٧/١٤دا هەمان سکاڵا بۆ (لایکین)ش دەکات: "دنیایەك میوانم هەن، ئەگەر دەتەوێن، وەرە هەندێکیان بۆ خۆت ببە! ژوورم کەمە، نوێن و پێخەفم کەمە، حەوسەڵەی قسەکردن و مجامەلەم دەگەڵیاندا نییە، بە ڕاستی تاقەتی خانەخوێیم نەماوە".

لەگەڵ هاتنی مانگی ئابدا، بە جۆرێ بێتاقەت و کەم حەوسەڵە بوو، بیری لەوە دەکردەوە بە گوێی پزیشکەکان بکات و، بەر لە سەرما و سەهۆڵبەندانی زستان، بڕوات بۆ شوێنێکی گەرمەسێر.

کاتێ ڤاسیلی سوبولفسکی دۆست و برادەری، سەرنووسەری "هەواڵێن ڕووسیا" نامەیەکی بۆ نارد کە لە هاوینەواری بیارتیزە، چیخۆف وازی لە هەموو کارێك هێنا و لێبڕا بڕوات بۆ لای ڤاسیلی. بەڵام نەدەوێرا بە تەنیا بە ئەوروپادا سەفەر بکات. ئەوەبوو لە ١٨٩٧/٨/١٩ دا نامەیەکی بۆ ڤاسیلی نارد: "تکایە بۆم بنووسە ئایا لە مۆسکۆ سواری قیتاری بەرلین ببم یان قیتاری ڤیێننا، چونکە من قەت سەفەری بیارتیزم نەکردووە، کەمێك لەم سەفەرە دەترسم. بە خۆت دەزانی من بە هەموو زمانێك قسان دەکەم جگە لە زمانانی بێگانە. کاتێ کە لە هەندەران بە زمانی ئەڵمانی یان فەرەنسی قسان دەکەم فەرمانبەر و تیمی ناو قیتارەکان پێم پێدەکەنن. بەڵام لە

پاریس دا، کە ئەم وێستگە و ئەو وێستکە دەکەم، وەکو ئەوە وایە، لە تاریکیدا چاوشارکێ بکەم".

حازر و ئامادە، لە هیچی کەم نەبوو تەنیا بیر لە خەرجی ڕێگاوبان بکاتەوە. چۆن تەگبیری خەرجی ئەم سەفەرە بکات، دوای هەندێ حیساب و کیتابی ورد، تاکی تەرازووەکە بەلای سەفەرەکەدا قورس بوو. پاداشتی نەورەس کە حاڵی حازر لێرە و لەوێ لە هەموو شوێنێکی ڕووسیا نمایش دەکرا، دەگەڵ ئەو سلفە و وامەی کە پێشوەختە لەسەر چیرۆکی "جووتیاران" وەری گرتبوو، بەشی مەسرەفی مانەوەی چەند مانگێکی لە فەڕەنسا دەکرد. کاتێ لە ١٨٩٧/٨/٣١دا لە میلیکۆڤۆ بە ڕێکەوت، وای هەست دەکرد نەك هەر لە هەراو هەنگامە و ژاوەژاوی ژیانی ڕۆژانە، بەڵکو لە نەخۆشییەکەشی دوور دەکەوێتەوە.

پەڕاوێز:

* "... ڤروڤسکی...": ئاماژەیە بۆ یارەکەی ئاناکارنینا کە پاش خۆکوژی دڵدارەکەی، داوای کرد بۆ شەڕی نێوان سڕبستان و عوسمانیان بڕوات.

"١٢"

## یاڵتا

چیخۆف لە نامەیەکیا (١٨٩٧/٩/٥) بۆ ماریای خوشکی دەڵێت: "سەفەرەکەم تا بەرلین زۆر خۆش بوو، تووشی کۆمەڵێك هاوسەفەری باش بووم. لەبەرلینەوە تا کۆڵۆن خەریك بوو لە دووکەڵی جگەرەی ئەڵمانیاندا دەخنکام. لە کۆڵۆنەوە تا پاریس خەوتم."

چیخۆف لە پاریس یەکسەر خانەوادەی سوڤورینی دۆزییەوە، چەند ڕۆژێك بەشەقام و بازاڕەکانی پاریسدا گێڕایان. بە جۆرێ بەسەر ماندوویەتی و نەخۆشیەکەیدا زاڵ بوو، کە توانی سەردانی کۆمەڵێك کابارێی مۆدی ڕۆژ بکات. ( لە کابارێی مولون ڕۆژدا*، سەمایەکی ڕۆژهەڵاتی بینی کە لەسەر ڕیتمی دایەرە زەنگی ئەنجام دەدرا). زۆر دوکان و فرۆشگایان گەڕا. (لە موغازەکانی لوڤەردا، شەمدانێك، دار عاسایەك، دوو بۆینباخ و کراسێکی کڕی.) پاش ئەوەی دانی بە جوانی و خۆشی شارەکەدا نا، سواری قیتاری باشوور بوو و بەرەو بیارتیز کەوتە ڕێ، کە سوبولفسکی لەوێندەر چاوەڕوانی بوو.

دوای ئەوەی لە ئوتێلی ڤیکتوریا جێگەی گرت. بەناو شار کەوت، کە چاوی بە بەنداوی کەنارەکان و، گەرماوە دەریاییەکان و جم و جوڵی خەڵکەکە کەوت، سەری لە زندوویەتی و ئاوەدانی شەقام و بەنداوەکان سووڕما. یەکەم کاری ئەوە بوو شەپقەیەکی پووشی کڕی تا لە تیشکی هەتاوەکەی بپارێزێت. کوشکێکی چکۆلەی لە زەل دروستکراوی لە قەراخەکەدا گرت، بۆخۆی لەوێندەروە پڕ بە چاوانی تەمەشای دیمەنی شەپۆلی کەفچەڕینی دەریای دەکرد. ئیدی کاتی خۆی یا بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە بەسەر دەبرد یان بە تەمەشاکردنی گەشتیارانی ئافرەتی جوانی، تەنك جل کە بە چەترێن ڕەنگاو ڕەنگەوە سەگەکانیان بەدوی خۆدا ڕادەکێشا و بە بەردەمی ئەودا ڕەت دەبوون، یان تەمەشای ئەو شایەرە گەڕۆکانەی دەکرد، کە بەدەم گیتار ژەنینەوە گۆرانیان دەگوت. هەر هەموو ئەم دیمەن و شتانە دەیانکردە کارێك خۆی گوتەنی وەها هەست بکات کە "سەدان هەزار قۆناغە ڕێ لە میلیکوڤو دوورە.". بێئەوەی بەقەد نووکە دەرزییەك هەست بە غەریبی بکات. حەزی نەدەکرد بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە. بۆ ئەوەی زیاتر فەرەنسا و فەرەنسیان بناسێت، لێبڕا لای کیژۆڵەیەکی نۆزدەساڵانی فەرەنسایی بەناوی مارگۆ، دەرسی زمانی فەرەنسی بخوێنێ. تەنیا کەسەری ئەوە بوو کە ڕووسێکی زۆر لە بیارتیز بوون. دوای دوو هەفتەیەك، هەوا گۆڕا، بوو بە باو بۆران، بەپەلە باروبنەی پێچایەوەو، بەعەوداڵی هەتاو بەرەو نیس ڕۆیی. لە نیس لە ڕووس پانسیون، ژمارە نۆ، شەقامی گونۆ هەواری خست. لەوێ خۆی لە نێو چل هاووڵاتی ڕووسدا دیتەوە، کە زۆریان نەخۆش بوون. ژوورکەی ئەو لە نهۆمی دووم بوو، ژوورێکی گەورە بوو، شانشین و بەربێلایی گەورەی هەبوو دەیڕوانیە باشوور، ناوەکەی کۆمبار کرابوو، تەختێکی "وەکو تەختەکەی کیلۆپاترای" تیا بوو، و تەوالێتی تایبەتی و ئەلاحەدەی هەبوو. ژنێکی ئاشپەزی ڕووسی لێبوو، کە خواردنی نیمچە ڕووسی و نیمچە فەرەنسی دروست

دەکرد، زۆربەی کات دەگەڵ سوپی کەلەرمدا ستیك و پەتاتەی سوورەوەکراوی لێدەنا. چیخۆف، بەچاوێکی تەنزئامێز دەیڕوانیە هاوسەفرەکانی. بێوەژنێکی ڕەزا قورسی لێبوو، کە لەکاتی دابەشکردنی خواردندا، زەق زەق دەیڕوانیە چیخۆف نەبا باشترین پلە گۆشت هەڵگرێت. پڕ بوو لە قەیرە کچانی ڕەنگ زەرد. ژنانی مێرد داری چەنەباز و هەرزە وێژ، کە چیخۆف وەکو بۆ سوڤورینی نووسی بوو، دەترسا ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو ئەوانی لێبێ.

هەر کاتێ توانیبای بەلەز دەچووە دەرێ، هەتاوی گەرم، گوڵ و باخچە، بنە خورماو دەریای مەنگ و شین، خاویان دەکردەوە، ختووکەی گیانی تەمەڵییان دەدا، بەناو گوڵگەشتی "باخچە" ئینگلیزان دەکەوت، دەگەڕا ماوەیەکی زۆر دەهات، دەچوو ئەوجا لە چاخانەیەکدا دەوەستا، یان ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، یان لە هەوای ئازادا گوێی لە کۆنسێرتان دەگرت، هەوڵی دەدا بیر لە هیچ شتێك نەکاتەوە، وێڕای ئەوەش سوور بوو لەسەر دەرسە فەرەنسیەکانی، فایدەی نەبوو. هەرچی دەکردو دەکۆشا، نەیدەتوانی بەڕەوانی بەم زمانە قسان بکات، بۆیە نەیتوانی ئاشنایەتی دەگەڵ خەڵکی ئێرەدا پەیدا بکات. بەڵام دۆستایەتی دەگەڵ چەند ڕووسێکی گەورەو ناودارا پەیدا بکات، لەوانە: مافناس و مێژوو نووس و کۆمەڵناس ماکسیم کوڤالڤسکی، کە دوای ئەوەی لەسەر بیرو بۆچوونی پێشکەوتوخوازانەی سیاسی لە زانستگەی مۆسکۆ دەرکرا بوو، هاتبووە فەرەنساو بوو بە پەناهەندە. ڤالرین یاکوبی ی نیگارکێش و شێوەکاری زۆر ڕەشبین، هەروەها جێگری کونسوڵی ڕووسیا، یوراسوف کە نەرمە پیاوێکی شەرمن بوو. ئیدی چیخۆف دەگەڵ ئەمانەدا قوماری دەکرد. دەچوو بۆ مەیخانەو باڕی گۆتێك بۆ خواردنی گوێچکە ماسی، یان بەمەبەستی سەرگەرمی دەچوو بۆ گازینۆی شارەوانی.

تەنانەت ئەم سووکە خۆشگوزەرانی و سەرگەرمیانەش، جۆرە پەشیمانیەکیان لە ناخیا دروست دەکرد. وێڕای ئەوەش مۆتیف و ئامیانی چیرۆکی لە دەفتەری سەرنجەکانیا تۆمار دەکرد، بەڵام زاتی نەدەکرد بیانکات بە چیرۆك و بیان نووسێتەوە. لە نامەیەکیا بۆ فیودور باتیشکوڤ، سەرنووسەری ڕووسی گۆڤاری (کۆسموپۆلین)ی چەند زمانە، دەڵێت: "زۆر بەخاوی دەنووسم. ئیشم لە بەر ناڕوات ، ئیشی نووسین لێرە قورسە، بە تایبەتی کاتێ لە ژووری ئوتێلێك بی و لەپشت مێزێکی غەریبەوە دابنیشیت، کە هەوا کەمێك خۆش دەبێ، کەڵکەڵەی چوونە دەرەوەت دەکەوێتە سەر." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٥/ك١/١٨٩٧) دەیگوت کارکردن لەو جۆرە کەش و هەوایەدا وەکو ئەوەیە لەسەر مەکینەی درومانی کەسێکی دی کار بکەیت. هەروەها گلەیی ئەوەشی دەکرد لە بەر خواردنی چەورو زۆر خۆری تووشی خەواڵویی بووە. وێڕای ئەوەش، هەر چۆنێ بوو، سێ چیرۆکی نووسی بە ناونیشانێن (بۆشناك، زاگە، لە گالیسکەدا) ئەم کارە زۆری ماندوو کرد، لەلای خۆیەوە بەکارێکی زۆر کەمی دەزانی، بە نەبەدڵی ناردنی بۆ (هەواڵێن ڕووسیا).

دوای ماوەیەکی کەم دیسان کەوتەوە خوێن هەڵێنان، وای دەنواند گوێی لەم مەسەلەیە نییە. لە نامەیەکیا بۆ هیلین شاڤروڤا دەڵێت: "جار جار خوێن هەڵدێنم، بەڵام ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە سەلامەتی و تەندروستیمەوە نیە، وەکو گوێرەکەی بێ جووت هەڵبەزو دابەزمە.. چەند خۆشحاڵم

تا ئێستا بێ جووتم، ژنم نەهێناوە. چ سەڵتەنەتێکە!" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٧/١٠/٢٩) وێڕای ئەوەش پزیشکەکان ئەمریان پێکرد کە بگوازێتەوە بۆ نهۆمی یەکەم تا بە قاڵارماندا سەرنەکەوێت. هەروەها تکایان لێکرد ئێواران زوو، بەر لەوەی دنیا تاریك بێت، بۆ پانسیونەکە بگەڕێتەوە. وێڕای سەرپەرشتی ئەوانیش، خوێنڕێژییەکەی، هەرچەندە لەچاو ئەوسای مۆسکۆدا کەمتر بوو بووەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوو. لە نامەیەکیا بۆ سوڤۆرین (١٦/ك١/١٨٩٧) دەڵێت: "دایمە وەکو ئەوەی دەستبەسەربم، لە ژوورەوەم. بەڕاستی ئەم ژیانی تەنیاییەم لاناخۆشە."

جا بۆ ئەوەی ئەم هەستی تەنیاییە لە خۆی بڕەوێنێتەوە کەوتە نامەو نامەکاری دەگەڵ ئەو دۆست و ئاشنایانەی کە لە ڕووسیادا بەجێی هێشتبوون. جار جار نامەی بۆ کەسوکارەکەی ،بۆ ئەوانەی کە لەدەستی وان هەڵاتبوو، دەنوسی و پرسیاری ئەوەی دەکرد بەبێ ئەو چۆن کاروباری خۆ لە میلیکۆڤو بەڕێوە دەبەن؟ ئایا ماری، کە ئەم وەکالەتی تەواوەتی داوەتێ، بەباشی وەکاڵەتەکەی بەڕێوە دەبات. ئەگەر پێویستی بەپارە بوو دەتوانێ داوای سلفەو وام لە ڕۆژنامەی "هزری ڕووسی" بکات، لە بیری نەچێت کە بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵەوە، ڕۆبڵێك بدات بە گاوانەکە، سێ ڕۆبڵ بە کەشیشی گوندەکە بدات، لە بیری نەچێت سوپاسی ئەو دراوسێیەیان بکات، کە هەندی خشتی بۆ بینای قوتابخانەکەی نوڤوسلکی دابین کردبوو. هەروەها بە باوکی ڕوحانی بڵێ کە چیخۆف زۆر خۆشحاڵ بووە بەوەی کە نوسخەیەکی "سەفەرنامەی" میلیکۆڤۆی پێ گەییوە.

جارێکی دی کەوتەوە نامە و نامەکاری "گاڵتە بە ڕاست" دەگەڵ لایکادا. لە نامەیەکیا بۆ لایکا گلەیی کردبوو کە گوایە لیڤیتان، داوای لە سێرگی موروزوف ملیونێر کردبوو، یارمەتی چیخۆف بدات، ئەویش بە ناوی دیاریەوە، بێئەوەی چیخۆف داوای کردبێ یان ئاگای لە هیچ بووبێ، دوو هەزار ڕۆبڵی بۆ ناردبوو. چیخۆف ئەمەی زۆر لەبەر گران دەبێت و لە نامەیەکیا بۆ لایکا گلەیی دەکات و دەڵێت: "من نە داوای ئەم پارەیەم کردووەو نە دەمەوێ. تکام لە لیڤیتان کردووە کە ڕیگەم بدات ئەو پارەیە بە شێوەیەك بۆ سیرگی بنرێمەوە کە دڵی کەس نەیەشێت و کەس زویر نەبێت. بەڵام لیڤیتان ڕازی نیە، بەڵام ڕازی بیت یان نا، من دوو هەفتەیەك، مانگیکی دی، ئەو پارەیە بە سوپاسنامەیەکەوە بۆ سێرگی موزوروف هەر دەنێرمەوە." (بڕوانە نامەی بە رواری ٢/ت٢/١٨٩٧) لە نامەی دواتریا بۆ لایگا زۆر دۆستانە لیی دەپرسێت کە ئیستا ماشقەی کێیەو دەگەڵ کێدا ئاشقێنی دەکات، ئایا ڕاستە بەتەمایە دوکان و فرۆشگای جل و بەرگی ژێرەوە بکاتەوەو دەڵێت: "من نامەوێ وەعزت دابدەم، بەڵام ئەوەندەت پیدەڵێم کار چەند لە سەرەتاوە بچووکیش بێت، لە ئایندەدا جۆرە خۆیبوونێکی دارایی و دڵنیایی دەروونی و ئاسوودەیی هزریت بۆ دابین دەکات." و بەڵێنی دابویە کە بچێتە دوکانەکەی و چاوبازی و ئاشقێنی دەگەڵ خەیات و شاگردە جوانەکانیا بکات.

سەبارەت بە لیدیا ئەڤیلوڤا، سەفەرەکەی چیخۆف کەم و زۆر ساردی نەکردەوە. سەرلە نوێ کەوتەوە نامەو نامەکاری لەگەڵیا، جارێکی دیکە، چەند چیرۆکێکی بۆ نارد، تا بیان خوێنێتەوەو ڕاو بۆچوونی خۆی لە بارەیانەوە دەربڕێت. لە یاداشتەکانی خۆیدا دەڵێت: "کە نامەم بۆ ئانتون

دەنووسی هەستم دەکرد بە تۆبزی خۆمی بەسەردا دەسەپێنم، بەڵام وێڕای ئەوەش نەمدەتوانی دەستبەرداری نامە نووسین ببم، چونکە ئەمە بۆ من وەکو خۆکوژی وابوو، نەمدەتوانی خۆ بکوژم." ( بڕوانە: لیدیا ئەڤیلوڤا، چیخۆف لە ژیانی منا: چیرۆکێکی ئاشقانە، پاچڤەی دیڤید مگرشك، لندن: جی لیمن، ١٩٥٠ ل١٢٤)

چیخۆف، بە نەبەدڵی، بەڵام وەکو هەمیشە، بە نەزاکەت و ئەدەبەوە، وەڵامێکی زیرەکانە، ئاوێتەیەك لە ستایش و ڕەخنەی دایەوە: "کەم ئەزمونی و بێ متمانەیی و تەمەڵی بە چیرۆکەکانتەوە، زەق و دیارە... تۆ خۆت بە ڕستەکانتەوە ماندوو ناکەیت، کە مەرجە ئەمە بکەیت. نهینی و ڕازی هونەر لە ڕستەدا پەنهانە." (بڕوانە نامەی ٣/ت١٨٩٧/٢). لیدیا لە نامەی دووەمیا (٦/ت١٨٩٧/١) گلەیی لە چیخۆف دەکات کە تەنیا لایەنی تاریکی ژیان لە چیرۆکەکانیا بەرجەستە دەکات، قارەمانەکانی هەموو خەمین و گۆنگ و ئاڵۆزن. چیخۆف وەڵامی دەداتەوە کە هەق بەوەو دەڵێت: "مخابن، ئەمە خەتای من نیە! نووسینەکانم، بەبێ ئەوەی خۆم بمەوێ واهی دەردەچن، کاتێ کە دەنووسم هەست بە ڕەشبینی ناکەم: کاتێ کە دەنووسم مجێزم خۆشە. دەڵێن خەڵکانی خەمین و خەمبار شتی شاد دەنووسن و خەڵکانی شاد و دڵخۆش، شتی خەمین دەنووسن من بەخۆت دەزانی پیاوێکی شادو دڵخۆشم، یان بەلای کەمەوە وەکو دەڵێن سی ساڵی یەکەمی ژیانم بەخۆشی و شادی بردووەتە سەر... تەندروستیم بەیانیان باشە، ئێواران باشترە، هیچ شتێك ناکەم، نەدەنووسم و نە ئارەزووی نووسینم هەیە، زۆر تەمەڵ بووم." (بڕوانە نامەی ١٨٩٧/١٠/٦).

یەکێك لەو هۆیانەی کە نەیدەیهێشت خەریکی کاری نووسین بێ، ئەوە بوو کە لەم ژینگە تازەیەدا هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبوو کە خەیاڵی بهاڕوژێنێ. بەڵام هۆی سەرەکیتر ئەمە بوو کە نەیدەتوانی خوێندنەوەو باری سەرنجە تایبەتیەکانی خۆی لە زەرفی شەو و ڕۆژێکا بە نووسین بسپێرێت و بیگۆڕێت بۆ ئەدەبیات، بێویستی بەوە بوو لە خەڵکی و دنیا دوور بکەوێتەوە، دەگەڵ خوێندنەوەو باری سەرنجەکانیا بژی، تا بتوانێ بیگۆریت بۆ ئەدەبیات و ئەم گۆڕانە سەیرەش کە کەرەستەو ڕەگەزێن خاو دەگۆریت بۆ تیمەو بابەتی چیرۆکڤانی، ڕەنگە مانگان و بگرە ساڵان بخایەنێ. کاتێ کە سەرنوسەری گۆڤاری "کوسموپولیز"ی چەند زمانەی ڕووسی داوای ، دەقێکی بڵاونەکراوەی لێکرد، کە لە ژیانی هەندەرانی خۆیەوە هەڵێنجرابێ، لە نامەیەکیا (١٥/ك١٨٩٧/١) وەڵامی دەداتەوە: "ناتوانم ئەو جۆرە چیرۆکە لە دەرێی ڕووسیادا بنووسم. تەنیا لەڕوسیاو بەپشتیوانی یادگەی خۆم دەتوانم ئەو جۆرە چیرۆکە بنووسم. من زیاتر لە بیرەوەرییەکانمەوە ئیلهام وەردەگرم، قەت ڕاستەوخۆ شتم لە سروشتەوە وەرنەگرتووە. پێویستم بەوەیە کەرەستەکان، باری سەرنجەکانم، لە یادگەما هەڵگرم، تا دەخەملێ و گەڵاڵە دەبێت، بێتە پاڵاوتن و تەنیا ئەو شتەی تیا دەمێنێ کە بایەخدارو نموونەیی بێ."

لە نیس دا، شارەکەی بەلاوە گرینگ نەبوو، بەڵام لە ڕادەبەدەر دڵبەندو شیفتەی خەڵکەکەی بوو، بەلای ئەوەوە خەڵکی فەرەنسی زۆر بە ئەدەب و ڕۆشنبیر، میهرەبان و هەقپەروەر بوون. لە نامەیەکیا (١٨٩٧/١٠/٢) بۆ ئیڤان چیخۆف دەڵێت: "لێرە سەگیش بۆنی مەدەنیەتی لێدێ." بە

سەرسوڕمانەوە باسی ئەوە دەکات کە کەشیشێکی دیتووە چۆن دەگەڵ کۆمەڵێك منداڵە مەکتەبلیاندا لە جادەدا تۆپێنی کردووە. باسی ئەوە دەکات کە ئەو کارەکەرەی لە پانسیونەکەدا خزمەتی کردووەو لە ژورەکەی ئەو بەرپرسیار بووە، وێڕای هەموو ماندوویەتیەکی خۆی چۆن وەکو دۆتمیرێك بە ڕوویا پێکەنیوەو بە ڕووخۆشی ڕەفتاری دەگەڵ کردووە. باسی ئەوە دەکات ئەوەی لێرە دڵخۆش دەکات و ورە بەرز دەکاتەوە، هەموان لە دوکانا، لە قیتارا ڕۆژباش دەگەڵ یەکدیدا دەکەن، ئەگەر دەگەڵ سواڵکەریشدا قسان بکەن بە مسیۆ یان مەدام ناوی دەبەن.

بە بۆچوونی چیخۆف فەرەنسا لە ڕیزی پێشەوەی وڵاتانی دیکەدا بوو و نوێنەرایەتی شێوازی شارستانیەتی ئەورووپای دەکرد. کاتێ کە ژمارەیەك لە ڕۆژنامەو بڵاڤۆکان دووبارە "دۆزی دریڤوس"یان هێنایەوە گۆڕێ، هێندەی دی ئەو بۆچوونەی لەلا چەسپی. ئایا دەشیا مولازم ئالفرید دریفوس، کە لەساڵی ١٨٩٤دا، بە تۆمەتی سیخوڕی بۆ ئەڵمان. دادگایی سوپایی کرا بوو لە دوڕگەی ئەهریمەندا* حوکمی ئەبەدی درا بوو، بێتاوان بی؟ ئایا قوربانی بیرو هزری کوێرانەی دژە جولەکە نەبوو، کە ئەو کاتانە لە ڕیزی سەرکردایەتی سوپادا، باوی بوو؟ ئایا خەتاباری ڕاستەقینە سەرگورد سترازی نەبوو، کە برایەکەی دریفوس، تازە گەیی بووە قەناعەت تاوانباری ڕاستەقینە ئەوەو مەحکوومی کرد بوو؟

چیخۆف کە دەیزانی ویژدان و تێکڕای یەکپارچەیی وڵات لە مەترسیدایە، زۆر بە تاسەوە پەیگیری پێچ و پەنای قسەو باس و هەواڵەکانی دەکرد. لە نامەیەکیا بۆ سوبولفسکی (١٨٩٧/١٢/٤) دەڵێت: "بە درێژایی ڕۆژ مژوولی خوێندنەوەی ڕۆژنامان بووم، مژوولی خوێندنەوەی "دۆزەکەی دریڤوس" بووم. بە بۆچوونی من دریفوس بێتاوانە."

دوای مانگێك، لە ١٨٩٨/١/١٢دا (من متهم می کنم)ی زۆلای خوێندەوە کە نامەیەکی کراوە بوو بۆ سەرۆك کۆمارو، حکومەتی تۆمەتبار دەکرد کە هەوڵی شاردنەوەو پەردە پۆشکردنی حەقیقەتی داوە. چیخۆف، بەخوێندنەوەی ئەم نامە کراوەیەی زۆلا، زۆر هاڕوژاو هاتە جۆش، نامەیەکی بۆ سوڤورین نارد کە: "دۆزی دریفوس، دەنگی داوەتەوەو ڕێگەی خۆی گرتووە، بەڵام هێشتا بەخێرایی تەواو ناڕوات. زۆلا کەسێکی ئابڕوومەندە... بە ڕاستی کەوتوومەتە ژێر کاریگەری ئەو: فەرەنسا وڵاتێکی سەیرە، پڕە لە نووسەرێن ئازاو کەم وێنە." (بڕوانە نامەی ١٨٩٨/١/٤). هەروەها لە نامەیەکیا بۆ پاتیوشکوف دەڵێت: "زۆربەی هەرە زۆری چینی ڕۆشنبیران لایەنگری زۆلان و باوەڕیان وایە دریفوس بێتاوانە. زۆلا هەنگاوی خێرای بۆ پێشەوە ناوە، ناڕەزایی نامەکانی وەکو شنەبایەکی تازەن و، هەر فەرەنسیەك بگری، هەست دەکات کە لەم دەڤەرەدا عەدالەت هەیەو ئەگەر مرۆڤێکی بێتاوان، تۆمەتبار بکرێت، خەڵکانێك هەن داکۆکی لێبکەن." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٨/١/٢٣).

لە شوباتی هەمان ساڵدا، زۆلاش هێنرایە پای مێزی دادگا، سەرەنجام حوکمی یەك ساڵ زندانیان بەسەردا داو ناوی لە لیستی (لیژیون د/ئور)* سڕییەوە. بەڵام تا زیاتر هێرشی دەکرایە سەر ، چیخۆف پتر ستایشی دەکردو شیفتەی دەبوو. هەواڵی ڕۆژنامەکانی بە هەمان گەرم و گوڕی هەر هاوڵاتییەکی فەرەنساییەوە دەخوێندەوە. لە نامەیەکیا بۆ دۆستێکی هونەرمەند بە

ناوی ئەلکساندرا خۆتیانیستوڤا دەڵێت: "لە من دەپرسیت ئایا هێشتا باوەڕم وایە کە هەق بەزۆلایە. جا با من لە تۆ بپرسم ئایا تەسەورێکی ئەوەندە نادروستت دەربارەی من هەیە کە گومانی ئەوەم لێبکەیت، بۆ تاقە ساتێکیش لە پشتیوانی ئەو پیاوە سارد ببمەوەو گومان لە هەقانیەتی بکەم. نینۆکیکی ئەو نادەم بە هەموو ئەو تیمسارو ئەفسەرە گەورەو شایەدە نەجیبانەی! کە حاڵی حازر ڕایانکێشاوەتە پای دادگا." (بڕوانە نامەی ١٨٩٨/٢/٩) ئەگەر بە حەزی چیخۆف بوایە، حەزی دەکرد هەموو دۆستانی ڕووسی خۆی، وا لێبکات وەکو ئەو پشتیوانی لە دریڤوس بکەن. بەڵام گلەیی لە هەڵوێستی بەڕێزترین دۆستی خۆی، واتە لە سوڤورین هەبوو کە لە بلاوکراوەکەی خۆیدا (ڕۆژگاری نوی) کەوتبووە دژایەتی دریڤۆس چیخۆف، بەو نیازەی کە ئەو هەڵوێستەی پێبگۆڕێت، نامەیەکی دوورو درێژی بۆ نووسی، بریتی بوو لە بەرگرینامەیەکی یاسایی، داکۆکییەکی پڕ جۆش و خرۆش، داوای هەڵوێستی ڕاستگۆیانەی ڕۆشنبیری، دەڵێت: "دەنووسیت کە لە زۆلا توڕەیت، لە کاتێکا لێرە هەموو کەسیك وا هەست دەکات زۆلایەکی تازەو باشتر لەدایك بووە. دادگایی کردنەکەی وەکو چۆن تورپنتین بچووکترین پەڵەی چەوری لادەبات، بەو ئاوایە پاکی کردووەتەوە. ئێستا لە چاوی فەرەنسیەکاندا، وەکو هەتاوی ڕاستی، دەدرەوشێتەوە. کەس گومانی لەم هەموو پاکی و ڕەوشت بەرزییەی ئەو نیە." لە درێژەی نامەکەیدا، هەندی خاوی دەکاتەوە و نەرمتر دەدوێ، لە لایەکەوە گلەیی لە بڵاوکراوانی ڕاستگەرا دەکردو بەوە تاوانباری دەکردن کە ئاگری دژایەتی جولەکە خۆش دەکەن تا حەقیقەت لە خەڵکی وەشێرن و لەلایەکی ترەوە، ئافەرین و شاباشی زۆلای دەکرد کە خۆی خستووەتە ئەم گێژاوەوە تا هەڵەیەکی زەق و دزێوی یاسایی بسڕێتەوە. دەڵێت: "گرینگ ئەوەیە کە زۆلا پیاوێکە ڕاستگۆ، یانی داوەریەکانی تەنیا لەسەر بناغەی ئەو شتە ڕۆدەنێ کە دەتوانێ ببینێ، وەکو خەڵکانی دی لە سەر بناغەی وەهم و خەیاڵ ڕۆی نانێت. هەڵبەتە دەشێت خەڵکانی سەر ڕاست و ڕاستگۆش هەڵە بکەن (ئەمە گوتنی ناوێ) بەڵام هەڵەی ئەوان، کەم زیانترە، لە بڕیاری نادڵسۆزانەی زادەی داوەریانی پێشوەختە و فاکتەرو هاندەرێن سیاسی. گریمان دریفوس گوناهبارە، ئەوجاش هەق بە زۆلایە، چونکە کاری نووسەر تاوانبارکردن و تاقیبکردنی کەس نیە، بەڵکو پشتیوانی و لایەنگریە لەو کەسە – با گوناهباریش بێ. هەرکە تاوانبار، گوناحەکەی لەسەر ساغ بووەوە، یان سزا درا، هەنگێ نووسەر ئەرکی خۆی ئەنجام دەدات. ڕەنگە خەڵکی بپرسن سیاسەت و بەرژەوەندی وڵات چی بەسەر دێ؟" بەڵام نووسەران و هونەرمەندانی گەورە، دەبێ ئەوەندە سەرو ساخت دەگەڵ سیاسەتدا پەیدا بکەن کە بتوانن خۆیانی لێ دوور بگرن." (بڕانە نامەی ١٨٩٨/٢/٢٦). چیخۆف، بەشێوەیەکی گشتی، زۆلای بە نموونەی پیاوی ئازادو لیبڕاڵ دەزانی، پیاویك کە پابەندی دڵی خۆیەتی. چیخۆف هەقی بە نووسەر دەدا کە وابەستەی هیچ حیزبێك نەبیت – بە حوکمی ویژدان هێرشی دەکردە سەر هەردوو چەپ و ڕاست. کاتێ کە شەڕی (ڕۆژگاری نوێ) دژی دریڤوس و زۆلا، وەکو خۆی بەردەوام بوو، چیخۆف هۆی ئەمەی دەگەڕانەوە بۆ بێ توانایی و بێ دەسەڵاتی سوڤورین لە هەنبەر ئەو گوشارەی کە هاوڕێ سیاسەتوانەکانی دەیانخستە سەری. لە نامەیەکیا بۆ لیونتیف

—شچگلوف دەڵێت: "من سوڤورینم زۆر خۆش دەوێ، زۆر زۆر، بەڵام خەڵکانی لاواز لەگینە، وەکو خوێڕیترین خەڵك ڕەفتار بکەن و لە هەستیارترین و ترسناکترین و تەنگانەترین ساتی ژیاندا وابکەن." لێبڕا، دەستبەرداری شەڕە قەڵەم دەگەڵ سوڤورین دا ببێت، هەنگێ نامەیەکی بۆ ئەلکساندری برای نووسی کە: "ڕۆژگاری نوێ، سەبارەت بە دۆزی دریڤوس، هەڵوێستی زۆر ناشرینە. من و پیرەمێرد لە ڕێگەی نامەوە، بەنامە گەنگەشەی (هەڵبەتە بە زمانێکی نەرم) ئەو بابەتەمان کردووەو هەردووکمان بێدەنگیمان هەڵبـژاردووە. من ئیدی نامەوێ نە نامەی بۆ بنووسم نە نامەم بۆ بنووسێت، کە هەوڵدەدات نەزانی خۆی لە بواری بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەدا گوایە بە ئەشق و خۆشەویستی سوپا ، پەردەپۆش بکات." (بڕوانە نامەی ١٨٩٨/٢/٢٣). هەرچەندە زۆر پەست بوو بوو، بەڵام قەت بیری لەوە نەدەکردەوە کە پەیوەندی خۆی دەگەڵ سوڤوریندا بېڕێت پێشتریش هەندێ ناکۆکی و دڕدۆنگیان کەوتبووە نێوان، بەڵام کە کار لە مریشکە ڕەشەو دابڕانی یەکجارەکی نزیك دەبووەوە، چیخۆف کە بە تەبیعەت کەسیکی بەگوزەشت بوو، فریا دەکەوت و شەڕەکەی بە نەرمی دەکوژاندەوە. بەڵام ئەمجارەیان دوو دڵی وەلاوە نابوو، هیچ کاتێ نەیتوانی هەستی حورمەت ئامێزی خۆی دەرهەق بەم پیاوە بە تەواوەتی وە دەست بێنێتەوە. هەڵبەتە دۆستایەتیەکەیان بەردەوام بوو، بەڵام زیاتر ڕواڵەتی بوو تا گیانی بە گیانی.

هەرچەندە هەواڵی ڕۆژنامەکان، چیخۆفیان شپرزە دەکردو ناخیان دە هەژاند، بەڵام مانەوەی لە پانسیون ڕووسدا، جۆرە ئارامی و ئاسوودەییەکیان پێدەبەخشی، هەندێجار وای هەست دەکرد کە بابایەکی فەرەنسی خانەنشینەو ئێسقانەکانی دەداتە بەر هەتاو. تاقە شتێك کە ئەو ئارامیەی شێواند، دان یەشەیەکی بە ئازار بوو، کە ناچار بوو عەمەلیاتی بکات. بەڵام خوێن هەڵهینانەکەی وەستابوو. تەنانەت بە نیاز بوو دەگەڵ کوڤولفسکی دا سەفەری باکووری ئەفریقا (جەزایر، تونس و چەند وڵاتێکی دیکە) بکات. کاتێ کوڤولفسکی لەدوا ساتدا بە هۆی نەخۆش کەوتنەوە، لەو سەفەرە ژێوان بووەوە، چیخۆف زۆری پیناخۆش بوو، هەمان هەستی خانەنشینی بەسەریا زاڵ بووەوە، وای هەست دەکرد لە تەمەنی، خۆی گوتەنی هەشتاو نۆساڵیدایە نەك سی و هەشت ساڵی.

خۆشبەختانە لە ٣/٢/دا پوتاپنکو گەییە نیس و لە پانسیون ڕووس هەواری خست. کەش و هەوای ئارامی پانسیونەکە شۆکی کرد. پوتاپنکو، کابرایەکی قوماربازی سەرکێس بوو، بۆ قومار هاتبوو، لە ڕۆڵێتی مونتکارلۆ یەك ملیۆن فرانکی بردبووەوە. ئیدی دەیتوانی بەکەیفی خۆی بنووسێت و بەرهەم چاپ بکات، بێئەوەی ناچار بێت داوای وام و سلفە لە وەشانکاران بکات. دوای ماوەیەکی کەم چیخۆفیش کەوتە سەر هەمان کەڵکەڵەی منداڵانەو خولیای ئەگەری ئەوەی کە ئەویش لە قومارخانەی ناوبراوا، پارەیەك کۆبکاتەوە، بەڵام لێبڕا تەنیا یاری مسۆگەر بکات و هیچ ڕیسکێك نەکات. بەجووتە دەزگایەکی ڕۆڵێتی چکۆلەیان کڕی، لە پانسیۆنەکەدا، دەرگایان لە سەرخۆ دادەخست و بە سەعاتان مەشقیان دەکرد، تۆپە عاجیەکەیان وەردەچەرخاند و ژمارەکانیان، لە دەفتەرێکی چکۆلەی بەر باخەڵدا تۆمار دەکرد تا بەخەیاڵی خۆیان، شێوازێکی

زۆر باشی بردنەوەی مسۆگەر بدۆزنەوە. هەموو ڕۆژێ دەچوون بۆ مونتکارلۆ تا بەختی خۆیان تاقیبکەنەوە. پوتاپنکو کە تەبیعەتیکی سەرکێشانەی هەبوو، بۆ هەر ژمارەیەك پارەیەکی زۆری دادەنا، چیخۆف ئارامترو بەپارێزتر بوو، زۆر بە پارێزەوەگرەوی دەکرد و پارەیەکی کەمی دادەنا. بەڵام وێڕای ئەمەش هەورازو نشێوی بەخت و یەغباڵ، مێسکی ماندوو دەکرد. کە لە قومارخانەکە دەگەڕایەوەو دەگەیشتەوە پانسیۆنەکە، ئەوەندە شەکەت بوو لە تۆ وایە لە مەیدانی شەڕ هاتووەتەوە. دوای دوو هەفتە ئەوجا هەستی کرد، ئەم قومارخانەیە زیانێکی زۆر بە تەندروستی دەگەیەنێت، بۆیە لێبڕا کە چیتر هاتوچۆی ئەوێندەر نەکات، بەڵام پوتاپنکۆ، دەستبەردار نەبوو تا هەموو شتێکی لە دەست داو دۆڕاند، بە ڕادەیەك لات بوو، کە پارەی گەڕانەوەی بۆ ڕووسیا پێ نەما، لە چیخۆڤ قەرز کردو لە ٣/٢٨دا بەرەو ڕووسیا گەڕایەوە، چیخۆف لە هەمان ڕۆژدا نامەیەك بۆ ماری خوشکی دەنێرێت کە: "بی پوتاپنکۆییم پێوە دیارە، بیری دەکەم."

لەم بەینەدا، جوزیف برازی نیگارکێش، لە سەر داوای پاڤل ترتیاکۆڤ کە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو وهیوایەتی کۆکردنەوەی تابلۆ و پورترێتان بوو، هاتبوو بۆ نیس تا وێنەیەکی چیخۆف بکێشێت. ئیدی چیخۆف، بۆ ماوەی دوو هەفتە بەیانیان بە ناچاری لە بەردەم نیگارکێشی ناڤبریدا دادەنیشت، بە ڕاستی ئەمە ئەشکەنجەیەك بوو، هێندەی دی باری تەندروستی قورس دەکرد. هەڵبەتە کە وێنەکەش* تەواو بوو. بەدڵی نەبوو. لە نامەیەکیا (١٨٩٨/٣/٢٣) بۆ ئەلکساندر کوتیانتزیڤا، دەڵێت: "لە سەر کورسیەك دانیشتووم پشتەکەی مەخمەلێکی سەوزە، ڕوو بەڕوو... بوینباخێکی سپیم لە ملە دەڵێن بەو بوینباخەوە زۆر گەش دیارم، بەڵام من دەڵێم دەموچاوم لەوە دەچێ تازە چنگێ بڕنوتیم هەڵمژی بی..." لە ( ١٨٩٨/٣/٢٨)دا، بۆ ماریای خوشکی دەنووسێت کە: "لەم تابلۆیەدا شتیك هەیە کە لە مندا نیە و لە مندا شتێك هەیە کە لە تابلۆکەدا نیە." پێی وابوو تابلۆکە زیاتر لە وێنەی فۆتۆگرافێ دەچێت. لە هەمان نامەدا بە سوعبەتەوە بەماری خوشکی دەڵێت: "ئەگەر ڕەشبین بوویم و دەستم دابێتە نووسینی چیرۆکین خەمناك. ئەوا خەتای ئەم تابلۆیەیە کە بۆیان کێشاوم."

لە گەڵ نزیکبوونەوەی بەهارا هەستی دەکرد پێویستی بەوەیە بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە، زۆر بیری ڕووسیا، میلیکۆڤۆی دەکرد، خەوی بە میلیکوڤۆوە دەبینی، پرسیاری لە ماریا دەکرد، وەزعی سەهۆڵبەندان و توانەوەی بەفری ئەوەێندەر لە چدایە. لە ئێستاوە ئامۆژگاری دەکرد، چۆن خزمەتی باخەکە بکات: "گوڵەباخەکان پەرچ مەکە تا خۆم دەگەڕێمەوە. تەنیا ئەو چڵانە ببڕەوە کە لە زستاندا وشك بوون یان زۆر نەخۆشن، بەڵام وریابە هەندێجار چڵە نەخۆشەکانیش چاك دەبنەوەو لە ڕەگەوە هەڵدەدەنەوەو دەژێنەوە. دار میوەکان پێویستیان بە پەینە. پەین بکەنە ژێر دار گێلاسەکان." ( بڕوانە نامەی ١٨٩٨/٤/١).

کە ماریا وەڵامی دایەوە کە هەوای میلیکۆڤۆ، هێشتا بۆ ئەو ساردە، لێبڕا سەفەری پاریس بکات و لەوێ چاوەڕوان بکات تا تەشقی سەرمای ڕووسیا دەشکێ. بە هەفتەیەك دوای ئەوەی گەییە ئەوێ، سوڤورینش پەیدا بوو. بەیەکدی شادبوونەوە، هەرچەندە لە دڵا کەمێك سارد بوون،

بەڵام لە یەکدی زویر نەبوون. چیخۆف لە ئوتێل دیژون دابەزی بوو، قاییل بوو بگوازرێتەوە بۆ لای سوڤورین، کە لە ئوتێل ڤاندۆم لای دابوو. جا چونکە باری تەندروستی کەمیك باش بوو بوو چووە تەمەشای چەند شانۆنامەیەك و کۆمەڵێك پێشانگای شێوەکاری، سەردانی ڤێرسای کرد، سەری رووسانی ئاکنجی ئەوێی دا، دیدەنی ماتیۆی برای ئالفرید دریڤوسی کرد، هەروەها سەردانی برنا لازاری رۆژنامەنووسی داشداری دریڤۆسی کرد، کە ئەویش نوسخەیەکی لە نامیلکەکەی خۆی دەربارەی ئەو دۆزە پێشکەش بە چیخۆف کرد.

چیخۆف، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لە نیس بوو، هەمیشە لە خەمی شاری تاگانرۆکی زاگەی خۆیدا بوو، لەوێ سێ سەد کتێبی کلاسیکی کڕی بوو وبە کەشتی ناردبویەوە بۆ کتێبخانەی گشتی شارەوانی تاگانرۆگ . لە پاریسدا، دۆسیەیەکی تێروتەسەلی دەربارەی دۆزی دریڤوس کۆکردبووەوە تا ئەویش بۆ هەمان کتێبخانەی تاگانرۆگ بنێرێت. دوای ئەوەی مارك ئەنتوکولسکی پەیکەرسازی رووسی ناسی، هانی دا کە پەیکەرێکی پتروسی گەورە ،دامەزرێنەری تاگانرۆك پێشکەش بەو شارە بکات.

وێڕای ئەم هەموو سەرقاڵیەش، بە نیگەرانیەوە چاوەڕوانی بروسکەی ماری بوو، کە لە ئاووهەوای رووسیا ئاگاداری بکاتەوە، تا بۆ وڵات بگەڕێتەوە. بە تایبەتی کە ئاو وهەوای پاریس بەرەو ساردی و تەڕوو تووشی دەچوو. ئاقیبەت، دوای چاوەڕوانیەکی زۆر، بروسکەی گۆرین گەیی: کەش و هەوای میلیکۆڤۆ خۆشە، رێگاو بانەکان، بەکەڵکی پیاسەو گەران دێن. چیخۆف لە ١٨٩٨/٤/٢٨دا نامەیەکی بۆ ئەلکساندری برای نووسی کە: "پێڵاوەکانت جوان بۆیاخ بکە، جلیکی رێك و پیك لەبەر بکەو وەرە بۆ پێشوازیم و لەوێستگەکە چاوەڕوانم بکە. جا لەبەر ئەوەی خزمی بابایەکی دەوڵەمەندم، پێموایە هەقی ئەمجۆرە داوایەم هەیە. هەواڵی گەڕانەوەکەم بەکەس مەڵێ." لە ١٨٩٨/٥/٢دا بە تەنیا سواری قیتاری لەزی باکوور بوو و بەرەو سان —پترسبۆرگ گەڕایەوە. لە ١٨٩٨/٥/٥دا لە میلیکۆڤۆ بوو. باوکی لە دەفتەری یاداشتەکانیا ئەمەی نووسیوە: "ئانوشا، لە فەرەنسا گەڕایەوە، دیارییەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێناوە." دایکی لە نامەیەکیا بۆ میخائیل نووسیویەتی: "سەعات پێنجی ئێواریێ گەیشتەوە، زۆر لاواز بووە."

هێشتا بە تەواوەتی نەحەسابووەوە، کە نامەیەکی لە فلادیمیر نەمیروفیچ —دانچنکۆوە پێ گەیی، داوای دەکرد رێی بدات شانۆنامەی نەورەس دەربێنێ و پێشکەشی بکات. دانچنکۆ، برادەری کۆن و نووسەرو مامۆستای هونەری دراما بوو. تازە دەگەڵ ستانسلافسکی دەرهێنەرو ئەکتەردا رێك کەوتبوو شتیك لە بواری شانۆی میللیدا دابمەزرێنن کە دوای ماوەیەکی کەم ناویان نا، شانۆی هونەری مۆسکۆ. تیپی نواندنەکەیان بریتی بوو لە گەنجانی ناشی و نا پیشەیی تیپەکەی ستانسلاڤسکی و خوێندکارە گەنجەکانی دانچنکو. ئەو ئەکتەرە تازانە، زۆر بەجۆش و خرۆش بوون، دەیانویست لە پرۆڤەی قورس و رۆتینی رۆژانەی باو یاخی بن و شێوازێکی سادەو ساکارانە لە دنیای شانۆدا دابهێنن و بگرنە بەر. دانچنکۆ، لێبڕابوو، نەورەس بەو نەفەسە تازەیەوە پێشکەش بکات و هەر لە هەوەڵیشەوە نەورەسی بە دەقیکی شانۆیی سەرکەوتوو دەزانی و بەلایەوە پر بەپێستی ئەم رەوتە تازەیە بوو، بەڵام چیخۆف نەیدەتوانی ئەو

شکستە نەنگینە فەرامۆش بکات کە پار، لە سان–پترسبۆرگ، ڕوو بە ڕووی ئەم شانۆنامەیە بوو بوو. چیخۆف لە نیسەوە، نامەیەکی بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە نووسی بوو کە: "جاران خۆشترین شوێن بەلای منەوە شانۆ بوو، بەڵام ئێستا کە دەچم بۆ شانۆ، هەمیشە وا هەستدەکەم، یەکێك لە باڵکۆنەکەدا خۆی مەڵاس داوەو هاکا هاواری کرد "ئاگرا!" ئەکتەرەکانم خۆش ناوێن. بە ڕاستی شانۆنامەنووسی، هەموو شتێکی لە بەرچاوم خستووە، ورەی ڕوخاندووم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٨/٣/١٣).

بۆیە لە ترسی ئەوەی نەبا ئەو حاڵەتە دووبارە ببێتەوە، هەر بۆ ئاسوودەیی خۆی پێشنیازەکەی دانچنکۆی ڕەت کردەوە. پیی وابوو چیرۆك ئاسوودەییان پێدەبەخشی و شانۆنامە نیگەرانی و دڵەڕاوکەیان بۆ دروستدەکرد، یانی وای لێهاتبوو شانۆنامەی بەجۆرە ڕیسکێك دەزانی .چونکە دەگەڵ گۆشەگیری و تەنیایی خۆیداو، دەگەڵ کڕی و کپی و بێدەنگی ژووری کارەکەیدا ڕاهاتبوو، حەزی نەدەکرد جارێکی دیکە بگەڕێتەوە ناو جیهانی مـن منـۆکیٚ ی ئەکتەران و، فەندەدەڵ فێڵی پشت پەردان و مجێزی کەیفی گۆنگ و پێشبینی نەکراوی تەمەشاڤانان. بەڵام دانچنکۆ، هەر کۆڵی نەداو، هێندە بە دەوری چیخۆفدا هات و هێندەی هان دا، تا ئەنجام هیچ چارێکی نەماو ملی دایە خەت.

جا دانچنکۆ، دوای ڕەزامەندی چیخۆف، دەبوایە ستانسلافسکیش بێنێتە ڕەدا، کە دەترسا شانۆنامەکە بۆ (نمایش کردن دەست نەدا) بۆیە لە ١٨٩٨/٦/٢١دا نامەیەکی بۆ ستانسلافسکی نارد کە: "ئەم بەرهەمەی چیخۆف ژیانی مۆدێرنی ڕووسیای لە خۆدا هەڵگرتووە، بە ژیانی مۆدێرنی ڕووسیا بارگاویە، بۆیە بەلامەوە زۆر جوانەو سوورم لەسەر نمایش کردنی." هەڵبەتە ئەو ئەکتەرە گەنجانەی کە بە مەبەستی پرۆڤە لە مەزراو مولکێکی دەرێی مۆسکۆدا کۆبووبوونەوە زۆر دوو دڵ بوون لەوەی بتوانن، لە شانۆنامەیەکی وا قورسدا سەرکەوتن بەدەست بێنن، چونکە کاتیٚ یەکەمجار لە سان –پترسبۆرگدا، پێشکەش کرابوو، ئەکتەرانی کارامەو پڕ ئەزموون بەشدارییان تیا کردبوو، تەمەشاڤانان، بە هۆیهاو فیکە کێشان پێشوازیان کردبوو. بۆیە دەبوایە دەرهێنەر، دەسکارییەکی ئەوتۆی تیا بکات، کە ئەکتەرەکان متمانە بەخۆ پەیدا بکەن.

لە کاتێکا ئەوان لای خۆیانەوە هەوڵیان دەدا ڕازی کاراکتەرانی نەورەس هەڵبێنن، چیخۆف، لە میلیکوڤۆدا، بێخەم و خەیاڵ سەرگەرم و مژوولی کار بوو. وای هەست دەکرد تەندروستی زۆر لە جاران باشترە، بێئەوەی گوی بە قسەو ئامۆژگاری پزیشکان بدات، بە هەمان تین و گوڕی جارانەوە کاری دەکرد. ئەوە بوو نامەیەکی (١٨٩٨/٥/١٧) بۆ قەشە باشی سێرگی بترۆڤ کە یەکێك بوو لە دۆستانی دێرینی بنەماڵەکەیان، نارد کە: "وەکو ئاگادارم کردبوویت، نەخۆش بووم، تەنانەت ماوەیەکیش لە نەخۆشخانە کەوتم، دیار بوو تووشی سیل و دەردەباریکە بوو بووم... بەڵام ئێستا هەموو شتێك بە دڵی دۆستە، تەندروستیم زۆرباشە، یانی هەست ناکەم نەخۆشم، وەکو جاران دەژیم. خەریکی پزیشکی و ئەدەبیاتم، جووتیاران تیمار دەکەم، چیرۆکان دەنووسم، هەمو ساڵێك شتێکی تازە بینا دەکەم.".

پێوە بوو ئەمجارە، لە گوندەکەی خۆیدا، لە میلیکۆڤۆ قوتابخانەیەك دروست بکات. جا چونکە منداڵێکی زۆر چاوەڕوانی ناونووسی بوون، هەستا بە شێوەیەکی کاتی، کوخێکی بەکرێ گرت، دەستێکی پێدا هێنا، چەند ڕحلە و مێزێکی کڕی و مامۆستایەکی بەکرێ گرت. چەند هەفتەیەك دوای گەڕانەوە بۆ میلیکۆڤۆ، نامەیەکی پڕ شانازی بۆ ڤیکتۆر گولتیف، سەرنووسەری گۆڤاری (هزری ڕووسی) نارد کە: "مەکینەکەم، کەوتووەتەوە کار." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٨/٦/٦) وێـڕای زۆری میـوان، ئـەو هاوینــە کـارێکی زۆری کــرد، بــە ســوود وەرگــرتن لــەو تێبــینی و سەرقەڵەمانەی لە دەفتەرچەی یاداشتەکانیا تۆماری کردبوون ، چوار چیرۆکی دوابە دوای یەکی نووسی: (ئیونیچ، پیاوێك لـە پاکـەتا، ئـەنگوری فـەڕەنگی، دەربـارەی ڤیـان) شوێن لـە دوا سـێ چیرۆکیاندا هـەمان شـوێن و دیکـۆرە، لـە هەرسـێکیاندا هـەمان دوو قارەمـان: مامۆسـتا بـورکین و ئیڤان ئیڤانیچ، دووبـارە دەبنـەوە. چیخۆف دەمـێ بـوو بـیری لـەوە دەکـردەوە، زنجیرە چیرۆکێك بنووسێت، لە ڕووی شوێن و قارەمانەوە بە ڕادەیەك هاوبەش بن، کە ئەگەر ڕۆمانێکی یەکپارچەی یـەکگرتووش پێـك نـەهێنن، بـەلای کەمـەوە کـۆ حیکایـەتێك پێـك بهێـنن کـە لـە یـەك سەرچـاوەوە هەڵێنجرابن. بەڵام ئەم پرۆژەیەشی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ئەم ئەزموونـە لـە سنووری ئـەو سـێ چیرۆکە هێـوەتر نـەڕۆیی. لـەوە نەدەچـوو بتوانێـت، بـە نەفەسـێکی درێـژی ڕۆمانەوانیـەوە، مامەڵە دەگەڵ ڕووداو و قارەمانـەکانیا بکات، ئەگەرچی لـە چیرۆکە کورت و مامناوەندییـەکانیا، ئەم کارە لە دەستیا وەکو مێوو ڕۆن وابوو. چونکە لە درێژدادڕی و چەنەبازی دەترسا، بۆیـە زۆر بە خێرایی دەچووە سەر نیوەڕۆك و کاکڵەی بابەتەکانی و بەپوختـەیی لـە قاڵبی چیرۆکی کورتـدا دەی هونەرانـدن و دەیبڕانـدەوە. هەرچـەندە ستایشـی هەنـدێ کـاری تایبـەتی سـەنگینی دەکـرد، بەڵام لە هونەردا زیاتر بەلای شێوازی تەکنیکی سووك و ئاساندا دایدەکێشا.

دوای جۆش و خرۆشێکی داهێنەرانە، لە ناکاوا، بەرە بەرە خا بووەوە. سـەیر دەکـەین لـە ئـاخر و ئۆخری تـەموزا، لـە نامەیـەکیا بـۆ لیـدیا ئـەڤیلوڤا (٢٣/ یـان ١٨٩٨/٧/٢٧) بـەمجۆرە دەکەوێتـە گلەیی و سکاڵا: "میوانم ئەوەندە زۆرن، کە فریا ناکـەوم وەڵـامی دواهـەمین نامـەت بدەمـەوە. حـەز دەکەم بە دووورودرێژی وەڵامت بدەمەوە، بەڵام چونکە لەگینـە هـەر سـاتێ کەسـێك خـۆی بـە ژوورا بکات و زنجیرەی بیرکردنـەوەم ببڕێت، بێزارم بکات، دەستم ناچێتە نووسین. ئەمـەش شـایەدی خوا، لەوکاتەدا کە وشەی (بێزارم بکات)م دەنووسـی کچکۆڵەیەك خـۆی بـە ژوورا کـردو خەبـەری دامێ کە نەخۆشێك هاتووە تا معایەنەی بکەم. دەبێ بڕۆم بۆ لای... بە ڕاستی لە نووسین بێزارم، نـازانم چـی بکـەم. حـاڵی حـازر کـاتێ کـە دەسـت دەدەمـە نووسـین یـان بیر لـە نووسـینی بابـەتێك دەکەمەوە، دڵم تێك هەڵدێت، ڕێك وەکو ئەوەیـە شـۆربایەکی کەلـەرم بخـۆم کـە تـازە سیسـرکێکیان لێ دەرهێنابێ.. بمبورە کە ئەم بەراوردە دەکەم... تەنیا لە نووسین بێزارنیم، سەبارەت بەم ژینگە ئەدەبیـەش بێـزارم کـە بـۆ هـەر کـوێ دەڕۆی لێـت نابێتـەوە، وەکـو چـۆن فـەزاو هامـاج لـە زەوی نابێتەوە."

هەڵبەتە ئەم "ژینگە"و ئەم "هاماجە"ی گوایـە ئەوەنـدە لێیـان بێـزار بـوو، بـۆ ئـەو زۆر پێویسـت بوو، بەڵگەش ئەوەیە زۆر بـە گـەرمی پێشـوازی ئـەو دۆسـت و میوانانـەی دەکـرد کـە لـە میلیکۆڤۆ

سەردانیان دەکرد. کاتێ کە نەمیروفیچ ئاگاداری کردەوە کە تیپەکە گەڕاوەتەوە بۆ مۆسکۆ، چیخۆف بڕیاری دا کە بچێت بۆ ئەوێندەر تا هەندێ لە پرۆڤەکان ببینێ.

کاتێ لە ۱۸۹۸/۹/۹دا خۆی بە هۆڵەکەدا دەکات، ئەکتەرە گەنجەکان هەست بە هەڵچوونێکی زۆر دەکەن. بە ڕادەیەك دەکەونە ژێر کاریگەریی سام و هەیبەتی ئەوەوە، متمانەیان بەخۆ کز دەبێت. چیخۆف کە ئەویش وەکو ئەوان نیگەران بوو، بەدەم کۆکە کۆکەوە، پەیتا پەیتا دەستی بە ڕدێنە چکۆلەکەیدا دێناو یاری بەچاپلکەکەی دەکرد. بەڵام دوای ئەوەی پرۆڤەی پەردەیەکی تەواوی بینی، نیگەرانیەکەی ڕەوییەوە. بۆ یەکەمجار هەستی کرد ئەکتەرەکان لە مەبەستی شانۆنامەکەی گەییشتوون. لە پرۆڤەی دووەمدا چەند پێشنیازێکی دەربارەی چۆنیەتی نواندنی دەورەکان کردو داوای کرد ستانسلافسکی بەخۆی ڕۆڵی ئەو ئەکتەرە بدینێ کە دەوری (تریگورین)ی دەبینی. ستانسلاڤسکی کە دەرهێنەری شانۆنامەکەش بوو. ڕاوبۆچوونی زۆر تایبەتی دەربارەی شانۆ هەبوو، هونەرەکەی خۆی خۆشدەویست . بە تەما بوو بۆق و کسۆکان بێنێتە پشت پەردانەوە، تا لە ڕێگەی قیڕە قیڕی بۆق و حەپە حەپی کسۆکانەوە، فەزای ڕاستەقینەی گوند بەرجەستە بکات. کاتێ چیخۆف سەیری کرد ستانسلاڤسکی بەو ڕادەیە پابەندی واقیعگەراییە، زۆر پێکەنی، حەریك بوو لە پێکەنینا دەبورایەوە پێی گوت: "شانۆ، مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، دیواری چوارەمی تیا نیە، وێڕای ئەوەش شانۆ هونەرە، پوختەی ژیان دەنوێنێ، نابێ هیچ شتیکی زیادەی لێ باربکرێ."

چیخۆف، لە کاتی هەوەڵین پرۆڤەکانـدا، بە تەواوەتی کەوتە ژێر کاریگەری جوانی ئۆلگالیوناردوڤنا کنیپەرەوە، زۆر بە وردی دەوری ئارکادینای دەبینی کە دەورێکی یەجگار قورس بوو، ئەم تواناو بەهرەیە هێندەی دی لە دڵی چیخۆفدا شیرینی کرد. ئۆلگا کنیپەر، ئەوکاتانە لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵیدا بوو، دەموچاوێکی پان و جدی هەبوو، چاوەکانی گەش، زیرەکیان لێدەباری، قژی ڕەش و چڕ بوو. تازە لە خوێندنگەی هونەری درامی دەرچوو بوو و لێبڕابوو خۆی بۆ شانۆ تەرخان بکات. هەرکە چاوی بە چیخۆف کەوت، تووشی جۆرە خورپەیەکی دەروونی گۆنگ بوو.

ڕێکەوت وای هانی کە چیخۆف لە پرۆڤەیەکی شانۆنامەی (تزار فیدور ئیڤانوفیچ)دا، کە شانۆنامەیەکی شیعری ئەلکسی تولستوی بوو، جارێکی دیکە ئولگا کنیپەر بدینێ. ئۆلگا لەم شانۆنامەیەدا دەوری ئیرینای دەبینێ، قەرار بوو وەرزی یەکەمی شانۆی هونەری مۆسکۆ، بەم شانۆنامەیە بکرێتەوە .چیخۆف خۆی پێچابووەوەو لە هۆڵە ساردو شێدارەکەدا بەرانبەر بە شانۆ ڕووتەکە دانیشتبوو. شانۆکە ڕووت و قووت بوو، تەنیا چەند مۆمێك کە لە شووشەدا دانرابوون، ڕوناکیان دەکردەوە. ئۆلکا، ڕۆڵی ئیرینای ژنی تزاری دەبینی. چیخۆف چاوی لە بچووکترین جولە یان وتەی ئۆلگای هونەرمەند، غافڵ نەدەکرد. دوای ماوەیەکی کەم لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین، لەوبارەیەوە دەڵێت:"بە ڕای من ئیرینا زۆر بەشکۆ بوو. دەنگی، ڕەنگی، هەڵوێستی، ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی، ئەوەندە جوان و کاریگەر بوو، هەناسەی پیاوی سوار دەکرد.. ئەگەر لە مۆسکۆ مابامەوە، ئاشقی ئەم ئیرینایە دەبووم." (نامەی بە رواری ۱۸۹۸/۱۰/۱۸).

لە ڕاستیدا، ڕۆژی دوای ئەم پرۆڤەیە، بەرەو قرم ڕۆیی. دەمەو پایز بوو، کە دەستی بەخوێن هەڵهێنان کردەوە. ئیدی چاری ناچار بوو، دەبوایە بەگوێی پزیشکەکانی بکات و وەرزی دوورو درێژی زساتان لە شوێنێکی گەرمەسێر بەرێتە سەر. ئەم سەفەرەی کە جاران بەتاسەوە خۆی بۆ ئامادە دەکرد، هەنوکە لێی بوو بوو بە کۆڵی شێرو بەجۆرە دوورخستنەوە و تاراوگەیەکی دەزانی. هەرچەند بیری دەکردەوە، دەگەییە ئەو قەناعەتەی ئەگەر دەیەوێ بمێنێ، دەبێ باکوور بە سروشتی سەخت و کەش و هەوای ساردیەوە، کە زۆری حەز لێدەکرد، بەجێ بێڵێ و ڕوویکاتە باشوور، چوونکە پێویستی بە هەتاوە گەرمەکەی بوو.

کە لە ١٨٩٨/٩/١٨دا گەییە یاڵتا، دوو ژوری لە ڤێلایەکی ناو باخێکی پڕ گوڵ و گوڵزاردا بەکرێ گرت. بەڵام ئوتێلانی بەشکۆ و جەلال، گەرماوێن دەریایی، دارو درەختی خورماو کالپتۆس و، دەریای شینی ڕوون، بە شێوەیەکی گشتی، تێکڕای فەزای ئەم شوێنە پڕ هاتوچۆیە، دەگەڵ زەوقی ئەودا تێکیان نەدەکردەوە، زۆر دەستکرد دەهاتنە بەرچاوی. هەستی دەکرد خەڵکی یاڵتا، گۆشەگیرن و لەدەرێی ڕەوتی ژیاندان. ڕۆژانە، بەدەم پیاسەی کەناری دەریاوە دەڕۆیی تا دەگەییە کتێبفرۆشی سینانی کە مەڵبەندی ڕۆشنبیری شار بوو. هەموو ئەو نووسەرو هونەرمەندانەی بە ڕێکەوت ڕێیان دەکەوتە شار، لەوێندەر یەکیان دەگرتەوە. چیخۆف کۆمەڵێك لەو نووسەرو هونەرمەندانەی لەوێ دیتن لەوانە: شاعیری لاو کونستانتین بالمونت، فیودۆر شالیاپینی گۆرانی بێژی بە ناوبانگی باس و ئۆپرای ڕووس، و ڕەحمانینوف ی ئاهەنگساز کە ئیلهامی پارچە مۆسیقای (فانتازیایەك بۆ ئورکسترا)ی لە چیرۆکی "سەرە ڕێگای" چیخۆفەوە وەرگرتبوو وپێشکەشی کردبوو بە چیخۆف. هەروەها خەڵکانێکیش کە حەزیان لە ناسین و دیداری ناوداران بوو، دیدەنی چیخۆفیان دەکرد. لە دوو نامەدا بۆ تاتیانا –کوپرینك دەڵێت: "وەکو ماسیە سەگانە، بێکەیف و بێ دەماخم." و "ژنانی چەنەباز، بە دەستنووسان و بێ دەست نووسانەوە، لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵێن." ( بڕوانە هەردوو نامەی بەروارێن ١٨٩٨/٩/٢٨ و ١٨٩٨/١٠/١). جا بۆ ئەوەی خۆی لەم وەزعە نالەبارە بدزێتەوە، زۆرجار پەنای دەبردە بەر قوتابخانەیەکی کچانەی ئەو ناوەو دەگەڵ بەڕێوەبەرو مامۆستاکانی ئەوێدا نانی دەخوارد. زۆری پێنەچوو بوو بە یەکێك لە دەستەی مامۆستایانی ئەو قوتابخانەیە. کاتێ بە ڕاڕەوەکاندا پیاسەی دەکرد، کچۆڵەکان بە جلکی سپی یەکچەشنەوە، وەکو خانمانی گەورە، بەڕێزو حورمەتەوە سەری ڕێزو نەوازشیان بۆ دادەنەواند.

چیخۆف، نزیکەی مانگێك بوو لە یاڵتا دەژیا، ئێوارانێك خۆی بەدوکانەکەی سینانی دا کرد، سینانی بروسکەیەکی ماریای دایە، بروسکەکە ئاڕاستەی سینانی کرابوو نەك چیخۆف: "ئانتون پافلوفیچ چیخۆف، چۆن هەواڵی مەرگی بابی وەرگرتبوو؟" ڕۆژ، ڕۆژی ١٨٩٨/١٠/١٣ بوو، بابی ڕۆژی پێشوو مردبوو. هەڵبتە ماریا، بۆیە هەوەڵجار ئەم خەبەرەی بە سینانی دابوو، تا دڵی براکەی بەم خەبەرە دانەلەرزێ، ئەمە جگە لەوەی لە خەیاڵی خۆیدا وای تەسەور کرد بوو کە لە ڕێگای بڵاڤوك و ڕۆژنامانەوە بەخەبەرەکەی زانیبێ. چیخۆف دەم و دەست بروسکەیەکی ماتەمینی بۆ خشکەکەی نارد. هەرچەندە هێشتا ئەو ڕق و بوغزەی لە دڵدا مابوو کە بەهۆی

سەختگیری و ئاڵمی باکیەوە، لە منالیا لای دروست بوو بوو، بەڵام مردنی لە ناکاوی باوکی، لە ناخەوە هەژاندی، زۆری خەفەتبار کرد، زیاتر خەمی بۆ دایکی و ماری دەخوارد. لە نامەیەکیا (١٨٩٨/١٠/١٤) بۆ ماری دەڵێت: "خەفەت بۆ باوکم دەخۆم، خەفەت بۆ هەمووتان دەخۆم، کە بیر لەوە دەکەمەوە، ئێستا ئێوە لە مۆسکۆ لە چ وەزع و حاڵ و تازیەبارییەکی ناخۆشدا دەژین و منیش لێرە لە یاڵتا بێخەم و خەیاڵ، بەوپەڕی ئاسوودەیی دەژیم، هەست دەکەم بارێکی قورس بەسەر شانمەوەیەو لێم نابێتەوە."

بیرۆکەیەکی دیکەش، بەرە بەرەو هێدی هێدی بۆ ناخی دەخزی و ئازاری دەدا: ئائا ئەم باوکە، کە چیخۆف وەکو قەرەقۆزێکی بەدەسەڵاتی بۆش و بەتاڵی، پر هەوای تەمەشا دەکرد، ئایا لەوە زیاتر کاری لەم نەکرد بوو کە خۆی تەسەورو وێنای دەکرد؟ ئایا ئانتون هەر لە منداڵی ڕا، جۆرە گەوماندارییەکی ئاینی لا دروست نەبوو، لە هەموو شتێکدا کەسێکی نەرم و بەگوزەشت نەبوو، لە پەیوەندیە جڤاکی و مرۆڤانیەکاندا، لە نووسین و ئەدەبیاتدا، زیاتر بەلای سادەیی و ساکاریدا دای نەدەکێشا؟ ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا پەرچەکردار نەبوو لە هەنبەر سەختگیری و زەبرو زەنگ و خۆسەپاندنەکانی باوکی ڕەحمەتیدا؟ پێدەچوو لە هەموو شتێکدا هەڵوێستێکی تەواو پێچەوانەی هەڵوێستی بابی هەڵبژاردبێ. ئەگەر هەندێ باوکان کارێکی وا بکەن، منداڵەکانیان بە نموونەو پێشەنگیان بزانن و چاویان لێبکەن، ئەوا پاول یگوروفیچ ڕێك بە پێچەوانەوە کارێکی وای کرد کوڕەکەی نەك چاوی لێبکات، بەڵکو لێشی برەوێتەوەو هەرگیز بەو ڕێگایەدا نەڕوات، کە ئەوی پێدا ڕۆیی بوو. ڕەنگە چیخۆف، لە هەر ئەندامێکی دیکەی خانەوادەکەیان پتر قەرزار باری بابی بووبێ کە هەمیشە سەرزەنشتی دەکرد. بە هەر شێوەیەك دەژیا و هەر شتێکی دەنووسی، ماکێکی ژیانی سەردەمی منداڵیەتی سایەی بابی تیا بوو.

دوای ماوەیەکی کەم، بە تول و تەفسیل چۆنیەتی مردنەکەی بابی پێگەیی. پاول یگوروفیچ، لە میلیکۆڤۆ، سەندوقێکی گەورەی کتێبانی هەڵگرتبوو، تووشی فتقێکی سەخت بوو بوو، بەپەلە گەیاندبوویانە نەخۆشخانە لە مۆسکۆ، لەوێ نەشتەگەریەکی قورسیان بۆ کردبوو، کە ماوەیەکی زۆری خایاند بوو، ئیدی بەرگەی نەگرتبوو و مردبوو. ئەم هەواڵە هێندەی دی چیخۆڤ خەفەتبار کرد، حەزی دەکرد هەم وەکو کوڕ و هەم وەکو پزیشك، بە دیار بابیەوە بێت. لە ١٨٩٨/١٠/١٧ دا لە نامەیەکیا بۆ سوڤورین دەڵێت: "ئەگەر من لە ماڵ بام، ئەمە ڕووی نەدەدا، نەمدەهێشت بمرێت." چیخۆف، زۆر نەخۆش بوو، باری تەندروستی ریگەی نەدەدا بەپەلە سەفەری مۆسکۆ و بەشداری ڕێوەڕەسمی پرسەو ناشتنی بابی بکات. بەڵام کە زانی بابی لە گۆڕستانە جوان و ئارامەکەی دێری نوڤودڤیچی مۆسکۆ بەخاك سپێردراوە، هەستی بە جۆرە ئارامیەك کردو دڵی ئیسراحەتی کرد. ئەوجا لە نامەیەکی تریا، دوای بەخاك سپاردنی بابی (١٨٩٨/١٠/١٤) بۆ ماریا، دەڵێت: "وا هەست دەکەم دوای مردنی باوکمان، ژیان لە میلیکۆڤۆ وەکو جاران نامێنێ، وا هەست دەکەم ژیان لە میلیکڤۆ بە وەستانی (دەفتەری کەشتی)یەکەی ئەو وەستاوە."

هەرچەند دایکیان زۆری دڵ بەگوند و بە ماڵەکەی میلیکۆڤۆیان خۆش بوو، چیخۆف هەستی دەکرد، ماقووڵ نیە دایکی بەدرێژایی زستان بە تەنیا لەگەڵ ماری دا لەوێ بمێنێتەوە. مادامێکی

بەخۆیشی ناچارە لە بەر نەخۆشی لە شوێنێکی گەرمەسێر بژی، بۆیە هەقە زاتی ئەوەی هەبێ میلیکۆڤۆ بفرۆشێت و لە قرم دا، لانەیەك بۆ خانەوادەکەیان پێکەوە بنێ. تەنانەت پێش مردنی بابیشی بیری لەوە کردبووەوە کە ئەگەر بکرێت بۆ یالْتا باربکەن و لەوێندەر ئاکنجی بن. ئیدی لەگەڵ سینانی دا چوو بوون بۆ تەمەشای خانوویەکی چوار ژووری دڵگیر کە کەوتبووە قەدپاڵێکی نزیکی گوندێکی تاتاری بە نێوی کوچوکوی. پاشان چیخۆف دەچێتە تەمەشای پارچە زەویەك لە ئاوتکا، کە بیست دەقەیەك لە یالْتاوە دوور دەبێت. ئەم زەویەی زۆر بەدڵ دەبێ، زەویەکە لە سەر دەریا دەبێ، ئیدی بێ چەند و چوون بڕیاری کڕینی دەدات و لێدەبڕێ بەکەیفی دڵی خۆی خانوویەکی لەسەر دروست بکات. کێشەی دارایی بە ڕۆکی گرت، ئەوە بوو وەکو نووسەرو هەقی نووسەرایەتی پێنج هەزار ڕۆبڵی بەسلفە لە سوڤورین وەرگرت. بانکێکی ناوچەییش بەڵێنی دا لە هەنبەر بارمتەیەکی عەقاریدا، حەوت هەزار ڕۆبڵی بە قەرز بداتێ. لە کۆتایی مانگی ئوکتۆبەردا گرێبەستەکەی ئیمزا کرد، ئیدی ئەندازیارێکی گەنج بە ناوی لیڤ شاپوڤالوڤ، نەخشەی خانووەکەی بۆ کێشا و قەرار بوو لە مانگی کانوونی یەکەمدا دەست بەکار بن.

کاتێ ماریا هات بۆ یالْتا تا سەیری موڵکەکەی برایەکەی بکات، هیچ بەدڵی نەبوو، چونکە زەویەکە کۆنە ڕەزێکی پەرژین کراو بوو، یەکپارچە گیاکەڵەو دەوەنە کێولکە بوو، زۆر لە دەریاوە دوور بوو، زۆر لە گۆڕستانی تاتارەکانەوە نزیك بوو. بەو باوەڕو قەناعەتەوە بۆ باکوور گەڕایەوە کە دایکی هەرگیز دڵی نایەت میلیکۆڤۆی ئازیز بەجی بێڵێ. ئیدی چیخۆف لەو ڕۆژە بە دواوە نامە لەسەر نامەی بۆ دایکی و خوشکەکەی دەنارد و هانی دەدان کە دوودڵ نەبن. بە دووردرێژی باسی ئەوەی بۆ ماری دەنووسی کە چۆن باخی میوەو باخچە و بێستانی بە شکۆ لەو بەهەشتە هەتاوگیرەدا، دوور لە هەراو زەنای شار دروست دەکات. بۆ دایکی دەنووسی کە موبەقێکی گەورەی بۆ دروست دەکات. ئاوی تیابێ، هەموو تفاق و کەرەسەیەکی ئەمریکایی تیابێ، مەکینەی جلشۆری تیابێ، عەماری دارو ڕەژوو، زەنگ بۆ بانگکردنی کارەکەرو خزمەتکاران، تەنانەت تەلەفۆنیشی تیابێت. ئەمە جگە لەوەی کە ڕێوەڕەسمی قوداس لە ئاوتکا، سەعات دەی بەیانیان بەرپا دەکرێت، کە ئەمە کاتێکی زۆر لەبارە بۆ پیرێژن و– دەتوانێ بە درێژایی پایز بۆ خۆی لەو دەشت و بێشانەی ئەو ناوە قارچك کۆبکاتەوە.

چیخۆف، لە کاتێکا، لە ریگەی نامەو نامەکارییەوە، ئەو هەموو ستایشەی ئاوتکای بۆ دایکی و ماری خوشکی دەکرد ڤێلا چکۆلەکەی کوچوکوی هەر لەبیر بوو. لە کاتێکا ماری هێشتا لە ڕێگەی نامەوە گەنگەشەی ئاوتکاو بارکردن و بار نەکردنی دەگەڵ چیخۆفدا دەکرد، ڕۆژیك ٨/ك١/١٨٩٨ نامەیەکی باوەڕ نەکردەنی پێگەیی. چیخۆف بۆی نووسی بوو: "با خەبەرێکت بدەمێ، خەبەرێکی خۆش، چاوەڕوان نەکراو. خەیاڵت بۆ ئەوە نەچێ کە ژن بێنم یان خوازگاری کەسێکم کردبێت. بەدەستی خۆم نەبوو، لەکوت و پڕێکا هات بەسەرماو (کوچوکوی) یەکم کڕی. بە دوو هەزار ڕۆبڵ کڕیم، سەنەد وقەواڵەکانیشم هەر لەجێوە ئیمزا کرد، تا چەند ڕۆژێکی دی باوروبنەم دەپێچمەوەو دەچم بۆ ئەوێندەر. حاڵی حازر بووم بە خاوەنی یەکێك لە موڵکە هەرە

جوانەکانی قرم. ئەمە بەکەس مەڵێ، دەنا ڕۆژنامەکان ئەم هەواڵە دەقۆزنەوە و وای بڵاو دەکەنەوە کە من موڵکێکم بە سەد هەزار ڕۆبڵ کڕیوە."

ماریا بەڵێنی دا کە ئەم ڕازە بپارێزێ، بەڵام لەم زیادە مەسرەفەی براکەی نیگەران بوو. ماریا لە غیابی چیخۆفدا، بوو بوو بە دەمڕاست و کۆڵەکەی خانەوادەکەیان. ئەو میلیکۆڤۆی بەڕێوە دەبرد و خزمەت و مدارای دایکی دەکرد، سەرپەرشتی و چاودێری دروستکردنی قوتابخانەی گوندەکەی دەکرد، حیساب و کیتابی وردی دەرامەت و مەسرەف ڕادەگرت. خەمی هەرە گەورەی، وەزع و حاڵی براکەی بوو. بەر لە حەڤدەی کانوونی یەکەم، کە ڕۆژی نمایشی یەکەمی شانۆنامەی نەورەس بوو، دەترسا تووشی ناکامیەکی دیکە ببنەوەو، ئەمە کار لە تەندروستی براکەی بکات. بۆیە بەبێ پرسی چیخۆف، چوو بۆ ئیدارەی شانۆی هونەر. بەدەم پەلمەگریانەوە لێیان پاڕایەوە کە نمایشی شانۆنامەکە دوابخەن، بەڵام ئەوان زۆر بە نەرمی و نەزاکەتەوە وەڵامیان دایەوە کە پارەیەکی زۆریان لەم کارەدا خەرج کردووەو بیست و شەش پرۆڤەیان لەسەر کردوەو مەحاڵە بتوانن دوای بخەن.

ئێوارەی ١٧/ك١/١٨٩٨)، بەر لە کردنەوەی پەردەی شانۆ، ئەکتەرەکان زۆر نیگەران بوون، دەترسان ئەگەر شکست بێنن، ئەوا چیخۆفی ئازیزو خۆشەویستیان ڕەنگە لە داخا بمرێت. هەر هەموویان (ناردین)یان خوارد بوو، ناردین ئارامبەخشێك بوو کە لە ڕووسیادا هەموو کەسیك بە کاری دەبرد. کە پەردە لابرا، هۆڵەکە چواریەکی پڕ بوو لە تەمەشاڤانان، ستانسلافسکی بە گوێرەی شێوازی خۆی لە کاری دەرهێنان، پشت لە جەماوەرەکە دانیشتبوو، ئەوەندە نیگەران بوو، لە رزینی لاقەکانی خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا. نەمیروفیچ –دانچنکو، لە یاداشتەکانی خۆیدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "کاتێ لە دوای نواندنی پەردەی یەکەم، پەردە دادرایەوە شتێك ڕووی دا، مەگەر هەر دە ساڵ جارێك لە شانۆدا ڕوو بدات: پەردە دادرایەوە، تا گوێ بڕکات بێدەنگی بوو، بێدەنگیەکی ڕەها، چرکە نە لە هۆڵەکەوەو نە لە شانۆکەوە نەدەهات. ئەوانەی ناو هۆڵەکە حەپەسابوون، دەتگوت هەناسەیان لەبەر بڕاوە. ئەوانەی سەرشانۆکە، ئەکتەرەکان تیا مابوون، نەیاندەزانی مەسەلە چیە... ئەم بێدەنگی و حەپەسانە ماوەیەکی زۆری خایاند. ئەکتەرەکان وای بۆچوون کە پەردە (فەسڵ)ی یەکەم شکستی هێناوە، شکستیکی وەهای هێناوە، کە تاقە دۆستێك لە نێو ئاپۆڕای تەمەشاڤانەوە، چەپڵەیەکی پێ ڕەوا نەبینێ. ئەکتەرەکان تووشی جۆرە هیستریایەك بوون. پاشان، لە ناکاوا، وەکو ئەوەی بەنداوێك بڕوخێت، هەرەس بێنێ یان بۆمبایەك بتەقێتەوە، بەو ئاوایە دەنگی چەپڵەڕێزان بەرز بووەوە، دەنگی چەپڵە گویی پیاوی کەڕ دەکرد، گەورەو بچووك، دۆست و دژمن چپڵەیان لێدەدا، هەر هەموو هورای ستایش و ئافەرینیان دەکێشا." (بڕوانە فلادیمیر نەمیروفیچ –دانچنکۆ. ژیانم لە شانۆی ڕووسیدا، پاچقەی جان کورنوس، ١٩٣٦، ل٨٧ –١٨٦) ئیدی لە دوا پەردەدا. مەسەلەکە لە سەرکەوتن دەرچوو، بوو بە فەتح. ئەکتەرەکان لە کۆتایی دوا پەردەدا، لە ناو هۆراو چەپڵەڕێزانی بێ بڕانەوەی تەمەشاڤانانەوە، لەسەر شانۆکەوە، دوای کڕنوش بردن بۆ خەڵکەکە، بەدەم گریانی شادیەوە، باوەشیان بە یەکدیدا دەکرد. لەو دەمەدا کە ستانسلافسکی لە سەر شانۆکە سەمای سەرکەوتنی

دەکرد، جەماوەرەکە بەدەم هۆراکێشانەوە هەستانە سەر پێیان و بەیەك دەنگ داوایان دەکرد بروسکەی پیرۆزبایی بۆ نووسەری شانۆنامەکە بنێردرێ.

ئەم برووسکەیە هەر ئەو شەوە نووسراو بۆ بەیانی گەییە یالّتا، ناوەڕۆکی بروسکەکە بەمجۆرە بوو: "ئێستا لە نواندنی نەورەس بووینەوە. سەرکەوتنێکی گەورە بوو. لە دوای هەر پەردەیەك دەبوو بەهۆراکێشان و چەپڵەڕێزانێکی بێ شومار... هەموو خەریکە لە خۆشیا شێت دەبین" بروسکەیەکی دیکەشی پێگەیی: "ڕۆژنامەکان، تێکڕا ستایشی نەورەس دەکەن، بە کارێکی جوان و سەرکەوتنێکی گەورەی وەسف دەکەن. ڕەخنەگرانی شیفتە." چیخۆفیش، بەخۆشحاڵیەوە، بە بروسکەیەك وەڵامی دانەوە: "بەهەمووان بڵێن، لە ناخی دڵەوە سوپاسگوزاری هەموویانم. من لە یالّتادا وەکو دورخراوە وام، عەینی دریڤوس لە دورگەی ئەهریمەندا، بەداخەوەم کە لە ناوتاندانیم، بروسکەکەتان شادو خۆشحاڵی کردم."

دوای وەستانێکی چەند ڕۆژە (ئولگاکنیپەر، تووشی پەتا بوو بوو). بۆ جاری دووەم نمایشی نەورەس دەستی پێکردەوە. هۆڵەکە لە خەڵکیدا جمەی دەهات. شەوانە خەڵکی ڕیزیان دەبەست بۆ بلیت کڕین. گەلێك لەو گەنجانەی هاتبوون بۆ شانۆکە، بەدەم چاوەڕوانی ئەوەی سەرەی بلیت کڕینیان بێت، لەو ناوە لەسەر کورسی چکۆلە، ئەو کورسیانەی قەد دەکرێن، دادەنیشتن و لەبەر ڕوناکی گڵۆپەکان کتێبیان دەخوێندەوە، یان دەڕەقسین تا گەرمیان ببێتەوە. خۆ ئەگەر یەکێکیان بەختی هەبوایە بلیتی دەسکەوتبا، ئیدی لە خۆشیا بەند نەدەبوو و بەلەز دەچوو بەلای کاری خۆیەوە. ئیدی هەر نامەو بروسکەی پیرۆزبایی و دەستخۆشی بوو لە هەموو لایەکەوە بەسەر چیخۆفدا دادەباری. چیخۆف لەدڵی خۆیدا خەفەتی لەوە دەخوارد کە لە نمایشە ناکامەکەی (نەورەس)دا لەسان-پترسبۆرگ توانی ئامادەبێ، کەچی بە هۆی نەخۆشییەوە نەیتوانی لەم نمایشە سەرکەوتووەی هەمان شانۆنامەدا (نەورەس) لە مۆسکۆ، ئامادە ببێت. دیارە چیخۆف، ئەم سەرکەوتنەی زۆر پێخۆش بوو، تا ڕادەیەك باش قەرەبووی شکست و ناکامیەکەی سان-پتسبۆرگی بۆ کردەوە. نووسەری گەنج، ماکسیم گۆرکی، کە ماوەیەکی کەم بوو نامەو نامەکاری دەگەڵ چیخۆفدا، کەوتبووە بەینەوە، لە نامەیەکیا بۆ وی دەڵێت یەکێك لە دۆستەکانی کە پیاوێکی زیرەك و ڕۆشنبیرە، بەدەم "فرمێسکی هەڵچوونەوە" پێی گوتووە، بۆ چڵ ساڵ دەچێت هاتوچۆی شانۆ دەکات، لە ژیانیا "شانۆنامەی جوان و کاریگەرو هونەری وەکو نەورەسی نەدیتوە". گورگی لە سەری دەڕوات: "بەو حاڵەشەوە ناتەوێ شانۆنامە بنووسێت؟ دەبێ بنووسیت هەی نارەسەنی نالەبار!" چیخۆف، ئەم حوکمە شۆخی ئامێزەی گۆرکی بەهەند وەرگرت، لە دڵی خۆیدا دەیگوت تۆ بڵێی هەق بە گۆرکی بێ؟ ڕەنگە. ئەکتەرانی (شانۆی هونەریی مۆسکۆ) بە ڕادەیەك ڕێزو حورمەتی جیخۆف و بەرهەمەکانیان دەگرت، ئیدی پێویستی بەوە نەدەکرد چیخۆف، دوودڵ بێ لەوەی کاری تازەیان دەگەڵ بکات. چیخۆف لە سایەی بەرەکەتی شانۆی هونەری مۆسکۆ و بە هرەی ئەکتەرانی شانۆی ناوبراوە وە هەم جەماوەری خۆی دۆزییەوە، هەم خەڵکانێك پەیدا بوون کە لە ڕەمزو ڕازی شانۆ نامەکانی تێبگەن. بۆیە هەستی بە جۆرە هاوئاهەنگیەکی تازە دەکرد لە نێو ئەو شتەی کە دەیویست پێشکەش بە

خەڵکی بکات و ئەو شتەی کە خەڵکی لەویان چاوەڕوان دەکرد. ئێستا تەنیا پێویستی بە هێزو توانا بوو تا لەسەر کارەکەی بەردەوام بێ.

بۆ نەگبەتی لە ئاخرو ئۆخری نۆڤەمبەری ١٨٩٨دا، نەخۆشیەکە بەرۆکی گرتەوە، کەوتەوە کۆکەکۆك و خوێن هەڵهێنان. بەڵام دکتۆر ئیسحاق ئاڵتشولەر، کە پزیشکی شەخسی ئەو بوو وبەردەوام دەرمانی دەکرد، نەیدەتوانی دەوەرەیەکی جدی عیلاجی بەسەردا بسەپێنێ. نەرم و نیانی و، ئازایەتی و ورەبەرزی نەخۆشەکەی، دەیانکردە کاریك زۆرجار لە ئاستی عیلاج و دەرمانکردنەکەیدا نەرمی بنوێنێ. بەچاوی خۆی دەیبینی کە چیخۆف هەوڵدەدات، بە نەرمی ،بێئەوەی دەنگ بەرزبکاتەوە، قسان بکات، کە کۆکە دەیگرت، خوێناوەکەی دەکردە دەسڕی کاغەزەوە. بەڵام چیخۆف دانی بە مەترسی نەخۆشیەکەیدا نەدەنا. کاتێ ڕۆژنامەی (هەواڵان) کە لە سان-پترسبۆرگ دەردەچوو، لە لاپەڕەیەکیا، هەواڵێکی لە بارەی خەتەرناکی نەخۆشیەکەیەوە بڵاوکردەوە، زۆر توڕە بوو، ڕوونکردنەوەیەکی بۆ ڕۆژنامەکان ناردو بەمجۆرە ئەو هەواڵەی بەدرۆخستەوە: "نازانم کێ حەزی کردووە کەس و کارەکەم بترسێنێ و ئەو هەواڵە ناخۆش و درۆیەی بۆ ئەو ڕۆژنامەیە ناردووە. لە نامەیەکیا (١٨٩٨/١٠/٢٧) بۆ سوڤورین، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ڕاستە دەکۆکم، بەڵام کۆکەیەکی ئاسایی، وەکو گورگی برسی دەخۆم، بە کەیفی خۆم دەخەوم، ڤۆدگا دەخۆمەوە، شەراب دەخۆمەوە." دوای مانگێك واتە لە ١٨٩٨/١١/٢٩دا لە نامەیەکی دیکەدا بۆ هەمان سوڤورین دەڵێت: "پێنج دانە ڕۆژە بەردەوام خوێن هەڵدێنم، ئەمڕۆ وەساوەتەوە، بەڵام با ئەمە لە بەینی خۆمانا بمێنێ، بە کەسی مەڵێ. ئێستا ناکۆکم، گەرمای بەدەنم ئاساییە، ئەم خوێنە خەڵکی زیاتر دەترسێنێ تا خۆم، بۆیە هەوڵدەدەم لە کەسوکارەکەمی بشارمەوە." ئیدی چیخۆف لە یاڵتا بەم حاڵە ڕاهاتبوو، هەندێجار باش بوو، هەندێجار خراپ. کە وەزعی خراپ دەبوو کونجی ماڵەوەی دەگرت و نەدەهاتە دەرێ، بەڵام کاتێ هەستی دەکرد وەزعی کەمیك باشە، بەجۆرێ شانی وەبەرکار دەدا تۆڵەی ئەو وەختانەشی دەکردەوە کە بە هۆی ناساغیەوە لە دەستی چوو بوون. خۆ ئەگەر تاقەت و ئارەزووی نووسینی نەبا ئەوا سەرپەرشتی و چاودێری دروستکردنی ماڵەکەی خۆی لە ئاوتکا دەکرد، نەخۆشانی دەبینی، سەری قوتابخانەکانی دەدا، دەچوو بۆ ئەنجوومەنی خاچی سووری ناوچەیی و لە چالاکیەکانی ئەنجومەنی ناڤبریدا بەشداری دەکرد. پیتاکی بۆ خەڵکی لێقەوماوی گرانی دەڤەری سامارا کۆدەکردەوە.

دکتۆر ئالتشولەر لە بارەیەوە دەڵێت: "میهرەبانی ئەوە پیاوە، خۆش خزمەتی لە کارێن گەورەو بچووکدا، دەگمەن و بێ وێنە بوو."

هەرچەندە لە ماوەیەکی کەمدا، لەیاڵتادا کۆمەڵێك دۆست و ئاشنای گرت، بەڵام بیری کەسووکارو ئاشناو بناژۆکانی جارانی دەکرد. تەنیا ئیڤان سەری دابوو ولە سەری ساڵ و بە بۆنەی چەژنی لەدایکبوونەوە چەند ڕۆژێك لە لای مابووەوە. بەڵام دایکی و خوشکەکەی کە لە شوقەیەکی بەکرێ، لە مۆسکۆ دەژیان سووربوون لە سەر ئەوەی بۆ قرم نەیەن. چیخۆف، لە کاتێکا باسی خۆشی و دڵگیری یاڵتای بۆ دایکی و خوشکەکەی دەکرد، بە خۆی لە هەتاوو

دەریای شین بێزار بوو، ئەلهای بەفری دەکرد، خەوی بە شەقامانی قەرەباڵغ و جەنجاڵ، خوارنگە، و شانۆوە دەبینی. لە ٥/ك١/١٨٩٩ دا نامەیەك بۆ نووسەرێکی برادەری بە نێوی تیخونوف دەنووسێت کە: "زۆر بیری پایتەخت دەکەم، لێرە دڵم تەنگە، بێزارم، بەو زوانە دەبم بە خوردە بوژروا. هەست دەکەم بەو زووانە دەبم بە خاوەنی خانوویەك و ژنێکی دێهاتی دەموچاو کونج دەخوازم، لەو ژنانەی کە بە درێژایی ڕۆژان لێم دەدات و لە ڕۆژانی پشوودا ئاشتم دەکاتەوەو دڵخۆشیم دەداتەوە. ئێمەی نووسەر بە کەڵکی ئەوە نایەین لە شارۆچکەو لادێدا بژین، هیچ سەرقاڵیەکمان نابێ.. یاڵتاش جیاوازیەکی ئەوتۆی لە شارۆچکەکانی دی نیە.. لێرە تەنانەت میکرۆبی سیلیش دەنوون."

گیانی بە نامەی دۆست و ئاشناکانی بوو، دەنا هەستی دەکرد لە دنیا دابڕاوە. بەدووورودرێژی و بە کەماڵی ئارەزوو وەڵامی دەدانەوە. یەکێك لەو کەسانەی کە لەو دواییانەدا، نامەو نامەکاری دەگەڵ پەیدا کردبوو مەکسیم گۆرکی بوو، کە ناوە ڕاستەقینەکەی بشکوف بوو. گۆرکی لەو سەردەمەدا نووسەرێکی تەمەن سی ساڵان بوو، خەڵکی نیژنی نوڤوگورود بوو. خۆی خۆی پێگەیاندبوو، یانی کەسێکی خۆڕستی بوو.لە چیرۆکەکانی سەرەتایدا گەندەڵیەکانی کۆمەڵگەی بۆرژوای لە قاو دەدا. بێئەوەی هەرگیز چیخۆڤ دیتبێ، خۆ بە خۆ نامەیەکی بۆ نارد، پڕ بوو لە ستایشی بەرهەمەکانی. ئیدی کتێبی خۆیان بۆ یەکتر دەنارد و نامەو نامەکاریان کەوتە نێوانەوە. گۆرکی لە ڕادەبەدەر شیفتەی چیخۆف بوو، دان بەوەدا دەنێ کە بەدەم خوێندنەوەی هەندێ لە چیرۆکەکانیەوە گریاوە. چیخۆفیش، لای خۆیەوە ستایشی "بەهرەی بەپیتی" هاوتا گەنجەکەی خۆی "گۆرکی" دەکردو دەیگوت: "کاتێ کە وەسفی شتێك دەکەیت، بەچاو دەیبینی، بەدەست دەیگریت. ئەمە بۆ خۆی هونەرە، ڕەسەنایەتی هونەرییە." لە لایەکی دیکەشەوە گۆرکی ئاگادار دەکردەوە کە نەکەوێتە داوی ئاسانکاری و سادەنووسییەوە، خۆی لە درێژدادڕی و ئینشابازی دوور بگرێت: "ئەم بێ مووبالاتیە، بە تایبەتی لە وەسفی سروشتدا، کە بۆ بڕینی دیالۆکەکان بە کاری دەبەی بە زەقی دیارە. کاتێ ئەم وەسفانە دەخوێنمەوە، خۆزیا دەخوازم کە سخ و چڕتربن، لە دووسێ دێڕدا کۆتایی پێبێت. ئەو ئاماژە زۆرانەی بۆ شەهوەتڕانی، بۆ ڕاز و نیاز، بۆ... هتد لە وەسفەکانتا دەیکەیت، شەقڵێکی ڕەوانبێژانەی ڕۆتینی بە وەسفەکانت دەبەخشن. خوێنەر بێتاقەت و بێزار دەکەن. ئەم بێ موبالاتیەی تۆ لە وەسفی ژنانیشدا بە ئاشکرا دیارە... من تۆ ناناسم، نازانم خەڵکی کوێت و کێیت، بەڵام وا هەست دەکەم هێشتا گەنجیت، پێموایە مادام شتێکی پێویستە بۆ ماوەی دوو سێ ساڵێك نیژنی –نوڤوگورود بەجێ بێڵی، پێویستە تەماس دەگەڵ ئەدەبیات و ئەدیباندا پەیدا بکەی، نەك بۆ ئەوەی وەکو کەڵەبابانی دیکە فێری خوێندن ببیت، یان ڕازو ڕەمزی کارەکە لە ئێمەمانانەوە فێری بیت، بەڵکو بۆ ئەوەی بە تەواوەتی خۆت لە ئەدەبیاتدا نقوم بکەی، بە ڕادەیەك گەشە بکەیت کە ئاشقێنی دەگەڵ ئەدەبدا بکەیت." (بڕوانە نامەی ٣/ك١/١٨٩٨)

دوای چەند مانگێك، کۆمەڵێك تێبینی و باری سەرنجی وردتر لەوانەی پێشووی ،دەربارەی شێواز بۆ گۆکی لە نامەیەکیا ١٨٩٩/٩/٢ نووسی: "تۆ کۆمەڵێك وشەی وەسفی زۆر بەکار دەبەیت

کە خوێنەر چەواشە دەکات و زۆر بە زەحمەت وشەی دڵخوازی خۆی تیایاندا دەدۆزێتەوە، بێزار و ماندوو دەبێت. بۆ نموونە ئەگەر من بنووسم: "پیاوەکە لە سەر چیمەنەکە دانیشت" ئەم ڕستەیە زۆر ڕوونە، بە ئاسانی دێتە تێگەیشتن، خوێنەر پێویستی بەوە نیە دوبارە بگەڕێتەوە سەری. بەڵام ئەگەر بنووسم: "پیاوێکی باڵا بەرز، زەلام، سینگ باریك، ڕدێن سوور، دەستەباڵا، شەرمن، سلۆك لە سەر سەوزە گیایەك کە بوو بوو بە پێخوستی ڕێبواران، دانیشت، کرۆکپ، بە نیگەرانیەوە دەیڕوانیە دەوروبەری خۆی." تێگەیشتنی ئەمە زۆر قورسە، بیر و هزر پەرت دەکات. لە کاتێکا هونەری چیرۆکڤانی دەبێ یەکسەر لە ماوەی چرکە ساتێکدا، بچێتە مێشکەوە." ئیدی بەمجۆرە ئەم دوو پیاوە، لە یەکەمین نامەکانیانەوە پەیوەندییەکی ئەدەبی توندو تۆڵ و نزیکیان لە نێوانـدا چێبوو، گـۆرکی ڕێزێکی زۆری لە چیخۆف و تێبینی و سەرنجەکانی دەگرت و چیخۆفیش بەو پەڕی ڕاشکاوی و بێهیچ مدارایەك ئامۆژگاری ئەدەبی گۆرکی دەکرد.

چیخۆف، کۆمەڵێك پەیوەندی نامەیی هەبوو، یەکێك لەو پەیوەندیانەی دەگەڵ لیدیا ئەڤیلوڤادا بوو. پەیوەندیەکی زۆر سەیر بوو. نە ئەوە بوو ئەشق و خۆشەویستی ئەو قەبووڵ بکات. نە ئەوە بوو بە یەکجارەکی دەستبەرداری بێت. دوای ئەوەی لیدیا ئەڤیلوڤا، لە نەخۆشخانەکەی ئوستروموفدا، کە چیخۆف لە وێندەر کەوتبو، دیدەنی کرد. لەسەر داوای چیخۆف درێژەیان بە دیدەنی یەکتر دا. کەچی وێڕای ئەوەش لیدیا ئەڤیلوڤا هەمیشە گلەیی دەکرد کە چیخۆف گویی ناداتێ و کابرایەکی دڵ مردوە. چیخۆف لە وەڵامنامەیەکیا (١٨٩٨/٧/١٠) دەڵێت: "ئەگەر نامەکانم هەندێ زبرو ساردن، خەتای من نیە، تەبیعەتم وایە." بەو جۆرە پاکانەی بۆ هەڵویستی خۆی دەرهەق بەو ژنە کردووە. بە هەرحاڵ کاتێ گۆڤاری (هزری ڕووسی) دوای چەند هەفتەیەك چیرۆکێکی تازەی چیخۆفی لە ژێر سەرناڤی (دەربارەی ڤیان) بڵاوکردەوە، ئەمە ئەڤیلوڤای زۆر هاڕووژاند، وەکو خۆی لە یاداشتەکانیا: چیخۆف لە ژیانی مندا، دەڵێت: "کە چاوم بەم ناونیشانە کەوت، تەواو هاڕوژام. هەزارو یەك خەیاڵم تێوڕکا. گۆڤارەکەم هەڵگرت و بە هەشتاو بەرەو ماڵ پەل بوومەوە." دوای ئەوەی بە ئەڵهاو تاسەیەکی گەرم و گوڕەوە چیرۆکەکە دەخوێنێتەوە، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم چیرۆکە دڵدارییە نە بەکامە، لە ژێر پەردەیەکی تەنکدا، کەم تا زۆر، هەستی ئەو بە ڕانبەر بە نووسەر دەنوێنێ. ئیدی بە بۆچوونی خۆی، چیخۆف لە وێدا و لە میانەی (ئالیکین)ی کاراکتەری چیرۆکەکەوە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی خۆشەویستی خۆی بۆ ئەم دەرنەبڕیوە. لە یاداشتەکانیا دەڵێت: "ئیدی نەدەگریام، بەڵکو لێکدا لێکدا هەنسکم هەڵدەدا، لاپەڕەکانی گۆڤارەکەم بە فرمێسکان تەڕ کرد. یانی گلەیی لە من نە دەکرد، بەکەمتەرخەمی نە دەزانیم، بەڵکو پاکانەی بۆ دەکردم، لێم دەگەیی، خەفەتی بۆ دەخواردم.. ئەگەر خانەوادەکەی من نەیاندەهێشت بە ئانتون پاڤلوفیچ شادبم ، ئانتون پاڤلوڤیچش نەی دەهێشت دەگەڵ خانەوادەکەمدا شاد بم، هەنگێ دەبوایە ببم بە دوو بەشەوە." ئەڤیلوڤا، بە بۆنەی ئەم چیرۆکەوە، مەیلی تازە بووەوە، لێبڕا بە شێوازێکی دیکەو بە شێوەیەکی باشتر بکەوێتە ڕاوی چیخۆف، پەنای بردە بەر زمانێکی تەشەرئامێز. لەنامەکەیدا زۆر بە تووڕەیی

سوپاسی چیخۆڤ کرد، کە شەرەفی ئەوەی پێبەخشیوە بیکات بە قارەمانی یەکێك لە چیرۆکەکانی. باسی نووسەرێکی وەکو خۆی بۆ دەکات کە چۆن پەنای بردووەتە بەر ڕەفتارێن "دزێوو قێزەون" تا گوایە بتوانێ پاشان، بەشێوەیەکی واقیعیانە لە ڕۆمانەکانیا وەسف و بەرجەستەی بکات. لە سەری دەڕوات و دەڵێت: "نووسەر، وەکو مێش هەنگە، لە هەر شوێنێ هەنگوینی خۆی بدۆزێتەوە وەری دەگرێت . لە نووسین بێزارە. ئەوەندەی بابەت هەیە وا سەری دەخوات... کەچی بەوپەڕی خوێنساردی و بێموبالاتی، ئەو هەستانە دەردەبڕێت، کە ناخ و ڕۆحی لێیان بێ ئاگایە، چونکە تواناو بەهرەکەی دەروون و ڕۆحی تەرە کردووە. تا نووسەر ساردتربێ، حیکایەت و چیرۆکەکانی هەستیارتر و کاریگەرتر دەبن. ئیدی با خوێنەران، بە نێرو مێیانەوە، بە دەم خوێندنەوەیەوە بگرین! ئیدی هونەر ئەمەیە."

چیخۆڤ، زۆر ئاقڵانە و بە پارێزەوە وەڵامی ئەم نامە توندەی دایەوە کە: "بۆچوونەکەت دەربارەی مێش هەنگ دروست نیە. لە پێشا دەڕوات، گوڵی گەش و جوان دەدۆزێتەوە، ئەوجا لە سەری دەنیشێتەوەو شیلەکەی دەمژێ تا بیکات بە هەنگوین. سەبارەت بە بۆچوونەکانی ترت: بێزاری، بێتاقەتی و ئەمەی کە خەڵکی بەهرەمەند، تەنیا لەجیهانی خەیاڵ و وەهمدا دەژین و ئاشقێنی دەکەن – تەنیا دەتوانم ئەوە بڵێم کە ڕوح و ناخی بەشەر تاریکستانێکە، سەری لێ نایەتە دەرکردن... دەستەکانت دەگوشم. ئاگات لە تەندروستیت بێ، شادو بەختەوەر بیت. دۆستت ئا. چیخۆڤ." (بڕوانە نامەی ١٨٩٨/٨/٣٠)

ئەڤیلوڤا، کە بینی چیخۆڤ ئەمجارەش نەکەوتە تەڵەکەیەوەو خۆی دەدۆزێتەوە، زۆر توڕە بوو. بۆیە دەستی دایە قەڵەم و بەوە تۆمەتباری کرد کە دەیەوێ کۆتایی بەنامەو نامەکاریەکانیان بێنێ. چیخۆف، لە جیاتی ئەوەی ئەم دەرفەتە بقۆزێتەوەو بە ڕاستی ئەم ژنە سەرکێشە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، لە نامەیەکیا بۆ ئەڤیلۆڤا (١٨٩٨/١٠/٢١) دایە باریکان، پاشەکشەی کردو، کەوتە پاکانە کە: "نامەکەم خوێندیتەوە، هەر ئەوەندەم لە دەست دێ، دەست بۆ ئاسمان هەڵبڕم و سوێندت بۆ بخۆم و بڵێم ئەگەر هەندێ شت لە نامەکانما دەبینی، قسەی دڵم نین، ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێ نەزانم چۆن بیاننووسم... بە هەرحاڵ لیم زیز مەبە، بمبورە ئەگەر جۆرە زبری و ساردیەك لەو نامانەی دوایمدا هەبن، نیازی ئەوەم نەبووە بتڕەنجێنم."

دوای سێ ڕۆژ، لە ١٨٩٨/١٠/٢٤دا، بە هەمان زمانی نەرم و دۆستانە، نامەیەکی بۆ لایکاش نووسی، سوپاسی لایکای کرد بوو کە وێنەیەکی شەخسی خۆی بۆ نارد بوو. لە کۆتایی نامەکەدا دەڵێت: "هەرشاد و خۆش بیت، دۆستی دێرینی خۆت لە بیر مەکە.. ئا. چیخۆف" هەرچەندە دەترسا، مەکری ژنانە، ئاسایش و ئاسوودەیی بشێوێنێ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتیش حەزی نەدەکرد ئەو پێگەیە لە دەست بدات کە لە هەست و سۆزی ئەو کیژە جوانانەدا پەیدای کرد بوو.

کاتێ هەر لەو ڕۆژانەدا، میخائیلی برای بەردەوام گوشاری لێدەکرد کە ژن بێنێ، لە ڕۆژی ١٨٩٨/١٠/٢٦دا لە نامەیەکا، بە ڕوون و ڕەوانی، ڕاو بۆچوونی خۆی لەو بارەیەوە پێ دەڵێت: "سەبارەت بە ژن هێنان کە ئەوەندە دووپاتی دەکەیتەوە، نازانم چی بڵێم؟ جارێ زەماوەندێك

زەماوەندە کە بە ئەشق بیٚ. خواستنی کیژیٚك تەنیا لەبەر ئەوەی جوانە، وەکو ئەوەیە بچی لە بازاڕ شتیٚك بکڕی پیٚویستت پیٚی نەبیٚ، تەنیا لەبەرئەوە بیکریت کە جوانە، کۆڵەکەی ژیانی خانەوادەیی خۆشەویستی و جازیبەی جنسی و یەکیٚتی ژنی و میٚردە. ئیدی شتەکانی دی، هەر هەمووی فشەیە، چەند حیساب و کیتبای وردیشی بۆ بکەین، زەحمەتە وا دەربچیٚت. کەواتە مەسەلەکە هەر ئەوە نیە کچیٚکی جوان بدۆزیتەوە، بەڵکو کچیٚك بدۆزیتەوە کە خۆشت بویٚ."

چیخۆف، تا ئەوکاتە نەك هەر ئەو کیژەی نەدۆزی بووەوە، تەنانەت لە دڵی خۆیدا لە دۆزینەوەشی دەترسا، کە ئەو کەسە ژیانی لیٚ بئاۆزیٚنیٚ! ئایا بە خۆی توانای ئاشقیٚنی مابوو؟ ئەویٚ کە نەخۆشی بڕستی لیٚبڕی بوو، خۆ بەخۆ خۆی لە دنیا دوور دەگرت. سۆزو گودازی دابوویە کزی و پەیوەندیە سۆزداریەکانی زیاتر لە ڕیٚگەی نامەو نامەکارییەوە بوو. بەڵام هەندیٚجاریش لە هەڕەتی سستی و بیٚ تواناییدا، کۆمەڵیٚك ئارەزوو و ئاوات بەرۆکیان دەگرت، بۆ نمونە: دروستکردنی خانوویەکی تازە، چیرۆکیٚکی باشتر لە دوا چیرۆکی خۆی بنووسیٚت، ئافرەتیٚکی ناسك، زیرەك و چالاك و چەلەنگ حەزی لیٚبکات، وەکو ئولگاکنیپەر کە ڕۆڵی ئارکادینای ژنی تزاری لە شانۆنامەی نەورەسدا بینی.

ئیدی ئەوەی بۆ مابووەوەو دڵی پیٚی خۆش بوو تەنیا نووسین و تەلارکاری بوو، خانووەکەی ئاوتکای خەریك بوو بەرز دەبووەوە و پیٚدەچوو خانوویەکی جوان و لەبەر دڵان دەربچیٚت. نەورەسەکەی لە مۆسکۆدا، هیٚشتا لە هەڕەتی برەودا بوو. کۆچیرۆکەکانی بە بازاڕو خۆشفرۆش بوون . تەنانەت سوڤورین چاپ و بڵاوکردنەوەی کۆ بەرهەمەکانی گرتبووە ئەستۆی خۆی، بەڵام هیٚندە بە خاوی کاری لەو پرۆژەیەدا دەکرد، کە چیخۆف دەیگوت ئەگەر کار وا بڕات و ئەو بایە لەو کونەوە بیٚت، دوا بەرگی کۆ بەرهەمەکانم تا ساڵی ١٩٤٨ بڵاونابیٚتەوە. ئەدۆلف مارکسی، وە شانکاری بە ناوبانگ، کە تازە ڕۆمانی (ژیانەوەی) تولستۆی چاپ و بڵاو کردبووەوە، وەختیٚ لەریٚگای سیرکینکۆوە دەبیستیٚ کە چیخۆف لە سوڤورین پەستە، پیٚشنیاز دەکات هەموو بەرهەمەکانی چیخۆف بکڕیٚت و بە زوترین کات چاپیان بکاتەوەو پیٚشنیازی ئەوەشی کرد نەك بە گویٚرەی سەرڨ بەرهەمەکان لە بازاڕا، پارەکەی بداتیٚ، بەڵکو یەکسەری و لە یەك جیٚگەدا هەموو پارەکەی بداتیٚ. هەڵبەتە ئەمە بۆ کەسیٚکی وەکو چیخۆف، تەماحیٚکی گەورە بوو کە لە شەو ڕۆژیٚکا ببیٚ بە خاوەنی پارەو پولیٚکی باش، بۆیە بەو پیٚشنیازە قاییل بوو، چونکە دەیتوانی هەم هەموو قەرزەکانی پیٚبداتەوە و هەم خانووەکەی ئاوتکای پیٚ تەواو بکات و دایکی و ماریاش لە دەستکورتی و نەبوونی ڕزگار بکات. هەڵبەتە لە ڕووی وەفای ئەخلاق و ئەودەبەوە بە سوڤورینی ڕاگەیاند کە نیازی غەدریکی ئاوهای هەیە. ئیدی ئەو ڕازی بیٚ یان ناڕازی. بەڵام ماری خوشکی تکای لیٚدەکرد، سویٚندی دەدا کە دەستبەرداری هەموو مافەکانی نەبیٚت و پیٚشنیازی دەکرد کە خۆی ئەرك و سەرپەرشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی براکەی دەگریٚتە ئەستۆ (وەکو چۆن هاوسەرەکەی تولستۆی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی میٚردەکەی گرتبووە ئەستۆ.)
بەڵام چیخۆف وەڵامی دایەوە کە ماریا بە خۆڕایی خەمی لە خۆی هیٚناوە و پیٚویست بە هیچ نیگەرانیەك ناکات، چونکە ئەم بە خۆی دەزانیٚ چیدەکات و بەرهەمەکانیشی هەرزان فرۆش

ناکات. چیخۆف داوای هەشتا هەزار ڕۆبڵی دەکرد، مارکس پەنجا هەزاری دەدا، ئەنجام لەسەر حەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ ڕێکەوتن. بەڵام ئەم مامەڵەو قەرارداده کە لە ڕۆژی ٢٦/ك٢/١٨٩٩ ئیمزا و مۆر کرا، بە ئاشکرا زەرەوی چیخۆف بوو. دەقی قەراردادەکە وابوو کە چیخۆف لە هەنبەر ئەو هەفتاو پێنج هەزار ڕۆبڵەی کە بیست هەزاری دەگەڵ ئیمزاکردنی قەراردادەکەدا وەردەگرت و باقیەکەی بە چوار قیست و لە ماوەی دوو ساڵدا پێ دەدرا، دەستبەرداری ماڤ بڵاوکردنەوەی هەموو بەرهەمەکانی، جگە لە شانۆنامەکان، ببێت بۆ مارکسی وەشانکار. سەبارەت بە بەرهەمەکانی داهاتوو، ماڤ چاپی یەکەم بۆ نووسەر دەبێت و پاشان لە بری پارەیەکی زیادەو بەپێی مەلزەمە حیسابی، دەبێ بە موڵکی وەشانکار. هەرچەندە چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ ماریا، باسی جۆرە ناچارییەکی خۆی لەو مامەڵەو سەودایەدا دەکات، بەڵام ئەوەش دووپات دەکاتەوە، بەلای کەمەوە خەمی ئەوەی لە کۆڵ دەبێتەوە کتێبەکانی بە باشی چاپ نەکرێت و ئیدی بێخەم و خەیاڵ کاری خۆی دەکات. لە ڕاستیدا بۆیە بەو مەرجە تایبەتیانە قاییل بوو، چونکە دەیزانی تەمەنێکی کورتی ماوەو زۆر ناژی، بۆیە حەزی دەکرد ئەو چەند ساڵە کەمەی بە خۆشگوزەرانی بەرێتە سەرو مارکسی وەشانکار دەبێ بە فریارەسی دواساڵەکانی تەمەنی.. لە نامەیەکیا بۆ لایکا (٢٢/ك٢/١٨٩٩) دەڵێت: "شتێکی گرینگ لە ژیانمدا ڕووی داوە... چ ڕووداوێك؟ ژن دێنم؟ مەزەندەی لێبدە... ژن دێنم؟ ئەگەرت وازەن دەبەی، باشە کێ دێنم؟ نەخێر، ژن نایەنم، خەریکم هەموو بەرهەمەکانم بە مارکس دەفرۆشم... خەریکی مامەڵەو سەوداین، لە وەیە لە زەرفی یەك دو ساڵدا تەواو دەڵەمەند ببم." بە شۆخی و سوعبەتەوە بە برادەرەکانی دەگوت: "بووم بە مارکسی"

هەڵبەتە هەستی بەجۆرە عەزابێکی ویژدان، دەرهەق بە سوڤورین دەکرد. بەم کارەی، کۆتایی بە هاوکارییەکی سیازدە ساڵەی نێوان خۆیان هێنا. هەرچەندە لە ڕووی ئەدەبەوە، سوڤورینی لە دانوستان و گفتوگۆیەکەی نێوان خۆی و مارکس ئاگادار کردبووەوە، بەڵام بە پێویستی دەزانی، جارێکی دیکەو، بە نامە هۆو ئەنگێزەی ئەو قەراردادەی بۆ ڕوون بکاتەوە. ئەوەتا دەڵێت: تەنیا نەبونی و، پێویستی بەپارەیەکی زۆرو یەکسەری، ناچاری کردووە مل بۆ ئەم سەوداو مامەڵە قورسە بدات، بەڵام وێڕای ئەوەش گورگ ئاسا بەرگری لە خۆی کردووەو تەنازولی لە شانۆنامەکانی نەکردووە. لە نامەیەکیا (٢٧/ك٢/١٨٩٩) بۆ سوڤورین دەڵێت: "ماڤ شانۆنامەکانم بۆ خۆم پاراستووە، دوای خۆشم بۆ میراتگرەکانم دەمێنێ. ئەمەم بە تۆبزی لە مارکس پچڕیوە. بەمجۆرە قۆناغێکی تازە دەستی پێکرد... وێڕای ئەوەش ناڕەحەتم، هەست دەکەم دەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەندا زەماوەندم کردووە... لە نێو کاسبکارانا قسەیەکی باو هەیە دەڵێت کە پێکەوەن لە شەڕان، بەڵام بە ئاشتی جیادەبنەوە. ئێمەش بە ئاشتی و دۆستانە لێکدی جیا دەبینەوە – هەرچەندە من و تۆ پێکەوەش بووینو هیچ کێشەیەکمان نەبوو – پێموایە بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە تۆ کتێبەکانی منت بڵاودەکردەوە هیچ دڕدۆنگیەکمان نەکەوتە بەینەوە، بەڵکو هەندی کاری گەورەشمان پێکەوە کرد."

بەگوێرەی قەرارداردەکە، دەبوایە چیخۆف لە زەرفی شەش دانە مانگدا نوسخەی هەموو بەرهەمەکانی، لە کۆنترینیانەوە تا تازەترینیان بە مارکس تەسلیم بکات. دیارە ئەمە کارێکی

یەجگار دژوار بوو، بە تایبەتی لەو ڕووەوە کە گەلێك لە چیرۆکە زۆر زەبەندەکانی سەرەتای، لە هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤارێن ساتیردا بڵاوبووبوونەوە، کە وەستابوون و دەرنەدەچوون. ئەم کارە خۆی گوتەنی، وەکو ئەوە وابوو، داوای لێبکەن، ئامارێك بە ژمارەی هەر هەموو ئەو ماسیانە بگرێت، کە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا ڕاوی کرد بوون. کاتێ هەندێ لە چیرۆکە کۆنەکانی پەیدا کردنەوە، بە زۆربەیاندا چووەوە، هەر چیرۆکێکی کەمێك شاشی و واشی تیا بوایە، پێیدا دەچووەوەو دایدەڕشتەوە. دیارە خۆی گوتەنی ئەم بێگارە، بە هۆی کەمی کتێبخانان و ئەرشیفخانان لە یاڵتادا، هێندەی دی باری سەرشانی قورس دەکرد. کە هەستی کرد زۆر ماندووەو بە تەنیا دەرۆستی ئەم کارە نایەت، هانای بردە بەر ماریاو ئەلکسندر، ئەوانیش قۆڵیان لێ هەڵماڵی و کەوتنە گەڕان بە بڵاوکراوەو بلاڤۆکەکانی مۆسکۆ و سان –پترسبۆرگدا، ئیدی هەر چیرۆکێکیان دەدۆزییەوە، نوسخەیەکیان لەبەر دەگرتەوە. بەڵام سەبارەت بەو چیرۆکانەی کە لە گۆڤاری (سان– پترسبۆرگ) بڵاوی کردبوونەوە، ئەو گۆڤارەی کە شووبرایەکەی لیدیا ئەڤیلوڤا، سەرنووسەری بوو، چیخۆف نامەیەکی بۆ ئەو خانمە گەنجە ڤڕێ کرد، تکای لێکرد، یارمەتی بدات. لەنامەکەدا داوای لێکرد بوو یەکێکی بۆ بدۆزێتەوە، هەم چیرۆکەکانی بۆ بدۆزێتەوە و هەم کۆپییان بکات. هەڵبەتە ئەوەشی فەرامۆش نەکرد کە بەدەم ئەم داواکاریەوە، دڵنەواییەکیشی بکات و کاریگەری ئەو نامە توندانەی ئەو دواییانەی نێوانانی، کەمێك لێبڕەوێنێتەوە. بۆیە لە کۆتایی نامەکەیدا، بەجۆرە عوزرخواییەکەوە دەڵێت: "بەلای کەمەوە، ئەوەندەم بۆ بنووسە کە لێم زیز نیت، ئەگەر بڕیاریشت داوە هیچ نامەیەکم بۆ نە نێری، هەر ئەوەندەم بۆ بنووسە کە لێم زیز نیت." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٩/٢/٥).

دیارە ئەڤیلوڤا، ئەم داوایەی زۆر پێخۆش بوو، لە خوای دەویست خزمەتێکی ئەو پیاوە گەورەیە بکات، کە هێشتاش هەر بە ئاشقی خۆیی دەزانی، ئیدی بەڵێنی دا کە بەخۆی (واتا ئەڤیلوڤا) ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆو، بە ڕاستی و دڵسۆزانەش بەڵێنەکەی بردە سەرو چیخۆفیش زۆر لیی مەمنوون بوو. ئەو نامانەی کە لە ماوەی دەورانی کورتی ئەم هاوکاریەدا بۆ ئەڤیلوڤای ناردن، هەندی نەرمتر بوون و، لەوە نەدەچوو وەکو جاران لیی (لە ئەڤیلوڤا) بترسێت. لە نامەیەکی ١٨٩٩/٢/١٨دا بۆ ئەڤیلوڤا دەڵێت: "بۆچی من لە یاڵتام؟ بۆچی ئێرە ئەوەندە ناخۆشە؟... بەفر دەبارێ، زریانێکە ئەو پەڕی دیار نیە. گژەبا خۆی بە پەنجەرەکاندا دەکێشێت. ئارەزووی نووسینم نیە و هیچ نانووسم... تۆ فرە میهرەبانی، هەزارجار ئەمەم گوتووەو جارێکی دیکەش بۆتی دووبارە دەکەمەوە.

زستانی قرم یەجگار سارد بوو، هەموو کارێکی خانووەکەی ئاوتکا وەستا، دەبوایە چاوەڕوان بکات، تا هەوا خۆش دەکات و ئەوجا دەست بە بیناکاری بکاتەوە. ئەم خانووە کۆشکێکی زۆر گەورە بوو، لە دیوی باکوو ڕەوە دوو نهۆم و لەدیوی باشوورەوە سێ نهۆم بوو، لەسەر تەرزێکی غەریب دروستی نەکرد بوو، بورجێك و بانیژەیەك و ڕاڕەوێکی شووشەیی هەبوو. چیخۆف کە هەستی بەجۆرە نائومێدیەك دەکرد، ناوی نابوو (قوتووی سەردین). چیخۆف مجێزو تەبیعەتی وابوو زۆر بە گەرمی دەستی دەدایە پرۆژەیەك و هەرکە تەواو دەبوو، ئیدی لێی سارد دەبووەوە.

لەم سەروبەندەدا تەواو سەرقاڵی نەخشە دانانی باخەکەی بوو، ڕاڕەوەکانی دیاری کردبوو، چیمەن و گوڵزارەکانی دەست نیشان کردبوو. دوو کرێکاری تورك بە فێستی سوورەوە، گڵ و خاکیان فەراهەم دەکرد، ئەمیش لە چاڵێکەوە دەچووە سەر چاڵێکی دیکە، نەمامی تازەی دەناشت، ڕووەك و گوڵانی دەڕواند. لە نامەیەکیا (١٨٩٩/٣/٢٤) بۆ ماری خوشکی دەڵێت: "بە ڕاستی ئەفسونێکی ڕاستەقینەیە، دوازدە نەمامی گێلاسم ناشتووە، چوار دار توو، دوو بادەم و چەند داریکی دیکە. دارە کۆنەکان چرۆیان کردووە، دارە هەرمێکە لە شکۆفەکردندایە، بادەمەکە گوڵی پەمەیی کردووە. باڵندە کۆچەرییەکان بەدەم کۆچی خۆیانەوە بەرەو باکوور، لە باخەکەدا شەو ڕۆژ دەکەنەوە و بەیانی بەدەم خوێندنەوە، بە تایبەتی هەوێردە، لە خەو ڕادەبن."

هەرچەندە چیخۆف پارەیەکی زۆری لە خانووەکەی ئاوتکا خەرج دەکردو پێویستی بە پارە بوو بۆ تەواوکردنی، بەڵام کە سەرە دەهاتە سەر کۆکردنەوەی پیتاك و باربوو، زەرەیەك دەستی نەدەگرتەوەو بەوپەڕی دەست و دڵ کراوەیی دەچووە بەرەوە. هەر کە یەکەمین قیستی پارەکەی لە مارکس وەرگرت، پینج سەد ڕۆبڵی بۆ بینای قوتابخانەی گوندێکی نزیکی یاڵتا تەرخان کرد. کە بە ڕێکەوت تووشی گافریوشکا بوو، کە جاران لە دوکانەکەی تاگانروك دا، شاگردی باوکی بوو، بەڵێنی دایە کە خەرجی مانگانەی قوتابخانەی کیژەکەی بکێشێت. کاتێ ئەلکسندری برای لێبڕا خانوویەکی چکۆڵە، لە گوندێکی دەرێی سان- پترسبۆرگ بۆ خۆی دروست بکات، هەزار ڕۆبڵی دایە. ئیدی چیخۆف نامەکانی بۆ ئەلکسندر بەمجۆرە ئیمزا دەکرد: "برا و کیسەی پارەی تۆ" یان "مرۆڤ دۆستی دەوڵەمەند.".

تا زیاتر شۆرەت و ناوبانگی دەردەکرد، بێگانان پتر ڕوویان تێدەکرد، نەك هەر لە پێناوی کۆمەکی دارایی یان ئامۆژگاری و ڕێنوێنی دەربارەی شێوازی نووسین، یان وەسێتنامەیەك بۆ وەشانکارێك، بەڵکو بۆ زانینی ڕاوبۆچوونی ئەویش دەربارەی دۆزو کێشەکانی ڕۆژیش. دیارە پرسیاری کێشەکانی ڕۆژ زۆری ناڕەحەت دەکرد. بە درێژایی تەمەنی ڕەفزی دەکرد هەڵوێست لەمەڕ ڕووداوە سیاسی و جڤاکیەکان بگرێت. کاتێ شەپۆلی مانگرتن و خۆپیشاندانی خوێندکاری لە سان -پترسبۆرگەوە دەستی پێکردو بە سەرانسەری وڵاتدا تەشەنەی کردو ژمارەیەك گەنج، بە هۆی پێکادانی توندەوە دەگەڵ پۆلیسدا، لە زانستگە دەرکران یان گیران، هەندێ کەس بە نامە داوای ڕاوبۆچوونیان لە چیخۆف دەکرد، داوایان دەکرد پشتیوانیان لیبکات بەڵام ئەو کە بە درێژایی تەمەنی خۆی لەکارو باری گشتی و سیاسی دوور دەگرت، ئەمجارەش پەنای وەبەر هەمان پرەنسیپ بردەوە کە هونەرمەند نابێ خۆی لەپرس و مەسەلە گشتییەکان هەڵقورتێنێ. ئەوە بوو لە ١٨٩٩/٤/١٧ دا نامەیەکی بۆ لیدیا ئەڤیلوڤا نووسی کە: "ئایا ئەرکی ئێمەیە خۆ لەم وەزعە هەڵقورتێنین؟ ئایا ئەمە کارو ئەرکی پۆلیس و دەرەك و ئاسایش نیە کە لە بنەڕەتدا بۆ ئەو کارە دامەزراون؟ خۆ ئەگەر قەراربێ هەر شەڕێك بکەین، هەر هەڵوێستێك بگرین، هەر داوەریەك بکەین، جگە لە چەکی قەڵەم نابێ هیچ چەکێکی دیکە بەکار بەرین."

هەرچەندە خۆی لە خۆپیشاندانە زانکۆییەکان دوور گرتبوو، بەڵام بە ئاشکرا، بە قسەو بە نووسین ڕەخنەیی لە ڕەفتاری دڕندانەو سەرکوتکەرانەی دەوڵەت دەگرت. تا زیاتر دەچووە

تەمەنەوە، پتر لە توندڕەوییەکانی ڕژێمی سەرکوتکاری وەخت بێزار دەبوو. کەچی وێڕای ئەوەش ڕۆژێ لە ڕۆژان لە سوسیالزمی شۆرشگێڕی گۆرکی نزیك نەبووەوە. لە بزووتنەوە جەماوەریەکان دەترسا. لێبراڵێکی سەرسەخت بوو، دژی توندو تیژی و زەبرو زەنگ بوو چ لە لایەن ڕژێمەوەو چ لە لایەن خەڵکەوە. پێی وابوو ئەوەی گۆڕانکاری ئاشتیانە لە ڕووسیادا دروست دەکات، کاری جەماوەر نیە، بەڵکو کاری خەڵکانێکی تەنیاو ڕەسەنە. لە ١٨٩٩/٢/٢٢دا، لە نامەیەکا بۆ برادەرێکی دێرینی، پزیشکی گوندی، ئورلوف دەڵێت: " من باوەڕم بە تاك هەیە. من ڕزگاری لەو کەسانەدا دەبینم. کە لێرەو لەوێ، لە سەرانسەری ڕووسیادا پەراگەندەن، ئیدی چ ڕۆشنبیرو هزرڤان بن، چ گوندی و جووتیار. کاری ئەوانە گرینگە، با ژمارەشیان کەم بێت... هیچ کەسیك لە وڵاتی خۆیدا پێغەمبەر نیە... ئەو خەڵکانەی من باسیان دەکەم ڕۆڵێکی نادیار لە کۆمەڵگەی خۆیاندا دەبینن. ئەوانە دەستیان بەسەر کەسدا ناڕوات، بەڵام ئەنجامی کارەکانیان وەکو ڕۆژ لای خەڵکی عەیانە. بە هەرحاڵ زانست لە پێشکەوتندایە، هۆشمەندی جڤاکی ڕوو لە زیادیە، مەسەلە ئەخلاقیەکان بە ئاشکرا دەخرێنە ڕوو. هەر هەموو ئەم گۆڕانکاریانە، سەرباری هەمو لەمپەرو کۆسپەکان، بە شێوەیەکی سەربەخۆ ڕوو دەدەن، دوور لە دەست تێوەردانی ڕۆشنبیران، پارێزەران، ئەندازیاران و محافەزەکاران، ڕوو دەدەن."

وەکو چاوەڕوان دەکرا، سوڤورین، هەڵوێستێکی یەجگار توندی لەمەڕ خۆپیشاندەران و سەبەبکارانی خۆپیشاندانەکان وەرگرت، دوو وتاری لەو بارەیەوە نووسی و، بە ئاشکرا خۆپیشاندەرانی مەحکوم کردووەو پشتیوانی لە تزار دەکات کە لیژنەیەکی تەحقیقی بۆ ئەم مەسەلەیە پێکهێنا بوو، دیارە مەبەستی ئەو لیژنەیە بە ئاشکرا، سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی بزوتنەوە خوێنکاریەکە بوو. ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو دوو وتارە ئەوە بوو، کە ڕۆشنبیران و نووسەران، بایکۆتی ڕۆژنامەکەی سوڤورین (ڕۆژگاری نوێ)یان کرد. ئەوە بوو گۆرکی لە (ژیان)دا وتارێکی توندی لەو بارەیەوە بڵاوکردەوە، ئیدی بەرە بەرە دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە سوڤورین، لە بری ئەو دوو وتارە دە هەزار ڕۆبڵی لە حکوومەت وەرگرتوە. ئەوە بوو نەك هەر ڕادەو ڕێژەی فرۆشی (ڕۆژگاری نوی) بە تەواوەتی دایە کزی، بەڵکو چەند کەسیك لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەش دەستیان لە کارکێشایەوە. پاشان دوای ماوەیەکی کەم کۆمەڵەی کۆمەکی دوولایەنەی نووسەرانی ڕووس، سوڤورینی بەڕێوەبەری (ڕۆژگاری نوێ)یان داواکرد کە بۆ لێپێچینەوە لە دادگای شەرەڤ کۆمەڵەی ناوبراو ئامادە بێت تا هۆی ئەو هەڵوێستەی خۆی ڕوون بکاتەوە یان لە ئەندامیەتی کۆمەڵە بخرێ. بەڵام سوڤورین، کە لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ دەهات و بەخۆیشی نەخۆش بوو، تیا مابوو چ بکات. لە هەڕەتی پەرێشانی خۆیدا نامەیەکی بۆ چیخۆف نارد و داوای ڕاوێژ و تەگبیری لەو کرد. هەڵبەتە چیخۆف بەوپەڕی ڕاشکاوی وەڵامی دەداتەوە کە لە وتارەکانی ڕازی نیەو بەوە تۆمەتباری دەکات کە بە شێوەیەکی زۆر سەرڤە سەرڤە و ناشیانە خۆی لە مەسەلەیەکی ترسناك داوەو بە خۆڕایی پشتیوانی لە حکومەتێك دەکات کە بە ئاشکرا سنووری دەسەڵاتی خۆی دەرهەق بە خەڵکی بەزاندووە. لە کاتێکا ماف و عەدالەت بۆ دەوڵەت و بۆ کۆمەڵگە یەکسانەو "چەمکی دەوڵەت، دەبێ لە سەر

پرەنسیپ و بناغەی قانون ڕۆبنرێ، ئەگەر وانەبێ، دەوڵەت دەبێ بە داهۆڵ، دەبێ بە تەپڵێکی بۆش و بەتاڵ، دەبێت بە ئامێری ترساندن." (بڕوانە نامەی ١٨٩٩/٣/٤) چیخۆف دوای چەند هەفتەیەکی دی دەگەڕێتەوە سەر هەمان بابەت و لە نامەیەکی دیکەیدا (١٨٩٩/٤/٢) بۆ سوڤورین، بە وردی هەڵوێستی خۆی دیاری دەکات و دەڵێت: "کاتێ کە ڕێگەی خەڵکی نەدرێ بە ئازادی ڕای خۆ دەربڕن، بە ئازادی گوزارشت لە بیرو بۆچوونی خۆ بکەن، هەنگێ بە تووڕەیی دەری دەبڕن، زۆرجار، هەڵبەتە لە ڕوانگەی حکوومەتەوە، بە شێوەیەکی دزێو و ترسناک گوزارشتی لێدەکەن. دەیسا با ئازادی ڕۆژنامەوانی و ئازادی بیروباوەڕ بە خەڵکی بدەن، بزانە چۆن ئەوساکە ئەو هێمنی و ئارامیە بەرقەرار دەبێ کە ئاواتی هەموو لایەکە، ڕاستە ڕەنگە درێژخایەن نەبێ، خۆ بەلای کەمەوە، تا ئێمە لە ژیاندا بین بڕدەکات."

وێڕای هەموو ئەمەش، چیخۆف دەگەڵ بیرۆکەی دادگایی کردنی سوڤورین لە دادگای شەرەف (کۆمەڵەی کۆمەکی...)دا نەبوو: ڕەنگە ئەو جۆرە دادگایی کردنە بۆ نموونە بۆ ئەفسەرانی سوپا ماقولیەتێکی تێدا هەبووبێ، بەڵام بۆ نووسەران، کە ئەرکیان ئەوە بوو بە ئازادی گوزارشت لە بیرو باوەڕی خۆیان بکەن و لە هیچ دادگایەك نەترسن، ماقوول نەبوو ( هەڵبەتە سوڤورین بۆ دادگای ناڤبری نەچوو) دیارە چیخۆف پێی وابوو، تەنیا دەستەی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (ڕۆژگاری نوێ) خۆیان لەو ڕیسواییە بەرپرسیار بوون کە تووشی ڕۆژنامەکە بوو بوو ولەو بارەیەوە دەڵێت: "خەڵکی گەیونەتە ئەو باوەڕو قەناعەتەی کە ڕۆژگاری نوێ، کۆمەڵێك یارمەتی دارایی لە حکومەتی ڕووسی و لەسەرکردایەتی گشتی سوپای فەرەنسی وەردەگرێت و ڕۆژگاری نوی بە هەموو توانایەکی خۆیەوە هەوڵدەدات داکۆکی لەم هەڵوێستە ناشایستەیە بکات... خەڵکی وا هەستدەکەن، تۆ پیاوێکی لای حکومەت دەستت دەڕوات، تۆ پیاوێکی ستەمکارو دڵڕەقیت. لەوەش خراتر ڕۆژگاری نویێ کارێکی وای کردووە کە ئەو بەدحاڵی بوونە، تا زۆرترین ماوە، لە هزرو بیری کۆمەڵگەی ئێمەدا بمێنێ." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٩/٤/٢٤).

وەکو گوترا سوڤورین ڕەفزی کرد بچێت بۆ دادگای شەرەف. بەڵام ژنەکەی تووڕە بوو، چیخۆڤ بەوە تۆمەتبار کرد کە لە هەڕەتی تەنگانەدا، دەستبەرداری دۆستایەتی مێردەکەی بووە. چیخۆف لە ١٨٩٩/٥/٢٩دا نامەیەکی بۆ دەنێرێت و دەڵێت: "تۆ گلەییم لێدەکەیت کە من بابایەکی بێ وەفام. دەڵێی ئەلکسی سیرگیوفیچ پیاوێکی میهرەبان و دڵپاك و مرۆڤدۆستە، من گەنگەشەی میهرەبانی ئەو ناکەم. بەڵام، من وەکو کەسێك کە لە ناخی دڵەوە چاکەو خێری ئەوم دەوێ، چیم لە دەست دەهات، دەمتوانی چی بۆ بکەم (بۆ سوڤورین) پێم ناڵێی؟ ئەم وەزعەی ئێستا زادەی ئەمڕۆ نیە. ئەمە کەڵەکەی ساڵانێکی دوورو درێژە. ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی دەیڵێن تازە نیە، دەمێکە، لە هەموو شوێنێ بە سەر زاری خەڵکیەوە بووە. بەڵام ئێوە، تۆ و سوڤورین، حەقیقەتتان نەدەبینی، وەکو چۆن پاشایان حەقیقەت نابینن. ڕاستە (ڕۆژگاری نوێ) بە قۆناغێکی دژواردا دەڕوات، بەڵام وێڕای ئەوەش بۆ خۆی هێزو دەسەڵاتێکە، هەروەش دەمێنێتەوە، دوای ماوەیەك دەگەڕێتەوە سەر دۆخی خۆی، وەکو جارانی لێدێتەوە، هیچ شتێك ناگۆڕێت، وەکو جاری جاران بەردەوام دەبێتەوە."

هەق بە چیخۆف بوو، بەسەهوو نەچوو بوو. زەینی گەلی ڕووسی کورت بورد بوو. هەرکە گێژەڵوکەکە نیشتەوە، ڕۆژگاری نوێ، وەکو بەرزەکی بانان هاتەوە مەیدان و درێژەی بە کاروانی پرشکۆی خۆی دایەوەو، پێگەی سوڤورینیش، گەڕایەوە دۆخی جاران. هەرچەندە خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران و مەسەلەکەی مارکس و دۆزەکە دریڤوس، ئەم دوو پیاوەی تەواو لێکدی دوور خستبووەوە، بەڵام چیخۆف نەیتوانی پەیوەندی خۆی دەگەڵ ئەو دۆستە دێرینەیدا قەت بکات و، نامەی لێ نەبڕی، تەنانەت چەند جارێکیش سوڤورینی دەعوەت کرد کە بچێ بۆ یاڵتاو سەری بدات، بەڵام سوڤورین* کە لەو سەرو بەندەدا غرووری بریندار بوو بوو، بە دەنگیەوە نەچوو وهەرگیز سەردانی نەکرد.

هەرچەندە سوڤورین، خۆی لەو سەردان و دیدەنیە بواردو نەچوو، بەڵام گۆرکی بەخۆشحاڵیەوە، دەعوەتەکەی قەبووڵ کردو، هەر لە یەکەم دیداریانەوە لە یاڵتا، دڵبەندو شیفتەی چیخۆف بوو. جیخۆفیش زۆر بەم دۆستە گەنجەی ئاسوودە بوو. ئیدی بەدوو قۆڵی ڕۆژانی تەواو یان بەدەم باس و گەنگەشەی هونەرو ئەدەبیات و سیاسەتەوە بەسەر دەبرد. باسی شاکارەکانی شارستانیەتی ڕۆژاواو وەزع و حاڵی دژوارو نالەباری مامۆستایانی ڕووسیان دەکرد. چیخۆف بەگۆرکی دەڵێت: "خۆزگە دەتزانی کە گوندان و دێهاتی ڕووس چەندیان پێویست بە مامۆستای باش، هوشیار و زیرەك و ڕۆشنبیر هەیە!... مامۆستا پێویستە هونەرمەندێك بێ ئاشقی پیشەکەی خۆی. بەڵام لای ئێمە کەسێکی کرێگرتەی کۆڵکە خوێنەوارە، کە دەڕوات بۆ دێهات تا گوایە دەرس بە منداڵان بڵێتەوە، هێندە لە گیانی گرانە دەڵێی بۆ زندان دەڕوات. برسی، بێ ڕوو، داماو، دەترسێت بژێوی ورزق و ڕۆزیەکەی لە دەست بدات... کاتێ مامۆستایەك دەبینم، لە ئاستیا تەریق دەبمەوە، شەرمەزاری ڕووت و ڕەجاڵیەکەی دەبم. چونکە شڕپۆش و شڕۆڵەیە، هەست بە کەمی وکێماسی دەکات. وا هەستدەکەم من سەبەبکاری بەدبەختی مامۆستام." (بڕوانە یادگاریەکانی ماکسیم گۆرکی دەربارەی تولستوی، چیخۆف و ئاندرێیڤ. پاچڤەی س. س. کوتلیانسکی و لیونارد ولف. لەندەن: وەشانخانەی هاگرت، ١٩٣٤، ل ٩٢ –٩٣). گەلێك لەو مامۆستایانەی بۆ یاڵتا دەهاتن، نەخۆش و دەردەدار بوون. چیخۆف لێبڕا، تیمارخانەیەکیان بۆ دروست بکات. گۆرکی زۆری هاندا بۆ ئەم کارە جوان و شایستەیە. چیخۆف، دەگەڵ گۆرکی دا، وەکو نووسەرێکی هەڵقوڵاوی ناو ڕەمەکی مەردم و کەسێکی زۆر ئایدیالیست و سادەو ساکار، زۆر خۆشحاڵ بوو، دەگەڵ ئەم دا خۆشحاڵتر بوو تا لە گەڵ نووسەرانی هەستیارو سەفسەتەبازی سان –پترسپۆرگ و مسکۆ. لە ١٨٩٩/٣/٢٣دا، نامەیەك بۆ لیدیا ئەڤیلوڤا، دەربارەی گۆرکی دەنووسێت و دەڵێت: "بە ڕواڵەت لە سالوك و ماڵ بەکۆڵان دەچێ، بەڵام لە ناخا پیاوێکی زۆر شایستەو نەفس بەرزە. من زۆر پێی ئاسوودەم. دەمەوێ بەچەند ژنێکی بناسێنم، چونکە پێموایە ڕەنگە ئەمە بۆ ئەو باش بێ، کەچی مل نادات." هەروەها لە نامەیەکی دیکەدا. (١٨٩٩/٣/٣٠) بۆ ڤاسیلی روزانوڤی ڕەخنەگرو هزرڤانی بە ناوبانگ، دەربارەی گۆرکی دەڵێت: "ئێستا گۆرکیم لایە. ئینسانێکە سادە، دەربە دەر، بەگەورەیی دەستی بەخوێندن و خوێندنەوە کردووە، جا ئێستا وەکو تامەزرۆ هەر بڵاوکراوەیەکی دەست دەکەوێ خێرا دەیقۆزێتەوەو بێ

هـیچ پێشـداوەریەك بـەدڵ و بـەگیان بـەر دەبێتـە خوێندنـەوەی، وەکـو ئـەوەی سـەرلەنوێ لـەدایك ببێتەوە.".
گـۆرگیش، لای خۆیـەوە، پێـی سـەیر بـوو کـە نووسـەرێکی بلیمـەتی وەکـو چیخـۆف، وێـڕای ئـەو هـەموو بەهرەداریـەی، ئەوەنـدە ئینسـانێکی دەگمـەن و کـەم وێنـە بـوو. لـە نامەیـەکیا بـۆ ژنەکـەی دەربـارەی چیخـۆف دەڵێـت: "چیخـۆف، کەسیکی ڕیزپـەڕە، زۆر میهرەبانـە، تـا حەزکـەی ناسـك و بەبەزەییە، خەڵکی شێتی بوون، نایەڵن ئیسراحەتێ بکات.. زۆرم حـەز بـە مـەجلیس و دەم و دوو وگفتوگۆیـەتی. بیرم نایـەت، بـەم ڕادەیـە لـەزەتم لـە مەجلیسـی هـیچ کەسـێکی تـر بـینی بێـت."
هەروەها لە نامەکەیدا باسی ئەوەش دەکات کە نەخۆشی وای لە چیخۆف کردووە، هەندێجار بـەد مێجیـزو دەمـدەمی بـێ، دووره پـەرێزو گۆشـەگیر بـێ. وێـڕای قـەرەباڵغی و ئـاپۆڕای ئـەو هـەموو خەڵکەی بەدەوریـەوەن، زۆر تەنیایە، نائومێدە، وەکو یـەکێك گەمیەکـەی نقووم بـووبێ، بـە قووڵی دەبیرو خەیاڵانـەوە دەچـێ. ڕۆژێـك چیخـۆف بـەدەم پاڵکەوتنـەوە، لـە نێـوان دوو نـۆرە کۆکـەدا بـە گۆرکی دەڵێت: "لە گەرمەی ژیاندا پیاو بیر لەوە بکاتـەوە کـە دەبـێ بمرێـت، شـتێکی خـۆش نیـە، بەڵام لە جەرگەی ژیاندا بیت و سوور بزانی پێش ئـەوەی ئەجـەلت بێـت، بمریـت، ئەوپـەڕی گاڵتـە جاڕیە."
لە ئاخرو ئۆخری زستاناو بەرلەوەی بەهار بیت، ئارەزووە لـە مێژینەکـەی چیخـۆف کـە هـەڵاتن بوو لە یالتا، سەری لێهەڵدایەوە. نامەیەکی لە (١٨٩٩/٤/٢) بۆ سوڤۆرین نارد کە: "بـە ڕاسـتی لـە گیانی خۆم بێزارم، ئەمە کەی بوو بە ژیـان، تاکـەی تـەنیا بـۆ پاراسـتنی سـەلامەتی خـۆم بـژیم، بـە کەنارەکانـدا دەسـوڕێمەوە، بـە شـەقامەکاندا دەخولێمـەوە عـەینی کەشیشـێك کـە بـە تـۆبزی خانەنشـین کرابـی." ئـەوە بـوو لـە ١٨٩٩/٤/١٠دا، بـەبێ پرسـی دکتـۆر ئالتشـولەر بـەرەو مۆسـکۆ ڕۆیی.
لە سەرەتادا، لای دایکی و خوشکەکەی، لەو شوقە چکۆلەیەدا کە لـە شـەقامی مالایـا –دیمترو فکا بەکرێیان گرتبوو، هەواری خست. میوان، وەکو چۆن مێش بە سـەر پارچـە نـانێکی بەشیلەی مرەبادا دادەبارن، بەو ئاوایە بەسەریا دادەبارین. سەماوەر لە سەعات هەشتی بە یانییەوە تا دەی شەوێ نەدەکوژایەوە. هەرچەندە کۆمەڵێك نووسین و چیرۆکی بە سـەرا کەڵەکە بـوو بـوو ودەبوایـە ڕاستیان بکاتەوەو پێیاندا بچێتەوە و بە زووترین کـات بیانـدات بـە مـارکس، بـەڵام دڵـی نـەدەهات کـەس دەربکـات. هەنـدێجار مـاری دەبـردە پەنایەکـەوەو بـە گوییـدا دەچپاند: "تەمەشـا، مـن ئـەو پیاوە ناناسم، قەت لە یەك قوتابخانەدا پێکەوە نەبووین. دەزانم دەستنووسێکی لـە بەڕکدایـە و وا دیارە تا کـاتی شـێو دەمێنێتـەوەو هـەنگێ بۆمـانی دەخوێنێتـەوە، بـە ڕاسـتی شـتێکی ناخۆشـە."
دوای چوار ڕۆژ، بە مەبەستی ئەوەی کەمێك بحەسێتەوەو لەم جەنجاڵیە دووربکەوێتەوە، بە تـەنیا باری کرد بۆ شـوقەیەکی دیکـە، لـە هـەمان شـەقام و نزیکـی دێـری ستراسـتنوی کـە زۆری حـەز لـە دەنگی زەنگەکانی دەکرد. زۆری پێنەچوو، میوانـان لێـرەش دۆزییانـەوە، بـە هاتوچـۆی بـەردەوام بێزارو وەڕەزیان کرد، لە ١٨٩٩/٤/٢٤دا نامەیەکی بۆ دکتۆر ئالتشولەر نـارد کـە: "میـوان لـە سـەر میوان، قسەو گفتوگـۆی لـە پەسـتاو بێبڕانـەوە، لـە دووەم ڕۆژی جـەژنی پـاك و دوای ئاهەنگـەکان،

هێندە شەکەت و ماندوو بووم خۆم بە پێوە نەدەگرت، وام هەست دەکرد جەنازەیەکی بێ گیانم".
لە گەرمەی ئەم هەراو هەنگامەیەدا بوو کە نامەیەکی گۆرکی پێگەیی، ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی نامەکە زۆری کارتێکرد، گۆرکی لە ١٨٩٩/٤/٢٣، لە نیژنی نوڤوگوردەوە بۆی نووسی بوو: "بەدیتنی تۆ شادبووم، زۆر شادم! پێموایە تۆ یەکەم پیاوی ئازادو سەراپا مەردو ڕەندی کە تا ئێستا دیتبێتم. چەند باش دەکەیت کە ئەدەبیاتت کردووە بە گەورەترین خەمی ژیانی خۆت، بەڵام من هەرچەندە دەزانم ئەو نۆڕینە زۆر باشە، بەڵام باوەڕ ناکەم بتوانم وەکو تۆ بژیم —من سەرێکم هەیەو هەزار سەودای کوك و ناکوك، زۆر لەمە بێزارم، بەڵام بەدەستی خۆم نیە، هیچ دەسەڵاتێکم نیە. تکایە لە بیرم مەکە. بارێك و ڕەوان، بێ هیچ پێچ و پەنایەك پێتان بڵێم: حەز دەکەم ناو بە ناو لە هەڵەکانم ئاگادارم بکەیتەوە، ئامۆژگاریم بکەیت، ڕیم پێنیشان بدەیت. بە کورتیەکەی وەکو دۆستێك کە پێویستی بە ڕێنوێنی و ئامۆژگاریە، بەو ئاوایە ڕەفتارم دەگەڵ بکە."

هەڵوێستی کەسێکی دیکەش، هەر لەو سەرو بەندەدا زۆر کاری لە چیخۆف کرد، ئەویش ئەوە بوو کە تولستۆی لە مۆسکۆ چووە دیدەنی. بەڵام هەندێ لەو ئەکتەرو شانۆکارانەی کە لەو کاتانەدا بە ڕێکەوت لای چیخۆف بوون، بە ژاوە ژاوو چەنەبازی خۆیان، نەیان هێشت ئەو دوو ئەدیبە چوار قسەی جدی بکەن. بەڵام خۆشبەختانە، بۆ سبەی ئێوارە چیخۆف دەعوەتی تولستۆی بوو، ئیدی لەوێ توانیان دوو بە دوو بە کامی دڵ گفتوگۆیان بکەن، کە باسی وەچەی جەوانتر دێتە ئاراوە، تولستۆی ناوی گۆرکی دەبات و دان بەوەدا دەنێ کە بە هرەیەکی باشی هەیە، بەڵام ڕەخنە لە سستی لایەنی سایکۆلۆژی دەگرێت و دەڵێت: "دەشێت هەر شتێك دروست بکرێت، تەنیا لایەنی سایکۆلۆژی نایەتە دروستکردن، گۆرکی زۆر لایەنی سایکۆلۆژی دەستکردی هەیە. شتانێك وەسف دەکات کە هەستیان پێناکات."

دوای هەفتەیەك لیدیا ئەڤیلوڤا ڕۆژی ١٨٩٩/٥/١، دەگەڵ هەرسێ منداڵەکەیدا بە نیازی سەردانی موڵکەکەی بۆ ماوەیەکی کورت لە مۆسکۆ لادەدات. پێشنیاز بۆ چیخۆف دەکات کە لەوێستگەی ڤیتاردا، لە ماوەی گۆڕینی ڤیتارەکەدا، یەکدی بدینن. چیخۆف کە حەزی دەکرد منەتباری و سوپاسگوزاری خۆی سەبارەت بەو زەحمەتە دەربرێت کە ئەڤیلوڤا بۆ کۆکردنەوەو دۆزینەوەی چیرۆکەکانی ئەو کێشابووی، ملی بۆ ئەو پێشنیازەدا. بەڵام کاتێ خۆی لە هەنبەر ئەم ژنە بێپەرواو خۆپەرستەدا بینییەوە، وەکو هەمیشە سڵەمیەوەو خۆی بەدەستەوە نەداو بە ئاشکرا خوا خوای بوو تازووە بڕوات و لە کۆڵی ببێتەوە. هەرچەندە ئەڤیلوڤای غەرقی خەیاڵ و وەهمێن ڕۆمانتیکی ئەم جیابوونەوەیەیانی بە دیمەنی دوعاخوازی چیرۆکێکی چیخۆف (دەربارەی ڤیان) شوبهاند، بەڵام هەرگیز ئەو دەست لە ملانە پڕ جۆش و خرۆشەی کە لوتکەی ئەو دێمەنەی چیرۆکەکەی پێك دێنا، ڕووی نەداو نە هاتەدی. چیخۆف دەگەڵ ئەڤیلوڤاو منداڵەکانیا سەرکەوتە نێو فارگۆنەکەو هەرکە دوعاخوازی لە منداڵەکان کردو لە فارگۆنەکە هاتە دەرێ و گەییە ڕارەوەکە، ئەڤیلوڤا بە دوایا هات داوای لیکرد کە لە گوندیدا سەردانی بکات. چیخۆف بە تەنزەوە وەڵامی دەداتەوە کە: "ئەگەر نەخۆشیش بکەوی سەرت نادەم. ڕاستە من

دکتۆرێکی زۆر باشم، بەڵام کرێ دەستم زۆر گرانە بەتۆ نادرێت. بۆیە جارێکی دی هەرگیز یەکدی نابینین." ئیدی دەستی دەگوشێت و وەدەردەکەوێ و منداڵەکان هاوار دەکەن: "دایکە، دایکە، خێراکە فریاکەوە."

ئەڤیلۆڤا، پاشان لە یاداشتەکانیا (چیخۆف لە ژیانی مندا...) لەمبارەیەوە دەنووسێت: "ڤیتارەکە بە خاوی کەوتەڕێ. من تارمایی چیخۆفم دەبینی کە بە کاوەخۆ بە بەر پەنجەرەکەدا دەڕۆیی، بەڵام ئاوڕی پاشەوەی نەدایەوە. ئەوسا نەمدەزانی و قەت وێنام نەدەکرد کە ئەمە دوا دیدارم دەبێت دەگەڵ چیخۆفدا."

هەمان ڕۆژی ١٨٩٩/٥/١ چیخۆف لە نمایش و نواندنێکی تایبەتی نەورەسدا، لە شانۆی هونەری مۆسکۆ، ئامادە دەبێت. ستایشێکی زۆری ئەکتەرەکانی کرد، بەڵام گلەیی لە ڕیتمی پەردەی چوارەم هەبوو. دوای هەفتەیەك بەر لەوەی سەفەری میلیکوڤۆ بکات و خۆی لە هەراو زەنا و ژاوە ژاوی مۆسکۆ رزگار بکات، جارێکی دیکەش چووە تەمەشای شانۆنامەکەی، ئەوە بوو لە ڕۆژی سەفەرەکەیدا بۆ میلیکوڤۆ (١٨٩٩/١/٧) قاییل بوو وێنەیەك دەگەڵ ئەکتەرەکاندا بگرێت. لەم وێنەیەدا زۆر شیك پۆشە، لەپشت مێزەکەوە دانیشتووە، وا دەنوێنێ دەستنوسی نەورەس بۆ ئەو ئەکتەرانە دەخوێنێتەوە کە بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە دەوریان داوە. لەم وێنەیەدا ژنێکی گەنج بەجیا لە گروپەکە و لەسەر لا وەستاوە، دەبیرو خەیاڵێکی قووڵەوە چووە، ئەو ئافرەتە ئولگاکنیپەر بوو، کە دوو ڕۆژ لەوە بەر چیخۆف وێنەیەکی خانووەکەی میلیکوڤۆی خۆی بەم نووسینەوە پێشکەش کرد بوو: "ئەمە ماڵەکەمە، ئەو شوێنەیە کە نەورەسی تیا نووسراوە، پێشکەشە بە ئولگا لیوناردوڤنا کنیپەر، دەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیما." ئۆلگا، ژێراو ژێر کەوتە ژێر کاریگەری ئەم پێشکەشیەوە.

پەراوێز:

* – بوشناك: قەومێکی چادر نشین و تورك نەژاد بوون لە دەوروبەری ٨٨٠ زایندا لە دەڤەری ئۆراڵەوە دێنە دەڤەری دانوبی ژێری و مەجاڕیەکان لەوێ دەردەکەن.

* – دورگەی ئەهریمەن: دوڕگەیەکی چکۆلەیە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی نزیکی کەناوی گۆیانە، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەوە تا ١٩٤٦ تاراوگەی زندانیانی سیاسی بوو.

* – لیژیون د/ ئور: میداڵێکی سوپایی و ئەهلی بوو لە فەرەنسادا، ناپلیون لە ساڵی ١٨٢٠دا داینا بوو.

* – وێنەکەش... ! ئەو وێنەیە تا ئێستاش لە مۆزەخانەی تریتیاکوف، لە مۆسکۆ پارێزراوە.

* – سوڤورین: (١٨٣٤ – ١٩١٢) بەخۆشی ژیاو لە تەمەنی هەفتاو هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

* – مولون روژ: کابارەیەکی بە ناوبانگی پاریسە کە لە ساڵانی ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزدەیەم و ساڵانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا مەکۆی نیگارکێشان، شاعیران و هونەرمەندان بوو.

"١٣"

## سڵاو له تۆ ئەی دوا لاپەڕەی تەمەنم

لەو ماوانەدا کە چیخۆف لە یاڵتا دەژیا، ماری خوشکی دۆستایەتی دەگەڵ ئولگاکنیپەردا گرتبوو. ماری شێوازی ئاسایی نواندنی ئولگای لەسەر شانۆو، تەبیعەتی سادەو خۆڕسکی زۆر بەدڵ بوو. نامەیەك بۆ چیخۆڤ برای دەنێرێ کە: "ئامۆژگاریت دەکەم کە ئاگات لە کنیپەر بێ، بایەخی بدەیە، من زۆرم بەدڵە." ئیدی ئەم دوو کیژە گەنجە کەوتنە هاتوو چۆی یەکدی. ئولگا کیژی ئەندازیارێکی ئەڵمانی نەژاد بوو. پەروەردەو خوێنەوارییەکی بوژوایانەی هەبوو، مۆسیقا و وێنەو زمانانی بیانی خوێندبوو، بەڵام کە بابی مرد ئیدی دەبوایە دەست بگرنەوەو ئەو مەسرەفەی جارانیان پێنەدەکرا. گۆڕکی گوتەنی (خانەوادە شێتەکەی کنیپەر) گواستیانەوە بۆ شوقەیەکی سێ ژووری لە مۆسکۆ، دایکە بێوەژنەکەی کە دەرسی مۆسیقای دەگوتەوە دەگەڵ دوو خاڵی قەرەباڵغی ئۆڵگادا کە هەر خەریکی خواردنەوەو بوون ودەگەڵ خودی ئولگادا، هەر هەموویان لەو سێ ژوورەدا بەسەر یەکا کەڵەکە بوو بوون. ئولگا ئاواتی ئەوە بوو ببێ بە ئەکتەرو شانۆکار، بەڵام دایکی حەزی نەدەکرد، بە هەرحاڵ پاش ئەوەی بەبێ ڕەزامەندی دایکی، سێ دانە ساڵ دەرسی هونەری درامای لە سەر دەستی نەمیروفیچ —دانچنکو خوێند، دانچنکو بە ئەندامی تیپی نواندنی شانۆی هونەری وەری گرت. ئولگا، شیفتەو ئاشقی پیشەکەی خۆی بوو، ژیانێکی بێخەم و خەیاڵ و بێموبالاتانەی یاخیانەی گرتەبەر.. لە کاتێکا کە قوتابیەکانی دایکی پرۆڤەیان لە سەر ئاوازان دەکردو خاڵەکانی، کە یەکێکیان پزیشك و ئەویتریان ئەفسەر بوو، کۆنیاکیان دەخواردەوەو کۆنکانیان دەکرد یان بە دەنگی بەرز بەرهەمەکانی تولستۆی و چیخۆفیان دەخوێندەوە. ئولگاش بە دەنگی بەرز دەورەکانی خۆی ئەزبەر دەکرد.

ئولگا، چەند ئاشق و دڵبەندی پیشەکەی بوو، ئەوەندەش ئاشق و شەیدای ژیان بوو، ژیانی لێ هەڵدەقوڵا، زۆر بە باشی و هۆشمەندانە قسەی لە هونەرو ئەدەبیات دەکرد. بەڵام بێهیچ شەرم و پەروایەك کەمترین بایەخی بە جل و بەرگ، کڵاو وتەنانەت چێشت لێنان و ئاشپەزیش نەدەدا. هەرکە یەکەمجار چیخۆڤ بینی، یەکسەر زانی لەو پیاوانە نیە کە حەز لە خەڵکانی ڕۆشنبیری بۆش و بەتاڵ، بێ ڕوح و گیان، بکات. بۆیە لێبڕا، بۆ ئەوەی سەرنجی چیخۆف ڕابکێشێت و لە بەرچاوی شیرین بێت، دەوری ڕۆشنبیری چەنەبازی بێناوەڕۆك نەبینێ، بەڵکو لە حوزوری ئەودا نازو عیشوەی دەکرد، گورج و گۆڵ، چالاك و چەلەنگ، ڕووخۆش و ڕوح سووك دەهات و دەچوو، ژیان و تەندروستی و سەلامەتی لێهەڵدەقوڵا. بە پێستی سپی و زوڵفێکی ڕەشی ئاوریشمین و چاوانی خەندانەوە، ژیانی لێهەڵدەقوڵا. تەمەنی بیست و نۆساڵ بوو، تەنیا دە ساڵ لە چیخۆف بچووکتر بوو، کەچی چیخۆف بەچاوی پڕ سۆزی پیرەمێردێکەوە تێی دەڕوانی، نەخۆشی تەواو کە سیرەو پیری کردبوو.

کە چیخۆف لە ١٨٩٩/٥/٧دا بۆ میلیکوڤۆ گەڕایەوە، ئولگای دەعوەت کرد کە بێت بۆ تەمەشای بەهاری لادێ. ئولگا بێ چەندو چوون دەعووەتەکەی قەبووڵ کرد. هاماج و جەوی سادەو گەرم و

گۆڕی ماڵەکە، ناسکی و هێمنی دایکی نووسەر، هێندەی دی دڵیان خۆشکرد "دایکی چیخۆف ژنە ڕووسێکی هێمن و سوعبەتچی و خۆش مەشرەب بوو". ئولگا، کە دەی بینی چیخۆف، زۆر ساکاراانە شانازی بە میوانداری ئەو و بەماڵەکەیەوە دەکات، هێندەی دی دڵبەندی بوو. پاشان لە یاداشتەکانی خۆیدا، لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئانتون، ئاشقی هەموو بەروبومێکی زەوی بوو، سێ ڕۆژی پڕ لە هەستی جوان، سەرڕێژ لە خۆشی و هەتاومان بردە سەر." کاتێ کە دوعاخوازیان لێکدی کرد، هەردووکیان بەتاسەوە، چاوەڕوانی دیداری تازە بوون.

ئولگا، لە حوزەیرانی ١٨٩٩دا چوو بۆ قەفقازیا، تا پشووی هاوین، دەگەڵ براکەیدا لە متسنحت بەسەر بەرێت . کاتێ چیخۆف بەمەی زانی گلەیی لێکرد، خۆی پێنەگیراو، بەهەمان ئەو شێوازە گاڵتە بە ڕاست و، تەنزئامێزەی کە ڕۆژگارێك دەگەڵ لایکادا بەکاری دەبرد، نامەیەکی بۆ نارد کە "یانی چی؟ تۆ لە کوێی؟ وا خۆت لێ شاردوینەتەوە، خەریکە دەکەوینە گومانەوە کە ناکا فەرامۆشت کردبین، یان لە قەفقازیا کەسێکت دۆزیبێتەوەو شووت پێکردبێت... ئەگەر وایە با بزانین شووت بەکێ کردووە؟ نەڵێی بڕیارت داوە واز لە شانۆ بێنی؟ نووسەری لە بیرکراو – ئاهـ، چ زوڵمێکە،چ کارەساتێکە، چ جەفاکاریەکە ئەمە!" (بڕوانە نامەی ١٨٩٩/٦/١٦). ڕۆژی دوایی، لە پەراوێزی نامەیەکی ماریای خۆشکیا کە بۆ ئۆلگای نووسی بوو، ئەم وشانەی نووسی: "سڵاو لە تۆ ئەی دوا لاپەڕەی تەمەنی من، ئەی ئەکتەرە گەورەکەی وڵاتی ڕووس! بەغیلی بەو چەرکەسانە دەبەم کە هەموو ڕۆژێ دەتبینن.. هیوای شادی و بەختەوەریت بۆ دەخوازم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨٩٩/٦/١٧).

بە ماوەیەکی کەم دوای سەردانەکەی ئۆلگا بۆ میلیکۆڤۆ، کەوتە خولیای ئەوەی کە میلیکوڤۆ بەجی بێلێ و لەوێ باربکات، هەرچەندە ئەمەی لە بەرگران بوو و کۆمەڵێك یادگاری لە وێندەر هەبوو، بەڵام کەڵکەڵەی یاڵتای کەوتبووە سەر، بۆیە هەستا ئاگادارییەکی بڵاوکردەوە کە موڵکەکەی میلیکۆڤۆی، بە بیست و پێنج هەزار ڕۆبڵ دەفرۆشێت، هەرچەندە هیچ کڕیارێکی جدی نەهاتە پێشی، بەو نیازەی ئەم نرخە هەندێ کەم بکاتەوەو دابگرێت و ئەم مامەڵەیە زوو لە کۆڵ بکاتەوە، خەڵکانیکی ڕاسپارد کە کتێب و بارگە شەخسی و کەلوپەلەکانی دەرێی ماڵەکەی بۆ بپێچنەوە، یان بیان نێرێ بۆ یاڵتا. بیرۆکەی ئەم گواستنەوە تازەیە یارمەتی دەدا کە پشت بکاتە ڕابردوو وفەرامۆشی بکات.

لە ئاخرو ئۆخری حوزەیراندا ئۆلگا نامەیەکی بۆ نووسی و پێشنیازی ئەوەی بۆ کرد کە لە باشووردا یەکدی ببینین. چیخۆف بە مەمنوونیەوە پێشنیازەکەی قەبووڵ کرد. ئیدی ڕێکەوتن لە ١٨٩٩/٧/١٨دا لە نوفوروسیسکدا یەك بگرنەوە و پاشان لەوێندەرەوە بۆ یاڵتا بڕۆن.

ئەم بەرنامەیە بە وردی جێبەجێکرا. چیخۆف لە یاڵتا، چووە ئوتێلی مارینۆ، بەڵام ئۆلگا لای دۆسستانی هاوبەش: خانەوادەی سەردین لایدا. چیخۆف وەختی خۆی لە نێوان سەردانی خانووەکەی ئاوتکا و، کە لە تەواوبوونا بوو، پیاسەی ناو شار دەگەڵ ئۆلگادا، دابەش کرد بوو. چیخۆف سەری لە گۆڕانی کتوپڕی حاڵی ئۆلگا سوڕما بوو، لە نامەیەکیا (١٨٩٩/٧/٢١) بۆ ماری خوشکی، دەڵێت: "کنیپەر، زۆر خەمبارە، لە یاڵتایە، دوێنێ هاتبوو چایەکم دەگەڵ بخواتەوە.

کەچی بەدرێژایی دانیشتنەکە کرۆکپ هیچ قسەیەکی نەکرد." ئۆلگا کە دەی بینی چیخۆف زۆر نیگەرانە خواردنی باش نیە، زۆرجار تەنیا پارووە نانێك و تۆزێ پەنیر دەخوات، هەندی ژەم هەر هیچ ناخوات، زۆری خەفەت بۆ دەخوارد، کە جار جارێك دەرفەتی دەبوو، دەگەڵ ئۆلگادا دەچوو بۆ خواردنی خۆراکی دەریایی بەشەرابی سپی قرمەوە، ئۆلگا دەڵی خۆش دەبوو. لە ١٨٩٩/٨/٢دا، بە دوو قۆڵی بۆ مۆسکۆ گەڕانەوە: ئۆلگا دەبوایە دەگەڵ تیپەکەیدا دەست بە پرۆڤە بکات. بە سواری گالیسکە بەرەو باخچە سەرای کەوتنەڕێ، کە لەو زەمانەدا نزیکترین وێستگەی قیتاری ئەو دەڤەرە بوو. بەدەم ڕێگاوە تەمەشای دیمەنی چیاکانی ئەم بەرو ئەوبەریان دەکرد، دەیانڕوانیە ئەو باخچە پڕ گوڵ و گوڵەباخانەی، کە داری سەروو، پەرژین ئاسا دەوریان دابوون، دەیانڕوانیە گۆرستانە تەرك کراوەکانی موسوڵمانان و گوندە چکۆلە تاتارنشینەکان. بۆن و بەرامەی خۆش دنیای پڕ کردبوو، گفتوگۆ و چپە دوو ڕوحی ئاوەدان دەکردنەوە، ئەم دوو ڕێبوارە خەفەتیان بۆ تەواوبونی ئەم پشووە خۆشە دەخوارد کە هەرچەندە یەکی نەخستبوون، بەڵام تەواو لێکدی نزیك کردبوونەوە.

کە گەییشتنەوە مۆسکۆ، ئۆلگا بەردەوام خەریکی پرۆڤە بوو، چیخۆفیش، سەرقاڵی ئامادەکردنی بەشی یەکەمی کۆ بەرهەمەکەی بوو بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە.وەختیان زۆر کەم بوو، بۆیە زۆر کەم یەکتریان دەبینی. لەم ماوەیەدا ماریا کڕیارێکی بۆ خانووەکەی میلیکۆڤۆ دۆزی بووەوە، کابرای کڕیار، بازرگانی دارو لەوحان بوو. عەقدێکیان کرد کە بە قیست پارەکە بدات. چیخۆف گرێبەستەکەی دەگەڵ ئیمزا کرد، یارۆی بازرگان قیستی یەکەمی دواخست، قیستەکانی تری هەر نەدا، ئیدی پەشیمان بوونەوە، چیخۆف لە ئەنجامدا میلیکۆڤۆی بە یەکێك لە بارۆنەکانی بنەماڵەی ستوارت فرۆشت.

لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا هەوا گۆڕا، باران و سەرما دەستی پێکرد، چیخۆف نەخۆش کەوت. لە ١٨٩٩/٨/١٩دا نامەیەکی بۆ سوڤورین نووسی کە: "ئازارم یەجگار زۆرە، نازانم هی نەخۆشیەکەمە یان هی سەرماکەیە. ئەوندە بێتاقەتم ناتوانم سەرم لەسەر سەرینەکەم هەڵبڕم." تاقە چاری ئەوە بوو بگەڕێتەوە بۆ یاڵتا. ڕۆژی ١٨٩٩/٨/٢٧ شەکەت و ماندوو گەیشتەوە یاڵتا. پاشان دایکی و خوشکەکەی لە ١٨٩٩/٩/١٨ گەیینە لای ئەو.

ئیدی بە سێ قۆڵی. لە خانووە تازەکەی ئاوتکادا، هەرچۆنێ بوو، جێی خۆیان خۆشکرد، بەڵام گەچکارییەکەی هێشتا وشك نەبووبووەوەو کرێکارەکان وەکو خاوەن ماڵ، لە ماڵەکەدا بەدەم ئیش و کارەوە دەسوڕانەوە. ئەوە بوو چیخۆف لە ١٨٩٩/٩/١٥دا نامەیەکی بۆ گولتسیڤی نووسەری "هزری ڕووسی" نارد کە: "کاشیکاران و دارتاشان لە بەیانیەوە تا ئێوارێ، بە تەقوهوڕی چەکوش و چەکوشکاریەوە خەریکی کارکردنن و لە نووسینم دەکەن. بۆ نەگبەتی هەواکەشی ئەوەندە خۆش و دڵگیرە، بە زەحمەت خۆم لە ژوورەوە دەگرم. کەش و هەوای خۆش و دڵگیری ئەوێ کردیە کارێك کە دایکی چیخۆف، سەرباری ناخۆشی باربارۆکێ و ژیان لە خانوویەکی تەواو نەکراودا، زوو بە زوو هۆگری ئەوێ بوو وبیری میلیکۆڤۆی نەدەکرد. کە ماریا دەچووەوە بۆ مۆسکۆ بەپێویستی نەدەزانی لەگەڵیا بڕوات.

ئیدی خانووەکەی ئاوتکا، بەرە بەرە خۆشتر دەبوو. چیخۆف زۆر دڵی بەوە خۆش بوو کە ژووری تایبەتی خۆی هەبوو. بە کاغەزی دیوارپۆشی جوانی نەخشین بەگوڵی سۆسەن، دیوارەکانی ئەم ژوورەی پۆشی بوو. پەنجەرەیەکی گەورەی بەرزی ڕوناکی تیا بوو، لای سەرەوەی نیمچە بازنەیی بوو، دەکرا لەوێوە تەمەشای باخ و بێستان و دۆڵ و ماڵەکانی یاڵتاو دەریا بکەیت. دیمەنێکی دەسکردی لیڤیتان لە سەرووی موغەیرییەکەوە هەڵواسرا بوو. جۆرەها وێنەی خانەوادەکەیان بەدیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، وێنەو تابلۆی ئاوی، پۆرترێتی تولستوی و تورگینف و گریگوروفیچ. لە سەروی مێزێکی گەورە، کە لەبەر کاغەزو کتێب و پەیکەرۆکانی دارین و بەردین دیار نەبوو، ئاگاداریەك هەڵواسرابوو: "تکایە سیغار مەکێشن." بەڵام کاتێ میوانێك ئاگاداریەکەی نەدیتباو بە سەهو سیغاری پێکردبا، بۆ ئەوەی تەریق نەبێتەوە چیخۆف ئاگادارییەکەی نیشان نەدەدا. کۆکینەکەی پێخۆشتر بوو تا ئەمر بەو کەسە بکات. خۆ ئەگەر ناچار بوایە عوزربێنێتەوە و ڕابکشێت، ئەوا دەچووە ژوری نووستنەکەی کە دوو سێ هەنگاو لەوێوە دوور بوو، ژوورێکی سپی، پاك و خاوێن و قەلەندەرانە بوو.

سەرباری ئەوەی کە پاکنووس و پێداچوونەوەو ئامادەکردنی کۆ بەرهەمەکانی وەختێکی زۆریان لە چیخۆف دەگرت و ماندوویان دەکرد، ئەو پایزە دەرفەتی هێناو توانی دوو چیرۆکی درێژ بە ناونیشانێن: (خانم و سەگەکەی، شیوەڵە) بنووسێت و نەخشەی چیرۆکێکی دیکەش بە ناونیشانی: (قەشە باشی) دابڕێژێت. لە چیرۆکی (شیوەڵەدا) ڕێك وەکو چیرۆکی (جووتیاران) بێ هیچ مداراو خاترانەیەك، وێنەیەکی زەق و بێ ڕتووشی ژیانی جووتیاری دەقاو دەق وەکو ئەوەی لە میلیکۆڤۆ دیتبووی، دەگرێت. بەڵام لە (خانم و سەگەکەی)دا بەپێچەوانەوە، لە ژینگەو هاماجی تایبەتی یاڵتاوە هەڵی هێنجاوە. ئەم چیرۆکە باسی خیانەتێکی ژن و مێردایەتی دەگێڕێتەوە، کە لە پشوویەکی هاوینەدا، بە سووکە ئاشقێنیەکی سەرڤەسەرڤە دەست پێدەکات و پاشان بە دەم کۆمەڵێك ڕووداوی چاوەڕوان نەکراوەوە، دەگۆڕێت بۆ ڤیان و خۆشەویستیەکی قووڵ، بەڵام بێ هیچ ئومێدێك. ئەفسوونی دوولایەنەی یاڵتا، خزیوەتە بن دێڕی سەرانسەری ئەم چیرۆکەوە وچیخۆف وەستایانە دیمەنەکانی باشوور، جادەو ڕێگاو بانە تۆزاویەکان، خوارنگەی سەر ڕێگاکان، تریفەی هەیڤەشەو، نەرمە ڕازی دەریاو گەلێك لەو خولیایانەی ئاشقان مەست و مەنگ دەکەن، لەم چیرۆکەدا وێنە دەگرێت. چیرۆکی ئەم دوو دڵدارە، زۆر بە ناسکی و بێ پەردە دەگێڕێتەوە، بە شێوەیەك دەیگێڕێتەوە کە هەر سووکە وەسفێکی لاوەکی چەندیش بە ڕواڵەت کەم بایەخ و بێ مانا بێ، سووکە بەشدارییەك لە هاوهەنگی گشتی چیرۆکەکەدا دەکات و کۆتاییەکەشی وەکو کۆتایی زۆربەی چیرۆك و شانۆنامەکانی چیخۆف، دەکەوێتەوە: "لەوە دەچوو، دوای ماوەیەکی کەم، چارەسەرێك پەیدابێ و ئەوسا ژیانیکی تازەو گرینگ دەست پێ بکات، بەڵام هەردووکیان لایان عەیان بوو کە هێشتا لە سەرەتای ڕێگادان و زۆریان ماوە بۆ کۆتایی ڕێگاو، ئەمەی ئێستا دەستی پێکردووە، دژوارترین و ئاڵۆزترین بەشی ژیانە."

گۆرکی دوای ئەوەی چیرۆکی "خانم و سەگەکەی" دەخوێنێتەوەو زۆری بەدڵ دەبێت، لە ١٩٠٠/١/١دا، نامەیەکی پڕ ستایش بۆ چیخۆف دەنووسێت: "تۆ دەزانی چیدەکەی؟ دەتەوێ

تۆڵە لە ڕیالیزم بکەیتەوە، بیکوژیت. سەرکەوتووش دەبی - بۆ هەتا هەتایە ئەمە قاڵبێکە پێش زەمانی خۆی کەوتووە - بەجدی کەس ناتوانێ لەم بوارەدا پێشی تۆ بداتەوە. کەس ناتوانێ وەکو تۆ بەم سادەییە، دەربارەی شتی ئەوەندە سادە بنووسێت. دوای خوێندنەوەی زۆربەی چیرۆکەکانی تۆ، کە زۆر سادەن، هەرشتێکی دیکە هێندە زبرو درشت دێتە بەرچاو لە تۆ وایە لەجیاتی قەڵەم، بە پارچەدار نووسراوە. یانی سادەیی و دروستی خۆی لەدەست دەدات... تۆ بە چیرۆکە کورتەکانت خزمەتێکی گەورە دەکەیت، کارێکی وا دەکەیت خەڵکی بێز لەم ژیانە سست و خاوە مردەلۆخە بکەنەوە... چیرۆکەکانت شووشەی ناسك و خۆش پەرداخن، پڕن لە هەموو بۆنێکی ژیان."

هەرچەندە چیخۆف، کەرەستەو تیمەی زۆربەی چیرۆکەکانی لە ژیانی خەڵکی یەوە هەڵدەهێنجا، بەڵام ئەمجارەیان، وا دیارە ئەزموونی ئاشقێنی خۆی کرد بوو بە کەرەستەو تیمەی چیرۆکی (خانم و سەگەکەی). ئەمە باسی ئەزموونی خۆی نیە کە لە چیرۆکی ناڤبریدا دەڵێت: "ئەو هەمیشە لەچاوی ژناندا کەسێك بوو غەیرەز ئەوەی هەبوو. ژنان، ئاشقی پیاوێك بوون لە بوونی ئەودا، لە بری ئەوەی خودی ئەو بێ، کەسێك بوو ئافەریدەی خەیاڵی ئەوان، کەسێك کە بەدرێژایی تەمەن ئاشقانە بە شوێنیدا دەگەڕان، تەنانەت دوای ئەوەی کە پەیان بە هەڵەی خۆشیان برد، هێشتاش هەر ئاشقی بوون و، شتاقیانیش پێی شاد نەبوون. زەمان تێدەپەڕی و ئەویش درێژەی بەدیداری ژنان و بەردوستکردنی پەیوەندی و بڕینی پەیوەندی دەگەڵیاندا دەدا، بەڵام هەرگیز ئاشق نەبوو، هەر ناوێکی لێدەنەی لێی بنە، بەڵام ئەوە ئەشق و خۆشەویستی نەبوو، تازە تازە بەم ئاخریە کە سەری سپی بووە، بە ڕاستی و لە ناخەوەو بۆ یەکەمجار لە ژیانیا ئاشق بووە."؟

هەڵبەتە گوروڤ شا قارەمانی چیرۆکی ناڤری کۆپیەکی موو بە مووی خودی چیخۆف نەبو. ڕاستە چیخۆف، زۆر بیری ئۆلگای دلڕفێنی دەکرد، غەریبی دەکرد، بەڵام ئەم غەریبی کردنە زیاتر زادەی بێتاقەتی و بێزاری و تەنیایی بوو تا زادەی ئەشق و ڤیان. لە ١٨٩٩/٩/٣، لە یاڵتاوە نامەیەکی بۆ دەنێرێت کە: "تەواو هۆگری تۆ بووم، غەریبیت دەکەم و هەرگیز ناتوانم قەناعەت بە خۆ بێنم کە تا بەهار تۆ نەبینم. مجێز خراپە." دوای مانگێك لە ٤/ت١٨٩٩/١دا، نامەیەکی دیکەی بۆ دەنێرێت: "بێتاقەتم، پەستم. خۆزگە بەو مشکە دەخوازم، کە لە ژێر شانۆکەی تۆدا دەژی." بەڵام دوای چەند هەفتەیەك بە تێپەڕبوونی ڕۆژان. سۆزی ئاشقێنی چیخۆف بەرە بەرە دایە کزی و نامەکانی کەمبوونەوە. لە ٨/ك١٨٩٩/١دا، کارتێکی بۆ ئۆلگا نارد: "ئەی ئازیز، ئەی ژنە دلڕفێنەکە، ئەگەر نامەت بۆ نانێرم، هی ئەوەیە خەریکی کارکردنم، حەز ناکەم لە کارەکانم سارد ببمەوە."

هەڵبەتە زۆری حەز بە دیتنی دەکرد، بەڵام تەنیا بۆ دانیشتن و گفتوگۆ، کە زۆری لەزەت لە دانیشتن و گفتوگۆی ئەو دەبینی. بە تایبەتی کە لە یاڵتادا، لە یارانی نووسەر و وەشانکارانی بەرهەمەکانی و شانۆ دوور بوو، هەستی بە تەنیایی دەکرد، و بێپەردەو بە ڕاشکاوی باسی ئەم تاراوگە وناکامی و تەنیایی و بێتاقەتیەی خۆی، بۆ تاقە ڕازگرەکەی، ماریا دەگێڕایەوە. ئەوەتا لە

نامەیەکیا ١١/ت١٨٩٩/٢ بۆ ماریا دەڵێت: "بەفر شاخەکانی گرتووە. دنیا زۆر ساردە... لە کاتێکا تۆ باسی شانۆو کۆڕی ئەدیبان و هەزارو یەك شتی خۆشم بۆ دەکەیت، لەوە دەچێ بتەوێ تامی تامیم بدەیتەوە. چونکە مەگەر تەنیا گەوجان لێرە، لە قرم هەڵبکەن. تۆ نازانی چەند ناخۆشە ئینسان بە ناچاری سەعات نۆ بچێتە ناو جێگاوە، بە پەستی لە جێگادا ڕابکشێت و سوور بزانێ هیچ جێگایەك نیە بۆی بچێ، کەسێك نیە قسەی دەگەڵ بکات، کارێك نیە بیکات، هاندەرێك نیە بۆ نووسین، چەند ناخۆشە ئینسان ڕەنگدانەوەو دەنگدانەوەی خۆی نەبینێ و نەبیستێ! من و ئەم پیانۆیە دوو شتین لەمماڵەدا مەحکومین بە بێدەنگی. تیا ماوین مادامێکی کەس نیە بمان هێنێتە دەنگ بۆ لێرەیان داناوین؟

بە هەرحاڵ، چیخۆف، بەو هەموو بێزاری و نەخۆشیەی خۆیشیەوە، خەڵکانی داماو و هەژاری لە بیر نەدەکرد، کە چاوی بە وەزعی نالەباری نەدارانی قوربانیانی نەخۆشی سیل دەکەوت، بڕ بڕ بۆ چارەسەر ڕوویان دەکردە یاڵتا، (یان ئەو گوتەنی ئەو خەڵکانەی کە ڕووسیا، بۆ ئەوێی دەناردن تا لە کوڵ خۆیانی بکاتەوە) هێندەی دی ڕژ دەبوو لەسەر جێبەجێکردنی پرۆژە کۆنەکەی خۆی کە بریتی بوو لە دامەزراندن و کردنەوەی تیمارخانەیەك یان بوژانگەیەك بۆ نەخۆشانی هەژارو نەدار. ئەوە بوو لیژنەیەکی بۆ سەرپەرشتی ئەم پرۆژەیە پێکهێنا، بەخۆی کەوتە پیتاك کۆکردنەوە، دۆست و هاورێکانی بۆ ئەو کارە هاندا، لە گۆڤارو بڵاڤوکاندا بانگەوازی بۆ خێرەومەندان بڵاودەکردەوە. هێندەی پارە کۆکردەوە کە بەشی خەستەخانەیەکی چکۆلەی سی قەرەوێڵەیی بکات. ئەمە بۆ قۆناغی یەکەم خراپ نەبوو، بەڵام بەدڵی چیخۆف نەبوو،بە دڵی ئەم پیاوە کارایە نەبوو کە هەم لە ئیش و کاراو هەم لە نووسیندا پیاوێکی زۆر جدی بوو: لە نامەیەکیا (٢٦/ت١٨٩٩/٢) بۆ ڕۆژنامەڤانی تاگانروگی، ئەبرام تاراکوڤسکی دەڵێت: "بە ڕاستی خەمی نەخۆشانی سیلمە. بڕ بڕ بۆ چارەسەرو دەرمان ڕوو دەکەنە من و نازانم چی بکەم.. گەیوومەتە ئەو قەناعەتەی کە جاڕی پیتاك کۆکردنەوە بدەم.. خۆزگە دەتبینی ئەو نەخۆشە داماوانەی ڕووسیا هەڵیان دەڕێژێتە ئێرە، بۆ ئەوەی لە کوڵ خۆیانی بکاتەوە، چۆن دەژین! بە ڕاستی وەزعیان خراپە، حاڵی حازر مژوولی داواکردنی پیتاك و بار بووم، ئەگەر شتێك کۆ نەکەینەوە، ناچار دەبم لە یاڵتا هەڵێم." لە ٢٥/ت١٨٩٩/٢دا نامەیەك بە هەمان نێوەڕۆك دەنێرێ و، لەو بارەیەوە دەڵێت: "دنیایەك نەخۆشی بێنەوای دەستکورت لێرە کەوتوون، کە دەبینی دەپاڕێنەوە و داوای شتێك دەکەن، پیاو خەریکە ئاگری تێ بەردەبێ، یان کە دەبینی بەدەم گیانەڵڵاوە، لە ژێر شڕەپەتۆیەکدا دەمرن، کوڕم دەوێ بەرگەی ئەم دیمەنە بگرێت. بڕیارمان داوە، تیمارخانەو بوژانگەیەکیان بۆ دروست بکەین" بە هەرحاڵ دوو ساڵی پیچوو تا توانی چل هەزار ڕۆبڵێك کۆبکاتەوە کە بەشی دروستکردنی خەستەخانەیەکی خێرخوازی* سی قەرەوێڵەیی دەکرد (کە ئەم تیمارخانەیە تا ئەمرۆش ماوەو بە ناوی ئەوەوەیە) ئەوەی لەم هەڵمەتە خێرخوازیەدا، لە گشت شتێك پتر پەستی کرد، هەڵوێستی نەرێنی هەندێ لە بە ناو "پێشکەوتنخوازان" بوو، بە بیانووی ئەوەی کە ئەمە کارێکی زۆر گەورەیەو سەر ناگرێ، یانی دەستدانە بەردی زل نیشانەی نەوەشاندنە بە عانەیەك نەهاتنە بەرێ.

سەیر ئەوە بوو، لە کاتێکا داوای کردنەوەی تیمارخانەی بۆ خەڵکانی دی دەکرد، بە هیچ جۆری بیری لەوە نەدەکردەوە بەخۆی لەو جۆرە شوێنانەدا بکەوێ. دەیزانی نەخۆشەو نەخۆشیەکەی ترسناکە، بەڵام بەخەیاڵیش ئەوەی قەبووڵ نەبوو کە لە بوژانگەو تیمارخانەیەکدا بکەوی و چاوەڕوانی مردن بکات، دەیویست بە شێوازی تایبەتی خۆی تا دوا چۆڕی ژیان بژی، لەزەت لە ژیان بدینێ، با ئەم لەزەتە لە سەر حیسابی کورت بوونی تەمەنیشی بێ، چونکە بە هیچ جۆرێ پارێزی نەدەکرد. سەبارەت بە نەخۆشەکانی باوەڕی بە پزیشکی هەبوو. بەڵام بۆ خۆی نا. کە خەڵکی پێویستیان بەو بایە، دکتۆر بوو، بە هانای نەخۆشانەوە دەچوو، بەڵام بۆخۆی نا.

هەرچەندە زۆر سەرقاڵی ئەوە بوو، پرۆژەی تیمارخانە خێرخوازیەکە بە زووترین کات جێبەجێ بکرێت، بەڵام هێشتا لە یاڵتادا هەستی بەجۆرە تەنیایی و بۆشاییەکی بەلەزەت دەکرد. لە نامەیەکیا (کۆتایی ساڵی/١٨٩٩) بۆ مایر هولدی ئەکتەرو بەڕێوەبەری شانۆی هونەری مۆسکۆ، لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەوای ئێرە خۆش و گەرمە، بەڵام ئەمە وەکو مەرگەی بێ گوشتە، مەرگەی بێ گۆشت فایدەی چیە؟" لەم سەرو بەندەدا بە شێکی زۆری نامەکانی ئاڕاستەی ئەو تیپە بوو کە ئەرکی نواند و پێشکەشکردنی شانۆنامەی (لالۆ ڤانیا)ی گرتبووە ئەستۆو قەرار بوو لە پایزی ئەو ساڵەدا نمایش بکرێت. لالو ڤالیا، لە بنەڕەتدا، هەر هەمان چیرۆکی (دێوی جەنگەڵی) بوو کە چیخۆف، دەستکاری کردبوو و بە شێوەیەکی تازە دایڕشتبووەوەو وەختی خۆی لە لادێدا پێشکەش کرابوو و سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێنا بوو، بەڵام چیخۆف دووڵ بوو، قاییل بێ کە لە شانۆیەکی گەورەدا لە سان –پترسبۆرگ یان مۆسکۆ نمایش بکرێت. ئیدی ملی بۆ ئەم کارە نەدا تا لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٩٩دا، شانۆی مالی، کۆنترین و بە ناوبانگترین شانۆی مۆسکۆ، قەولی دا کە شانۆنامەی ناڤبری پێشکەش بکات. لیژنەی ئەدەبی شانۆی مالی، پاش ئەوەی دەقەکەیان خوێندەوە داوایان لێکرد، هەندێ دەستکاری و گۆڕانکاری بنەڕەتی تیا بکات. ئەندامانی لیژنەی ناوبراو پێیان وابوو، بۆ نموونە، ماقوول نیە کەسێکی ڕۆشنبیری وەکو لالۆڤانیا. بەجۆرێ تورە ببێت کە دەست بداتە دەمانچەو تەقە لە مامۆستایەکی کۆنی زانستگە بکات. پێیان وابوو جگە لە ناماقوولیەتەکەی، هەستی هەموو ڕۆشنبیرانیشی بریندار دەکرد. چیخۆف پاش ئەوەی تێر بە بۆچوون و بیانووەکانی لیژنەی ناوبراو پێکەنی، دەستنووسی دەقەکەی لێوەرگرتنەوەو دای بە تیپی شانۆی هونەری مۆسکۆ، کە بەینی دەگەڵ هەموو ئەندامانی تیپەکەدا زۆر خۆش بوو.

لەو ماوەیەدا کە لە مۆسکۆ، چووە تەمەشای چەندین پرۆڤەی (لالۆ ڤانیا) لە سەر شانۆی هونەری مۆسکۆ. هێندە بە دیقەت و هەستیاری چاودێری هەموو وردو درشتێکی نواندنەکەی دەکرد، کە قەت لە کەسێکی بە تەبیعەت گۆشەگیری وەکو ئەو نەدەوەشایەوە. بچووکترین هەڵە لە شرۆڤەی دەقەکەدا، بچووکترین کەمتەرخەمی لە نواندندا، ئەوەندەی ئازار دەدا وەکو ئەوەی نینۆکی دەربێنن. سڵی لەوە نەدەکردەوە کە ڕووبە ڕوو، هەڵەو کەم کوڕیەکانی دەرهێنەرو ئەکتەرەکان بداتەوە بە چاویانا و سەرزەنشتیان بکات. جا چونکە لەو ڕووەوە کەمێك مدارای ئەکتەرە ژنەکانی دەکردو دەگەڵ ئەواندا نەرمتر بوو، ناویان نابوو (چاودێری ئەکتەرانی ژن).

پاییز، گەڕایەوە بۆ یاڵتا،لەوێ بە پەرۆشەوە، چاوەڕوانی هەواڵی (لالۆڤانیا)ی دەکرد. کە دوور لەو بۆ خۆی لە مۆسکۆدا دەژیا. ئۆلگا، کە ڕۆڵی یەلینای لەم شانۆنامەیەدا دەبینی، نامەیەکی بۆ چیخۆف ناردو داوای لێکرد نۆڕینی سایکۆلۆژی ئەم کاراکتەرەی بۆ شەرح بکات. چیخۆف وەڵامی دایەوە ستانسلافسکی سەهوە کە وا تەسەور دەکات گوایە دکتۆر ئەستروف عاشقێکی شەیدای یەلینایە. ئەستڕۆف، بەگوتەی ئەو، دڵبەندی جوانیەکەی ئەم ژنەیە، بەڵام گەییووەتە ئەو قەناعەتەی کە دەگەڵ ئەم ژنەدا هیچ بە هیچ ناکات و ناگاتە هیچ ئاکامێك. لە پەردەی چوارەم و کۆتاییدا بەجۆرێ قسان دەگەڵ یەلینادا دەکات وەکو ئەوەی "هەواڵی گەرمای باوی ئەفریقای پێ ڕابگەیەنی". و ماچی دەکات: "تەنیا لەبەر بێکاری و کات بەسەر بردن" چیخۆف لەسەری دەڕوات: "ئاه! ئەی ئەکتەرە جوان و ئازیزەکەم! چەند حەز دەکەم بیم بۆ مۆسکۆ! بەڵام وێڕای ئەوەش سەرت دەسوڕێ، تۆ نەخۆشیت، تووشی سەرەگێژێکێ بوویت، کاتت نیە بۆ منی تەرخان بکەیت." (بڕوانە نامەی ١٨٩٩/٩/٣٠).

قەرار درا شانۆنامەی (لالۆڤانیا) لە شەوی ١٨٩٩/١٠/٢٦دا نمایش بکرێت، هەموو بلیتەکان، پێشوەختە فرۆشرا بوون. شەوی دواتر، واتە ١٨٩٩/١٠/٢٧، لە کاتێکا چیخۆف، چوو بووە جێگاوەو پاڵکەوتبوو. پۆستەخانەی یاڵتا، بە تەلەفون پەیوەندیان پێوە کردو یەك یەك ئەو بروسکانەیان بۆ دەخوێندنەوە کە گەیی بوونە لای ئەوان. چیخۆف لە نامەیەکیا بۆ ئۆلگا کنیپەر (١٨٩٩/١٠/٣٠) لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەموو جارێ ڕادەپەڕیم، بە هەشتاو بە پێی خاوس، بە دەم هەڵ لە رزینەوە بە تاریکی بەرەو تەلەفونەکە غارم دەدا، دەگەڕامەوە ناو جێگاکەم، هەرکە چاوم دەچووە خەو، دیسان لە زەنگی تەلەفونەکە خەبەرم دەبووەوە، ئەمە یەکەمجار بوو، کە شۆرەتی تایبەتیم نەیدەهێشت خەوم لێبکەوێت."

هەڵبەتە هەر هەموو ئەم بروسکانە مژدەو مزگێنی سەرکەوتنێکی گەورەیان پێبوو، بریتی بوون لە پیرۆزبایی و دەستخۆشی لە پەستاو بێبڕانەوە، بەڵام چیخۆف وەکو ئەوەی دڵی خەبەری دابێ، هەستی بە جۆرە نیگەرانی و ناڕەحتی و ناڕەزاییەك دەکرد. پاشان ستایش و زەمی ڕۆژنامەکان، دروستی ئەو هەستە پەنهانەی ئەویان سەلماند. بەڵام بەرە بەرە چۆنیەتی نمایشەکانی دواتر، ڕۆژ بە ڕۆژ باش و باشتر دەبوون، جەماوەری بینەران، پێشوازیەکی گەرمیان لە شانۆنامەکە کردو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا .چیخۆف، لە (لالۆڤانیا)دا سەرلە نوێ دەگەڕێتەوە سەر تیمە و بابەتە باوەکانی خۆی: پیربوون و پوکانەوەی ڕوح لە ناو ڕۆتینیەتی ژیانی ڕۆژانەدا، بێزاری لە ژیانی بۆش و بەتاڵی گوندی، شکستی حەتمی هەر هیواو ئاواتیکی ئایدیالی، هەڤدژی نێوان تەبیعەتی نەرێنی خۆپەرستی و تەبیعەتی ئەرێنی بەخشندەو خەڵك دۆست. لەم شانۆنامەیەدا مامۆستای بە ناوبانگ سیربریاکوف و هاوسەرەکەی واتا یەلینای گەنج و جوان، وەکو نموونەی تەبیعەتی یەکەم بەرجەستە کراون. "لالوڤانیا"ی سەر ڕاست و یەکڕەنگ و دڵسۆزیش وەکو نمونەی تەبیعەتی دووەم بەرجەستەکراوە. (لالۆڤانیا، دەگەڵ سونیای دڵپاکی خوشکەزایدا، ئەو مەزراو موڵکە بەرێوە دەبات، کە سونیا لە دایکیەوە، کە ژنی یەکەمی سیربریاکۆف بوو، بە میرات بۆی ماوەتەوە.) کاتێ لالۆڤانیا، کە هەموو ژیانی خۆی بۆ خزمەتی

زاواکەی، واتە "مامۆستای بە ناوبانگ" تەرخان کرد بوو، بۆی دەردەکەوێت کە ئەم مامۆستایە هیچ نیە، ناوی زل و دێی وێرانە، مشەخۆرێکی پفدراوەو هیچی تر، تووشی نائومێدی و ڕکونی دەبێت. کاتێ سیربریاکوف، لە ڕووی خۆپەرستیەوە، دەکەوێتە بیری ئەوەی ئەم موڵکە بفرۆشێت و پارەکەی بخاتە ئیش و کاری زیاترەوە تا خۆشتر بژی، هەنگێ لالۆڤانیای دڵسۆز و سەر ڕاست، خۆای نامێنێ، بەوە ڕقی خۆی هەڵدەڕێژێ کە بەر دەمانچەی دەدات، بەڵام بەرناکەوێت. ئیدی دوای ئەم ڕووداوە کە مقۆمقویەکی کەمی لێدەکەوێتەوە، هەموو شتێك ڕەوت و ڕێڕەوی خۆی وەردەگرێتەوە: خەونی خۆشەویستی و ئەشقی قارەمانەکان، خۆشەویستی و ئەشقی ڤانیاو ئەستروف بۆ یەلینای جوان، خۆشەویستی سونیا بۆ دکتۆر ئەستروف، یەك یەك دەبێ بە هەڵم و دەچێ بە ئاسمانا. فشە ئاشتیەکی فشەڵ دووبارە قارەمانەکان لێکدی نزیك دەکاتەوە. دوای ئەو ئاشتەواییە سیربریاکوف و یەلینا بۆ پترسبۆرگ دەگەڕێنەوە. لالۆڤانیا و سونیاش هەر لە مەزارو موڵکەکەدا دەمێننەوە و وەکو جاران درێژە بە کارە بێهودەکەی خۆیان دەدەن و خزمەتی خۆشگوزەرانی وشۆرەت و ناوبانگی "حەزرەتی مامۆستا" دەکەن، بەروبومی مەزارو موڵکەکەی بۆ دەنێرن. بەو جۆرە، خراپە بەسەر چاکەدا سەردەکەوێت. هەموو قارەمانە سەرەکیەکانی شانۆنامەکە، لە ململانێکانیاندا شکست دێنن. دکتۆر ئەستروف، کە لە هەر هەموویان پاکترو سەر ڕاست ترە، هەرچەندە لە بایەخی کارەکەی خۆی بەگومانە. بەڵام هەموو ژیانی خۆی بەدیار نەخۆشەکانیەوە بەسەر دەبات. لالۆڤانیای زۆر دڵسۆز و هەستیار، هەست دەکات ژیانی خۆی کردوە بە قوربانی خزمایەتیەکی خانەوادەیی بێ مانا. یەلینا، گلەیی لە خۆی دەکات، کە بەخۆیشی نازانێ چ دەکات و کەسایەتیەکی لاوەکی و پەراوێزیە. سیربریاکوڤ ڕوح زلی لە خۆبایی، کە سەرچاوەی سەرەکی هەر هەموو ئەم ناکۆکیانەیە، گلەیی ئەوە دەکات پیر بووە و بە ڕاشکاوی بەژنەکەی دەڵێت: "تۆ قێزم لێدەکەیتەوە، تۆ لەپێش هەموانا قێزم لێدەکەیتەوە." بەڵام سونیای خوێن گەرم، لە ئەنجامدا بەدەر لە هەر خەون و ئومێدێك مل بۆ واقیع دەدات و ئامادەیە درێژە بە ژیانی قورس و ناڕەحەتی خۆی بدات. دوا کۆمێنتی شانۆنامەکەش بەو سپێردراوە: "تۆ لە ژیانتا خۆشیت بەخۆتەوە نەبینیوە لالۆڤانیا، بەڵام سەبرکە، ئێمەش ئاسودە دەبین.. خۆشی دەبینین..." گۆشەگیری و پاشەکشە بۆ ئەم ئافەریدە فشەلانەی چیخۆف، باشترین سەنگەری بەرگریە لە هەنبەر جەزرەبەکانی قەدەرا. هەموویان لە هەوەڵەوە دەزانن، هەرچیەك بکەن، چارەنووس و قەدەریان هەر شکست و تێشکانە، وەك بڵێی لە نەستیاندا بەم فیداکاریەی خۆیان ڕازی بن — حیزی و سەلامەتی.

کاتێ نەمیروفیچ — دانچنکو، بەچەند هەفتەیەك دوای شەوی کردنەوەی شانۆنامەی لالۆڤانیا، کەوتە گلەیی کە زۆر ماندووەو بیر لەوە دەکاتەوە کە واز لە کاری دەرهێنان بێنێ و ئەو ئەرکە بەدەستەی کارگێڕی شانۆی هونەری مۆسکۆ بسپێرێت. چیخۆف کە دەیزانی ئەم تیپ و شانۆیە چ دەورێکی لە سەرخستنی ئەم شانۆنامە دژوارەدا دیتووە، بە جۆش و خرۆشێکی دۆستانەوە لە ٢٤/ت٢/ ١٨٩٩دا وەڵامی نەمیروفیچ دانچنکو دەداتەوە کە: "ئاهـ، نەکەی، کۆڵنەدەی، سارد نەبیتەوە! شانۆی هونەر، جوانترین لاپەڕەی ئەو کتێبە دەبێت کە لەسەر شانۆی هاوچەرخی

ڕووسی دێتە دانان. پێویستە شانازی بەم شانۆیەوە بکەیت، تاقە شانۆیەکە کە من خۆشم دەوێ، هەرچەندە تاقە جارێکیش نەم دیتووە.. ئەگەر لە مۆسکۆ ژیابام، هەوڵم دەدا ببم بە یەکێك لە ئەندامانی ئەو شانۆیە، تەنانەت ئەگەر بە خزمەتگوزاریش بوایە، تا بمتوانیبا بە گوێرەی توانای بچووکی خۆم خزمەتێکی بکەم و، ئەگەر بکرێت، نەیەڵم ساردببێتەوەو ئەو دەزگا گرینگ و بایەخدارە فەرامۆش بکەیت."

گۆرکی، دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم شانۆنامەی (لالۆڤانیا)ی دیتبوو، لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٠٠دا نامەیەکی بۆ چیخۆف نووسی بوو: "لالۆڤانیا، هەرخۆی لالۆڤانیایە! بە تەمام شوێنێك بگرم و جارێکی دیکەش بچمە تەماشای.. من پێموایە ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەندتر لەوەی هەیە کە خەڵکی تێی گەییوون. ناوەڕۆکێکە دەوڵەمەند و پڕ لە ڕەمزو ڕاز، فۆڕم و شێوەکەی هێندەی دی ئەم ناوەڕۆکە ڕەسەنەی بەرجەستە کردووە."

چیخۆف، دوای کۆمەڵێك لەم شایەدیانە، ئیدی دڵنیا بوو کە شانۆنامەکەی کەوتووەتە سەر سکەو ڕێگەیەکی دوورو درێژو ڕووناکی گرتووەتە بەر.

لە گەرمەی ئەو هەموو مەدح و ستایشەدا کە سات بە سات بەسەر لالۆڤانیادا دادەباری، لەپڕ دەنگێکی نەشاز بەرزبووەوە: دەنگی تولستوی بوو، بەدەم توڕەبوونەوە لە ئەلکساندرسانینی ئەکتەر دەپرسێت: "کام شانۆنامە، کوا شێوە، کوا ناوەڕۆك؟ ڕووداوەکان لەجێی خۆدا ئەم پێ و ئەو پێ دەکەن." کە نەمیروفیچ – دانچنکو دەیەوێ داکۆکی لە چیخۆف بکات، تولستوی بە توڕەیی بەرپەرچی دەداتەوە کە هیچ شەقڵێکی درامی تراژیدی لە لالۆڤانیادا نیە، هاتووە ئەم کەم و کوڕیەی بە ئاوازی گیتارو یاری کریکیت* پڕ کردووەتەوە. کاتێ ئەم قسانەی تولستوی بە چیخۆف دەگەنەوە، بزەیەکی دڵپاکانەی بۆ دەکات و هیچ ناڵێت. دوای ماوەیەك لە دانیشتنێکا دەگەڵ (پیوتەر گندیچ)ی نووسەرا کە باس دێتە سەر تولستوی، چیخۆف باسی ئەوەی بۆ دەکات کە مامۆستای پیر شانۆنامەکانی ئەو (چیخۆف) بەگەن ناکات و لە سەری دەڕوات و دەڵێت: "ئەوەی دڵخۆشم دەکات ئەوەیە کە جارێکیان تولستوی بەرەو ڕوو پێی گوتم: "بەخۆت دەزانی من ڕقم لە شەکسپیرە، بەڵام شانۆنامەکانی تۆ لە هینەکانی ئەو خراترن." دوای ئەوە چیخۆف بە جۆرێ لە قاقای پێکەنین دەدات، کە ئەگەر پیوتەر گندیچ ڕاست بکات، عەینەکەکەی لەچاوی دەکەوێتە خوارەوە.

هەڵبەتە ڕەخنە توندەکەی تولستوی لە لالۆڤانیا کە گلەیی توندی لە لایەنە ئەخلاقیەکەشی هەبوو، نەیکردە کاریك کە چیخۆف پێشوازی گەرم لە ڕۆمانی (ژیانەوە)ی تولستۆی کە ئەو زستانە بڵاوبووەوە، وەکو ڕووداوێکی ئەدەبی گەورە نەکات. لە نامەیەکیا بۆ گۆرکی (١٩٠٠/٢/١٥) لەو بارەیەوە دەڵێت: "ڕۆمانی (ژیانەوە)م خوێندەوە. جگە لە پەیوەندی زۆر ئاڵۆز و گۆنگ و دەسکردی نێوان نەخلیودوف و ماسلوڤا، ئیدی تێکڕای ڕۆمانەکە زۆر کاری تێکردم: بە پێزی ، دەوڵەمەندی، بەرفراوانی ڕۆمانەکە و ناڕاستگۆیی پیاوێك کە لە مردن دەترسێت، نایەوێ دان بەو ترسەدا بنێ و خۆی بە هەندێ دەقی کتێبێن پیرۆزەوە هەڵدەواسێت." لەگەڵ ئەمەشدا کاتێ لە مانگی کانوونی دووەمدا بیستی تولستوی نەخۆشە و حاڵی شڕە، بە ڕادەیەك

نیگـەران بـوو، وەك ئـەوەی خزمێکـی نزیکـی خـۆی نـەخۆش کـەوتبێ و حـاڵی شـڕبێ. لـە ٢٨/ك٢/١٩٠٠دا نامەیـەك بـۆ میخائیـل منشـیکوڤ ڕۆژنامـەوانی بنـاڤ و دەنـگ دەنووسـێت کـە: "نەخۆشیەکەی تولستوی زۆری ترساندووم، نیگەرانی کردووم، بە ڕاستی لە مردنی ئەو پیاوە دەترسم، مەرگی ئەو کەلێن و بۆشاییەکی گەورە دەخاتە ژیانمەوە. چونکە یەکەم: کەسم هێندەی ئەو خۆش نەویستووە. من کەسیکی ئیماندار نیم، بەڵام باوەڕی ئەوم لە هەموو باوەڕەکانی دی پێ پەسەندترە، لە ڕۆحی منەوە نزیکترە. دووەم: کاتێ لە دنیای ئەدەبدا ناوێکی وەکو تولستوی لە ئارادابێ، نووسەرایەتی ئاسان و خۆشە، تەنانەت ئەگەر سووریش بزانی لە ڕابردوودا هیچ کاریکی زندووت ئەنجام نەداوەو ئێستاش پێت ئەنجام نادرێت. ئەمە جێگەی نیگەرانی نیە، چونکە تولستۆی بە تاقی تەنیا لە جیاتی هەمووان کاری ئەفراندنەوانی دەکات. ئەوەی تولستۆی ئەنجامی دەدات، هـەر هـەموو ئـەو خۆزیـاو ئـاوات و ئامانجانـە لـەخۆ دەگرێـت کـە لـە ئـەدەبیات چـاوەڕوان دەکرێـت. سـێیەم: چـونکە تولسـتۆی پێگەیـەکی ئـەدەبی گـەورەی هەیـە، لـە ڕیـزی پێشـەوەی هـەر هەموومانداپە، دەسـەڵاتێکی یـەجگار فراوانـی هەیـە، تـا ئـەو لـە ژیانـدا بـێ، هـیچ ئەدەبیاتێکی جەڵەبی و بازاڕی بێ پەردەو توڕەهات یان گریان ئەنگێزو سۆز بزوێن ناتوانێ سـەر بەرز بکاتەوە و هەمیشە لە سێبەردا دەمێننەوە، هەر دەسەڵاتی مەعنەوی ئەو دەتوانێ سنوورێك بۆ ڕەوت و ڕێبازو مجێزە ئەدەبیە جۆراو جۆرو جیاوازەکان دابنێ. بەبێ ئەو ئـەدیبان وەکـو ڕانـی بێ شوانیان لێدێ، ئەدەبیات دەبێ بە هەڕاجە بازاڕێکی هەزار لۆ."

هەڵبەتـە "تولسـتۆی"ش ڕێـزی چیخـۆڤ لـەلابوو، سـۆزێکی نیمچە باوکانـەی دەرهـەقی هـەبوو. هەرچەندە شانۆنامەکانی بەدڵ نەبوو، بەڵام بەچیرۆکنووسێکی داهێنەرو فلیڤانی دەزانی، لەزەتی لـە چیرۆکەکانی دەبینی، دوای ئـەوەی چیرۆکی "شـیوەڵە"ی خوێنـد بـووەوە، لـە نامەیـەکیا بـۆ گـۆڕکی لـە بارەیـەوە دەڵێـت: "چیخـۆف چـەند چیرۆکێکی جوانی بـە ژیـان بەخشـیوە! زۆرم پـێ خۆشە!" چیخۆڤ بە موپاسان بەراورد دەکرد. لە نامەیەکی تریا بۆ گولدن وایزەر خاوەنی "هزری ڕووسـی" دەڵێـت: "هـەموو شـتێك لای چیخـۆف تـا خـەیاڵ بـڕ دەکـات واقیعیـە. دەقـەکانی دەوری کامیرای زومدار دەبینن، پیاو وا هەست دەکات، لەخۆڕا، بێهیچ نەزم و نیزامێك وشەو پەیڤان خوا بەختەکی هەڵدەڕێژێت، کەچی وەکو نیگارکێشێکی ئەمپرسیونیست لەو سەرەوە کۆیان دەکاتەوە و شـتێکی جـوان بەدەسـتەوە دەدات." (بڕوانـە: ئـا. ب. گولـدن وایـزەر، چـەند پـەیڤێك دەگـەڵ تولسـتۆی دا، پاچڤەی س. س. کاتلیانسـکی و ڤێرجینیـا وولـف (لەنـدەن، بڵاوەخانـەی هـاگرت، ١٩٢٣ ل٥١).

لـە ١٦/ك٢/١٩٠٠دا چیخۆف، هـەواڵی زانـی کـە ئـەوو، تولستۆی و کورولینکو بـۆ ئەندامیـەتی ئەکادیمیای (کۆڕی زانیاری) ڕووسیا هەڵبژێردراون . حکوومەت ساڵی ڕابردوو بڕیاری دابـوو لـە ئەکادیمیادا، بە مەبەستی کۆکردنەوەی ژمارەیەك لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی نـاودار، بەشـێك بـۆ زمـان و ئـەدەبیاتی ڕووسـی بـە نـاوی پوشـکینەوە بکاتـەوە. چـیخۆف، بـەم بۆنەیـەوە دنیایـەك بروسکەی پیرۆزبایی بۆ هات، ئەنجوومەنی شارەوانی تاگانروك بڕیاری دا وەکو ڕێزو حورمـەت بۆ چیخۆف دوو بۆرس بە نـاوی ئـەوەوە بـە دوو خوێنکاری شایستە ببەخشێت. بـەڵام چیخۆف

هەرچەندە شانازی بەوەوە دەکرد کە لە نێو ئەم دە ئەندامە تازەیەدا شان بە شانی تولستۆی وەستاوەو حیسابی ئەوی بۆ دەکرێ، بەڵام گاڵتەی بە هەرهەموو ئەو شتانە دەهات. ئەوە بوو کە نامەی بۆ کەسوکارو دۆستەکانی دەنووسی، پاینی نامەکانی بە نازناوی وەك: "براتان، ئەندامی بە ناوبانگی ئەکادیمیا، ئا. چیخۆف". یان "ئانتون ئەکادیمیکۆس" لە نامەیەکا بۆ ماری خوشکی، دەڵێ کارەکەرە پیرەکە وای زانیوە، بووە بە "جەنەراڵ" داوای لە هەموو میوانەکان کردوە بە (پایەبەرز) بانگی بکەن. بەلای ئەوەوە تاقە ئیمتیازی ئەم ناز ناوە تازەیەی لەوەدا بوو، کە جۆرە پیگەیەکی ئەکادیمی پێ دەبەخشی، پەساپۆرتێکی تایبەتی پێدەبەخشی کە شەڕەشەقی گومرکەکانی لە کۆڵ دەکردەوە. هەڵبەتە بەخۆیشی باوەڕی نەدەکرد تا سەر بە ئەندامیەتی ئەکادیمیا بمێنێتەوە، ئەوەتا لە نامەیەکیا ٢٨/ك٢/١٩٠٠ بۆ منشیکوف، لەو بارەیەوە دەڵێت: "کاتێ خۆشحاڵتر دەبم، ئەگەر لە سەر هەندێك سەرپێچی ئەم لەقەب و ناز ناوەم لێ بسەننەوە"

تا زیاتر ناو و ناوبانگی دەردەکرد، زیاتر لە تەنیایی ژیانی یاڵتا و دووری لە دۆستان و لە دەنگۆی شارو لە تەپو دوکەڵی شۆرەت، وەڕز دەبوو: "بێکاری، تەنیایی و زستانی ساردی سارد، قاتی ڕەهای ژنانی جوان، دەموقەپۆزی بەرازانی سەر گوزەرگاکان، هەر هەموو ئەمانە دەشێت لە کورت ترین کاتدا بەشەر لەبن بێنن. بە ڕاستی ماندووم. وا هەست دەکەم ئەم زستانە بە ئەندازەی دە ساڵ دریژە." هەموو ئەوانەی لە نامەیەکا ١٩٠٠/٢/٣ بۆ گۆرکی نووسی بوو، کە مانگێ لەوەپێشتر (ك٢/١٩٠٠) نامەیەکی بۆ چیخۆف نارد بوو: "دەڵێن گوایە بە نیازی دەگەڵ ئافرەتێکی ئەکتەرا – نازانم کێیە، بەڵام ناوێکی بیانی هەیە – زەماوەند بکەی. باوەڕ ناکەم شتی وا هەبێت، بەڵام ئەگەر ڕاستە، ئەوا پیرۆزبایت لێدەکەم و زۆرم پێخۆشە."

چیخۆف، لەو بارەیەوە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. پازدە ساڵ پتر بوو ئەو دەنگۆیەی بەدواوە بوو کە دەیەوێ ژن بێنێ، بەڵام ئەمجارەیان ئەم دەنگۆیانە لە هەموو کاتێکی دی لە ڕاستیەوە نزیکتر بوون. هەموو کەس دەیانبینی کە ئۆلگا کنیپەر و ماریا سەروسرێکیان لە نێواندایە، ئەو نامانەی کە ماری بۆ چیخۆڤ دەناردن، لێوان لێو بوون لە ستایشی دەستە خوشکە تازەکەی کە ئەویش هەندێجار لە پەراوێزی نامەکانی ماریادا، چەند وشەیەك یان ڕستەیەکی دۆستانەی بۆ دەنووسی. ماریا هەرچەند سەیری ئەم پەیوندییە نامەییەی دەکرد، وەکو گاڵتەیەکی ڕەوتەنی تیژ تێپەڕ دەهاتە بەرچاوی. ماریا لە یەك شت دڵنیا بوو: ئانتون پیاوی ژن هێنان نەبوو، ژنخواز نەبوو، ئەمە جگە لەوەی هەندێجار زۆر بە ڕەقی و زبری وەڵامی نامەکانی ئۆلگای دەدایەوە. کاتێ ئۆلگا، بیستی چیخۆف نیازی سەفەری هەندەرانی هەیە، بە ئاشکرا پێی ناخۆش بوو. چیخۆف لە نامەیەکیا ١٩٠٠/٢/١٠ بۆ ئۆلگا، دەڵێت: "بۆچی ئەوەندە دڵگرانی؟ خەمت چیە؟ تۆ بۆ خۆت دەژی، خەون دەبینی، کار دەکەی، هیواو ئومێدت بە ئایندە هەیە. دەخوێتەوە، پێدەکەنی... لەوەی زیاتر چیت گەرەکە؟ وەزعی من جیایە: من لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەنراوم، بە خۆشی ناژیم. ناخۆمەوە، هەرچەندە حەزم لە خواردنەوەیە، حەزم لە گۆرانی و ئاوازە، هیچ

شتێك نابیستم – بە كورتیەكەی من وەكو ئەو درەختە هەڵكەندراوە سەرگەردانە حایرماوەم كە نازانیٚ ئاخۆ ڕەگەكانی دژێنەوە یان سیس دەبن و دەمرن."

هەر بۆ ئارامی مێشك و ئیسراحەتی دەروون، باخەوانی دەكرد، هەوڵی دەدا لە خاكی وشك و ڕەقەنی ئاوتكادا، درەختی توس و غانی كێوی، لە پاڵ سەرو و نەخلٚ و كالیپتۆساندا، بڕوێنیٚ و ماڵی بكات. ئاقاقیەكان زۆر زوو ڕوان، ئەو هەفتا شەتڵە گوڵەی كە پار پایز ڕواندبوونی سیٚ دانەیان نەبیٚ ئیدی هەموویان ڕوابوون. بە شانازیەوە بە منشیكوف دەگوت: "پێموایە ئەگەر نووسەر نەبام دەمتوانی ببم بە باخەوان." ئەو دوو سەگە چكۆلەیەی لە میلیكۆڤۆوە هێنابوونی هەردووكیان تۆپین. لە جیاتی ئەوانە دوو سەگی دیكەی ڕاگرت، كە چیخۆف بۆ هەر كویٚ بڕۆیشتایە دووی دەكەوتن. "كەستانە" سەگێكی گەوجی خۆش خوو بوو، بەڵام "بازە" دەنگ كەرخێكی دڕو شەڕانی و زۆر وەڕ بوو. دوو قازی قوڵنگی باڵكراویش لەم باخەدا هێلانەیان كرد بوو، كە چیخۆف دەچووە پەرچی گوڵەباخەكان، هەنگاو بە هەنگاو بێئەوەی زۆر نزیك ببنەوە دووی دەكەوتن. كاتیٚ ئارسینی بەردەست، كە بۆ شت كڕین دەچووە شار، لە شار دەگەڕایەوە بەلاقە درێژە كانیانەوە بەدەوریا سەمایان دەكرد، دەنووكیان دەكردەوەو بە دەنگێكی كەرخ بۆیان دەقیقان. چیخۆف جگە لە پشیلەكان كە لێیان بێزار بوو، ئیدی هەموو حەیوانەكانی دیكەی خۆش دەویست. لێرەش كە مشكی بە تەڵان دەگرت، وەكو میلیكوڤۆ، دەیبردن لە دوور، لە گۆڕستانی تاتارەكان بەڕەڵای دەكردن.لەم سەرو بەندەدا كێشەی دارایی تەواو كەم بوو بووەوە. ماركس، بەردەوام بەگوێرەی قەراردادەكەیان، قیستەكانی بۆ دەنارد، لە هەقی شانۆنامەكانیشیا پارەی باشی وەردەگرت. بڕی پێنج هەزار ڕۆبڵی بە ناوی ماریاوە خستە بانقێكەوە. بە حوكمی غەریزەی موڵكداری، موڵكێكی دیكەی لە گوروزوف بیست كیلۆمەتری یاڵتادا، بە خانوویەكی چكۆلەی سیٚ ژووریەوە كڕی، كە دەیڕوانیە سەر دەریا. جا بۆ ئەوەی پاكانە بۆ ئەم گەوجێتیەی خۆی بكات لە نامەیەكیا بۆ ماری دەڵێت دەتوانین لە ڕۆژانی پشوودا بەخێزانی بچینە ئەم كوخە ماریاش ئەمجارە ڕازی بوو، لە وەڵاما بە تەشەرەوە دەڵێت ئۆلگا كنیپەریش قاییلە. دەگەڵ نزیك بوونەوەی بەهارا، چیخۆف كەڵكەڵەی دیتنی ئۆلگای دەكرد. چیخۆف پێشنیازێكی بۆ تیپی شانۆی هونەر كردبوو كە بە هەموو ئەندامانی تیپەكەوە، بێن و گەشتێكی دەڤەری قرم بكەن. پاش دوو دڵیەكی زۆر ئەوجا ستانسلاڤسكی قاییل بوو، ئەوە بوو سەفەرەكەیان خستە سەرەتاكانی مانگی چوار. ئەلهەقی هەموو ئەندامانی تیپەكە، هەوڵیان دەدا بەپێی توانا نمایشێك بكەن بەدڵی ئەو بیٚ، تا هانی بدەن شانۆنامەیەكی تازەیان بۆ بنووسێت. گوتمان سەفەرەكە خرایە سەرەتاكانی مانگی چوار. چیخۆف لە خۆشیان لە پێستی خۆی نەدەهێوری. لە ١٩٠٠/٣/١٧دا نامەیەكی بۆ فیشنسكی ئەكتەر نارد كە: "من شادم، شادم، زیاتر لەبەر خۆم، تا هەمووتان لە دەرهێنانێكی تازەدا، بەجل و بەرگێكی شیكەوەو لەبەر ڕوناكی كارەبادا بدینم. پیاو ڕاست بڕوات ئەمە خەونێك بوو تا چەند ڕۆژی ڕابردووش هەرگیز باوەڕم نەدەكرد بێتەدی. ئێستاش هەر كاتیٚ زەنگی تەلەفۆنەكەم لێدەدا یەكسەر دڵم دادەخوڕپیٚ و لە دڵی خۆدا دەڵێم:

"ناشێ بروسکەیەکم لە مۆسکۆوە بۆ هاتبێ کە بڕیاریان دابێ لە سەفەرەکەو نمایشی شانۆنامەکە ژێوان بووبنەوە."

لە یەکی نیساندا، ئۆلگا و ماری، پێش ئەوەی ئەندامانی تیپی شانۆی هونەر بگەنە سیڤاستوبۆل، لەیالّتادا پەیدا بوون. هەڵبەتە شادی دیداری چیخۆف و ئۆلگا کەوتە ژێر سەردانی ئاپۆڕای ئەو دۆست و ناسیاوانەی کە هاتبوونە دیدەنی چیخۆف، ئەمە جگە لەوەی خوێن هەڵێنانەکەی دەستی پێکردبووەوە و ناچار بوو لە جێدا بکەوێ نەیەتە دەرێ. یانی وەکو پێویست لەزەتی لە دیدارەکەی ئۆلگا نەبینی. ئۆلگا زۆر نیگەران بوو، خەمی چیخۆڤ بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش ناچار بوو بە تەنیا سەفەر بکات و پەیوەندی بە ئەندامانی تیپەکەوە بکات. چیخۆف لە ١٩٠٠/٤/٩دا کەمێك باشتر بوو، بە چاو قایمی سواری کەشتیەك بوو وسیڤاستوبۆل خۆت بگرە وا هاتم. ڕۆژی دوایی، بە ڕەنگزەردی و لەش بە باری، نەخۆش و تێکشکاو، بەدەم وشکە کۆکەوە گەییە ئەوێندەر. هەر کەسێك لە تەندروستی دەپرسی، بەدەم زەردەخەنەیەکی زۆرەکیەوە وەڵامی دەدایەوە "زۆر باشە، تەندروستیم باشە."

هەر ئەو شەوە شانۆنامەی لالۆڤانیا نمایش کرا. چیخۆف لە ژووری دەرهێنەر دانیشتبوو و، تەمەشای نواندنی لالۆڤانیای دەکرد، لەلایەن ئەکتەرانێکەوە پێشکەش دەکرا کە هەرگیز نەی دیتبوون بە بەرچاوی جەماوەرەوە نمایش بکەن. نمایشەکە زۆر سەرکەوتوو بوو، تەمەشاڤانان دەستیان بە چەپڵەڕێزان کرد، لە ناو هۆڵەکەوە هورایان دەکێشاو داوای نووسەریان دەکرد. هاتە سەر شانۆ، ئەژنۆکانی دەلەرزین، گەردو تۆز نیشتبووە سەر عەینەکەکەی، بەڵام شادو خۆشحاڵ دیار بوو، هەموو ئەکتەرەکانی بەدڵ بوو، بە تایبەتی ئۆلگا. دوای دو ڕۆژ هەمان تیپی بینی کە شانۆنامەی (هیدا گابلەر)ی ئیپسنیان پێشکەش دەکرد، هیچ بەدڵی نەبوو. کە ئەکتەرەکان ڕەئیان دەپرسی، دەیگوت: "گوێ بگرن، بە ڕاستی ئیپسن شانۆنامەنووس نیە." ڕۆژی ٤/١٣ بۆ یالّتا گەڕایەوە، نەخۆشی و گوشاری دەروونی ئەوەندەیان کەسیرە کرد بوو، نەیتوانی ئەو شەوە، کە قەرار بوو شانۆنامەی نەورەس نمایش وپێشکەش بکرێت، لەوێ بمێنێتەوە.

تیپی شانۆی هونەر، بۆ ڕۆژی دوایی گەییە یالّتا. هەرچەندە تۆف و زریانێکی بەترەف بوو، جەماوەرێکی یەجگار زۆری ئاشقانی شانۆ لە بەندەرەکە خڕ بووبوونەوە، تەکان و شان لێك دانێك بوو بە ناو خەرمانی جانتایاندا، ئەوپەڕی دیار نەبوو. بە دەم زریان و گژەباوە، هوراکێشان و گوڵ باران و پێرۆزباییەك بوو هەر مەپرسە. ئەکتەرەکان تەنانەت پێش ئەوەی دەست بەکاریش بن، بەوپەڕی گەرم و گوڕی لەلایەن جەماوەری خەڵکەوە پێشوازی کران. ڕۆژی دوایی ئەندامانی تیپی شانۆی هونەر، ڕێگەی ئاوتکایان گرتەبەر – هەندێکیان بەپێیان و هەندێکیان بە گالیسە – چیخۆف دەعوەتی بۆ کردبوون. کۆمەڵێك نووسەرو هونەرمەند و سازڤانانی وەکو ماکسیم گۆرکی، ئیڤان بونین، ئەلکساندر کوپرین و سێرگی ڕاخمانینوفیش لەوێ بوون، کە بە تایبەتی هاتبوون بۆ یالّتا، تا نمایشی تیپی شانۆی هونەر ببینن... ئیدی کۆمەڵ کۆمەڵ لە دەوری مێزی چای، لە ژووری کار، لە بانیژەکان و باخەکەدا لێکدی خڕدەبوونەوەو کۆڕی قسەو باس گەرم دەبوو. بۆنینی شیك، گوێگرانی خۆی بە نوکتەوحیکایەتی ڕووسی پەتی سەر گەرم دەکرد،

گۆڕکی بەجۆش و خرۆشەوە باسی سیاسەت و هونەری دەکرد، ئۆلگا و ماری بە سینی، شیرینی و ساردیان بەسەردا دەگێڕان. چیخۆف بەوپەڕی دڵخۆشی، بەسەر میوانەکاندا دەگەڕاو لە دەقیقەیەکدا دەجار عەینەکەکەی لە چاوی دادەگرت و دەیکردەوە چاوی و بە میهرو سۆزەوە، بەگەرمی خێرهانینی یەکە بە یەکەیانی دەکرد.

ئیدی ئەکتەرەکان لە ماوەیەکی کەما ڕوویان کرایەوە، هەموو ڕۆژێ چ نیوەڕوان و چ ئێواران، چ بۆ نان خواردن و چ بۆ چاخواردنەوە، سەری نووسەرەکەی لەمەڕ خۆیان دەدا، ئیدی گفتوگۆی سەر خوان و مێز، لە جدیترین بابەتەوە تا شۆخیترین بابەتی لەخۆ دەگرت. هەر هەموویان کۆڕو مەجلیسی چیخۆفیان پێخۆش بوو، بە ڕادەیەك هۆگری بوون، لێبڕان هەموو ساڵێك سەفەری یاڵتا بکەن و مەکۆیەکی هاوبەش لەوێندەر بۆ خۆ دروستبکەن.ئیدی شانۆی هونەر، لە ڕۆژی ١٦/٤/١٩٠٠دا دەستیان بە چالاکیە شانۆییەکانی خۆ کرد، بە لالۆڤانیا دەستیان پێکرد، تەمەشاڤانان تێکەڵەیەك بوون لە گەشتیارانی دەوڵەمەند، کۆمەڵێك مامۆستا، فەرمانبەرانی ناوچەکەو نەخۆشانی سیل. دایکی چیخۆف کە قەت هیچ شانۆنامەیەکی کوڕەکەی نەبینی بوو، داوای کرد بێتە تەمەشای ئەم دانەیەیان. بەم بۆنەیەوە دیزداشەیەکی ئاوریشمی ڕەشی کۆنی لەبەر کردبوو کە لە بنی جانتایەکدا دۆزی بوویەوە. چیخۆف ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو، نیگەرانی ئەوە بوو ئاخۆ پەرچەکرداری دایکی، کە ژنێکی ساویلکە بوو و ئەهلی شانۆو چوونە شانۆ نەبوو، چ دەبێ! لەمەش خراتر ئەوە بوو کە تیپی مۆسیقای شارەوانیش، لە باخچەکەی ئەولایانەوە، خەریکی ئاهەنگ و مۆسیقای پۆلکا بوون، کە لە ناکاوا و لە هەستیارترین ساتدا، لە ناو هۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. وێڕای ئەوەش شانۆنامەکە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، جەماوەری تەمەشاڤانان، بەدەم هوراکێشانەوە، بەڕێزەوە بەرزە پێ لەبەر نووسەر هەستان. دوای هەشت ڕۆژان، کاتێ شانۆنامەی (نەورەس) نمایش کرا. جۆش و خرۆش و پێشوازی جەماوەر لە کارەکە، زۆر لەوەی پێشوو زیاترو گەرم و گوڕتر بوو. دوای هوراکێشان و ستایش و ئافەرینێکی زۆر لە کۆتایی دوا پەردەدا نامەیەکی پیرۆزباییان بە ئیمزای پتر لە دووسەد کەسەوە، دایە چیخۆف، کە ناو و ئیمزای گشت دۆستان و برادەرانی ئەدیب و هونەرمەندی خۆیشی تیا بوو.

خانمێکی دەوڵەمەند، کە لە دڵبەندانی تیپی شانۆی هونەر بوو، هەموو ئەندامانی تیپەکەی بەبۆنەی تەواوبوونی کارەکانیانەوەو بە مەبەستی دوعاخوازی، لە سەربانی کۆشکە بە شکۆ و دەوڵەمەندانەکەی خۆیدا، نیوەڕۆ خوانێکی شایستەی بۆ سازکردن و پاشان دیاری وسەوقاتی دوعاخوازیان دایە یەکتری. ئەکتەرەکان ئەو کورسی و جوڵانەیەیان بە دیاری دایە چیخۆف کە لە نمایشی شانۆنامەی لالۆڤانیادا بەکاریان بردبوو. چیخۆفیش میدالیێکی زێڕی چکۆلەی لەسەر شێوەی کتێبێك بە دروستکردن دابوو، وێنەیەکی خۆیان لەسەری نەخشاندبوو کە دەقی نەورەسی لەبەردەم ئەکتەرەکاندا دەخوێندەوە، بەڵێ سەرو میدالی لەو میداڵە پیشکەش بەهەر یەکێك لە ئەکتەرەکان کردبوو. بەڵام میداڵەکەی نەمیروفیچ – دانچنکۆ ئەم دەستەواژەیەی لەسەر نەخشێنرا بوو: "تۆ گیانت بە بەر نەورەسەکەمدا کرد .. سوپاس."

هەرکە تیپی شانۆی هونەر یاڵتایان بە جێهێشت، شار یەکسەر گەڕایەوە باوەشی بێدەنگی و خامۆشیە مەرگ ئاساکەی جارانی خۆی. دوای ئەو چەند ڕۆژە پڕ جم و جوڵ و چالاکی و چەلەنگیە خۆشە، کپییەکی تەحەمول ناپەرێز باڵی بەسەر شارا کێشا، چیخۆف لە ١٩٠٠/٥/٦دا بە هەشتاو خۆی گەیاندە مۆسکۆ، خێرا خۆی گەیاندە لای لیڤیتان کە لەسەر جێگای مەرگ کەوتبوو. دیدەنی ئۆلگاشی کرد. بەڵام چونکە ئۆلگا سەرقاڵی پرۆڤەێن شانۆیی بوو، چیخۆف کە دەیویست حەقیقەت و ڕاستی تەندروستی و سەلامەتی خۆی لێبشارێتەوە، دوای دە ڕۆژێک دووبارە بۆ یاڵتا گەڕایەوە. هەرکە گەیشتەوە، خێرا نامەیەکی بۆ ئەکتەرە ئایزەکەی خۆی نارد: "سڵاوت لێبێ ئەی نازەنین، ئەی ئەکتەری دڵڕفێن، چۆنی؟ باشیت؟ کە لە مۆسکۆ بووم تووشی سەر یەشەو تایەکی توند بووم، بەڵام لە تۆم شاردەوە، بمبورە. ئێستا زۆر باشم، هەستدەکەم عەلەمم نیە." (بڕوانە نامەی بەراواری ١٩٠٠/٥/٢٠)

بە ڕاستی باش بوو، بە ڕادەیەك باش بوو کە لێبڕا دەگەڵ گۆرکی و چەند دۆستێکی دیکەدا، گەشتێکی پازدە ڕۆژە بە سەرانسەری قەفقازا بکەن. بە ڕێگا سوپاییە بە ناوبانگەکەی جۆرجیادا کەوتنەڕێ، بەدەم ڕێوە سەردانی چەند دێرێکیان کرد و، لە تەفلیس لایان دا. لە ناو ئەو قیتارەدا کە لە تەفلیسەوە بۆ باتومی دەبردن، ئۆلگای بینی، لە خۆشیا واقی وڕما بوو، ئۆلگا دەگەڵ دایکیا بە گەشتێکی کورتخایەن هاتبوو بۆ ئەو دەڤەرە. بە هەرحاڵ شەش سەعاتێکیان لە قیتاردا پێکەوە، بەو پەڕی خۆشحاڵی بەسەربرد، پێش ئەوەی گۆڕینی قیتار دووبارە لێکیان جیابکاتەوە، بەڵێنیان بە یەك دا کە لە سەرەتای تەموزا لە یاڵتا یەکتر ببینن. ئۆلگا، قسەی خۆی بردە سەر، لە کاتی خۆیا گەییە یاڵتا. هەر لە هەوەڵ ساتی گەیشتنیەوە، لای چیخۆف، لە ئاوتکا مایەوە. ئەم دوانە یەکیان دەناسی، نزیکەی دوو ساڵێك بوو نامەو نامەکاریان لە بەینا هەبوو. بەڵام ئەمە یەکەمجاریان بوو پێکەوە و لە یەك ماڵا دەژیان. بە ڕاستی سیحری جوانی ئۆلگا، ڕوح سووکی و چالاکی، لەنزیکەوە، زۆر کاری لە چیخۆف کرد، هەرچەندە هەوڵی دا ماوەیەك خۆی گران بگرێت و مەند بنوێنێ، بۆیە ئۆلگا دوو دڵ بوو لەوەی چ هەنگاوێك بنێ و چ هەڵوێستێك بنوێنێ. بەڵام چیخۆف وردە وردە دەستبەرداری گرانفرۆشی بوو و دایە نەرمکێشی. ئیدی خۆ بەخۆ لە ئاشقێنی تەوسامێزەوە بواردی بۆ ڤیان و خۆشەویستی ڕاستەقینە. ئیدی ئۆلگا بە زیرەکی خۆی تێگەیی کە گرەوەکەی بردووەتەوە، مەسەلەکە لە مجامەلەو ئاشقێنی ڕواڵەتی دەرچووەو بووە بە خۆشەویستی ڕاستەقینە. ئەنجام ئۆلگا بوو بە یاری. ئایا یەکەم دەست لە ملانێیان لە ژوورەکەی چیخۆف دا، لەبەر تریفەی مانگە شەودا لەوکاتەدا کە دایکی و خوشکەکەی لە ژوورەکەی تەنیشتیانەوە نووستبوون، ڕووی دا، یان لە کوختەکەی گورزوف دا کە ئەوەندە لە کەناری دەریاوە نزیك بوو گوێیان لە زەمزەمەی شەپۆلەکان دەبوو؟ ئیدی هەموو شەوێك بە نهێنی یەکتریان دەبینی. ئۆلگا، جلێکی سپی و درێژی لەبەر دەکرد کە چیخۆف زۆری حەز لێدەکرد، چوونکە زیاتر جیلوەی بە قژە ڕەش و لوولەکەی دەبەخشی. قژی ڕەشی بەسەر شان و ملیا دەهاتە خوارێ. لەبن لێوانەوە گۆرانی پڕ سۆزی گلینکای* دەگوت: "بەخۆڕایی شێت و شەیدام مەکە.." دوای ماچ و موچ و دەست لەملانێ و... بەدوو قۆڵی، دەست لە نێو

دەست، بەمیهر و سۆزەوە دەکەوتنە ڕازو نیاز و چپە دوو. کە ئۆلگا لە ئاسمانی حەوتەمی لەزەتەوە، دەهاتە سەر زەوی و وەخۆ دەهاتەوە، بە دوو قۆلی وەکو دوو خوێندکاری پازدە ساڵان، بە تۆزێ نان و مرەباو قاوە خۆیان، خۆیان دەعوەت دەکرد.

ئەم دوو دڵدارە وێڕای هەموو پارێزکاریەکیان، نەیان توانی ئەم نهێنییە لە ماری و دایکی بشارنەوە، هەر زوو گومانی ئەوەیان برد کە ئەم ماستە موویەکی تێدایە. هەڵبەتە ئانتون زۆر خۆشحاڵ بوو، تەنانەت خوشکەکەشی بە شادمانی ئەو شاد بوو، بەڵام چونکە چیخۆڤ باش دەناسی، بۆیە پێی وابوو ئەم پەیوەندیەش هەواو هەوەس و کەف و کوڵێکی ڕەوتەنی و تیژتێپەڕە. کەچی لە گەرمەی ئەم کەین و بەینەدا چیخۆف خۆی لە میوانان و لە مێزی کارکردنەکەی دەدزییەوە. ئیدی دڵی زۆر خۆش بوو، تاقە ڕووداوێك کە سێبەری خستە سەر ئەم شادی و خۆشیەی ئەو، هەواڵی مەرگی لیڤیتان بوو کە لە ١٩٠٠/٧/٢٢ پێی گەیی. دوای ئەوە ڕووداوێکی نالەبارو، کەم دابێژێك کۆمیدی هاتە پێشەوە: ئەویش هاتنی کوت و پڕو لە ناکاوی یەکێك لە کۆنە (نەورەسەکانی) بوو بۆ یاڵتا: ڤێرا کومیسار جڤسکایا. ئەم ئەکتەرە جوانە، کە گەیی بووە لوتکەی شۆرەت و ناوبانگی خۆی بە ڕێکەوت بۆ گەشت و سەیران هاتبوو بۆ باشووری ڕووسیا و تاقیبی چیخۆڤ کرد بوو، ئدی چیخۆف بە خۆشحاڵیەوە لە ١٩٠٠/٨/٣دا لە گورزوف دەی بینێ. لە کاتێکا کە بەدوو قۆڵی بە کەناری دەریادا پیاسەیان دەکرد، ڤیرا، هەموو جوانەیەکی خۆی خستبووە کارو، بە دەنگە مۆزیکییەکەی و لە بن لێوانەوە مەنەلۆگە تایبەتیەکەی نینای قارەمانی شانۆنامەی نەورەسی دەگوتەوەو هەندێ شیعری پۆشکینی لەبەرو بەدەنگە خۆشەکەی دەخوێندەوە. کاتێ ڤێرا داوای لێکرد ڕۆژێکی دیکەش لەلای بمێنێتەوە، زۆر پەشۆکا، چونکە خواخوای بوو، ساتێ زووتر بۆلای ئۆلگا بگەڕێتەوە. بۆ رۆژی دوایی پاش ئەوەی وێنەیەکی خۆی بەم پێشکەشیەوە: "بۆ ڤێرا کومیسار چڤسکایا، ٨/٣. ڕۆژێکی زریانی، کە دەریا خرۆشا بوو، لە ئانتون چیخۆڤ ئارامەوە" بۆ بەجێ هێشت، بە هەشتاو لەوێندەر ڕۆیی.

چونکە ئۆلگا، تەنیا دوو ڕۆژی بەدەستەوە مابوو و دەبوایە بڕوات، بۆیە چیخۆف هەرساتێکی لا بە زێڕێ بوو. لە ١٩٠٠/٨/٥دا بە سواری کەشتی لەگەڵیا بۆ سیڤاستوبۆڵ ڕۆیی. شەوێ لەگەڵیا مایەوە. بەیانی ئۆلگای برد بۆ وێستگەو سواری قیتاری مۆسکۆی کرد. زۆر ئازادانە هەڵس و کەوتیان دەگەڵ یەکدا دەکرد، شەرمیان لە یەکتر شکا بووو، بێ پەردەو خۆمانەو بەخۆشەویستیەوە یەکیان دەدواند. بەجۆرێ هۆگرو تێکەڵاوی یەکدی بوو بوون، کەسیان وێنای نەدەکرد بەبێ ئەوی دی هەڵبکات. چیخۆف، سێ ڕۆژ دوای ڕۆیشتنی ئۆلگا، واتە لە ١٩٠٠/٨/٩دا نامەیەکی بۆ نارد: "سڵاو ئولیا ئازیزەکەم، بەندی دڵەکەم، مایەی خۆشی و شادیم... بیرت دەکەم، هەمیشە وا خەیاڵ دەکەم، کە لەپڕ دەرگا دەکرێتەوە و تۆ خۆت بە ژووردا دەکەی، کەچی هەر نایەیت. بێگومان حاڵی حازر، دوور لە من و لە یاڵتا، سەرگەرمی پرۆڤەیت، خواو ئاسمان و فریشتەکان ئاگادارت بن، خوا لەگەڵ ، کیژی دڵبەند. ئانتونێوی تۆ." دوای چەند ڕۆژێکی کەم، نامەیەکی دیکەی بۆ نارد کە: "ئازیزەکەم، ئەکتەرە ناسك و نازدارو شکۆمەندەکەم. من دەژیم. بیر لە تۆ دەکەمەوە، خەون بە تۆوە دەبینم، بێ تۆییم پێوە دیارە،

بێتاقەتی تۆم. جێگات چۆڵە. دوێنی و پێریێ لە گورزوف بووم. ئێستا بەرەو یاڵتا ،بۆ زندانەکەم، دێمەوە، گژە بایەکی تورەیە، کەشتیەکە ناڕوات، زریانێکی تووشە، شەپۆل بە شەپۆل دەڵێ بەولاوە. خەڵکی نقووم دەبن، هەور مانی لە بارین گرتووە، هەموو شتێك ڕوو لە ژاکان و چرمسینە. بە کورتیەکەی لە وەتای تۆ ڕۆیشتوی هەموو شتێك لە ڕەونەق کەوتووە. ئەگەر ئەشق و ڤیانی تۆ نەبێ لەوەیە خۆم بخنکێنم. هەر شادو سەلامەت بی، ئەی ئەڵمانیە چکۆلە جوانکیلەکەم" (بڕوانە نامەی بەرواری ١٣/٨/١٩٠٠).

لە سەرەتاوە هەر یەك دوو ڕۆژ جارێ ، نامەی دڵداریان بۆ یەکدی دەنارد. پاشان چیخۆف، کەوتە کارکردن لە سەر شانۆنامەیەکی تازە: "سێ خوشك". لە ٢٣/٨/١٩٠٠دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد: "سەرقاڵی نووسینی ئەم شانۆنامەیەم، بەڵام لەوە ناچێ خۆش دەربچێت. من تەواوی دەکەم، ئەگەر بەدڵم نەبوو لە سووچێکەوە دایدەنەم و ساڵێکی دی، یان هەر وەختێ ئارەزووم لێ بێ دەگەڕێمەوە سەری." دەیویست تا لە یاڵتادایە ئەم کارە قوورسە تەواو بکات. هەرچەندە تەندروستی لەوە خراتر بوو، لە ئێستاوە بیر لەوە بکاتەوە کە سەفەری مۆسکۆ بکات. ئەو نامە بە ئاوو تاوانەی ئۆلگا لەوێندەرەوە بۆی دەنووسی، زۆریان دەهاڕوژاند. ئۆلگا باسی ڕۆژێکی زۆر خۆشی، لە فەرامۆش نەهاتووی لادێی بۆ دەکرد. پێشنیازی ئەوەی بۆ چیخۆف دەکرد کە هاوینی داهاتوو لە "شوێنێکی ئەو دەڤەرە" بە سەربەرن، لەنامەیەکیا دەڵێت: "دایمە بیرم لەوە دەکردەوە کە تا چ ڕادەیەك بەم سروشتە رووسیە خۆشحاڵ دەبیت: بەم هەموو کێڵگەو مێرگوزارە، بەم هەموو دەشت و دۆڵە، بەم کەندولەندو ڕووبارە تاریك و سێبەر ئاسایانە ئاسوودە دەبیت.." یان باسی ئەو شەوبێریەی بۆ دەگێڕایەوە کە تا بەرە بەیان، سەعات دووی پاش نیوەشەو، دەگەڵ دۆستاندا بەسەری بردبوو: "بیرم بایەت لە ژیانما، بەقەد ئەمجارە پێکەنی بم." یان باسی کۆڕو ئاهەنگێکی سەمای بۆ دەکرد کە بەکراسێکی یەخە کراوەوە تا هەناسەی تیابووە سەمای کردووە. دەنگدانەوەی ئەم ژیانە گەنجانەیەو پرشنگدارە، دەبووە مایەی ئەوەی چیخۆف بە هۆی نەخۆشی و تەنیایەکەیەوە زیاتر هەست بە پیری بکات. ئیدی لە ٨/٩/١٩٠٠دا نامەیەك بۆ ئۆلگا دەنێرێ کە: "دەترسم نائومێدت بکەم. قژم بەجۆری دەوەرێ کە ئەگەر ئاگام لەخۆ نەبێ، لە زەرفی هەفتەیەکدا سەرم تەواو دەڕوتێتەوەو دەبم بە پیرەمێردێکی سەر ڕوتاوەو هەڵدەستمە سەر پێیان... زۆر دڵم تەنگە، تەنگی تەنگە تێدەگەی؟ خواردنم تەنیا سوپ و شۆربایە. شەوان ساردە، بۆیە لە ماڵ دەرناچم. کچانی جوان دیار نین. پارەم ڕوو لە کزییە، ڕیشم خەریکە بۆز دەبی." ئەم وێنە تەڵخەی چیخۆف دەربارەی خۆی بەرجەستەی کرد بوو، نەك ئۆلگای سارد نەکردەوەو چیخۆڤ لە بەرچاو نەخست، بەڵکو زیاتر دڵبەندی بوو، هەرچەندە سوور دەیزانی نەخۆش و بیتاقەتە، هەر مکووڕ بوو لەسەر ئەوەی شووی پێبکات و وەکو شتێکی بڕاوە باسی ئەم قەراری شووکردنەی بە چیخۆف، لای نەمیروفیچ –دانچنکۆ باس کرد بوو. بەڵام لەو ڕاستیە غافڵ بوو کە چیخۆف لە ژیانی هاوسەری بێزارەو هەر بەوەندەوە نە دەوەستا داوای زەماوەندی لێنەکات، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ سەفەرەکەشی بۆ مۆسکۆ دوا دەخست. بەوەش پاکانەی بۆ ئۆلگا دەکرد کە کاری شانۆنامەی (سێ خوشك) زۆر خاو دەڕوات، هیچ ئەنگێزەو ئیلهامێکی نووسینی

نیە، نەخۆشە: "تا و کۆکەو سەریەشە" ئامانی نادەن. بەڵام ئایا ئۆلگا بە ڕاستی بیری دەکرد، تاسەمەندی دیتنی بوو؟ ئایا نیازی فەرامۆشکردنی ئەوی نەبوو؟ چیخۆف لە ۱۹۰۰/۹/۱٥دا نامەیەك بۆ ئۆلگا دەنێرێت کە: "ساردیەکی دۆزەخینت تیایە، کە ئەمە بە ڕێکەوت پڕ بەپێستی خانمێکی ئەکتەرە! دڵگران مەبە لەم قسەیە ئازیزەکەم. مەبەستم هیچ نیە، شتێك بوو هەروا بە دەمما هات." جا کە ئۆلگا گوشاری لە چیخۆف دەکرد و داوای لێدەکرد یاڵتا بەجێ بێڵێ و بڕوات بۆ لای ئەو، چیخۆف بە تاڵی وەڵامی دەدایەوە: "بۆچی بێم بۆ مۆسکۆ، بۆ ئەوەی تەمەشایەکی تۆ بکەم و بگەڕێمەوە؟ نۆبەتەی ئەو قەوانەیە: بگەمە ئەوێ، تەمەشایەکی پرۆڤەی پر هەراو هەنگامەی شانۆنامەیەك بکەم و دوبارە ڕێ و ڕێ بگەڕێمەوە!... نامەکانت کەم بوون. من وای لێکدەدەمەوە کە لێم بێزار بوویت و خەڵکانی دیکە دەتلاوێنن" (بڕوانە نامەی ۱۹۰۰/۹/۲۲). ئۆلگای ئەمەی زۆر لە بەرگران بوو، کەوتە گلەیی، چیخۆڤ بەوە تۆمەتبار کرد کە پیاوێکی دڵڕەقە، هەست و سۆزی خۆی دەشارێتەوە چ پێویست بەو چاو و ڕاوە دەکات. هەوڵی دەدا، بە ئاماژە تێی بگەیەنێ کە چی لە چیخۆف دەوێت. ئەم چاوشارکێیە لە پای چی، ئەم خۆدزینەوەیە بۆ؟ ئایا باشتر نیە، ڤیان و خۆشەویستی خۆیان بە بەرچاوی خەڵکیەوە دەربڕن و ئاشکرا بکەن؟ تا ئۆلگا پتر پێی دادەگرت، چیخۆف زیاتر گۆشەگیر دەبوو و خۆی لە باسی مەسەلە بنەڕەتیەکە دەبوارد و خۆی لە گیلی دەداو باسی ئایندەی نەدەکرد. لە ۱۹۰۰/۹/۲۷دا نامەیەك بۆ ئۆلگا دەنێرێت، کە جۆرە پەشیمانیەکی پێوە دیارەو دەڵێت: "ئاخر من لە چ شتێکدا دەرهەق بە تۆ دڵڕەق بووم؟ بەدڵ خۆشم و ویستوویت و هەرگیز ئەمەم لێنەشاردویتەوە. هەرگیزاو هەرگیز. ئەوەی من لە نامەکەی تۆدا دەی بینم، ئەوەیە تۆ ڕوونکردنەوەو گفتوگۆیەکی دوورو درێژت دەوێ، گفتوگۆیەك کە ئەنجامێکی جدی لێبکەوێتەوە. بەڵام من یەك لەباری خۆم نازانم چیت پێ بڵێم، جگە لەوەی کە دە هەزار جاری تر پێمگوتویت و بێگومان تا ئاخری تەمەنم (کە پێناچێت درێژ بێ) دووبارەی دەکەمەوە کە خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێیت و بڕایەوە. ئەگەر حاڵی حازر لێکدی دوورین و پیکەوە ناژین، نە گوناحی منی تیایەو نە خەتای تۆ، بەڵکو خەتای ئەهریمەنە کە بەکتریای سیلی لە مندا تۆوداوە و عەشقی هونەری لە تۆدا ڕواندووە." جا بۆ ئەوەی ئۆلگا ئاشت بکاتەوە، ڕۆژی ۱۹۰۰/۹/۲۸، لە نامەیەکا باسی ئەو کاراکتەرە دەکات کە لەشانۆنامەی (سێ خوشکدا )بە یادی ئەوەوە ئەفراندوویەتی و دەڵێت: "هەر خۆم دەزانم چ دەورێکت لەسێ خوشکدا دەبی! دەور نە گاڵتە! دە ڕۆبڵم نەدەیتێ، ئەو دەورەت نادەمێ، بۆ کچیکی دیکەی دادەنەم." ئەنجام لە ١٦/ت۱/۱۹۰۰دا شانۆنامەی ناڤبری تەواو کرد و زۆری دڵ پێخۆش بوو، نامەیەکی بۆ گۆرکی نارد کە: "زۆر زەحمەتم بە نووسینی (سێ خوشکەوە) کێشا، چونکە سێ کاراکتەرو قارەمانی ژنی تیایە، دەبوایە هەر یەکێکیان خەسڵەت و تایبەتمەندی و کەسایەتی خۆیان هەبوایە، هەرسێکیان کیژی یەك جەنەڕاڵن. ڕووداوەکان لە شارۆچکەیەکی دەڤەرێکی وەکو پرم دا زوو دەدەن، سەربازان ناوچەکەیان داگیر کردووە. تۆپخانەیەکی لێیە... هەوای یاڵتا خۆشە، تەندروستیم باشە. حەز ناکەم سەفەر بکەم، تەنانەت حەز ناکەم بۆ مۆسکۆش سەفەر بکەم..." وێڕای ئەمەش دوای هەفتەیەك ملی بۆ داوا یەك لەسەر یەکەکانی

ئۆلگا داو لە ۱۹۰۰/۱۰/۲۳دا گەییە مۆسکۆ و، لە ئوتێلی دریسد، لە ناوەندی شارا، لەسەر ڕوباری تفیرسکایادا هەواری خست.

هەموو ڕۆژێ دەچوو بۆ شانۆی هونەر، ئامادەی پرۆڤەو نمایشەکان دەبوو. بەمجۆرە چەند جارێك "نەورەس"و "لالۆڤانیا"ی بینی. ڕاستە هوراو ستایشی جەماوەرەکە دڵخۆشیان دەکرد، بەڵام وەکو هەمیشە دەربارەی ئەم شانۆنامە تازەیەی نیگەران بوو. وێڕای ئەمەش ڕازی بوو هونەرمەندی نیگارکێش ڤالنتین سیروۆ وێنەیەکی بکێشێت. زۆربەی کات دەگەڵ ئۆلگا، گۆرکی و یان شالیاپین دا، شەوان دەچوونە پیاسەی ناو شار. لە بازاڕ نانیان دەخواردو تا درەنگانێکی شەو بۆ ئوتێل نەدەگەڕایەوە. ئەم ژیانە بێ سەروبەرە، زوو کاری تێکرد. تووشی سەریەشەو تاو کۆکە بوو، وێڕای ئەوەش بۆ ساتێکیش بیری لەوە نەدەکردەوە کە سەفەرەکەی قەت (قطع) بکات و بۆ قرم بگەڕێتەوە. هەڵبەتە لەبەر خاتری ئۆلگا و لە خۆشی ئۆلگا نەدەگەڕایەوە. ئۆلگا لە بەینی هەر دوو پرۆڤەیەکدا، دەرفەتی دێناو دەچوو بۆ ئوتێل بۆ لای، بە دەستی بە تاڵ نەدەچوو بۆ لای، چکلێت و نوقڵ، گوڵ، شووشە بۆن و قوڵەنیا و مەدالیای بۆ دەبرد، ئەوجا سەماوەر ئامادە دەکرا، ئۆلگا کەرەو هەنگوینی بۆ لە سەر نان دەکردو دەرخواردی دەدا. چیخۆف کە دەیبینی وەکو کەیبانوویەکی ڕاستەقینە بە دەوریا بێت، زۆری پێخۆش بوو. بەڵام وێڕای ئەوەش بیری لەوە نەدەکردەوە کە خوازگاری بکات: خۆشەویستی ئازاد، نهێنی، گەرم و گوڕی نێوانیان تەواو تێری دەکرد.

پاش ئەوەی چیخۆف گەییە مۆسکۆ بە ماوەیەکی کەم، ستانسلافسکی لە بارەگای شانۆی هونەردا، هەموو ئەندامانی تیپەکەی کۆکردەوە تا دەقی شانۆنامەی (سێ خوشك) بخوێننەوە. لە سەرەتاوە هەموو بەدڵیان بوو، بەڵام بەرە بەرەو فەسڵ دوای فەسڵ، سارد دەبوونەوە. دوای خوێندنەوەی دوا فەسڵ، هەموو بێدەنگ بوون، بێدەنگیەکی ڕێز ئامێز بە سەریاندا زاڵ بوو. چیخۆف بۆ ئەوەی شەرمەزاری و پەشۆکانی خۆی بشارێتەوە، بە دەم بزەیەکەوەو بە کۆکە کۆك، نیگای پرسیار ئامێزی بە یەك بە یەکی ئەکتەرەکاندا گێڕا. ئیدی زۆری پێنەچوو زاتیان وەبەرخۆ ناو کەوتنە دەربڕینی ڕاو بۆچوونی خۆیان. ئۆلگا، هەندێ لەو بۆچوونانەی پێناخۆش بوو. زۆربەی گەنگەشەو بۆچوونەکان بریتی بوون لە: "ئەلهەقی ئەم دەقە هێشتا ماویەتی ببێ بە شانۆنامە، زیاتر سکێچی سەرەتاییە تا شانۆنامە"یان "ئەمە نایەتە نمایشکردن، هیچ دەورێکی تیا نیە، کۆمەڵێك ئاماژەیەو هیچی تر" هەندێك لە ئیرادگران دوو دڵ بوون لەوەی کە ئاخۆ ئەم دەقە تراجیدیایە یان کۆمیدیا. یەکێك لە ئامادەبووان بە دەنگی بەرز گوتی: "هەرچەندە من لە بنەڕەتەوە لە گەڵ بۆچوونەکانی نووسەردا نیم، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنەم کە..." چیخۆف لەوەی پتر هەڵی نەکرد، کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت و ڕۆیی.

ئیدی ستانسلافسکی لە ترسی ئەوەی نەبا چیخۆف نەخۆش بکەوێ بە هەشتاو چوو بۆ ئوتوتێل بۆلای. سەیری کرد چیخۆف، لە ڕاو بۆچوونی ئەکتەرەکان دەربارەی شانۆنامەکەی، زۆر پەستەو خراپ چڕوچاوی داوە بەیەکا. چیخۆف هاواری کرد: "نا، "ئەم لە بنەڕەتەوە"یە قابیلی قبووڵ نیە!" ئیدی بەخۆی قەراری دا شانۆنامەکەی بە کەڵك نایەت و پێویست ناکات پێشکەش

بكرێت. ئەنجام ستانسلافسکی توانی هێوری بکاتەوەو ئاقڵانە ڕەفتار بکات. چیخۆف بە گوێی کردو هەر لە ئوتێلەکەداو لە ماوەیەکی کەمدا بە هەردوو فەسڵی یەکەم و دووەمدا چووەوەو دەسکاری تەواوی کردن و لە نوێ دایڕشتنەوە. کاتێ کە ڤیرا کومیسار جڤسکایا ویستی شانۆنامەی (سێ خوشك) لەسەر حیسابی خۆی لە سان —پترسبۆرگ پێشکەش بکات، چیخۆف بە خەمبارەیەوە بە بیانووی ئەوەی (کە کاریکی کاڵو کرچ، ڕوتینی، نەبەکام و تاقەتبەرە) ڕەفزی کرد.

چیخۆف، لە ناکاوا، لە ١١/ك١/ ١٩٠٠ دا پێش ئەوەی پێداچوونەوەی شانۆنامەکەی بە تەواوەتی تەواو بکات، مۆسکۆی بەجێهێشت. ئیدی ئەو عادەتەی هەبوو، هەرکە کەمێك بێتاقەت دەبوو، حەزی دەکرد جەو بگۆڕێت. بە خەیاڵی خۆی بەرەو ئاسۆیەکی تازە دەڕۆیی، بەڵام هەرکە دەگەییە ئەو شوێنە، سەیری دەکرد بیابانێکە لە بێزاری. جا کە گەیشتەوە یاڵتا، هەرچی سەری هێناو سەری برد، هەستی دەکرد بە سەربردنی زستانی دوورو درێژ لەوێندەر، ئەوپەڕی گەوجیەتیە. بۆیە لێبڕا بەپەلە بۆ نیس بڕوات.

ئۆلگا، ئەم سەفەرە لە ناکاوەی زۆر لە بەر گران بوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت تۆ بڵێی خەتای ئەم نەبێ، پێداگری و کەموکوڕی ئەم وای لێنەکات بەو جۆرە هەڵێت، خۆی بدۆزێتەوە؟ خێرا نامەیەکی بۆ چیخۆف نووسی: "بۆچی ڕۆیشتی، ئەدی قەرار نەبوو لای من بمێنی؟ بە ڕاستی بەرگەی ئەم جودابیە ناگرم. تا دوێنێ کە قیتارەکە دەڕۆیی و تۆی لێ دوور دەخستمەوە، باوەڕم نە دەکرد لێکدی جیا دەبینەوە. ماوەیەکی زۆر دووی قیتارەکە کەوتم، نەمدەتوانی باوەڕ بەم جودابیە بکەم، ئەوسا لە هۆڕژنی گریانم دا، گریان ئەمما گریان! ساڵانێك بوو کە قەت بەو کوڵ و جۆشە نەگریابووم."

ئەوە بوو ڕۆژی دوایی لە ١٢/ك١/١٩٠٠دا، نامەیەکی چیخۆڤ پێگەیی، لە ڤێناوە نووسی بووی، ئەم نامەیە تۆزێ دڵنیای کردەوە: "سبەینێ بەرەو نیس دەکەومە ڕێ، بەڵام حاڵی حازر لە ئوتێلم، بە تامەزرۆییەوە دەڕوانمە ئەو دوو تەختەی ناو ژوورەکەم. دەنووم، بیر دەکەمەوە، زۆرم لە بەرگرانە کە لێرە بە تەنیام، بێ تۆییم پێوە دیارە، فێنکی دڵەکەم، ئازیزەکەم بە ڕاستی لە شەرمەزاریدا گریانم دێ!" هەڵبەتە ئۆلگا لەوە بێئاگا بوو کە چیخۆف مانگێك لەوەپێش لە نامەیەکیا ١٦/١١/١٩٠٠ بۆ سوڤورین، گوتبووی: "یانی بیستووتە گوایە بە تەمام ژن بێنم. ڕاست نیە. بە نیازم بڕۆم بۆ ئەفریقا بۆ تەمەشای تیمساحان." گەییە نیس، لە هەمان (پانسیون ڕووس)ی شاقامی گۆنۆ، هەرچەندە هاماجی داخرا و وخەمناکی ئەو شوێنەی بەدڵ نەبوو، لایدا. هیچ گۆڕانکاریەك بە سەر پانسیۆنەکەدا نە هاتبوو، هەمان تاس و حەمامی جاری پێشوو بوو کە لەوێ لای دابوو: هەمان کارەکەرە فەرەنسیە ڕووخۆش و لێو بەخەندەکان، هەمان ئاشپەزخانەی ڕووسی کە شووی بە قولەڕەشێك کردبوو، هەمان پیرەژنە ترسناکەکانی سەر سفرەو خوانەکەی جارەکەی پێشویی لەوێندەر دیتنەوە. بەڵام مەستی کەش و هەوا خۆشەکەی ئەوێ بوو. ئەوە بوو لە ١٤/ك١/١٩٠٠دا یەکەم نامەی لە نیسەوە بۆ ئۆلگا نارد کە: "لێرە بنەگوڵان چرۆیان کردووە، گەنجان جلکی هاوینەیان لەبەر کردووە. تاقە کەسیك نابینی کڵاوی لە سەربێ." ڕۆژی

دواتر یانی لە ١٥/ کانوونی یەکەمدا، بۆی دەنووسێت: "دەڵێی لەسەر مانگم .کەش و هەوا مامناوەندیە، دنیا هەتاوە، کە چاکەت لە بەردەکەم گەرمام دەبێ. هەموو کەس جلکی هاوینەیان لەبەرە پەنجەرەکانی ژورەکەم کراونەتەوە، لەسەر گازی پشتن، لەوەدەچێ پەنجەرەی ڕوحیشم کرابێتەوە". خەریکی پاکنووس و پێداچوونەوەی شانۆنامەکەمم، پێم سەیرە کە چۆن و بۆچی ئەم شتەم نووسیوە."

دەقی فەسڵی یەکەم و دووەم لای ستانسلافسکی مابوونەوە، ئەویش دەستی بە پرۆڤەیان کرد بوو. چیخۆف تەنیا سووکە دەسکارییەکی فەسڵی سێیەمی کرد، بەڵام فەسڵی چوارەمی لە هەوەڵەوە تا کۆتایی سەرلە نوێ داڕشتەوە. دوای هەفتەیەك لە فەرەنساوە پاشماوەی دەستنووسی شانۆنامەکەی بۆ مۆسکۆ نارد. بە سوعبەتەوە بۆ ئۆلگای نووسی (١٧/ك١/١٩٠٠):

"زۆر وشەم بۆ تۆ و لەبەر خاتری تۆ زیاد کردووە، دەبێ سوپاسم بکەیت."

چیخۆف، نیگەرانی ئەوە بوو ئاخۆ لە شانۆی هونەردا لە دووری ئەو چ باسە؟ ئایا ئەکتەرەکان، توانیویانە بچنە کلێشەی قارەمانانی شانۆنامەکەوە؟ ئایا ستانسلافسکی دەرهێنەر، بە خولیا تەبیعەتگەراییەکانی خۆی، باری شانۆنامەکەی قورس نەکردوە؟! ئەوە بوو لە ٢/ك١٩٠١/٢دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "بەلای کەمەوە یەکێك لە پرۆڤەکانی (سێ خوشك)م بۆ باس بکە. خۆ زیادکردن یان لێ لابردنی ناوێ؟ دەورەکەی خۆت باش دەگێڕیت گەوهەری یەك دانەی من؟ ئاگاداربە لە هیچ فەسڵێکدا خەمبار نە نوێنی. توڕەیی قەینا، بەڵام خەمباری نە. ئەو خەڵکانەی بۆ ماوەیەکی زۆر خەم لە ناخی خۆدا هەڵدەگرن خووی پێوە دەگرن، زۆرجار یان فیکە دەکێشن یان لە فکران ڕادەچن. کەواتە لەسەر شانۆ، بەدەم گفتوگانەوە لە فکران ڕابچۆ، دەبیرەوە بچۆ، تێدەگەی؟ دوای چەند ڕۆژێك لە ١١/ك١٩٠١/٢دا نامەیەکی دیکەی بۆ ئۆلگا نووسی کە: "بە ڕاستی غەدر دەکەیت کە نامەم بۆ نانێریت. بەلای کەمەوە بۆم بنووسە کە (سێ خوشك) چی بەسەر هات، گەییە کوێ. تا ئێستا تاقە وشەیەکت دەربارەی ئەم شانۆنامەیە بۆ من نەنووسیوە. جگە لەوەی کە چوویتە پرۆڤە یان ئەمڕۆ پرۆڤەتان نەبوو."

هەڵبەتە چیخۆف، بە خەمی هەموو وردەکارییەکی شانۆنامەکەیەوە بوو، بۆیە داوای لە یەکێك لە ئەکتەرەکان کرد کە تەنیا لە فەسڵی یەکەمدا فراك (جۆرە باڵاپۆشێکە) لە بەربکات، بە یەکێکی دیکەیانی گوت بەجۆرێ سیمای خۆی بگۆڕێت کە لە لیرمانتوڤ شاعیر بچێت. جا چونکە لە شانۆنامەکەدا چەند دەورێکی ئەفسەران هەبوو و دەترسا لە نواندندا کاریکی وەها بکرێ ئەو ئەفسەرانە وەکو کاریکاتۆر بنوێنن، داوای کرد خۆ لە هەر نەفەسێکی کۆمیدی دوور بگرن. جا بۆ ئەوەی نمایشەکە ڕاستگۆییەکی زیاتر وەربگرێت، ڕووی لە سەرهەنگ پترۆڤ برادەری نا کە لە پرۆڤەکاندا ئامادە بێت، ئاگای لە دروستی و وردی جلکە سوپاییەکان و ڕەفتاری ئەو ئەکتەرانە بێت کە دەوری ئەفسەرانیان دەبینی. ئەم سەرهەنگە بەڕێزە بە ئەمانەتدارییەکی ئەوتۆوە ئەو ئەرکەی دەستۆ گرت، کە نامەیەکی دورودرێژی بۆ چیخۆڤ ناردو بە توندی گلەیی لێکرد کە بۆچی پۆرترێتی ئەفسەرێکی بەجۆرێ کێشاوە کە بەوپەڕی بێ ئەخلاقی ژنێکی مێردار لە ڕێ دەر بکات. ئیدی چیخۆف لە ٢٤/ك١٩٠١/٢ نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "بە هەرحاڵ هەرچیەکم

بەسەرهەنگ گوتبوو جێبەجێی کردوە. بەکورتیەکەی دەبیٚ ئەفسەرەکان جلکی سوپایی لەبەر بکەن... بیری مۆسکۆ و غەریبی تۆ دەکەم."

زمانی نامەکانی چیخۆف، وەکو هەمیشە میهر ئامێزو پر سۆز بوو، بەڵام کەمترین ئاماژەیان دەربارەی زەماوەند تیا نەبوو. ئیدی چیخۆڤ بە گومان لە دوورەوە، درێژەی بەچاوشارکیٚ و خۆدزینەوەکانی خۆ دەدا. ئۆلگا، دوای سەفەرەکەی چیخۆف یەکسەر نامەیەکی بۆ نارد بوو کە: "دەزانی ئانتون لە خەیاڵەکانی خۆم دەترسم، یان بە گوتەیەکی دی بەدەنگی بەرز خەون و خەیاڵەکانم دەربڕم، بەڵام هەست دەکەم شتێکی جوان و بە هێز لەم ڤیان و ئەشقەی ئێمە دەکەوێتەوە. هەرکاتیٚ ئەم قەناعەتەم لا پەیدا دەبیٚ، مەیل و ئارەزووی ژیان و کار پەیدا دەکەم و نیگەرانی و کیشە چکۆلەکانی ژیان بەرۆکم بەر دەدەن. ئیدی لە خۆ ناپرسم بۆچی دەژیم." جا چیخۆف، خۆی لە وەڵامدانەوەی ڕاستەوخۆی ئەو نامەیە دوورگرت، لە ڕاستیدا بەدەگمەن خۆی لە باسکردنی ئایندە دەدا. نەخۆشیەکەی کردبوویە کاریك کە نەتوانیٚ پابەندی بەرنامەو پرۆژانی درێژخایەن بێت. ئیدی دەبوا بۆ ڕۆژ بژی، خۆی زۆر ماندوو نەکات، خۆی بپارێزێت. لە ٢/ك١٩٠١/٢دا لە نامەیەکا وەڵامی ئۆلگا دەداتەوە: "من تۆم خۆش دەویٚ، بەڵام تۆ بەمە نازانی تۆ پێویستت بە مێردە، یان پێویستت بە زاوایەکی کەتەی چوارشانە، فەرمانبەرێکی گەورەی بەپلەو پایە. ئەریٚ لە نامەی پێشوودا پیرۆزبایی سەری ساڵی تازەم لێکردبوویت؟ بە ڕاستی نەم کردبوو؟ چۆن شتی وا دەبێت؟ بەڵام من، من چیم؟ بە ڕاستی هیچ نیم." هەروەها دەڵێت: "هەردوو دەستت ماچ دەکەم، هەر دە پەنجەکەت، ناوچەوانت ماچ دەکەم، هیوای شادمانی و ئاسوودەیی و خۆشەویستیەکی زۆر زۆرت بۆ دەخوازم. خۆشەویستیەکی درێژخایەن، بۆ نموونە پازدە ساڵ بخایەنیٚ. دەڵێی چی؟ ئەشقی واهی دەبێت؟ بەلای منەوە دەبیٚ، بەڵام بەلای تۆوە نا." جا بۆ ئەوەی شۆخیئامێزی نامەکانی بپارێزێت، بەم جۆرە ناوانە ئیمزای دەکردن: "ئازیزی تۆ، ئانتون"، "توتوی ئەکادیمی"، "ئانتونیوسی ڕەبەن"، "پزیشکە خانەنشینەکەت" و "شانۆنامە نووسە خانەنشینکراوەکەت."

دوای ماوەیەکی کەم لەو نیسە جوانەی کە لە سەرەتای هاتنەکەیەوە مەستی کەش و هەواو جوانیەکەی بوو بوو، بێزار بوو. یەکێك لە هۆیەکانی ئەو بێزاریەش ئەوە بوو کە ڕووسێکی زۆری لیٚ بوون و تینوو و تامەزرۆی دیداری چیخۆف بوون. وێڕای ئەمەش تاقەتی نووسینی نەبوو، کاری نووسینی بە باشی لەبەر نەدەڕۆیی. لە نامەیەکیا "٢/ك١٩٠١/٢) بۆ ئۆلگا لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەڵبەتە دەنووسم، بەڵام بە خاوی و بێتاقەتی. وا هەست دەکەم (سیٚ خوشك) پرزەی لەبەر بڕیوم، یان پیر بووم و لە نووسین چومەتەوە، ئیدی نازانم پێویستە بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەستبەرداری نووسین ببم، بۆ نموونە نزیکەی پێنج ساڵێك بچمە سەفەران، ئەوسا بگەڕێمەوەو دەست بەکار بکەمەوە." بیری لەو دەکردەوە بچێتە جەزائیر، بەڵام دەریا خرۆشا بوو و سەفەری دەریایی ترسناك بوو. بۆیە وازی لەو بیرۆکەیە هێناو لە ٢٦/ك١٩٠١/٢دا دەگەڵ کوڤالفسکی هاوڕێیدا، بە قیتار بەرەو ئیتاڵیا ڕۆیشتن. لە قیتارا و بەدەم ڕێوە، بە کوڤالفسکی هاورێی دەڵێت: "من وەکو پزیشك دەزانم کە تەمەنم کورت دەبێت" ئیدی بە دوو قۆڵی سەری پیزا و فلورەنساو

بە تایبەتی ڕۆمایان دا. چیخۆف لە ١٩٠٢/٢/٢دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "ئەم ئیتاڵیایە چەند وڵاتێکی جوانە! چەند وڵاتێکی سەیرە! گۆشەیەك نابینی، بستێك زەوی نابینی، پڕ نەبێت لە زانیاری گەورەو پڕ سوود." لە لایەکی دیکەشەوە پێی سەیر بوو، هیچ هەواڵێکی لە بارەی شانۆنامەکەیەوە پێنەگەیی بوو. ئایا پێشکەشیان کردبوو یان نا؟ تۆ بڵێی ئەم بێدەنگیە نیشانەی ئەوە بێ شکستی هێنابێ؟ ( هەڵبەتە هۆی ئەم بێدەنگیە ئەوە بوو کە زوو زوو ئەدرەسەکەی دەگۆڕاو پێیان نە دەزانی) دەنا شانۆنامەکە لە ٣١/ك١٩٠١/٢دا یەکەم نمایش کرابوو ودانچنکۆ بە بروسکەیەك دڵنیای کرد بوو کە شانۆنامەکە، هەرچەندە فەسڵی دووەمی درێژ بوو، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە. هەڵبەتە ئەم هەواڵە، زۆریش دروست نەبوو، جۆرە خاترگرییەکی تیا بوو. چوونکە هەم ڕەخنەگران و هەم تەمەشاڤانان هەموویان لە سەرەتاوە سەریان لە پچڕ پچڕی دیالۆگەکان، هەڵوەستە زۆرو درێژخایەنەکان، نەبوونی و کەمی جووڵە و هەڵوێستی سەرگەردانانەی کاراکتەرەکان، سوڕ مابوو... بەڵام زۆری پێنەچوو، چیخۆف بۆی دەرکەوت کە ئافەرین و ستایشەکانی سەرەتا، جۆرە پیلانێکی بەزەیی ئامێز بوون. لە ڕووی بەزەییەوە خاتریان گرتووە. لە نێو هەموو دۆستەکانیا تەنیا لاروف سەرنووسەری "هزری ڕووسی" بە ڕاشکاوی، ڕێك و ڕەوان ڕای خۆی بۆ نووسی: "سەرکەوتن؟ بە ئەندازەی سەرکەوتنەکەی "نەورەس" نەبوو، بەڵام بەلای منەوە بە بە هاترو پڕ ماناتر بوو."

لەم بەینەدا کەش و هەوای ڕۆما بەرەو ناسازگاری دەچوو. ئیدی بیناو شوێنەوارە مێژووییەکان، بە بەفر سواخ دران. چیخۆف بە ناچاری و بە نە بەدڵی بەرنامەی سەفەری ناپۆلی هەڵوەشاندەوە، سواری کەشتی بوو، ئودیسا خۆت بگرە واهاتم. ئیدی لە کەشتیدا و بەدەم ڕێگاوە، شانی لە خوێندنەوە قایم کرد. هەرکە گەییە یاڵتا، هێشتا ماندوویەتی نەحەسابووەوە، لە ١٩٠١/٢/١٦دا نامەیەکی بۆ خوشکی نووسی کە: "شەویَ گەیشتمەوە. تا بەیانی خەوم پێیا نەکەوت. هیچ شتێك دەربارەی مۆسکۆ و شانۆنامەکەم نازانم." سێ ڕۆژ دواتر، واتە لە ١٩٠١/٢/١٩ دا ئەم بروسکەیەی بۆ ئۆلگا نارد: "چاوەڕوانی بروسکەیەکی تێروتەسەل بکە، تەندروستیم باشە. منی ئاشق بە بێ تۆ هەڵناکەم، غەریبیت دەکەم سەگە چکۆلەکەم*... چیخۆف."

چیخۆف تەنانەت پێش ئەوەی وتارێن ڕۆژنامەکانیش بخوێنێتەوە دڵنیا بوو کە لە شانۆنامەکەی نەگەییون. پێشبینی ئەوەی کردبوو. بەڵام هەستی دەکرد کە (سێ خوشك) ڕۆژێ دێ، دەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، خۆی دەسەپێنێ، تەنانەت بەسەر ئەوانەشدا کە گلەییان دەکرد کە گوایە خاوو بێ ڕەونەقە،خۆی دەسەپێنێ.

چیخۆف، بۆ ئەوەی وێنەیەکی زندووی ئەو شارۆچکەیەی کە ڕووداوەکانی شانۆنامەی (سێ خوشك)ی تیا ڕوو دەدەن، بگرێت، سوود لە بیرەوەرییەکانی خۆی لە شارۆچکە سوپایی و خەواڵوەکەی ڤوسکریسنك دەبینێ، ئەو شارۆچکەیەی کە ڕۆشنبیران و ئەفسەران وەختێ خۆیان بە کارێن ڕۆتینی ڕۆژانەو چەنەبازی و فەلسەفە ڕێسییەوە تیا بەسەر دەبرد، هەروەها سوودی لەو بیرەوەریانەش وەرگرتبوو کە لەپشووە هاوینەکاندا، لە لۆکا، لە مەزارو موڵکەکەی سێ

خوشكانی لینتڤاریف دا بەسەری برد بوو. ئەم كچانەو ئەم ئەفسەرانەی تۆپخانەی شار قەت یەكیان نەبینی بوو.. بە هەرحاڵ كچەكان لە ماڵی خۆیاندا میوانداری ئەفسەرەكان دەكەن، ئەم ئاوێتەبوونە دەروونی و جادووییەی نێوان ئەم دوو گروپە بەشەرە، لەمێشك و خەیاڵی چیخۆفدا گەڵاڵە دەبێت و دەبێتە ئیلهامبەخشی شانۆنامەی (سێ خوشك.)

ئەم سێ خوشكە، كچی جەنەڕاڵێك دەبن، هەرسێكیان لە مۆسكۆ لە دایك بوو بوون. ئیدی لە بێ مانایی و بێهودەیی ژیانی گوندی بێزارو وەڕز دەبن، لە كانگای دڵەوە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ شار دەكەن، خەریكە پەڕوباڵ بۆ مۆسكۆ دەربكەن. خەریكە شێت بن بۆ مۆسكۆ و لە سەرانسەی شانۆنامەكەدا، ئەو پاشبەندەی ئەوان دەیڵێن و دەیڵێنەوە "بەرەو مۆسكۆ! بەرەو مۆسكۆ!" دووبارە دەبێتەوە، بەڵام ئەم نوستالیژاو غەمی غوربەتە تاقە خاڵی هاوبەشی نێوان هەرسێكیانە، خوشكە گەورەكەیان ، ئۆلگا سەرسەخت و ڕوح زلە، مامۆستای قوتابخانەیە، هەست بە مەسئولیەت دەكات، پێدەچێ سور بێ لە سەر ئەوەی شوو نەكات و بە قەیرەیی بمینێتەوە. بەڵام خوشكی دووەم، ماشا كە (ئۆلگا كنیپەر دەوری ئەو دەبینێ) كەسێكی توندە تەبیعەت وهەستیارو نەژنەوە، بەخۆشەویستی شوو بە موعەلیمێكی كەودەنی فشەكەر دەكات، خەتای ناكامی هەڵبژاردنەكەی خۆی بە ملی خەڵكانی دیدا دێنا. خوشكە بچووكەكەیان، ئیرینا، كچێكی ڕۆحسووكی، شادو شەنگۆڵە، بەخەیاڵ دەژی، بەخولیای ئەوە دەژی كە ببێ بە كەسیكی ئیماندارو خۆی بۆ كارێن خێرخوازی تەرخان بكات. جا ئەمانە بە خەون و خەیاڵان دڵخۆشی خۆیان دەدایەوەو كەبتی خۆیان دەڕەواندەوە. لە ناكاوا، سەریان دای بە بەردی واقیع دا. فەوجێكی تۆبخانە لە شارۆچكەكەیاندا هەڵدەدات. وردە وردە چەند ئەفسەرێك دەكەونە هاتوچۆیان، بەرە برە هەندێ سووكە ڕیسكی ئاشقێنی دەكەوێتە بەینەوە. ئیدی مەیلی ژیانیان لەدڵا زندوو دەبێتەوە و نەفسی دنیاییان دەبوژێتەوە. ئۆلگای سەركێش بیر لەوە دەكاتەوە قوتابخانەكەی تەرك بكات. ماشا، كە شووەكەی بەدڵ نیە، حەز لە عەمید ڤرشینین دەكات و پەیوەندی دەگەڵدا دەبەستێ. ئیرینا كە لە هەموویان شۆخ و شەنگتر بوو، ئەفسەرێكی دیكە خوازگاری دەكات و مل بۆ زەماوەند دەدات. بەڵام كاتێ دوای چەند مانگێك فەوجەكە دەگوازنەوە بۆ پایەگایەكی دیكەو ئەفسەرەكان خواحافیزی لە خوشكەكان دەكەن، ئیدی خوشكانی داماو، دەچنەوە قاغەكەی جارانیان و دوای ئەو نەشئە سۆزداریە، بادەدەنەوە سەر خەون خەیاڵات. ئۆلگا كونجی تەنیایی دەگرێت و لە گوندێكا دەژی كە ڕقی لێیەتی. ماشا دەگەڵ مێردە مامۆستاكەیدا كە لێی بێزارە، بەداخ و كەسەرەوە دەژی. ئیریناش كە دەزگیرانەكەی لە دوئێلدا دەكوژرێ ڕزگاری خۆی لە سەختكۆشی و فیداكاریدا دەبینێتەوە. كاتێ كە جۆقەی سوپایی بە ئاهەنگی مارشەوە، بە جادەكاندا دەڕوات و دوور دەكەوێتەوە. ئۆلگا، هەردوو خوشكەكەی لە ئامێز دەگرێت و بە میهرو سۆزەوە دەڵێت: "خوشكە ئازیزەكانم، ژیانی ئێمە كۆتایی نەهاتووە. درێژە بە ژیانی خۆ دەدەین، ئەم جۆقەی مۆسیقایە هێندە بەجۆش و خرۆش مۆزیقا لێدەدەن ئەگەر یەك دەقیقەی دی سەبر بكەین، لەگینە بۆمان دەربكەوێ بۆ دەژین، بۆ ئازار دەچێژین. ئا خۆزگە دەمانزانی كاشكێ بمانزانیبا!"

بەو جۆرە، ئەم سێ کیژە پاش هەرەسی خەون و ئاواتەکانیان بێهودە هەوڵدەدەن کە بزانن بۆچی لەم دنیایەدا دەژین. سەرانسەری شانۆنامەکە، بە هەموو بارگە سایکۆلۆژیە گرژەکانیەوە بە دەوری تەوەری ئەم پرسیارەدا دەسوڕێتەوە: مانای ژیان چیە؟ کۆمێنتی بەگومانی ئەفسەرەکان، خۆی لە خۆیدا وەڵامی پرسیارە نیگەرانەکانی خوشکەکانە. یەکێك لە ئەفسەرەکان دەڵێ: "کام مانا؟ فەرموو بڕوانە بەفر دەبارێ. ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ چیخۆف لە میانەی کۆمەڵێك ڕستەو گفتوگۆی بە ڕواڵەت کەمبایەخەوە هاماجێکی هێندە بارگاوی و شاعیرانە دەخولقێنێ، کە تەمەشاڤانان وەکو کاراکتەرەکان لە ئاستی بێهودەیی وەزعی بەشەریدا دۆش دادەمێنن. نووسەر داوامان لێدەکات زیاتر بچینە ناخی خۆمانەوە تا پەیگیری ڕووداوە دەرەکیەکان بکەین. ئەو ناوچە گوندییە خەمناکە بێئەوەی بەخۆ بزانین، دەبێ بە نیشتمانی دەروونیمان. ئەو موغامەرەو ڕیسکە خەمناکەی سێ خوشکەکە ملی پێوە دەنەن، ڕیسك و موغامەرەی ئێمەشە. ئێمەش وەکو ئەوان سەرگەردان و حایر نازانین لە کوێوە دێین و بۆکوێ دەڕۆین و لەم دنیایەدا چیبکەین و چ کارەین، دوای ئەوەی هۆڵەکەش جێدێڵین تا ماوەیەکی زۆر، دەنگی ترسناك و بەسامی ئەندرێ، ئەندرێی برای ناکام، دژی خەڵکی شارۆچکەکە، لە گوێماندا دەزرنگێتەوە: "ئێمە هەموو کارێکمان ئەوەیە کە بخۆین و، بخۆینەوە، بنووین و پاشان بمرین... ئەوسا خەڵکانی دی لەدایك دەبن، ئەوانیش دەخۆن و دەخۆنەوەو دەنوون، جا بۆ ئەوەی لە بێزاری و بێتاقەتیدا نەمرن، بە زەبری بەدگۆیی و ڕیابازی و ڤۆدگاو وەرەقبازی و گەنگەشان جۆرە هەمەڕەنگیەك بە ژیانی خۆ دەبەخشن... ژنان مێردەکانیان فریو دەدەن، مێردان درۆ دەکەن و وا دەنوێنن هیچ نابینن، هیچ ناژنەون. ئیدی قورسایی ئەم درندە ڕەفتاریە، دەکەوێتە سەرشانی منداڵان و هێزی داکۆکی و بەرگرییان لەبەر دەبڕێت و، تروسکەی خوایی لە ڕوحیاندا دەکوژێنێتەوە. دەبن بە کۆمەڵێك جەنازەی داماو و کڵۆڵ – ڕێك وەکو باب و داکیان." یانی بە گوتەیەکی دی ژیان دزێوە، پووچە، خۆشی شادی تەنیا وەهم و خەیاڵەو هیچی دی. تاقە چارەسەری نائومێدی تەنیا کارە، کار بەبێ هیچ تەماحێك یان ئومێدێکی پاداشت. هەر هەموو ئەمانە فەلسەفەی ڕاستەقینەی چیخۆف بوون لە کاتی نووسینی شانۆنامەکەدا. تا نەخۆشیەکە زیاتر کەسیرە و لاوازی دەکرد، کەمتر حەزی بە مەجلیس و کۆڕی ئەوانە دەکرد کە بە ناوی خۆیەوە دەیان دواندو خۆیان بە دۆستی دەزانی و بە ئافەرین و ستایشان گوێیان دەئاخنی.

وێڕای ئەوەش کە ئیڤان بونینی لە یاڵتا دا بینی زۆر خۆشحاڵ بوو. ماری، ئیڤانی دەعوەت کرد بوو وچەند هەفتەیەك بوو لە شوقەکەی ئاوتکای ئەواندا بوو. ئەم پیاوە بە زەبری ئاکار جوانی و ڕوح سووکی خۆی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕێزو حورمەتی ماری و دایکی بەدەست هێنا. لەوەش دەچوو هەستی ماری بە رانبەر بەم نووسەرە گەنج و تەڕدەماخ و قۆزە، لە سنووری دۆستایەتی ئاسایی هێوەتر بڕوات. بە هەرحاڵ کاتێ چیخۆف هاتەوە، بونین چوو بۆ ئوتێل. بونین دە ساڵ لە چیخۆف بچووکتر بوو، لە ڕووی ئەدەبەوە لە بواری ئەدەبدا بە مامۆستای خۆی دەزانی و ڕێزی تایبەتی بۆی هەبوو. کە ناو بە ناو هاتوچۆی ئەوماڵەی دەکرد، هەستی دەکرد چیخۆف، دەترسێت، ترسێکی نەخۆشانە، کە لە هەنبەر هەر کەسێکدا بە بێ چاکەت و بێ

بۆینباخ دەربکەوێ. تەنانەت دەگەڵ خەڵکانی میمڵشدا هەر بە ئەدەبەوە ڕەفتاری دەکرد، حەزی لە نەزم و نیزام دەکرد و بزە خەمامێزەکەی لەسەر لێوی ئاوا نەدەبوو، کە نوکتەیەکی خۆشی بۆ دەگێڕادرایەوە، وەکو منداڵ دەگەشایەوە. ئێوارانێك کاتێ بەدوو قۆڵی بە گالیسکە پیاسەیان دەکرد، چیخۆف بە بۆنینی گوت: "ئایا دەزانی تاچەند ساڵی دی بەرهەمێن من دەخوێنرێتەوە؟ حەوت ساڵ." بونین پرسی: "بۆ حەوت؟" چیخۆف وتی: "با بڵێین حەوت و نیو." دوای تۆزێك لە سەری ڕۆیی: "من سوورم لەسەر ئەوەی تەنیا تا حەوت ساڵی دی دەمخوێننەوە، بەڵام من کەمتر دەژیم: ئەو پەڕی شەش ساڵی دی. بەڵام بە هیچ جۆرێ ئەمە لای ڕۆژنامەوانانی ئودیسا باس مەکە." ئەلکساندر کوپرین، یەکیکی دی بوو لەو نووسەرە گەنجانەی کە لەو سەرو بەندەدا هاتوچۆی چیخۆڤ دەکرد. کوپرین کەوتبووە ژێر کاریگەری ڕواڵەتی سادەو ساکارانەو بێ فیزی و سیمای خەمینی ئەوەوەو لەمبارەیەوە گوتویەتی چیخۆف، ئەگەر چاوە قاوەییە تۆخە ئامال شینە پرشنگدارەکانی نەبوایە، ڕێك بە چاویلکە نەوار ڕەش و ڕدێنە چکۆلەکەیەوە لە دکتۆریکی ئەڵمانی یان مامۆستایەکی گوندی دەچوو و دەڵێت: "سیما و دەموچاوی چیخۆف، جوانترین دڵگیرترین و پڕ ئیلهامترین دەموچاو بوو کە تا ئێستا دیتبووم." چیخۆف حەزی دەکرد بەیانیان کاری نووسین بکات، بەدەگمەن باسی بەرنامەو پرۆژە ئەدەبیەکانی خۆی دەکرد و پیاوێك بوو حەزی بە خۆهەڵکێشان نەدەکرد. گلەیی لە نەخۆشیەکەی نەدەکرد، پیی وابوو ڕازپۆشی و بێدەنگی نیشانەی سەر ڕاستی و ڕاستگۆییە. باوەڕی وابوو کە پیاوی ساغلەم و ڕاست و سەرڕاست، نابێ بە گلەیی لە بەختی خۆی ،خەڵکی بێزار و وەڕەز بکات. تا دەردو ئازاری زیاتر بوایە، هەوڵی دەدا بیشارێتەوەو وابنوینێ کە تەندروستی زۆر باشەو عەیبی نیە. خۆ ئەگەر دایکی یان خوشکەکەی بیاندیبا لە سەر کورسیەکەی دانیشتووەو چاوی نوقاندووەو سەرو سیمای تێکچووە، خێرا دڵنیای دەکردنەوە کە: "هیچ نیە! کەمیك سەری دێشێت" حەزی بە ئاهو ناڵەو ئاخ و ئۆف نەبوو، حەزی لەو کەسانە نەدەکرد کە دەیانویست سەرنج و بەزەیی خەڵکی دەرهەق بە خۆیان ڕابکێشن. چەند حەزی دەکرد شانۆ وەکو ژیان بوایە، ئەوەندەش حەزی دەکرد ژیان لە شانۆ بچێت. ئەوەندە بە ناوبانگ بوو، لە هەوەڵی نیوەڕۆوە ئاوتکا پڕ دەبوو لە میوان. کوپرین لەو بارەیەوە دەنووسێت: "تەنانەت کیژانی دزێوو شێواویش، بە شەپقەی پووشی سپی و قەراخ پانەوە، خۆیان دەدا بە سەر موحەجەرەی دەوری مۆلکەکەی داو بەواقی وڕەوە بە سەعاتان بەدەم تەماشاوە لەوێندەر دەوەستان. هەمو جۆرە خەڵکیك دەهاتنە دیدەنی چیخۆف: توێژەران، نووسەران، فەرمانبەرانی گوندی، پزیشکان، ئەفسەران، شێوەکاران، دڵبەندان چ پیاو و چ ژن، مامۆستایان، پیاو ماقولان، خەڵکی ئاسایی، سیناتۆران. کەشیشان و ئەکتەران و ئاشناو بێگانان."

خەڵکانێك هەبوون دەیانویست بەلای ئەم ڕێباز یان ئەو ڕێبازی سیاسیدا ڕای بکێشن. بەڵام ئەو بەوە وەڵامی دەدانەوە کە نووسەر دەبێ تەنیا پابەندی ئەدەب بێت. خۆ ئەگەر کەمیك پێ داگریان کردبا، وەڵامی دەدانەوە: "گوێ بگرن دەتانەوێ شتێکتان پی بڵێم؟ لە زەرف دە ساڵی ئایندەدا ڕووسیا دەبێت بە خاوەنی دەستووری خۆی" (بڕوانە ئەلکسی کوپرین، یاداشتەکان —بە

زمانی ڕووسی). ئەوە بوو لە سەرەتای بەهاری هەمان ساڵدا (١٩٠١) زنجیرەیەك نائارامی و پەشێوی توند وڵاتی هەژاند. تولستۆی بە هۆی داشداری لە کۆمەڵێك فیرقەی ئاینی چەوساوەوە، لەلایەن ئەنجوومەنی پیرۆزی کڵێساوە تەکفیر کرا. دیارە ئەم کارو هەڵوێستە کۆنەپەرستانەیە نەك هەر لە خۆشەویشتی کەسایەتی ئەوی کەم نەکردەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ڕووسیا و لە هەندەرانیش خۆشەویست تر و بە ناوبانگتری کرد. جەماوەری خەڵکی لە شەقامەکانی مۆسکۆ و سان- پترسبۆرگدا کەوتنە خۆپیشاندان. هەندێ یاسای تازە دەرکرا کە ئازادیە زانکۆیی و ئەکادیمیەکانی تەواو تەسك دەکردەوە، ئەم کارە، دەنگدانەوەیەکی خراپی هەبوو وخوێندکارانی بە جارێ وروژاند و هەراو هەنگامەیەك بەرپابوو ئەوسەری دیار نەبوو. لەچواری ئازاردا/١٩٠١ لە کاتی یەکێك لەم خۆپیشاندانانەدا سوارەی قۆزاق، لە بەردەم کڵێسای گەورەی قازاندا، لە سان پترسبۆرگ پەلاماری خۆپیشاندەرانیان داو لە ماوەی نیو سەعاتێکدا چەندین کەسیان لێکوشتن و ژمارەیەکی زۆریشیان برینـدار کرد. گۆرکی کە بە خۆی ئەو ڕووداوەی دیتبوو، لە کۆتایی مانگی ١٩٠١/٣دا نامەیەکی دوورودرێژی لەو بارەیەوە بۆ چیخۆف نارد کە: "خەریکە مێشکم تێك دەچێ... تا ماوم ئەو شەڕو پێکادانەم لە بیر ناچێت! شەڕێکی دڕندانە بوو، لەلایەن هەردوو لاوە دڕندانە بوو. ژیان سیمایەکی تاڵ و گرژی لە خۆگرتووە. پیاو وا هەست دەکات دڕندەیەکی ڕەشی ترسناك، لەپەنایەکەوە، لە نزیکی ئەوا، لە سێبەری ئەم ڕووداوانەدا خۆی لە بۆسە داوەو لە سێ و دووی ئەوەدایە لە سەرەتادا پەلاماری کێ بدات و کێ بخوات."

هەرچەندە چیخۆف لە نزیکەوە پەیگیری ڕووداوەکانی دەکرد، بەڵام لەسەر هەمان هەڵوێستی پارێزکارانەی خۆی مایەوە. نە هیچ عەریزەیەکی ئیمزا کرد و نە هیچ وتارێکی بە قازانجی خوێندکارە یاخیەکان بڵاوکردەوە. بەڵام لە کارتێکا کە لە١٩٠١/٣/١٨دا بۆ ئۆلگای ناردووە دەڵێت: "نامەی خەمناکم لە سان-پترسبۆرگ و مۆسکۆوە پێدەگات .بێزارم لەوەی کە لە ڕۆژنامەکاندا دەیخوێنمەوە." و بەم وشانە کۆتایی بە کارتەکەی دێنێ: "خۆشەویستەکەم! ئەی ئەکتەرە جوانەکەم، دڵفرێنەکەم، بە دوعا، بە دڵ ماچت دەکەم. نامەم بۆ بنووسە. دەستبەردارم مەبە. پیاوە چکۆلەکەت." ( بڕوانە ئیڤان بونین. یاداشتەکان: بە ڕووسی. هەموو قسەکانی بونین لەم سەرچاویەوە وەرگیراون و وەردەگێرێن.)

بە درێژایی ئەم ماوەیە ئۆلگا لە پترسبۆرگ بوو. ژیانی جادویی خۆی لە شانۆی هونەردا بە سەردەبرد. هەچەندە ڕەخنەگران سەبارەت بە (سێ خوشك)، دیتن و بۆچوونی خۆیان ئاشکرا کرد بوو، لێیان دەخوێند، بەڵام تەمەشاڤانان شانۆنامەکەیان بە دڵ بوو، زۆریان حەز لێدەکرد. ئەو هەموو پێشوازی و ئێوارە خوانانەی لە سەر شەرەڤ تیپی نواندنی شانۆی ناڤبری ساز دەکران، جریوەی بە ئەستێرەی گەشی دەروونی ئۆلگا دەبەخشی. ئۆلگا لە ١٩٠١/٣/٥دا نامەیەکی بۆ چیخۆف نووسی کە: "دوێنێ میوانی یەکێتی نووسەران بووین. لە سەر قاپەکانی هەمووماندا گوڵ و میداڵی گیتارئاسای زێڕینی شەرەفیان دانابوو. من لە سەر کورسی شەرەف دانیشتبووم... جلێکی مەخمەلی ڕەشی یەخە باریکی تۆڕیم لەبەر کردبوو، قژم لای ئارایشتگەر چاك کردبوو. بەڵام تۆ کەی گوێت بەم شتانە داوە؟! ئۆلگاو دۆستەکانی دوای ئەوە چوون بۆ

فنلاند،چەند ڕۆژێکیان لەوێ بە ئەسکی و بەفربازی بەسەر برد. هەموو شادو خۆشحاڵ لە تۆ وایە منداڵە مەکتەبلین و لە پشوودان.

چیخۆف چاوەڕوانی ئەوە بوو، کە ئۆلگا پاش سەفەری بەهارەی تیپی شانۆی هونەر بۆ سان پترسبۆرگ بۆ دیدەنی ئەو بێت بۆ یاڵتا. بەڵام بەپێچەوانەوە، ئۆلگا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە چیخۆف، بچێت بۆ مۆسکۆ و دیدەنی ئەو بکات. چیخۆف وەڵامی دەداتەوە کە توانای ئەوەی نیە. کەم و زۆریش خۆی لە باسی خوازگاری و زەماوەندیش نەدەدا، ئیدی ئۆلگا هەرچەندە بەزەیی بەحاڵی چیخۆفدا دەهاتەوە و مدارای نەخۆشیەکەی دەکرد، بەڵام ئابڕووی خۆیشی بەلاوە گرینگ بوو، بۆیە لە ئەنجامدا توڕە بوو، دەیگوت هەموو دۆست و ئاشناکانیان باسی ئەوە دەکەن کە بەو زووانە زەماوەند دەکەن، کەچی چیخۆف بە تاقی تەنیا خۆی لە گێلی دەداو حاشای دەکرد. ئایا بە ڕاستی وای وێنا دەکرد تا هەتا هەتایە بەو پەیوەندییە نهێنییە قاییل دەبێت، بەدزییەوە هاتوچۆی دەکات؟ ئۆلگا دەیویست ئەم پەیوەندییە ئاشکرا بێ، چیخۆف بە ئاشکراو بە بەرچاوی خەڵکییەوە خۆشی بوێت. بە ڕاستی ببێ بە شەریکی ژیانی، نازناوی ئەو هەڵگرێت، بەلای کەمەوە لە ناو خەڵکی شارا. چونکە لە بواری هونەری شانۆدا هەر بە ناوی ئۆلگا کنیپەرەوە دەمایەوەو کاری دەکرد. بە هەرحاڵ، ڕەفزی کرد لە جەژنی پاکدا بڕوات بۆ یاڵتاو بە بەرچاوی بەدگومانی دایك و خوشکی چیخۆفەوە، دەوری قەپاتمە بدینێ، ئەوەتا دەڵێت: "خۆ لە بیرتە ئەو هاوینەمان چەند دژوارو ناخۆش بوو. تا کەی خۆمان بشارینەوە؟ بۆچی و لەپای چی؟ وا هەست دەکەم وەکو جاران خۆشت ناوێم، تۆ تەنیا ئەوەت دەوێ بێم بۆ ئەوێ و لێتەوە نزیك بم."

هەڵبەتە گومان لەوەدا نەبوو، کەمترین کەمتەرخەمی چیخۆف دەبووە مایەی ئەوەی تاقە ئافرەتێك کە لە ژیانیا بە ڕاستی خۆشی ویستبوو، لە دەست بدات. چیخۆف تەمەنێکی زۆر کورتی لە بەردەمدا بوو! ئایا ماقوول بوو خۆی لەم دوایین دڵخۆشیەش بێبەش بکات، گوایە سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێ؟ ئایا ئەگەر ژنی هێنابا، نەیدەتوانی ئارامی دەروونی خۆی، کە بۆ کاری نووسین پێویست بوو، بپارێزێت؟ ڕۆژێك کە بۆنین لە ژووری کارەکەی ئەو بوو، چیخۆف لە دەمی دەرچوو کە: "دەزانی بە تەمام ژن بێنم؟" بەڵام یەکسەر قسەکەی گۆڕی و کردی بە سوعبەت و شۆخی و گوتی پیاو ژنێکی ئەڵمانی بێنێ باشترە لە ژنی ڕووسی. چونکە ژنی ئەڵمان باشتر خزمەتی دەکات و پێی ڕادەگات و نایەڵێت منداڵەکانیان بە ماڵەکەدا بسوڕێنەوەو لەگەنێکی مس بەدەستەوە بگرن و بە ماڵەکەدا بسوڕێنەوەو بە کەوچك و مراکان پێیا بکێشن و بە تەق و هوڕ ماڵەکە تێکبنەن. بۆنین کە ئاگاداری پەیوەندی نێوان ئۆلگا و چیخۆف بوو، خۆی لە نەژنەفتن داو هیچی نەگوت. بەڵام کاتێ بیری لەوە کردەوە کە ئۆلگا زۆر پابەندی پیشەکەی خۆی، ئەکتەریەو ماریاش فرە دڵسۆزو هۆگری براکەیەتی، گەییە ئەو ئەنجامگیریەی: "ئەمە خۆکوژییەکی خراپ دەبێت، خراتر لە ساخالین." (بڕوانە یاداشتەکانی بونین.)

هەر هەموو ئەو هۆیانە کردیانە کارێك کە چیخۆف بەرە بەرە مل بداتە خەت. ئەوەبوو لە ١٩٠١/٣/١٦دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "زۆر ماندووم، تاقەتی ئەم هەموو ڕاکە ڕاکەیەم نیە.

نەخۆشی بە تەواوەتی پیری کردوم. تۆ هیچت لە من دەست ناکەویّ، وەکو ئەوەیە باپیرەیەك بۆ خۆت پەیدابکەی... بە تەواوەتی ئەدەبیاتم تەرك کردووە. کە تۆ بگوازمەوە، ئەمرت پێدەکەم واز لە شانۆو نواندن بێنی و بە دوو قۆڵی بۆ خۆ خەریکی کشت و کاڵ دەبین. ئەم نەخشەیەت بەدڵ نیە؟ زۆر باشە کەواتە پێنج ساڵ و هەندێکی دی بەردەوام بە لە سەر نواندن، ئەوسا بیرێك لە خۆ دەکەینەوە." کە ئۆلگا لەم سەفەرە جەنجاڵ و خۆشە گەڕایەوە، گەڕایەوە سەر بیرۆکە پرۆژەی زەماوەندەکەی، لەدڵی خۆیدا دەیگوت تۆ بڵێی لە کاتی سەفەرەکەیدا بۆ پایتەخت سەبارەت بە نەخۆشیەکەی چیخۆف کەمتەرخەمی نەکردبیّ؟ بۆیە بڕیاری دا، لە بەرخاتری نەخۆشیەکەی ئەو گویّ بە ئابڕووی خۆی نەدات و بچێت بۆ یاڵتا. لە کاتێکا چیخۆف لە ڕووی ناچارییەوە خۆی بۆ سەفەر ئامادە دەکرد کە بچێتە دیدەنی ئۆلگا. لەپڕ ئۆلگا خۆی بە یاڵتادا کرد. تەنیا پازدە ڕۆژ لەوێندەر مایەوە. بەڵام نەیتوانی چیخۆف بێنێتە ڕەداو ڕۆژیك بۆ زەماوەندەکەیان دیاری بکات. ئەم هەڵویێستەی زۆر لا ناخۆش بوو، بۆیە هەرکە گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ، بۆ چیخۆڤ نووسی: "ئەو دیدارەم دیدارێکی تاڵ و ناخۆش بوو." ئەمجارەیان ئەمری بە چیخۆف کرد، کە بێت بۆ مۆسکۆ و بە زووترین کات بیگوازێتەوە. چیخۆف، وەزعی زۆر بیّ وەزع بوو، هەستی بە بێدەسەڵاتی و ناچاریەکی سەیر دەکرد، ئەنجام ملی دایە خەت و جڵەوی خۆی بە چارەنووس و قەدەر سپارد. وەکو ئەوە بوو لە ئاسمانەوە بە شاقوڵی بۆ قوڵایی نادیار بەربێتەوە. ئەوە بوو لە ١٩٠١/٤/٢٦دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "لە یەکی ئایاردا لە مۆسکۆ دەبم. بەڵام بەڵێنم بدەیە کە هیچ کەسێك بە زەماوەندەکەمان نەزانیّ تا دەیبڕێنینەوە. ئەگەر حەز دەکەیت، هەرکە گەیمە ئەوێندەر مارەت دەکەم. نازانم بۆچی ئەوەندە لە ئاهەنگ و پیرۆزبایی و پێکی شامپانیا کە دەبیّ بەدەم بزەیەکی گۆنگەوە بەدەستەوەی بگرین دەترسم." و ئەوجا لەسەری دەڕوات: "هەموو شتێکم تەواوە، هەموو شتێك، تەنیا شتێکی بچووك نەبیّ — ئەویش ڕەوشی تەندروستیمە."

لە ڕاستیا هەفتەیەك بوو، زۆر خراپ دەکۆکی.. بەڵام سوور بوو لەسەر ئەوەی وەعدەکەی خۆی بباتە سەر. لە ١٩٠١/٤/٢٢دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "کۆکە تەواو بێتاقەتی کردووم، پزەی لێبڕیووم. بەوپەڕی خەمساردی بیر لە ئایندە دەکەمەوە، هیچ زەوقێکی نووسینم نیە. تۆ بیر لە ئایندە بکەوەو لە جیاتی من شتەکان بەڕێوە ببە. تۆ ڕێنوێنم بە، هەرچیەك بڵێی بەگوێت دەکەم. ئەگینا لە جیاتی بژین، دەبیّ ژیان وەکو دەرمان، هەر سەعاتەی پڕ بە کەوچکە چایەك بخۆین." دوای چەند ڕۆژێك، لە ١٩٠١/٥/٢دا لە نامەیەکدا دەڵێت: "لە ژووری کارەکەم دانیشتووم و نایەمە دەریّ، چونکە هیچ کاریکی دیکەم نیە، بۆیە دانیشتووم بەدەم بیرکردنەوەوە دەکۆکم... بەم زووانە یەکدی دەبینین.. بە دڵی تۆ دەکەم.. تۆ خۆت وەکیل بە.

لە ١٩٠١/٥/١١ گەییە مۆسکۆو لە ئوتێلی دریسد لای دا. حەزی نەدەکرد هیچ کەسێك بە پرۆژەی زەماوەندەکەی بزانیّ. بە کەسی نەگوت. تەنانەت ماری و ئیڤانیشی، کە لەشار بوون، ئاگادار نەکردەوە. کاتیّ ماریا گەڕایەوە بۆ یاڵتا، بۆ لای دایکی، هەنگیّ لە ١٩٠١/٥/٢٠دا نامەیەکی بۆ نارد کە گوایە چووەتە لای پزیشکێکی پسپۆڕ، کە معایەنەی کردووەو زانیویەتی هەردوو سییەکانی زۆر نەخۆشن، ئەمری کردووە کە سەفەری دەڤەری ئوفا بکات، تا لەویّ بە

شەرابی کۆمیس* خۆی دەرمان بکات. جا وەکو ئەوەی بترسێت ماریا، نیازو مەبەستە نهێنی یەکانی هەڵبێنێ، بە زمانێکی شۆخی ئامێزەوە لە سەری دەڕوات:"سەفەر بە تەنیا بۆ ئەویٚ ناخۆشە، خواردنەوەی کۆمیسش زۆر ناخۆشە. خۆ ئەگەر ڕوو لە کەسێك بنەم لە گەڵما بێت، هەم ئەزیەتەو هەم جۆرە خۆپەرستیەکە، بۆیە باشترین شت ئەوەیە ژن بێنم، بەڵام هیچ بەڵگەنامەیەکم پیٚ نیە: هەر هەمووی لە یاڵتا دایە، لە چاوی مێزەکەمدایە."

بەڵام ئەو دیکۆمێنت و بەڵگەنامانەی کە بۆ ئەو کارە پێویست بوون لە یاڵتا نەبوون، بە خۆی بوون، ئۆلگا بیری خستبووەوە کە دەگەڵ خۆیدا بیانهێنیٚ. ئیدی هیچ کۆسپیك لە ڕێگەی زەماوەندەکەیاندا نەبوو. جا بۆ ئەوەی شتەکە لە خەڵکی بشارێتەوەو هیچ قەرەباڵغیەك دروست نەبێت، تکای لە ئەلکساندر فشنفسکی ئەکتەر کرد کە بە ناوی ئەوەوە، لە ١٩٠١/٥/٢٥دا، واتە لە ڕۆژی زەماوەندەکەیدا ئێوارە خوانێك بۆ جەماعەتێك لە خزمان و دۆستانی بووك و زاوا ساز بکات. میوانەکان، بە گوێرەی قەرار لە ڕێستۆراندا کۆدەبنەوە و بە تاسەوە چاوەڕوانی هاتنی ئۆلگا و ئانتون دەکەن، بیٚ خەبەر لەوەی کە ئەم زیافەت و خوانە بەچ بۆنەیەکەوە ساز کراوە" لەوکاتانەدا کە میوانەکان چاوەڕان دەکەن، ئۆلگا و ئانتون لە کڵێسایەکی چکۆلەی دەورووبەری مۆسکۆدا خەریکی ڕێوەڕەسمی مارە بڕین دەبن و تەنیا چوار کەسیان وەکو شایەت، کە بۆ ئەو جۆرە بۆنەیە پێویست بوون، دەگەڵدا دەبیٚ. شایەتەکانی ئۆلگا برایەکی و مامێکی دەبن، شایەتەکانی ئانتونش، دوو خوێندکاری دۆستی براکەی دەبن. دوای مارە بڕینەکە، هەردوو بووك و زاوا بە مەبەستی دوعاخوازی بەپەلە سەرێکی دایکی ئۆلگا دەدەن، ئەوجا دەڕۆن بۆ وێستگە، سواری قیتار دەبن و بەرەو نیژنی – نوڤوگورود، یەکەم قۆناغی مانگی هەنگوینیان دەڕۆن. هەڵبەتە پێش ئەوەی بکەونەڕیٚ چیخۆف دوو بروسکەی نارد، یەکێکیان بۆ فشنفسکی بوو پێی ڕاگەیاند لەو کاتەدا کە میوانەکانی لە ڕێستۆرانەکەدا چاوەڕوانی ئەو بوون، ئەو خەریکی ژن مارە کردن بووەو دووەمیان بۆ دایکی: "دایکە گیان، دووعای خێرم بۆ بکە. ژنم مارە کردووە، هەموو شتێك وەکو جاران دەمێنیٚ. دەڕۆم تا بە کومیس چاری خۆم بکەم... تەندروستیم باشترە. ئانتون"

ژن و مێرد، ڕۆژێکیان لە نیژنی –نوڤوگورود دەگەڵ گۆرکیدا بەسەر برد، گۆرکی بە هۆی بەشداری کردنی لە خۆپیشاندانەکانی مانگی ئازاردا لە ماڵەکەی خۆیدا لە ژێر چاودێری و نیمچە دەست بەسەر بوو، ئەوسا بە ڤۆلگادا بەرەو کاماو پاشان ڕوباری سپی ڕۆیشتن و لە گوندی ئاخیونوڤۆی دەڤەری ئوفا لایان دا، لە وێندەر لە ئاسایشگای سیلداران، دوو هۆدەیان بەکریٚ گرت. کە گەیشتنە ئەویٚ، چیخۆف بروسکەیەکی دایکی پێگەیی کە پیرۆزبایی لێدەکردو دوعای خێری بۆ دەکرد. بەڵام هیچ شتێکی خوشکەکەی پێنەگەیی. چیخۆف لەم بێدەنگیەی خوشکەکەی نیگەران بوو. هەڵبەتە خوشکەکەی لەوە تورە بوو کە ئانتون نیازی خۆی لیٚ شاردبووەوە .بۆ ڕۆژی دوایی چیخۆف بە مەبەستی پاکانە ئەم نامەیەی بۆ نارد: "هەڵبەتە زانیوتە کە ژنم هێناوە. باوەڕ ناکەم ئەمە بە هیچ شێوەیەك ژیانم بگۆڕێت، هەر وەکو جاری جاران دەمێنم. مەگەر هەر خوا بزانیٚ دایکم چی دەڵێت، بەڵام دڵنیای بکە کە هیچ گۆڕانێك ڕوونادات،

هەموو شتێك وەكو خۆی دەمێنێتەوە. تا ئێستا چۆن ژیاوم هەر وا دەژیم. پەیوەندی دەگەڵ ئێوەدا بە هەمان میهرو خۆشەویستی جارانەوە بەردەوام دەبێت. من و ژنەكەم ناچار دەبین بەجیا بژین: من، بەخۆت دەزانی فێری جوداییم." (بڕوانە نامەی ١٩٠١/٦/٢)

ڕۆژی دوایی نامەیەكی ماری پێگەیی كە بەرواری ١٩٠١/٥/٢٤ی لێدرا بوو. بۆیە درەنگ پیی گەیی بوو چونكە لە سەفەری بەردەوامدا بوو و ئەدرەسەكەی جێگیر نەبوو، بە هەرحاڵ ئەم نامەیە وەڵامی نامەكەی٥/٢٠/ ١٩٠١ی چیخۆف بوو كە بە شۆخی و تەنزەوە باسی ژنهێنانی خۆی تیا كردبوو. هەڵبەتە وەكو پێشبینی كرد بوو، ماریا زۆر لێی پەست و تووڕە بوو: "با ڕای خۆمت دەربارەی زەماوەندەكەت پێ بڵێم. من بەش بەحاڵی خۆم ئەم كارەم زۆر پێناخۆشە. ئەم سۆز و سۆزداریەی تۆ شتێكی سەرقەرقەو ڕەوتەنیە. باشترین شت ئەوەیە تا زووە لەوێندەر دووربكەویتەوە. كەسێك تۆی خۆش بوێ دەستبەردارت نابێت. ئەم كارەش نە بۆ ئەو دەكاتە فیداكاری و نە بۆ تۆش دەكاتە خۆپەرستی. ئاخر چۆن دەتوانی ئاوا بیربكەیتەوە؟ خۆپەرستی، لەبەر چی؟ دەتوانی هەر كاتێ مەیل و ئارەزووت لێبێ ژن بێنی. دەتوانی ئەمە بە كنپشتسەكەشت* بڵێی. تۆ دەبێ پێش هەموو شتێك بیر لە تەندروستی خۆت بكەیتەوە. توبی توخوا وا نەزانی من لە بەغیلی و خۆپەرستیدا ئەم قسانە دەكەم. تۆ هەمیشە بۆ من ئازیزترین و نزیكترین كەس بوویت. هەموو ئاواتێكم خۆشی تۆیە. تەنیا ئەوەم گەرەكە كە تۆ تەندروست و شاد بیت... بە هەرحاڵ چی بەباش دەزانی وابكە. ڕەنگە من لەمبارەیەوە ئالودەی غەرەزێك بم. تۆ بەجۆرێ منت پەروەردە كردووە كە هیچ پێشداوەرییەكم نەبێ... خودایا، چەند زەحمەتە دوو دانە مانگی خشت لە تۆ دووربم، لەكوێش؟ لە یاڵتا! خۆزگە ڕێگەت دەدام، ئەگەر بۆ هەفتەیەكیش بووە بێم بۆلات و بزانم چۆن بە كومیس خۆت دەرمان دەكەی." نامەكەی بەم پەراوێزە كۆتایی دێنێ، كە هاوسۆزییەكی خوشكانەی پڕ خەمخۆری لێ هەڵدەقوڵێت: "ئەگەر دەم و دەست وەڵامی ئەم نامەیە نەدەیتەوە، نەخۆش دەكەوم. هیوای خێرم بە "ئەو" بگەیەنە"

چیخۆف ترسا: ئەگەر ماری هەر بە بیرۆكەی ئەگەری زەماوەندی برایەكەی دەگەڵ ئۆلگادا ئەوەندە پەست و قەڵس بێ، ئەگەر بزانێت زەماوەندەكە بە ڕاستی سەری گرتووەو براوەتەوە، دەبێ چەندی پێناخۆش بێ؟ چیخۆف بە ترس و دوودڵیەكی زۆرەوە، ویستی بە هێمنی لە هەنبەر خوشكە سەركێشەكەی خۆیدا، داكۆكیەك لە هەڵوێستەكەی خۆی بكات، ئەوە بوو لە ١٩٠١/٦/٤دا نامەیەكی بۆ نارد كە: "نازانم باشم كردووە یان خراپ. بەڵام ئەنگێزەی سەرەكی ژن هێنانم ئەمانەیە: یەكەم: تەمەنم لە سەرووی چلساڵەوەیە. دووەم: ئۆلگا لە بنەماڵەیەكی باشە. سێیەم: ئەگەر بمەوێ لێی جیاببمەوە، دەتوانم بە ئاسانی ئەو كارە بكەم، وەكو ئەوەی لە بنەڕەتدا نەم هێنابێ. بۆ خۆی كەسێكی سەربەخۆیە و خۆی خۆی دەژێنێ. خاڵێكی گرینگی دیكەش ئەوەیە كە ئەم زەماوەندە نە شێوەی ژیانی منی گۆڕیوە نە شێوەی ژیانی ئەوانەی كە دەگەڵ مندا ژیان و دەگەڵ مندا دەژین دەگۆڕێت. هەموو شتێك، وەكو جاری جاران بەردەوام دەبێت و منیش بە تەنیا لە یاڵتادا دەژیم." جا بۆ ئەوەی ماریا دڵنیا بكات كە تا چ ڕادەیەك بۆ

براکەی زەرورییە، بروسکەیەکی بۆ نارد تا بێت و لە گەرمەی مانگی هەنگوینەکەیاندا، پێکەوە و بەسێ قۆڵی گەشتێکی خۆش و کورتخایەن بە ڕووباری ڤۆلگادا بکەن.

کە ماری بە هەواڵی ئەم زەماوەندەی زانی تووشی شپرزەیی و پەرێشانیەکی یەجگار ناخۆش بوو: هەم خودی زەماوەندەکەی پێناخۆش بوو، هەم ئەوەشی پێناخۆش بوو کە براکەی پێی نەگوتبوو. لە سەرێکیشەوە پەشیمان بوو لەوەی کە ئەو نامە توندەی بۆ براکەی ناردووە. ئەوە بوو لە ١٩٠١/٥/٢٨دا نامەیەکی بۆ چیخۆف نارد کە: "بە ردەوام، بێوچان بیردەکەمەوەو بیر دەکەمەوە. هەر بیرەو لە مێشکمدا دەپەنگێتەوە. کە زانیم بەو کوت و پڕیە زەماوەندت کردووە تووشی شۆك بووم! هەڵبەتە دەمزانی ئۆلگا، درەنگ یان زوو لێت نزیك دەبێتەوە. بەڵام قەت باوەڕم نەدەکرد، بەم زووانە بیگەیەننە زەماوەند، بە ڕاستی ئەم زەماوەندەی ئێوە سەراپای ژیانی هەژاندم، ناچاری کردووم زۆر بیر لە تۆ، لە خۆم، لە پەیوەندی ئایندەم دەگەڵ ئۆلگادا بکەمەوە. ئۆلگا زۆر گۆڕاوە، لەپڕێکا گۆڕا، لەمە دەترسم. هەست دەکەم لە هەموو کاتێ تە نیاترو بێکەسترم. وا نەزانی هیچ جۆرە بەدخودایییەکم یان شتێکی لەو بابەتەم تیابێ، نا، شتی وا نیە، بگرە لە جاران خۆشترم دەوێی. لە ناخی دڵەوە هیوای شادمانیت بۆ دەخوازم، هەروەها بۆ ئۆلگاش هەرچەندە نازانم ئەو لە بارەی ئێمەوە چ دەڵێت، نازانم هەستم بەرانبەر بەو چۆنەو چۆن دەبێت. کەمێك لێی زویرم، چونکە باسی ئەم زەماوەندەی بۆ نەکردووم، خۆ ئەمە بەڕێکەوت و کوت و پڕ ڕووی نەداوە. دەزانی ئانتون زۆر ناشادم. لە ڕووی دەروونیەوە زۆر خراپم، دڵم بە هیچ خۆش نیە، قێزم لە هەموو شتێك دەبێتەوە. تاقە حەزو ئاواتم ئەوەیە تۆ بدینم، تەنیا تۆو بەس، هیچ کەسێکی دی نا."

ماریا، هەستی دەکرد لە دوو لاوە خیانەتی لێکراوە: هەم لە لایەن براکەیەوەو هەم لەلایەن باشترین دەستەخوشکیەوە. ئەم دوو کەسە، کە هەریەکەیان لای خۆیەوە ئەوی بە مەحرەمی ڕازی خۆی هەڵبژارد بوو، بێهیچ پرس و ڕاوێژیکی ئەو، نەخشەی زەماوەندیان کێشا بوو. ئەم ژنە جێی ئەوی لە لای چیخۆف گرتبووەوەو چیخۆفیش لە جیاتی ئەو خووی دابووە ئەو ژنە. ئیدی بە حیسابی خۆی لە قەلیش بوو لە کۆترانیش. هەستی بەو پەڕی تەنیایی و بێکەسی دەکرد، بە خەیاڵی خۆی هیچ شتێك و هیچکەسێك نەبوو بۆی بژی و ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات. ئیدی بۆ تاقە ساتێکیش بیری لەو پێشنیازە سەیرە نەکردەوە کە چیخۆف دەعوەتی کردبوو تا لە سەفەری مانگی هەنگوینەکەیاندا، ئەویش لە گەڵیاندا بێ. کاتێ ڕۆژنامان بە دووروودرێژی هەواڵی زەماوەندی چیخۆفیان بڵاوکردەوەو ڕۆژنامەی (ڕۆژانە هەواڵ) وێنەیەکی بووك و زاوای بڵاوکردەوە، ماریا خۆی پێنەگیرا و نەیتوانی نا سازگاری خۆی بەرانبەر ئۆلگا بشارێتەوە. نامەیەکی بۆ براکەی نووسی: "کامتان بە ناوبانگترن تۆ یان کنیشتس؟ وێنەکەی ئەویان بەو جلکانەوە بڵاوکردووەتەوە کە لە لالۆڤانیادا لەبەری بوو و وێنەکەی تۆش بە چاویلکە زەڕەبینەکەتەوە." کاتێ ئۆلگا گلەیینامەیەکی میهر ئامێزی بۆ ماریا نارد، ماریا لە بری ئەوەی وەڵامی براژنەکەی بداتەوە، پۆزشنامەیەکی بۆ براکەی نارد کە: "ئەمە یەکەمجارە کە ڕێ بەخۆ بدەم بەم ڕاشکاوی و گۆساخیە قسان بکەم، بە داخەوەم کە ئەگەر ئێوەم، تۆو ئۆلگام ئازار دابێت،

ببورن. خۆ ئەگەر کەسێکی غەیرەز (کنیپشتس)ت خواستبایە، ڕەنگە تاقە وشەیەکم لەمبارەیەوە بۆ نە نووسیبای ،چونکە ڕقم لە ژنەکەت دەبوو. بەڵام ئێستا مەسەلەکە جیاوازە. زۆر جیاوازە .ژنەکەت دۆستی من بوو، لە یەکەوە نزیك بووین، زۆر شتی هاوبەشمان لە بەینا بوو. بۆیە گومان و دوو دڵیەکی زۆرم لا پەیدا بوو و، بە هەر حاڵ بەوپەڕی ڕاستگۆیی و بێپەردە گوازرشتم لە هەستی خۆم کردووە... لیم زویر مەبە، ئەوەش بزانە کە لەم دنیایەدا کەسم لە تۆو ئۆلگا خۆشتر ناویَ." (بڕوانە نامەی ١٩٠١/٦/١٦).

بەوجۆرە، باشترین ساڵانی تەمەنی وەقفی خزمەتی براکەی کرد، پێدەچێ هەر بۆیەش شووکردنی لەبیری خۆ سڕی بووەوە تا لە گەڵ براکەیا بمێنێ و ئاگای لە تەندروستی و بەڕێوەبردنی کارو بارەکانی و ماڵەکەی بێ. کەچی ئەنجام دەستی لە هەموو شتێك بڕا. تەنانەت ئەوەشی پێنەبڕا وەکو کارەکەرێکی ماڵەکەش، سوپاس و ستایش بکرێت. بە هەرحاڵ هەرچەندە ئانتون هەوڵی دەدا دڵنیای بکاتەوە کە پەیوەندیان وەکو جاران دەمێنێتەوەو ناگۆڕێت، فایدەی نەبوو، ماریا دەیزانی ژنهینانی چیخۆف، خۆی لە خۆیدا دەکاتە دوورخستنەوەی ئەو. ماریا تا ئەو کاتانەی کە ئۆلگا، تەنیا ماشقەی براکەی بوو، پێگەی بەرزو تایبەتی خۆی لە ماڵەکەدا هەبوو. بەڵام کە ئۆلگا بوو بە ژنی فەرمی براکەی ، واتە پلەیەك بەرز بووەوە، ئیدی ئۆلگا ئەو پێگە بەرزەی لە دڵی چیخۆفدا پەیدا کرد. بە پێچەوانەی بۆچوون و دڵنەواییەکانی چیخۆفەوە، ئەو پەیوەندییە بێوێنەو پڕ میهرەی نێوان خوشك و برا لێك ترازا. چیخۆف بەرە بەرە دوور دەکەوتەوە. ماریا بۆ هەتا هەتایە لە دەستی دا. ماریا، لە نائومێدی خۆیدا، گرێی دڵی بۆ بونین دەکردەوە. کە زیاد لە جاریَ دڵسۆزی و لوتف و مەیلی خۆی بۆ ماریا سەلماند بوو. ماریاش لەم ڕووەوە منەتباری خۆی لە نامەیەکا بۆ دەربڕی بوو: "لە حاڵیکی دەروونی ناخۆش دام. ژیانم یەکپارچە نائومێدیە، لێم بووە بە دۆزەخ. ڕەنگە ژن هێنانی برایەکەم، یەکێك بێ لە هۆکارەکانی ئەم حاڵەتە. ئاخر شتێکی لە ناکاو و زۆر کوت و پڕ بوو!... ماوەیەکی زۆر نیگەران بووم، لە دڵی خۆدا دەمگوت: باشە ئۆلگا چۆن قایبل بووە کەسێکی وا نەخۆش، بخاتە ژێر ئەم بارە قورسە، لەوەش خراتر ئەم شتە لە مۆسکۆ ڕوویداوە. بەڵام پێدەچێ، هەموو شتێك بەخۆشی وئاسانی بڕابێتەوە.." ئەوجا بەجۆرە مزایەدەیەکی هەژارانەوە بۆنین ئاگادار دەکاتەوە کە ئەویش بیر لە شووکردن دەکاتەوە و دەڵێت: "بزانە مێردێکی دەوڵەمەندو دەست و دڵ تێرم بۆ بدۆزەرەوە. ئێستا تاقەتم نیە درێژە بەم نووسینەم بدەم، بەڵام زۆر حەز دەکەم قسە دەگەڵ تۆدا بکەم. گفتوگۆی تۆم زۆر پێخۆشە. نامەی زیاترم بۆ بنووسە. بە هۆی مەسەلەکەی ئانتوشکاو ئولتشکاوە* زۆر پەست و غەمگینم."

چیخۆف، لەو ماوەیەدا، لە ئاخیونوڤودا ژیانێکی ڕۆتینی ساردو سڕی بەسەر دەبرد، وەکو نەخۆشێك خەریکی عیلاج بوو. ئاسایشگاو تیمارخانەی سیلداران، هەرچەندە زۆر پەرپووت و هەژارانە بوو، بێ کەرەسەو تفاق بوو، بەڵام شوێنەکەی کە کەوتبوە نێوان دارستانێکی بەڕوو و پێدەشتێکەوە، زۆر خۆش و جوان بوو. هیچ ناسیاوو ئاشنایەکی لێنەبوو، تاقە هاودەمی چیخۆف، چەند نەخۆشێکی مژوولی دەواو دەرمانی خۆیان و کۆمەڵێك باشکیری* گێل و نەزان

بوون. تەنانەت بوونی ئۆلگاش نەیدەتوانی ئەم شوێنە خەمین و خەمناکەی لە بەرچاو جوان و شیرین بکات و ڕەونەق و زندوویەتیەکی پێ ببەخشێت. چیخۆف لە ١٩٠١/٦/٩دا نامەیەکی بۆ سوبولفسکی نارد: "ئا، بەڵێ، بەرێزەکەم. یەکسەر ژنم هێناو تەواو. خەریکم دەگەڵ وەزعی تازەمدا ڕادێم، یانی مەحرووم بوونم لە هەندێ ماف و ئیمتیازات، هەستدەکەم باشم. ژنەکەم کەسایەتیەکی بە نێوبانگە، هەرگیز گەوج و کەودەن نیە. کەسێکی ڕوح سووکە." دوای چەند ڕۆژێك دی لە ١٩٠١/٦/٢٣دا، لە نامەیەکا بۆ هەمان سوبولفسکی دەڵێت: "ژیان، لێرە وەکو ژیانی ئۆردوگا وایە، بە ڕاستی تاقەتبەرە! چیتر هەڵناکەم، پێویستە هەڵێم." لە وەتای ئەو دەرمانەی بەکاردێنا، هەستی دەکرد وەزعی باشترە. ڕۆژانە، بە هەزار قێزو بێز چوار بوتڵ کومیسی دەخواردەوە. تەواو قەڵەو بوو بوو، بەدەگەمەن دەکۆکی. هەرچەندە بە تەما بوو دوو مانگ لەوێ بمێنێ، بەڵام دوای یەك مانگ داوای کرد ئیزنی بدەن. لە ١٩٠١/٦/٣٠دا، بە هەمان شێوازی تەنزئامێزی هەمیشەیی خۆی، نامەیەکی بۆ بۆنین نارد کە: "سبەینێ بەرەو یاڵتا سەفەر دەکەم، بە بۆنەی زەماوەندی فەرمیمەوە، نامەی پیرۆزباییم بۆ ئەوێ بۆ بنێرە. هەڵبەتە زانیوتە کە زەوجاندوومیان، وانیە؟ ئێساش چەند پارێزەرێکم گرتووە و خەریکم عەرزو حاڵی تەڵاق دەدەم!" لە ١٩٠١/٧/٨دا، دوای سەفەرێکی یەك هەفتەیی، دەگەڵ ژنەکەیا گەییشتنەوە یاڵتا. دایکی و خوشکەکەی بە میهرو سۆزێکی نیگەرانی ئامێزەوە، بە کونجکاوی و ترسەوە پێشوازی و خێر هاتنەوەیان کردن.

پەراوێز:

* –خەستەخانەیەکی خێرخوازی: ئەم خەستەخانەیە ئێستاش لە گەڕدایەو بە ناوی چیخۆفەوەیە.

* – کریکیت: جۆرە وەرزشێکە، بە دوو تیپی یازدە نەفەری ،دوو گۆڵ، یەك تۆپ و دار قاشۆ، لە فەزای کراوەو لە سەر چیمەن ئەنجام دەدرێ.

* – میخائیل ئیڤانوفیچ گلنیکا (١٨٣٠ –١٨٥٧) ئاهەنگسازێکی ڕووسە، بۆ یەکەمجار شەقڵ و مۆرکی زانستیانەی بە گۆرانی فۆلکلۆری ڕووسی بەخشی.

* – سەگە چکۆلەکەم: چیخۆف زۆرجار ئەو دەستەواژەیەی وەکو گوزارشتێکی ئاشقانە، لە نامەکانیا بۆ ئۆلگا بەکار دەبرد.

* – کۆمیس: جۆرە شەرابێکە کە تاتاران لە شیری وشتر یان ماین دروستی دەکەن و وەکو دەرمان دەخورێتەوە.

* – کنپشتس: ناوێك بوو چیخۆف، بۆ خۆشەویستی لە ئۆلگای نابوو.

* – باشکیر: میللەتیکی موسوڵمان و تورك زمانن کە لە ساڵی ١٥٥٦وە هاوڵاتی ڕووس بوون.

* – ئانتوشکاو ئولتشکا: سووکەڵە ناوی ئانتون و ئۆلگان.

## ئاشقێنی بە نامە

ئۆلگا، پاش ئەوەی بە فەرمی تێکەڵاوی ئەمماڵباتە بوو، بە جدی کەوتە هەوڵی ئەوەی بۆ هەمووانی بسەلمێنیٚ کە دڵدار و ماشقەکەی جاران نیە، بەڵکو هاوسەرێکی شەرعییە و ماف و سەڵاحیەتی بیٚ چەند و چوونی خۆی هەیە. زەوق و سەلیقەی ئەڵمانی ئاسای، زاکون پەسەندی ئەو، دەگەڵ ژیانی بیٚ سەروبەر و ناڕێك و پێکی مێردەکەیدا تێکی نەدەکردەوە. دایك و خوشکی مێردەکەی، زۆریان ناز دابووە کوڕەکەیان و هیچ زەبت و ڕەبتێکیان دەگەڵدا بەکار نەبردبوو، وازیان لیٚ هێنابوو بە کەیفی خۆی بکات و پابەندی هیچ نەزم و نیزامێك نەبێت و تەنانەت وەکو پێویست مشوری خۆیشی نەخوات، پەیڕەوی یاسا و ڕێسای تەندروستی نەدەکرد، لە کاتی خۆیدا و بە ژەم نانی نەدەخوارد، تەنانەت هەندێجار ئەگەر حەزی کردبا، نانی هەر نەدەخوارد. دایکی و خوشکەکەی نەدەوێران ڕەخنە لە داب و نەریتی زگورتیانەی ئەو بگرن کە بە تایبەتی تەمەنێکی هەبوو. بەڵام ئۆلگا ئەمەی پیٚ قووت نەدەچوو. بەجۆریٚ ڕەفتاری دەگەڵ چیخوفدا دەکرد وەك ئەوەی منداڵێکی بچووك بیٚ لە پێست و کڵێشەی پیاوێکی گەورەدا، بە دەسەڵاتێکی نیمچە دایکانەوە، واداری دەکرد کە بەردەوام جلەکانی ژێرەوەی بگۆڕێت، بە فڵچە جلەکانی پاك بکاتەوە، پێڵاوەکانی بۆیاخ بکات، بەردەوام سەری بشوات، بەرلەوەی قژ و ڕدێنی درێژبن و تێك بئاڵێن، کورتیان بکاتەوە. چونکە چیخوف هەمیشە هاواری گەدەی دەکرد، بەرنامەی خواردنەوەکەی پیٚ گۆڕی، کاتی دیاریکراوی بۆ ژەمە خۆراکەکانی دانا، دەرمانی سافکردنی گەدەی دەرخوارد دەدا. دایکی ئانتون، کە کەیبانۆی بیٚ هەڤرکی موبەق و سەرپەرشتیاری مەنجەڵان بوو، زۆری لەبەر گران بوو کە ئافرەتێکی بێگانە، غەزوی موبەقەکەی بکات. ماری، کە زۆر لە مێژبوو، بەوپەڕی میهر و خۆشەویستیەوە پەرستاری براکەی دەکرد، پێی ناخۆش بوو کە هەنووکە ئەو دەورەی لیٚ سەنرابووەوە. ئۆلگا لە ڕوانگەی، ئەم دایك و خوشکەوە، کە خۆیان بە خاوەنی ڕاستەقینەی ماڵ و حاڵ و پەرستاری بە ئەمەك و دڵسۆزی چیخوف دەزانی، بابایەکی بێگانە، داگیرکەر و، مێمڵ بوو، هێندە بە خۆی دەفشی کەس لەگەڵیا هەڵی نەدەکرد. ئیدی دەمبۆڵە و توەڕەبوون و تۆران و قسەدابڕانی زۆر، ڕووی دا، ئولگا، چەند جارێك هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەو ماڵە بەجێدێڵیٚ، دەڕوات و مێردەکەشی دەگەڵ خۆیدا دەبات. چیخوف، لە دنیادا ڕقی لە قەرقەشە و شەڕەدەم بوو، بەردەوام هەوڵی دەدا هەردوو لایەن لە کەری شەیتان بێنێتە خواریٚ، هێوریان بکاتەوە، ئاشتیان بکاتەوە و ئاگری ڕق و کینەی نێوانیان بکوژێنێتەوە. بەڵام ئەم شەڕە پەنهانەی کە لەسەر ئەو دەکرا، زۆری ئەزیەت دەدا.

کاتیٚ ئولگا لە ١٩٠١/٨/٢٠ دا بە مەبەستی بەشداری لە پڕۆڤەکانی تیپی شانۆی هونەر، بەتەنیا سەفەری مۆسکۆی کرد، چیخوف هەم پێی ناخۆش بوو و هەم پێی خۆش بوو. کاتیٚ ئۆلگا بە ئاشکرا لە نامەیەکا بۆی نووسی کە غیرە لە خەسووی و دشەکەی دەکات. چیخوف تکای لێکرد کە بە سەبر و حەوسەڵە بیٚ، ئاقڵانە مامەڵە دەگەڵ واقیعەکەدا بکات. لە

١٩٠١/٩/٣دا وەڵامی نامەکەی دەداتەوە کە: "تۆ بۆت نووسیوم کە ماری هەرگیز دەگەڵتا ناسازێ و ئەمە و ئەوە!... بە ڕاستی ئەمە شتێکی گەوجانەیە! تۆ لە هەموو شتێکا زێدەڕۆیی دەکەیت، و بە خەیاڵ ئەو شتانە دروست دەکەیت، مێش لە خۆت دەکەی بە گامێش، دەترسم بە زووانە دەگەڵ ماریادا بە شەڕبێن و لێتان ببێ بە دەمەقاڵە. گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم: سەبر بگرە و بۆ ساڵێك زمانی خۆت بگرە، تەنیا بۆ یەك ساڵ، هەنگێ هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە. هەرچییەکت پێ گوترا، هەرچۆنێکت هاتە بەرچاو، گوێ مەدەیە و بێدەنگ بە و یەك قسەش مەکە. ئیدی سەبارەت بەوانەی تازە زەماوەند دەکەن، چ پیاو و چ ژن، شتە جوانەکانی ژیان و سازگاری و خۆشیەکانی ژیانی ئایندەیان، وەستاوەتە سەر خۆسازان و سەبر و حەوسەڵە و زەمانسازی ڕۆژانی هەوەڵی زەماوەندەکەیان. یانی دەبێ چاوپۆشی لە وردەشتەکان بکرێت. کچی باش بە، گیانەکەم، چیت پێ دەڵێم وابکە، هەندێ زیرەك بە!... باوەڕبکە جگە لە تۆ هیچ ئینسانێك، هیچ ئافرەتێکم خۆش ناوێ. دەی هەر خۆش و شاد بی."

بەوجۆرە، ئامۆژگاری ژنەکەی دەکات نەك خوشکەکەی و دایکی، کە میهرەبان و لێبوردە بێ و خۆی لە هەر بەدحاڵی بوونێ دووربگرێت کە لێکیان دووربخاتەوە. لە لایەکی ترەوە ئەو هاوینە، ٨/٢٠ نامەیەکی دایە ئولگا کە دوای مردنی ئەم بیگەیەنێتە دەستی ماریا. ئەم نامەیە وەسێتنامەکەی بوو: "ماری گیان، وەسێتی من ئەمەیە کە خانووەکەی یاڵتام بۆ تۆ بێ، بۆ خۆت هەتاهەتایە تیا بژی، هەروەها دەرامەتی کارە شانۆییەکانیشم بۆ تۆ بێت. هەروەها خانووەکەی گورزوفم و پێنج هەزار ڕۆبڵ بۆ ژنەکەم بێ." (بڕوانە نامەی ١٩٠١/٨/٣) هەروەها وەسێتنامەکە کۆمەڵێك پارە و پولی بۆ برا و ئامۆزاکانی و شارەوانی تاگانرۆگ و جووتیارانی میلیکوڤۆ تیابوو، جگە لەمانە ئامۆژگاری ماریاشی کردبوو کە ئاگای لە دایکیان بێ و بیگرێتە خۆی. هەڵبەتە چیخوف بۆیە میراتێکی زیاتری لە هی ژنەکەی بۆ خوشکەکەی دیاری کردبوو، چونکە دەیزانی کە ژنەکەی بە حوکمی پیشەکەی وەکو ئەکتەر، هەمیشە دەتوانێ ژیانی خۆی دابین بکات. بەڵام دووری لە ئۆلگا، دوای سێ مانگ ژیانی هاوبەش، بۆ ئەو زۆر ئەستەم و ناخۆش بوو، بۆیە ناچار لە ڕێگەی نامەوە ئەشق و خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕی. ئیدی هەموو ڕۆژێك یان هەر دوو ڕۆژ جارێك نامەیان بۆ یەکدی دەنووسی، نامەکانیان ئاوێتەیەك بوو لە خەم و میهر و ڕاز و نیاز و بچووکترین شتی ڕۆژانە. چیخوف دەنووسێت و دەڵێت: "با وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە، ئەم ماوەیە زۆر باش دەخەوم، هەرچەند خەوی تەنیایی زۆر ناخۆشە – باوەجو من فێرم! – زۆر دەخۆم، ڕۆژ بەدەم قسە و گفتوگۆ دەگەڵ میوانانـدا دەبەمە سەر. هەموو ڕۆژێ کەفیر* دەخۆم، زۆر بەلەزەتە، گەدەم باش بووە. بەڵام بیرم چوو قولۆنیا لە سەر و قژم بدەم. دوێنێ سەرم شت." (بڕوانە نامەی ١٩٠١/٨/٢٨) لە نامەیەکی دیکەدا دەڵێت: "وەکو منداڵ هۆگری تۆ بووم. بەبێ تۆ هەست بە نارەحاتی دەکەم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٩٠١/٨/٢٤) یان لە نامەی سێیەمدا دەڵێت: "کە تۆ لێرە نیت، ئەوەندە بێتاقەتم دەڵێی بە خورتی لە دێرێکدا حەپسیان کردووم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٩٠١/٨/٣١) کاتێ ئۆلگا، کەوتە خەیاڵی ئەوەی لە شوقە تازەکەیاندا، لە مۆسکۆ، پشیلەیەك ڕابگرێت، چیخوف لە سەرەتاوە ئیعتیرازی گرت، کە

گوایە (قیزی لە پشیلە دەبێتەوە.) و پێشنیازی کرد کە لە جیاتی پشیلە سەگێك ڕابگرێت. بەڵام هەر زوو بایدایەوە و دایە باریکی و لە کۆتایی نامەکەیا نووسی: "بە هەرحاڵ، بە کەیفی دڵی خۆت بکە گیانەکەم، لەلایەن منەوە سەرپشك بە، حەزدەکەی نەهەنگ ڕابگرە: من ڕێگەی هەموو شتێکت دەدەم، ئامادەم دەگەڵ پشیلەشدا بخەوم." (بڕوانە نامەی ڕێکەوتی ١٩٠١/٨/٣٠.)

هەمووی بخەینە سەر یەك، نەیدەکردە مانگێك کە ئۆلگا چووبوو بۆ مۆسکۆ، چیخوف، بەهەشتاو، بە نیازی سەردانی هاوسەرەکەی، هەرچەند کەش و هەوای ئەو کاتەی مۆسکۆ سارد و زستانی بوو، بەرەو ئەوێندەر کەوتە ڕێ. ماری و ئۆلگا، پێکەوە شوقەیەکی گەورەیان بە کرێ گرتبوو، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ کارکردنی ئەو تیابوو. چیخوف کە بینی ئەو دووانە، لە جاران باشتر پێکهاتوون، زۆری پێخۆش بوو. بەڵام چیخوف کە تینووی ئەوەبوو ئۆلگا تەنیا هی ئەو و بۆ ئەو بێ، ناچاربوو شانۆ بکات بە شەریکی خۆی. ئۆلگا کە شیفتە و دڵبەندی پیشەکەی خۆی بوو، دەیویست ببێت بە ئەکتەری یەکەمی بێ هەڤڕکی تیپەکەیان. پڕۆڤەی ڕۆژانە بەلای کەمەوە شەش سەعاتی دەخایاند و هەندێجار تا درەنگانێکی شەو بەردەوام دەبوو. هەڵبەتە ئۆلگا وەکو ئافرەتێکی گەنجی، چالاك و چەلەنگ و، ژیاندۆست، زۆرجاریش بەشداری لە کۆڕ و ئاهەنگ و شەوبێریە کۆمەڵایەتیەکانیش دەکرد و کاتێ کە دەگەڕایەوە، دەستی لە ملی مێردەکەی، خۆی گوتەنی لە ملی (موپاسانی ڕووسی) ئازیزی دڵەکەی، وەردێنا و خۆی لە دەوری دەگێڕا و، مێردەکەی – بۆ ماوەیەکی تیژتێپەڕ – نقومی شادیەکی بێ سنوور دەبوو.

شانۆی هونەر لێبڕا، (سێ خوشك) پێشکەش بکاتەوە. ئەو پایزەیان بۆ پڕۆڤەی شانۆنامەی ناڤبری تەرخان کرد. ئیدی چیخوف، وەکو هەمیشە، خۆی دەپێچایەوە و بە تاقی تەنیا لە هۆڵی چۆڵ و خاڵی دا دادەنیشت و چاودێری نواندنی ئەکتەرەکانی دەکرد و تێبینی و باری سەرنجی خۆی دەدانێ. دیارە ئیرادی فرەی لە دەرهێنانە زۆر واقیعییەکەی بوو. بۆیە داوای لە ستانسلافسکی کرد کە گمەی ئەو کوترانەی دەگەڵ لابردنی پەردەدا دەستی پێدەکرد لابەرێت. هەڵبەتە ئەم گمەگمە لەلایەن کۆمەڵێك ئەکتەری پشت پەردەوە ئەنجام دەدرا، ڕۆژێك بەو ئەکتەرانەی دەوروبەری خۆی گوت: "بەسەرچاو، بەنیازم شانۆنامەیەکی تازە بنووسم کە بەم شێوەیە دەست پێبکات: "کە کەش و هەوایەکی خۆشی هەیە، چەند جوانە، چەند ئارامە! نە جریوە جریوی چۆلەکەیەك دەژنەوین، نە حەپەی سەگێك، نە کوکوی کوکوختیەك، نە ناڵەی بایەقوشێك، نە چریکەی بولبولێك، نە چرکەچرکی سەعاتێ، نە زەنگی گالیسکەیەك، نە زیکەزیکی زیکزیکەیەك نایەت." (بڕوانە کونستانتین ستانسلافسکی، ژیانی هونەری من. چاپی ١٩٢٤، ل٤٢٠). دیارە، چیخوف دەیویست کەمترین ئارایش و ڕازانەوەی شانۆیی لە دەرهێنانی شانۆنامەکەدا بکرێت، ستانسلافسکیش ئەمەی پێناخۆش بوو، دەیویست لە ڕێگای چۆنیەتی و تەکنیکی وردی دەرهێنانەوە، تەمەشاڤانان سەرسام بکات. چیخوف حەزی لە دەرهێنانێکی زیاتر تەجریدی و دوور لە هەر ئارایش و ڕازانەوەیەك دەکرد، تا ئەو تەبیعەت و مجێزانەی کە وێنەی گرتبوون و بەرجەستەی کردبوون بە باشترین شێوە دەربکەون. ستانسلافسکی لە دەرێ ڕا کارەکەی دەبینی و، چیخوف لە ناوەوە ڕا. بە هەرحاڵ، وەختێ وەرزە چالاکی شانۆی هونەر،

لە ڕۆژی ١٩٠١/٩/٢١دا، بە شانۆنامەی سێ خوشك کرایەوە و دەستی پێکرد، شانۆنامەکە بە هۆرای هیستری و چەپڵەڕێزانی گەرم و گوڕ پێشوازی لێکرا. کاتێ کە چیخوف، لە کۆتایی پەردەی چوارەمدا چووە سەر شانۆ، بە جارێ قیامەت ڕابوو. چیخوف لە ١٩٠١/٩/٢٤دا نامەیەکی بۆ لیونید سریدینی دۆستی، کە پزیشك بوو لە یاڵتا، نارد کە: "زۆر خۆم لە مەسەلەی دەرهێنانەکەی هەڵنەقورتاند، وەکو نووسەر، هەندێ تێبینی و سەرنجم دا بە هەندێك لە ئەکتەرەکان، خەڵکی دەڵێن شانۆنامەکە زۆر لە وەرزی چالاکیەکانی پار، باشتر بووە و پێشوازییەکی گەرمتر کراوە."

بەڵام چونکەی بەرگەی کەش و هەوای ساردی مۆسکۆی نەدەگرت، هەر زوو شەکەت و ماندوو بوو، پاش ئەوەی چووە لای دکتور چوروفسکی، لەسەر قسە و ئامۆژگاری ئەو ناچاربوو بۆ یاڵتا بگەڕێتەوەوە و زستانەکە لەوێ بەسەر بەرێت. لە ١٩/ت١/١٩٠١دا لە نامەیەکیا بۆ میرولیوبوڤ ڕۆژنامەوان، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ژنەکەم، کە زۆر هۆگری بووم و خووم پێوەگرتووە، بە تەنیا لە مۆسکۆ دەبێت، منیش بە تەنیا لەوێ دەڕۆم، ئەو دەگری و منیش پێی دەڵێم پشت نەکاتە شانۆ. بە کورتیەکی وەزعم پەشێوە."

لە ١٩٠١/١٠/٢٨دا گەیشتەوە یاڵتا، ئیدی دەبوایە زستانەکە لەوێ بەسەربەرێت و بە ناچاری و لە ڕێگەی نامەوە ئاشقێنی دەگەڵ ژنەکەیدا بکات. بۆ ڕۆژی دوایی خۆی پێنەگیرا و لە نامەیەکا سۆز و ئەشقی خۆی بەمجۆرە بۆ دەربڕی: "نازەنین، فریشتە، سەگە چکۆلەکەم، کۆترە باریکەکەم، تکات لێدەکەم باوەڕ بە خۆشەویستی و ڤیانم بکە، لە گانگای دڵمەوە خۆشم دەوێی، دەتپەرستم. لەبیرم مەکە، بێ نامەم مەکە، تۆزێ زیاتر بیر لە من بکەوە، هەستێك ڕووبدات، تەنانەت ئەگەر لەپڕ ببی بە پیرەژنێکیش هەر خۆشم دەوێی، ڕوحم خۆش دەوێی، تەبیعەتم خۆشدەوێی. بە دڵ ماچت دەکەم، دەستت دەستۆ دەکەم و دیسان ماچت دەکەم. جێگاکەم بۆنی تەنیاییەکی غەریبی لێدێ، لە تۆ وایە پیرە زگورتیەکی بەدبەخت و بێزار و زار بە گلەییم." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٩٠١/١٠/٢٩). هەرچەند ڕۆژێك دواتر نووسی: "چەند خۆش دەبوو، ئێستا قسەم دەگەڵ ژنەکەمدا کردبا، دەستم بە برۆکانیا، بە شانیا هێنابا و دەگەڵیا پێکەنیبام. ئاه گەوهەرە یەك دانەکەم، خۆشەویستەکەم، ئازیزەکەم!" ئۆلگاش، بە هەمان تینویەتی و تاسە و تامەزرۆییەوە وەڵامی دەداتەوە. دەڵێت لە دوای سەفەری ئەو دڵی نەهاتووە، جێگاکەیان ڕێك بخاتەوە و هەر بەو دەقەوە هێشتویەتیەوە، چونکە کە جێگاکەیان دەبینێ، هەست دەکات هەر بە یەکەوەن: "ماچت دەکەم ئانتونکا گیان. ماچت دەکەم بە میهر، بە نەرمی، بە نیانی... چەند حەزدەکەم توند لە ئامێزت بگرم!" و هەروەها: "ماندووم، ئەم بەیانیە تاقەتم نەبوو لە جێگا هەستم، هەر جارێ وەردەچەرخام، خۆزیام دەخواست کە چارەی ئازیزت بدینم، ڕدێنە زەردەکەت بدینم." و "چەند حەزدەکەم وەکو ئەو کاتانەت بێنمە بەرچاوی خۆم کە بەیانیان لەسەر سیسەمەکە پشت لە من دادەنیشتیت، یانی ئەو کاتانەی کە خۆت دەشت و بە ڕووت و قووتی پشت لە من دادەنیشتی. ئاگات لێیە چ بیریەلێکی گوناه ئامێزم بە مێشکا دێ. بیرەوەری گوناه ئامێزترم لایە و پێتی نالێم." ئۆلگا، وێڕای ئاهونالەی جوداییش، باسی پڕۆڤەکانی خۆی،

شادمانی سەرکەوتنە کۆمەڵایەتیەکانی و تەسریحەی قژەکەشی بۆ دەکرد. کەچی چیخوف باسی میوانەکانی بۆ دەکرد، باسی ڕووداوە چکۆلە و بێ بایەخەکانی ژیانی تەنیایی و زوگورتایەتی بۆ دەکرد وەك: تـۆزێ ڕۆن گەرچەکی خـواردووە، قـژی چـاك کـردووە، یـەکێك مێزەکـەی بـۆ پـاك کردووەتـەوە و شووشـەی مەرەکەبەکـەی شـکاندووە. لـە نامـە یـەك لـە دووی یەکەکانیانـدا، هـەردووکیان هـەمان پرسـیاریان دووبـارە دەکـردەوە: "کـەی یەکدی دەبینینـەوە؟" هـەردووکیان هێندە بە جددی بیریـان لـەم مەسـەلەیە دەکردەوە، کە ئۆلگـا دوچاری عـەزابی ویـژدان بوو بوو، ئۆلگا تا ئەوکاتـەی یار و دلبـەری چیخوف بـوو، هەسـتی نـەدەکرد لـە سـەرێتی شـەو و ڕۆژ بـە دیاریـەوە بێ و پەرستاری و خزمەتی بکات. بەڵام کاتێ کە بە فەرمی بوو بە هاوسـەری، پێـی وابـوو لـە سـەرێتی بـە تـەواوەتی خـۆی بـۆ شـادمانی ئـەم بوونـەوەرە نائاسـاییە تـەرخان بکـات. هەڵبەتە گلەیی و گازاندەی دەوروبەر و، بەتایبەتی هی ماری بەر گوێ دەکەوتەوە، کە مێردەکەی بـە تـەنیا جێهێشـتووە و خـەریکی شـانۆکاریی خۆیـەتی، ئەمـە وای لێـدەکرد هەسـت بـە جـۆرە تاوانێـك بکـات. بـەڵام زەوق و شـەوقی نوانـدن و، دەرکـەوتن لەبەرچـاوی خـەڵکی، بـە ڕادەیـەك بەسـەریا زاڵ بـوو، کـە نەیـدەتوانی واز لـە پیشـەکەی بێنێ و خـۆی لـە یاڵتـادا زندەبەچاڵ بکات. ئیدی نەیدەزانی قوربانی بە مێردەکەی بدات لە پێنـاوی شـانۆدا یـان بـە پێچـەوانەوە قوربـانی بـە شانۆ بدات لە ڕای مێردەکەیدا؟ چیخوفیش بە تەبیعەتی خۆی کە پیاوێکی بێ لایـەن بـوو، زۆری لە ژنەکەی نـەدەکرد کە واز لـە پیشـەکەی بێنێ، ئـەم مەسـەلەیەی نـەکردبوو بـە کێشـە. سـەرباری ئـەوەی کـە تـەنیا و زۆر نـەخۆش بـوو! لـەوە هێـوەتر نـەدەڕۆیی کـە لـە نامـەکانیا سووکە گلەییـەك بکـات: "بـە ڕاسـتی ئێمـە غـەدر دەکـەین کـە پێکـەوە نـاژین" بـەڵام ئۆلگـا، لـە نامەیـەکی ٦/ت٢/١٩٠١دا دان بە تاوانی خۆیدا دەنێت و دەڵێت: "زۆر حەزدەکەم دەگەڵ تۆدا بم و نەفرەت لە خۆ دەکەم کە بۆچی وازم لە شانۆ نەهێنا... بە خۆیشم نازانم چیمە. ئەمەم پێناخۆشە. کە بیر لەوە دەکەمەوە تۆ لەوێ بە تەنیای، بێزار و بێتاقەتی و، منیش لێرە، لەجیاتی خۆم بە تـەواوەتی وەقفی خۆشەویستەکەم بکەم، سەرقاڵی کارێکی ترم، لە سوێیاندا نـەخۆش دەکـەوم. بە خۆیشـم نـازانم چ شـتێك ڕێـی ئـەم کـارەم لێـدەگریت؟" ئۆلگـا بـە ئاشـکرا دەیویسـت چـیخوف بکـات بـە شەریکی بڕیاری خۆی. بەڵام چیخوف، دەیزانی، ئەو بڕیارە، بڕیاری تەرك کردنی شانۆ بۆ ئۆلگا، زۆر زەحمەتـە و تووشـی پەشـیمانیەکی دژواری دەکـات، جـا چونکە ڕێـز و حورمـەتێکی یـەجگار زۆری بۆ ماڤ تاك هەبوو داوای لە ژنەکەی نەدەکرد کە لـە پێنـاوی ئـەودا واز لـە ژیـانی ڕەخشـانی مۆسـکۆ بـێنێ و بێـت لـە یاڵتـادا کـونجی خـەڵوەت بگرێـت. لـە سـەرەتاوە داوای لێکـرد جـۆر هاوسەنگیەیەك لە نێوان هەردوو هەڵوێستەکەدا چێبکات: "دەتەوێ شانۆ تەرك بکەی؟ بە ڕاست؟ کـە نامەکەم خوێندیتـەوە هەستم بە شتێکی وا کرد. بەڕاستی بەتـەمای شتی وا بکـەیت؟ پێش ئەوەی بڕیار بدەی، بە جدی بیری لێبکەیتەوە گیانەکەم، زۆر بە جدی، ئەوەشت لـەبیر نەچێت کـە من زستانی ئاینـدە لـە مۆسـکۆ بەسـەر دەبـەم." (بڕوانە نامـەی ٧/ت٢/١٩٠١). ئیـدی چـیخوف، چـوار ڕۆژ دواتـر، بـە ڕوونـی و ڕەوانـی بیرۆکـەی خـۆی لەمبارەیـەوە بەوپـەڕی لـە خـۆ بردەیـی دیاریکرد: "هیچ مانایەکی نیە شانۆ، لەپێناوی ئەم ژیانە ناخۆشەدا تـەرك بکەی کە حاڵی حازر

له یاڵتا بەسەری دەبەین." هەڵبەتە ئەم وەڵامەی چیخوف، بە تەواوەتی دەگەڵ هەست و بیر و بۆچوونە تازەکەی ئۆلگادا تێکی دەکردەوە. ئیدی بەدەم مەستی ئەم وەڵامە شەریفەوە، لە ٤/ك١/١٩٠١دا لە نامەیەکیا ئەم ئیعتیرافە بۆ مێردەکەی دەکات: "من هەمیشە پاڕاومەتەوە کە تەندروستیت باش بێ، بتوانێ لە مۆسکۆ بژیت، بەلای کەمەوە بەشێکی زستان لە مۆسکۆ هەڵبکەیت. لێ ئەم خەیاڵ پڵاوەم کەڕووی هەڵهێنا ئانتونچیك گیان. پێم بڵێ چی بکەم. بەبێ کار، دەبم بە بار بە سەرتەوە، وەڕز و بێزارت دەکەم. دەبێ بە ژوورەکەدا بێم و بچم و پەڵپ و بیانوو لە هەموو شتێك بگرم. بە ڕاستی ناتوانم بەبێ کار بژیم. هیچ مانای نیە، بەم تەمەنەوە، هەرچیەکم بەو هەموو زەحمەتەوە بونیات ناوە بەو ئاسانیە بیڕوخێنم. هەست دەکەم خەڵکانێك بە چاوی تانە و تەشەرەوە لێم دەڕوانن: بۆچی شانۆ تەرك ناکەم؟ چۆن دڵم دێت تۆ بەدەم نەخۆشیەوە، بە تەنیا لەوێ بەجێ بێڵم؟ ... هتد... هەموو ئەمانە دەزانم گیانەکەم، بۆیە زۆرجار بێدەنگ دەبم، بە تایبەتی لەگەڵ تۆدا."

چیخۆف سەرانسەری پایزەکەی بەو ئومێدە بردەسەر کە مانگی یەك، لە مۆسکۆ، دەگەڵ ئۆلگادا یەك بگرنەوە.کەچی لە ١٩٠١/١٢/٩دا نەخۆشیەکەی سەری هەڵدایەوە، تووشی خوێن هەڵهێنان بووەوە و بە ناچاری لە جێدا کەوت. ئیدی بەرنامەی سەفەرەکەی مۆسکۆی تێکچوو. هەڵبەتە بەو حاڵەشەوە هەر خەمی ژنەکەی بوو، بۆیە دوای دوو ڕۆژ و لەناو جێگای نەخۆشیەوە، نامەیەکی (١٩٠١/١٢/١١) بۆ نارد، کە بەمجۆرە دڵنەوایی دەکات: "هەستدەکەم ئەمڕۆ زۆر باشترم، تەنیا لای بەیانی خوێنم هەڵهێنا، ئەویش زۆر کەم بوو، بەڵام دەبێ جارێ لەجێدا بمێنم و ئیسراحەت بکەم. هیچ ناخۆم، زۆر نیگەرانم چونکە ناتوانم کار بکەم. بۆ جەژن چاوەڕوانت ناکەم. پێویست ناکا بێی گیانەکەم. کاری خۆت بکە، خەمت نەبێ، ئەوەندەمان کات دەبێ کە پێکەوە بژین." بۆ ڕۆژی دوایی هەمان ئامۆژگاری بۆ دووبارە کردەوە: "نیگەران مەبە گیانەکەم، تووڕە مەبە، خۆت شپرزە مەکە، خەم مەخۆ، هەموو شتەکان ئاوەڕۆی ئاسایی خۆ وەردەگرنەوە، هەموو شتێك بە خۆشی تەواو دەبێ، هەموو شتێك بە دڵی خۆمان، بە دڵی من و تۆ دەبێ هاوسەرە بێ هاوتاکەم. سەبر بگرە و چاوەڕوان بە." دوای دوو ڕۆژ، لە نامەیەکی دیدا، کە جۆرە داخ و کەسەرێکی پێوە دیاربوو، دەڵێت: "نووسیوتە، کە شەوی ٨/ك١/١٩٠١ زۆرت خواردووەتەوە. ئاه، ئازیزەکەم خۆزگەم بە خۆت، بریا دەتزانی چەند بەغیلی بە چالاکی و زندویەتی تۆ، بە شەنگوڵی و پاراوی تۆ، بە لەش ساغی و ڕوح سوکی تۆ، بە خۆش مجێزی تۆ دەبەم، خۆزگەم بە خۆت کە دەتوانی بە دڵی خۆت بخۆیتەوە و ترسی خوێن هەڵهێنانت نەبێ." (بڕوانە نامەی ١٧/ك١/١٩٠١). بەڵام لە ١٩٠١/١٢/٧دا بۆی نووسی بوو: "کۆمپرێسم لە قەبرغەی ڕاستم ناوە، قەتران دەخۆم، بەڵام گەرمای بەدەنم ئاساییە. بەرەو باشی دەڕۆم، بەو زووانە دەبمەوە بە بەشەر."

تا زیاتر بەرەو باشی دەچوو، پتر تاسەی ژنەکەی دەکرد. لەپڕ گەییە تینی و هاواری نائومێدی لێ هەستا: "خۆزگە دەتزانی چەندت تاسە دەکەم. چەندم پێ ناخۆشە کاتێ وەختی دانانی ئەم کومپریسە گەورە و گرانە دێت، تۆ لێرە نیت. هەست بە تەنیایی و بێکەسی دەکەم، تەواو داهێنراوم!... خۆشم دەوێی سەگە چکۆڵەکەم، دڵم، هەستم کەڵکەڵەی تۆ دەکەن، زۆر زۆر بیرت

دەکەم. وام لێهاتووە باوەڕنەکەم جارێکی دی یەکتر ببینینەوە. من بەبێ تۆ هیچ نیم... لە کانگای دڵەوە ماچت دەکەم ئازیزەکەم، سەد جار لە هەمێزت دەگرم... خەوم باشە، بەڵام کەی ئەوە، بەبێ هاوسەرە ئازیزەکەم بوو بە خەو." (بڕوانە نامەی بەرواری ١٨/ك١/١٩٠١). ئۆلگا، خێرا لە ١٩٠١/١٢/٢٣ وەڵامی ئەو هاوارنامەیەی دایەوە کە: "بەڵێنت دەدەمێ کە ئەمە دوا ساڵ بێ بەمجۆرە بژیت گیانەکەم! هەموو شتێك دەکەم بۆ ئەوەی ژیانت خۆش و دڵگیر بکەم، نەیەڵم بە تەنیا بیت. بزانە چۆن کارێکی وەها دەکەم باشترین ژیانت بۆ دابین بکەم. بتوانی بە کەیفی خۆت چیرۆك و شانۆنامە بنووسیت و کاربکەیت. پێدەچێ لە دڵی خۆتا گلەیی ئەوەم لێبکەیت کە وەکو پێویست خۆشم نەویستوویت. وانیە؟ گلەیی ئەوە بکەی کە وازم لە شانۆ نەهێناوە، کە ژنێکی خراپ بووم! دەزانم دایکت چ بیرێك دەربارەی من دەکاتەوە! هەق بەوە! نە هەقی نیە! ئانتون، ئانتونی ئازیزم، بمبورە، لە منی گێل و نەفام ببورە، زۆر بە خراپی بیرم لێمەکەوە. ڕەنگە پەشیمان بی لەوەی کە منت خواستووە؟ پێم بڵێ، مەترسە، بە ڕاشکاوی ئەوەم پێ بڵێ. من خۆمم، زۆر بە دڵڕەق دێتە بەرچاو. پێم بڵێ چی بکەم."

چیخوف، بە واقیعبینییەکی قارەمانانەوە ئەم ئیعترافەی وەرگرت. باوەڕی وابوو بەو نەخۆشیە کوشندەیەوە هەقی ئەوەی نەبوو، ژنێکی جوان و جاحێڵی، چالاك و چەڵەنگی تینووی ژیان، بە دیار خۆیەوە ببەستێتەوە. ئەوە بوو لە ٢٩/ك١/١٩٠١دا نامەیەکی بۆ نووسی کە: "تۆ گەوجی گیانەکەم! لەوەتای تۆم خواستووە، بۆ تاقە جارێکیش گلەیی ئەوەم لێنەکردوویت کە شانۆت تەرك نەکردووە، بە پێچەوانەوە زۆر خۆشحاڵ بووم دەمزانی کە سەرقاڵی کاریت، کە لە ژیانا ئامانجێکت هەیە، کە بێهودە ناسوڕێتەوە و وەکو مێردەکەت کاتی خۆت بەفیڕۆ نادەی. حەزناکەم مات وخەمبار بی. پێبکەنە. ڕاتدەمووسم و بەداخەوەم کە ئەمە هەموو شتێك بێ."

بەڵام ڕۆژی دوایی (٣٠/ك١/١٩٠١)، لەکاتێکا بیری لە نزیك بوونەوەی ئاهەنگ و شەوبێریەکانی سەری ساڵ دەکردەوە و خۆشی و شادمانی و ئاهەنگێڕانی خەڵکانی تەندروستی دێنایەوە بەر چاوی خۆی، هەستی بە تەنیایی و بێکەسیەکی زۆر کرد، دیسان نامەیەکی بۆ ژنەکەی نارد کە: "سبەینێ سەعات نۆ دەچمە جێگاوە، تا بەبۆنەی سەری ساڵی تازەوە ئاهەنگ نەگێڕم. تۆ لێرە نیت، واتە هیچم نیە و، پێویستم بە هیچ نیە." (بڕوانە نامەی بەرواری ٣٠/ك١/١٩٠١).

لە کاتێکا چیخوف، نەخۆش و داماو، غەرقی ژیانی ڕۆتینی، زۆربەی کاتی خۆی بەسەر کورسیەکەیەوە، بەبێ جوڵە و بە چاوانی نوقاوەوە بەسەردەبرد، ئۆلگا، بە کەماڵی ئارەزوو، چالاك و چەلەنگ، بە تەواوی جۆش و خرۆشەوە، بەشداری ئاهەنگە بە جەلال و شکۆکانی، مۆسکۆی جەژنگێڕی سەری ساڵی دەکرد. لە هەموو نامەیەکیا، پاش ئەوەی لە تەندروستی چیخۆڤ ئازیزی دەپرسی و داخ و کەسەری خۆی سەبارەت بە دووریان لە یەکدی، دەردەبڕی، یەکسەر دەهاتە سەر باسی، پرۆڤان، چوونە کۆنسێرتان، ئاهەنگێن ئێوارە خوان و کۆڕی ڕەقسین و سەما، کە ئەوا تیایا شاگوڵ بوو. چیخوف هانی دەدا کە بێ دڵی خۆی نەکات. و لە نامەیەکیا (٣/ك٢/١٩٠٢) وەکو بڵێی داوای بوردن بکات کە نەخۆشە، دەڵێت: "باش ناکەیت کە بێزار و

بێتاقەتی. خۆ تۆ لەبەر ئەوە لە مۆسکۆ نیت کە تۆ وات دەوێ. بۆیە لە مۆسکۆیت چونکە هەردووکمان وامان دەوێ. دایکم هیچ ناکۆکیەکی دەگەڵتدا نیە، هیچ ڕقێکی لێت نیە." تاقە ترسی چیخوف ئەوەبوو کە ئۆلگا لە ڕادەبەدەر خۆی ماندوو بکات، لە ٧/ك١٩٠٢/٢دا نامەیەکی بۆ نارد: "ژنە نەسرەوتە ئازیزەکەم. بەزەییەکت بە خۆتا بێتەوە، بەلای کەمەوە هەفتەیەك مەچۆ دەرەوە، لە ماڵەوە بە، شەو زوو بنوو، ئەگەر هەموو شەوێ سەعات سێ یان شەشی بەیانی بخەویت، زوو پیر دەبیت و دەدەیە باریکی و بنێسی، دەکەویە شەڕفرۆشی." بەڵام ئۆلگا گوێی لەم ئامۆژگاریانە نەبوو، تەنانەت هەوڵی نەدەدا ئەم سەرەڕۆییانە لە مێردەکەشی بشارێتەوە. ئەوەتا لە ١١/ك١٩٠٢/٢دا، لە نامەیەکیا بۆ چیخوف، بە مەکر و نازی کیژێکی عازەبەوە، بە شەرمێکەوە دەڵێت: "دوای نمایشەکە، بۆ شیڤ خواردن چووین بۆ ئێرمیتاج*، بە غەمزە و ناز کونستانتین سیرگیوفیچ – م (ستانسلافسکی دەرهێنەر) ئیحراج کرد. ئەمەت بەدڵە؟... پاشان – عەیب و شورەیی! – چووین بۆ کاباریێ."

ماری، کە لە هەمان شوقەدا، دەگەڵ ئۆلگادا دادەنیشت زۆر لە ڕەفتاری ئۆلگا ناڕازی بوو. بەڵام کە بینی بۆ براکەی دڵسۆزە، ئەویش لەبەر خاتری ئەم هەڵوێستەی، بەڕادەیەك پەیوەندی خۆی دەگەڵ ئۆلگادا خۆش کرد کە بووبوو بە نیمچە سکرتێرەیەکی. بەمجۆرە ماری بووبوو بە بەشێك لە ژیانی ئەم ژن و مێردە. بە تەواوەتی لە ژیانی وان وەدەرنەکەوتبوو. بەڵام چونکە ئافرەتێکی توندە تەبیعەت بوو، نە بەو نەرمکێشییەی چیخوف دەرهەق بە ئولگا ڕازی بوو، نە ڕەفتاری ئۆلگای بەدڵ بوو کە بە نەهەق ئیستیغلالی چاوپۆشی و نەرم و نیانی چیخۆڤ دەکرد. لە نامەیەکیا ١٩٠٢/٢/٣ بۆ براکەی دەڵێت: "لە مۆسکۆ بێزار بووم، هەست دەکەم نەخۆشم، بە تایبەتی کە زۆربەی کات بەتەنیا لە ماڵەوەم وبیری تۆ و ماڵەکەی خۆمان دەکەم، چونکە زۆر کەم ئۆلگام دەبینم. دوێنێ لەزگ بوو لێمان ببێتە شەڕ. دەمویست نەیەڵم بڕوات بۆ کۆڕ و ئاهەنگی سەمای موزوروف، بەڵام هەر ڕۆیی، بەرەبەیان گەڕایەوە بۆ ماڵ. ئەمڕۆش کە چوو بۆ پرۆڤە زۆر شەکەت بوو، ئەم شەویش نمایشی هەیە." ئۆلگا هەندێجار گلەیی و گازاندەی لە چیخوف دەکرد کە گوایە لە پڕۆژە ئەدەبیەکانی ئاگاداری ناکات. چیخوف لە نامەکانیا بە دوورودرێژی باسی تەندروستی، بەرنامەی خواردن، پارێزکردن و خۆشەویستی و ڤیانی خۆی بۆ دەکرد، بەڵام لەوەدەچوو نەیەوێ لە ژیانی ئەدەبی خۆی ئاگاداری بکات و پڕۆژە ئەدەبیەکانی خۆی پێ بڵێ. ئایا متمانەی بە ژنەکەی نەبوو؟ ئایا بەوەی نەدەزانی کە بتوانێ هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیەکانی وەکو هونەرمەندێك، بکات؟ چیخوف لە ٢٠/ك١٩٠٢/٢دا بە نامەیەك وەڵامی دەداتەوە: "بۆت نووسیوم کە هەموو شتێك بۆش و بەتاڵە، کە گوایە گێلی تەواویت، کە نامەکانت بێزار و وەڕەزم دەکەن، کە بە ترسەوە هەست دەکەیت ژیانت دێتەوە یەك. هتد... بە ڕاستی گەوجی. من کە باسی شانۆنامەی ئایندەی خۆمم بۆ نەکردوویت، لەبەر ئەوە نیە، وەکو نووسیوتە، متمانەت پێناکەم، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هێشتا باوەڕم بەم شانۆنامەیە نیە، هێشتا لە مێشك و خەیاڵما گەڵاڵە نەبووە. هەڕەشەم لێدەکەیت کە ئیدی نە هیچم لێ دەپرسیت و نە دەخلت بەسەر هیچ شتێکمەوە دەبێ، خێرە نازەنین؟ بەسە، واز لەم ڕەشبینییە بێنە، واز لە

دڵتەنگی بێنە! پێ بکەنە! ڕەشبینی و دڵتەنگی بۆ من باشە، چونکە لە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵدا دەژیم، نە کارێك هەیە بیکەم، نە کەسێك هەیە بیدینم، زۆربەی ڕۆژانی هەفتە نەخۆشم."

بەڵام ئۆلگا ئەم قسانەی بە گوێدا نەدەچوو. دڵنیابوو کە چیخوف دەگەڵ تولستوی، گۆرکی و بونین و، هەموو دۆستانی نووسەریدا گفتوگۆی زۆر بەرزتر و جدیتری هەبوو تا لەگەڵ ئەمدا، هەڵبەتە لەمەدا بە هەڵە نەچووبوو. واڕێکەوت تۆلستۆی بێتە قرم و ماوەیەك لەوێ بژی: پاش ئەوەی تووشی مەلاریا دەبێ، پزیشکەکانی ئامۆژگاریان کردبوو، کە یاسنایا بولیانا بەجێ بێڵێ و بڕوات خۆی بداتە هەتاوی دەریای ڕەش، بە سواری فارگۆنێکی تایبەتی قیتار گەییە ئەوێندەر و لە گاسپرا لایدا، کە دە کیلۆمەترێك لە یاڵتاوە دوور بوو، لێرە، یانی لە گاسپرا، کۆنتێس پانینا کۆشکێکی تایبەتی خستە خزمەتی، کۆشکێکی یەجگار گەورە بوو، لەسەر تەرازی ئیکۆسی بوو، دوو بورجی هەبوو، تا نیوەیان بە لاولاو داپۆشرابوو. پیاو دەیتوانی لە بانیژەکەیەوە بڕوانێتە باخچە پڕ گوڵ و گوڵزارەکەی، تەمەشای دەریا بکات. چیخوف لە ١٩٠١/٩/١٢دا یەکەم سەفەری بۆ گاسپرا کرد و بە دیداری ئەم ئەفسونکارە هەفتا و سێ ساڵانە شاد بوو. بەر لەوەی بڕوات بۆ دیداری، ماوەیەکی زۆر لە بیری ئەوەدا ما کە چ جلکێك لەبەربکات. چونکە حەزی نەدەکرد نە زۆر پۆشتە و پەرداخ بێ نە زۆر پەرپووت و بێ نموود بێ. دوای چەند هەوڵێك چاکەت و پانتۆڵێکی ڕەشی فەرمی و کڵاوێکی لبادی نەرمی هەڵبژارد. تولستوی، بە هەمان هەیئەتی سادە و ساکاری هەمیشەیی خۆی کە کراسێکی جووتیارانەی لەبەر و جووتێ چەکمەی لە پێ و کڵاوێکی سپی قەراخ پانی لەسەر بوو، پێشوازی و خێرهانینی کرد. بە هەرحاڵ دوای ئەمە زۆر دیداری دیکەی گەرم و گوڕیان، لە بانیژەکەی گاسپرادا بوو، تولستوی لە پشت تەپڵەکێکی مامناوەندیەوە، دادەنیشت، پیاڵەیەك چای ساردی بەدەستەوە دەگرت، بە پشتی چەماو و چاوانی گەش و تیژ و ڕدێنی لەرزانەوە، دەکەوتە قسان، بە شێوەیەکی بنجبڕ ستایشی ئەم کار و سەرزەنشتی ئەو کاری دەکرد. چیخوف شان داچەکیوو دیمەن خەمناك، لە هەنبەریا دادەنیشت، کڵاوەکەی لە باوەشیا دادەنا و بەسەری قامکان پێیا دەکێشا یان عەینەکە زەڕەبینەکەی چاك دەکرد و هەوڵی دەدا بەرپەرچی بداتەوە. لە کۆتایی گەنگەشە و گفتوگۆکاندا، هەرکەسە و بە ڕەئی خۆیەوە هەڵدەستا. گفتوگۆ و گەنگەشەی نێوانیان، گەنگەشەی نێوان پێغەمبەرێکی دیوانە و گومانداریکی قەدرزان و ئەقڵمەند بوو. تەنانەت لە باسی ئەدەبیاتیشدا لە هەموو شتێکدا هەڤرەئی نەبوون، چیخوف بە لەزەتەوە گوێی لە تۆلستۆی دەگرت کە زۆر بە توندی هێرشی دەکردە سەر شکسپیر گوایە، بە بۆچوونی ئەو، جگە لە کۆمەڵێك شانۆنامەی خراپ، هیچی تری نەنووسیوە. هەروەها گلەیی لە نووسەرانی نوێش دەکرد کە بەڕای ئەو، قەناعەتیان بە هەندێ بەرهەمی کالۆکرچ و جەڵەبی کردووە. مامۆستای پیر، لەو بەینەدا، بە شێوەیەکی ڕەوتەنی و لامسەرلایی، شانۆنامەکانی ئەویشی بەسەر دەکردەوە و گلەیی ئەوەی لێدەکرد کە گوایە هیچ مەسەلە و پرسێکی ئەخلاقی ناخاتە ڕوو و هیچ چارەسەرێك پێشنیاز ناکات: "قارەمان و کاراکتەرەکانت بۆ کوێت دەبەن؟ لەو تەختەوە کە لە سەری ڕادەکشێیت، بۆ ئاودەست و بەپێچەوانەوە." بەڵام وەکو هەمیشە ستایشی

چیرۆکەکانی دەکرد. پێی دەگوت: "تۆ ڕووسیت، بەڵێ ڕووس، ئەمما ڕووس، ڕووسی تەواو عەیار." هەڵبەتە ئەم قسەیە لە زاری بابایەکی ناسیونالیستی دوو ئاتەشەوە، نەك هەر ستایش بوو، بەڵکو دان پێدانانێکی تەواویش بوو بە بەهرە و توانای چیرۆکنووسی چیخوف. پاشان سێرگی کوڕی تولستۆی لەوبارەیەوە دەنووسێت: "وام هەست دەکرد کە بابم بەڕاستی دەیویست لە چیخوف نزیك ببێتەوە و بیخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، بەڵام هەستی بە ڕەفزێکی بێدەنگ، بە لەمپەرێکی لەبەزان نەهاتوو دەکرد، کە نەیدەهێشت بگەنە هیچ ڕێکەوتنێك." (بڕوانە سێرگی تولستوی: چاوخشانێك بە ڕابردوودا.) بونین لە یاداشتەکانی خۆیدا، لە زمانی چیخوفەوە دەڵێت: "ئەوەی لە تولستۆیدا زۆر مایەی سەرنج و سەرسامی منە، ئەوەیە کە زۆر بە بچووکی تەماشای ئێمەی نووسەر دەکات، بگرە هەر بە هیچمان نازانێ... بە کۆمەڵێك منداڵە ورتکەمان دەزانێ." تولستۆی هەندێجار حەزی دەکرد سەر بخاتە سەر میوانە بە شەرم و حەیاکەی، ڕۆژێك لە ناغافڵا لێی پرسی: "بە گەنجی زۆرت جندە بازی کردووە؟" ئیدی چیخوف، دەشڵەژێ، بە دەم ڕاکێشانی ڕدێنی خۆیەوە دەکەوێتە مینگەمینگێکی نامەفهووم. هەنگێ مامۆستای پیر، بە ڕاشکاوی و بە خۆ هەڵکێشانەوە دەڵێت کە ئەو لە بەهاری تەمەنیا مێبازێکی سەیر بووە، لە مێبازیدا بتکوڵاندبا تێر نەدەبوو. ئیدی بەتانی ئەو باسانەدا چوو بوو وشەی زۆر کاڵوکرچی بە کار بردبوو. ئیدی چیخوف بە جۆرێ دەستەپاچە بووبوو لە ڕوو دامابوو، نەیزانی بوو چ بکات. گۆرکی کە ئەو دوانە پێکەوە دەبینێ، زۆری پێ سەیر دەبێ کە چ شتێك کۆیان دەکاتەوە، تۆلستۆی بەو هەموو ڕاشکاوی و قسە لە ڕوویی و بێ پەرواییە لە کوێ و چیخوڤ، ڕوو نەرمی دڵپاك و نەخۆش لەکوێ! جا گۆرکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "تولستۆی، چیخوفی خۆشدەویست، بە دیتنی چیخوف دڵی دەکرایەوە، لەوە دەچوو بە نیگا، دەموچاوی میوانەکەی بلاوێنێ. تولستۆی بە هەموو بێ بەروابییەکی خۆیەوە، چیخوڤ بە کچۆڵەیەکی شەرمنی هێمن دەشوبهاند." ڕۆژێ تولستوی، کە چیخوف دەبینێ بە باخچەکەی گاسپرادا پیاسە دەکات، لە ژێر لێوانەوە بە گۆرکی دەڵێت: "پەح! کە ئینسانێکی عەزیز و مەنگ و بەشکۆیە! شەرمن و ئارام دەڵێی کچە! تەنانەت ریکردنیشی و وەکو هی کیژانە. بە کورتیەکەی پیاوێکی جوانە!" (بڕوانە: ماکسیم گۆرکی، چەند بیرەوەریەك دەربارەی تولستوی، چیخوف، ئاندرییف. پاچڤەی س.س.کوتلیانسکی و لنر وولف، لەندەن: بڵاوەخانەی هاگرت، ١٩٣٦. ل٦٦). دوای ماوەیەك، ڕۆژێك، لە دانیشتنێکی سێ قۆڵی هەرسێکیاندا، تولستوی لە دەفتەری یاداشتەکانی خۆیدا ئەمە تۆمار دەکات: "شادم بەوەی کە چیخوف و گۆرکیم خۆش دەوێت." (بڕوانە تولستوی، دەفتەری یاداشتان، ١٩٠١/١١/٢٩، بە ڕووسی).

گۆرکی، بە هۆی چالاکی سیاسیەوە گیرا، پاشان ئازاد کرا، لێ دانیشتنی سان – پترسبۆرگ یان مۆسکۆیان لێ قەدەغەکرد. ئیدی مۆڵەتی لە حکومەت وەرگرت، بە هۆی نەخۆشییەوە لە قرم ئاکنجی بێت، مەرجی حکومەت ئەوەبوو کە نابێ لە یاڵتا دانیشێت. وێڕای ئەوەش هەفتەیەك لای چیخوف مایەوە. ئیدی بە درێژایی ئەو ماوەیە، پاسەوانێك لە دەرێی حەوشی ماڵەکەی چیخوف دا، ئێشکی دەگرت. هەرکاتێ گۆرکی لە ماڵەکە وەدەرکەوتبا، مفەوەزی پۆلیس تەلەفۆنی بۆ

چیخوف دەکرد کە یارۆی گومان لێکرا و کێوە چووە. ئەنجام گورکی لە ئولیز، کە لە گاسپراوە دوور نەبوو، خانوویەکی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵەکەی بە کرێ گرت. تا زیاتر دەگەڵ چیخوف دا یەکیان دەبینی، دۆستایەتیان خۆشتر و قووڵتر دەبوو. چیخوف لە ١٧/ت٢/١٩٠١دا نامەیەك بۆ ئۆلگا دەنووسێت کە: "ئەلیکسی مەکسیموفیچ (گۆرکی) هیچ نەگۆڕاوە، وەکو هەمیشە کەسێکی شایستە، هۆشن و میهرەبانە. تەنیا یەك شتی نەشازە، ئەویش کراسە جووتیاریەکەی بەرێتی، کە هەرچی دەکەم ناچێتە دڵمەوە و لە گەڵیا ڕانایەم..."

گۆرکی، شیفتەی سادەیی و بێ فیزی ئەم نووسەرە گەورەیە بوو، کە لە هەر ستایشێك بێزار بوو، هەرگیز و لە هیچ کات و شوێنێکدا خۆی لە بەرانبەرەکەی بە گەورەتر نەدەگرت، بە مەزنتر نەدەزانی. ئەوەتا لەو بارەیەوە و لە ستایشی چیخوف دا، لە یاداشتەکانی خۆیدا دەڵێت: "پێموایە، هەموو میوانێك لە هەنبەر چیخوف دا، خۆ بە خۆ وا هەستدەکات، لە سەرێتی سادەتر و خاکیتر، ڕاستگۆتر و بە کورتیەکەی زیاتر خودی خۆی بێت... چیخوف حەزی لە گفتوگویان دەربارەی مەسەلەو پرسێن قووڵ نیە. ئەو جۆرە گفتوگۆیانەی کە خەڵکی ڕووسی ئێمە خۆبەخۆ زۆری حەزلێدەکەن و غافڵن لەوەی کە گفتوگۆ دەربارەی پۆشاکی مەخمەلی ئایندە، لەکاتێکا ئێستا پانتۆڵێکی باشت لە پێدا نیە، نەك هەر خۆش نیە، بەڵکو شتێکی گەوجانە و کۆمێدیشە." (بڕوانە یاداشتەکانی گۆرکی.) لە ڕاستیدا گۆرکی زیاتر شیفتە و دڵبەندی ناسکی و میهرەبانی و بێ فیزی هاوڕێ گەورەکەی بوو کە دەیزانی زۆری بە بەرەوە نەماوە. چیخوف، هێدی و ئارام، بە ڕووخۆشی و دەم بە پێکەنینەوە پێشوازی میوانانی دەکرد، دار و درەختی دەڕواند، بەرهەمی دەنووسی، نەخشەی سەفەر دادەنا، بە جۆرێ ئەو کارانەی دەکرد، لە تۆ وایە بەتەمایە لەو نزیکانەدا بە تەواوەتی چاك ببێتەوە و عەلەمی تیا نەمێنێ. هیچ گلەییەکی لە زەماوەندە نائاسایی و غیابیەکەی خۆیشی نەدەکرد. بە کاوەخۆ گوێی لەو کەسانە دەگرت کە دەردی دڵ و نهێنی دەروونی خۆیان بۆ باس دەکرد و بە خۆیشی هیچی بۆ کەس نەدەگێڕایەوە. خۆ ئەگەر هەندێجار دەگەڵ گۆرکیدا بکەوتایەتە گفتوگۆ و گەنگەشەی سیاسی، هەمیشە هەوڵی دەدا قەناعەتی پێ بێنێ، کە لە ڕاو بۆچوونەکانیا، لە نۆڕینیا بۆ ئایندە، هەندێ واقیعی و میانڕەو بێ. لەکاتێکا گۆرکی، مارکسیستی توندڕەو خەوی بە شۆڕشێکەوە دەبینی کە بتوانێ بورژوازیەت بە تەواوەتی گسك بدات و دەسەڵات بە دەستی پرولیتاریا بسپێرێت، چیخوف کە پیاوێکی وردبین بوو، بە ئومێدی ئەوەبوو، کە ڕژێمی تزاری، بەرەبەر بگۆڕێت بۆ ڕژێمێکی لیبراڵی ڕۆشنبیرانە. وێڕای ئەمەش باوەڕی بە شایستەیی هاووڵاتیانی خۆی نەبوو، ڕای بەرانبەر بە هاووڵاتیانی خۆی باش نەبوو. بگرە هەندێجار بە گومان بووە لەوەی کە شایستەی ئەم وڵات و زاگەیە بن، بە گۆرکی دەگوت: "ڕووسیان، خەڵکێکی سەیرن. وەکو بێژنگ وان، هیچیان تیا ناوەستێ. لە گەنجیا، هەر شتێك دەبینن، لە خۆدا کەڵەکەی دەکەن، هەر کە سی ساڵیان بوارد، ئەوەی تیایانا دەمێنێ چنگی خاك و خۆڵ و خاکەری بێکەڵکە... ئینسان بۆ ئەوەی مرۆڤانە، ئابڕومەندانە بژی دەبێ کاربکات. بە ئەشقەوە، بە باوەڕەوە کاربکات. لای ئێمە ڕووس شتی وانیە... ڕووسیا وڵاتی چاوچنۆك و تەمەڵانە. شیفتە و کوشتەی خواردن و خواردنەوەن، بەوان بێ شەو و ڕۆژ بخەون و

پڕخوهۆڕیان سەعاتە ڕێیەك بڕوات... نەفسیەتی سەگیان هەیە: كە لێت دان، بە دەنگێكی نەوی دەقروسكێنن و خۆ بە كۆنەكانیاندا دەكەن، ئەگەر نەوازشت كردن، لەسەر گازی پشت بۆت وەردەكەون و هەر چوار پەلیان دەكەنە ئاسمان و دەكەونە كلكە سووتێ." هەروەها: "بە خۆمان دەڵێین وەزع بەرەبەرە، دەگەڵ هاتنی هەر تزارێكی تازەدا دەگۆڕێت و باشتر دەبێت، خۆ دوای دوو سەدەی دی زۆر باشتر دەبێت. كەس نیە كار بۆ ئەوە بكات كە سبەینێ ئەم باش و باشترە بێتەدی. بەمجۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ ژیان ئاڵۆزتر دەبێت و خۆبەخۆ دەڕوات و نازانین بۆ كوێ دەڕوات، خەڵكیش گێل تر و گەوجتر دەبن و زیاتر لە ژیان دووردەكەونەوە." (بڕوانە یاداشتەكانی گۆركی.) چیخۆف كە ئەو زستانە بونین و كوبرین دەبینێ، بە هەمان نەفەس و هەمان زمان ئەوانیش دەدوێنێ. كاتێ بۆنین، باسی كەم بەرهەمی و بێ بەرهەمی خۆی بۆ دەكات، چیخوف، پێیا هەڵدەشاخێ و دەڵێت: "غەدر دەكەیت! بە خۆت دەزانی كە گرینگترین شت بۆ ئینسان كارە... دەبێ كاربكەیت و بەدرێژایی ژیانت دەستبەرداری كار نەبیت!" پاشان ئەم ئامۆژگاریەی دەكات: "پیاو نابێ دەست بە نووسین بكات، تا هەست نەكات سارده وەكو بەفر." (بڕوانە: یاداشتەكانی بونین.)

سەبارەت بە لیونید ئاندرییف، كە چیرۆكەكانی سەرەتای زیاتر خەیاڵی بوون و بە شێوازێكی هەندێك ئاڵۆز نووسرابوون و تازە سووكە سەركەوتنێكی بەدەست هێنابوو، بە بونین دەڵێت: "ئەگەر یەك لاپەڕە لە چیرۆكەكانی ئاندرییف بخوێنیتەوە، دەبێ دوو دانە سەعات لە هەوای پاكا پیاسە بكەیت." چیخوف كە بەخۆی پێچەوانەی كەسێتی خەمین و ڕەنجدیدەی ئاندرییف بوو، كە هەستی كرد، ئۆلگا، شیفتەی بەهرەی ئەم نووسەرە گەنجەیە، لە ٧/ك١/١٩٠١دا نامەیەكی بۆ ئولگا نووسی كە: "بەڵێ، نووسەرێكی باشە. ئەگەر زیاتری نووسیبا، سەركەوتووتر دەبوو. ڕاستگۆیی كەم پێوە دیارە، ئاڵۆزە، ئەمە وای كردووە، خوێنەر بە ئاسانی هۆگری نەبێ. بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، درەنگ یان زوو جەماوەر هۆگری دەبن و ناوێكی گەورە بۆ خۆی پەیدا دەكات." (بڕوانە نامەی ١٩٠١/١٢/٧). چیخوف لە هەمان نامەدا ژنەكەی ئاگادار دەكاتەوە كە ڕۆن گەرچەكی خواردووە. كۆكەكەی زیادی كردووە، توانای نووسینی نیە. بە درێژایی زستانەكە هیچ كارێكی نەكردووە تەنیا ئەوەنەبێ كە چیرۆكی "قەشەباشی = اسقف"ی تەواو كردووە و پاك نووسی كردووەتەوە. ئەمە بریتییە لە چیرۆكی ژیان و مەرگی قەشە باشیەك، هێندە بە تانی هاماجی كڵێساییدا چووە، هێندە سەروكاری دەگەڵ دینداری تەقلیدیدا پەیدا كردووە، لە تۆ وایە بابایەكی ئەهلی باوەڕ و نویژان نووسیویەتی نەك بابایەكی گوماندار و گومان ئەندێشی دوو ئاتەشە. هەروەها هەوڵی دەدا لە مێشك و هزری خۆیدا نەخشەیەكیش بۆ "باخی ئاڵوباڵو" دابڕێژێ. بەڵام نە قارەمانانی شانۆنامەكە و نە پیرەنگ و ڕووداوانی شانۆنامەكە خۆیان بە دەستەوە نەدەدا و بۆی زەوت نەدەبوون. وەختێكی زۆری بە خوێندنەوەی بەرهەمێن بونین و كوپرین و گۆركی بەسەربرد و هەڵەكانی بۆ گۆركی ڕاست دەكردەوە، هەروەها بۆ جاری دووەم بەرهەمەكانی تورگینیفی خوێندنەوە. لەو ڕەخنەگرانە پەست بوو كە سووربوون لەسەر ئەوەی كە جۆرە لێكچوونێك لە نێوان بەرهەمەكانی ئەو وتورگینیفدا هەیە. لە نامەیەكیا بۆ ئۆلگا

١٩٠٢/٢/١٣ لەو بارەیەوە دەڵێت: "تورگینیف دەخوێنمەوە. تەنیا هەشت یەك یان دەیەکی نووسینەکانی ئەم نووسەرە دەمێننەوە و دەژین، باقی بەرهەمەکانی لە ماوەی بیست و پێنجی – سی ساڵی دیکەدا، هەمووی لە ئەرشیفخانەکاندا دەنێژرێن." کە بیری لە ساڵانی ڕابردووی دەکردەوە، پێی سەیر بوو چۆن ڕۆژ بە ڕۆژ، ئەو هەموو کارەی کردووە. ژیانی ئەو بریتی نەبوو لە ڕووداوێن گەورە، بەڵکو بریتی بوو لە چیرۆك و شانۆنامان. یانی زیاتر بۆ نووسین ژیابوو، نەك بۆ ژیان، ژیانی لە قەبەڵی نووسین کردبوو. وێڕای ئەمەش، جارجاریێ، لەو زەمانە دێرینەوە، لە ژیانی واقیعییەوە، تارمایيەك دەهاتە دەریێ و بەرۆکی هزر و یادگەی دەگرت. یەکێك لەو تارمایی و تاپۆیانەی کە لەپڕ پەیدابوو لایکا میزینوڤا بوو، کە لە بواری گۆرانی ئۆپرادا شکستی هێنابوو و وازی لە پرۆژەی کردنەوەی موغازەی جلکیش هێنابوو. ئێستا، حایر و بێکار، خووی دابووە خواردنەوە. کاتێ ماری، بە خێری خۆی، بۆ شەوێك لە شوقەکەی خۆیاندا جێی کردبووەوە، ژوورەکەی بە تەواوی بۆنی دووکەڵە جگەرە و مەشرووبی گرتبوو، بۆیە بۆ بەیانی ناچاربوو هەموو دەرگا و پەنجەرەکان بخاتە سەر گازی پشت تا هەوای ژوورەکە بگۆڕێ و ئەو بۆنە جگەرە و مەشرووبە بڕوات. بۆ برایەکەی نووسی: "دڵم بە لایکا دەسووتێ." بەڵام ئۆلگا، کە لایکای (جاران جوان)ی لە شەو ئاهەنگێکدا بینی بوو و تەعاروفیان کردبوو، هیچ سۆزێکی بەرانبەری نەبوو، بە پێچەوانەوە نامەیەکی بە تانە و تەشەری بۆ چیخوف نووسی: "لایکا مەست بوو، وەکو قیڕ پێمەوە نووسا بوو و داوای لێدەکردم کە نەخبی دۆستایەتی دەگەڵدا بخۆمەوە. بەڵام قاییل نەبووم، چونکە حەزم لەم جۆرە کارانە نیە. من نایناسم، لەبەرچاوم جۆرێکە، بە دەست خۆم نیە نایحوبێنم." دوای چەند هەفتەیەك، ئۆلگا، چیخوڤ ئاگادار کرد کە لایکا قاییل بووە شوو بە ئەلکساندر سانین بکات. سانین ئەکتەر و دەرهێنەر بوو لە شانۆی هونەر، چیخوف لە ١٩٠٢/٣/١٢دا وەڵامی ئۆلگای دایەوە کە: "دەمێکە لایکا دەناسم. بە شێوەیەکی گشتی و وێڕای هەموو شتێك کچێکی باشە، زیرەکە، ئابڕوومەندە. دەگەڵ سانین دا هەڵناکات، خۆشی ناویێ... لە ئێستاوە تا کۆتایی ساڵ وەکو منداڵێکی گەورەی خۆی مدارای دەکات، پاشان لە ئێستاوە تا ساڵونیوێکی دی، دەکەوێتە خیانەتکردن لە مێردەکەی. بە کورتیەکەی هەر هەموو ئەم مەسەلانە، ڕێکەوتە*." هەڵبەتە چیخوف لە کورتی و بەو ئەنجامگیریە پڕ ڕەشبینییە بڕییەوە و وەکو سەردەمی گەنجی نەکەوتە شۆخی و لاقرتێ و ئاشقێنی گاڵتە بە ڕاست. چونکە ژنی هێنابوو، ژنەکەی خۆش دەویست و نەخۆشیش بوو، ئیدی هیچ ئومێد و مەرامێکی بە لایکا نەمابوو.

یەکێکی دیکە لە کۆنە دۆستەکانی کە لەپڕ پەیدا بووەوە لیدیا ئەڤیلوڤا بوو، کە هەواڵی زەماوەندی چیخوف، تا سەر مۆخ هەژاندبووی. لیدیا لە یاداشتەکانی خۆیدا لەو بارەیەوە دەڵێت: "لە ناکاوا ئارەقەیەکی سارد نیشتە سەر تەوێڵم، کەوتم بەسەر یەکەم کورسی نزیك خۆما." تاقە سوکنایی دڵی ئەو تانە و تەشەرانە بوو کە لە "هەڤرکە" سەرکەوتووەکەی دەدران: "ئۆلگا، دەگەڵ ئانتوندا زۆر کۆمیدی دەهاتە بەرچاو! چیخوف پیرەمێرێك بوو لەو گۆڕە، سیما لەڕ و لاواز، لە عەمەلمەندان دەچوو. یانی ئەو دووە لە هەموو شتێك دەچوون تەنیا لە بووك و

زاوا نەبیٚ." لەمەش خراتر، دەنگۆیەك لە نێو خەڵكیدا بڵاوبوو، كە نەمیروفیچ – دانچەنكۆ، بە ئاشكرا ئاشقێنی دەگەڵ دەكرد. ئیدی ئەم قسە و قسەلۆكانە كردیانە كارێك، لیدیا ئەڤیلوڤا، نەیدەزانی بە بۆنەی ئەم زەماوەندەوە پیرۆزبایی لە چیخوف بكات یان نا. ئەنجام لێبڕا كە پیرۆزبایی لێبكات، هەر لەو پیرۆزبایی نامەیەدا داوای لێدەكات ئاخۆ بە ئەشقە كۆنەكەیان، كە ئێستا مردووە خۆشحاڵە، ئەگەر باوەڕ بە لیدیا بكەین، ئەوا چیخوف پاش ئەوەی سوپاسی كردووە، وەڵامی داوەتەوە: "دەتوانی بزانی كە ئایا بەختەوەر و شادم؟ پێش هەموو شتێك من نەخۆشم، حاڵی حازر زۆریش نەخۆشم. ئەوە حەقیقەتەكەیە، ئیدی بە خۆت، بە كەیفی خۆت حوكم بدە. دووبارە سوپاسی نامەكەت دەكەم... هەمیشە هیوای شادمانیم بۆ خواستوویت. ئەگەر هەر كارێكم لەو بارەیەوە لە دەست هاتبا، بە خۆشحاڵیەوە بۆم دەكردیت. بەڵام هیچم پێناكریٚ." (بڕوانە لیدیا ئەڤیلوڤا: ئا.ب.چیخوف لە ژیانی مندا). بەمجۆرە چیخوف، بە سەرەقەڵەمیٚ خۆی لە لیدیای ڤیرسیچمە ڕزگاركرد كە بە تۆبزی چیرۆكی ئەم ئەشق و ڤیانەی نێوان خۆی و چیخوڤ دروست كردبوو، تا بە خەیاڵی خۆی لەبەرچاوی نەوەكانی ئایندە گەورە و بە شكۆ بنوێنیٚ.

لەم سەروبەندەدا تاقە ئەشقی چیخوف، ئەشقی ئولگا بوو، ئولگا بۆ ئەو، كە دووریەكەی هێندەی دی شیرینی كردبوو، وەكو شاقارەمانەكەی ئەدمۆن روستان "دۆتمیری دوورە دەست"ی لێهاتبوو. وێڕای تكا و ڕجای چیخوف، دكتۆر ئالتسشور، ڕێگەی نەدەدا كە سەفەری مۆسكۆ بكات. ماریا، بەزەیی بە براكەیدا دێتەوە، دەچێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی شانۆ، دوای ڕجا و تكایەكی زۆر، توانی مۆڵەتی چەند ڕۆژێك لە شوباتی ١٩٠٢دا بۆ ئولگا وەربگرێت تا سەفەری یاڵتا بكات. ئەوەبوو ئۆلگا بە نامەیەك چیخوڤ ئاگادار كردەوە كە "چوار ڕۆژ و پێنج شەو" لای ئەو دەمێنێتەوە و لە ١٩٠٢/٢/٢٢دا گەییە یالتا. ئەمە ئۆلگا گوتەنی "هەنگوینە مانگێكی دیكە" بوو. كاتیان زۆر كەم بوو، بۆیە وەكو ئەوەی دەستێك هەڕەشەی جیابوونەوەیان لێبكات، هەموو وەختەكەیان شەیدایانە و بە ئاشقێنی بردەسەر. ئۆلگا هێشتا بە تەواوەتی نەگەیی بووەوە جیٚ، چیخۆف خێرا نامەیەكی بۆ نارد: "هەرچی زووترە بگەڕێوە نازەنین! بەبیٚ ژنەكەم هەڵناكەم." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٢/٢٨).

ئۆلگا، لەوكاتەدا، دەگەڵ تیپی شانۆی هونەردا بە گەشتێكی شانۆیی هاتبوو بۆ سان – پترسبورگ. تیپەكەی ستانسلافسكی، سەركەوتنێكی جەماوەری و میدیایی گەورەی لە پایتەخت بەدەست هێنا. نمایشێكی تایبەتی شانۆنامەی "سیٚ خوشك" لەبەردەم تزار و دەرباری تزاردا پێشكەش كرا. ئۆلگا، لە نێو هاوپیشەكانیا، لە هەموویان دیارتر بوو، بوو بە ئەستێرەی تیپەكە. لە ژیانیا ئەوەندە پیرۆزبایی لێنەكرابوو، ئەوەندەی چەپكەگوڵ پێشكەش نەكرابوو، دەعوەتی ئێوارەخوان نەكرابوو. بە ڕاستی مەستی ئەم هەموو ستایش و ئافرینە بوو. بەڵام كە جۆش و خرۆشەكە بەرەبەرە خاوبووەوە و دامركایەوە. بە تەنیا چووە ژوورەكەی خۆی، كە بیری لە وەزعی ئانتۆن دەكردەوە: نەخۆش، تەنیا، بێزار لە زندانە بەرینەكەی لە یاڵتا، هەستی بە جۆرە عەزابێكی ویژدان دەكرد. هەنگیٚ، بۆ پاكانەی ڕەفتار و هەڵوێستەكەی خۆی، بەپەلە ئەم

نامەیەی بۆ نووسی: "هەندێجار ڕقم لە شانۆیە، هەندێجار ئاشقانە خۆشم دەوێ. شانۆ ژیانی پێ بەخشیووم، خەمێکی زۆر، شادیەکی زۆر، تۆی بە من بەخشێوە، کردوومی بە کەسایەتی. ڕەنگە تۆ ئەمە بە ژیانێکی درۆینە بزانیت، بە جۆرە خەیاڵ و وەهمێکی بزانی، لەوانەشە وابێ، بەڵام لە دوا ئەنجاما ئەمەش جۆرە ژیانێکە. بەر لە شانۆ من زۆر ساویلکانە دەژیام. هیچم لەمەڕ ژیان نەدەزانی، هیچ دەرك و تێگەیشتنێکم لەمەڕ خەڵکی و هەستی خەڵکی نەبوو." چیخوف وەکو هەمیشە، دڵنیای دەکردەوە کە پێی ڕازیە و بە سەرکەوتنەکانی خۆشحاڵە. بە تەنزەوە بۆی دەنووسێت: "کەواتە خەریکە دەبی بە ئەکتەرێکی ناودار. دەبی بە (سارا برنارد)ێکی دیکە. وازم لێ دێنی؟ یان دەتەوێ ببم بە ژمێریارت و دوات بکەوم." لە پەراوێزی هەمان نامەدا بۆی دەنووسێت: "من هیچ لاریم لەوە نیە نێوبانگ دەربکەی، بەغیلی ئەوەت پێ نابەم ساڵانە بیست و پێنج تا چل هەزار ڕۆبڵ دەرامەت و دەستکەوتت هەبێ. بەڵام بەر لە هەر شتێك تا دەتوانی ئاگات لە شانۆنامەنووسە چکۆلەکە بێ." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٣/١٧).

دەستەواژەی "شانۆنامەنووسە چکۆلەکە" یان (نیمچە ئەڵمانی - چکۆلە) ناو بە ناو لە نامەکانیدا، دووبارە دەبووەوە. دیاربوو هەردووکیان حەزیان لە منداڵ بوو. ئۆلگا چەند هەفتەیەك دوای سەفەرەکەی یاڵتا، خەبەری بۆ چیخوف نارد کە دڵی تێك هەڵدێ، چیخوف ئامۆژگاری کرد کە کەمتر بخواتەوە. پاشان، ئۆلگا لە ١٩٠٢/٣/٣١دا بە نامەیەك ئاگاداری کردەوە کە منداڵەکەی لەبارچووە: "کە لە یاڵتا بەڕێ کەوتم، بە ئومێدی ئەوەبووم نووسەرێکی چکۆلەت پێ ببەخشم. بەڵام زۆریش دڵنیا نەبووم لەمە. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە هەستم بە بێتاقەتی دەکرد، وامدەزانی سك یەشەیەکی ڕەوتەنیە و هیچی تر. هەرچەندە حەزم دەکرد حامیلە بم، بەڵام ئەقڵم بەوەدا نەشکا کە بە ڕاستی حامیلەم... تا ناردیان بەدوای دکتۆرا و دکتۆر هات، ئەوسا زانیم مەسەلەکە چیە و تازە کار لەکار ترازاوە. هەنگێ گریام ئەمما گریان... بە ڕاستی لەبارچوونی نووسەرە چکۆلەکە ژانی کردە دڵمەوە." بەپەلە بۆ نەخۆشخانەیان برد و خێرا خرایە ژێر نەشتەرگەریەکی ناچارییەوە، تەنانەت دڵسۆزی و میهرەبانی ئەکتەرەکانی هاوڕێشی، نەیدەتوانی لەو جەزرەبە و شۆکە دەروونیە دژوارەی دەربێنێ. هەموو بیرکردنەوەیەکی هاتبووە سەر ئەوەی کە بڕوات بۆ یاڵتا و پەنابەرێتە بەر مێردەکەی. بەڵام ئایا مێردەکەی ئامادەبوو، بەو هەموو کەمتەرخەمیەوە کە ژنەکەی بەرانبەر بەو کردبووی، پێشوازی بکات؟ ئۆلگا دوای چەند ڕۆژێك بۆی نووسی: "بروسکەیەکم بۆ بنێرە. لە بیرم مەکە، لە کەمو کووڕیم ببورە!"

ئەوەی ڕاستی بێ چیخوف، لەجیاتی بروسکەیەك، چەند بروسکەیەکی بۆ نارد، لەو بروسکانەدا بە گەرمی و خۆشەویستی لە تەندروستی پرسی بوو و دڵنیای کردبوو کە بە تاسەوە چاوەڕوانی دەکات. زیاتر خەمی باری دەروونی و جەستەیی ژنەکەی بوو تا خەمی لەبارچوونی منداڵەکە. کاتێ کەشتییەکەی ئولگا لە ڕۆژی ١٩٠٢/٤/١٤دا لە یاڵتادا لەنگەری گرت، دەبوایە ئولگا بە دەستەبەرە لە کەشتییەکەوە بۆ ناو گالیسکە بگوازنەوە. هەڵبەتە چیخوف، نەك هیچ کەمومووڕییەکی بە چاویا نەدایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کە بەو نەخۆشی و ڕەنگ زەردیەوە

بینی، دڵی گیرا و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك نەخۆش کەوت. زۆر بە خەمی ئولگاوە بوو، لە گەرمەی ئەم خەم و پەژارەیەدا، ڕووداوێکی گەورە لە جیهانی ئەدەبی ڕووسیدا ڕووی دا. گۆرکی کە تازە بۆ بەشی ئەدەبی ئەکادیمیا هەڵبـژێردرابوو، خەبەری زانی کە دەوڵەت، بە بیانووی ئەوەی کە گۆرکی لە ژێر چاودێری پۆلیسدایە، داوای لە ئەکادیمیا کردووە، هەڵبژاردنەکەی بۆ ئەندامێتی لە ئەکادیمیادا، هەڵبوەشێنێتەوە. چیخوف زۆری لەبەر ناخۆش دەبێ، بەوپەڕی نیگەرانی، ڕاوێژ و شیرەت بە کۆمەڵێك لە دۆستانی ئەهلی قەڵەم دەکات، هەموو هانیدەدەن وەکو پشتیوانی لە گۆرکی، ئەویش واز لە ئەندامیەتی ئەکادیمیا بێنێ. بەڵام پارێزەرێك ئامۆژگاری کرد کە هیچ پەرچە کردارێك نەنوێنێ، تۆلستۆی بەوە خۆی پەڕاندەوە کە هیچ کاتێك خۆی بە ئەندامی ئەکادیمیا نەزانیوە. چیخوف، لە نێو ئەم هەموو بۆچوونە هەڤدژەدا تیامابوو و نەیدەزانی چ هەڵوێستێك هەڵبـژێرێت. کاتێ کورولینکوی هاوڕێی لێی پرسی کە هەڵوێستی بەرانبەر بەو نەهەقیەی دەسەڵات چیە، چیخوف تەنیا ئەوەندەی گوت: "ژنەکەم تایەکی توندی لێهاتووە، لەجێدا کەوتووە، تەواو داویەتیە باریکی و بنێسی." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٢/٢٠). دوای چەند هەفتەیەك کورولینکو بۆ دیدەنی چیخوف چوو بۆ یاڵتا. بە دوو قۆڵی قەراریان دا کە واز لە ئەندامیەتی ئەکادیمیا بێنن. بەڵام شتاڤیان دوا نامەی ئیستیقالەکەیان بۆ بەڕێوبەرایەتی ئەکادیمیا نەنارد، وایان بە مەسڵەحەت زانی جارێ سەبربکەن، تا بزانن ئاخۆ ئەکادیمیا لە بڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوە یان نا. هەڵبەتە ئەم هەڵوێستە لە بنەڕەتدا هەڵوێستێکی دیپلۆماتکارانە بوو و لە هەمان کاتدا بە قازانجی گۆرکی بوو.

لەم سەروبەندەدا، وەزع و حاڵی خانەوادەییان خراپ بووبوو: خوشك و دایكی چیخوف بە ئاشکرا لۆمەی ئۆلگایان دەکرد کە بە ئانقەست بە سکپڕی درێژەی بە ژیانی بێ سەروبەری خۆی داوە و منداڵەکەی لەباربردووە. چیخوف، بەڕادەیەك لە ناکۆکی و ناتەبایی ئەم سێ ژنە بێزار بوو کە بڕیاری دا، دەگەڵ ئۆلگادا، پێش ئەوەی بە تەواوەتی چاك ببێتەوە، بڕوات بۆ مۆسکۆ. لە ١٩٠٢/٥/٢٧دا گەیینە مۆسکۆ، ئۆلگا یەکسەر لەجێدا کەوت.

دوای ماوەیەکی کەم نەخۆشیەکەی ئۆلگا لێی تازەکردەوە. دکتۆران معایەنەیان کرد و دەرکەوت کە پەردەی (سیفاقی) ئاوساوە و هەوی کردووە و دەبێ نەشتەرگەری بۆ بکرێت. چیخوف بەردەوام بە دیاریەوە بوو، بەبست لێی دوورنەدەکەوتەوە، زۆر خەمبار بوو، بەردەوام دەرەجەی گەرمای دەگرت، بەخۆی کۆمپێرسی بۆ دادەنا. ئەمجا نۆرەی ماریا بوو پەشیمانی خۆی دەربڕێ و لە یاڵتاوە نامە بنێرێت کە ئامادە یە بێت یارمەتی براکەی بدات. پاشان، لە ١٩٠٢/٦/١٢دا، کە قەرار بوو ئۆلگا بخرێتە ژێر نەشتەرگەری، لەپڕا ئۆلگا چاك بووەوە. چیخوف بە خۆهەڵکێشانەوە دەیگوت کە ئەو چاکی کردووەتەوە، چونکە لە ناو هەموو پزیشکەکاندا، تەنیا ئەو هەموو خواردنێکی، جگە لە شیر و قەیماغ، لێ قەدەغە کردبوو. لە نامەیەکیا بۆ نەمیروفیچ – دانچنکو، بە شانازیەوە لەو بارەیەوە دەڵێت: "لە نێو هەموو دکتۆرەکاندا، هەر من هەموو خواردنێکم، جگە لە شیر و قەیماغ لێ قەدەغەکرد و بۆی بوو بە شفا و دوای ماوەیەکی کەم ئولگا لە مەترسی خەلەسی."

چیخۆف، که ئەو خەمەی لە کۆڵ بووەوە و هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشا، جارێکی دی کەوتە بیرکردنەوە لە پشووی هاوین. ماریا پێشنیازی کرد کە دەگەڵ ژنەکەیدا بۆ یالتا بگەڕێتەوە. بەڵام کە ئەزموونە تاڵەکەی مانگی چواری خۆیانی بیرکەوتەوە، پێشنیازەکەی ماری ڕەتکردەوە. بڕیاری دا دەعوەتەکەی ساڤا موروزوف، کە ملیونێرێکی زۆر گەورەبوو، قەبووڵ بکات و بڕوات بۆ پرمی کۆسارەکانی ئۆڕال. ئیدی ئۆلگای بە دایکی سپارد و بۆ خۆی بە تەنیا سەفەری کرد. دیارە ئەم بڕیارە سەیرەشی زادەی ئەو مجێز و تەبیعەتەی بوو کە نەیدەتوانی بە درێژا لە یەك شوێنا ئۆقرە بگرێت. ئەو بانگە نادیارەی ناخی هێندە بە هێز بوو، بێ هیچ دوودڵییەك ژنە زۆر خۆشەویست و، نەخۆشەکەی بەسەر دایکیا بەجێهێشت و ڕۆیی.

ڕۆژی ١٩٠٢/٦/١٧ دەگەڵ ساڤا موروزوف دا، بە دوو قۆڵی کەوتنە ڕێ. هەوەڵجار بە سواری قیتار ڕۆییشتن، پاشان بە کەشتی، ڤۆلگا و کامایان بڕی. یەك هەفتەی تەواویان پێچوو تا گەییشتنە مۆڵکە بەرفراوانەکەی موروزوف کە کەوتبووە ڤزیفولودوڤیلڤای ئەوبەری پرمەوە. چیخوف بەدەم ئەم سەفەرە دوور و درێژەوە، پەیتاپەیتا ناسکە نامە و بروسکەی شادیبەخشی بۆ نەخۆشەکەی، کە ڕوو لە چابوونەوە بوو، دەنارد: "مجێزێکی خۆش و نیمچە ئاڵمانیم هەیە، سەفەرەکەمان زۆر خۆشە. زۆر لە جاران کەمتر دەکۆکم. نیگەرانی تۆ نیم چونکە دەزانم و دڵنیام کە حاڵی سەگە چکۆلەکەم باشە. بێگومان دەبێ وابێ." یان "تەندروستیم باشە. خواردنم باشە، هەست بە سەرما ناکەم، تووڕە مەبە، خەم مەخۆ، ورەت بەرزبێ." یان : "تا دەگەڕێمەوە دەبێ قەڵەو و گۆشتن بوویی، کێشت زیاد بووبێ، وەکو بەڕێوەبەری شانۆ." (بڕوانە نامەێن ١٨،١٩،١٩٠٢/٦/٢٢).

مۆڵکەکەی سافا موروزوف (برای سێرگی موزوروفە کە پێشتر ناوی هاتووە) بریتی بوو لە خانوویەکی دێهاتیانەی گەورە، کە یەك لەشکر خزمەتکاری تیابوو، لە باخچەیەکی گەورە، دارستانێکی بەرینی دارغان، چەندین گوند، کە پڕبوون لە خانووی دارینی تبەو و چەند کارخانەیەك بۆ دروستکردنی شتی کیمیایی. موزوروڤ خاوەنی ئەم مۆڵکە ردێنێکی درێژی هەبوو، ڕەفتاری، ڕەفتاری دەوڵەمەندان بوو. بە خوایشتی خۆی بایەخی بە ئەدەب و کارێن خێرخوازی دەدا. ماوەیەکی کەم بوو، پارەیەکی زۆری بۆ نۆژەنکردنەوەی شانۆی هونەر تەرخان کردبوو، ئامێری تازەی کارەبای بۆ کڕی بوو، تەختەی گەڕۆکی بۆ سازکردبوو، کابینەی ڕەحەت و تایبەتی بۆ خۆگۆڕینی هونەرمەندەکان دروستکردبوو. چیخوف، هەرکە گەییە ئەوێندەر، وێڕای ئەوەی زۆر ماندبوو، واداریان کرد سەردانی یەکێك لە کارخانەکان بکات. شوێنێك بوو زۆر جەنجاڵ و قەوغا، تابڵێی بۆگەن، تەحەمول نەدەکرا. قسەی دەگەڵ کرێکارەکاندا کرد، کە زانی ڕۆژی دوازدە سەعاتان کاردەکەن، بە ڕاشکاوی قسەی دەگەڵ خانەخوێیەکەیدا کرد و ئیرادی لێگرت. دەڵێن لە هەنبەر ڕەخنەکانی چیخوفدا لە ڕوو داما و بە ناچاری ڕازی بوو کە کاری ڕۆژانە بۆ کرێکارانی هونەری و پسپۆڕ بکرێ بە هەشت سەعات و بۆ کرێکاری ئاسایی بکرێ بە دە سەعات. موزوروف هەر یەکەم شەو دەعوەت و میوانداریەکی گەورەی سازکرد، ڕۆشنبیران و فەرمانبەران و بەرپرسانی ناوچەکە و هەموو دەستەی بەڕێوبەرایەتی دامودەزگاکانی خۆی

دەعوەت کرد. چیخوف، بە بێدەنگی، لە نێو ئەم مەجلیسە پۆشتە و پەرداخەدا، لە سەری سەرەوە دانیشت. حەوت جۆرە خۆراك دانرابوو، چیخوف لە نێو هەموو خواردنەکاندا تەنیا کەمێك شۆربای خوارد، لە خواردنەوەشدا، تەنیا تۆزێ ئاوی خواردەوە. دیاربوو کە ئامادەبووان لەبەردەم موزوروفدا هەڵدەلەرزین، لاسایی ڕەفتارەکانی ئەویان دەکردەوە، سەریان بۆ قسەکانی دەلەقان. زۆربەیان چیخۆفیان نەدەناسی، تەنیا ئەوەندەیان دەزانی کە "نووسەرە"، وایان هەست دەکرد ئەویش یەکێکە لە دەسەندە خۆرانی ئاغاکەیان. لە ڕاستیا چیخوف، هەم دڵبەندی ئەم بزنسمانە بە ڕواڵەت چاکەخوازە بوو، هەم لێی بێزاربوو. جوامێری و میهرەبانی و دڵاوایی ساڤا موروزوڤی بەدڵ بوو، بەڵام سەروەت و سامانە بێ ئەندازەکەی بە دڵ نەبوو کە زۆر پێوەدەفشی، لەو شێوە نۆکەرایەتی و خوبزەییە بێزاربوو کە خەڵکی لەسەر ڕادێنا، ئەو خەڵکەی کە بەرماوەی خوان و سفرەکەی ئەویان کۆدەکردەوە و دەیانخوارد. چیخوف، دوایی سەردانی بنکەی تەندروستی کرێکارەکان دەکات، بە خوێندکاری گەنج تیخونوف، کە خوێندکاری بەشی ئەندازە دەبێت و لای موروزوف کاردەکات، دەڵێت: "موروزوف، بازرگانێکی دەوڵەمەندە... شانۆیان دادەمەزرێنێ... وا خۆی دەنوێنێ گوایە شۆڕشگێڕە.... کەچی تەنترۆ لە دەرمانخانەکەیدا نیە، پەرستارەکەی کابرایەکی مەی خۆرە، هەموو شووشە سپرتۆکانی خواردووەتەوە و بە ڕۆن گەرچەك دەرمانی ڕۆماتیزم دەکات. ئەمانە هەموویان یەك قوماشن: روکفلرانی ڕووسی ئێمە*."

کاتێ موروزوف، ناچاربوو، بە هۆی کاروبارەوە سەفەر بکات و لەوێ بڕوات. میوانەکەی (چیخوف) بە ئەلکساندەر تیخونوف سپارد. ئەم گەنجە لە سەرەتادا هەستی دەکرد چیخوف کەسێکی داخراوی کەمدووی دڵناسکە. بەڵام زۆری پێنەچوو، بوون بە دۆست. بە دوو قۆڵی، بە دارستانە بەرینەکەدا دەگەڕان، دەچوونە ڕاوەماسی و بە قوڵاپان ماسیان دەگرت، باسی ئەدەب و سیاسەتیان دەکرد. هەندێجار دڵی ئەم گەنجە خوێنگەرمە بیست و دوو ساڵانە، لە قسەیەکی تەنزئامێزی چیخوف دەشکا، بۆ نموونە ڕۆژێك چیخوف بە تۆنێکی تەوس ئامێزەوە پێی گوت: "خوێندکاران بۆیە یاخی دەبن و خۆپیشاندان دەکەن، تاوەکو قارەمان بنوێنن و ئەوسا ئاسانتر کیژان بخەنە دواوە!" کاتێ تیخونوف، ڕووی گرژ کرد، چیخوف هەردوو دەستی لە ملی کرد، بەدەم بزەیەکی خەمناکەوە پێی گوت: "ئەدی تۆ؟ تۆش دەنووسیت؟... نە؟... ئەمە باشە. ئێستا خوێندکاران ناخوێنن، یان ڕۆمانان دەنووسن یان شۆڕش دەکەن... ئیدی، ڕەنگە وا باشتر بێ. کاتێ ئێمە خوێندکار بووین، بیرەمان دەخواردەوە و هەقمان بەسەر هیچەوە نەبوو، هیچ کارێکی ترمان نەدەکرد: کۆمەڵە خەڵکێکی دڵ مردووین." جارێکی دی پێی گوت: "پیاو نابێ هەرگیز درۆبکات. یەکێك لە تایبەتمەندیە زۆر باشەکانی هونەر ئەوەیە کە ڕێگە نادات درۆبکەیت. دەتوانی لە عەشقا، لە سیاسەتدا، لە پزیشکیدا درۆبکەیت، دەتوانی خەڵکی و تەنانەت خوداش فریوبدەی — نموونەی ئەمە زۆرە — بەڵام لە هونەردا ناتوانی درۆ بکەی، تۆ تەمەشا، خەڵکی، لە سەرووی هەموویانەوە تولستۆی، بەوە من تۆمەتباردەکەن، کە تەنیا دەربارەی بابەتێن سواو و ئاسایی دەنووسم، قارەمانانی ئەرێنیم نیە: شۆڕشگێران، خەڵکانی وەکو ئەسکەندەری مەقدونی، یان سەرانی ڕاستگۆ و پیاوانەی پۆلیس، وەکو ئەوەی لای لیسکوف هەیە. ئاخر من ئەمانە

لەکویٚ بێنم؟ شتی لەمە باشتر شك نابەم! ژیانی ئێمە، ژیانی لادێیانەیە. شەقامی شارەکانمان، قیڕتاونیە، گوندەکانمان هەژارن، خەڵکەکەمان شڕۆڵە و شەپڕێون. تا گەنجین هەموو وەکو چۆلەکەی سەر گوفەکان بە جۆش و خرۆشەوە دەجریوێنین، لە چل ساڵیدا، ئیدی پیرین و بەرەبەرە بیر لە مردن دەکەینەوە، قارەمانی چین؟"

ساڤا مورۆزوف، بەرلەوەی سەفەربکات، بڕیاری دا ئەو قوتابخانەیەی کە خەریك بوو لە موڵکەکەی خۆیدا دروستی دەکرد، بە نێوی چیخوفەوە ناوبنیٚ. بەڵام چیخوف، لە ڕۆژی ڕێوڕەسمی کردنەوەی قوتابخانەکەدا هێندە بیٚ هێز و بێتاقەت بوو، کە ناچاربوو لە هۆڵی پێشوازی دا، لەسەر تەختێك پاڵ بکەویٚ و بە پاڵکەوتنەوە پێشوازی میوانان و نوێنەرانی ئەهلی و فەرمی بکات. وەکیل و پێشکاری مورۆزوف بەو بۆنەیەوە و بە خۆشی نووسەری ناودارەوە وتارێکی پێشکەش کرد. کە لە وتارەکەی بووەوە، نیگایەکی سەراپای کرد و بە شێنەیی وتی: "دوگمەی پانتۆڵەکەت دانەخستووە!" خەڵکەکە هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا. چیخوف زۆر خۆشحاڵ بوو، کە بەو شێوەیە، فەرمیەتی بۆنەکەی، کە زۆری پیٚ قورس بوو، ڕەواندەوە.

تیخونوفش، وەکو گۆرکی شیفتە و دڵبەندی سادەیی ئەم ئینسانە بەناوبانگە بوو کە وەکو هاوتایەکی خۆی ڕەفتاری دەگەڵ ئەمدا دەکرد. شیفتەی ئەو ئازایەتی و سەبر و حەوسەڵەیە بوو کە لە هەنبەر ئەو نەخۆشیەدا هەی بوو. نەخۆشیەکە تەواو کەسیرەی کرد بوو، سینگی بە ناوا چووبوو، ڕەنگی زەرد بووبوو، ڕدێنی بۆز بووبوو. کڵاوەکەی بەدەم ڕێوە تا سەرچاوی دەهات. وەکو پیرەمێردان، هەنگاوی بچووکی دەنا، هێدی هێدی ڕێی دەکرد، ناوبە ناو دەوەستا تا نەفەسیٚ تازە بکاتەوە. هەمیشە، دەبەیەکی چکۆلەی چەرمپۆشی بە شانی چەپیەوە هەڵدەواسی و تا سەر ڕانی دەهاتە خواریٚ، هەرکاتیٚ کۆکە بیگرتایە قەپاخە نیکەڵەکەی دەبەکەی دەکردەوە، ڕووی وەردەگێڕا، لیکاوێکی خوێنامێزی دەتفانە دەبەکەوە. ئەوسا نەفەسی تازە دەکردەوە، چاویلکە زەڕەبینەکەی ڕێك دەخستەوە و هەوڵی دەدا پێبکەنیٚ.

ژوورەکەی تیخونوف، بە تەنیشت ژوورەکەی چیخۆفەوە بوو. شەوێك لە دیوارەکەوە گوێی لە کۆکەیەکی زۆر توند دەبیٚ کە ناڵە ناڵێکی لە پەستا و بێبڕانەوەی بە دوودا دیٚ. تیخونوف، هەراسان و شپرزە، بە پێی خاوس و کراسی خەوەوە، بە پەلە ڕادەکات، دەرگا دەکاتەوە، لەبەر ڕۆشنایی مۆمێك چیخوف دەبینیٚ کە لە سەرلا، لە سەر جێگاکەی پاڵکەوتووە و سەری لە تەختەکە هێناوەتە خواریٚ. دەهەژی ئەمما هەژان، دەگەڵ هەر هەژانێکدا بڵقی خوێن لە دەمیەوە دەردەهات و دەرژایە ئەو بەڵغەمدانە سەدەفە شینباوەوە کە بە دەستیەوە گرتبوو. تیخونوف گوتەنی "وەکو شووشەیەك سەر بەرەوخوار بیگری و برژیٚ بەو ئاوایە خوێنی لە زار دەرژا" تیخونوف، بە ناوی خۆیەوە گازی کرد. هەنگیٚ چیخوف، سەری نایەوە سەر بالیفەکەی، بە دەستەسڕێك، ڕیش و سمێڵە خوێناویەکەی سڕی، چاوی بەرەو دەنگەکە هەڵبڕی. تیخونوف پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "هەنگیٚ، لە بەر تیشکی زەردی مۆمەکە، بۆ یەکەمجار، چاوانیم بەبیٚ چاویلکە بینی. چاوەکانی درشت، بیٚ جوڵە، نەرم عەینی چاوی منداڵێك." پێدەچیٚ

هەوەڵجار تیخونوڤ نەناسیبێتەوە. بەڵام دوای یەك دوو ساتێك، وەخۆ دێتەوە و لە بن لێوانەوە دەڵێت: "خەوم لێحەرام کردیت... بمبورە گیانەکەم..." (بڕوانە: یاداشتەکانی تیخونوف.)

دوای چەند ڕۆژێك چیخوف، کەمێك باش بوو و بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە. هەرکە گەییشتەوە مۆسکۆ، دیسان کەڵکەڵەی سەفەری کەوتە سەر، ئەمجارەیان دەگەڵ ئۆلگادا، کە پێدەچوو چاك بووبێتەوە. دایکی ستانسلافسکی، دەعوەتی کردن بۆ هاوینەوارەکەی خۆیان لە لیوبیموڤکا، شارە دێیەکی نزیکی مۆسکۆ بوو. ڤێلاکەی کە بۆ چیخوف و ئۆلگا دانرابوو، لە ناوەندی گوندێکی جوانی پڕ دار و درەختی زەلام بوو. ڕوبارێك لە چەند مەتری ڤێلاکەوە، بە ناو مۆڵکەکەدا دەڕۆیی، هەرچەندە خەڵك و میوانی تریشی لێبوون، ئەگەر ئەم جووتە هاوسەرە بیان ویستبا تێکەڵاویان ببن، بەڵام چیخوف و ژنەکەی بەم گۆشەگیریە زۆر ڕازی و خۆشحاڵ بوون. چیخوف لە نامەیەکیا (١٩٠٢/٧/١٨) بۆ ستانسلافسکی کە لەو سەردەمەدا سەفەری هەندەرانی کردبوو، لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەوا خۆشە، ڕوبارەکە جوانە. ئێمە عەینی کەشیشان هەر خەریکی خواردن و خەوتنین. لە کانگای دڵەوە سوپاسگوزار و منەتباری تۆم. زۆر دەمێکە هاوینە پشووی وا خۆشم بەسەرنەبردووە. هەموو ڕۆژێ دەچمە ڕاوەماسی. ڕۆژی پێنج چەلان دەچمە ڕاوەماسی. دەسکەوتی ڕاوەکەمان خراپ نیە (دوێنێ ماسی سوفمان خوارد). نازانم چۆنت بۆ باس بکەم کە دانیشتنی ڕەخی ئاوان چەند خۆشە. بە کورتیەکەی هەموو شتێك بە دڵی ئێمەیە. هیچ گرفتێکمان نیە تەنیا ئەمە نەبێ کە من تەمەڵم و هیچ کارێك ناکەم. هێشتا دەستم بە نووسینی شانۆنامەکەم نەکردووە. جاریێ هەر بیری لێدەکەمەوە." ئەم سەفەرە هاوینەیەیان تا ١٩٠٢/٨/١٤ خایاند. لەم ڕۆژەدا چیخوف بڕیاری دا بە تەنیا بۆ یاڵتا بگەڕێتەوە، چونکە ئۆلگا ناچاربوو، دیسان بۆ پڕۆڤە بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ. ئولگا لەوە پەست بوو کە چیخوف تەنانەت پێشنیازی نەکردبوو کە تا قرم لەگەڵیا بڕوات. ئولگا، گومانی ئەوەی هەبوو کە ماریا داوای لە چیخوف کردبێت، کە بە تەنیا بۆ یاڵتا بگەڕێتەوە. بۆیە نامەیەکی بۆ ماریا نووسی بوو و داوای ڕوونکردنەوەی لێکردبوو، نامەکەی دایە دەست چیخوف و داوای لێکرد، بەبێ ئەوەی بیکاتەوە بیگەیەنێتە دەست ماریا. گەنگەشەی نێوان ژن و مێرد بەرەبەرە بوو بە قەرقەشە. ئانتون ڕەفزی کرد تاقە یەك ڕۆژی دیکە لەوێندەر بمێنێتەوە. بۆیە بە تووڕەیی ژنەکەی بەجێهێشت، لە دایکی، لە خوشکەکەی و لە خۆی پەست و تووڕەبوو.

کە لە ١٩٠٢/٨/١٦دا گەییشتەوە یاڵتا، یەکەم نیاز و مەبەستی ئەوەبوو، ناکۆکی و ناتەبایی نێوان ئەندامانی خانەوادەکەیان نەهێڵێ و هەموویان ئاشت بکاتەوە. بەڵام ماری کە نامەکەی ئۆڵگای خوێندەوە زۆری پێناخۆش بوو. نامەکەی پیشانی براکەی دا. چیخوف یەکسەر نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسی کە: "بۆچی سەرزەنشتی ماریت کردووە؟ بە ڕاستی نامەکەت ناڕەوایە، زۆریش ناڕەوایە. ئەو شتەی دێتە نووسین هەرگیز نایەتە پاککردنەوە: نەخێر ناسڕدرێتەوە. بە شەرەفم کاتێ دایکم و ماریا داوایان کردبوو کە بۆ یاڵتا بگەڕێمەوە، هەرگیز نەیان گوتبوو بە تەنیا بگەڕێمەوە، بە پێچەوانەوە داوایان کردبوو لەگەڵ تۆدا بگەڕێمەوە و هەمیشە ڕێز و میهری تایبەتیان بۆت هەبووە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٨/١٧). و بە ئۆلگای

ڕاگەیاند کە بە نیازە بەو زووانە سەفەری مۆسکۆ بکات. کە هەفتەیەك بوری و هیچ وەڵامێکی لە ئۆلگاوە پێ نەگەیی، دایە باریکان، کەوتە پاڕانەوە: "نازەنین عەزابی ڕوحم مەدە، بە خۆڕایی ئازارم مەدە! با ئاگام لە هاڵ و هەواڵت هەبێ. لێم زیزی، بە ڕاستی نازانم بۆ؟ ئاخر لەسەرچی؟ تێناگەم. لەبەر ئەوەی بەجێم هێشتی؟ خۆ لە هەوەڵی جەژنی پاکەوە دەگەڵتا بووم، بۆ تاقە ساتێکیش لێت دوور نەکەوتمەوە. ئێستاش بەهۆی کار و خوێن هەڵهێنانەوە نەبوایە بەجێم نەدەهێشتی." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٨/٢٤). ئەنجام ئۆلگا هاتە قسان، بەڵام لە جیاتی ئەوەی هێور ببێتەوە، بە توندی کەوتە گلەیی و گازاندە کە ماری هەق نەبوو، نامەکەی ئەو (ئۆلگا) بە ئانتون نیشان بدات و، دایك و خوشکەکەی، ئانتون، کاتێ ئولگا نەخۆش بووە، حەزیان نەکردووە ئانتون بەدیاریەوە بێ. جا ئێستا کە ئانتون ئەوی خۆشناوێ، پێویست ناکات بچێ بۆ مۆسکۆ بۆلای. ئانتون، زۆری هەوڵدا هێوری بکاتەوە، لە ١٩٠٢/٨/٢٧دا نامەیەکی بۆ نارد کە: "مەحاڵە، شتی وا مەحاڵە نازەنین، ئینسان نابێ بێ ئینساف بێ. کە وترا هەق ئاو ڕادەوەستێ، پیاو دەبێ لە حانای هەقا ملکەچ بێ، ملی لە موو باریکتر بێ. بە تایبەتی کە تۆ لەو لایەنەوە کەسێکی میهرەبانی، زۆر میهرەبان، تێگەیشتوو ودڵفراوان. بمبورە لەم سووکە گلەییە گیانەکەم، جارێکی دیکە گلەییت لێناکەم. بە ڕاستی من حەز لەم شتانە ناکەم." بە خەمینییەوە لە سەری دەڕوات: "ئەگەرچی نامەکانت ساردبوونەتەوە، بەڵام من هەمیشە خەیاڵم لای تۆیە و بیر لە تۆ دەکەمەوە، یەك ملیار جار ماچت دەکەم، لە ئامێزت دەگرم. نازەنین، خۆشەویستەکەم، هەر پێنج ڕۆژ و نامەیەکم بۆ بنووسە. خۆ هەرچیەك بێ مێردتم! وا زوو بەجێم مەهێڵە، هێشتا فریای ئەوە نەکەوتووین، وەکو پێویست پێکەوە بژین. هێشتا منداڵێکت بۆ نەخستوومەتەوە، هەر کاتێ منداڵێکت بوو، ئەوسا بە کەیفی دڵی خۆت بکە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٨/٢٧). ئۆلگا ئەمجارەیان زۆر توڕە بوو، بەوە ئانتونی تۆمەتبارکرد کە ڕاستگۆ نیە و هیچ بەلایەوە گرینگ نیە کە جارێکی دی دەگەڵ ئەما (ئۆلگا) بژی یان نا، نامەیەکی توندی بۆ نووسی: "ئەمە تەنیا یەك شت دەگەیەنێ: ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە ماوەیەکی زۆر پێکەوە ژیاوین. ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە لێکدی جیا ببینەوە؟ زۆر باشە، با وابێ." دوای کەمێك دەگەڕێتەوە سەر بابەتی کار و پیشەکەی کە بە بۆچوونی ئەو سەرچاوەی ئاشوب و ئاژاوەی نێوانیان بوو. باشە بە چ ئەقڵێ دەستبەرداری شانۆ ببێ، لە کاتێکا چیخوف بە دەگمەن پێویستی بەو دەبوو؟ بەمجۆرە کۆتایی بە نامەکەی دێنێ: "تۆ دەتوانی لەگەڵ منا بژی و هیچ قسەیەك ناکەیت. جار وا هەبووە هەستم کردووە بارم بە سەرتەوە، پێویستت بە بوونی من نەبووە. پێموایە تۆ تەنیا وەکو قەپاتمەیەك منت دەوێ، بەڵام وەکو بوونەوەرێکی بەشەری، هەستدەکەم تەنیا و بێگانە و لە تۆ دوورم."

پەرەگرافەکانی دیکەی نامەکەی ئۆلگا ئەوەیان دەنواند کە زۆر بە باشی لە تەبع و تەبیعەتی مێردەکەی ئاگاداربوو. بەوە تۆمەتباری دەکرد، لە پشت ڕواڵەتی ئارام و هێمنی ئەوەوە، پیاوێك دەبینێ کە گوێ بە چارەنووسی کەس نادات، خەمی کەسی نیە، هەرگیز لەو شوێنەی کە تیایەتی، لەو ساتەی کە تیایا دەژی ڕازی نیە. بەو نەفەسەوە هەڵسوکەوت دەگەڵ ژنەکەیدا دەکات وەکو ئەوەی شتێك بێ بێگیان، کەم و زۆر گوێ بە هەستە دەروونیەکانی نەدات. کەمترین

غیره لەو شیفتە و دڵبەندانەی نەکات کە بە دەوریا دێن. بەردەوام گلەیی لە زۆری میوانەکانی دەکات و لە ناخیشا خواخوایەتی تێکەڵاویان ببێ.

باری ئەم سەرزەنشت و گلەییانەی ئولگا، لە توانای ئانتون قورستربوو، بەو پەڕی شپرزەیی وەڵامی دایەوە: "باشە کێ پێی گوتوویت کە من ناگەڕێمەوە بۆ مۆسکۆ و، بە یەکجارەکی وازم لە مۆسکۆ هێناوە و پایزی ئەمساڵیش بۆ ئەوێندەر ناڕۆم؟ باشە من بە زمانێکی ڕوون و ڕەوان، بە زمانێکی ڕووسی پوختە بۆم نە نووسیویت کە بێگومان لە مانگی ئەیلولدا دەگەمە لات و تا کانوونی دووەم لەگەڵتا دەمێنمەوە؟ بۆم نەنووسیت ها؟ بوختانی ئەوەم بۆ دەکەیت کە دەگەڵتا ڕاستگۆ نەبووم. تۆ دەڵێی کاتێ نامەکانم دەخوێنیتەوە ڕادەجفریت، وەختی ئەوە هاتووە لێکدی جیاببینەوە، وادیارە تۆ لە من تێناگەیت... پێموایە ئێمە، من و تۆ، لەم مەسەلانە هیچ خەتایەکمان نیە، بەڵکو کەسێکی تر خەتابارە کە ڕەنگە قسەی بۆ تۆ کردبێت و قەناعەتی پێ کردبیت کە باوەڕ نە بە قسەم و نە بە کردارم نەکەیت و حاڵی حازر لە هەموو شتێك بەگومانیت. ئەگەر مەسەلەکە واهی بێ من هیچ دەسەڵاتێکم نیە و هیچ کارێکم پێناکرێت. هەوڵی ئەوەش نادەم بتهێنمە ڕەدا و قەناعەتت پێبکەم کە هەق بە منە، چونکە فایدەی نیە... گیانەکەم، ئازیزەکەم، ئاخر تۆ ژنی منی، کەی لەمە دەگەیت؟ تۆ نزیکترین کەسی لە منەوە، تۆ ئازیزترین کەسی منیت. لە ڕادەبەدەر خۆشم ویستوویت، ئێستاش خۆشم دەوێی. کەچی تۆ خۆت بە قەپاتمە و دلبەرێکی بێگانە و تەنیا وەسف دەکەیت، بە ژنێکی لە من نامۆ... کەواتە خوات لەگەڵ، چۆنت پێخۆشە وا بیربکەوە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٩/١).

ئۆلگا، کەمێك وەخۆ هاتەوە، لەو شەڕ و قەرقەشەیەی نێوانیان ژێوان بووەوە، هەردووکیان بیانووی خۆیان هەبوو، ئیدی بەشەربوون و خۆی گوتەنی بەشەریش شیری خاوی خواردووە. بە هەرحاڵ سوێندی بۆ خوارد کە هیچ کەسێك دژی ئەو هانی نەداوە، بە کورتیەکەی دوای ئەو ماوە خۆشەی کە لیوبیموفکا پێکەوە ڕایان بواردبوو، ئیدی بەرگەی ئەم جودابییەی نەگرتووە. پاشان دان بەوەدا دەنێت کە جارجارێك تووشی ڕەشبینی دەبێت: "کە بەشەرێکی بەدم! شەڕاشۆ، جینگن!... کە بیر لە تۆ دەکەمەوە هەمیشە خۆم وا دێتە بەرچاو لە بەردەمتا بە چۆکا هاتووم و داوای بوردنت لێدەکەم." جا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە بە نیازی ئاشتەوایی گشتیە، بە مێردەکەی گوت بە تاسەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی مارییایە بۆ مۆسکۆ و هەر لە ئێستاوە گوڵی لە ژوورەکەی داناوە.

لە گەرمەی ئەم بگرە و بەردەیەدا، چیخوف بە تاسەوە لە ئولگا دەپرسێت ئایا دکتۆرەکەی ڕێگەی داوە منداڵی ببێت یان نا: "ئاهـ! نازەنین، ئازیزەکەم، خەریکە درەنگ دەبێ! تا منداڵەکەمان دەبێ بە ساڵ و نیوێك، من ڕدێنم پاك سپی دەبێت، قژ بە سەرمەوە نامێنێ، دان لە دەمما نامێنێ." (بڕوانە نامەی ١٩٠٢/٩/١٠). ئولگا وەڵامی دەداتەوە کە بە قسەی پزیشك عەیبی نەماوە. لەسەری دەڕوات: "خۆشحاڵی؟ ساڵێکی دی منداڵێکی قشتیلەی جوانت پێدەبەخشم."

چیخوف، ویڕای ئەو شەڕە نامانەی ئەو دواییانەش، پێی ناخۆش نەبوو هاوینەکە لە یاڵتا، دەگەڵ دایکی و خوشکەکەیا بەسەر بەرێ. ئەمان، واتا دایکی و خوشکەکەی، گلەیی ئەوەیان لێنەدەکرد کە وەکو زگورتی دەژی، وازیان لێدێنا بە کەیفی خۆی نان بخوات، بەوپەڕی میهر و سۆزەوە بە دەوریا دەهاتن. لە ٩/١دا سوڤورین سەری دا، بە دوو قۆڵی یادێکی زۆری ڕابردوویان کردەوە. چیخوف هەرچەندە ئیرادی لە سیاسەتی (ڕۆژگاری نوێ) دەگرت، بەڵام چاکە و پیاوەتی سوڤورینی وەکو بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی، هەر لەبەرچاوبوو. وەختێ سوڤورین ڕۆیی، چیخوف لە پاشملەی نەگوت، بە پێچەوانەوە لە لای سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی لۆکاڵ بە نێوی پریڤوکین، زۆری داکۆکی لێکرد: سوڤورین، سەرباری هەموو هەڵەکانی، یەکەم کەس بوو کە هەقدەسی ڕۆژنامەڤانانی زیاد کرد، هەلومەرجی کاری بۆ باش کردن، کۆمەکی زۆر نووسەری دەسکورتی کردووە و بەشداری لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کردووە. هەڵبەتە داکۆکی کردنی چیخوف لە بابایەکی کۆنەپەرستی وەکو سوڤورین، بەو مانایە نەبوو کە داکۆکی لە دەسەڵاتی ڕۆژ بکات. بە پێچەوانەوە لە دەسەڵاتی وەخت بێزاربوو. کە لە ١٩٠٢/٩/١٨دا بە مەرگی زۆلای زانی، بۆ ئۆلگای نووسی: "ئەمڕۆ غەمگینم: زۆلا مردووە، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، شتێکی خراپ بوو، بە تایبەتی لەم کاتەدا! من وەکو نووسەر، قەت شیفتەی نەبووم، بەڵام وەکو ئینسان زۆرم خۆشدەویست، ڕێزی تایبەتیم بۆی هەبوو، بە تایبەتی لەو ساڵانەی دواییدا کە دۆزی دریفوس هەرا و هەنگامەیەکی زۆری نایەوە."

لەم سەر و بەندەدا، مەسەلەیەکی دیکەش هەبوو کە بیری چیخۆڤ مژوول دەکرد: "مەسەلەی" گۆرکی، دوای ئەوەی چەند مانگێك چاوەڕوانی کرد کە فەرمانی دەرکردنی گۆرکی لە ئەندامیەتی ئەکادیمیا بە فەرمی هەڵبوەشێتەوە و دووبارە بە ئەندامی ئەکادیمیا هەڵبژێردرێتەوە، سەیری کرد، شتی وا لە ئارادا نیە. بیری کردەوە کاتی ئەوە هاتووە لە هەنبەر بێدادی حکومەت سەبارەت بە ئەدەبیات، هەڵوێست بنوێنێ. بۆ یەکەمجار هەستی کرد لە ڕووی ئەخلاقیەوە، لە سەرێتی خۆی لە سیاسەت هەڵقورتێنێ. لە ١٩٠٢/٨/٢٥ ئیستیقالە نامەکەی بۆ ئەلساندر فاسیلوڤسکی، بەڕیوەبەری بەشی ئەدەبیاتی ئەکادیمیا نارد. چیخوف لە ئیستیقالە نامەکەیدا، ئاماژەی بەو هەڤدژیە کردبوو کە ئەکادیمیا تێی کەوتبوو، لە لایەکەوە گۆرکی بە هەڵبژاردنی ئازاد، بە ئەندام وەرگرتبوو و لە لایەکی دیکەوە بە فەرمانێکی فەرمی لە ئەندامیەتی خستبوو، گوتبووی چونکە ئەمیش ئەندامێکی ئەکادیمیایە، مانای وایە شەریکی ئەو فەرمان و بڕیارەیە ( یانی ناکرێ لە هەوڵەوە پیرۆزبایی وەرگرتنی لێکردبێت و ئێستاش بڕیاری دەرکردنی بدات.) ئیدی بەوە کۆتایی بە ئیستیقالە نامەکەی هێنابوو: "ناتوانم لە ڕووی ویژدانیەوە ئەم هەڤدژیە قەبووڵ بکەم. دوای ڕامان و بیرکردنەوەیەکی زۆر، هیچ چارێکم نەما جگە لەوەی ئەم بڕیارە دژوار و ناخۆشە بدەم، کە بەڕێزەوە داواتان لێبکەم کە لە ئەندامیەتی ئەکادیمیا مەعافم بفەرموون." ڕۆژی پێشتر، ڕەشنووسی ئەم ئیستیقالە نامەیەی بۆ کورولینکو – کە ئەویش ئیستیقالە نامەی خۆی ئامادە کردبوو – ناردبوو بەم شەرحەوە: "ئەمە ئیستیقالە نامەکەمە. ماوەیەکی زۆر بە نووسینییەوە

بووم. دنیا زۆر گەرم بوو، نەمتوانی شتێکی لەوە باشتر بنووسم. خۆ ڕەنگە ئەگەر ویستباشم شتێکی باشتر بنووسم، هەر نەمتوانیبا."

ئیستیقالە نامەکە، لە چەندین ڕۆژنامەی نهێنی و تەنانەت لە هەندەرانیش بڵاوبووەوە. گەلێك لە ڕۆشنبیرانی ڕووس دەستخۆشی ئەم بڕیارە بوێرانەیان لە چیخوف و کورولینکۆ کرد. چیخوف لە ئەندامیەتی ئەکادیمیا نەما، بەڵام زۆر لە جاران پتر ناوبانگی دەرکرد.

جەماوەر و لایەنگرانی، چاوەڕوانی بەرهەمی تازە و درەخشانیان لێدەکرد، زۆری لە دڵ گران بوو کە نەیدەتوانی ئاواتەکەیان بێنێتە دی. هەستی دەکرد بەرەو کۆتایی دەڕوات، ماندووبوو، بێ توانا بوو، هیچی لە هەگبەدا نەبوو. ئۆلگا، لە مۆسکۆوە گوشاری لێدەکرد کە دەقی شانۆنامەکەی تەواو بکات. بە هەمان داواو پێداگری دایکانەوە ئەمەی دەکرد کە داوای لێدەکرد ڕۆن گەرچەکەکەی بخوات، یان سەری بشوات. ئۆلگا بە ڕازی داهێنانی نەدەزانی، پێی وابوو نووسەر هەر ئەوەندەی لە سەرە لە پشت مێزەوە دانیشێت، کاغەزێکی سپی بخاتە بەردەمی خۆی، هەنگێ وشە خۆبە خۆ لە نووکی قەڵەمەکەیەوە دەڕوێ و شکۆفە دەکات. نەمیرۆفیچ – دانچنکۆ و ستانسلافسکیش بە هەمان ئەقڵیەتی ئۆلگاوە چیخۆفیان بەگیر دێنا و پێ داگرییان لێدەکرد. چیخۆفیش، بەوە باکانەی بۆ خۆ دەکرد کە: "بێتاقەتە، هیچ هاندەرێکی ڕوحی نیە، متمانەی بە هێزی داهێنانی خۆی نەماوە. لەبەر میوان نای پەرژێ سەری خۆی بخورێنێ... جا بۆ ئەوەی دڵخۆشی خۆی بداتەوە کە هێشتا لە بەرهەمهێناندا بەردەوامە، هەستا پێداچوونەوەیەکی بە مۆنۆلۆگێکی چەند لاپەڕەیی خۆیدا، بە ناونیشانی "زیانی جگەرەکێشان" کە لەساڵی ١٨٨٥ دا نووسی بووی، کردەوە. ئایا ئەمە سەرەتای ئیفلاسی کاری نووسینی ئەو بوو؟ بە لای خۆیەوە، نەخێر. سبەی، بەڵێ سبەی هەمان بەهرە و توانای جارانی دەژێتەوە. خەریك بوو بەرەبەرە ژیانی ڕۆژانەی لەبەرچاو دەکەوت. هەروەها تەمەن و نەخۆشی لە خەڵکیان دوور خستبووەوە. هەستی دەکرد پێویستی بەوە نیە دڵی بۆ کەس بکاتەوە، تەنانەت بۆ ئۆلگاش. بە زۆری خۆی لە دۆستەکانی دوور دەگرت، ئیدی ئەم دووری و دوورە پەرێزییە بووبوو بە دابڕان. چەند بە ڕواڵەت ڕووخۆش و خۆش مەشرەب بوو، ژێراوژێر دوو ئەوەندە لە بەرانبەرەکەی دڕدۆنگ بوو. لە یەکێك لە دەفتەری یاداشتەکانیا نووسیویەتی و دەڵێت: "وەکو چۆن لە گۆڕەکەما بە تەنیا دەبم، لە ژیانیشیا بەو ئاوایە بە تەنیا دەژیم." بونین، کە لەو سەروبەندەدا زۆر چاکی دەناسی و تێکەڵاوی بوو، لە بارەیەوە دەڵێت: "هیچ کەسێك، تەنانەت ئەوانەش کە زۆر لیوەی نزیك بوون، بە تەواوەتی نەیاندەزانی چی لە دڵ و دەروون و ناخیایەتی. هەمیشە بەسەر خۆیا زاڵ بوو، تەنانەت لە خۆمانەترین گفتوگۆماندا بە تەواوەتی نەدەکرایەوە، بەردەوام دەگەڵ هەمووواندا ناسك و ڕووخۆش بوو، خۆ دەگەڵ هەندێکدا زۆر میهرەبان و بە لوتف بوو. بەڵام هەمیشە مەسافەیەکی لە بەینی خۆی و هەر یەکێك لەوانەدا دەهێشتەوە... تۆ بڵێی لە ژیانیا ئاشق بووبێ، ئەشقێکی ڕۆمانسی، کوێرانە؟ باوەڕ ناکەم." بونین، پێی سەیر بوو، خەڵکانێك هەبن، بتوانن باسی لوتف و میهر و، خەم و خولیا و گەرم و گوڕی مرۆڤانی چیخۆف بکەن، لەو بارەیەوە دەڵێت: "وا لە بەر چاومە کاتێ کە تەعلیقێ لەمەڕ میهری خۆی دەخوێنێتەوە

چۆن بیردەکاتەوە. هەڵبەتە زۆر لەوە بێزار بوو کە بەرەو ڕوو ستایشی گەرم و گوڕی مرۆڤانی و خەمەکانیان بکردایە!" هەست و نەستی سارد و سڕ و خەمساردانەی پزیشکێکی دیار نەخۆش لە هونەرەکەی چیخوفدا بەدی دەکرێت. گۆرکی زۆر بە باشی پەی بەمە بردبوو و لە نامەیەکیا ٢٠ – ٣٠/ت٢/١٨٩٨ بۆ چیخوف، دەربارەی "لالۆڤانیا" بە باشی ئەو نیشانەیەی پێکاوە و دەڵێت: "تۆ بە ساردیەکی ئیبلیسانەوە مامەڵە دەگەڵ خەڵکیدا دەکەی، خەم سارد و بێ موبالاتی وەکو بەفر، وەکو بۆران، وەکو عەزاب." سیرگینکۆی دۆستی دڵسۆزی منداڵی و قوتابخانەی، وا باسی چیخوڤ کردووە، هەرچەندە دۆستی زۆر بوون "بەڵام بە خۆی دۆستی هیچ کەسێك نەبووە، یانی بە حەیاتی لەگەڵ هیچ کەسێکدا هێندە تێکەڵاو نەبووە کە خۆی لە بیربکات."

بەمجۆرە، لە هەمان کاتا کە لە هەنبەر خەڵکیدا کراوە و ڕووخۆش بوو، خێرا بە هانای خەڵکانی ئاتاج و لێقەوماوەوە دەچوو، بۆ چاکە سەری پێوە نەبوو، لە کاتێکا بێ دریغ کۆمەکی نووسەرانی گەنج و مامۆستایانی هەژار و سیلدارانی دەستکورتی دەکرد، بەڵام لەو کەسانەش نەبوو، کوێرانە و بێ چەند و چوون خەڵکی خۆش بوێ... بایەخدانی بە خەڵکی لە جۆرە خۆ نوێنییەك بەدەر نەبوو. کەسێکی سەرناس و دروست مەزەندە بوو، بە چاو تروکانێك نەفسیەتی خەڵکی هەڵدێنا، بەڵام ئەوە نەبوو بەردێکی لەسەر دابنێ و لە بنەبانی دڵ و دەروونی خۆیدا بینێژیت و بڕێتەوە، بەڵکو لە قارەمانی چیرۆکەکانیا زندووی دەکردەوە. دوو چاوی تیژ و سەرێکی سارد و ئارامی هەبوو، لە تۆ وایە لە تونگەیەکی بلوورا دەژی. تەنانەت ئەوانەی کە وایان دەزانی، دەماریان ناسیوە، درەنگ یان زوو بۆیان دەردەکەوت کە لەمپەرێکی تەنك و تیواڵ، لە نێوان ئەمان و ئەودا هەیە. لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، هەم لە خۆشی گەورە و هەم لە خەم و ئازاری گەورە خۆی دوور دەگرت. یانی میانڕەو بوو. تاقە خولیا و کەڵکەڵەی ئەو، هونەر، ئەدەبەکەی بوو. کە دەکەوتە نووسین، ئیدی زەمەن لەلای ئەو لە سوڕانەوە دەوەستا. کاتێکت دەزانی لە بۆشاییەوە، چەندین لاپەڕەی پڕ لە نووسین پەیدا دەبوو، کۆمەڵێك قارەمانی تازە و چیرۆکێکی نوێ دەهاتە ئاراوە. بە ڕاستی ئەم شتە لە پەرجوو دەچوو! بەڵام وێڕای ئەو هەموو شۆرەت و ناوبانگەش کە هەی بوو، هەرگیز خۆی بە شتێکی گەورە و نائاسایی نەدەزانی. لە کاتێکا لە هەر لاف و گەزافێکی خەڵکی دیکە بێزار بوو، نەیدەتوانی، لە هەڕەتی شۆرەت و لە لوتکەی سەرکەوتنی خۆیدا، سنووری توانا و بەهرەی خۆی فەرامۆش بکات و بەخۆی بنازێ. هەڵبەتە ئەم میانڕەویەی لە تەوازع و بێ فیزی یان ملکەچیەوە نەبوو، بەڵکو لەوەوە بوو کە خاوەنی زەینێکی ڕۆشن و پەروەردەیەکی باش بوو. بەردەوام دەستی لە چیرۆك و شانۆنامەکانیا بوو، تەتەڵە و بژاری دەکردن، شێوازی دەگۆڕین، سیقاڵی دەکردن و دەیخەملاندن، بەڵام هەرگیز باوەڕی بەوەش نەبوو کە ئەم بەرهەمانە نەمر بن و لە دوای خۆ بمێنن. بونین، لەمبارەیەوە دەڵێت: "هەرچەندە چیخوف لە ئەدەبیاتدا گەیی بووە پێگەیەکی بەرز، بەڵام خۆی هەستی بەمە نەدەکرد." کوپرین دەڵێت: "کەس نەبوو، لەگەڵیا دانیشێت و هەستی بە گەورەیی توانا و بەهرەی ئەو و بچووکی خۆی لە حانای ئەودا نەکات."

چـــیخوف کـــە خـــەریکی پێداچـــوونەوە و ڕاســـتکردنەوە و هەڵـــەبڕی بـــەرگی شەشـــەمی کۆبەرهەمەکـەی دەبێـت، کـە قـەرار بـوو لـە سـاڵی ١٩٠٢ دا چـاپ و بڵاوببێتـەوە، گەییـە ئـەو ئەنجامـەی، کـە پرەنسـیپ و بنـەمای بنـەڕەتی بەرهەمـەکانی، لـە سـەرەتای نووسـینییەوە و بـە درێژایی ژیانی لـە بواری نووسـیندا، وەکو خـۆی ماوەتـەوە. ئـەم پرەنسـیپ و بنەمایانـەی بریتی بوون لـە سادەیی، ڕاسـتگۆیی، وەسفی ورد و جوان، بێ لایـەنی و دەس وەرنـەدانی نووسـەر لـە دەقـی چیرۆکەکان، چونکە ئەگـەر داشـداری لـە قارەمانـەکانی بکردایـە، یـان چارەسـەری بـۆ ئـەو کێشانە بدۆزیباوە کە لـە نـاو چیرۆکەکەدا ڕوو بـە ڕوویـان دەبـووەوە، چیرۆکەکە لـە هونەریـەت دەکەوت و هیچی بـۆ خوێنـەر نەدەهێشتەوە. خوێنـەر دەبێ بە خـۆی و لـە ڕێگـەی خوێندنـەوەی خۆیـەوە و بەوپـەڕی ئـازادی دەقـی چیرۆك هەڵسـەنگێنێ و داوەری بکـات و بگاتـە ئـەنجامگیری دڵخـوازی خـۆی. چـیخوف تـا زیـاتر دەچـووە تەمەنـەوە، قەناعـەتی زیـاتری لا چـێدەبوو کـە ئەدەبەکەشـی وەکـو ژیانیـەتی. نـە ڕووداوی گـەورەی تیایـە، نـە دەسـتەواژەو ڕسـتەی قەبـە و بـە ئاهـەنگ و ئـاواز، نـە هەڵوێسـتی پاڵەوانانـەی تیایـە، بـەڵکو مۆسـیقایەکی تیایـە هێـدی و هـێمن، ڕاستگۆ، گـەرم و گـوڕ، کاریگـەر و هەنـدێ لایـەنی تاریك و چـەن پرسـیارێکی بـێ وەڵـام، سـووکە بێهوودەیی بوونیژیانی ڕۆژانە، کە شەپۆل بـە شـەپۆل ڕامـان دەمـاڵی و لـە دوا چاڵ و بۆشـاییمان نزیك و نزیکتر دەخاتەوە. هەڵبەتە شانۆنامەکانیشی، وەکو ستانسلافسکی تەسەوری دەکرد، بۆ گریاندنی جەماوەر نەبوو، بەڵکو زیاتر بۆ هاندانیان بوو کە لە وەزع و حـاڵی بەشـەری وردبینـەوە لەو بارەیەوە بە تیخونوف دەڵێت: "ئەوەی من دەمویست ئەوەیە ڕاستگۆیانە بـە خـەڵکی بڵێم: تەمەشای خۆتان بکەن، بڕوانن چ ژیانێکی خراپتان هەیە، گرینگ ئەوەیە خەڵکی بەمـە بزانن، کـە بە تەواوەتی ئـەوەیان زانـی، هـەنگی بـۆ خـۆ ژیـانێکی باشتر دادەهێـنن. مـن نـایبینم، بـەڵام دەزانم هـەموو شتێك دەگۆڕێت. هـیچ شـتێك وەکـو ژیـانی ئێسـتای ئێمـە نـامێنێ." هـەمان بیرۆکـەی لـە دەفتەری یاداشتەکانیا، بە شێوەیەکی کەمێك جیاوازتر تۆمار کردووە: "ئینسان کە خۆی ناسی، خۆیمان پێ ناساند، حەقیقەتی خۆیمان پێ ناساند، هەوڵدەدات باشتر ببێ."

هەرچەندە، دڵ خۆشی خـۆی بـەو جـۆرە بیرکردنەوەیـە، دەدایـەوە، تاقە ئومێـدی ئـەو ئـەوەبوو، بـەڵام هـەرگیز لەگـەڵ ئـەوەدا نـەبوو، کـە ئـەم ئاواتـە لـە ڕێگـەی شۆڕشـی سیاسـیەوە بێتـە دی. قارەمانـەکانی وەکـو خـەونێکی دڵخۆشـکەر باسـی ئـەم ئاواتـە دەکـەن، وەکـو خـەونێکی بڕێـك ناماقوڵیش. ئەوەتا سەرهەنگ ڤرشینین لـە (سێ خوشك)دا دەڵێت: "ژیـان سـەختە، لـە ڕوانگـەی زۆربەمانەوە، وەستاوە، هیچ ئومێدێکی لێناکرێ، بەڵام وێڕای ئەمەش دەبێ دان بەوەدا بنەین کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاسانتر و ڕوناك تر دەبێ، بە گوێرەی قەرینـە و نیشـانەکانیش ئـەو ڕۆژە ڕوناکـە دوور نیە."

جا بە ئومێدی ئـەو ڕۆژە، دەبوایـە ڕووسیا وەکـو خـۆی، بـە تـزار و بیرۆکراتیـەت و بـە پۆلیسـی یەوە قەبووڵ بکرێت. چیخوف بە قەناعەتەوە، لـەو بارەیـەوە دەڵێت: "لـە هـیچ شـوێنێکی دنیـادا، دەسەڵات، ئەم زەبر و زەنگە بە کار ناهێنێ، کە لای ئێمـەی ڕووس بـە کـار دەبرێ، وێـڕای ئـەوەی کۆیلایەتی سووك و ڕیسوای کردووین، لە ئازادی دەترسین."

بیری لەوە دەکردەوە لە شانۆنامەی ئایندەیدا کە دەمێ بوو پێوە بوو بینووسێت، ئەم ملکەچی و بێ هەڵوێستیە نیشتمانیە وەکو خەسڵەتێکی دیاری ڕووسی بەرجەستە بکات. بەڵام هەستی دەکرد، تا لە یاڵتادا بێ هەرگیز ناتوانێ بینووسێت: پێویستی بە مۆسکۆ و بە ئۆلگا، بە ڕوناکی و چرای پرشنگداری شانۆ بوو، تا زەوقی ژیان و کاری لا دەمەزەرد بکەنەوە. دکتۆر ئالتسشولەر، کە لەسەر داوای چیخوف چووبوو بۆ یاڵتا تا معایەنەی بکات، پاش ئەوەی لە ١٩٠٢/٩/٢١دا معایەنەی دەکات، دڵی نایەت سەفەرەکەی لێ قەدەغە بکات. چیخوف ڕۆژی دوایی، یانی لە ١٩٠٢/٩/٢٢دا نامەیەك بۆ ئۆلگا دەنووسێت کە: "پێی وایە حاڵم تاڕادەیەکی باش، باش بووە. نەخۆشیەکەم لە بەهارەوە بەرەو باشی چووە، ئەو دەرمانەی بۆی داناوم، کاری خۆی کردووە. ئەوەندە باشم کە ڕێگەی داوم سەفەری مۆسکۆ بکەم. بەڵام دەڵێت نابێ ئێستا سەفەر بکەم، دەبێ تا هەوەڵی سەهۆڵبەندان چاوەڕوان بکەم. ئیدی بەو زووانە یەکدی دەبینین گیانەکەم!" دوای دوو ڕۆژ، لە ١٩٠٢/٩/٢٤دا بۆی دەنووسێت: "لە ئێستاوە لە بیرت بێ سەگە چکۆلەکەم، کە هاتمە مۆسکۆ، شووشەیەك عەتری (هوبنیان)، شووشەیەکی گەورە دەکڕین، یان دوو، سێ شووشەی چکۆلە دەکڕین بۆ ئالتسشولەری دەنێرین... لە مۆسکۆ هیچ شتێك ناکەم جگە لە خواردن و خواردنەوە و خەوتن و نەوازشی ژنەکەم و چوونە شانۆ و خەوتن لە کاتی دەست بە تاڵیدا. قەرارم داوە ببم بە پێڕەوی ئەپیکۆر."

ئۆلگا، بە شەوق و زەوقی نۆبووکانەوە وەڵامی دایەوە: "ئانتوشا، کوڕە چکۆلە ئازیزەکەم، کەواتە بەم زووانە پێك دەگەینەوە؟ ئۆخەی! دووبارە دەتوانین بە خۆشی و ئومێدەوە بژین، شتەکان وەکو جاران تاریك و لێڵ نابن. ماچت دەکەم، خەنی لەو چاوانەی کە تەمەشای تۆی پێ دەکەم، لە سەراپات ورد دەبمەوە، ئەی مێردە جوانەکەم!"

بەمجۆرە، چیخوف بۆ ئەوەی دایکی بەتەنیا لە یاڵتا نەمێنێتەوە، ناردی بۆ لای میخائیلی برای لە پترسبۆرگ. ماریاش لەگەڵ دایکیا چوو بۆ پایتەخت، چونکە دوای ئەو سووکە دەمبۆڵەیەی هاوینیان حەزی نەدەکرد. بچێتە مۆسکۆ و لە هەمان شوقەدا دەگەڵ ئولگا و ئانتوندا بژی.

ئەنجام، چیخوف لە ١٢/ت١٩٠٢/١دا باروبنەی پێچایەوە. بە پاڵتۆیەکی تەنکەوە بە قیتار بەرەو مۆسکۆ وەڕێکەوت: قەرار بوو ئۆلگا، ئەگەر دنیا سارد بوو، پاڵتۆ فەروە ئەستوورەکەی لەگەڵ خۆدا بۆ بێنێ. گوتبووی دەواودەرمانی بۆ ئامادە کردووە: ڕۆن ماسی و کریوزوت. هەروەها قەولی دابوو بەو بۆنەیەوە پێکێ بیرە و حەمامێکی گەرمی بۆ ئامادەبکات.

دیداری مۆسکۆ و ئۆلگا بۆ چیخوف خۆشیەکی دوو چەنانە بوو، دەمەزەرد کردنەوەی خۆشەویستی هاوبەش بوو. بە تاسەوە کەوتە گەشت و گەڕان، خۆی بە فرۆشگایاندا، بە خوارنگە، بە شانۆیاندا دەکرد. شالیاپین، دیاگیلیف، روسولیمۆ، بونیف، سوڤورین و گۆرکی، کە پرۆڤەی یەکەمین شانۆنامەی ئەو: "قوڵایی = Lower Depths" لەسەر شانۆی هونەر، دەکرا. دیکۆراتی تازەی شانۆی ناوبراوی بە دڵ بوو، بە تایبەتی کە شانۆکە و کابینەی خۆگۆڕینی ئەکتەرەکان و لۆجەکان، زۆر سادە و هونەریانە ڕێکخرابوون. چووە تەماشای پرۆڤەی شانۆنامەیەکی تولستۆی بە ناونیشانی "هێزی تاریکی" و نمایشی تازەی "لالۆڤانیا" و "سێ

خوشك"ی بینی. هەستی كرد نمایشی ئەمجارەیان زۆر بێ عەیب بوو. بەڵام ئەم زنجیرە هەستە جۆراوجۆرە زوو ماندوویان كرد. دووبارە كەوتە كۆكین. دوای شەش هەفتەیەك ناچار بوو بۆ یاڵتا بگەڕێتەوە، بۆ باوەشی هەتاو و تەنیایی و بێزاری بگەڕێتەوە. هاتووچۆی نێوان باكوور و باشوور، گەرمیان و كوێستان، جەنجاڵی و چەلەنگی شار و بێدەنگی و خەمینی گوند، نێوان ژیانی ژن و مێردایەتی و زگورتایەتی، كێشماكێشی نێوان وەهمی ژیان و خۆ ئامادەكردن بۆ مردن، هەر هەموو ئەمانە مێشكیان ماندوو دەكرد. هەركە گەییشتەوە یاڵتا نامەیەكی بۆ ئولگا نووسی كە: "خەم مەخۆ گیانەكەم، كاربكە، بۆ خۆت بگەڕێ، هەر كوێت پێخۆش بوو بڕۆ، بە كەیفی دڵی خۆت بنوو. پڕ بە دڵ حەزدەكەم باش بی، سەلامەت بی! لەم دوا دیدارەماندا، هێندەی دی لە بەرچاوم شیرین بووی، گەورەتر بوویت. لە جاران خۆشترم دەوێی. كە بەبێ تۆ دەچمە جێگاوە و بەبێ تۆ لە جیگا هەڵدەستم زۆرم لە دڵ گرانە، بە ڕاستی خراپ نازدارت كردووم." (بڕوانە نامەی ٣٠/ت٢/١٩٠٢)

هەوای یاڵتا، هێندە سارد بوو، چیخوف نەدەوێرا لە ماڵ وەدەربكەوێ. هەڵبەتە ئیشێكی ئەوتۆیشی لە دەرەوە نەبوو، تا كەڵكەڵەی چوونە دەرەوە بكات. تەنانەت ئەوكاتەش كە نیكۆلای دووەم هات بۆ شار تا بەردی بناغەی كڵێسایەكی تازە دابنێ، چیخوف بەشداری ئەو ڕێوڕەسمەی نەكرد. لە سەرەتای كانوونی دووەما تووشی هەو و ئاوسانی سیپەلاك بوو، ئیدی داوای لە دكتۆر ئالتسشولەر كرد بە بێدەنگی معالەجە و دەرمانی بكات. تاقە شتێك كە بە درێژایی ئەو زستانە دوور و درێژە دڵخۆشی كرد، خەبەری سەركەوتنی شانۆنامەكەی (قوڵایی) گۆركی بوو، كە لە سەرانسەری مۆسكۆدا دەنگی دابووەوە و بووبوو بە داستانی سەر زاران. هەروەها بەم هەواڵەش دڵخۆش بوو كە (نەورەس)ەكە لەسەر شانۆی ئەلكساندرنیسكی پێشكەش كراوە و سەركەوتنێكی گەورەی بە دەست هێناوە، یانی لە هەمان شوێندا سەركەوتووانە پێشكەش كرابوو، كە شەش ساڵ لەوەپێش، دووچاری شكستێكی نەنگین بووبوو. لە گۆڤاری (دنیای هونەر)دا وتارێكی پڕستایشی لەسەر بڵاوكرایەوە كە: "سەركەوتنی نەورەس لەسەر شانۆی تزاری، سەركەوتن بوو نە گاڵتە. ئەم سەركەوتنە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەوەیە كە چیخوف لە بواری شانۆنامەشدا، نووسەرێكی نەك هەر بە توانایە، بەڵكو بووە بە یەكێك لە شانۆنامە نووسە كلاسیكەكان و ئەوەتا یەكێك لە شانۆ دەوڵەتیەكان، بە فەرمی دانی پێدا دەنێ."

سێرگی دیاگیلیف، بەڕێوەبەری "دنیای هونەر"، كە لە ماوەیەكی كەمدا لە بواری هونەرەكانی سەمادا، شۆڕەتێكی زۆری پەیداكرد، زۆری هەوڵ لەگەڵ چیخوفدا دەدا كە بەشداری لە گۆڤارەكەیدا بكات و شتی بۆ بنووسێت. ئەم دوو پیاوە لە یەكێك لە تازەترین دیداری خۆیانا لە مۆسكۆ، گفتوگۆیەكی زۆریان دەربارەی ئایندەی ئاین لە ڕووسیا، كردبوو. كاتێ دیاگیلیف، هەوڵی دا بوو بە نامە و لە میانەی نامەوە درێژە بە هەمان گفتوگۆ بدات، چیخوف بە نامەیەك (٣٠/ك١/١٩٠٢) وەڵامی دابووەوە كە: "با خەڵكی هەرچیان دەوێ بیڵێن، با ئەنجومەن و كۆمەڵێن فەلسەفی – ئاینی جۆراوجۆر دامەزرێن. ئەمە ئەو ڕاستیە ناشارێتەوە كە توێژی

ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگەی ئێمە، لە ئاین دوور کەوتووەتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژیش دوورتر دەکەوێتەوە. هەڵبەتە هەڵسەنگاندنی لایەنێن ئەرێنی ونەرێنی ئەم دیاردەیە ئیشی من نیە: بەڵام ئەوەندە دەڵێم و دەزانم ئەو بزاڤە ئاینییەی کە تۆ باسی دەکەیت شتێکە و شارستانیەت و فەرهەنگی مۆدێرن شتێکی دیکەیە. هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەمیان زادەی ئەویانە کارێکی نابەجێیە. شارستانیەت و فەرهەنگی مۆدێرن، هەوڵ و سەرەتایە بۆ ئایندەیەکی زۆر مەزن، هەوڵێکە ڕەنگە دەیان هەزار ساڵ بخایەنێ، مەبەست و ئامانجی ئەوەیە کە تیرەی بەشەر، لە ئایندەیەکی زۆر دوورا، حەقیقەتی خوای ڕاستەقینە بدۆزنەوە، یانی تەنیا بە خەیاڵ و مەزەندان نەیناسن، یان لە کتێبەکانی دۆستویفسکیدا بۆی نەگەڕێن... بەڵکو بە هەمان ڕوونی دوو جاران دوو دەکاتە چوار، بیناسن." ئەم ئیماندۆزیە ڕووسی شەقڵە، بە شێوەیەکی تێر و تەسەلتر، لە دەفەتری یاداشتەکانی چیخوفدا باسکراوە: " لە نێوان (خوا هەیە) و (خوا نیە)دا مەسافەیەکی یەجگار گەورە هەیە، کە زانای ڕاستگۆ و دڵسۆز بە زەحمەت دەیبڕێ. خەڵکی ڕووس یەکێك لەم دوو جەمسەرەی قەبووڵە، گوێ بەو مەسافەیەی نێوانیان نادات. بە گوتەیەکی دی یان هیچ نازانێ، یان زۆر کەم دەزانێ." چیخوف، تا پتر لە مەرگ نزیك دەبووەوە، پتر گۆماندار دەبوو. بۆیە زۆر بە وەعز و ئامۆژگاریە ئاینی و ئەخلاقیەکانی تۆلستۆی، کە گوایە دەیویست لەو ڕێگایەوە، بە شەر فێری مرۆڤدۆستی و بونیادنانی دنیا بکات. ئەم دەقانەی، کە پێغەمبەری پیر، خوای بۆ خوێنەرەکانی پێ ڕاڤە و شرۆڤە دەکرد، وا دەهاتنە بەرچاو کە سووکایەتین بە نووسەری "جەنگ و ئاشتی" و "ئانا کارنینا" و دوور نەبوو بە نیشانەی خەڵەفانی سەرەتای پیرییان لە قەڵەم بدات.

لەم سەروبەندەدا، بە خەمینیەوە ئەوەی لە خۆیدا بە دی دەکرد، کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەداتە کزی و لە چالاکی خاو دەبێتەوە. چونکە هیچ کارێکی گەورە و جدی لە دەست نەدەهات، هەمیشە باسی ڕووداوە بچووکەکانی ژیانی خۆی بۆ ئۆلگا دەگێڕایەوە: دوگمەیەکی پاڵتۆکەی کەوتووە، نینۆکی درێژبوون. کە سەری شتووە، سەرمای بووە، بۆری ئاوەکەیان تەقیوە... هەمیشە هەمان سکاڵا و هەمان ئومێد و خۆزیاخوازی: "پێموایە ئەگەر بمتوانیبا، نیوشەو، تەنیا نیوشەو، سەر بەسەر شانی تۆوە خەوتبام چاك دەبوومەوە و هیچ خەمێکم لە دڵا نەدەما. بە هەرحاڵ بێ تۆ ناتوانم بژیم. هەوڵبدە، بۆ هاوین ڤیلایەك بەکرێ بگری، جێیەك بێ کە بتوانم تیایا بحەوێمەوە و بنووسم." (بڕوانە نامەی ٢٥/ك١/١٩٠٢). هەروەها لە نامەیەکی دیکەدا پێی دەڵێ ڕۆژێ دێ کە بەدرێژایی ساڵ دەگەڵ ئەودا (ئۆلگا) بژی، لەوبارەیەوە دەڵێت: "هەنگێ کوڕێکت دەبێ، قاپەکانت دەشکێنێ، کلکی سەگەکەت ڕادەکێشێت و تۆش بەوپەڕی شادمانیەوە تەمەشای دەکەیت." (بڕوانە نامەی ١٤/ك١/١٩٠٢) ئۆلگا، هەستی دەکرد، بەرپرسە لەم جودابیەیان. ئانتونیش وەکو هەمیشە، بەوپەڕی میهرەوە، هەوڵی دەدا ئەم هەستی خۆ بە گوناحبار زانینە، لای هاوسەرەکەی هێور بکاتەوە: "دەلال، تۆ هەمیشە بۆم دەنووسیت، چونکە بە تەنیا لە مۆسکۆ دەژیت و لە یاڵتا و لەگەڵ مندا ناژیت، هەست بە عەزابی ویژدان دەکەیت. دەتوانین چ بکەین گیانەکەم؟ چمان لە دەست دێ؟ تۆ باش بیربکەوە: ئەگەر بە درێژایی زستان، لە یاڵتا، دەگەڵ

مندا ژیابای، ژیانت بە فیڕۆ دەچوو، هەنگێ من هەستم بە عەزابی ویژدان دەکرد. یانی هیچمان بە هیچ نەدەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە دەمزانی کچێکی ئەکتەر دەخوازم، مەبەستم ئەوەیە: کاتێ تۆم خواست سوور دەمزانی تۆ وەرزی زستانان لە مۆسکۆ بەسەر دەبەیت. هەڵبەتە بە هیچ جۆرێ خۆم بە مەغدوور یان خەڵەتاو نازانم. بە پێچەوانەوە هەست دەکەم هەموو شتەکان ئاسایین. کەواتە لەوەی پتر بە باسی عەزابی ویژدانت، ئازارم مەدە. لە مانگی سێدا جارێکی دی یەکتر دەبینینەوە و ئیدی هەست بەم تەنیاییەی ئێستامان ناکەین... دەستم بە کارکردن کردووەتەوە. ڕەنگە فریانەکەوم هەموو ڕۆژێ نامەت بۆ بنێرم، بمبوورە." (بڕوانە نامەی ٢٠/ك٢/١٩٠٢).

هەڵبەتە کە دەیگوت دووبارە "دەستم بە کار کردووەتەوە" کەمێك موبالەغەی تیابوو. چونکە چیرۆکی (بووکەخان) کە ماوەیەك بوو دەستی دابویە، زۆر خاو دەڕۆیی. دیارە ئەمە لەبەر ئەوە نەبوو کە سەرچاوەی خەیاڵی وشکی کردبوو،بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە زۆر ماندوو بوو، هێندە ماندوو بوو کە نەیدەتوانی وشەکان لە سەر کاغەز ڕیزبکات، بەوەش شەکەت دەبوو. لە نامەیەکیا ٢٣/ك٢/١٩٠٣ بۆ ئۆلگا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "دنیایەك بابەت و تیمەم لە مێشك و خەیاڵدایە! بێزوو بە نووسینەوە دەکەم، بەڵام هەست دەکەم لە شتێکم کەمە: نازانم هی جەوەکەیە یان هی نەخۆشیەکەمە." دوای چەند هەفتەیەکی دی، ١٩٠٣/٢/٥، ڕاشکاوانەتر دەڵێت: "ڕۆژی شەش حەوت دێڕێك دەنووسم، ئەگەر بشمکوژی ناتوانم لەوە زیاتر بنووسم. ڕۆژ بە ڕۆژ دڵم لە ئەدەبیات هەڵدەشێوێ." ئەوسا لە ١٩٠٣/٢/١٦دا ئەم ئیعترافە ترسناکە بۆ ئۆلگا دەکات: "ئاه نازەنینم، با بە ڕاشکاوی پێت بڵێم، هەموو خۆزیایەکم هاتووەتە سەر ئەوەی کە چیتر نووسەر نەبم، واز لە نووسەری بێنم." بەڵام وێڕای ئەوەش بە هەر گیانەسەرییەك بوو، وردە وردە لەسەر نووسینی "بووکەخان" بەردەوام بوو، هەر سەعاتەی چەند وشەیەکی لێدەنووسی، ئەوەبوو لە ١٩٠٣/٢/٢٧دا، دوای پێنج مانگ لە کارێن پچڕپچڕ، تەواوی کرد و دەستنووسەکەی نارد بۆ میرولیوبوڤ سەرنووسەری بڵاوکراوەی "گۆڤاری هەمووان" کە، ژمارەیەکی دیکەشی لە دوا چیرۆکەکانی چیخوف بڵاوکردبووەوە. "نادیا"ی جەوانی قارەمانی ئەم چیرۆکە، لە خانەوادە دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانەکەی خۆی بە جۆرێ یاخی دەبێت کە مل بۆ شووکردنێکی قەراداری نەدات، سەری خۆی هەڵدەگرێ و بۆ سان – پترسبۆرگ هەڵدێ و درێژە بە خوێندن دەدات و لەوێ تووشی چارەنووسێکی پڕ لە فیداکاری و لە خۆبردەیی دەبێت. لەم سەر و بەندەدا "ساشا"ش کە خزمێکی دووری نادیایە و کەڵکەڵەی خەباتی دژ بە گوێڕایەڵی بورژوایی خستبووە سەری، سەفەر دەکات، بە ڕوباری ڤۆلگادا بۆ معالەجە بە کۆمیس دەڕوات وبە نەخۆشی سیل دەمرێت. دوا خەونەکانی نادیا، کۆتایی شانۆنامەی "سێ خوشك" وەبیر دێنێتەوە: "ئاه! با ئەم ژیانە تازەیە بە زووترین کات بێ، ئەو زەمانە بێت کە بنیادەم بتوانێ دلێرانە، ئازادانە چارەنووسی خۆی دیاریبکات، شاد و ئازاد بم."

ئایا دڵی چیخوف خەبەری دابوو کە دەشێت "بووکەخان" دوا چیرۆکی ئەو بێ؟ خۆ کۆبەرهەمەکانی پتر لە دوو سەد و چل چیرۆکیان لە خۆ گرتووە. هەندێکیان زۆر کورتن،

هەندێکیان درێژ. هەندێکیان بە ئاشکرا شاد، هەندێکیان خەمناك و دڵتەزێن. ئەمانە تێکڕا و پێکەوە ئاوێنەی باڵانمای ژیانی ئەو سەردەمەی ڕووسیان، لە جووتیارەوە تا ڕەبەن، لە مامۆستای زانکۆوە تا عەرەبانچی، لە خوێندکارەوە تا بازرگان... هەموو توێژە کۆمەڵایەتیەکان لەم کومیدیا بەشەرییەی چیخوفدا هەن. خوێندنەوەی چیرۆکەکانی چیخوف وەکو ئەوەیە دەگەڵ ڕێنوێنێکی خوێنساردا بە ناو گێژەلوکەی ڕووسیای ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدە بکەویت، یارۆی ڕێنوێنی خوێنسارد و هۆشن هەموو شتێکت – نیشان بدات و هیچ شتێکت بۆ شەرح و شرۆڤە نەکات. ئیدی لەم سەری ئەم ڕێگا پڕ پێچ و دەورانەوە تا ئەوسەری، یەکێتی شێواز، یەکێتیەکی سەیری شێواز بەدی دەکەیت. چیخوف، لە ١٨٨٩/٤/١١، لەوکاتەدا کە یەکەمین دەیەی سەردەمی نووسەرایەتی بڕی بوو، لە نامەیەکیا بە ئەلکساندری برای گوتبوو: "کورتبڕی برای بە هرەیە." و بە خۆیشی هەرگیز ئەمەی فەرامۆش نەکرد. بۆیە هەمان سادەیی، دیقەت و وردی، بێ لایەنی نووسەر، خۆ هەڵنەقورتانی لە ژیان وهەڵوێستی کاراکتەران، وەکو چۆن لە کۆنترین چیرۆکیدا ڕەنگی داوەتەوە، بەو ئاوایەش لە تازەترین چیرۆکیدا بەدی دەکرێت، لە تێکڕای چیرۆکەکانیا، بۆ ساتێکیش هەست بەوە ناکەین بەهرە و توانای چیرۆکنووس دابێتیە کزی و سەرچاوەی ئیلهام و سەرۆی وشکی کردبێت.

چیخوف، کە "بووکەخانی" تەواوکرد، ویستی هەموو بەهرە و توانایەکی وەقفی "باخی ئالوباڵو" بکات. بەڵام ڕستەی دیالۆگەکانی بۆ لێك نەدەدرا. کاتێ ئۆلگا گلەیی ئەوە لێکرد کە تەمەڵی دەکات. پەست بوو، لە ١٩٠٣/٣/٤دا نامەیەکی بۆ نارد کە: "گومان لە تەمەڵی من نیە! تۆ ئەمە بخە ئەولاوە، خۆ ئاشکرایە کە دژمنی خۆم نیم. ئەگەر توانام هەبوایە نەك یەك شانۆنامە، بەڵکو بیست و پێنج شانۆنامەشم دەنووسی." دوای دوو ڕۆژ (١٩٠٣/٣/٦) کە بڕێك گەشبین تر بوو، لەوبارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر شانۆنامەکەم، بەو شێوەیە دەرنەچوو کە خۆم وێنام کردووە، گەردنت ئازابێ بکێشە بە دەم و کەپووما. سەروو دەوری کۆمیدیم بۆ ستانسلافسکی و بۆ تۆش داناوە." دوای ماوەیەکی کەم (١٩٠٣/٣/٢١) مژدەی بە ژنەکەی دا کە: "باخی ئالوباڵو، خەریکە دەق دەگرێت. هەوڵدەدەم، بە گوێرەی توانا ژمارەی کاراکتەرەکان کەم بکەمەوە، کە ژمارەی کاراکتەرەکان کەمتر بێ پوختە تر دەردەچێ." ئەوجا لە ١٩٠٣/٤/٩دا، لە ناکاوا ڕایگەیاند کە: "بەنیازم شانۆنامەکە لە مۆسکۆ بنووسم، مەحاڵە لێرە بنووسرێت."

بەڵام دکتۆر ئالتسشولەر، بە هیچ جۆرێ ڕێگەی ئەم سەفەرەی نەدا. ئیدی چیخوف لە ئۆلگا پاڕایەوە، کە مۆڵەتێکی چەند ڕۆژی لە بەڕێوەبەرایەتی شانۆی هونەر وەربگرێت و ئەو بێت بۆ یاڵتا. ئۆلگا بە کەسەرەوە وەڵامی دایەوە کە بەتەمای شتی وا نەبێ، چونکە دەگەڵ تیپی شانۆی هونەردا، بە سەفەرێکی هونەری دەڕوات بۆ سان – پترسبۆرگ. چیخوف پابەندی قەراری دکتۆرەکەی بوو، ئۆلگاش پابەندی قەراری دەرهێنەرەکەی. ئیدی کەسیان خاوەنی بڕیاری خۆ نەبوون.

کە هەوا تۆزێ گەرم بوو، دکتور ئالتسشۆلەر، بایی ئەوە نەرم بوو کە ڕێگەی نەخۆشەکەی بدات، بە قەراخ بەنداوەکەدا پیاسە بکات . بەڵام چیخوف، هەردوو سەگەکەی دەگەڵ خۆدا دەبرد،

بەدەم پیاسەی ناو باخەکەوە، سەیری درەختەکانی دەکرد، تەمەشای باخەوانەکەی دەکرد کە چۆن بنەگوڵەکان پەرچ دەکات، دوای تۆزێك، بە هانکەهانك خۆی دەگەیاندە تەختێك لەسەر تەختێك بەرانبەر بە دەریاکە دادەنیشت تا پشوویەك بدات. دەگەڵ سەرەتای بەهارا، بونین، گۆرکی و، کوپرین هاتن بۆ قرم. ئەمانە زوو زوو دیدەنیان دەکرد، هەوڵیان دەدا بە قسەی خۆش، دڵخۆشی بدەنەوە. چیخوف، بە بێدەنگیەکی مەرگ ئامێزەوە گوێی لێدەگرتن، دارعاساکەی لە بەینی هەردوو لاقیا، نیگای ئاوارەی دوور، ڕەنگی زەرد بوو. پێدەچوو، ژیان لای ئەو هیچ تامێکی نەمابێ. جارجار قسەی سەیرسەیری لە زار دەردەپەڕی. جارێك بە بۆنین دەڵێت: "حەزدەکەم، کەسێك بم ماڵ بە کوڵ، گەڕۆڵ، زیارەتی ئەم زیارەتگە و ئەو زیارەتگە بکەم، لە دێرێکی ناو دارستانێکی، دیار دەریاچەیەك بژیم، ئێوارانی هاوین، لەسەر تەختێك لە بەردەم دێرەکەدا دابنیشم..." دوای تۆزێك ماندوویەتی پێوە دەرکەوت، میوانەکانی تێگەیشتین کە وەختی ئەوە هاتووە بڕۆن، تا ئەویش ئیسراحەت بکات. لە ١٩٠٣/٤/١١ لە نامەیەکیا بۆ ئۆلگا دەڵێت: "سەرم دێشێت. دەکۆکم. میوانان زۆر دادەنیشن. دوێنێ بەڕێزێکی ڕیشن چواردانە سەعات و نیو لە نزیکی مێزەکەمەوە دانیشتووە!" هەموو ئاواتێکی چیخوف ئەوەبوو کە جارێکی دی و لە زووترین کاتدا هاوسەرەکەی ببینێ. ئیدی وای لێهاتبوو نە تەحەمولی یاڵتا و نە میوانان و نە دکتۆر ئالتسشولەری نەدەکرد، ئەنجام سەبری سوا و، لە ١٩٠٣/٤/٢٢دا، بێ پرسی هیچ کەسێك، وەکو سەربازێکی هەڵاتوو، بە هەڵاتن بۆ مۆسکۆ هەڵهات.

پەراوێز:

* – ئێرمیتاج: موزەخانەیەکی زۆر گەورەیە لە لینینگراد. گەنجینەیەکی هونەری بێ هاوتایە، لە ساڵی ١٧٦٥دا بە فەرمانی یکاترینای گەورە، دامەزراوە.

* – ... هەموو ئەو مەسەلانە ڕێکەوتە: ماریا لە یاداشتەکانی خۆیدا دەڵێت کە لایکا و مێردەکەی ژن و مێردێکی بەوەفا و دڵسۆزی یەکدی بوون. دوای شۆڕشی ئوکتوبەر چوون بۆ فەرەنسا. لایگا لە ساڵی ١٩٣٧ دا لە پاریس مرد.

* – روکفلرانی ڕووسی ئێمە: واباوبوو کە ساڤا موروزوف کۆمەکی دارایی شۆڕشگێڕەکانی دەکرد تا لە ڕێگەیەوە وا بنوێنێ کەسێکی لیبراڵ و پێشکەوتوو خوازە...

"١٥"

## كە نووسینی ئەم شانۆنامەیەم بەلاوەقورس بوو!

دوای کەش و هەوای گەرمی یاڵتا، سەرماو سۆڵەی مۆسکۆ کردیە کارێك کە چیخۆف نەتوانێ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە ژورەکەی خۆی بێتەدەرەوە. چیخۆف، ئەو شوقە تازەیەی بەدڵ بوو کە ئۆلگا و ماریا لە شەقامی پترۆفکا بەکرێیان گرتبوو. بەڵام عەیبی ئەوەبوو کە لە نهۆمی سێیەمدا بوو و ئاسانسۆریشی نەبوو، بەڵام کاتی خۆی بە نامەیەك لەمەیان ئاگادار کردبووەوە، هیچ ئیعترازێکی نەگرتبوو، بەڵام ئێستا ئەمەی لێ بوو بوو بەکێشەیەکی گەورە، عەزابێك بوو لەو گۆڕە، بە هانگەهانگ و دڵەکوتێ، تا ئەم مەسافەیەی دەبڕی نیو دانەسەعاتی پێدەچوو، دەبوایە ناو بە ناویش لە ڕێگادا بوەستێ و نەفەس تازەبکاتەوە. جا چونکە نەیدەتوانی بچێتەدەرێ، وای بە باش زانی لەماڵەوە، پێشوازی دۆست و ئاشناکانی بکات..

یەکێك لەوانە بۆنینی دۆستی وەفاداری بوو، کە پاشان یادەوەرییەکانی خۆی لەو بارەیەوە دەگێڕێتەوە: "بێدەنگیەکەی ،کۆکەکەی، چاوە بە قوڵاچوو و خەواڵوەکانی سیمای خەمناکی و تەحرو دیداری ئەندێشناکیم لە بیرە... بەو حاڵەشەوە هەمیشە پۆشتەو پەرداخ بوو.. دەستەکانی گەورەو وشك دیار بوون، کە دەستت لێدەدان ناسك بوون. وەکو زۆربەی ئەو خەڵکانەی بەردەوام لە فکران ڕادەچن، ئەو قسانەی خۆی بیر دەچوونەوە. کە توزێ لەوەپێش چەند جارێك گوتبوونیەوە." ئیدی هەواڵی هاتنەوەی چیخۆف، خێرا لە سەرانسەری شاردا بڵاوبووەوە. ئیدی میوان، بە ئاشناو بێگانەوە سەری کرایەوە. چیخۆف بەو زەبوونیەی خۆشیەوە، هێشتا هەستی دەکرد لە سەرێتی پێشوازی هەر نووسەرێکی گەنجی تازە زمانگرتوو یان پیرەنووسەرێکی لە زمان کەوتوو، یان هەر ڕۆژنامەنووسێکی تامەزرۆی خەبەر بڵاوکردنەوە، هەر وەشانکارێکی عەودالی دەستنووسان، و هەر خانمێکی چەنەبازی خۆ بە ئەدیب زان، بکات و بە ناچاری گوێی لێبگرێت. تۆلستۆی بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی چیخۆف، وێنەیەکی خۆی بە پێشکەشیەکەوە بۆ دەنێرێت دەگەڵ لیستێکدا بە ناوی ئەو چیرۆکانەی کەچیخۆف تا ئەو کاتە بڵاوی کردبوونەوەو تۆلستۆی بەدڵی بوون و بەگەنی کردبوون، لیستەکە بریتی بوو لە(٣٠) چیرۆکان، پازدەیانی بە چیرۆکی دەرەجە یەك و پازدەیانی بە دەرەجە دوو خانەبەندی کرد بوو.* پیرەمێرد هەر هەموو ئەو چیرۆکانەی لە بەرگێك کۆکردبوونەوەو ناو بە ناو دەیخوێندنەوەو دووبارە دەیخوێندنەوە. لای لازارفسکی گوتبووی: "چیخۆف، پۆشکینی پەخشانە. چۆن شیعرەکانی پۆشکین دەنگدانەوەی سۆزی ئەون، چیرۆکەکانی چیخۆش بەو ئاوایە دەنگدانەوەی سۆزی خۆین. بە ڕاستی هەندێ لەم چیرۆکانە، زۆر نایابن، مایەی سەرسامی ڕەهان." لەم سەرو بەندەدا، هەم پسپۆڕان و شارەزایان و هەم جەماوەری خەڵکیش هاو ڕەئی بوون کە چیخۆف لە بەرزترین لوتکەی چیرۆکنووسیدایە. باشەچیخۆف کە لەدوای گۆگۆل و دۆستوفسکی و گونچاروف و تورگینیف و تولستوی یەوە هاتبوو، چ شتیکی تازەتر لەوانی لەگەڵ خۆدا هێنابوو، وا بوو بوو بەداستانی سەر زاران و مایەی ستایشی هاوعەسرانی خۆی؟ ئەوەی ڕاستی

بێ لە جەوهەرو کرۆکدا، دوو پرەنسیپی تازەی هێنابووە ئاراوە: ڕاستگۆیی و میانڕەوی. گەورەداهێنەرانی پێش ئەو، هەریەکەیان بە شێوەی تایبەتی خۆی سەرنجی وەرگری دەهاڕوژاند. ئیدی بە جۆرە زێدەڕۆییەك، بەوەسفێن لیریکی، بە زمانی جادوویی سەرنجی خوێنەریان بۆ خۆ ڕادەکێشا. بەڵام چیخۆف یەکەم کەس بوو کە بەنەرمی و، لەبن لێوانەوە قسەی بۆ دەکردیت. بەپێچەوانەی قەڵەم و ئینشای ئارام و هاوئاهەنگ و سفت و زۆر هونەری تورگینێفەوە، چیخۆف پەنای دەبردە بەر شێوازی نەخت و پوخت، لە کورتی دەی بڕییەوە، بەڵام هەر وشەیەکی بەمانایەکی پەنهان بارگاوی بوو. گەورە ئەدیبەکانی دیکەی ڕووس، سۆزی خوێنەرانیان دەهاڕوژاند. بەشداری هەڵچوون و سۆزو گودازی خوێنەریان دەکرد، لەگەڵیا دەگریان و لەگەڵیا پێدەکەنین. بەڵام چیخۆف میانڕەو و بێلایەن، خوێنەر ڕوو بە ڕووی دیاردەو ڕووداوەکان دەکاتەوە تا بەکەیفی خۆی هەڵوێست وەربگرێت. بەڵام نایەت لە هەموو بۆنەیەکدا ختوکەی سۆزی خوێنەر بدات. تا بیخاتەپێکەنین یان گریان. بەڵکو دووراو دوور پەلەپیتکەیەکی پەسەندو بەجێی لێدەدات، لە هەژانێکەوە بۆ هەژانێکی دیکەی دەبات تا ئامادەی بکات، بە وردی ناخی کاراکتەرەکانی دەرك بکات و بیخوێنێتەوە. هیچ شەرح و شرۆڤەیەکی بەسەردا ناسەپێنێ. ئیدی خوێنەر یان بینەر، بەرە بەرە بەبێ ئەوەی بەخۆ بزانێ، شان بەشانی چیخۆف،بەشداری لە ئەفراندنی بەرهەمەکەدا دەکات.بیری چیخۆف لە سەرانسەری چیرۆك و شانۆنامەکانیا پەراگەندەو پەخش و بڵاوە، هەرچەندە بیرێکی ڕەشبینانەیە، بەڵام وێڕای ئەوەش باوەڕی بەپێشکەوتن، بە توانای مرۆڤ بە هاتنی ژیانێکی باشتر هەبوو. کەسێکی مەتریالیست و بێباوەڕ بوو، بەڵام لە ناخی خۆیدا، لەقوڵایی دەروونیا جۆرەنیگەرانیەکی سۆفیانەی هەبوو، هەستی بەبوونی نهێنییەك دەکرد، کە بەخۆی دەیگوت، بە ئاسانی پەی پێنابات. ئەم بیرەزانستی و سۆزەمرۆڤانیە، ئەم تەنزە سارد و سەرنجە گەرمە، جۆرە خەرمانەیەکی ڕاستگۆیی بە بەرهەمەکانی دەبەخشی. بە هەموو بێفیزی و تەوازوعێکی خۆیەوە، دەیزانی شێوازێکی تازەی بیرکردنەوەو نووسینی هێناوەتە ناو ئەدەبیاتی ڕووسیا. بەگۆڕکی دەگوت: "ئەو ڕێگایانەی من کردومنەتەوە تازەن و بە تازەیی دەمێننەوە. ئەمە تاقە بایەخ و تایبەتمەندی منە."

هەندێ لە برادەرکانی، لەسەرووی هەموویانەوە گۆرکی، بەپێ داگریەوە هانیان دەدا گفتوگۆ دەگەڵ مارکسی وەشانکاری بەرهەمەکانیا بکات و بەگرێبەستەکەیاندا بچنەوە. چونکە مارکس، لە زەرفی چەند ساڵێکدا، پتر لە دووسەد هەزار ڕۆبڵی لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەوەوە بەدەست هێنابوو. ئێستاش وەکو پاشکۆی گۆڤارەکەی (نیڤا) خەریك بوو دووبارە بڵاوی دەکردنەوە، بێئەوەی تاقە کوپیکیك بەچیخۆف بدات. هەڵبەتە نەدەکرا گرێبەستەکە هەڵبوەشێنرێتەوە، یانی ئەو هەفتاو پێنج هەزار ڕۆبڵەی کە چیخۆف لە کاتی ئیمزای گرێبەستەکەدا وەری گرتبوو، بگێڕدرێتەوە بۆ مارکس. بەڵام دەکرا بەلای کەمەوە داوای ئەوە لە مارکس بکات کە پێداچوونەوەیەك بە گرێبەستەکەدا بکەن، و سێیەکی دەسکەوتی فرۆشی بەرهەمەکان بدرێ بە نووسەر، چونکە قازانجی بەرهەمەکان یەجگار زۆر بوو. خۆ ئەگەر چیخۆف، لە ڕێگەی نمایشی شانۆنامەکانیەوە دەسکەوت و دەرامەتی باشی دەست نەکەوتبا، تووشی

دەستکورتی و نەداریش دەبوو. چیخۆف ماوەیەکی زۆر ئەو پیشنیازەی ڕەفز کرد، ئەنجام بە نەبەدڵی چوو بۆ سان- پترسبۆرگ، تا مارکس بدینیّ. چوونەکەی بێهودە بوو، سەری دای لە بەرد: مارکس ڕێك و ڕاست هەر سازانێکی لەو بارەیەوە ڕەفز کرد. چیخۆف بەخۆیشی لە مەسەلەی سەواو مامەڵەدا زۆر دەست سپی بوو. عەینی منداڵ، لە مەسەلەی پارەو ژمارەو ئەم شتانە دەترسا. نەیدەتوانی لە هەنبەر خەنیمێکی سەرسەختی وەکو مارکس دا، بکەوێتە چەلەحانیّ و گەنگەشەو مامەڵەکردن و دەنگ بەرزکردنەوەو کێشان بە مێزەکەیا. وەختیّ بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، نامەیەکی لەو بارەیەوە(١٩٠٣/٦/٧) بۆ ماری خوشکی نووسی کە: "قسەم دەگەڵ مارکسدا کرد، شتێکی ئەوتۆم لیّ دەسنەکەوت. کۆمەڵێك کتێبی جزوبەند کراوی جوانی دامیّ، نزیکی شەست و پێنج کیلۆ دەبێت، هەروەها پێنج هەزار ڕۆبڵیشی بۆ دەواو دەرمانی نەخۆشیەکەم پێشنیاز کرد کە هەڵبەتە وەرم نەگرت."

بەدرێژایی زستانەکە، خەیاڵی بەوەوە لێدەدا کە دەگەڵ ئۆلگادا سەفەری سویسرا و ئیتاڵیا بکەن، بەڵام زاتی نەدەکرد بەبیّ شیرەتی دکتۆر، مل بە سەفەرێکی وا دژوارەوە بنێت. لێرا بچێتە لای دکتۆری زانا ئوستروموڤ. کەچەند ساڵێك لەوەپێش، لە عیادەکەی خۆی، معالەجەو دەرمانی خوێن هەڵهێنانەکەی کردبوو. ئوستروموڤ، دوای ئەوەی معایەنەی دەکات، دەبینیّ وەزعی تەندروستی زۆر خراپە: سیپەلاکی ڕاستی زۆر خراپ بوو و سیپەلاکی چەپیشی ئاوسا بوو. بۆیە سەفەری هەندەران بەو حاڵەوە کاری کردەنی نەبوو، بگرە ئوستروموڤ سەفەری تا یاڵتاشی پیّ باش نەبوو. بەچیخۆڤ گوت: "تۆ زۆر نەخۆشیت!" چیخۆف دوای معایەنەکە، نامەیەك بۆ ماری خوشکی لەگەڵ دایکیا لە یاڵتا ئاکنجی بوو، دەنووسێت کە: "ماوەیەکی زۆر سەماعەکەی بەکار برد، گوێی نا بەدڵمەوە، معایەنەیەکی وردی هەموو ئازای کردم... پێنج جۆرە دەرمانی بۆ نووسیم. پێی گوتم زستان لە یاڵتا نەبم: پێی وایە زستانی ئەوێندەر زۆر ساردەو بەکەڵك نایەت. داوای لێکردم لە ڤێلایەکی نزیکی مۆسکۆ بمێنمەوە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٣/٥/٢٤).

چیخۆف، ئەم ئامۆژگاری و فەرمانەی زۆر پێخۆش بوو. باسی نەخۆشیەکەی و سەرنجە ترسناکەکانی دکتۆر ئوستروموڤی هەر نەکرد: ئیدی زستانان لە کەنارە ناخۆشەکانی قرم بەسەر نابات، بەڵکو لە مۆسکۆ بەسەری دەبات، لە ژنەکەی و کۆڕو مەجلیسی دۆستانی ئەدەبییەوە نزیك دەبێت. ئیدی پێویستی بەوە نەما بە دزییەوەو بە هەزار و یەك بیانووی دەستکردەوە ئەو کارەبکات، ئەوە دەستوورو داوای دکتۆر بوو. ئیدی نامەی بۆ ماریای خوشکی نووسی کە گوروزوف و کوچوکوی بفرۆشێت و لە دەورو بەری مۆسکۆ شوقەیەك بکڕێت.

وەکو دکتۆرێك سەری لە ڕاوبۆچوونی ناکۆك و هەڤدژی دۆستە دکتۆرەکانی دەرنەدەکرد. نە یدەزانی باوەڕ بە ئالتسشولەر بکات کە دەیگوت کەش و هەوای قرم بۆ نەخۆشیەکەی ئەو زۆر باش و لەبارە یان باوەڕ بە ئوستروموڤ بکات کە دەیگوت هەوای قرم بۆ نەخۆشیەکەی ئەو زۆر خراپە؟ لە١٩٠٣/٦/٤دا نامەیەکی بۆ دکتۆر سریدینی برادەری نووسی کە: "نازانم باوەڕ بەکێیان بکەم، ئەگەر ئوستروموڤ ڕاست بیّ، ئەدی بۆچی من چوار زستانم لە یاڵتا بە سەر برد؟" هەروەها

له١٩٠٣/٧/١دا نامەیەکی بۆ لاڤرۆڤ نووسی کە: "هەرکە لە مۆسکۆ جێگیر ببم و لەوێ ڕابێم، دکتۆرەکان جارێکی دی بۆ قرمم دەنێرنەوە یان هەواڵەی قاهیرەم دەکەن."
لەم سەروبەندەدا، ماری یاکونچیکوڤای دەستەخوشکی ئۆلگا، ئۆلگاو چیخۆڤ دەعوەت کرد، کەچەند هەفتەیەك لە مۆڵکەکەی ئەودا، نزیکی نارو– فومنسکویی دەوروبەری مۆسکۆ بەسەر بەرن. چونکە وەرزی چالاکی شانۆیی تەواو بوو بوو، بەخۆشحاڵیەوە دەعوەتەکەیان قەبووڵ کرد. کە گەیینە ئەوێندەر و سەیریان کرد خانەخوێیەکان، خانوویەکی تایبەتی و جیای بۆ تەرخان کردوون، خانوویەکی هێندە گەورە کە جێی دەکەسی تیا دەبووەوە نەیاندەزانی لەخۆشیان چی بکەن، لەکەیفان لەپێستی خۆ نەدەهێورین. چیخۆف له١٩٠٣/٥/٢٩دا نامەیەك بۆ ماری خوشکی دەنێرێت و دەڵێت: "ئێرە ڕووبارێکی لێیە، دەشتێکی پان و بەرینی بۆ پیاسەو گەڕان لێیە، کلێسایەکی کۆنی لێیە، ماسی زۆرە. نامەم بۆ بنێرە، لە وەزعی دارە بەردارەکان، بنچەگوڵەکان، هەموو دارو درەختەکانی دی ئاگادارم بکە. دار کالیپتۆسەکان لە چدان؟ ئەدی گوڵە زەمەقیە ژاپۆنیەکان؟" بە ئومێدی ئەوەبوو بۆ پایز ڤێلایەك لەو ناوە بەکرێ بگرن، ئۆلگا، هەموو دەڤەرەکە گەڕا، بەڵام شوێنێکی لەباری نەدۆزییەوە. تاك و تەرا، خانووی باش لێرەو لەوێ هەبوون ،بەڵام زۆر گران بوون، بەکرێگرتنیان لەکێشی ئەواندا نەبوو. دوو ڕۆژیان لە فوسکریسنك، لە ماڵی ساڤاموروزوف (روکفلری ڕووسی) بە سەر برد. چیخۆف لە میانەی ئەم مانەوە کورتەدا بە خاتوو موروزوڤ گوتبوو: "ئەوەی تا ئێستا نووسیومە، پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە، لە داهاتوودا چۆن دەنووسم؟ هیچ ڕۆشنبینییەکم لەو بارەیەوە نیە. ئەمەم زۆر لا ناخۆشە. ئازارم دەدات." کە گەڕایەوەبۆ نارو –فومسکویی، ویستی بچێتەوە سەر (باخی ئالۆبالۆ) کە ساڵێك بوو دەستی پێکردبوو، بەڵام دەبوایە جارێ "بووکەخان" پاکنووس بکاتەوە. چونکە لە دەقی چیرۆکەکە ڕازی نەبوو، چەندین پەرەگراڤ لە نوێ نووسی بووەوە. هەرچەندە ئەمە ماندووی دەکرد، بەڵام حەزی نەدەکرد بە نیوەچڵی بیداتە چاپکردن و وەشانکاران. ئەم کاری پێداچوونەوەو پاکنووس کردنە، جۆرە ئارامی و ئاسوودەییەکی هزری و مەعنەوی پێدەبەخشی، جۆرە وەفاداریەك بوو بەرانبەر بە شەرەڤ پیشە. پاشان گەڕایەوە سەر شانۆنامەکەی . هەستی دەکرد زۆر خاو دەچێتەپێشێ. چونکە ماوەیەکی زۆر بوو دەگەڵ کاراکتەرەکانیا دەژیاو مێشکی پێوەی مژوول بوو، هەموو تازەیی و ڕەونەق و ناسکیەکی خۆیان لە دەست دابوو. ڕۆژێکی بە باران وگژە باو باهۆزان، بایەکی توند لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە کە کرابووەوە، خۆی بە ژووریّ ڕا دەکات و چەندین پەڕەی دەستنووسی شانۆنامەکە دەبات و لە باخچەکەدا دەکەونەوە. بەڵام باران تەڕی کرد بوون، مەرەکەبەکەی بە جۆرێ سڕی بووەوە کە نەدەخوێنرانەوە یەکێك لە میوانەکانی بەوە دڵخۆشی چیخۆڤ دابووەوە کە گرینگ نیە، بێگومان شتەکانی بیرماوەو بیری دەکەونەوە. چیخۆف بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دابووەوە کە: "باوەڕ بکە هیچ شتێکم بیرنەماوە. دەبی سەرلە نوێ دیمەنەکان بنووسمەوە."

هەرچەندە نارو –فومینسکویی، لە مۆسکۆوە نزیك بوو، بەڵام ئەوەندە ئارام و کپ و بێدەنگ و خۆش بوو لە تۆ وایە لەوپەڕی دنیایە. کەچی هەندێ دەنگۆی سیاسی، دەگەییە ئەو مەڵبەندی

ئاشـــتی و ئارامیـــەش. چـــیخۆف لـــەوێ خەبـــەری کوشـــتارە نەخشـــە بۆکێشـــراو وئاشـــکرا و خوێناوییەکەی (کیشینیوف)ی بیست. بڵاوڤۆکان و چاپەمەنی فەرمی بێدەنگیان لەم مەسەلەیە کرد، بەڵام قاو داکەوت کە ئەم قەتل و عامە کاری ئەو کۆنە پەرستانەبووە، کە ژێراوژێر پۆلیس پشتیوانیان لێکردوون. چیخۆف، حەزی دەکرد ئاگاداری زیاتری لەمەڕ ئەم مەسەلەیە هەبێت، داوای لەسوڤورین کرد کە ئەو ڕۆژنامـەنهێنی و مارکسیانەی بۆ بنێرێت کە دەربارەی ئەم ڕووداوەیان نووسی بوو. هەرچەندە ئەم کارە لە مەترسی بەدەر نەبوو، بەڵام سوڤورینی، پارێزکاری بەناوبانگ، داواکەی چیخۆڤ جێبەجێ کرد. بەڵام چیخۆف پاش ئەوەی گوتارەکانی کە هەمووی دژی حکومەت بوو، بە وردی و بە ئینسافەوەخوێندەوە، پەسەندو بەگەنی نەکردن و گوتی: "لە ئەنسایلکۆپیدیا وشك ترن." تەنانەت بە نامەکراوەکەی گۆڕکیش دەربارەی ئەو ڕووداوە ڕازی نەبوو، بە مجۆرە بۆ سوڤورینی وەسفکردووە: "دڵگیرە، وەکو هەموو ئەو شتانەی دەیان نووسێت، بەڵام زیاتر دروستکراوە تا نووسین بێ: نە تازەییەکی تیایە، نەمتمانەیەکی تولستۆیانەو زۆر دووروودێژە." (بڕوانەنامەی ١٩٠٣/٦/٢٩).

هەڵبەتە چیخۆف، لە کانگای دڵەوە خەفەتی بۆ قوربانیانی ئەو کوشتارە دەخوارد. کاتێ نووسەری بە نێوبانگی ئەڵمانی –جولەکە، شولوم ئەلیخوم، داوای لێکرد کە چیرۆك بنووسێت و دەگەڵ ئەو کۆمەڵە چیرۆکەدا بڵاوی بکاتەوە کە قەرار بوو لە وارشۆ بۆ پشتیوانی لێقەوماوانی جولەکەی ئەو کوشتارە بڵاوبکرێتەوە. چیخۆف وەڵامی دایەوە: "لەم نزیکانەدا هیچم نەنووسیوە، یان زۆر کەمم نووسیوە، بەڵام دەتوانم بەڵێنێکی مەرجدارت بدەمێ: زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەو چیرۆکە بنووسم، ئەگەر نەخۆشی بوارم بدات. ئەو کۆچیرۆکەم کە تازەچاپ بووە، هەر هەمووی لەخزمەتی تۆدایە، زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر بۆ زمانی ییدیش* پاچڤە بکرێت و لە کتێبێکدا، بە قازانجی قوربانیانی جولەکەی کیشینیوف چاپ و بڵاوبکرێتەوە." و بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە تا چ ڕادەیەك بەخەمی ئەو ڕووداوەوە بووە، لە پەراوێزی هەمان نامەدا دەڵێت: "دوێنێ ١٩٠٣/٦/١٨ نامەکەی تۆم پێگەیی." (بڕوانە نامەی ١٩٠٣/٦/١٩) چیخۆف هەر لەو ڕۆژانەدا. بە پێشنیازەکەی گولتسیف قاییل بوو کە لە"هزری ڕووسی"دا وەکو هەڵسەنگێنەری دەستنووسان کار بکات. ئایا لەبەر ئەوەبەم کارەقاییل بوو، کە ئەگەر خۆیشی توانای نووسینی نەمێنێ، هەر بەردەوام بێ لە خزمەتی ئەدەبیاتدا، یا بەخوێندنەوەو هەڵسەنگاندی بەرهەمی خەڵکانی دیکەش بی؟ دیارە وەختێ کە ئەم کارەی قەبووڵ کردبوو، ئەوەی بیر چوو بوو کە نەخۆشەو باری تەندروستی ڕیگەی هیچ جۆرەکارێکی زیادەی نادات و بەم کارە هێندەی دیکە باری قورس دەبێت.

لە کاتیکا ئۆلگا، هاونشینی میوانەکانی ماری یاکونچیکوڤای زۆر لەگیان خۆش بوو پێیان دەگەشایەوە. ئانتون بەناچاری تەحەمولی دەکرد، کۆڕو مەجلیسی قسانی ئەوانی کە بەحیساب کەسایەتی کۆمەڵایەتی بوون. بە جۆرە چەنەبازییەکی بێبایەخی ئەوتۆ دەزانی، کە بەلای ئەوەوە نەدەگەییە ئاستی قسەدێهاتیەکانی ماکسیم، کە بابایەکی باخەوان بوو لە موڵکەکەدا. هەرچەندە چیخۆف و ئۆلگا بەو نیازە هاتبوون کە دوو هەیڤان لە نارو –فۆمینسکۆیی بمێننەوە، بەڵام دوو

هەفتە پێش تەواوبوونی مەوعیدی ناڤبری، گەڕانەوە. دەبوایە بۆ مۆسکۆ بگەڕێنەوە، بەڵام بێئەوەی گوێ بە ئامۆژگارییەکانی دکتۆر ئوستروموڤ بدات، بەرەو یاڵتا وەڕێکەوتن.

لە۱۹۰۳/۷/۹دا گەیینەوە یاڵتا. چیخۆف لێبڕا بوو کە لە یاڵتا نەجوڵێ، تا شانۆنامەی (باخی ئاڵو باڵو) تەواو نەکات. بۆ ئەوەی خۆی ناچار بکات بە شێوەیەکی باشتر کاربکات، ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ خۆی دانا: دەبێ (باخی ئاڵوباڵو) بۆ سەرەتای تشرینی یەکەم، بۆ وەرزی تازەی شانۆ ئامادە بێت. بەو وەزعە تەندروستیە نالەبارەوە، دەبوایە ڕۆژ بە ڕۆژ دێڕ بە دێڕ خۆی هانبدات، ئەم بەرهەمە تەواو بکات، کەوای هەست دەکرد، لەگینە ئەمە دوا بەرهەمی بێت. ئومێدەوار بوو جوانی سروشت و خۆشی هەوای یاڵتاو، ئاشتی خانەوادەیی، کە لەو دواییانەدا بەرپا بوو، یارمەتی بدەن و زەوقی کارکردنی هەبێت و بتوانێ زوو بە زوو ئەم کارە تەواو بکات. هەر چەندە باخەکە پڕ بوو لە گوڵ، هەتاو بە ئاسمانی ساف و شینەوە دەدرەوشایەوە، بەڵام ژیانی خانەوادەییان خۆش نەبوو. ماریا بەدیتنی براکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام بوونی ئۆلگای پێناخۆش بوو. ئۆلگا وەکو جاران، خۆی کردبوو بە سەر وەسێتی ژیانی مێردەکەی کە ملی بۆ هەموو داوایەکی ئۆلگا دەدا. ئۆلگا ئیرادی لە جل و بەرگی مێردەکەی دەگرت، چاودێری بەرنامەی خواردنی دەکرد، واداری دەکرد هەموو ڕۆژێ لەحوزوری ئەودا حەمامی سارد بکات. پێی وابوو حەمامی سارد بەهێزی دەکات. ماری و دایکی، ئەم زەبت و ڕەبتە میهرئامێزەی ئۆلگایان لەبەرگران بوو. پاشان ئۆلگا نامەیەك بۆ چیخۆف دەنێرێت کە: "بۆچی کاتێ کە من لەوێم، کێشەو دژواریان چێدەبێ؟ بۆچی عەزابی ڕۆحم دەدەیت و هیچ شتێك ناکەیت؟... هەر کە سەفەر دەکەم، یان لە من جودادەبیتەوە، دەست بەخواردن دەکەیت، ماری دەتوانێ هەموو شتێکت بۆ بکات و بەگوێی دەکەیت."

ئۆلگا هەر بەوەوە نە دەوەستا کە ژیانی ڕۆژانەی ئانتۆن ئاڕاستە بکات، بەڵکو بەدیاریەوە دەوەستاو بەردەوام هانی دەدا کاربکات، بیری دەخستەوە کە شانۆی هونەر چاوەڕوانی شانۆنامەکەی ئەوە تا لە پایزا پیشکەشی بکات. چیخۆف، وەکو منداڵە مەکتەبلیانی گوناهکار وترساو، بەڵێنی دەدا کە لە کاتی دیاریکراودا تەواوی بکات، بەڵام ستانسلافسکی و نەمیروفیچ —دانچنکو، نیگەران بوون، بە نامە لە ئۆلگایان دەپرسی کە: "ئایا مێردەکەی لە نووسین بەردەوامە، دەچێتەپێشێ؟ ئومێدی ئەوەیان هەبێ کە بەڵێنەکەی بباتەسەر؟ چیخۆف، ڕاستەوخۆو بەپۆزشەوە وەڵامی دەدانەوە: "شانۆنامەکەم ئامادە نیە، زۆر بەخاوی دەڕوات، ڕەنگە هۆیەکەی تەمەڵی من، خۆشی هەواو قورسی و دژواری بابەتەکە بێت." (بڕوانە نامەی ۱۹۰۳/۷/۲۸). بەڵام ستانسلافسکی هەر زوو هۆی ڕاستەقینەی ئەم خاوەخاو و پۆزش و پۆزشکاریانەی بۆ دەرکەوت: هۆی ڕاستەقینەی ئەم دواکەوتنە نەخۆشیەکەی بوو، نەخۆشی هێزی داهێنانی سست کردبوو. ستافسلافسکی چونکە دەیزانی سوور بوون و پێداگریەکەی نابەجێیە، دەیویست پاکانە بۆ ئۆلگا بکات، نامەیەکی بۆ نووسی کە: "بمان بوورە، گومانی خراپمان لێمەکە. ئێمە خەمی ئانتون پاڤلوفیچ و کەسوکارو ئازیزانی ئەومانە، ئێمە کە بیر لە شانۆنامەکە دەکەینەوە، لەبەر ئەوەیە کە خەمی ئایندەی شانۆکەمانە. بە خۆت دەزانی شانۆکەی

ئێمە لە هەر گۆشەنیگایەکەوە تەمەشای بکەیت، بە شانۆی چیخۆف دادەنرێ. بەبێ ئەو حاڵمان پەشێو دەبێت." ئۆلگا لە سەرەتای مانگی ئابدا، وەڵامێکی گەشبینانەی ئەم دوودڵی و نیگەرانیەی ستانسلافسکی دایەوە: "ئێستا هەموو ڕۆژێ کار دەکات، هەرچەندە دوێنێ و ئەمڕۆ نەخۆش بوو وهیچ نەنووسیوە... ئێستا میوانمان کەمن. ئەگەر نەخۆشی بیەڵێت، کاری زیاتر دەکات." ئۆلگا نامەکەی بڕی ،چوو بزانێ مێردەکەی چی دەکات، ئەوجا گەڕایەوەو لەسەری ڕۆیی: "خەمتان نەبێ، ئا ئێستا کەوتە کارکردن." (بڕوانە نامەی ١٩٠٣/٨/٣).

چیخۆف، هەستی دەکرد نووسینی چیرۆك ئاسانترە تا شانۆنامە. دەیان جار سوێندی خوارد بوو کە واز لە نووسینی شانۆنامە بینێ. چونکە وەکو لە نامەیەکیا ١٥/ک١٨٨٩/٢ بۆ بلشچیف، لەوبارەیەوە گوتویەتی: "شانۆنامە ماشقەیەکی فریبۆکە، بە هەراو هەنگامەیە، گۆساخ و لاسار و تاقەتبەرە." کەچی وێڕای ئەوەش، بەردەوام دەگەڕایەوە سەری، لە زەتی لە قورسی و دژواریەکەی دەبینی. ئاشق و شەیدای ئەو پەیوەندی و تەماسە ڕاستەوخۆیە بوو کە لە نێوان نووسەرو جەماوەردا چێدەبوو. ئەمەی بەجۆرە کێشماکێشێکی نێوان نووسەرو تەمەشاڤان دەبینی. نووسەر کە دەچێتە کلێشەی کاراکتەرەکانییەوەو تەمەشاڤان کە تەمەشای دیمەنەکان دەکات و گوێ لە دیالۆگ و قسەی کاراکتەرەکان لەسەر تەختەی شانۆ دەگرێت، بەو ڕادەیەی کە خەمە تایبەتییەکانی خۆی لەبیر بکات و تێکەڵ بە خەمەکانی ئەوان ببێ. هەڵبەتە هەوڵی زاڵبوون بەسەر ئەقڵی خەڵکیدا، و کۆنتڕۆڵکردنی هۆڵێکی پڕاو و پڕ لە تەمەشاڤانان یەجگار بە لەزەت ترە، لەو سووکە ناسکە نەشانەی کە چیرۆکنووس، لە تەنیایی ژووری کارکردنەکەیدا دەگرێت. وێڕای ئەوەش لە ڕێگەی ئۆلگاوە، ئاگاداری هەموو جم و جوڵ و چالاکیەکی ژیانی شانۆ بوو. بەدەم نووسینی! باخی ئالوبالووە، بیری لەو ئەکتەرانە دەکردەوە، کە لەسەر شانۆ ئەو دیالۆگانەیان دووبارە دەکردەوە کە ئەو دەینووسین. ئۆلگا لە ئاخروئۆخری ئابدا، خەبەری بەنەمیروفیچ دانچنکو دا کە تەندروستی مێردەکەی باشترەو "بەجۆش و خرۆشەوە" سەرقاڵی کارکردنە. چیخۆف بەخۆیشی لە١٩٠٣/٩/٢دا دروستی ئەو هەواڵەی بۆ دووپات کردەوە: "ئەگەر بتوانم بەم نەفەسە بەردەوام بم، دڵنیام بەم زووانە شانۆنامەکەم تەواو دەبێت. لە پەردەی دووەمدا، زۆر کێشە، کێشەی گەورەم هاتە ڕێ، بەڵام وابزانم تەواو، هەموو شتێك ڕەوتی خۆی وەرگرتووە. ئەم شانۆنامەیەم ناودەنەم: :کومیدیا" ( لە نامەیەکەوە بۆ نەمیروفیچ...) قەرار وابوو ئۆلگا لە١٩٠٣/٩/١٩دا بۆ مۆسکۆ بگەڕێتەوە. چیخۆف بە تەما بوو دەستنووسەکەی تەواو بکات و بێ هیچ کەم و کوڕییەك بە ئۆلگادا بینێرێت. بەڵام نەخۆشی دیسان بەرۆکی گرت، بە ناچاری دەستی لە نووسین هەڵگرت. ئەوەبوو لە١٩٠٣/٩/١٥دا نامەیەکی بۆ ژنەکەی ستانسلافسکی نارد کە سەرباری ئەوەی بەرەو باشی دەچێت، بەڵام تووشی ژانەسەرێکی ئەوتۆ بووە کە دەستی قەڵەم ناگرێت: "بۆیە ئۆلگا، دەقی شانۆنامەکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. بۆیە خۆم هەرکە کەمێك بوژامەوەو توانای کارکردنم پەیداکرد، تەواوی دەکەم و هەر چوار پەردەکەتان پێکەوە بۆ دەنێرم." لە سەری دەڕوات و دەڵێت: "ئەوەی من نووسیومە، تراجیدیا نیە بەڵکو کۆمیدیایە، بگرە لە هەندێ شوێنا کۆمیکە."

کە ئۆلگا سەفەری کرد، چیخۆف ماڵەکەی لەبەر چاو چۆڵ بوو، کە لە سەرەتاوە دەستی نەدەچووە کار. لە۱۹۰۳/۹/۲۰دا نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسی کە: "لە هەموو شتێك دوورم، ئەوەندە دوورم، خەریکە بەرە بەرە ورەم دەروخێت وا هەستدەکەم تەواو بووم، زەمانی نووسەرایەتی من بەسەرچوو. چیتر نووسەر نیم. هەر ڕستەیەك کە دەنووسم لەبەر چاوم بێ بایەخە، تەواو بێهودەیە." بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی هەرکە کەمێك بوژایەوە، وێڕای بێتاقەتی و ژانەسەرو دڵ هەڵشێوان، گەڕایەوە سەر دەستنووسەکەی و تا درەنگانێکی شەو لەبەر ڕووناکی مۆمان هەر خەریکی نووسین و ڕەشکردنەوەو پاکنووس بوو. ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ ژنەکەی لە ڕەوتی کارەکە ئاگادار دەکاتەوە لە۱۹۰۳/۹/۲۱دا دەڵێت: "پەردەی کۆتایی خۆش دەبێ، ئەوەی ڕاستی بێ سەرانسەری شانۆنامەکە، شادو دڵگیر دەبێ" نامە ڕۆژانەکانی چیخۆف بۆ ئۆلگا، ئەوەیان دەردەخست کە لە دوو بەرەوە خەریکی خەبتین و شەڕ بوو: بەرەی نەخۆشی و بەرەی نووسین. لە۱۹۰۳/۹/۲۵دا دەڵێت: "پەردەی چوارەم بە ڕەحەتی و ئاسانی دەڕوات. لەوە دەچێ دەرهێنانەکەی ئاسان بێت. بۆیە هێشتا تەواوم نەکردووە چونکە نەخۆش بووم" ڕۆژی ۱۹۰۳/۹/۲٦ ئەم بروسکەیە بۆ ژنەکەی دەنێرێت: "هەر چوار پەردەکە تەواو بووە. حازرو ئامادەیە، خەریکی پاکنووسەکەیم. بەم زووانە بۆتی دەنێرم. حاڵم باشترە. ماچت دەکەم. ئانتون" لە۱۹۰۳/۹/۲۷دا بۆی دەنووسێت: "کاراکتەری زندووم خوڵقاندوون. ئەمە ڕاستە، بەڵام نازانم شانۆنامەکە چ بایەخێکی هەیە."

بە دەم پاکنووسکردنەوەی شانۆنامەکەوە بەرە بەرە ساردو ساردتر دەبووەوە، زۆر هەڵەی سایکۆلۆژی بۆ دەردەکەوت، دیمەنی درێژ، گفتوگۆی زیادەو نابەجێ و ناشیانەی کەشف دەکرد. بۆیە، لە خۆی تووڕە بوو ولێبڕا هەر هەموو ئەو کێماسی و کەموکوڕیانەی چاك بکاتەوەو ئەو پەرەگرافانە سەرلە نوێ داڕێژێتەوە. ئۆلگاش لە مۆسکۆ دەتگوت لەسەر ئاو وئاگرە: کەی دەستنووسەکەی پێدەگات؟ هەموو تیپەکە چاوەڕوانی گەیشتنی شانۆنامەکە بوون. چیخۆفیش، لەوێندەر، بێخەم و خەیاڵ خەریکی پێداچوونەوەی خۆی بوو... نەیدەویست کەمترین کەموکوڕی لە دەقەکەدا بمێنێ.. ئەوەبوو لە۲/ت۱۹۰۳/۱دا نامەیەکی پڕپاکانەی بۆ ئۆلگا نارد کە: "بەردەوام نەخۆشم، دەکۆکم، ڕۆژانە دەنووسم ،زۆرنا، گرنگ ئەوەیە دەنووسم، کاتێ کە دەقەکەم بۆ ناردیت و خوێندتەوە هەنگێ دەزانی کە ئەگەر لە زروفێکی دیکەدا بام، یانی نەخۆش نەبام، تۆزێ باشتر بام، دەمتوانی چ توحفەیەك دابهێنم، بەڵام بەم شێوەیەی ئێستایەوە حەیابەرەیە. ڕۆژی دوو دێڕ دەنووسم و دەست هەڵدەگرم." بۆ ڕۆژی دوایی ۳/ت۱۹۰۳/۱ تکای لێدەکات کە زویر نەبێت، دەڵێت: "گیانەکەم! سەبارەت بە شانۆنامەکە بمبوورە، باوەڕبکە تەواوم کردووە، حاڵی حازر خەریکی پاکنووسیم. لەوەی خێراتر کارم پێناکرێت." دوای چوار ڕۆژان جارێکی دی بۆی دەنووسێت: "بەردەوام خەریکی کارم، بەڵام چونکە خاوم، وام دێتە بەرچاو دەقەکەم زۆر درێژ دەردەچێ. قەبە دەبێ. لێی دەترسم، هیچ زەوقێکم لەسەری نەماوە." "بڕوانە نامەی ۷/ت۱۹۰۳/۱).

ئەنجام لە١٢/ت١/ ١٩٠٣دا بانگی سەرکەوتنی داو بۆ ئۆلگای نووسی: "بەو جۆرە، ئەسپە چکۆلەکەم، ئافەرین بۆ سەبرو عەزابی من و تۆ. دەقەکە تەواو بوو، تەواوی تەواو بوو، ئیدی سبەی ئێواریێ یان ئەو پەری بەیانی ڕۆژی ١٤/ت١ بۆ مۆسکۆی دەنێرم." و ئەوجا بەخۆشحاڵیەوە ئەم بەندەشی بۆ نامەکە زیاد کرد: "نازەنینم! کە نووسینی ئەم شانۆنامەیەم بەلاوە قورس بوو!"

دوای ئەوەی شانۆ نامەکەی خستە پۆستەوە، هەستی بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکی کوتوپڕ کرد. ئاخۆ شانۆی هونەر، چی دەربارەی ئەم کۆمیدیایە دەڵێن، کە ئەو هەموو ئەزیەتەی پێوە کێشاوە؟ ئایا نەچوو بووە ژێر بارێکی قورستر لە توانای خۆی؟ بەدەم گومانەوە هەستی بەجۆرە پەشیمانیەك دەکرد کە شانۆنامەکەی نارد بوو، چوونکە پێی وابوو لەکێماسی و کەموکوڕی بەدەر نەبوو. پێنج ڕۆژ بەسەر ناردنیا تێپەڕی. پێی سەیر بوو کە هیچ خەبەرێك لە مۆسکۆوە نەبوو. ڕاستە نامە لە مۆسکۆوە بۆ یالتا دوو ڕۆژی پێدەچوو تا دەگەییە دەستی ئانتون، بەڵام وێڕای ئەوەش بێدەنگی نەمیروفیچ–دانچنکۆ خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی دڵخۆشکەر نەبوو.

ئەنجام لە١٩/١٠/١٩٠٣دا بروسکەیەکی سەدو هەشتا وشەیی لە نەمیروفیچەوە پێگەیی کە(باخی ئالۆبالۆ) باشترین، جوانترین، ڕەسەنترین و شاعیرانەترین دەقی شانۆیی چیخۆفە. چیخۆف یەکسەر نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە نیگەرانی و دوودڵیدا بەدەم چاوەڕوانی هەواڵەوە نەخۆش بووە. دوای دوو ڕۆژان بروسکەیەکی ستانسلافسکی پێگەیی کە بە تەواوەتی ئاسوودەو دڵنیای کرد: "ئا ئێستا لە خوێندنەوەی دەقەکە بوومەوە. بەڕاستی کاری تێکردم. سۆزو گودازێکی وای لاچێکردم، ناتوانم هێوربیمەوە. بەعەمراتم هەستم بەم جۆرە نەشەیە نەکردووە . پێموایە ئەم دەقەت لە هەر هەموو دەقەجوانەکانی ترت باڵاترە. پیرۆزبایی گەرمم بۆ نووسەری بلیمەت." ڕۆژی دوایی و، ڕۆژەکانی دواتریش پاش ئەوەی بەسەر پەرشتی بەڕێوەبەرانی شانۆی هونەر، دەقەکە بۆ هەموو ئەندامانی تیپەکە خوێنرابووەوە، کۆمەڵێك بروسکەی تازەی پیرۆزبایی و دەستخۆشی بۆ هات: "تا بڵێی کاریگەر.. پڕ جۆش و گەرم و گوڕ.. سەرکەوتنێکی بێ وێنە.. درەخشان.. لە یەکەم پەردەوە دڵگیر... بچووکترین شتی تیا فەرامۆش نەکراوە... لە دوا پەردەدا گریاین.. ژنەکەت لەوپەڕی خۆشحاڵیدایە، هەروەها ئێمەش... تا ئێستا هیچ دەقێکی شانۆیی بەم گەرم و گوڕیە ڕەهایە پێشوازی نەکراوە."

هەر کەسێکی دی بوایە لە جیاتی چیخۆف، زۆر دڵی بەم هەموو ستایش و پیاهەڵدانە خۆش دەبوو، بەڵام چیخۆف، وێڕای ئەمەش هەر نیگەران و دوو دڵ بوو. لە٢١/١٠/١٩٠٣دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "ئەمڕۆ بروسکەیەکی ستانسلافسکیم پێگەیی، دەقەکەی بەکارێکی بلیمەتانە داناوم، مانای وایە زیاد لە پێویست هەڵیکێشاوەو ئەوەیش دەکاتە بێبەش کردنی لەو نیمچە سەرکەوتنەی کە لەگینە لە زروفێکی ئاساییدا بەدەستی بێنێ." هەروەها لە نەمیروفیچ – دانچنکۆش پەست و زویر بوو، چونکە کورتەیەکی شانۆنامەکەی لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاوکردبووەوە، ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردبووەوە ئەوە بوو کە ئەو کورتەیەی بڵاو کردبووەوە دروست نەبوو. وای هەست دەکرد بەڕێوەبەرایەتی شانۆی هونەر دوای ئەوەی شانۆنامەکەیان بە

دەست گەیی، بە ئارەزووی خۆیان و بیٚ منەتانە ڕەفتاریان دەگەڵ نووسەرەکەیدا دەکرد. چونکە پێیان نەگوتبوو کە(باخی ئاڵوباڵو) لەم وەرزەدا پێشکەش دەکرێت، دەرهێنانەکەی چۆن دەبیٚ؟ چ ئەکتەرانێك بۆ نواندنی دەورەکان هەڵدەبژێدرێن؟ یانی بەکەیفی خۆیان و بەبیٚ پرسی ئەو ئەکتەران دادەنەن؟ دەیویست دەست پێشکەری بکات، ئەوەبوو لیستی ناوی ئەو ئەکتەرانەی بۆ ناردن کە بەدڵی خۆی بوون. لە هەڕەتی پەستی و تووڕەییدا بوو. باوەڕو متمانەی بەکەس نەمابوو.. ئەنجام بە ڕەزامەندی هەمووان دەورەکان دابەش کران و، یەکەم ڕۆژی دەستپێکی پرۆڤەی دەقەکە خرایە١٠/ت١٩٠٣/٢.

به هەرحاڵ، تا ڕۆژی دیاریکراو نزیکتر دەبووەوە، چیخۆف نیگەران ترو بەدگومان تر دەبوو. بە هۆی کۆکەو نەخۆشی و دڵ هەڵشێوانەوە، لە یاڵتادا گیری خوارد بوو بۆیە نەیدەتوانی بەشداری ڕاستەوخۆ لە ئامادەسازی شانۆنامەکەو نواندەکەیدا بکات و دەترسا مۆسکۆییانی نیازپاك و لە هەمان کاتدا گەوج، لە دووری ئەو دەقەکەی بشێوێنن. لەوە ناخۆشتر هەیە، نووسەرێك نەتوانیٚ، بەشداری لە ئامادەسازی نمایشی شانۆنامەیەکدا بکات، کە سەرکەوتن و ژێرکەوتنی وەستابێتە سەر ئەو نمایش و نواندنە؟ کاتیٚ زانی کەسێك بە نێوی کوروسوف بە تەمایە(باخی ئاڵوباڵو) پاچڤەی فەرەنسی بکات، نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "نازەنینەکەم، ئەسپە چکۆلەکەم، ئاخر پاچڤەی دەقەکەم بۆ فەرەنسی، چ سوودێکی هەیە؟ بە ڕاستی ئەم کارە مایەی پێکەنینە! فەرەنسییەکان نە لە یەزمولای لوپاکین* و نە لە فرۆشتنی موڵکەکە تێناگەن، هەر بێزارییان بۆ دەمێنێتەوە. پێویست بەو کارە ناکات گیانەکەم، هیچ سوودێکی نییە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٣/١٠/٢٤). لە لایەکی دیکەشەوە ئۆلگا و ستانسلافسکی، جاریٚ بە پاڕانەوەوەو جاریٚ بە هەڕەشەوە نامە باران دەکرد، ئیدی لەو نامانەدا بۆچوونی خۆی لەمەڕ دیکۆرو دەرهێنانی شانۆنامەکەو لەمەڕ سایکۆلۆژیای ئەم یان ئەو ئەکتەر دەردەبڕی. وێڕای ئەمەش دڵنیا بوو، کە لەغیابی خۆیدا هیچ کەسێك کەمترین حیساب بۆ ئەو ڕێنوێنیانەی ئەو ناکات و هیچ بە کڵاوی ناپێون. لە١٩٠٣/١١/٢٥ نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "بە بەدحاڵی بوون دەستمان پێکردو بە بەدحاڵی بوونیش کۆتایی پێدێنین. لەوە دەچیٚ ئەوە چارەنووسی شانۆنامەکەم بیٚ."

چارە هەر ئەوە بوو بەلەز خۆی بگەیەنێتە مۆسکۆ . بەڵام تەندروستی زۆر خراپ تێکچوو بەڕادەیەك وەزعی خراپ بوو، بە گیانەمەرگی جلەکانی بۆ لەبەر دەکرا. کە ناردی بە دوای دکتۆر ئالتسشولەردا بێت معایەنەی بکات، هەموو جۆرە سەفەرێکی لێقەدەغەکرد. وەختایەك چیخۆف بۆی گێڕایەوە کە پرۆفیسۆر ئوستروموف ڕێگەی داوەو ئامۆژگاری کردووە زستان لە مۆسکۆ بەسەر بەریٚ، ئالتشولەر، زۆر تووڕە بوو، گلەییەکی زۆری لە هاوڕیٚ بە ناوبانگەی خۆی، ئوستروموف کرد. چیخۆف لە١٩٠٣/١٠/٢دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نووسی کە "... ئالتسشولەر تکای لێکردم نە بۆ مۆسکۆ بڕۆم و نە لەوێندەر بژیم. گوتی دەبیٚ ئوستروموۆ بەسەرخۆشی ئەو قسەیەی کردبێت."

چیخۆف، لە ناخی خۆیدا، دەیزانی کە هەق بە ئالتسشولەرە. نەخۆشیەکە بە ڕادەیەك لێی پیس کرد بوو، نەیدەتوانی بۆ ساتێکیش لە بیری خۆی بەرێتەوە. بە هانگەهانگ جلی لەبەر کرد،

بەرگـەی قورسـی پاڵتۆکـەی بـەری نـەدەگرت. هەرکـە چـوار پێـنج هـەنگاوان بـە نێـو باخچـەکەدا سوڕاباوە، بە ناچاری دەبوا بوەستێ، هەناسەی سوار دەبوو، گـوێی دەکەوتـە وژەوژ. زۆرجار کە لەپشت مێزیکەیەوە دادەنیشت و قەڵـەمی هەڵدەگرت دەست بـە نووسین بکـات، کۆکـە دەیگـرت، ناچار دەبوو قەڵەمەکەی دابنێ و واز لە نووسین بێنێ. کـە خـواردنی لەسـەر خوانەکـە دیتبـا دڵـی تێکهەڵدەهات، بە قێزو بێز ئەو حەبانەی دەخوارد کە دکتۆر بۆی دانابوو. دایکـی و خوشـکەکەی زۆر بەخەمیـەوە بـوون. لـە نزیکـەوە تیماریـان دەکـرد و چاودێرییان دەکـرد، زۆریـان لێدەکرد کـە بەگوێی دکتۆر ئالتسشولەر بکات و پەیڕەوی ئامۆژگاریـەکانی ئـەو بکـات و ڕۆژی هەشـت هێلکـە بخـوات، بـەڵام چیخۆف ئەمـەی پێنـەدەکرا. بـە هـیچ تـرین شـت قـەڵس و بێـزار دەبـوو. خـوا ئـەو خوایەیە تاقەتی نامە نووسینی بۆ ئۆلگاش نەمابوو. جگە لە شانۆ، سەلامەتی و تەندروستی ئەو تاقـە بابـەتی نامـەکانیان بـوو. ئۆلگـا وەکـو هەمیشـە مێردەکـەی ئاگـادار دەکـردەوە کـە ئاگـای لـە تەندروستی خۆی بێت. خواردن بخوات و بە وردی خۆی بپارێزێت. ئۆلگا پاك و خاوێنی بـەدەنی لە مێردەکەی دووپات دەکردەوە، ئەویش بەمە زۆر قەڵس دەبوو. لە نامەیەکیا بـۆ ئۆلگـا لـەوەتای ئالتسشولەر، لەوەتای زانیویەتی ئەو (واتە ئۆلگا) واداری دەکات کەحەمامی سارد بکات، ترسـی نـەماوە. هـەروەها پێـی گـوت (بـە ئۆلگـا) لـەوەتای وازی لـەو جۆرەحـەمام کردنـە هێنـاوە، هـەموو گیـانی بـووە بـە زیپکـەو وردە کوانـان. کـە ماریـا لـە ناوەڕاسـتی مـانگی ئۆکتۆبـەردا سـەفەری مۆسکۆی کرد، ئانتون هێندەی دی پەرێشان بوو. بۆ ئـەوەی ئیسـراحەت بەمێشـکی خـۆی بـدات، ئەو بەرهەمە دەستنووسانەی دەخوێندەوە کە گۆڤاری (هـزری ڕووسـی) بۆیـان دەنـارد تـا هـەڵیان بسـەنگێنێ، نـاو بـە نـاو قسـەی دەگـەڵ دکتـۆر ئالتسشـوڵەردا دەکـردو هـەوڵی دەدا، قەناعـەتی پێبکات کە مۆڵـەتی سـەفەری بـدات. بـەڵام ئالتسشـولەر قاییـل نـەدەبوو. تەنانـەت ئۆلگـاش هـانی دەدا کـە سـەفەر نـەکات، چـونکە کـەش و هـەوای مۆسـکۆ زۆر خـراپ بـوو. تـا زیـاتر ئامۆژگاریـان دەکرد، زیاتر ئەڵهای سەفەری دەکرد. لە٢٣/ت١٩٠٣/١دا نامەیەکی بۆ نەمیروفیچ –دانچنکو نـارد کـە: "بـە تـەنیا دەژیـم، پـارێزی تـەواو دەکـەم، دەکـۆکم، هەنـدێجار هەڵدەچـم، بەخوێندنـەوەوە مانـدووم، ئیـدی ئـەوە ژیـانی منـە." یادگاریـەکانی مۆسـکۆ، شـەپۆل شـەپۆل لـە یادگەیـدا زنـدوو دەبوونەوەو بە سـەریا زاڵ دەبـوون لـە٢/ت١٩٠٣/٢دا نامەیـەك بـۆ نـەمیروفیچ –دانچکو دەنێرێـت: "چەند حـەز دەکـەم ئێسـتا بـڕۆم بـۆ خوارنگـەی ئێرمیتـاج و ماسـی ئـازون بخـۆم و بـوتڵێ شـەرابی ئێرمیتاج* بخۆمەوە. جارێکیان بە تاقی تەنیا لەوێ بوتڵێ شامپانیام خواردەوە.بەڵام سـەرخۆش نـەبووم. پاشـان کۆنیـاکم خـواردەوەو هەمـدیس سـەرخۆش نـەبووم. دوای چـەند ڕۆژێکـی دی بایدایەوە سەر ئۆلگا، لە٧/ت١٩٠٣/٢دا نامەیەکی بۆ نـارد کـە: "مـەیلی نووسینم نیـە، ئـارەزووی سەفەری مۆسکۆ دەکەم. چاوەڕوانی قسەی تۆم.. بۆم بنووسـە نـازەنینم. بـۆم بنووسـە تـا سـەفەر بکـەم، ئێـرە بـەجێ بێڵم... هەستدەکەم تەندروستیم باشـە. ئـەم سـك یەشـەو دڵشـێوانەم لـە کـۆڵ بێتەوە، عەیبم نیە. پێویستم بەوەیە سیستەمی خواردنەکەم بگۆڕم، تۆزێ ئازادتر بژیم. پێویستم بە خواردنی هەموو شتێکە! تـۆ دەڵێـی چـی؟" لـەو کاتانـەدا، دڵنیا بـوو هەرکـە پێـی بگاتـە سـەر خـاکی مۆسـکۆ، یەکسـەر دەبوژێتـەوە. وەکـو (سـێ خوشـکانی) شـانۆنامەکەی، هـەر بـەم خەیاڵـە

**دەژیا. ئەوانەی کە ئامۆژگاریان دەکرد، بە ئۆلگاشەوە، ڕقیان هەڵدەستاند. بە ئامۆژگاریەکانیان قەڵس دەبوو. جا چونکە ئۆلگا، خۆی لەگێلی دەدا و نەیدەویست ئەو چرا کەسکەی بۆ هەڵبکات کە بە هیوای بوو، بەوە تۆمەتباری کرد کە گوایە نایەوێت (چیخۆف) لەگەڵیا بێ و لێی نزیک بێ. بەڵام زوو بایدایەوەو کەوتە پاڕانەوە : "ئەسپە چکۆلەکەم. بمبوورە کە هەمیشە بەدخوویی خۆم دەردەبڕم... خێراکە، خێرا دەعوەتم بکە کە بێم بۆ مۆسکۆ.. وام لێهاتووە بەبێ شانۆو بێ ئەدەبیات ناژیم. بەخۆت دەزانی من کەسێکی ژندارم، حەز دەکەم لەگەڵ ژنی خۆمدا بم، بیدینم... هیچ نانووسم، تەنیا چاوەڕوانی ئەمری تۆم کە جانتاکەم بپێچمەوەو بەرەو مۆسکۆ وەڕێکەوم. بۆ مۆسکۆ! بۆ مۆسکۆ! ئەمە هاواری "سێ خوشکان" نیە، بەڵکو هاوارو داوای مێردێکە."**

**بەجۆرێ کەڵکەڵەی سەفەری کەوتبووە سەر کە دوای دوو ڕۆژان بۆ ستانسلافسکی نووسی: "بە تاسەوە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژو سەعاتەم کە ژنەکەم مۆڵەتم بدات بێم بۆ ئەوێ. خەریکە وردە وردە گومانی ئەوەم لا پەیدا دەبێ نەبا ئۆینێکی لە ژێر سەرابێ. ئێرە ئارامە، گەرمە، خۆشە، بەڵام کاتێ پیاو بیر لە مۆسکۆ و حەمامێن ساندونۆفسکی دەکاتەوە، هەموو ئەم جوانی و خۆشیانەی ئێرەی لە بەرچاو دەکەوێ. کە لە ژووری کارەکەم دادەنیشتم. بە درێژایی کاتەکە چاوم لە سەر تەلەفۆنەکەیە. چونکە بەتەلەفۆن، ناوەڕۆکی بروسکەکانم پێ ڕادەگەیەنن. ئیدی دەقیقە بە دەقیقە چاوەڕوانم بۆ مۆسکۆ دەعوەت بکرێم." (بڕوانە نامەی ١٢/ت١٩٠٣/٢)**

**ئەنجام ئۆلگا، بە سەفەرەکەی قاییل بوو. ئەوەبوو لە٢/ك١٩٠٣/١دا بەلەز، بێئەوەی پرس بەدکتۆر ئالتسشولەر بکات، بەرەو مۆسکۆ کەوتەڕێ. گوێی لە ئاقیبەتی ئەم ڕیسکەی خۆی نەبوو. نەیدەیویست ئەگەر لەسەر حیسابی تەمەنی خۆیشی بووە، خۆی لەم دوا لەزەتە بێ بەش بکات.**

**پەراوێز:**

***- بە گوێرەی ڕای تولستۆی، چیرۆکە دەرەجە یەکەکان بریتی بوون لە: (منداڵان، کیژی کۆرس، دارمایەك، لەماڵەوە، تازیەباری، هەڵاتوو، لەدادگادا، ڤانکا، خانمان، تاوانبار، تاریکی، خەواڵوو، هاوسەر، دڵبەر، کوڕیژگان.)**

**دەرەجە دووەکانیش بریتی بوون لە: (سەرپێچی، خەمناکی، جادووگەر، ڤێرا، لەوڵاتی بێگانانندا، خانمی ئاشپەزباشی شوو دەکات، ئاه! جەماوەر، دەمامك، دەرفەتی ژنێك، ئەعساب، ئاهەنگی زەماوەند، ئافەریدەیەکی بێ پشتیوان، ژانانی دێهاتی، هەراوزەنا، پەژارە.)**

***- ییدیش: زمانێکی تێکەڵە لە ئاڵمانی و عیبری، لە نێو جولەکەکانی ڕووسیاو ئاڵمان و پولاندا دا بەکار دەبرا.**

***- یەرمولای لوپاکین: یەکێکە لە شا قارەمانانی شانۆنامەکە، لە کۆیلە کۆنەکانەو موڵکی ئاغاکەی جارانی خۆی دەکڕێت.**

***- ئیرمیتاج: جگە لە ناوی موزەخانە گەورەکەی ڕووسیا، ناوی شەرابێکی زۆر خۆش و بە ناوبانگی فەرەنسیشە.**

## ئیش شتربه = من دەمرم

کاتیٚ دکتۆر ئالتسشولەر، بە سەفەری کوتوپڕی نەخۆشەکەی زانی هاواری کرد: خۆکوژییە! بەڵام لە ڕاستیا دیمەنی مۆسکۆی ژێر بەفر چیخۆڤ بوژاندەوە. زۆری حەز لە وشکە سەرما، لە ئاپۆراو و قەرەباڵغی خەڵکانی سەر جادەکان، لە زەنگی کلێساو دەنگدانەوەی ئەو زەنگانە لەو هەوا ساف و بەستەڵەکاویەدا، دەکردو، بەو دیمەنانە گەشکەی دەکرد. تاقە کێشەی ئەوە بوو کە کاتیٚ لە پیاسە دەگەڕایەوە، چۆن بەو هەموو قاڵدرمانەدا، بۆ نهۆمی سێیەم سەربکەویٚ. جا بۆ ئەوەی خۆی ماندوو نەکات لێرا، هیچ دەعوەتێك قەبووڵ نەکات. بەڵام ویٚڕای ئەوەش، بۆ ڕۆژی دوایی، چوو بۆ ئەو ئاهەنگە ئۆپراییەی کە شانۆی بولشوی بە قازانجی (شالیاپین)ی هاوڕێی سازی کرد بوو. هەر وەها لە ئاهەنگی سەری ساڵی شانۆی هونەریشدا، کە بەخۆشی ئەوەوە سازیان کردبوو بەشداری کرد. ئەو شەوە زۆر دیمەنی کۆمیکی ڕاستەخۆو یەکسەری لەلایەن ئەکتەرەکانەوە پێشکەش و نمایش کرا، کە یەکێك لە دیمەنە هەرە سەرنج ڕاکێش و کۆمیدیەکان دیمەنی شەڕێکی تەن بە تەن و دەستەو یەخە بوو لە نێوان شالیاپینی کەتەو زەلام بەجل و بەرگی میرێکی ڕۆژهەڵاتیەوە دەگەڵ کەسێکی عەوامی ڕیوەڵەی مردەڵە بە ناوی سولیرجیتسکی کە لە یارانی شانۆی ناوبراو بوو. کە لە کۆتایی شەڕەکەدا، هەردوو هەڤڕك ئاشتبوونەوە، بە دوو قۆڵی گۆرانیەکی ئۆکرانیان گوت. پاشان بۆ شیو چوونە یانەی هونەرمەندان، شیڤیان خوارد، بە کەماڵی ئارەزوو خواردیانەوە، ئەوجا هەموو مێزو کورسیەکان لابران، ئەوجا تێکڕای ئامادەبووان، پیاوان بە جلکی کلکداری پیاوانەی هاوشێوەو، ژنان بەشەوجامەی بریقەداری کورتەوە، دەستیان بەسەماو ڕەقسین کرد. ئۆلگاش دوای تۆزێك لەپڕ هەستاو خۆی بە کۆڕی سەماکاراندا کرد. چیخۆڤ و گۆرکی لە سوچێکا دانیشتبوون، هەوڵیان دەدا لە جەرگەی ئەو بەزم و شادی و کەیفەدا، لە گەرمەی ئەو پێکەنین و مۆسیقاو گۆرانی و هەراو هەنگامەیەدا، گفتوگۆیەکی دۆستانە بۆ خۆ ساز بکەن، جا بۆ ئەوەی لێکدی حاڵی بن و گوێیان لە یەکدی بیٚ، ناچار بوون دەنگ هەڵبڕن، زۆری پێنەچوو کەوتنە کۆکە کۆك، دوای تۆزێك چیخۆڤ بەدەم بزەیەکی خەمینەوە گوتی: "ڕەنگە ئێستا جەماعەت بڵێن: کۆمەڵێك کۆکەی گرینگ و باشیان تەحویلی یەکدی دا.*" بەڵام چیخۆڤ زۆربەی شەوانی لەماڵەوە ،لە شوقەکەی جادەی پترۆفکا، بەسەردەبرد. زۆربەی کات بونینی لەلا بوو. چونکە ئۆلگا زۆرجار دەچوو بۆ شانۆ یان بۆ کۆنسێرت یان لە ڕێوەڕەسمی گشتی کارێن خێرخوازیدا بەشداری دەکرد. هەندێجار نەمیروفیچ- دانچنکو بە دوای ئۆلگادا دەهات. ئەم پیاوە هەمیشە جلی جوانی لەبەردەکرد، خۆی لە بۆنی جگەرەی بۆندارو عەتری بۆنخۆشدا هەڵدەکێشا، ئۆلگا بە جلی حەفلەوە، گەنج و شەنگۆڵ، خۆش بۆن و بەرامە، ڕووی دەکردە مێردەکەی: "بێتاقەت نەبی گیانەکەم. خۆ بێتاقەت نابی؟ دەزانم تۆ هەمیشە هاونشینی بوکویچونت پێخۆشە. (چیخۆڤ، لە خۆشەویستیدا ئەو ناوەی لە بونین نابوو) بە دوعا." هەنگیٚ بۆنین دەستی ماچ دەکردو ئۆلگا وەدەردەکەوت و نەمیروفیچ -دانچنکو

بە دوویا. کە جووتە هاوڕێ بە تەنیا دەمانەوە، بە کەماڵی ئازادی دەکەوتنە قسەو باسان. چیخۆف بە هاونشینی بۆنین زۆر ئاسوودە دەبوو، زۆر خۆمانە ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد، تەنانەت هیچ لاری لەوەش نەبوو کە لەسەر داوای ئۆلگا، بە بەرچاوی هاوڕێ گەنجەکەیەوە سەری بشوات. ئیدی بە بەرچاوی ئەوەوە. بەجلی ناو ماڵەوە دەهات و دەچوو، قسەی بۆ دەکرد، باسی خانەوادەکەی، منداڵیەتی خۆی، بۆچوونی دەربارەی هونەرو ئەو کتێبانەی کە تازە خوێندبوونیەوە، بۆ دەکرد. لە یادەوەریەکانی خۆیدا ئەمەی لەو بارەیەوە گێڕاوەتەوە: "ئۆلگا لیوناردوڤنا، زۆرجار نزیکی چواری بەیانی بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، هەندێجار دگەیبە بەرە بەیانیش، هاتنەوەی چی، بۆنی شەراب و عەتری سەعاتە ڕێیەك دەڕۆیی و دەیگوت: "بۆچی تا ئێستا نەخەوتووی گیانەکم؟ ئاخر بۆ تەندروستیت باش نیە. ئاه! هێشتا لێرەی بوکویچون؟ قەت لە تۆ تێرنابێ." هەنگێ بەپەلە هەڵدەستام و دەڕۆیشتم."

هەندێجاریش ڕێدەکەوت کە چیخۆف، ڕیسك بکات و، ئۆلگا دەستی بگرێت و لەماڵ بچێتە دەرێ. زۆری حەز دەکرد، دەگەڵ ئۆلگادا، لە جادەو بانان دەربکەوێت، شایی بەخۆی دەهات. داوای لە ئۆلگا کرد کە پاڵتۆیەکی فەرو و کڵاوێکی پێستە سمۆرەی بۆ بداتە دروون. ئیدی بەو جلە تازانەوە، پۆشتەو پەرداخ بە دووقۆڵی، هێدی هێدی و بە پارێزەوە بە جادەکاندا پیاسەیان دەکردو زوو زوو بەدەم تەمەشاکردنی جامخانەی موغازەکانەوە دەوەستا، تا پشوویەك بدات. بۆ ئەوی زۆرترین کات لە گەڵ ئۆلگادابێ، لە زۆربەی پرۆڤەکانی (باخی ئالۆباڵو)دا ئامادە دەبوو. بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بۆی دەردەکەوت کە ستانسلافسکی لە دەرهێنانەکەیدا. تەفسیرێکی دەقاودەق پێچەوانەی مەبەستی نووسەری بۆ شانۆنامەی ناڤبری کردووە. چیخۆف بە تەنیا لە ژووری ساردو تاریکە چکۆلەکەدا دادەنیشت، پاڵتۆ فەروەکەی لەبەر دەکردو تابنی چەناگەی دوگمەی دەدا. بە زۆر بەری کۆکەکەی دەگرت، بە تووڕەیی زەڕبینەکەی دادەکەندو لە چاوی دەکردەوە، زۆری پێناخۆش بوو کە دەیبینی شانۆنامەکەی بەرە بەرە دەگۆڕێت بۆ شتێکی پێچەوانەی ئەو شتەی کە ئەو مەبەستی بوو. هەوڵی دەدا، لە پێشا بە ئارامی و پاشان بە تووڕەیی، ڕاوبۆچوونی خۆی بۆ ستانسلافسکی شرۆڤە بکات و بهێنێتە ڕەدا کە بە قسەی ئەم بکات، بەڵام ستانسلافسکی ئامادە نەبوو گوێی لیبگرێت. چونکە باوەڕی وابوو کە نووسەر بۆی نیە خۆی لە کاری دەرهێنان و دەرهێنەر هەڵقورتێنێت. ئەوە بوو لە ٢٦/ك١٩٠٣/١دا نامەیەکی بۆ خانمێکی ئەکتەری دۆستی خۆی نووسی کە: "گوڵەکان تازە لە شکۆفەدا بوون، کە نووسەرەکە لەولاوە هات و هەموو شتەکانی شێواند." ئۆلگاش لەوبارەیەوە دەڵێت: "نووسەرو بەڕێوەبەرەکان، نەدەتوانن لە یەکدی حاڵی بن، نە ڕێك بکەون." هۆی سەرەکی ئەم ناکۆکیەی نێوان ستانسلافسکی و چیخۆف ڕاڤەو شرۆڤەی بەرهەمەکە بوو لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە. چیخۆف پێی وابوو وچەندین جار دووبارەی کردبووەوە کە ئەم بەرهەمە نەك هەر کۆمیدیایە، بگرە نیمچە کۆمیکیشە، بەڵام ستانسلافسکی بە درامایەکی کۆمەڵایەتی دەزانی کە هەرەسی چینی چکۆلەی ئاغاواتی گوندی لە هەنبەر چینی نۆکیسەو تازە دەوڵەمەندی عەوامی خەڵکیدا، نیشان دەدا و وێنە دەگرێت. ستانسلافسکی بەر لە هاتنی چیخۆف، هەموو ئەکتەرەکانی بەوە

تەڵقین دابوو کە بەو ئاڕاستەیەدا تەمسیل بکەن و پێی دەگوتن: "مەسەلەکە ئەوە نیە کە جەماوەرەکە بێنینە پێکەنین، گرینگ ئەوەیە وایان لێبکەین بۆ ئەو دنیا ئەفسوناویەی ژیانە ئابڕوومەندانەیە بگرین، کە لە هەنبەر زەرورەتە ئابوریە تازەکاندا خۆ ناگرێ و لە هەرەسهێناندایە. چیخۆف، زۆری هاواری کرد، بەڵام فایدەی نەبوو، ستانسلافسکی ملی بۆ نەدا و نەدا چیخۆف بە یەکێك لە میوانەکانی دەڵێت: "نازانم مەسەلەکە چیە، یا دەقەکە باش نیە یان ئەکتەرەکان تێی ناگەن... نواندن و نمایشی (باخی ئالوبالو) بەم دەرهێنانەی ئێستایەوە، دروست نیەو هەر نایەتە نواندنیش." ئیدی بەچەند ڕۆژێك پێش نمایشی یەکەم، نامەیەکی (١٣/ك٢/١٩٠٤) بۆ خاتوو کارکیفیچی بەڕێوەبەری قوتابخانەی یاڵتا، کە دۆستی کۆنی بوو، نارد کە: "باوەڕ ناکەم سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەس بێنیٚ، شتەکە لە ئاستێکی نزمدایە." بەرە بەرە ستانسلافسکی بەخۆیشی ترسی ئەوەی لێنیشت کە پێشوازیەکی ساردو سڕ لە شانۆنامەکە بکرێت. جا بۆ ئەوەی ڕەونەقێکی زیاتر بەو کارە شانۆییە بدات ، کەمێك بازاڕەکەی بۆ گەرم بکات، لەپڕ هات بە سەرپاو بڕیاری دا، یەکەم ڕۆژی نمایشی دەقەکە بخاتە (١٧/ك٢/١٩٠٤) کە گوایە ڕێکەوتی چل و چوارەمین ساڵیادی لەدایکبوونی چیخۆف و بیست و پێنجەمین ساڵیادی دەستپێکی ژیانی ئەدەبی ئەوی دەکرد.* بۆیە ئەم کارەی کرد، بە خەیاڵی خۆی ئەگەر جەماوەری تەمەشاڤانان چەپڵە بۆ شانۆنامەکە یان ئەکتەرەکانیش لێنەدەن، ئەوا ئافەرین و دەست خۆشی لە نووسەرەکەی دەکەن.

(گۆرکی و ئاندرییڤ)ش، بڕیاریان دا ئەم یوبیل و بۆنەیە بقۆزنەوەو مارکس هانبدەن بەو گرێبەستەدا بچێتەوە کە دەگەڵ چیخۆفدا بەستبووی. هەستان نامەیەکیان بەم ناوەڕۆکە بۆ مارکس نووسی کە گوایە ڕووسیا بەم زووانە، بە بۆنەی بیست و پێنجەمین ساڵیادی یەکەم چالاکی ئەدەبی چیخۆفەوە ئاهەنگێك دەگێڕێت. چیخۆفیش نەخۆشە، وێڕای ئەو هەموو خزمەتە هونەرییە بەرزەی بە وڵاتەکەیی کردووە، لەوپەڕی دەسکورتیدا دەژی، بۆیە ئەرکی نیشتمانی و ڕۆشنبیری مارکس وا دەخوازێت، کە مەرجەکانی ئەو گرێبەستەی دەگەڵ مرۆڤێکی بلیمەتی خۆشباوەڕی متمانە بەخڵکدا مۆری کردووە، هەندێك باش بکات. ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران، هونەرمەندان و، مامۆستایانی زانکۆ، نامەکەیان ئیمزا کرد. بەڵام کاتێ چیخۆف بە نامەکەی زانی، بە هیچ کلۆجێ ڕازی نەبوو، ئەو نامەیە بنێردرێت. ئەوە بوو بە تیلیشوفی گوت: "من بە حوسن و ڕەزای خۆم ئەم گرێبەستەم دەگەڵ مارکسدا ئیمزا کردووە. بۆیە نامەوێ لە قسەی خۆم ژێوان ببمەوە. ئەگەر بەرهەمەکانی خۆم هەرزان فرۆش کردبێ، تەنیا خۆم بەرپرسم. هەڵەیەکی گەوجانەم کردووە، مارکس لە گەوجێتی خەڵکانی دی بەرپرس نیە. جارێکی دی گەوجێتی وا ناکەم." هەروەها لە نامەیەکا بۆ یاکوڤلیڤ لەو بارەیەوە دەڵێت: "دەبوایە بەخۆم بەرهەمەکانم بڵاوبکەمەوە، بەڵام ئەوسا لە کوێ بمزانیایە کە پێنج ساڵی دی دەژیم؟ ئەوسا هەفتاو پێنج هەزار ڕۆبڵم، بەلاوە هێندە زۆر بوو، لە من وایە هەر تەواو نابێ. بەڵام ئێستا، ئەگەر دەرامەتی شانۆنامەکانم نەبێ، هیچم نابێت."

به مەزەندە هەستی کردبوو، کە ئەکتەرەکان، ژێراو ژێر خۆ ئامادە دەکەن، کە دەگەڵ یەکەم نمایشی دەقی (باخی ئالۆبالۆدا) ئاهەنگی ساڵیادی لە دایکبوونی نووسەرەکەیان بگێڕن. جا چونکە لەم جۆرە ئاهەنگانە بێزارو لە هەر خۆ نواندنێك دەترسا. شەوی ١٧/ك١٩٠٤/٢ لە ماڵەوە مایەوەو نەچووە دەرێ. بەو جۆرە بەبێ ئامادەبوونی ئەو، پەردە لەسەر بەشی یەکەمی نمایشەکە لابرا، کە هەڵبەتە برادەرانی شانۆی هونەر زۆریان پێناخۆش بوو. بەڵام ستانسلافسکی و نەمیروفیچ – دانچنکۆ لە کۆتایی پەردەی دووەمدا، نووسراوێکیان بۆ نارد کە هەم ئەکتەرەکان و هەم تەمەشاڤانان خوازیاری ئامادەبوونی ئەون. چیخۆڤ لە کۆتایی پەردەی سێیەمدا دەگاتە ئەوێ و هەردوو دەرهێنەر، دەستی دەگرن و دەیبەنە سەر تەختەی شانۆکە کە هەموو ئەکتەرەکان و نوێنەی کۆمەڵە ئەدەبیە سەرەکیەکانی مۆسکۆ خەریك بوون لە وێ خڕ دەبوونەوە .
لە ڕیزی پێشەوە وەستانیان، ئەکتەرەکان و نوێنەرانی دەزگا ئەدەبیەکانی مۆسکۆ لەپشتیەوە ڕیز بوون، جەماوەری تەمەشاڤان لە ناو هۆڵەکە و لەبەردەمیەوە کەوتنە چەپڵە لێدان و هوراکێشان. ئاهەنگەکە بە پێشکەشکردنی دیاری و سەوقاتیان، تاجە گوڵینەو چەپکە گوڵ لە هەموو لایەکەوە لەسەر تەختەی شانۆکەو لە بەردەم میوانی فەخری حەپەساو، چیخۆڤ کەڵەکە بوو.. ئەوجا نۆرە هاتە سەر وتاری ستایش و پیاهەڵدان، ئەو وتارانەی لە هەموو بۆنەیەکدا پێشکەش دەکرێن. ئیدی ڕۆژنامەوانان، ئەکتەران، سەرۆکی بنکە ئەدەبیەکان، یەك لە دوای یەك دەهاتنە سەر شانۆو دەکەوتنە ستایش و پیاهەڵدانی پیاوێك کە لە هەر جۆرە ستایشێك بێزار بوو. چیخۆڤ لەوێندەر وەستا بوو: ڕەنگ زەرد، بێتاقەت، خۆی لە جلەکانیا توند پێچابووەوە، چاوانی لەبەر تیشکی بلاچکتۆری پێشەوەی شانۆکە، لێکدا لێکدا دەتروکان، حایرو سەرسام نەیدەزانی چی لە دەستی بکات. بە تۆبزی کۆکەکەی کۆنترۆڵ دەکرد. ئەوەندە بێ وەزع بوو لە زگ بوو بکەوێت، یەکێك لە ناو هۆڵەکەوە هاواری کرد: "دانیشە!" بەڵام کورسی لەسەر شانۆکە نەبوو تا دانیشێت. ئەمە جگە لەوەی هەستی دەکرد، ئەدەب و ئەتەکێت وای لێدەخوازێ بە پێوە بوەستێ: ئەمە کەمترین کارێك بوو کە دەیتوانی بەرانبەر بەو هەموو خەڵکە بیکات کە لەبەر خاتری ئەو و بەمەبەستی قەدرزانی ئەو لەوێندەر کۆبووبوونەوە. وێڕای ئەمەش هەمیشە گاڵتەی بەمەیلی وتارخوانی دوورو درێژ و کوڕی خواردنەوەی پڕ درۆی ڕووسەکان دەهات و حەزی لەو جۆرە کۆڕو مەجلیسانە نەبوو، مەگەر هەر ئەوە نەبوو، کە کاتی خۆی نەچوو بوو بۆ یوبێلی گریگوروفیچ، ئەو گریگوروفیچەی تواناو بە هرەی چیخۆڤی کەشف کرد بوو؟ مەگەر هەر ئەو جارێکیان بە نەمیروفیچ–دانچنکۆی نەگوتبوو، ترسی لە مردن کەمترە تا لە وتارێك کە کەسێکی وەکو گولتسیڤ لەسەر گۆڕەکەی بیخوێنێتەوە؟ ئێستاش گولتسیڤی بەڕێوەبەری گۆڤاری "هزری ڕووسی" لەوێ بوو، خوتبەی دەدا، گوایە پیرۆزبایی لە چیخۆڤ دەکرد، بەجۆرێ قسەی دەکرد، لەتۆ وایە چیخۆڤ بە قووڵی شەش پێیان لە ژێر خاکدایە. لە نێوان هەر دوو وتارو کەرەتێك کۆمەڵێك بروسکەی پیرۆزبایی کە لە سەرانسەری ڕووسیاوە دەهاتن، دەخوێنرانەوە. چیخۆڤ، هێشتا بەپێوە وەستا بوو، بە دەم گوێگرتنەوە، زەق زەق دەیڕوانیە بۆشایی و عەینەکە زەڕەبینەکەی پاك دەکردەوە. وەکو ئەوەی ئەم بەزم و ئاهەنگە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبێ.

خوا خوای بوو ساتێ زووتر ئاهەنگەکە تەواو بێت. ماری، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بە بێدەنگی لە لۆجەکەی خۆیدا دانیشتبوو، خوا خوای بوو ئەم ئافەرین و ستایشە هەتا هەتایە بەردەوام بێ. وای هەست دەکرد، ئەم سەرکەوتنە بێ وێنەیەی براکەی، قەرەبووی بیست دانە ساڵی خۆشەویستی و لەخۆ بردەیی بۆ دەکاتەوە. ئەو ڕەنجەی بە براکەیەوە کێشاویەتی بە خەسار نەچووە. ئۆلگا کە لە سەر شانۆکەو لەبەر تیشکی زۆر ڕوناکی بلاجکتۆر وەستا بوو، ماری کە لە تاریکی هۆڵەکەدا دانیشتبوو، دوو ئافەرەتی کۆڵەگەی ژیانی چیخۆف بوون. ئەنجام نۆرە هاتە سەر نەمیروفیچ —دانچنکۆ، بە ناوی شانۆی هونەرەوە، ڕووی کردە چیخۆف و بەدەنگە خۆش و کاریگەرەکەی بەمجۆرە کۆتایی بە ئاهەنگەکە هێنا: "ڕەنگە پیرۆزباییەکانی ئێمە ماندووی کردبیت. بەڵام ئەوەی مایەی دڵخۆشیە ئەمەیە: ئەوەی لێرەدا دەیبینی تەنیا مشتێکە لە خەرواری ڕێزو خۆشەویستی ڕۆشنبیرانی ڕووس بۆ تۆ. شانۆکەی ئێمە بە ڕادەیەك قەرزارباری بەهرە، دڵنەرمی ونیهادپاکی تۆیە کە هەقی خۆتە بێ چەندوچوون بڵێی: "ئەمە شانۆی منە."

ئیدی ئەم ستایش و پیاهەڵدانە، فرە دەنگیە، لە بەردەم تەمەشاڤانەکاندا، کە هەموو بەپێوە وەستابوون و چەپڵەیان بۆ وتارە بەڕیتم و ئاهەنگەکان لێدەدا، پتر لە سەعاتێك بەردەوام بوو. چیخۆف پاش قسەکانی نەمیروفیچ، هیلاك و ماندوو، بێئەوەی بە وشەیەکیش سوپاسی کەس بکات شانۆکەی بەجێهێشت. ستانسلافسکی کە یەکێك بوو لە ڕێکخەرانی یوبێلەکە، لەوبارەیەوە دەڵێت: "یوبیلەکە بە ڕێك و پێکی، بە شێوەیەکی پڕشکۆ بەڕێوە چوو، بەڵام جۆرە خەمباریەکی پێوە دیار بوو، بۆنی تازیەباری لێدەهات. هەموو دڵمان تەنگ بوو." بەڵام چیخۆف، کە گاڵتەی بەو جۆرە ئاهەنگ و بۆنانە دەهات و ڕەخنەی لێدەگرتن، بە ڕادەیەك کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم هەموو ڕێزو ستایش و قەدرگرتنەوە، دوای دوو ڕۆژان، لە ١٩/ك١٩٠٤/٢دا نامەیەکی بۆ باتیوشکوف نارد کە: "زۆریان ڕێزگرتم، بەخۆشی و شادیەکی باوەڕ نەکردەنیەوە ڕێزو حورمەتی خۆیان نواند، ئێستاش مەستی ئەو دیمەنانە بەری نەداوم."

هەڵبەتە هەڵهەڵەو ستایش وچەپڵە ڕێزانی خەڵکەکە زیاتر بۆ نووسەرەکە بوو تا بۆ شانۆنامەکە. لە شەوی یەکەمدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان بێدەنگ بوون. ڕۆژنامە ڕاستگەراکان گلەیی ئەوەیان لە چیخۆف دەکرد کە بابەتێکی کۆنی سواوی هەڵبژاردووە، ڕۆژنامە چەپگەراکان، ئیرادی ئەوەیان دەگرت کە تراجیدیایەکی کۆمەڵایەتی پێکەنین ئامێزی نووسیوەو دەیەوێ تەمەشاڤانانیش پێبکەنن. وا دیار بوو هیچ یەکێك لە ڕۆژنامە و بڵاڤۆکەکان ئەو کۆمیدیایەیان لە (باخی ئاڵو باڵو)دا نەدەبینی کە چیخۆف باسی دەکرد. دیارە چیخۆف ئەمەی لە بەر گران بوو، بۆیە دوای چەند مانگێك، لە نامەیەکا (١٩٠٤/٤/١٠) گلەیی دەباتە بەر ئۆلگاو دەڵێت: "بۆچی نووسەرانی دیوارنامان و بەشی ئاگاداری ڕۆژنامان، سوورن لە سەر ئەوەی شانۆنامەکەم بە دراما ناو بەرن؟ ئەوەی ستانسلافسکی و نەمیروفیچ — دانچنکۆ، لەم شانۆنامەیەدا دەی بینن، بە هیچ جۆرێ ئەوە نیە کە من نووسیومە، گرەو دەکەم شتاقیان، نە ئەمیان و نە ئەویان، شانۆنامەکەیان بە تەواوی و بە وردی نەخوێندووەتەوە." ئەو تەوەتورو هەڵچوونەی لە (باخی ئاڵو باڵو)دا بەدی دەکرا زادەی

ناكۆكی لایەنە تراجیدیە كپ و بێدەنگەكەی بابەتەكەو لایەنە نیمچە كۆمیدیەكەی ئەو ئەكتەرانە بوو كە دەورەكەیان دەبینی. لە (باخی ئاڵو باڵودا)دا نەبوونی ڕووداو تەنشی درامی دروست دەكات، كە نەبوونی ڕووداو لێرەدا یانی لەم شانۆنامەیەدا، زۆر دیارترە وەك لە شانۆنامەكانی دیكەی. جا جەماوەری تەمەشاڤان كە گرفتاری جادووی گفتوگۆ و دیالۆگی خاوو هێمایی ڕۆژانەیە، نەك چاوەڕوان و تەسەوری هیچ گۆڕانێك ناكات. بەڵكو لەوەش دەترسێت، كە شتێكی كوت و پڕ ڕوو بدات و ڕەوتی ژیانی ئارامی گوند بشێوێ. لە دڵی خۆیدا هیوا دەخوازێت كە (باخی ئاڵو باڵو)ەكە نەفرۆشێت. ئەم خانوو وباخە موڵكی بنەماڵەیەكی كۆنە، پڕە لە یادگارو بیرەوەرییان. خاوەنی باخ و موڵكەكە، وەكو گەلێك لە كاراكتەرەكانی چیخۆف، خەڵكانێكی خەیاڵپەروەرن و لە ئاستانەی نابوودیدان و كار وابڕوات بەو زوانە باخ و موڵكەكەیان لەدەست دەدەن و لیبوۆ ڕانیڤسكایاو لیوندگاییڤی برای لەم ماڵە گوندیەدا، بە سۆزەوە خەون بە ڕابردووەوە دەبینن، بیر لە ژوورەكانی منداڵی خۆیان دەكەنەوە، یادی دار ئاڵوباڵوەكان دەكەنەوە. ئەم خوشك و برایە دوو كەسی دەسەوەستان و نەزانن، هیچیان لە دەست نایەت بۆ ڕزگاركردنی ئەم شوێنە كە زۆریان بەلاوە ئازیزە. هیچ قەرارێكیان بۆ نادرێ، ئیشی ئەمڕۆ دەخەنە سبەی، خۆ بە بەخت و شانس دەسپێرن كە لەم كێشەیەیان ڕزگار بكات. لیوبوۆ ڕانیڤسكایا، تەنانەت ئەو زەحمەتەش بە خۆی نادات كە بچێتە دیدەنی پورە دەوڵەمەندەكەیان كە لەگینە بتوانێ كارێكی وەها بكات ئەو شوێنە نەفرۆشرێ و لەو كێشەیە ڕزگاریان بكات. گاییف ڕۆژ تا ئێوارێ خەریكی بلیاردە، سەرباری ئەمەش لیوبوۆ (ئانیا) ئاشق و دۆستێكی خوێندكاری هەیە كە زۆری خۆش دەوێ، ناوی تروفیموفەو لە پاریسە. گاییف زۆر بەجدی بیر لەوە دەكاتەوە كە لە بانكێكدا دابمەزرێ، بەڵام ئانیاو تروفیموف، كە ڕەمزی گەنجان بوون، حەزیان دەكرد باخەكە نەمێنێ. تروفیموف، بە ئانیا دەڵێت: "سەرانسەری ڕووسیا باخی ئاڵوباڵوی ئێمەیە. وڵاتی ئێمە گەورەیە، پڕە لە شوێنی جوان" بێموبالاتی و خەمساردی گشتی لە پەردەی سێیەمی شانۆنامەكەدا، لەو ئاهەنگەدا دەردەكەوێ كە بە بۆنەی خستنە مزایەدەی باخەكەوە دەگێڕدرێ. بە رجەستە دەبێت .هەر هەمووان هەڵدەپەڕن، دەخۆنەوەو چاوبڕكێ دەكەن، تا فەزیحەتی فرۆشتنی باخەكە لە بیری خۆ بەرنەوە. ئەمە وەكو ئەوە بوو ماڵەكە لە ژێر دارا كوژرا بێ و خاوەنەكانی لەسەر جەنازەكەی هەڵپەڕن . كڕیاری موڵك و ماڵەكە، لوباكینی بازرگانە. پیاوێكە دڵڕەق، سەرسەخت، زبر، كارزان، بە نیازە هەموو دار ئاڵوباڵوەكان ببڕێتەوە و موڵكەكە بەش بەش بكات و هەر بەشەی بكات بە ڤیلایەك و پاشان بیانفرۆشێت. ڕوو لە میوانان و ئامادە بوان هاوار دەكات: "من موڵكێكم كڕیوە كە باب و باپیرم بە كۆیلەیی لە سەری ژیاون، بۆیان نەبووە بچنە موبەقەكەشیەوە." هەرچەندە دەیویست جوانی تەبیعەت، شیعریەتی تەبیعەت، لەپێناوی پارەو دەسكەوتی ڕووتدا، وێران بكات، بەڵام گوناح و تاوانی ئەو، بە هیچ جۆرێ لە گوناح و تاوانی خاوەنانی مۆڵكەكە، ڕانیفسكایا یان گاییف زیاتر نەبوو كە بە هۆی فەرامۆشكاری و خەمساردی ئەوانەوە، ڕۆژی ئەو موڵكە جوانە بەم ڕۆژە گەیی. لوپاكین دەكاتە ڕەمزو نمایندەی ئایندە، ئایندەی پڕ لە كارو كۆشش و ئەقڵانیەتی دوور لە هەر سۆزو گودازێك، بەڵام خاوەنانی موڵكەكە دەكەنە ڕەمزو

نمایندەی ڕووسیای کۆن، ئەو ڕووسیایەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پیاوی ئەفسوون دەکردو ئێستاویران و داروخاو سیحری بە تاڵ بوو بووەوە.

باخی ئالۆبالۆ، کە لە شانۆنامەکانی دیکەی چیخۆف بچووکترە، سیحرو ئەفسوونەکەی لە جوانی بەرجەستە کردنی تەنزئامێزی هاماجی ماڵباتی خاوەنانی موڵکەکەدایە. تەماشاڤان، کە گوێی لە دیالۆگ و گفتوگۆ سادەو ڕوون و ڕەوانەکان دەبێت، وا هەست دەکات کە ساڵەهایە ئەو ماڵباتە لە نزیکەوە دەناسێت و ئاگای لە هەموو شتێکی ڕابردوویانەو حاڵی حازر میوانە لەو بەهەشتە فیودالیەدا کە بە بەرچاوی خاوەنەکانیەوە وێران دەبێ. پەرجووی چیخۆف لەوەدایە کە هونەریانە پێکەنین و خەم، خۆشی و ناخۆشی تێکەڵ کردووە. کاتێ لە کۆتایی شانۆنامەکەدا فیرسی خزمەتکاری پیر، خۆی بە تەنیا دەبینێتەوە، ئاغاکانی لەو ماڵە چۆڵ و هۆڵەدا بەجێیان هێشتووە و کاتێ هاونەوا دەگەڵ دەنگی تەوراندا کە دارەکان دەبڕنەوە، لەبن لێوانەوە خۆی دەدوێنێ، ئیدی تەماشاڤان نازانێ کێ مەحکوم بکات و بەزەیی بە کێدا بێتەوە. هەرچەندە چیخۆف، گاڵتە بە قارەمانە لاوازو دوو دڵەکانی خۆی دەکات، بەڵام بە ڕاستگۆیی و میهر و خۆشەویستییەکی زۆرەوە کەم و کوڕی وکێماسیە ئەخلاقیەکانیان وێنە دەگرێت. ئانیا، کاتێ کە (باخی ئالۆ باڵو)ەکە بەجێدڵێ هاوار دەکات: "بە دوعا ئەی ماڵەکە! بە دوعا ژیانی کۆن." ترۆفیموف بەخۆشی و گەشبینی سەردەمی گەنجایەتییەوە، دەنگی دەخاتە پاڵ دەنگی ئەو ودەڵێت: "مەرحەبا، ئەی ژیانی تازە!" ئەمە بانگەوازی نەوەی نوێیە. بەڵام دوا قسە لە دەقی شانۆییەکەدا قسەی فیرسی پیرەمێرە کە ئاغاکانی فەرامۆشیان کردووە. لە بن لێوانەوە دەڵێت: "ڕۆیی بەبا ژینم، وەکو ئەوەی هەرگیز و هەرگیز نە بووبێ، ڕۆیی."

پێدەچێ چیخۆفیش، پاش نمایش و پێشکەشکردنی (باخی ئالۆ باڵو) هەمان هەستی فیرسی هەبووبێ. ئێستا هیچ کارێکی نەبوو خۆی پێوە خەریك بکات، ڕۆژ بە ڕۆژ واقیعبین تر دەبوو. گەیی بووە قەناعەت کە لە ئێستا بەدواوە هیچی دیکەی بۆ نانووسرێت. بۆ کات بەسەر بردن، بە مەلزەمە چاپکراوەکانی (باخی ئالۆبالۆ)دا دەچووەوە. قەڵەم بەدەست ئەو دەستنووسانەی دەخوێندەوە کە گۆڤاری (هزری ڕوسی) بۆی دەنارد. هەروەها پێشوازی میوانانی دەکرد، وەکو هەمیشە گلەیی لە زۆربەی میوانان دەکرد. لە نامەیەکیا (٢٠/ك٢/١٩٠٤) بۆ دکتۆر سریدین لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئێرە شێتخانەیە، نامپەرژێ سەری خۆم بخورێنم. یەك چرکە وەختم بۆ خۆم نیە، هەمیشە مژوولی پێشوازی و بەرێکردنی میوانم، بەردەوام قسەیان بۆ دەکەم، وام لێهاتووە لەو ساتە کەمانەدا کە ئازادم ، بیر لەوە بکەمەوە بگەریمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم لە یاڵتا، بیرێکی خراپیش نیە، پێمخۆشە."

گفتوگۆی نێوان چیخۆف و میوانەکانی زیاتر دەربارەی شەڕی نێوان ڕووسیاو ژاپۆن بوو کە تازە دەستی پێکرد بوو. چیخۆف بە پارێزەوە لە درۆو دەلەسانی ناو ڕۆژنامانی دەنۆڕی، بەڵام وەکو نیشتمانپەروەرێك ڕەفتاری دەکردو سەرکەوتنی خێراو بنجبڕی ڕووسیای بە ئاوات دەخواست. تەنانەت باسی ئەوەشی دەکرد – هەڵبەتە بە جۆرە دوودڵیەکەوە– وەکو پزیشکێکی خۆبەخش پەیوەندی بەبرینەکانی سوپاشەوە بکات. وەختێ یەکێك لە میوانەکانی پێشنیازی کرد

کە ئەو ڕووداوە، لە شانۆنامەیەکدا بەرجەستە بکات، وەڵامی دایەوە: "گوێ بگرە. پێویستە بیست دانە ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێبپەڕێت. مەحاڵە لەمڕۆدا هیچ قسەیەکی لە بارەوە بکرێت. نووسەر دەبێ لە باری دەروونیەوە ئارام و ئاسوودە بێت، دەنا ناتوانێ بێلایەن بێت."

کاتێ لیدیا ئەڤیلوڤا، جارێکی دی لە ژێر داروپەردووی فەرامۆشی ڕابردووەوە، سەرهەڵدەداتەوەو بە نامەیەك داوای لێدەکات چیرۆکێکی بۆ بنێرێت تا لەو کتێبەدا بڵاوی بکاتەوە کە بە تەما بوو بۆ سوودو قازانجی برینداران جەنگ چاپ و بڵاوی بکاتەوە. هەڵبەتە چیخۆف بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە، هانی نەداو پێشنیازی کرد کە باشترین پرۆژە، بۆ هاوسۆزی دەگەڵ بریندارانندا ئەوەیە کە گوڵبژێرێك لە باشترین چیرۆکێن جیهانی هەڵبژێرێت و لە کتێبێکدا بڵاویان بکاتەوە. (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٢/٧ هەر لە هەمان نامەدا پێی ڕاگەیاند بوو کە بە تەمایە بۆ یاڵتا بگەڕێتەوە. بەخۆیشی نەیدەزانی چ شتێك بەرەو قرمی ڕادەکێشا، ئەو قرمەی کە حەزی لێنەدەکرد، ناوی نابوو (سیبریای باشوور) زندانی ئاسمان شین. بی ئەو شوێنە هەلی نەدەکرد. پێدەچوو، ئەو هاتوچۆیەی بۆ ئەوێندەر، بێئەوەی بە خۆبزانێ، لە باری دەروونیەوە جۆرە خۆدزینەوەیەك بووبێ لە مردن. نەخۆشیەکەی گەیی بووە ڕادەیەك کە گوێی بە ڕێنوێنی و ئامۆژگاریەکانی ئالتسشولەرو ئوستروموف نەدەدا، بەڵام وێڕای ئەوەش، بیری کەوتەوە کە ئوستروموف گوتبووی هاوین لە دەوروبەری مۆسکۆ بەسەر بەرێت. دەگەڵ ئۆلگادا چوو بوو تسارتسینۆ، تا تەمەشای شوقەیەکی کرێ بکات. هەڵبەتە سەفەر بە خزاکێکی سەر بەتاڵ، لەم کەش و هەوا هەتاو و بەستەڵەکەدا کارێکی ئاقڵانە نەبوو. بەڵام چیخۆف، بەدەم تەمەشای دەشتی سەراپا سپی، هەڵمژینی هەوای پاك، گوێگرتن لە دەنگی زەنگوڵانی خزاکەکەو جیڕە جیڕی بەسەر بەفرو بەستەڵەکەدا، لە زەتێکی زۆری دەبرد. هەر هەمان ئێوارە کاتێ بۆ ماڵ گەڕایەوە، نامەیەکی دیکەی لیدیا ئەڤیلوڤای پێگەیی. هەڵبەتە هەوڵیدەدا پەیوەندی دەگەڵدا تازە بکاتەوە. تاکتیکی خۆی گۆڕی بوو، گلەیی لە خۆی دەکرد کە کاتی خۆی هەڵە بووەو ئومێدەوارە کە چیخۆف دەرفەتی بدات تا دڵسۆزانە کارو هەڵوێستەکانی خۆی بۆ ڕوون بکاتەوە: "بمبوورە ئانتون باڤلوڤیچ هەرچەندە تۆ داوای شتی وات لە من نەکردووە، بەڵام بۆ من فرسەتە :دەترسام بمرم و فریا نەکەوم پێت بڵێم هەمیشە لە کانگای دڵەوە ڕێزو حورمەتم بۆت هەبووە. بە باشترین و بەرزترین پیاوم زانیویت. چ قەیدیە ئەگەر خۆم لە بەر چاوت سووك کردبێت! جگە لەوە هیچ چارێکی دیکەم نەبوو. ئەوە ناخۆشترین ئەزموونی ژیانی منە... ئێستا وەختێ وتنی ئەوە هاتووە... من داوای ئەوەت لێناکەم بمبووریت، بەڵام تکادەکەم لە هەستم تێبگەی." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٢/٩)

هەڵبەتە چیخۆف، لەم داوە بەگومان بوو: بە تەما نەبوو، جارێکی دی خۆی بخاتە داوی نامەو نامەکارییەوە دەگەڵ لیدیای فێڵبازو سەرکێش و ئەقڵیەت ئاڵۆزا. ئەم ژنۆکەیە بۆچی ملی بۆ ئەو ڕاستیە نەدەدا، کە دەمێکە لە ژیانی چیخۆفدا وەدەر نراوەو سڕاوەتەوە؟ چیخۆف بە نەبەدڵی و بە مەبەستی ئەوەی بە یەکجارەکی کۆتایی بە نامەو نامەکاری نێوانیان بێنێ و لەو ڕووەوە ئومێد بڕی بکات. کارتێکی بۆ نارد کە: "بمبوورە، لە سەرما ڕەق بوومەتەوە، ئا ئێستا لە تسارتسینو

هاتوومەتەوە... دەستم قەڵەم ناگرێت. دەبێ جانتاو کەل و پەلەکانم کۆبکەمەوە. هیوای خێرو خۆشیت بۆ دەخوازم. ئومێدەوارم بەختەوەر بیت، ژیان بەو قورسیە مەگرە، ڕەنگە ژیان زۆر لەوە ئاسانتر بێ کە تۆ تێی گەیشتوویت. ئایا ئەم ژیانەی کە هیچی دەربارە نازانین، ئەو هەموو بیرکردنەوەیە دێنێ کە ئێمەی ڕووس مێشکی خۆمان پێوە مژوول کردووە؟کێ چوزانێ." (١٩٠٤/٢/١٤)

ڕۆژی دوایی ١٩٠٤/٢/١٥ ، چیخۆف دوعاخوازی لە ئۆلگا کردو سواری قیتاری سیڤاستوبول بوو، تا لەوێوە بە کەشتی بڕوات بۆ یالتا. کە گەییەوە ماڵ، زۆری پێ سەیر بوو کە بینی ئەلکساندەری برای و ژنەکەی و بچووکترین منداڵیان بە کارەکەرێك و سەگێکەوە لە شوقەیەکی دراوسێی خانووەکەی ئەودا، هەواریان خسستبوو. تومەز هاتبوون مانگێك لە قرم بەسەر بەرن. چیخۆف هەرچەند لە سەرەتادا کەمێك ترسا بوو، بەڵام زۆر زوو ترس و نیگەرانیەکەی ڕەوییەوە: ئەلکساندەر خواردنەوەی تەرك کردبوو، نەك هەر قسەی بێ سەرو بەرو وڕێنە ئاسای نەدەکرد بەڵکو قسەی زۆر ماقوول و دڵگیریشی دەکرد.بەڵام مخابن زوو گەڕایەوە بۆ پایتەخت. چیخۆف ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو.

هەرکە چیخۆف بۆ یالتا گەڕایەوە، دکتۆر ئالتسشولەر خێرا کەوتە سۆراخ و هەواڵپرسینی زۆری پێ سەیر بوو، کە بینی نەخۆشەکەی زۆر باشەو بەوپەڕی ورە بەرزی و بەدەم پێکەنینەوە ئەو دیاری و سەوقاتانەی نیشانی دکتۆرەکە دەدا کە بە بۆنەی یوبیلەکەیەوە وەری گرتبوون. چیخۆف لە نێو دیاریەکانیا، زیاتر دڵی بەو قوڵاپی ڕاوە ماسیە خۆش بوو، کە قولاپێکی زۆر تازەو پێشکەوتوو بوو. بەڵام ئالتسشولەر، زیاتر ئەو مەرەکەبدانە زیوەی بەدڵ بوو کە لە سەدەی هەژدەیەمدا دروستکرا بوو. چیخۆف بە گاڵتەو شۆخییەوە گوتی: "مادامێکی ئەوەندە چاوت لێیەتی وەسێت دەکەم، دوای مردنم بیدەن بە تۆ وەکو سزایەك بۆ تۆ." بەڵام هەمووی هەفتەیەکی نەبرد، کە دیسان مجێزی تێکچووەوە. لێرەش وەکو هەموو شوێنێکی دیکە کەوتە گلەیی لە دەست میوانان، زاتیشی نەدەکرد، دەرگایان لە ڕوو دابخات. بەخۆی دەگوت بۆچی مۆسکۆی بەجێهێشت و هاتەوە بۆ ئێرە. لە ١٩٠٤/٢/٢٣دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نارد کە: "ئەگەر شوقەکەی مۆسکۆمان وەکو هێلانە کۆتر بەو بەرزییەوە نەبوایە ئێستا حەزم دەکرد لەوێ بم." دوای چوار ڕۆژی دی دیسان بۆی دەنووسێت: "ژیان لێرە، ناخۆشە، تاقەتبەرە. خەڵەکەکەی دەورو بەرم، زۆر خەمساردو بێموبالاتن، گوێ بە هیچ نادەن، زەوقی هیچیان نیە، دەڵێی ئاو لایداون، بە ڕاستی پیاو لێیان بێتاقەت دەبێ" بیری لەوە دەکردەوە کە هاوین دەگەڵ ژنەکەیدا لە دەوروبەری مۆسکۆ بەسەر بەرن: "هیچ پرۆژەیەکت بۆ هاوین هەیە؟ بە تەمای لە کوێ بژیت؟ مشوری شوقەیەك بخۆ. ڕەنگە شتێکی باشت دەست بکەوێ.. ئێستاش تامی سەفەرەکەی تسارتسینوم لە ژێر دانا ماوە، چەند خۆش بوو پێکەوە چووین بۆ ئەوێ و گەڕاینەوە."

ئەو هەواڵانەی کە لە مۆسکۆوە، سەبارەت بە سەرکەوتنی کەم وێنەی شانۆنامەی (باخی ئاڵوباڵو) پێی دەگەیی دڵی خۆش نەدەکرد؟ هەرچەندە شانۆنامەی ناڤبری لە شارۆچکەکانیش داو لە بەردەم تەمەشاڤانی زۆردا نمایش دەکرا، فایدەی نەبوو ودڵی خۆش نەدەکرد، قەناعەتی

وابوو، خراپ نمایشی دەکەن. هەر دەرهێنانەکەی شانۆی هونەری لە بیر نەدەچووەوە کە بە قەناعەتی ئەو سەرلەبەری هەڵە بوو. لە ١٩٠٤/٣/٢٩دا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نووسی کە: "ئەو فەسڵەی دەبوایە ئەوپەڕی دوازدە دەقیقەیەك بخایەنێ، لای ئێوە چل دەقیقەی پێدەچێت. من هەر ئەوەندەم لەدەست دێ کە بڵێم ستانسلافسکی دەقەکەی مردار کردمەوە. بەڵام خوا ڕاوەستاوی بکات، گەردنی ئازاد دەکەم" یوتیخی کارپوڤ بەڕێوەبەری شانۆی سوڤۆرین، لە یاداشتەکانی خۆیا گێڕاویەتیەوە کە چیخۆف پێی گوتووە: "ئایا ئەمە باخی ئاڵو باڵوەکەی منە؟ ئایا کاراکتەرەکانی من ئەمانەن؟ جگە لە دوو سێ دەوریان، ئەوانی دی هیچیان فریان بە منەوە نیە. ڕاستە من ژیان وەسف دەکەم، بێگومان ژیانێکی تاریك و بورژاویانەیە، بەڵام ژیانێکی هەمیشە قێزەون و ناڵەزا نیە. ئیدی ئەوانە یان لە قاڵبی نووسەرێکی گرینۆك و مەستم دەدەن، یان دەمخەنە کلێشەی نووسەرێکی تاقەتبەرەوە. من چەندین کۆمەڵە چیرۆکی شادم نووسیوە، کەچی ڕەخنەگران، دەمامکی ژنێکی گرینۆکیان لە سەروچاو کردووم. ئیدی یەجگار تووڕە بوو، هیچ متمانەو باوەڕێکی بە شانۆی هونەر نەما، تا ئەوە بوو لە ١٩٠٤/٤/٢دا، بە بۆنەی یەکەم نمایشی شانۆنامەکەوە لە سان –پترسبۆرگ، بروسکەیەکی لە ستانسلافسکی یەوە پێگەیشت کە: "شانۆنامەکە پێشوازییەکی زۆر گەرمی لە لایەن جەماوەروە لێکرا، سەرکەوتنێکی یەجگار گەورەی بەدەست هێنا، بە هیچ جۆرێ دەگەڵ نمایش و نواندنەکەی مۆسکۆدا بە راورد نەدەکرا." نەمیروفیچ – دانچنکۆش، بە بروسکەیەك هەمان داوەری ستانسلافسکی بۆ دووپات کردوە: "لەوەتای من لە بواری شانۆدا کار دەکەم، بیرم نایەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان جەماوەری تەماشاڤان بەم گەرم و گوڕی و ئەرێنییە، کاردانەوەی بەرانبەر بچووکترین موفارەقەی درامایەکی سایکۆلۆژی هەبووبێ." ئەمە قەدەری زۆربەی شانۆنامەکانی چیخۆف بوو: لە سەرەتاوە، بە شێوەیەکی ساردو سڕ ئەگەر نەڵێین دژمنانە، پێشوازی دەکران و پاشان لە ناکاوا، دەنگیان دەدایەوە. دەبوایە چیخۆف دەمێك بوایە بەم حاڵەتە ڕاهاتبا، کەچی هەموو جارێ تووشی جۆرە پەستی و نائومێدیەك دەبوو، خەفەتی دەخوارد و کە پاشان هێورش دەبووەوە، ماکی جۆرە پەستییەکی لە دڵا هەر دەما. کەچی ئەوەتا لە نامەیەکیا (١٩٠٤/٣/٣١) بۆ ئۆلگا، ئامۆژگاری دەکات کە گوێ بەو هێرشە توندانە نەدات کە لە ڕۆژنامانو لە ڕۆژگاری نوێدا دەکرێتە سەریان و دەڵێت: "هەرچیەك بکەن، ناتوانن لە پایەی ئێوە کەم بکەنەوە، چونکە ئێوە وەکو هونەرمەند توانیوتانە بوونی هونەریی خۆتان بسەلمێنن و دەتوانن بەوپەڕی دڵنیایی و ئاسوودەیی بڕواننە ئێستاو ئایندە." تا ئەم کاتە نە ئۆلگا بیری لەوە کردبووەوە کە شانۆ تەرك بکات و خۆی بۆ خزمەتی مێردەکەی تەرخان بکات و، نە چیخۆفیش وێنای ئەوەی دەکرد، بە درێژایی ساڵ پێکەوە بژین. نە ئۆلگا بێ شانۆ هەڵی دەکردو نە چیخۆفیش بوونی بەردەوامی ئافرەتی لەگەڵ خۆیا، تەحەموول دەکرد. وێڕای ئەمەش زۆر تاسەی ئۆلگای دەکرد، هەموو ڕۆژێ نامەی بۆ دەنووسی، خۆشەویستی خۆی بۆ دووپات دەکردەوەو لە نامەکانیا بە "ئەسپە چکۆلەکەم" "نیوە جوانەکەی من" "ئەکتەری گەورەو ئازیزم" و "سەگە چکۆلەکەم" ناوی دەبرد. لە نامەیەکیا (١٩٠٤/٤/١٠) پێی دەڵێت: "بە تاسەوە چاوەڕوانی دیداری تۆم. خەنی لە خۆم. بەبێ تۆ حاڵم بێ حاڵە. هەر ڕۆژێ

تێدەپەڕێ سوپاسی خوا دەکەم کە بێ هیچ کێشەیەك، بێ هیچ کەڵکەڵەیەك بەدەم تەمەشاکردنی کاغەزانەوە، بەدەم پیاسەکردن لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ تێپەڕی." ڕۆژێ دوایی بۆی نووسی: "چاوەڕوانی قسەو فەرمانی تۆم سەبارەت بە سەفەرەکەم، بە ڤیلاکە، سەبارەت بە تێکڕای ژیانم. حەز دەکەم، زۆر حەزدەکەم کەمێکت لێبدەم تا دەسەڵاتی خۆمت بەسەردا بنوێنم. چەند حەزدەکەم دەگەڵ تۆدا پیاسەیەکی جادەکانی پتروفکا تفروسکایا بکەم." پاش ماوەیەکی دی دیسان بۆی نووسی: "بەبێ ژنەکەم زۆر بێتاقەتم. ناشوێرم ماشقەیەك بۆ خۆ بگرم.. لێم دەپرسیت ژیان چیە؟ ئەمە وەکو ئەوەیە بپرسیت گێزەر چیە؟ گێزەر گێزەرە. لەوە زیاتر هیچ تەعریفێکی تری نیە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٤/٢٠) هەڵبەتە ئەم سوعبەت و شۆخیە، بە شێوەیەکی خوازەیی هەڵوێست و بۆچوونی چیخۆڤ لەمەڕ مەسەلە میتافیزیکیەکان دەنوانێ. چیخۆف، هەر تەفسیرو ڕاڤەیەکی ئاینی یان فەلسەفی بۆ میتافیزیك، بە هەڵەو نادروست دەزانی و ڕەتی دەکردەوەو دەیگوت ئەگەر خوایەکیش هەبێ ئەوا دیاریکردنی بەگوێرەی ئەقڵی نا تەواوی ئێمە، دەکاتە بچووك کردنەوەی. لە دەفتەری یاداشتەکانیا نووسیویەتی: "ئەوەی لە ئینساندا دەمرێت ئەو شتەیە کە پەیوەندی بە پێنج هەستەکەمانەوە هەیە. بەڵام هەموو ئەو شتانەی دی کە دەکەونە دەرێی هەستەکانمانەوەو پێدەچێ زۆربن و نایەنە تەسەورکردن، دەمێنن و بەردەوامی بە بوونی خۆیان دەدەن."

ناو بە ناو خولیاو ئارەزووی نووسین بەرۆکی دەگرت. بەڵام چونکە لەوە بێتاقەتر بوو، پەیگیری کارێکی برێك درێژ خایەن بکات، زۆری پێنەدەچوو، بیانوویەکی دەدۆزییەوە، کە واز لەو کارە بێنێ: یەکێك لەو بیانووە حازر بەدەستانە، زۆری میوان بوو کە بێزاریان دەکرد. جا ئێستا هەواڵی شەڕی ڕۆژهەڵاتی دووریشی هاتبووە سەر. لە نامەیەکا بۆ ئۆلگا دەڵێت: "ئیش دەکەم. بەڵام بەدڵم نیە. هەمیشە وا هەست دەکەم بە بۆنەی ئەم شەڕەوە، کەس بەرهەمەکانمان ناخوێنێتەوە." وەکو هەموو هاوڵاتیانی خۆی، ڕۆژانە پەیگیری ڕۆژنامانی دەکرد، زۆرخەفەتی لە شکستەکانی ڕووسیا دەخوارد. هەموو ئاواتێکی ئەوە بوو ئەم شەڕە بە زووترین کات تەواو ببێت و هەردوولایەنی شەڕەکە پەیماننامەی ئاشتی مۆر بکەن، ئەگەر ئەم پەیمان نامەیە شانازییەکی گەورەی بۆ ڕووسیاش تیانەبێ. هەرچەند بە ڕاستی هیچی نەدەنووسی، بەڵام کە قەڵەمەکەی دادەنا بیری لە پرۆژەی شانۆنامانی تازە دەکردەوە، بە خەیاڵی خۆی نەخشەی دادەنا، هەرکاتێ حاڵی باش ببێت، بیان نووسێت. ئەوە بوو پێشنیازی بۆ ئەکتەرێك کرد بە ناوی پاڤیل ئولینیڤ کە شانۆنامەیەکی سێ پەردەیی بۆ بنووسێت کە لە هەندەران، بێ ئەوەی بە سانسۆرا تێبپەڕێت، پێشکەش و نمایش بکرێت. تەنانەت بەڵێنی دایە کە لە هەیڤی ئەیلولی ئایندەدا دەستنووسی ئەو شانۆنامەیەی تەحویل بدات. هەروەها دەگەڵ ستانسلافسکیدا باسی درامایەکی تازە دەکات کە: قارەمانەکەی زانایەك بێ، کاتێ کە دڵی لە ژنە خەمساردو بێ ئەمەکەکەی دەشکێت، سەری خۆی هەڵدەگرێت و بەرە باکوور دەڕوات ،لە دوا پەردەدا، زاناکە بە تاقی تەنیا، لەسەر پردی ئەو کەشتیەوە کە لەبەفرا چەقیوە، تاپۆی ژنەکەی بدینێ کە لە تیشکی شەوی وەهمی جەمسەری باکووردا مەلە بکات.

چیخۆف بەدەم چاوەڕوانی گەڕانەوەی تواناو بە هێزی داهێنەرانەی خۆیەوە بە سەعاتان بەدەستی بە تاڵ، لەپشت مێزەکەیەوە دادەنیشت و لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە نیگای دەبڕییە دەرەوەو تەمەشای دووری دەکرد. تەنیا کاری بوو بوو بە خوێندنەوەی ئەو دەستنووسانەی کە گولتسیف لە گۆڤاری "هزری رووسی"یەوە بۆی دەنارد، ئیدی بۆ خۆ خافڵاندن دەی خوێندنەوە، هەڵەو پەڵەی بۆ ڕاست دەکردنەوەو بە کورتە ڕاپۆرتێکەوە بۆ گۆڤاری ناڤبری دەناردنەوە. هەروەها خەریك بوو ئەو تێبینی و سەرنجانەی کە لەدەفتەرێن یاداشتەکانیا بە قەڵەمی ڕەش تۆماری کرد بوون، لە ترسی ئەوەی نەبا بچنەوە، بە قەڵەمی مەرەکەب بنووسێتەوە. جارێك کە نیکولای گارینی میخائیلوفسکی میوانی دەبێت، پێی دەڵێت: "نزیکەی پێنج سەد لاپەڕەیان تیایە، پڕن لە سەرنج و تێبینی و کەرەسەی خاوی بە کار نەهێنراو کە بەشی پێنج ساڵ کار دەکات. ئەگەر بتوانم هەر هەموو ئەمانە بکەم بە نووسین، ئەوا خانەوادەکەم مسۆگەر دەبن و پێویستیان بە هیچ نابێ."

لە نیوەی نیسانەوە، کۆکەکەی دایە زیادی، ئازاری گەدەو ڕیخۆڵە هەراسانی کرد. لە ١٩٠٤/٤/٢٠دا نامەیەکی بۆ سوبولفسکی نارد کە: "پێموایە هەموو ئەمە خەتای کەش و هەوای ئەم دەڤەرەیە، کە هەم خۆشم دەوێ و هەم لێی بێزارم، ڕێك وەکو چۆن پیاوێك ژنێکی جوانی دەمدەمی مجێزی هەم خۆش دەوێ و هەم لێی بێزارە." هەر چەندە زۆر نەخۆش بوو، بەڵام قەت لە یەك شوێندا ئۆقرەی نەدەگرت. بۆیە بڕیاری دا لە ١٩٠٤/٥/١دا بڕوات، بڕوات بۆ لای دکتۆری ددان تا دانێکی بۆ پڕ بکاتەوە، بەڵام پرسی بە دکتۆر ئالتسشولەر نەکرد. لە گەرمەی ئەم ریسکە تازەیەدا نامەیەکی بۆ ئۆلگا نووسی کە "بەیانی زوو دەگەمە مۆسکۆ ،چونکە قیتاری خێرا دەستی بەکار کردووە... تولەکەم، تولە چکۆلەکەم، کە غەریبیت دەکەم." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٤/٢٢).

چیخۆف، وەکو پێویست بەرگەی ئەم سەفەرە ناگرێت. لە ڕێگا وەزعی خراپ دەبێ، کە لە ١٩٠٤/٥/٣دا دەگاتە مۆسکۆ، هێندە بێتاقەت بوو، بە ئاستەم دەیتوانی پێ بەر پێ بنێ. ئۆلگا لە بەرخاتری ئەو شوقەیەکی تازەی لە شەقامی لیونتیفسکی بەکرێ گرتبوو کە ئاسانسۆری تیا بوو. بەڵام چیخۆف فریا نەکەوت تەمەشایەکی بکات و لەزەتی لێ بدینێ. یەکسەر لە جێدا کەوت. ئۆلگا دکتۆر یولیوس تاوبی هێنایە سەری. ئەم دکتۆرە پیاوێکی ئەڵمانی بوو، دکتۆری خانەوادەیی ماڵی ئۆلگا بوو. دکتۆر تاوب معایەنەی کردو دووپاتی کردەوە کە سییەکانی هەویان کردووەتەوەو تووشی "ئەنفلۆنزای ڕیخۆڵە بووە." کە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئەوەی دەسەلماند کە سیلەکە دابەزیوە بۆ دەوروبەری سکی. چیخۆف ڕۆژ بە ڕۆژ هەناسەی تەنگتر دەبوو. لەرزی لێدەهات، ئازارێکی تیژو توند دابوویە هەردوو باسك و لاقی، بە درێژایی شەو لەبەر ئەم ئازارە تیژە خەوی لێنەدەکەوت، دەترسا بڕ بڕەی پشتیشی تووشی سیل بووبن. دکتۆر تاوب، دەرزی مورفینی لێدا تا دڵی بە هێز ببێت، پارێزێکی قورسی بۆ دانا و دەستوری دا لەجێدا بمێنێتەوە، ئامۆژگاری کرد، هەرکە کەمێك وەخۆ هاتەوە و حاڵی باشتر بوو خێرا سەفەری ئەڵمانیا بکات و لەوێ خۆی پیشانی دکتۆرێکی پسپۆڕی بواری سیل بدات. هەرکە

توانای ئەوەی پەیدا کرد کە دەستی قەڵەم بگرێت، لە ١٩٠٤/٥/٢٢ دا نامەیەکی بۆ دکتۆر سریدین نووسی کە: "ژنەکەم بەدیار مێردە نەخۆشەکەیەوە، یەکپارچە زێڕە زێڕ. بە عەمرانم پەستاری وام نەدیتووە. زۆر باش بوو، بە ڕاستی باشم کرد ژنم هێنا، وا نەبوایە ئێستا چیم بکردایە." هەروەها نامەیەکی بۆ ماریا نارد کە تازە گەڕابووەوە بۆ یاڵتا بۆ لای دایکی: "هێشتا لە جێدا کەوتووم. تا ئێستا جگە لە جلکی ماڵەوە بۆ تاقە جارێکیش جلی دەرەوەم لەبەر نەکردووەو نەچوومەتە دەرەوە، هێشتا وەکو ئەو کاتەم کە تۆ لێرە ڕۆیشتی. پێرێ دیسان کوت و پڕ لە خۆڕا تووشی هەوی سییەکان بوومەوە. ئێستا باشم... هەناسە توندیەکەم باش بووە، کەمتر دەپرخێنم. هەناسە سواریەکەم کەمتر بووە. لە دکتۆرەکەم ڕازیم." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٥/٢٢).

بەو حاڵەشەوە بەردەوام بوو لەسەر خوێندنەوەی ئەو دەستنووسانەی کە گۆڤاری (هزری ڕوسی) بۆیان دەنارد، دەیخوێندنەوەو سەرنج و تێبینی خۆی لەسەر دەنووسین، وەڵامی ئەو نامانەی دەدایەوە کە داوای کۆمەك و ڕێنوێنیان لێدەکرد، بەستە کتێبانی بۆ کتێبخانەکەی تاگانروگ دەنارد، پەیتا پەیتا نامەی بۆ ماری دەنارد کە ئاگای لە باخەکەی یاڵتا بێ، بەدەم هەموو ئەو کارانەوە چاوەڕوانی ئەو ساتەی دەکرد کە بتوانێ هەستێ. کە میوانی دەچوون دەیان بینی بەجلی ماڵەوە لەسەر قەنەفەیەکی تورکی پاڵکەوتووە، لە خۆی تەریق دەبووەوەو داوای بوردنی لێدەکردن کە بەو جۆرە لە حوزوری واندایە. ئیدی دەکەوتە نوکتە گێڕانەوەو خۆی ڕووخۆش و سەرحاڵ دەنواند. بەڵام کە چاویان بە گۆنا چرچەکانی، بە ڕەنگە زەردەکەی، بەچاوە دەرپۆقیوەکانی دەکەوت دڵیان دادەخورپا. دکتۆر ڕوسولیمو، هەستی دەکرد وەکو هەموو سیلداران، بەدەستە گەرمەکانیەوە، بە گۆنا سوورهەڵگەڕاوەکانیەوە، بەجۆرە بێپەروایییەکەوە باسی نەخۆشیەکەی دەکات، ئایا بە تەمای چاك بوونەوە بوو، یان وای دەنواند باوەڕی بە چاك بوونەوەی خۆی هەیە؟

شەوێك گلیاروفسکی شاعیر، کە کاتی خۆی چیخۆف، یەکەم کەس بوو بوو، بۆ نووسین و شیعری هاندا بوو، دێتە دیدەنی چیخۆف. چیخۆف یەکسەر یەکێك لە فشقیاتەکانی سەردەمی گەنجێتی خۆیانی بیردەکەوێتەوەو بەخۆشیەوە دەیگێڕێتەوە کە چۆن گلیاروفسکی ڕۆژێك پێی گوتبوو، تازە لە دەڤەری ستێپ و لە نێو قۆزاقەکان گەڕاوەتەوە. چیخۆف کەمێك لە فکران ڕادەچێت و دەڵێت: "ئاهـ، ستێپ! خەنی لە خۆت! ئەوێ سەرچاوەو ئیلهامبەخشی شیعرە، هەموو شتێك نقوومی هەتاوە. نەك وەکو لای ئێمە!" ئەوجا چاوانی دەنووقێنێ، بەدەم بزەیەکی منداڵانەوە، سەری دەخاتە سەر سەرینەکەی. گلیاروفسکی دەڵێت: "پێموایە خەون بە ستێپەوە دەبینێ." لە ئاخر و ئۆخری مانگدا، تایەکەی چیخۆف دابەزی. ئەوەندەی تین و گوڕ وەبەر هاتەوە کە بتوانێ هەستێ و لەجێ بێتەدەرێ. لە ١٩٠٤/٥/٣١دا، مژدەی بە ماری خوشکی دا: "تەسەور بکە ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار، جل و پێڵاوم لە بەر کرد... بۆ یەکەمجار چوومە دەرەوە تا بە گالیسکە پیاسە بکەم." ئیدی هیچ تەگەرەیەك لە ڕێگەی نووسەر نە مابوو، کە بەگوێرەی

ئامۆژگاریەکەی دکتۆر تاوب سەفەری ئەڵمانیا بکات. ئیدی چیخۆف بلیتی قیتاری بەرلینی بۆ خۆی و ئۆلگا بڕی و لە ١٩٠٤/٦/٣دا لە مۆسکۆوە بەرەو بەرلین کەوتنەڕێ.

کۆمەڵێك دۆست و برادەر هاتن بۆ دوعاخوازی. یەکێك لەوانە تیلیشوڤ نووسەر بوو، کە بینی چیخۆف لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بەو ڕادەیە پوکاوەتەوە، تووشی شۆك بوو. چیخۆف کە لە سەر قەنەفەیەك دانیشتبوو، پشت و سەری نابوون بە چەند بالیفێکەوە، پەتۆیەکی دابوو بەسەر لاقەکانیا، بەجلی ماڵەوە پێشوازی کرد. چیخۆف هەر نەمابوو، شان و شەپیلك داکەوتوو. لاوازو بێتاقەت، ڕەنگ و ڕوو زەردو چرچەڵە. دەستە لاوازەکانی کە لە دەست و بازووی ئێسکە پەیکەر دەچوون هێنا، بەدەم تەوقەکردنەوە دەگەڵ میوانەکەیدا بە نیگای خەمینەوە گوتی: "سبەی دەڕۆم بە دوعا. دەڕۆم بۆ مردن."*

تیلیشوف، مات و بێدەنگ، باوەڕی بەچاوو گوێی خۆی نەدەکرد. پاشان بەمجۆرە ئەو دیمەنەی لە یاداشتەکانی خۆیدا تۆمار کردووە: "گومانم لەوە نەبوو کە ئەمە دوا دیدارمان دەبێت. زۆر ئاشکرا بوو جارێکی دی یەکدی نابینینەوە! ترسام لەو کاتەدا بە دەنگی بەرز قسان بکەم، یان بە دەنگی پێڵاوەکانم ناڕەحەتی بکەم. جەوەکە بێدەنگیەکی بەسام و شکۆی دەخواست. دەبوا بە دڵێکی کراوەوە گوێ بۆ ئەو یەك دوو وشەیە بگرم، چونکە بۆ من و بەلای منەوە، گومان لەوەدا نەما بوو کە دوا قسەن لە ڕوح و دەروونی گەورەو پاکی چیخۆفەوە دەردەچوون."

چیخۆف کە حەزی نەدەکرد باسی خۆی بکات، تکای لە تیلیشوف کرد کە سڵاوی بگەیەنێتە برادەرانی ئەنجومەنی ئەدەبی (ئەڵقەی چوارشەممە)و هیوای خۆشی و سەرکەوتنیان بۆ بخوازێ. لەو کاتەدا، تەمێکی بزە ئامێز نیشتبووە سەر نیگای کە بە ئاشکرا تەسلیم بوون بە مەرگی دەنواند. لە کاتێکا کە تیلیشوف بەتەما بوو بێتە دواوە، چیخۆف دیسان بەگوێیدا چپاند: "بە بونین بڵێ، بەردەوام بێ، بنووسێت، بنووسێت، دەبێ بە نووسەرێکی گەورە. بەڵێ، لە زمانی منەوە ئەوەی پێ بڵێ لە بیرت نەچێت!"

هەرکە چیخۆف و ژنەکەی لە ١٩٠٤/٦/٥دا گەیشتنە بەرلین، یەکسەر فەرقی کرد، دەتگوت ئەو چیخۆفە نیە کە تیلیشوف بینی بووی. هەمیشە جێگۆڕکێ ی پێدەکەوت ،بۆیە هەرکە لە ئوتێل ساڤۆی، باشترین ئوتێلی بەرلین هەواری خست، هەستی بە باشبوون کرد. ئیدی ئەم کابرا بە تەبیعەت دێهاتیە، بە سەفەران لە هەردوو ڕووی بەدەنی و دەروونیەوە، دەبوژایەوەو ئاسوودە دەبوو، هەرکە گەییە ئەوێندەر، بە نامەی گەشبینانە ماریای داگرتەوە، نامە لە سەر نامەی بۆ دەنارد و دڵنیای دەکرد کە: ئیشتیای کراوەتەوە. سەعات بە سەعات تەندروستی باشتر دەبێ. ئازاری لاقی نەماوە، سکچوونی لە کۆڵ بووەتەوە. ڕۆژ تا ئێواریێ بە پێیان بە بەرلینا دەسوڕێتەوە، خۆی بەم دوکان و بەو موغازەدا دەکات، بە گالیسکە بە گوڵگەشتاندا دەسوڕێتەوە دەچێتە تییرگارتن (باخی گیانلەبەران). ئەمە یەکەمجاری بوو کە دەگەڵ ئۆلگادا سەفەری هەندەران بکات، چونکە لە شارێکی بێگانەدا بوون، هەستی دەکرد لە هەموو کاتێ پتر لە ئۆلگاوە نزیکە. هاوسەفەری ئۆلگای زۆر پێخۆش بوو، بە دو قۆڵی و بە لەزەتەوە باسی بۆچوونی خۆیان

دەربارەی ئەو دنیا نوێیە دەکرد. چیخۆف بە شۆخییەوە پێی دەگوت تا ئێستا ڕێکەوتی ژنێکی جوانی ئەڵمانی نەکردووە، هەر هەموویان لە پۆشینی جل و بەرگدا بێ زەوق و سەلیقەن. کەچی لە نامەیەکیا بۆ ماری دەڵێت: "خەڵکی لێرە خۆش دەژین، تێرو پڕن، ژیان گران نیە... ئەسپان خۆش ئالیکن... جادەو بان پاك و خاوێنە، نەزم و نیزام بەرقەرارە." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٦/٨) بە ڕادەیەك گەشبین و خۆشحاڵ بوو، تەنانەت لێبڕا ماوەیەك لە کەناری دەریاچەکانی ئیتاڵیا بەسەر بەرێت و پاشان لە مانگی ئابدا، لە شاری ئەستەموڵەوە بۆ یاڵتا بگەڕێتەوە. بەڵام پرۆفیسۆر کارڵ ئیواڵد، کە پسپۆڕیکی بە ناوبانگی نەخۆشی سیل بوو، دکتۆر تاوب، چیخۆڤ بۆلای ئەو نارد بوو، بە پێچەوانەی چیخۆفەوە، دەربارەی ئایندەی چیخۆف نەك گەشبین نەبوو، بەڵکو نائومێدیش بوو. زۆر بە وردی معایەنەی چیخۆف دەکات و هەنگێ، هەردوو باسکی، بە نیشانەی ئەوپەڕی نائومێدی و دەسەوەستانی بڵاو دەکاتەوەو بێ ئەوەی تاقە وشەیەکی لەزار بێتە دەرێ، دەڕوات. دیار بوو قەناعەتی وابوو تازە کار لە کار ترازاوە و هیچ چارەسەرێك دادی نادات. پاشان دکتۆر ئالتسشولەر لەمبارەیەوە نووسیویەتی: "هەڵبەتە ئیواڵد، لەو بارەیەوە نەهەقی کردووە. بەڵام دەشێت بەوە پاکانە بۆ هەڵوێستەکەی ئەو بکرێت، کە پێی سەیر بووە چۆن دکتۆرێك ڕێگە بە پیاوێکی ئەوەندە نەخۆش دەدات، ڕێگەی سەفەرێکی وا بگرێتە بەر، بۆ کوێش؟" ئیللووسی، پەیامنێری (هەواڵێن ڕووسیا) کە لە بەرلین، چاوپێکەوتنێك دەگەڵ چیخۆف دەکات، نامەیەك بۆ سوبولفسکی بەڕێوەبەری دەنێرێت کە: "پێدەچێ چیخۆف دوا دوایی بێت. زۆر نەخۆش دیار بوو: زۆر لاواز بوو بوو، بەردەوام دەکۆکی، بە بچووکترین جوڵە دەکەوتە هانکە هانك. تایەکی گەرمی هەبوو."

هەر هەمان ڕۆژنامەنووس، چیخۆف و ئۆلگای تا وێستگەی پوتسدام بەڕێ کرد بوو، ژن و مێرد دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لە بەرلین مابوونەوە، لەوێوە سواری قیتار دەبن و بەرەو باندن وایلەر لە جەنگەڵی ڕەش، دەڕۆن. ئیللوسی لە نامەکەیدا دەڵێت: "چیخۆف زۆر بە زەحمەت بە قالدرمە نزمەکانی وێستگەکەدا سەردەکەوت. چەند دەقیقەیەك دانیشت تا نەفەسێك تازە بکاتەوە و ئەوجا سەربکەوێ. من داوام لێکرد لە قیتارەکەدا دابنیشێت و لەجێی خۆی نەجووڵێ، بەڵام هەر کە قیتارەکە جوڵا، بە کووڕە کووڕ هەستا، لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا و تا قیتارەکەش لەچاو ون بوو هەر بەسەر خواحافیزی لێدەکردم."

بادن وایلەر، شارۆچکەیەکی چکۆلەی پڕ لە کانیاوی مەعدەنی بوو کەوتبووە ڕەخی ڕۆژاوای جەنگەڵی ڕەشەوەو هەر چل کیلۆمەترێك لە بازلەوە دوور بوو، شارۆچکەیەك بوو پاك و خاوێن، ئارام و بێدەنگ، بەدڵی چیخۆف بوو، دەیگوت، دەڵێی لە ئیجادی بۆ حەسانەوەی نەخۆشان دروستکراوە. ئۆلگا و چیخۆف دوو ڕۆژی هەوەڵیان لەماڵێکی شەوانە ڕۆژیدا بەسەر برد، پاشان خانوویەکی سەر بەخۆیان بەکرێ گرت و گواستیانەوە:شوقەی فردریکی پێ دەگوترا، خاوەنەکەی بۆ کرێی دانابوو، باخێکی گەورەو خۆشی هەبوو، هەموو ڕاڕاوەکانی چەو ڕێژ و سەڵبەند بوو، پڕ بوو لە گوڵی جوان، تابنی چیاکان دەڕۆیی و ئەمە دیمەنێکی هێندەی دی جوان و دڵگیری پی بەخشی بوو. چیخۆف، بە درێژایی ڕۆژ لە بەیانیەوە تا سەعات حەوتی ئێوارێ لەو

هەوا ئازادەدا لە سەر قەنەفەیەك یان دادەنیشت یان پاڵ دەکەوت. چیخۆف لەوێوە نامە بۆ ماری خوشکی دەنووسێت کە: "هەتاوی ئێرە گەرمێکی ناخۆش و گەزندە نیە، ختووکەی پێست دەدات. پزیشکی ناوچەکە، دکتۆر شوورەر، پیاوێکی زۆر بە توانایە، مەردانە بە دەنگمانەوە هات. بە گوێرەی ڕێنماییەکانی ئەو، نەخۆش دەبێ ئیسراحەتی تەواو بکات، لە کەماڵی ئیسراحەتدا بێ. خواردنی تایبەتی بخوات: کاکاو، بڕوێشی جۆی لە کەرەیا خوسا، چای تووە فەرەنگی: "تا نەخۆش باش بخەوێ". هەرچەندە چیخۆف گلەیی لەم ڕێنماییانەی دکتۆر شوورەر هەبوو، بەڵام هەستی دەکرد سوودی لێدەبینێ: باش دەنووست، ئازاری لاقی نەما بوو. بۆ ماریای نووسی کە زۆر بە خێرایی گوڕو تینی وەبەردێتەوە. هێندە ورەی بەرز بوو، تەنانەت لە ١٩٠٤/٦/١٣دا نامەیەکی بۆ دایکی نووسی کە: "بەرە بەرە حاڵم باشتر دەبێت، ئەگەر وا بڕوات لەوەیە لە ماوەی هەفتەیەکدا باشی باش ببمەوە" ئۆلگاش بە ڕادەیەك ئومێدی پەیدا کرد بوو کە ناو بە ناو هاوسەرەکەی بەجێ بێڵی و بڕوات بۆ بازل بۆ معایەنەی ددانەکانی. هەروەها چوو بۆ فریبورگ تا دەستێ جلی فانیلای سپی بۆ مێردەکەی بکڕێت.

بەڵام دوای هەفتەیەك لە خۆشی، دیسان چیخۆف بێتاقەت بوو و، کەڵکەڵەی جێگۆڕکێی کەوتەسەر. پاش ئەوەی دنیایەك ستایشی خۆشگوزەرانی ئەڵمانی لە بادن وایلەر کرد، ئێستا لەبەرچاوی کەوتبوو، گلەیی دەکرد کە خەریکە لەوێ خەفە دەبێت. بۆ ماریای نووسی: "دەگەڵ ئەم لیی و بێدەنگییە ئاڵمانیەدا ڕانایەم. هیچ دەنگێك نە لەماڵەوە و نە لەدەرەوە نایەت، جگە لە دەنگی ناسازی ئەو ئورکسترا بێ بە هرەیە کە سەعات حەوتی بەیانی و لای نیوەڕۆ لە باخەکەدا بەرز دەبێتەوە. لێرە پیاو هەست بە زەڕەیەك بەهرە ناکات.زەڕەیەك زەوقی بەرز لە هیچ شوێنێ نابینی. بەڵام نەزم و ڕاستگۆییەکی زۆری تیایە. بەهرەو بەهرەمەندی لە ڕووسیا زۆرترە. قسەمان لەسەر ئیتاڵیاو فەرەنسا نیە" ئێستا خەریك بوو گومانی لە زانست و زانیاری دکتۆر شوورەریش دەکرد. لە ١٩٠٤/٦/٢١دا نامەیەکی بۆ ماری نارد کە: "دێت، سەرم دەدات... بەڵام چارەسەرو دەرمانەکەی هەمان چارەسەرو دەرمانە، کە لە مۆسکۆ بۆیان دەکردم. هەمان کاکاوی نەحلەتی و هەمان بڕوێشی جۆ." جا چونکە ژن و مێرد بۆیان نەبوو جارێ بادن وایلەر بەجێ بێڵن، بۆیە کەوتە کەڵکەڵەی ئەوەی لە ڤێلاکەی فردریك کە لە بەرچاوی کەوتبوو، بگوازنەوە بۆ ئوتێل سومەر، کە باشترین ئوتێلی ناوچەکە بوو. چیخۆف لێرە، لە بانیژەی ژوورەکەی خۆی دا دادەنیشت و بەسەعات تەمەشای ئەو خەڵکەی دەکرد کە دەچوون بۆ نووسینگەی پۆستەخانەکەی ئەو بەریانەوە. یان نەخشەی سەفەری دادەنا، بیری لە ڕێگاو بانەکان دەکردەوە و سۆراخی کاتی دەرچوونی هەموو جۆرە کەشتیەکی تریستا یان مارسیلیای بۆ ئۆدیسا دەکرد.

لەو سەروبەندەدا، شەپۆلە گەرمایەك دای بەسەر بادن وایلەردا. چیخۆف، کە نیوەی سیپەلاکەکانی ڕزی بوون، خەریك بوو لەو کەش و هەوا گەرم و شێدارەدا بخنکێ. لە ١٩٠٤/٦/٢٨دا نامەیەکی بۆ ڕوسولیمو نووسی کە: "گەرمای ئێرە لە کێشدا نیە پیاو دەخاتە هاوار." چیخۆف هەستی بە ماندوویەتیەکی زۆر دەکرد، بە هۆی گەرماکەوە بوو یان هی ئەوە بوو شوێنەکەی گۆڕی بوو؟ لەوساوە کە گەیی بووە ئەڵمانیا، بۆ یەکەمجار، حەقیقەتی بێ حاڵی

خۆی به ماریای ئازیز ڕادەگەیەنیٚ: "هەوای ئێرە زۆر گەرمە، چونکە هەموو جلەکانم زستانەن، خەریکە دەخنکێم. خوا خوامە لێرە هەڵێم." (بڕوانە نامەی ١٩٠٤/٦/٢٨) چیخۆف لەو نامەیەدا، کە دوانامەی ئەو بوو، بۆ یەکەمجار دان بە نائومێدیدا دەنێت: "من جۆرە خواردنێك دەخۆم خۆشە، بەڵام زۆر نیە، پێم ناکەویٚ. کەرەی ئەم وڵاتەم پێناخوریٚ، بێگومان گەدەم نەخۆشە، هیچ دەرمانێکی نیە جگە لە ڕۆژوو گرتن. یانی هیچ نەخۆم. ئیدی هەر ئەوەیە و تەواو! سەبارەت بە تەنگە نەفەسیەکەم، چار تەنیا ئەوەیە لە جێی خۆم نەجوڵێم." نامەکەی ئەم بۆ ماریا دەگەڵ نامەیەکی ماریادا بۆ ئەم هاوکات کەوتن. ماریا بۆی نوسی بوو مادام وەزعی ئەو (ئانتون) باشە، لێبڕاوە دەگەڵ ئیڤانی برایدا سەفەرێکی کورت بۆ قەفقازیا بکات، لە نامەکەدا دەڵێت: "ئاگات لە خۆ بیٚ ئانتون گیان، هەوڵبدە کەم بکوکی، زۆر بخۆی ، گوڕ بدە خۆت و بۆ ماڵ وەرەوە."

چیخۆف لە ١٩٠٤/٦/٢٩دا تووشی قەیرانێکی تەندروستی کتوپڕ بوو. دکتۆر شوورەر ناچار بوو هەم دەرزی مورفینی لێبدات و هەم ئۆکسجینی بداتیٚ. کە نەبزی هاتەوە تایم و کەمێك بوژایەوە، شەوێکی ئارامی بردە سەر. بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی هەم وای لێهاتەوە، دوو پەیامنێری ڕووسی کە بەپەلە بۆ بادن وایلەر هاتبوون، سەرو بروسکە هەواڵی ناخۆشیان دەربارەی تەندروستی چیخۆف، بۆ ڕۆژنامەکانیان لە ڕووسیا نارد. بەڵام چیخۆف، ئەم قەیرانەشی بە سەلامەتی بڕی، بە تەواوەتی وەخۆهاتەوە، داوای لەو بانقەی بەرلین کرد کە معامەلەی دەگەڵدا هەبوو، لە ئێستا بەدواوە هەموو ئەو حەواڵانەی بۆی دێن، بە ناوی ژنەکەیەوە ئاڕاستە بکەن. کاتیٚ ئۆلگا هۆی ئەمەی لیٚ پرسی، خۆی لە گێلی داو گوتی: "هیچ نیە، هەروا، بۆ ئیحتیات..."

چیخۆف، لە ١٩٠٤/٧/١دا هەستی دەکرد حاڵی باشترە، جووتە پەیامنێرەکەش، هەواڵی گەشبینانە تریان نارد: لێدانی دڵی زۆر باشە. ڕۆژەکە بەسەلامەتی تێپەڕی. دەمەو ئێواریٚ چیخۆف زۆری لە ئۆلگا کرد، کە سیٚ ڕۆژ بوو بەردەوام بەدیاریەوە بوو، بڕوات لە باخچەی ئوتێلەکەدا پیاسەیەك بکات. وەختیٚ گەڕایەوە چیخۆف لێی پرسی بۆچی ناچێتە خواریٚ نانەکەی بخوات، وەڵامی دایەوە هێشتا زەنگی نان خواردن لێی نەداوە. هەڵبەتە لێی دابوو، بەڵام ئەمان گوێیان لێی نەبوو بوو. ئۆلگا لەسەر تەختێکی باریکی نزیکی تەختە خەوەکەی مێردەکەی پاڵکەوت. چیخۆف بەگلەییەوە لێی پرسی بۆچی خەمگینەو بۆ ئەوەی دڵخۆشی بداتەوە، بە دەنگێکی کز کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکێکی زارەکی بۆی. چیرۆکەکە لە شارۆچکەیەکی مۆدێرنی چەشمەساری مەعدەنیدا ڕووی دەدا، مشتەرییەکانی بریتی بوون لە "بانقدارانی دەوڵەمەندی پڕخۆرو خۆشخۆر" و "گەشتیارانی گۆنائاڵێن ئینگلیزو ئەمریکی" ئەمانە هەموو ڕۆژیٚ دەچوونە گەڕان و وەرزش، ئیشتیای خواردنیان دەکرایەوە، ئێواریٚ بە کۆمەڵ، بە خەیاڵی خواردنی بەلەزەتەوە دەگەڕانەوە بۆ ئوتێل. ئێوارەیەك گەڕانەوە، سەیریان کرد ئاشپەز باشیەکە ڕۆییوەو هیچ خواردنێك کە گۆڕیٚ نیە. کاتیٚ چیخۆف گەییە ئەم خاڵەی چیرۆکەکە، بە زمانێکی تەوسامێز کەوتە وەسفی ڕەفتارو هەڵوێستی هەر یەکێك لەو خواردە برسیانە بەرانبەر بەو کارەساتە. کە چیرۆکەکە گەییە ئێرە، ئۆلگا بە هەموو دڵتەنگیەکی خۆیەوە، نەیتوانی پێنەکەنێت.

هەرچەندە دنیا زۆر گەرم بوو، بەڵام زۆری پێنەچوو کە چیخۆف خەوی لێکەوت. خێرا خێرا هەناسەی دەدا، بەڵام دەموچاوی ئاسوودە بوو. دوای چەند سەعاتێك ، لە سەعات دوازدەو نیودا لەپڕ هەستاو داوای دکتۆری کرد. ئەمە یەکەمجاری بوو لە ژیانیا ئەم جۆرە داوایە لە ژنەکەی بکات. ئۆلگا لەپڕ لەم ئوتێلە ئەڵمانیە گەورەیەدا، کە پڕ بوو لە خەڵکی نەناس و دیار بوو هەموو خەوتوون، هەستی بە تەنیاییەکی دژوار کرد. دوای شپرزەییەکی کەم، بیری کەوتەوە کە دوو خوێندکاری ڕوو لە ژوورەکەی تەنیشتی ئەوانن، بە هەشتاو ڕایکردو بێداری کردنەوە. یەکێکیان بەلەز وەدەرکەت تا بچێ دکتۆر شوورەر گاز بکات. ئۆلگا پاشان لەمبارەیەوە، لە یاداشتێکا دەڵێت: "ئێستاش گوێم لە دەنگی پێیەکانیەتی کە چۆن بەو شەوە کڕو کپ و خەفەناکەی مانگی تەمووز، بە سەر سەڵبەندەکەدا دەڕۆیی."

چیخۆف، بە دەم تاوە، وڕێنەی دەکرد، بە چاوانی ئەبڵەقەوە جارێ باسی دەریاوانێکی نەناسی دەکرد، جارێ پرسیاری ژاپۆنیانی دەکرد. بەڵام کاتێ ئۆلگا خەریك بوو جەوەنەیەك بەفری وردکراوی دەنایە سەر سینگی، یەکسەر وەخۆهاتەوە، بەدەم بزەیەکی خەمگینەوە گوتی: "بەفر مەنە سەر دڵێکی بەتاڵ." پەنجەرەکان لەسەر گازی پشت بوون، ئەوجاش وەکو پێویست هەناسەی بۆ نەدەدرا. کەوتبووە هانکە هانك، لاجانگەکانی نیشتبوونە سەر ئارەقە. دکتۆر شوورەر سەعات دووی دوای نیوەشەو گەییە سەری. چیخۆف، هەرکە چاوی پێی کەوت ڕاست بووەوە، پشتی دا بە بالیفەکانەوە، بەجۆرە ئەدەبێکەوە، بەزمانە ئەڵمانیە شکاوەکەی خۆی گوتی: "ئیش شتربە"* دکتۆر شوورەر یەکسەر دەرزییەکی کافوری لێدا. کە بینی دڵی چیخۆف هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا، خەریك بوو بنێرێت خێرا ئیستیوانەیەك ئۆکسجین بێنن. بەڵام چیخۆف کە هۆشی لەخۆ بوو، بەدەنگێکی پچڕ پچڕ: "فایدەی چیە؟ پێش ئەوەی بگەنە ئەوێ، من دەمرم." هەنگێ دکتۆر شوورەر ئەمری کرد شووشەیەك شامپانیای بۆ بێنن.

کە شامپانیاکەیان هێنا، چیخۆف پێکێکی وەرگرت، ڕوویکردە ئۆلگا و بەدەم بزەیەکی کاڵەوە گوتی: " لە مێژە شامپانیام نەخواردووە." بە کاوەخۆ پێکەکەی خواردەوە، پەرداخەکەی لای دەستەچەپەوە دانا، کەوتە سەر لا. دوای چەند ساتێك لە هەناسەدان کەوت. ئیدی بە هەمان سادەیی هەمیشەیی خۆی، لە ژیانەوە بەرەو مردن، پەڕی بووەوە. لە ١٩٠٤/٧/٢دا بەو ئاوایە مرد. سەعاتی قەد دیوارەکە سێی بەرەبەیانی نیشان دەدا. پەپوولەیەکی باڵ ڕەش لە پەنجەرە کراوەکەوە خۆی بە ژوورا کرد بوو، شێتانە خۆی بە گڵۆپە ڕوناکەکەدا دەکێشا، دوای تۆزێك بێدەنگیەکی بەسام لە جەنازەکە ئاڵا. دکتۆر شوورەر دوای سەرخۆشی و دەربڕینی هاوخەمی خۆی ڕۆیی. لەپڕ شڵپەیەکی خۆش هاتە گوێ: تەپەدۆری سەری شووشە شامپانیاکە دەرپەڕی، شامپانیاکە، بەدەم کەفچەڕینەوە بە قەدو باڵای شووشەکەدا هاتە خواری. پەپوولەکە، ڕێگای خۆی دۆزییەوەو لە پەنجەرەکەوە خۆی بە ناو جەرگەی شەوە گەرمەکەدا کردو لەچاو ون بوو. دیسان کپی و بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. کاتێ ڕۆژهەڵات، تەیروتو کەوتنە جریوە جریو، گەڵای داروردەختان کەوتنە خشە خش، ئۆلگا هێشتا بە خەمناکی بەدیار جەنازەی مێردەکەیەوە دانیشتبوو نیگای لەسەرو چاوی نەدەگواستەوە. دەموچاوی ئارام، بەبزە، دەتگوت

ئاگای لە هەموو شتەکانە. ئۆلگا، پاشان، ئەو ساتانە بە پەیڤان دەسپێرێت و دەڵێت: "هیچ دەنگێکی بەشەری لە ئارادا نەبوو. ژیان جوڵەی ڕۆژانی لێوە نەدەهات. ئەوەی هەبوو تەنیا جوانی، ئارامی و شکۆ و جەلالی مەرگ بوو."

ئیدی ئۆلگا، ڕێوشوێنی پێویستی گرتەبەر بۆ گواستنەوەی تەرمی مێردەکەی بۆ مۆسکۆ، کە قەرار بوو لە ۱۹۰٤/۷/۹دا لەوێندەر بەخاك بسپێردرێت. کۆمەڵێك دۆست و برادەر، لە ڕۆژی دیارکراوا، لە وێستگەی نیکولا خڕبوونەوە تا چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو قیتارە بکەن کە تەرمەکەی چیخۆڤ پێبوو. کاتێ کە دیتیان تەرمی چیخۆف، نووسەرە "هەرە خۆشەویستەکەی مۆسکۆ" لە فارگۆنێکی کەسکی پیس نراوەو لەسەر دەرگاکەی بەخەتی درشت نووسراوە: "بۆ گواستنەوەی سەدەفان"

گۆرکی، خوای نەمابوو، پەلەپیتکەت لێدابا شەقی دەبرد. نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسی: "خەریکە دڵم شەق دەبات. حەزدەکەم پڕ بەدەم هاوار بکەم، بگریم لەخۆم بدەم! خۆ بۆ ئەو هیچ فەرقێك ناکات، ئەگەر جەنازەکەیان لە سەبەتەیەکی جلی چڵکنیشدا بهێنابایەوە، هەر عەینی شت بوو. بەڵام بۆ ئێمە بۆ کۆمەڵگەی ڕووسی، عەیبەیەکی گەورەیە. هەرما بە فارگۆنی "گوێزانەوەی سەدەفان" بهێنرێتەوە! ئەوەی لە دڵی گۆرکی دەرنەدەچوو ئەوە بوو کە ڕووسیا بەو بێموبالاتی و خەمساردیە ڕەفتاری دەگەڵ بکات. کە پاشان ئەم فارگۆنە سەوزەی بەو پەڕی ڕیسوایی و شەرمەزاری لە قەڵەم داوەو بەوەی شوبهاندووە بودەڵەیەك بەدیار کوشتەی دژمنە بێ گیانەکەیەوە لە قاقای پێکەنین بدات و پۆزی سەرکەوتنی بەسەردا لێبدات. باشە ئەم گاڵتەجاڕیە زەقەش، هەر شتێك نەبوو لە بابەتی شێوازی گاڵتەچاڕانەی چیخۆف کە لە زۆر چیرۆك و شانۆنامانیدا دەربارەی بێهودەیی و پۆچی ژیان، بەرجەستەی کرد بوو؟

جۆقەیەکی مۆسیقای سوپایی، لەسەر شۆستەی وێستگاکە وەستا بوو و کەوتە لێدانی ئاوازێکی ماتەمباری، بەرە بەرە ماتەمگێڕان ڕیزیان بەست، هەندێك لەو دۆست و برادەرانەی هاتبوونە پێشوازی جەنازەکەی چیخۆف، بەگەڵ کاروانی ماتەمگێڕەکان کەوتن. ئەوەی ڕاستی بێ گەلێك لە ئامادەبووان سەریان سووڕما بووو نەیاندەزانی بۆچی چیخۆف بەم شکۆو ڕێوڕەسمە سوپاییە بەخاك دەسپێردرێ. لە دڵی خۆیاندا ستایشی دەوڵەتیان دەکرد، کە ئەم ڕێزو بایەخەی بەم ڕووداوە داوە. لە ڕێگادا زانیان کە دوای جەنازەی جەنەڕاڵێك کەوتوون بە نێوی کیلەر کە لە مەنشوریا* کوژرابوو وبەڕێکەوت جەنازەکەی هاوکات دەگەڵ جەنازەی نووسەرە دڵبەندەکەی واندا گەیی بووەوە ئەوێ.

بەڕێکەرانی جەنازەکەی چیخۆف کە هەر سەد کەسێك دەبوون و نابوون، لە وێستگەکە دەرچوون، مفەوەزێکی قەڵەوی کەتە بەسواری ئەسپێکی سپی بە هەیبەت پێشیان کەوتبوو. چەند خوێندکارێك تابووتەکەیان نابووە سەر شان و هێواش هێواش دەڕۆیشتن. ئۆلگاش لە دوای ئەوانەوە ڕێی دەکرد، دنیا گەرم بوو، تەپوتۆز بەدەم هەنگاونانی خەڵکەکەوە بەرز دەبووەوە. دوو پارێزەر بەجلی شیکەوە "وەکو دوو تازە زاوا"بە پێڵاوی تازەی بریقەدار و بۆینباخی درەخشانەوە لەپێش گۆرکییەوە ڕێیان دەکرد. بەدەم ڕێگاوە باسی زیرەکی سەگەکان

و جوانی و شکۆی کۆشك و تەلارەکانی خۆیان دەکرد. ژنێك کە جلێکی ئەرخەوانی لەبەرو چەترێکی بە گێزوگوڵنگەی هەڵدابوو، بە خوێنساردی باسی چیخۆڤ بۆ پیرەمێردێکی تەنیشتی دەکرد کە عەینەکێکی چوارچێوە پلاستیکی لەچاو بوو ودەیگوت: "کە پیاوێکی ناسك و ڕوح سووك بوو!" گۆرکی وای هەست دەکرد، هیچ کەسێك لەوانەی دەوروبەری، هەست بەو خەسارەتە گەورەیە ناکەن کە لە ڕووسیا کەوتبوو. کاروانی بەرێکەرانی تەرمەکە بەدەم ڕێکردنەوە، بەرە بەرە زۆر دەبوون. ئەوانەی بەگەڵ کاروانەکە دەکەوتن کڵاوەکانیان دادەگرت و نیشانەی خاچیان دەکێشا. کۆمەڵێك خوێندکار دەستیان گرتبوو وپەرژینێکی بەشەرییان دروست کرد بوو، تا نەیەڵن لاپرەسەنان و فزوڵان بێنە سەر ڕێگایان. تراموا و گالیسکەکان بە درێژایی ڕێڕەوی کاروانەکە وەستابوون، خەڵکانێك بە ئاماژەی قامکان گۆرکی و شالیاپین — یان بە یەکدی نیشان دەدا کە پێکەوە ڕێیان دەکرد، هەندێك لەوانە دەیانویست خۆ بگەیەننە وان و لە نزیکەوە بیانبینن. کاروانەکە بەدەم ڕێوە لە هەندێ شوێنان وەستان، بە تایبەتی لەبەردەم شانۆی هونەرو لەبەر بینای "هزری ڕووسی"دا تا هەندێ سووکە ڕێوڕەسمی ئاینی بەجێ بێنن. دایکی چیخۆف و خوشکەکەی و براکانی تازە گەیی بوونە مۆسکۆ، بە هەشتاو تاویان دەدا کە بە گەڵ کاروانی بەرێکەرانی جەنازەکە بکەون، پۆلیس لە هەوەڵەوە نەیناسین و ڕێگەی نەدان، تا ماری هاواری کرد: "ڕێگەم بدەن، ڕێم بکەن با لە براکەم نزیك ببمەوە!"

ئێستا جەماوەرێکی زۆر دوای جەنازەکە کەوتبوو. کە کاروانەکە گەییە بەر دەرگای دێری نوڤودیڤیچی، لەبەر ئاپۆرای خەڵکەکە ڕێ بەر ڕێدار نەدەکەوت. هەڵگرانی تابووتەکە و بنەماڵەکەی چیخۆف و کەسوکارو دۆستە نزیکەکانی دەبوایە بە پاڵەپەستۆ ڕێگای خۆبکەنەوەو بگەنە دیار گۆڕەکە. ئاپۆڕاکە، بەدەم بۆڵە بۆڵ و جنێودان و داخ و کەسارانەوە، لە دوای ئەوانەوە هرووژمیان هێناو بەدەم شکانی خاچان، ڕوخانی پەرژینان و پێشێلکردنی گوڵانەوە، وە ژوور کەوتن و بە نێو گۆڕستانەکەدا بڵاوبوونەوە. شالیاپین، بەچاوانی تەژی ڕوندك و دڵی بەکوڵەوە بە گۆرکی گوت: "ئەمە ئەو جەماوەرەیە کە ئەو لە پێناویا دەژیاو، کاری بۆ دەکرد و ڕێی نیشان دەدا!" لە تەنیشتی گۆڕەکەی بابیەوە، گۆڕیان بۆ چیخۆف هەڵکەند بوو. هیچ وتارێك نەخوێندرایەوە. کاتێ کە جەنازەکەیان بە تابووتەکەوە، لە گۆڕنا، ئاپۆڕاکە کە ئارام بوو بووەوە دەستیان بەخوێندنی سروودی مردووان: "یادی بەخێری هەتا هەتایە بمێنێ" کرد. ئەوجا ئۆڵگا وخانەوادەو دۆستانی نزیکی ئانتون، بەریز بە بەر گۆڕەکراوەکەدا تێپەڕین و سەروچنگ گڵیان فرێ دایە سەر تابووتە درێژەکە، کە بەحاڵ دەنگی نیشتنەوەی گڵەکەی عەکس دەکردەوە، ئەوجا گۆڕەکە بە گڵ پڕکرایەوەو هەنگێ گۆڕەکە لە ژێر خەرمانێکی گەورەی چەپکە گوڵ و تاجە گوڵینەدا ون بوو، تەنیا سێ ژنی داخدار، خەمین و خەمبار، نەیاندەتوانی چاو لەو خەرمانە گوڵە بگوازنەوە کە چیخۆف لە ژێریا ڕاکێشا بوو: دایکی و، خوشکەکەی و، ژنەکەی*.

بۆ سبەینێ ڕێوڕەسمی ئاینی لە گۆڕستانەکەدا بەرپا کرا. کە تیشکی زەردەپەڕی ئێوارێ لە گەڵای دار زەیزەفۆنی دیار گۆڕەکەی دەدا، وەکو زێڕ زەرد دەچوونەوە. جۆقەی کڵێسا سروودێکی ناسکی خەمینی دەخوێند. چەند دۆست و ئاشنایەك دەگەڵ خانەوادەکەی چیخۆف

دا هاتبوونه سەر قەبران. دوای تەوابوونی ڕێوڕەسمەکە کوپرین، کڕنووشی بۆ دایکی چیخۆف برد، بێئەوەی تاقە وشەیەکی لە زار بێتەدەر دەستی ماچ کرد. دایکی چیخۆف گوتی: "بڕوانە چ بەڵایەکمان بە سەرهات! ئانتونشا ڕۆیی!"

ئەمە تاقە وتار بوو کە لەسەر گۆڕەکە خوێندرایەوە. چیخۆف ئەوەندە لە فیشاڵ و فیشاڵبازی بێزار بوو، بێگومان ئەم تەقدیرە بێدەنگەی لە دڵ گران نە دەبوو.

پەراوێز:

*-کۆمەڵێك کۆکەی گرینگ... لەجیاتی کۆمەڵێك قسەی گرینگیان بۆ یەکدی کرد.

*- (بیست و پێنجەمین ساڵیادی...) بەگوتەی چیخۆف ئەم ساڵیادە دروست نیە، چونکە یەکەم بەرهەمی لەساڵی ١٨٨٠دا بڵاوکردووەتەوە،

* - چیخۆف، وشەیەکی لەوە کاڵوکرچتری لە "دەرۆم بۆ مردن" بەکار برد بوو، تیلیشوف نەیویستووە لە یاداشتەکانیا بەکاری بەرێت.

* - ئیش شتربە: دەمرم.

*- مەنشوریا: ناوچەیەکە لە باکووری ڕۆژئاوای چین کە لە باکورو ڕۆژئاواوە هاوسنوورە دەگەڵ خاکی ڕووسیادا.

*- (تەنیا سێ ژن..) دایکی چیخۆف، پازدە ساڵ دوای چیخۆف مرد. ماری خوشکی، دوای شۆڕشی ئۆکتۆر، بوو بە بەڕێوەبەری مۆزەخانەی چیخۆف لە ماڵەکەی خۆیا، لە یاڵتا. لە ساڵی ١٩٥٧دا لە تەمەنی نەوەدوچوار ساڵیدا مرد. بەڵام ئۆلگا کنیپەری ژنی سەرکەوتووانە درێژەی بەکاری شانۆییی خۆی دا و لە ساڵی ١٩٥٩دا لە تەمەنی هەشتاونۆ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

تێبینی: لە ڕۆژی پێنج شەمە ٢٠١٥/١/٨ لە شاری سلێمانی و گەڕەکی ڕزگاری، لە پاچڤەی ئەم بەرهەمە بوومەوە کە لەم دوو دەقەی خوارەوە، بە شێوەیەکی بەراوردکاریانە وەرم گێڕاوە، جا ئەگەر ئەمە بووبێتە هۆی ئەوەی هەندێ دەستەواژەو ڕستەو پەرەگراڤی دەقە کوردیەکە لە ڕواڵەت و شێوەدا تەواو دەگەڵ سەرچاوەی یەکەمدا تێکنەکاتەوە، ئەوا لەگەڵ سەرچاوەی دووەمدا تێکدەکاتەوەو دیارە پێچەوانەش پێچەوانەیە. هەڵبەتە بەدڵنیاییەوە پاچڤە کوردییەکە ئەگەر لەو دوو پاچڤەیە باشتر نەبێ ، ئەوا هیچی لە وان کەمتر نییەو بێ چەندو چوون ڕووی مەجلیسی ئەدەبیاتی هەیە..

سەرچاوە:

١- تشیخوف/ هنری تروبا من الاكاديميه الفرنسيه/ ترجمه: خليل الخوری، مراجعه الدكتور علی جواد الطاهر/ سلسله المائه كتاب الطبعة الاولی - بغداد - ١٩٨٧ (پڕ بەدڵ سوپاسی برای ئازیز مامۆستا سابیر شاکیر (مەلوول) ی ڕۆشنبیرو وەرگێڕی دڵسۆز دەکەم، کە ئەم سەرچاوەیەی بۆ دابین کردم

٢-چيخۆف/هانری تروايا/ ترجمه علی بهبهانی/ چاپ چهارم ١٣٨٩ تهران: ناهيد: شركت انتشارات علمی و فرهنگی.

# فەرهەنگۆك

## ئا

ئەداو ئەتوار: رەوشت و ئاكار

ئارایشتكار : ئارایشتگەر ، مكیاجكار

ئەوك : قوڕگ، گەروو، بەرمل

ئاسیو : ئازار، بەلاَ ، زیان، زەرەر

ئاشخانە : مووبەق، چێشتخانە

ئەنگۆ: ئێوە، هەوە، هون

ئەگەرنا: دەنا، ئەگینا، ئەگین، گەرنا

ئێژی : دەڵێی

ئەفسووناوی : سیحراوی، جادوویی

ئیكلام : كڕنۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن

ئامێز : باوەش، هەمێز

ئەزبەنی : گەورەم، قوبان

ئاران: گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار

ئۆین: پیلان، دەسیسە، فێڵ و مەكر

ئۆینباز : بەمەكرو فێڵباز، پیلانگێڕ

ئێشك: پاس، كێشك

ئاكنجی: نیشتەجێ

ئالوودە:گیرۆدە، خووپێگرتوو

ئاوەز: هۆش، فام، ئەقڵ

ئاشپەز: شیوكەر، چێشت لێنەر، چێشتچی

ئەنگێزە: هۆ، هاندەر، سۆنگە

ئەستەم: زەحمەت، ئاسێ ، دژوار

ئەسەح: ئەكید، خویا، مەعلووم

ئیرەیی: حەسوودی

ئەستێڵ: حەوز

ئیستەرەم: دەمەوێ

ئەستەڕ: بەر، بەری كەواو...

ئاپۆڕا: حەشامات، قەرەباڵغی، حەشیمەت

ئاشووب: پەشێوی و ئاژاوە

ئەوزار: ئامراز، ئامێر، وەسیلە

ئاغەڵ: جێی داكردنی مەڕو بزن لە دەمی سەرمادا

ئەسكەمیل: كورسی

ئاوەز: ئەقڵ

ئاخێز: نیوه هەستان

ئەوقات: پارێزەر

ئۆل: ئاین

ئاریشە: کێشە، گرفت

ئاودڕکە: ئاودڕ، ئەو شوێنەی ئاو دایدڕیبێ

ئاڵچاخ و دەنی: سووك و بێ ئابڕوو، خوێڕی

ئاوردوو: سوتەمەنی،شەواتەك ،ئێزنگ وقەلاٚشکەری

ئەرخایەن: دڵنیا، خاترجەم

ئۆفیس: نووسینگە، ژووری کار

ئاخاوتن:قسەکردن، پەیڤین

ئیش: کار

ئاوەژوو: بەرەواژ، سەروخوار، پێچەوانە

ئێزنگ: داری سووتاندن

ئاشچی: چێشت لێنەر، ئاشپەز

ئاوێزە: چلچرا،پڵپڵەو سڵسڵەی خشڵی ژنان

ئاوارتە: ریزپەڕ، جیاکراوە، دوورخراوە، پەڕێنراو

ئەمەك: وەفا، ئەمەگ، نمەکناسی

ئیفترا: بوختان

ئەزبەرکردن: لەبەرکردن

ئەشقی: شەقاوە، بەرەلاٚ، یاخی، ملهوڕ

ئەرباب: خۆش مەشرەف، رووخۆش، خۆش مامەڵە

ئاچەر: هاچەر، کلیل

ئاڵدۆزی: رۆکێشی زێرو زیوو، سورمە ڕێژ، سورمە چن

ئۆردووبەز: جێگەی دابەزین و ئیسراحەتی لەشکر

ئەڵها: ئارەزوو، کەڵکەڵە.

ئەسپەك: نەخۆشییەکی مێشکە، ماخولیا و جۆرە شێتییەکە.

# ب:

باوەژن: زڕدایك، هوٚی دایك، باجی

باب: باوك

بالاٚنما: بالاٚنوێن، ئاوێنەی بالاٚڕوان

بەلەز: خێرا، بەپەلە، گورج

بایس : هۆ، باعیس ، سەبەب

بلوور: شووشە

بێنەوا: هەژار، بێچارە، داماو

بە تۆبزی: بە زۆر، بە خورتی

بە روحم : بە بەزەیی ، دلۆڤان

برنجە: جۆرە کانزایەکە، زەردی سەماوەر(قصدیر)

بەلەنگاز: بێچارە،نەدار، بەسەزمان

بەرۆك: یاخە، یەخە

بەكاوەخۆ: بە هێواشی

بەرسڤ: وەلاّم

بەڕك: گیرفان، باخەڵ

بالیفۆكە: سەرینی بچووك، گۆشە

بوری: تێپەڕی

بیلبتون: بە تەواوەتی

بەو ئاوایە: بەو جۆرە، بەو شێوەیە

باریە: لۆسە

بەستێن: رۆخ، كەنار، گویٚ چەم، دەم چەم، ڕەخ

بێشە: دارستان، لێر

بەركۆشە: بەرهەڵبێنە

بن پیاڵە: ژێر پیاڵە

بۆرەقنە: ئامال بۆر، مەیلەو بۆر، بۆرباو

بوێر : ئازا، دلێر

بێوەی: بیٚ زیان، سەلامەت

باڕ : بێچووە مەڵی بەهارە

بێزوو: بێزگ، مەگیرانی

بێزگەوان: بێزووكەر

بەلاٚنس: هاوسەنگی

بارتەقا: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر

باجەوان: باجگر

بە سویٚ: بە ژان، بە ئازار

بەردەبار: پیاوی زاناو بە تەگبیر

بێدادی: نەهەقی

بەیتاڵ: پزیشكی ئاژەلاٚن

بویەر: ڕووداو

باژێرۆك: شارۆچكە

باشار: دەربردن، خۆراگرتن

بەرایی: پێشایی، بەراهی

بەڵەد: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن

بەفرە ژیلكە: بەفری زۆر دەنك ورد

بەلەك: پووز

بە خورتی :بە تۆپزی

بالیف: سەرین، پشتی

بەگەنكردن: پەسندكردن

باندۆر: كاریگەریی

بایس: هۆ،باعیس، سۆنگه

بەرخودان: مقاوەمەت

بارخانه:کەلوپەلی بازرگانی، باری لەسەر یەك هەڵچنراو

بەرجەوەن: دیمەن

بۆدڕ: بۆنی توندی ماسی و تەگه

بوودڕ: ڕەهۆڵ، دادڕاوی زەوی، کەند

بۆدراو: برژاو، خاوەبرژ

بەڵخ: بەڵغ، کەڕوو

باسریشك: بەفرو باران پێکەوە

بوخچه: پارچەیەکی چوارگۆشەیە بۆ کەل و پەل تێنان

بەدخوا: دڵپیس، لە چاکە بەدوور

بەعزکردن: تۆران. زیزبوون، قسە دابڕان

بن عام: خزمی دوور

بەگەن: پەسند

باپەڕ:نەخۆشی لە سەرماوە، سەرمابوون

بۆز: ڕدێنی ماش و برنج، شینی ئامال سپی

بیژی : زۆڵ ،حەرامزادە، شەیتان و وریا

بەتڵ: بەشێك

بوری : تێپەڕی

بادیهەوا: بە خۆڕایی، بەفیز و دەعیه

بزە: زەردەخەنه

بە خۆی نەوەستا: خۆی پێ زەوت نەکرا

بە خورتی: بە زۆر، بە تۆپزی

بنیچه: ڕەچەڵەك

بەور: دڕندەیەکی بە سامه

بالوکه: شتێکه وەك زیپکه و، زیپکەش نییه

بێ زات: بێ زاخ، ترسنۆك

بە غار: بە ڕاکردن

برێك: کەمێك ،تۆزێك، هەندێك

بەد ڕا: بیرخراپ، نیاز خراپ

بژوێن: زەوی پڕ گیا و لەوەڕ، بژوون، زەمەند

باخفم: قسەبکەم.

## پ:

پێشخزمەت: نۆکەری بەردەستان

پارك: باخ

پسمام : کوڕە مام، ئامۆزا

پواز: سنگێکه لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا نەیەتەوە یەك

پۆڕ: باڵندەیەکی خۆش گۆشتە، لە مریشک گەورەترە

پێشکار: خزمەتکار

پەیڤ : وشە، وتە ، قسە

پەز: مەڕ، مێگەلە مەڕ و بزن

پەری : فریشتە

پاژ: بەش

پرتەو: تیشک ، روناکی

پێکڤە: پێکەوە، بە هەڤڕا

پڕ: زۆر، تەژی

پۆستین: فەروە، کەوڵی تیسکن

پەژمردە: چەرمسی، ژاکاو

پایدۆس: دەست لە کار هەڵگرتن

پۆڵکە: گاگۆز

پەسیو: پەسیڤ، هەلأمەت

پیتاك: باربوو، کۆکردنەوەی دارایی

پێل: شەپۆل

پەسلان: قیامەت، ئەو دنیا

پاتاوە: پێلأو، کاڵە.

پاتۆق: شوێنی کۆبوونەوە

پۆڕ: قژ

پێشداوەری: حوکمی پێشوەختە

پانکردنەوە: ماستاوسارکردنەوە، ڕووپامایی

پەشم: قسەی قۆڕو بیٚ مانا

پزیشکیار: یاریدەدەری پزیشك

پەتۆ: بەتانی

پەرکەم:فیٚ، خوودار، پەتاو هەلأمەت پێکەوە، ئەنفلۆنزا

پێشهات: قەومان، بەسەرهات

پشتیر: گەوڕ، تەویلە

پەتەڕی: پەتیارە، شێتۆکە

پڕکێشی:پێداگری، سووربوون، جورئەتکردن

پاکەن: کەوش کەن، جێگەی پێلأو داکەندن

پەیڤ: وشە

پسۆك: قرچۆك، بەنێك زوو بپسێت.

پاخوا:بەشی رۆژە سواغێك قوڕ، کلۆشی بەر پیٚ بۆ گێرە

پوشپار: گیای وشك

## ت:

تەمەشاڤان: بینەر، سەیرکەر

**تەماشاخانە: شانۆ، نمایشسەرا**

**تەژی: پڕ، لیپاو لیپ، سەر ڕێژ**

**تا: لا، لایەن**

**تێشت: نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی**

**تالووکە: مەترسی، خەتەر**

**تەبارە: دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قایمە دەغڵ**

**تەژەو ناقۆڵا: گەورەو ناشیرین**

**تاین: یارۆ، فلأن، ناڤبری**

**تاژی: سەگی ڕاو، تانجی**

**تەشقەڵە: گەڕ، بیانووپێگرتن**

**تەیرو تو: باڵندەو مەلان**

**تەوازۆ: تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن**

**تخوب: سنوور، کەوشەن، تخووم**

**تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، توێڵ،جەمین**

**تۆرینۆك:تووڕەو دڵناسك**

**تەختەبەن: تەختە خەو**

**تەقوو: بەڵکوو ،هاتوو**

**تاقەتکردن: شاردنەوە، داکردن**

**تۆلاز: مێباز، چاو لەوەڕێن**

**تیلمە: تیلماسك**

**تیلاگ: لاسەر**

**تاوەگاز: تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو، تاوەسووت**

**تەڵفیزی: تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەو گەپ**

**تەریدە : ڕێگر ، چەتە**

**توولەك: وەرینی مووی لەش**

**تۆسن: سەرکێش، نا ڕام**

**تەڤگەر: نەسرەوت، بزووتنەوە**

**تەمراندن: کوژاندنەوە**

**تاری : تاریك**

**تۆماکۆ : تووتن**

**تەشبریق : هەورە تریشقە، بروسکە**

**تووك: نزای خراپ ، دوعای شەڕ**

**تاخ: گەڕەك**

**تاس: سەر ڕووتاوە، دەغسەر**

**تەرز: جۆر، نەوع**

**تەوسخەن:ژارخەن، پێکەنین بە تەوسەوە، پێکەنینی تەوسامێز**

**تاراوگە : مەنفا**

**تیز: تەوس، توانج، گاڵتە پێکردن**

**تامپۆن: دەعم، پێکدادان**

**تازەمۆد: نۆباو**

**تەشقی ئاسمان: بڵندایی ئاسمان**

**تەرە: تاراو، لە لانە تۆراو، ئاوارە**

**تەرزەکوت: تەرزەشکێن، درەخت یان زەرعاتێك تەرزە لێی دابێت.**

**تلیانە: قەرتاڵە، سەبەتە، سەبەتەی میوەچنی**

**تەنی: هیس، ڕەشایی نیشتووی دووکەڵ**

**تۆغیان: هەڕەمە، هەڕەت**

**تابان: درەوشاوە، بە درەوشین**

**تەشپی: بادیە، کاسەی دارین**

## ج:

**جەگەن: گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەڵکاودا دەڕوێ**

**جنگن: شەڕانی، دڕ، نەگونجاو**

**جەلۆ: هەرزە پیاو، سەرسەری**

**جندەخانە: سۆزانی خانە، قەحپەخانە**

**جەڕباندن:تاقی کردنەوە، تەجرەبە کردن**

**جوڕنە: حەوزۆکەی گەرماو**

**جما: جولا، بزوا**

**جڤاکی: کۆمەلایەتی**

**جوابی کرد : دەری کرد ، ئیزنی دا**

**جمکانە : دووانە، جمك، لفانە**

**جەندەك: تەرم**

**جیازی: کەلوپەلی بووك بۆ ماڵی زاوا.**

**جنزەدە: کەسێك جنۆکە دەستیان لێوەشاندبێت**

**جوونێ: تاقمێك، دەستەیەك، کۆمەڵێك**

**جەوەندە:مەتارە، کوندەی بچووك بۆ ئاو تێدا هەڵگرتن، دێمکە**

**جوابە جەنگی: بە دەمدا هاتنەوە.**

**جەنگە: گەرمە، هەڕەمە، هەڕەت**

## چ:

**چەلەنگ: چوست و چالاك، گورج و گۆڵ، شۆخ و شەنگ**

**چینی: جۆرێ سواڵەتی هەرەباشە، وەکو کاشی**

**چتۆ: چۆن، چلۆن، کوو**

**چڕین: وتن ( بۆ گۆرانی و قام)**

**چێڵ: مانگا**

**چەنگ: ئامێرێکی موسیقایە، هارپ**

**چەکمە: جەزمە، پووت**

**چەمەنزار: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار**

**چما: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی**

**چقڵ: دڕك، دڕو، دڕی**

**چەرچی: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش**

**چوغورد: چوغور، چغر، چڕ**

**چمك: سووچ، گۆشە**

**چوارنکال: هەرچوارلا**

**چێبوو: دروست بوو**

**چەمووش: سلّ، رەوەك، لەقە هاوێژو گازگر**

**چەرموو: سپی**

**چەرچی: دێوەرە،فرۆشیاری گەرۆك، دەستفرۆش**

**چاوساغ: دەسکێش، جاسووس، سیخوڕ**

**چەلیپا: خاچ، سەلّیب**

**چاوگ: دەستە چیلە**

**چوون: وەك،**

**چپەدوو: دووان بە چپە**

**چەقەن: زەوی تمتم، ڕەقەن.**

## ح:

**حایرمان: سەرسام بوون**

**حەسار: حەوش**

**حەنەك: جەفەنگ،قسەی گاڵتەو گەپ**

**حەشەری: بەر بەتاو، ژنی بە ئاڵۆش**

**حەژمەت: مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم**

**حەجامات: خوێن بەردان**

**حەوجە : پێویست**

**حێل: گەورە، زۆر گەورە**

## خ:

**خەنی لە خۆتان: خۆشی لە خۆتان**

**خشکۆك: دەلال، جوانکیلە، جوان، قەشەنگ**

**خەنەقاندن: خنکاندن ، لە سێدارەدان**

**خوبزە: خولاّم، نۆکەر، خزمەتکار، خزمەتچی**

**خورجین: هەگبەی لە بەن، جانتای لە بەن، خورج**

**خا: خات، خاتوون، خانم ، یا**

**خاپاندن: فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن**

**خاپینۆك: فریبۆك، فێڵباز**

**خانەدان: نەجیمزادە، ئەسڵزادە**

خودان: خێو، خاوەن، ساحێب

خوڵك: خوڵق

خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری

خشت: رێك، بێ كەم و زیاد

خاكی: بێ هەوا، بێ فیز

خەرگە: پەڕۆی كۆن و پیس

خوابەختەكی: خۆو بەخت، بە هەڵكەوت

خەبتین: خەبات كردن

خشكۆك: جوان، خشیك

خویا: ئاشكرا، دیار ، روون

خۆرانگاز: تاوە سووت، سووتاو لەبەر خۆر

خەفیە :جاسووس، خەوەرچین، هەواڵدز

خۆڵەكەوە: خۆڵەمێش

خەمرە: كوپەی زۆر گەورە

خەنۆل: خەندەران، دەم بە پێكەنین، ڕووخۆش

خزاگ:عەرەبانەیەك كە بەسەر بەفرا ڕایدەكێشن

خۆشكێنی: بێ فیزی، خۆ بە زل نەزان

خوو: فێ ، پەركەم

خۆیبوون: سەربەخۆیی

خڕ: هەموو، گشت، تێكڕا

خاترجەم: دڵنیا، ئەرخایەن

خوارنگە: خواردنگە، چێشتخانە

خاكرێز: قوڵكەیەك كە خاك و خۆڵی تێ فڕێ دەدرێ

خانەزا: نۆكەرێك كە لە ماڵی ئاغاكەی لە دایك دەبێ

خاترخوازی: خاترخازی، دوعاخوازی، خواحافیزی

خاراو: ڕاهاتوو لە كار، قاڵبووی كاران

## د:

داماو: بێنەوا، بەلەنگاز، بێچارە

دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ

دێركەوتن: دواكەوتن

دلپاقژ: دڵپاك، بێ فرو فێڵ، بێ گزی

دەربار: دیوەخان و بارەگای پاشا

دەهری : زۆر تورە

داگەڕان: هاتنە خوارەوە

دڵنەواز : دڵگیر، مایەی دڵخۆشی

دلۆڤان: بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان

دیدەوانی: ئێشكگرتن ( بە تایبەتی ئێشكی سەر قەڵات و بورجان)

**داپیره: دایە گەورە، نەنك**

**دەلیڤە: دەرفەت ، هەل**

**درەخت: دار**

**دەربارییان: دەست وپێوەندانی دیوەخان و بارەگای پاشایەتی**

**دڕوو: دڕك، چقڵ، دڕی**

**دڵڕەش: بێ بەزەیی، ستەمکار، دڵرەق، ڕکوونی**

**دامە: مۆر**

**دنگ: دینگ، ئامرازی چەڵتووك كوتان**

**دەڵەکدان: پاڵنان**

**دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان**

**دوونیەتی: خوێڕیەتی، بچووکی**

**دەڵەچە: مەرایی کەر، ماستاوچی**

**دۆنکی: داردەستی حەسحەسی ناو بازاڕ**

**دیرۆکنووس: مێژوو نووس**

**دەڕەڤی: هەڵەهات، رایدەکرد**

**دەرۆزە: گەدایی، سواڵ**

**داشۆ: کاکە، براگەورە**

**دەهری : زۆر توڕە**

**دەخەبتن : خەبات دەکەن**

**دۆغری : راست ، دروست**

**داغان : رووخان، وێرانکردن**

**دەغوول: دەسبڕ،خاپینۆك، فێڵباز، گزیکار**

**دوئێل: مبارەزە**

**دۆتمام: کیژەمام، ئامۆزا (بۆ کچ)**

**دەسەنە: بەخشین،**

**دوڕ: ناوەند، ناوەڕاست، چەق**

**دێر، درەنگ، جێگەی رەبەنانی فەڵە**

**دەست قڵپ: ماڵ بەفیڕۆدەر**

**دۆتمیر: کیژەمیر، شازادەخانم**

**دەقەتاند:بەسەردەبرد**

**دلاوا: بەخشندە، دڵ تێر، بە دەست و دڵ**

**دادڤانی: دادوانی، قەزایی**

**دەمە قاڵە:دەمبۆڵە، دەمقڕە، دەمەقاڵێ**

**دێر: جێگەی ڕەبەنی خاچ پەرست**

**دمۆر: دومۆر، شووم، نەحس**

**دەماوەر: قسە زان، وتە پاراو، چەقاوەسوو**

**دەقەتێ:دەبورێ**

**دەحکە: مشت و مڕ، گەنگەشەی توند**

**دایەن: ئەو ژنەی شیر دەدات بە منداڵی خەڵکی، ژنی بەخێوکەری منداڵی خەڵکی**

**دەخەلەساین: رزگار دەبووین**

**دەساوێز: بیانوو، پەڵپ**

**دەڵەمە: دۆڵەمە، شتێك بە تەواوەتی نەمەیی بێت**

**درزێو: ناحەز، ناشیرین**

**دەسەجەمی: بە كۆمەڵ**

**داشدار: لایەنگر و پارێزەر، پاسەوانی قەڵا**

**دوم: كلك**

**دین: شێت**

**دەلال:جوان و ڕەزا سووك**

**دەخمە: گۆڕ، قوڵكەی ژێر زەمین**

**دەسومشتاق: دەسومۆچ**

## ڕ:

**ڕەقسین: سەما، هەڵپەڕین**

**ڕنەك: قەشەو**

**ڕدێن: ریش**

**روندك: فرمێسك، رونتك، ئەسر، ئەسرین**

**رۆحانی: پیاوی ئاینی**

**راز: نهێنی**

**ڕەژوو: زوخاڵ ، خەڵوز**

**ڕك : كووڕ، ڕژد**

**رابوون: هەستان**

**رۆخانە: روبار، چۆم، چێم، ڕوو**

**ڕند: جوان، خوشیك، خوشكۆك**

**رمووده: ئالووده، هۆگر**

**رادەست: خۆ بە دەستەوەدان**

**رەند: مێرخاس، مەرد، پیاوانە**

**رەقیب: نەیار، خەنیم**

**ریسك: مغامەرە**

**ریوەڵە: بچكۆلەی لاواز، بێ نموود**

**رۆنیشت: دانیشت**

**رووپامایی: مەرایی، دەڵەچەیی، بن ریشەیی**

**راموسان: ماچ**

**رەهەنە: رەهەندە، عەودال ، ئاوارە، چۆڵگەڕ**

**رەبەن: سەڵت، زوگورت، راهب**

**رەبەنیتە: راهبە، ژنە فەڵەی تەركە دنیا، ڕەبەنی ژن**

**ڕاوگە: جێگەی ڕاو وشكار**

**ڕیشخەن: گاڵتە پێکردن**

**ڕەعیەت: ڕایەت، مسکێن**

**ڕەزا سووک: ئێسک سووک، ڕەزا شیرین، دەلال.**

**راجفرین: لەرزین، ڕاچڵەکین**

**ڕەدا: رازی بوون، قاییل بوون**

**ڕەخ: ڕۆخ، قەراخ، لا، کەنار**

**رازگر: مەحرەمی راز، نهێنی پارێز**

**ڕۆزا: جۆرە گوڵێکە، گوڵی پیرۆز**

**روودار: بێ شەرم، رووقایم، بێ چاو ورِوو**

**ڕاڤە: واتا شیکردنەوە، تەفسیر**

**ڕایە: حەدد، شیاوی**

**ڕەتبلاُو: هزرو بیر بلاُو، پەرتحەواس**

**ڕەقاڵ: رەقەڵە، داڵگۆشت، لەڕو لاوازِ، لەجەر**

## ز:

**زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیارە**

**زێدە: زیادە**

**زەلام: گەورە، ناقۆلاُو تەژە**

**زار: دەم، دەو**

**زوڕیيەت: وەچەو نەوەو نەتیرە**

**زێد: زاگە**

**زاگە: زێد، شوێنی لە دایکبوون، مەفتەن**

**زوخاڵ: رەژوو، خەڵووز**

**زگڕەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دڵ**

**زەوجین: زەماوەند**

**زڤڕینەوە: گەڕانەوە**

**زەیسان: زەیستان، ژنی تازە زاو**

**زەیەوان: زێوان، نیگابانی گۆڕ و گۆڕستان**

**زرانی: ئەژنۆ**

**زارۆک : بچیکان ، مندالاُن**

**زەردەکەن: بزە، زەردەخەنە**

**زەروو: زالو**

**زیانۆک: بە زیان، زەرەردەر، زیاندەر**

**زەحف: زۆر، فرە، مشە**

**زۆڵ: بیژ، حەرامزادە، زۆرزان**

**زەرگاڵ: پێلاُوی لە موو چندراو، بەلەک پێچ، گۆرەوی تا ئەژنۆ**

**زێبا: جوان، خشیك، ڕند، خشکۆك**

**زراڤ: باریك، شووش.**

## ژ:

**ژێوان: پەشیمان**

**ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی ، پێکەنینی تەوسامێز**

**ژارۆ: داماو، فەقیر، بەسەزمان**

**ژنەوتن: بیستن، ژنەفتن**

## س:

**سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە**

**سەڵت: ڕەبەن، بێ ژن و منداڵ، عازەب**

**سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە**

**سپڵە: پێنەزان، بێ ئەمەک، بێ وەفا، نمەک حەرام**

**سۆز: پەیمان، بەڵێن**

**ستران: گۆرانی، قام، لاوک، لاوژە**

**ستێران: ئەستێرە، ئەستێران**

**سپێدە: بەرەبەیان**

**سەوزەزار: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار**

**سەمت: لا، ئالی، رەخ**

**سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد**

**سەرگوروشتە: سەربوردە،**

**سخێف: جنێو**

**سەختگیر:توند و بەزەبت و رەبت**

**سیوات: خوێنەواری**

**سائەقڵ: شێتۆکە**

**سەربۆز: سەر ماش و برنج**

**سیاناو: قوڕاو**

**سێوی: هەتیوو، منداڵی بێ داك و باب**

**سیکتر: دەرکردن، تڕۆکردن**

**سونگی: قەمە**

**سەهەندە: بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی**

**سێبەندی: بێ شەرم و حەیا،**

**سابرێن: نێری، تەگە**

**سەرۆ: ئیلهام، سرووش**

**سازڤان: مۆزیکوان**

**سەرناڤ: ناونیشان**

**ستان: شار، پارێزگا**

**ستاندار: پارێزگار،متەسەڕیف**

**ساردخانە: مەیتخانە**

سۆل: پێڵاوی سووکەڵەی بێ پانییە ،نەعل
سەردولکە: گۆرانی هەڵگوتن بە مردوودا
ساڤالۆك: منداڵی تازەزاوی جوانکیلە
سەلبەند: رێگەی بە بەرد فەرشکراو
سیسەم: تەختە خەو، تەختە بەن
سوێ: ئازار، ژان
سیخار: زوقم
ساقەتە: لاسکی گیا
سەرگەڤار: سەرۆکی خێزان، گەورەی خێزان
سۆر: سوور، رەنگی سوور
سەوقاتی: دیاری
سالول: ژووری ئینفیرادی زیندان
سایمەل: جۆرێ نەخۆشی ئاژەڵ و ماڵاتە
سوتلی: قەپاتمە، ژنی بێ مارەیی بۆ ڕابواردن
سەربهوورد: سەربردە، بەسەرهات
سیپاڵ: جلك، بەرگ و کول و پەڵ، کۆنە پەڕۆ
سۆزانی: جندە، قەحپە
سیقال نەگر: مشت و ماڵ نەگر
سوخەت: سیفەت
سڵۆك: سرك، رەوەك، سڵ، بەپارێز
سفتە: چەك، کومپیالە، پسوولەی حەواڵە
ساپیتە: ساپیتك، میچ
سۆزە: گۆرانی خەمبار، سۆز، گۆرانی بە دەنگی نزم
سرووش: سەرۆ، ئیلهام، وەحی
سەرەوگرد: سەروەسێت
سندم : پێوەندی ئاسن.

## ش:

شڕندە: ژنی دەمدرێژی شەڕانی بێحەیا
شڕپۆش: شڕۆڵە، بێ بەرگ و بار
شەیپور: بۆقی، کەڕەنا
شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران
شکەفت: ئەشکەوت
شکەستەنی: ناسك، شتێ زوو بشکێ
شتاقیان، هیچیان، کەسیان
شنگ: هێز، تاقەت، توانا
شەقاو: هەنگاو
شلینگ: پارەیەکە

شاپ: شەق

شەکەت: ماندوو، هیلاك

شووره: دیوار

شەڕبار: پڕشەڕ، شەڕانی

شەنگوڵ: بە دەماخ، کەیف خۆش

شەبەیخوون: پەلامارو هێرشی شەوانە

شەلاق: شەلاخ، قامچی

شەم: مۆم، شەمالك

شەمدان: مۆمدان، شەمان، جێگەی مۆم

شۆڤار:زمان شڕ، نێوان تێکدەر، جاسووس

شوو: مێرد ، هاوسەری ژن

شەکەت: ماندوو. هیلاك

شاشك: مێزەر، پێچی مێزەر، شاشیك

شیرەت: راوێژ، ئامۆژگاری

شیرەتکار: راوێژکار

شادەتنامە: کارنامەی خوێندن

شۆخی : سوعبەت ، گاڵتە

شیڤ: شێو، شام، نانی شێوان، نانی ئێوارە

شێلەو بێلە: فێڵ و تەڵەکە

شەواك: گەمژە، گێلۆکە، دەبەنگ، سائەقڵ

شێلو: لێڵ

شلك: ناسك و تورت، سست و خاو

شەجەرە: سەجەرە، لیستی ناوی باب و باپیران

شەلاق: شەلاخ، قامچی ، جەڵدە

شەوبێری: شەونشینی، شەوکۆڕو مەجلیسی دۆست و برادەران، شەڤرۆنك

شەقڵ: مۆرك

شەڤرونك: شەونشینی، شەوکۆڕ، مەجلیس و ئاهەنگی شەوانە

شەڕاشو: شەڕانی، جنگن، جینگن

شەپڵە: نەخۆشی ئیفلیجی

شکستۆك: نزیکە شکان، شکستەنی، شتی ناسکی نزیکە شکان.

شەهلەوەند: سوارچاك، لاوی شۆخ و شەنگ.

شاختیز:باروونتدانی راوچی، شاخ

شوورەنگێو:شیر وەشێنی کارامە

## ع:

عاسا: دار عاسا، داردەست

عەیار: زیتەڵ، زۆرزان

عەبەنووس: دارێکی رەش و رەق و بەنرخە

عەیان: دیار، ئاشکرا، لەبەرچاو

عەگید: ئازا، پاڵەوان، جامێر

عال: نایاب

## غ:

غاڕ: ئەشکەوت

غوڕابی خەو: شیرنە خەو، خەوی قورس

غەوارە: غەریبە، بێگانە، نامۆ، ئاوەکی

## ف:

فەرمایشت: فەرموودە، قسە

فەرخە: بێچوە مەل و جانەوەران

فشقیات: حەنەک، گاڵتەوگەپ، ئاخافتنی بێ تام

فراڤین: نیوەڕۆژە، خواردنی نێوەڕۆ

فەرسەخ: فەرسەق

فڕناخ: لووت بەرز، بە دەعیە، روحزل، بە فیز و ئیفادە

فاما: فامیدە، تێگەییشتوو، زیرەك

ڤالا: بەتاڵ، خاڵی، پووك، ئاواڵە، کراوە

فەڕەنگی: ئەوروپایی

فەسات: گاینی ژنی بێگانە بە زۆر

چیان: خۆشەویستی، ئەڤین، ئەوین، دڵداری

فەرتووس: زورهان، پیری پەککەوتە

فەزیحەت: نەنگ، ریسوایی، مایەی ریسوایی

فیزماڵك: خۆ دزینەوە

فیوداڵ موڵکدار، دەرەبەگ

فەڵە: دیان، مەسیحی

## ق:

قالیچە: مافووری بچووك

قرمز: سوور

قەڕاڵ: پاشا

قەڕاڵنشین: پاشانشین، ئیمپراتۆریەت

قورباقە: بۆق

قاوەڵتی: تاشتی، بەرقلیان، نانی بەیانی، تێشت، قاوەتوون

قووچانی: هەڵهات

قشتیلە: بچووکی جوانکیلە

قالۆر: قاوغ

قاپ: قاچ

قاوغ: قەپێلك، قاپۆرە

قوشقی: تووڕە، وەرەز، سڵ ، ڕەوەك

قەرقەشە: تەشقەڵە، شەرو ناخۆشی

قۆپی: زەلکاوی قامیشەلان

قەڵەمرەو: سنوور و کەوشەنی ژێر دەسەلاتی کەسێك یان دەوڵەتێك

قوو: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە

قەلایی:کانزایەکی سپی نەرمە مسی پیٚ سپی دەکەنەوە

قژاوڵە: تاق تاقکەرە

قاوش: هۆلْ، شوێنی نووستنی بە کۆمەلْ

قەساس: سزا، تۆڵە

قەرەبەخت: بەخت رەش، بەدبەخت، نەگبەت

قامك: پەنجە، ئەنگوست، پل، کلك

قامبێژ: گۆرانی بێژ

قەساو: قەساب

قەلەزراو: ترسنۆك

قەتاندن: بەسەربردن

قاقڕ:زەوی رووتەن کە گیای لیٚ نەڕویٚ

قومات:باۆڵەی ساوا تێوە پێچان

قاشوانیٚ: گۆبازی، قاشوان

قەپاتمە: سۆیتەلی، ژنی بیٚ مارەیی بۆ رابواردن

قەموور: کووڕ، پشت کۆم، قەمبوور

قەستە سەر: دوژمنی زۆر سەرسەخت، خەتەر

قەبە : گەورە

قۆشەن: لەشکر

قرێر: بڕیار، قەرار

قەوماو: بویەر، رووداو

قاوەتوون: تاشت، تێشت، قاوەڵتی، نانی بەیانی

قیڕات: گەرماپێو

قڕێژە بەرد: خەنە تیلکە،وردە شینایی پێکەوە نووساوی سەر بەردان

قاپووت: پاڵتۆ، ساقۆ، بالاپۆش

قەواڵە: سەنەد، بەڵگەنامە

قەوغا: زۆر قەرەباڵغ و ئاوەدان

قرێتە: قرێدە، قلادەی ملی سەگ، ئەڵقەی ملی تاژی

قۆشمە: حەنەکچی، گاڵتەچی

قوڕنە: گۆشە، سووچ، قوژبن، سیلە

قەیچی: مقەست

قاودان: دەرکرن، جواوکردن.

قەبرغە: برك، قەبرخە، خالیگە

قووچاندن: راکردن، هەلاتن. ڕەڤین.

قاقەز قوشی : کۆلارە.

قازان: مەنجەڵی گەورە.

قار: ڕق، غەزەب، تۆران

قەرەولْ: پاسەوان، ئێشکگر، یاساولْ

قەتران: دەرمانێکی ڕەشە لە کولاّندنی داری سنۆبەر دەگیرێت

## ك:

کوت ومت: ەقاودەق

کوانگە: کوانوو، ئاگردان

کارمامز: بەچکە ئاسك

کودەڵە: بێچووە بەراز

کوختە: کۆخ، خانووی چکۆلەو خراپ

کوڵکە: موو، توك

کولۆ: کوللە

کەچڕەوی: لە ڕێ لادان، تەحریفیەت

کەوەیی: شینکی، شینباو، خۆڵەمێشی

کێوە: بۆ کوێ

کەپەك: سۆس

کۆمەك: یارمەتی، هاریکاری

کلۆر: ناوبەتالْ

کوریژگە: کوڕی بچووك

کەپوو: لووت، دفن

کەونارا: زۆرکۆن، شوێنەوار

کەسك: سەوز

کۆمیدی: پێکەنیناوی

کامکردن: نەوس تکان

کەزی: پرچ، زڵف

کلاّوخود: کلاّوی ئاسنینی شەڕڤان

کەرب: رق و کینە

کان: مەعدەن

کێوستان: کۆسار، کۆجاڕ

کۆڵۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە

کەمدوو: کەم قسە

کۆسار: کۆجاڕ، کێوستان

کەوی: ماڵی، دەستەمۆ

کەڤر: بەرد

کەڤرۆك: بەردەلاّن

کەندەکار: کەسێك کە لە دار نەخش دەکەنێ

**کێشکچی: پاسەوان، نیگابان**

**کۆ : سڵ، سڵکردنەوە**

**کەپوو : لووت، دفن**

**کارگە : وەرشە**

**کەرپووچ : خشتی سوورەوەکراو**

**کوند: بوەکوێرە، کوندە پەپوو، بایەقوش**

**کەودەن: گەوج**

**کاژستان: بێشەی دارکاژان**

**کرێت: ناشیرین، کاری خراپ**

**کەتواری: ریالیستی، واقیعی**

**کەوشەن : مەرز، سنوور ، ئاقار، تخووب**

**کنوکۆ : چوونە بنج و بناوان ، تۆژینەوە**

**کسۆك: سەگ**

**کەستەك:سندە گڵ، کلۆ قوڕی وشکەوە بوو**

**کۆشیار: چالاك، پڕکۆشش**

**کینەکێش: ڕك هەڵگر، ڕکونی**

**کەت: تەختەخەو**

**کەرەمکە: بفەرموو**

**کەوە رۆژ: رۆژی بێ هەتاو، سپییە ڕۆژ**

**کۆما: کۆمەڵێك**

**کەترەخانە: خانەی پیران**

**کەشم و نەشم: جوانی و نازو عیشوە**

**کۆرفام: گێل، گەمژە، دەبەنگ، گەلحۆ، گەلۆر**

**کەپەنك: فەرەنجی، قاپووتی لباد**

**کلکە سووتە: ڕووپامایی، کلکە لەقێ، ڕیایی و زمانلووسی**

**کۆجاڕ: کێوسات، کۆسار**

**کارەکەر: قەرەواش، خزمەتچی مێوینە، جێری**

**کەڵگیت: کەرکیت، هەپك ، شانەی پۆ کوتانی تەون.**

**کەنیزەك: کارەکەر، کەنیز، قەرەواش.**

**کەوڕێڵ: کۆخ، کۆختە،خانووی چکۆلەی یەکچاوە. ئەشکەوت.**

**کوچەماڵ: کەناس**

**کەڵەموست: قامکی گەورە،کەڵە ئەنگوست، ئەنگوستە گەورە.**

**کەڵەباب: کەڵەشێر، دیکل**

**کەمەند:پەت، کندڕ، حەبل**

**کتك: پشیلە**

# گ:

**گۆساخ: چاوقایم، رووقایم**

گەدا: پارسەك، سواڵکەر، دەرۆزەکەر

گورزە: باقەی گەورە

گەرەکمە: دەمەوێ ، دەخوازم

گەمە: یاری، وازی، کایە

گەنج: زێرو زیو، ماڵی دنیا

گەردنبەند: ملوانکە

گازکردن: بانگکردن

گۆرین: یارۆ، ناڤبری

گوند: دێ، ئاوایی

گومناو: ناوبزر، نەناسراو

گۆزینگ : قولەپێ

گەلۆز: ناولینگ

گول: گەڕ و گول

گاگۆز: پۆلکە

گارد: پاسەوانی تایبەت

گۆنگ : ئالۆز

گەنگەشە: موناقەشە

گووراو : مەخلووق

گووفەك: زبڵدان، سەرانگوێلك

گازی: بانگکردن

گڕۆز: وڕکن

گڵکۆ: گۆڕ، ئارامگە

گمێز: پێشاو

گێچەڵ: گەڕ، تەشقەڵە

گەمشەك: گەمژە، گەوشەگ، گەمشۆ، شەواك، گێل، دێوانە

گاڵدان: هاندان بۆ کاری خراپ

گۆڵمەز: زەنا زەنا، هەراو زەنا، دەنگەدەنگ

گەوشەك: بڕوانە گەمشەك

گەمشۆ: گێل، دێوانە، کەمفام، کاڵفام

گەوڕ: پشتێر، ئاغەڵ، تەویلە

گۆڵ : سەگی نێر.

## ل:

لە کەیفان: لە خۆشیان

لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەرەتەوە

لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەلاٚن

لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی

لۆسە: باری

لەزگ بوو: خەریك بوو، وەخت بوو، نزیك بوو

لێ: بەڵام

لێبڕا: بڕیاری دا

لۆسە: باریە

لاق: قاچ، لنگ

لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن

لایدە: بێگانە

لە هەنبەر: بەرانبەر

لێ : بەڵام

لەیستۆك : بووکەشووشە، بووکەڵە

لەگەز : مەتەڵ ، مەتەڵۆك

لەش بەبار: نەخۆش

لەگین:رەنگە، لەوەیە

لەوتاوە : پیس بووە

لەز : خێرا ،پەلە

لەبڕ : یەکسەری، بەقۆنتەرات

لاشەڕ : بێوەی، سەلامەت ، دوورە شەڕ

لاکەوە : لاچۆ ، برۆ کەنار

لە نك: لە کن، لە جەم، لە دەف، لەلا

لەگام: چەورە، زگ لەوەڕێن

لێژگە: لێژایی، نشێو

لێبۆك: لەودە، حەنەکچی، فێڵباز، موهەڕیج

لچ: لێوی خوارەوە

لوشکە: لوشك، جووتە

لاتریسکە: لادان لە ڕێگە

لات: نەدارو فەقیر، بێنەوا، پەریشانحاڵ

لەلە: نۆکەری زارۆك بەخێوکەر

لاڤە: پاڕانەوە

لە عەلەیی: لە دژ

لە یەکبینە: بەردەوام، پەیتاپەیتا، لە پەستاو بێ بڕانەوە

لەزێکە: پەلە بکە، خێراکە، بلەزە

لوقمان: دکتۆر، حەکیم

لەغەم: نەفەق، ڕێگەی ژێر عاردی

## م:

موغازە: فرۆشگە، دوکان

مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان

مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن

مژوول: سەرقاڵ، سەرگەرم

ملْ وموش: ملْومۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن

مۆڵ: زۆر، فره، زەحف

مژمژه: مەساسە

میرغەزەب: جەلاد

مەزرا: کێڵگە

مقاش: ماشە

مەگیرانی: بێزوو

مەرزو بۆ: ولأت، نیشتمان

مقەوا: کارتۆن

مەنهۆڵ: زێراب

مەزلْ: قۆناغ، جێی مەبەست

میرەبان : دلۆڤان ، میهرەبان

ماڵبات: خانەوادە ، بنەماڵە

مدارا :سەبرو حەوسەڵە ، دڵڕاگرتنی دۆست و ئەحباب

مووبەق : ئاشخانە

موغەیری: موغاری، بوغاری، کوانووی نێو دیوار

منجڕ :نەژنەو ،سوور لەسەر شتێك

مسکێن : رەعییەت، بەرحوکمی ئاغا

مەعلان : پسپۆڕ ، لێزان

مخابن: بە داخەوە

مراك : کەوچك ، کەچك

مینا، میناك: وەك، وەکو

مەخفەر: پۆلیسخانە، قەرەوڵخانە

مادونی: مۆڵەت، ئیجازە

مەرگی مفاجا: سەکتەی دلْ

مەحزەر: نووسینگەی مارەو تەلأقان

مەژی : مێشك

مامۆژن: ئامۆژن، ژن مام

مافور: قالی

مەتەرێز: مەتەرێس، سەنگەر

مامێر: ڕەبەنیتەی بەتەمەن

ماسێر: رەبەنیتەی گەنج

متوو: هۆگر

مرداو: قۆپی

مالیجە: چارەسەر، عیلاج، معالەجە

مەدام: خا، خاتوون، خانم، خات، یا

مجێز: میزاج، مەجاز

مەحتەل: ماتەڵ، دێرکەوتن

ماخۆلیا: ئەسپەك، نەخۆشیەکی مێشکە، گێژوحۆل

مەکتەبلی: قوتابی

مەخسەرە: گەپجاڕ

مۆڕە: خێسە، روانین بە چاوی زەق و توڕەیی

مەچیر: داوەبەن، دەزوو، تاڵ

مێردەك: بۆرە پیاو

مێژەڵۆك: لقی بڕاوەی ڕەز

مەعاف: بەخشراو، ڕەوا

موزیڕ: زیانۆك، زەرەردەر

میانساڵ: ناڤساڵ

مۆزە مۆز: دەورو خولدان بە مەبەست و تەمایەك

مۆرانە: جانەوەری دارخۆر

مەردمازار: ئەزیەتدانی خەڵکی

مشە: زۆر، فرە

مامێز:مامزە.

مامز: ئاسك، کەژاڵ

مەهوەش: وەك مانگ، مانگ ئاسا.

## ن:

نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری

نیگابان: پاسەوان

نەیجەزار: قامیشەڵان

نسیبەت: بەڵا، موسیبەت

نەترە: ورە

ناچیز: هیچ، زۆر کەم

نەژاد: رەگەز، رەچەڵەك، ئەسڵ

ناحەز: ناشیرین

نێچیرڤان : ڕاوچی

نشیمەن: بارەگا ، شوێنی دانیشتن

نەزاکەت : لوتف و ئەدەب

نك : کن ،لا، جەم ، دەف

ناڤبری : ناوبراو

نەژنەو :نەبیست، منجڕ

نمەد : لباد، نیوداشت: نە کۆن و نەتازە

نها : ئێستا، هەنووکە، نهوو

ناڤسالْ : میانسالْ

نووکه : هەنووکە ، نهو، نها، ئیستا

نەخاسما: بە تایبەتی

نەسرانی: فەڵە، مەسیحی، دیان

ناباب: ناباو، دژەباو، ناپەسند لە ڕووی کۆمەلأیەتییەوە

نۆبەرە: یەکەم منداڵْ، یەکەم بەر

نەپەرژان: دەست نەگەییشتن، فریا نەکەوتن، پێڕانەگەییشتن

نێرەوەز: نێرینە، نێر ڕەگەز

نەپرینگانەوە: سڵْ نەکردنەوە، کۆنەکردنەوە، سڵْ نەکردن

نیونەخت: یەك دەم، یەك سات

نێش: چزوو

نەساغ: نخۆش

نمەك ناسی: ئەمەگداری، وەفاداری

## و:

وەمێنیْ:بمێنێتەوە

وەکرد: کردەوە

وەشێرت: شاردەوە

وێنا: تەسەور

وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن

واز : کراوە، پێچەوانەی داخراو

وێدەدەم: دەدەمیْ

وەقف کردن : تەرخان کردن

وەردەوەدان : لە جاریْ پتر کێلأن

وەردیان : زیندانەوان

وەشانخانە: بلأوەخانە، دارالنشر

وەشانکار: بلأوکەرەوە، ناشر

وڕاوە: وڕێنە

ودم:مومبارەکی، پیرزی

وشکەبار:میوەی وشکەوەکراو

وەکوژاندن : تەمراندن، کوژاندنەوە

وێمدە : بمدەیە

واز: ئیشتیاو ئارەزووی خواردن

وەزەن: ئازار

وشترالوك:حوشتر خۆرە، عاگول

وازوازی: دەمدەمی مجێز

وێڵْ: ماریفەت

وانێك: یارۆ، هین

**وڵە: نەمەییوی تەواو**

**وشت: وشەی دنەدانی سەگ**

## هـ:

**هانکە هانك: هەناسە برکێ**

**هەژگ: لکەداری وشکەوە بوو، چڕوچیلکەی ئاوردوو**

**هەڕوگیڤ: هەرەشەو گورەشە**

**هەڵدێر: جێگەی زۆر بەرزو قیت لە شاخ و کێودا**

**هەزاربە هەزار: شاخی زۆر بەرزو عاسی**

**هەڵزنان: هەڵگەڕان بۆ سەرەوە**

**هایم: سەرگەردان، وێڵ**

**هەنبەر: بەرانبەر**

**هەترەش: زەندەق، زراو**

**هەنووکە: ئیستا، نها، نهوو**

**هۆشن: بەهۆش**

**هەتەر: مەودای حوکمی چاو**

**هۆڤی: کێوی، وەحشی**

**هۆدە: ژوور، ئۆتاغ، دیوو**

**هزرو هزرین : بیرو بیرکردنەوە**

**هەیڤ : مانگ**

**هەیڤەشەو: مانگە شەو**

**هەدا : سەبر ، حەوسەڵە**

**هەراوزەنا : هەراو هەنگامە**

**هەڕەمە : تێکەڵ و پێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو، هەڕەت، جەنگە، تاف**

**هاپۆ : مام**

**هەڵەشە :لەسەر، بێ ئەقڵ**

**هەرەت : تاف**

**هەتوان : مەرهەم ، مەڵحەم**

**هەڤڕك : ملەکەر، ململانێ، ڕکبەڕکێ**

**هەڕوو : هەڕە ، بڕۆ**

**هەنگێ : هەینێ ، ئەوسا**

**هەشتاو : پەلە ، لەز، خێرا**

**هاوکوف:دوو کەسی لە یەك ئاستی کۆمەلأیەتی**

**هاودەستی:هاوبەش لە کەین و بەینان**

**هەیڤۆك: هەیڤك، مانگیلە، مانگی یەك شەوە**

**هێورین: حەوانەوە**

**هاماج: ئۆتمۆسفیر**

**هەلأوێردن: جیاکرنەوە**

**هاتە وەشاندن ، بڵاوكرایەوە**

**هزرڤان: بیرمەند، زانا**

**هەنیە: تەوێڵ، ناوچەوان**

**هەلاكەت: گیانەڵڵا، ئاویلكە، ئاوزینگ، حاڵی مردن**

**هەڵاژیان: ڕاكشان**

**هاژۆتن: لێخوڕین**

**هێم: بناخە، بناغە**

**هاوسونح: هاوساڵ، هاوتەمەن، هاوزا**

**هاو وازی: هاوگەمە، هاوكایە، هاوبازی**

**هەوسار: ڕێشمە، دەستە جڵەو**

**هاوقەتار: هاوكارو پیشە، هاوڕێ، دۆست**

**هەمێز: ئامێز، باوەش**

**هزرین: بیركردنەوە**

**هەڵەت: زەردو ماهی زۆر سەخت.**

**هەراشتر: گەورەتر، پێگەییوتر**

**هەڕە: مشار.**

**هۆشی: گوڵەوەچنی.**

## ی:

**یاڵ: تووكی سەر ملی شێرو یەكسم**

**یەكهاوی: یەكجۆر، یەكدەست، بێگۆڕان**

**یارۆ : فلاَن**

**یاتاخ : پێخەف ، نوێن**

**یەختە: خەسێنراو، گون دەرهێنراو**

**یونیفۆرم: جلكی فەرمی یەكچەشن**

**یاوەگۆیی: وڕاوە، وڕێنە**

**یا: خا، خات، خاتوون، خانم، وشەی ڕێزە بۆ ژنی گەورە.**

**یەغدان: یەخدان، سەنوقیداریی گەورە.**

**حەمە کەریم عارف**

* **کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.**

- **لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.**

- **یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.**

- **لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.**

- **سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.**

* **جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.**

***لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.**

- **لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.**

- **زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:**

١- **تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩**

٢- **کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧**

٣- **بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨**

٤- **داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥**

٥- **لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان**

٦- **کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ**

٧- **نینا، ڕۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥**

٨- **نامۆ، ڕۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی**

٩- **ڕێبەر، ڕۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧**

**١٠-شکست، ڕۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.**

**١١- هاوماڵەکان، ڕۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان**

**١٢ – بێناسنامەکان، ڕۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦**

**١٣- قوربانی، ڕۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق**

**١٤- دووره وڵات، ڕۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان**

**١٥- ئازادی یا مەرگ، ڕۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨**

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جیٚ پیٚ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك
٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی
٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك
٢٢-دیدارو دەقو رەخنە،چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك
٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی شەشەم ٢٠١١
٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(        )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵڵائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فوئاد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- شیعر کوژی..حەمە کەریم عارف، چ١/ ٢٠١٠/کۆمەڵەی روناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك، ژمارە(٧٠)
٧٥- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا،(جانتا) کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی

٨٤-وقفات فى رحاب الپقافه الكورديه، حەمە كەریم عارف

٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسكی

٨٦-دەیڤد كۆپەرفیلد، (ڕۆمانی كورتكراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیكنز

٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس

٨٨-ڤل الصوت و قصص اخرى، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی

٨٩-شازادە و گەدا، ڕۆمان، مارك توین

٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی

٩١-سفرەی فەقیران حەمە كەریم عارف

٩٢-باڵندەكەی من ڕۆمان، فریبا وفی

٩٣- نامەكانی تولستۆی

٩٤- جەمیلە، ڕۆمان جەنگیز ئایتماتۆف

٩٥- حەفتا چیرۆكی چینی بۆ منالآنی كورد

٩٦- الرحیل الدامی....تقدیم وترجمە: جلال زنگابادی

٩٧- كۆڵوانە سوور... كۆچیرۆك بۆ منداڵان

٩٨- ئەو پیاوەی كە سێبەری خۆی فرۆشت ..ڕۆمان..شامیسۆ

٩٩- دكتۆر...شانۆنامە...برانسیلاڤ

١٠٠- با خەییام باش بناسین /جەلال زەنگابادی

١٠١- دۆزەخی پیرۆز، ڕۆمان ،برهان شاوی

١٠٢- من و نەنكم و ئیلاریون و ئیلیكۆ / ڕۆمان / نودار دومبادزە

١٠٣- یادگارییەكانی خانەی مردووان/ دۆستویفسكی

١٠٤-مێژووی ڕۆمانی توركی

١٠٥- دیوار...كۆچیرۆك................كۆمەڵێك نووسەر

١٠٦- كۆكۆرۆ...............ڕومان.........ناتسومی سوسكی

١٠٧- كانییە قارەمان....كۆچیرۆك بۆ مێرمنداڵان /حەمەكەریم عارف

١٠٨- ئەودیوی مەرگ............حەمەكەریم عارف/چ١٢٠٠١/ موكریانی

١٠٩- قاوشی ژمارە شەش/ چیخۆف/ پێشەكی و پاچڤەی: حەمەكەریم عارف

١١٠- گەمژە، ڕۆمان، دوو بەرگ، دۆستۆیفسكی

١١١- دەربارەی هۆزان و هۆزانڤانی...

١١٢- ساڵنمای ژیان و بەرهەمی...

١١٣- تاراس بۆڵبا/ ڕۆمان/ گۆگۆل

١١٤- لە زمانی چیرۆكنووسانەوە

١١٥- جیهانی چیرۆك ( كۆمەڵێك دەق ورەخنە)

١١٦- ڕۆبینسۆن كرۆزۆ/ ڕۆمان/ دانیل دیفۆ

١١٧- هەزار پیشە................حەمەكەریم عارف

١١٨- چیخۆف...هنری ترۆیا

١١٩- دەربارەی نامۆكەی كامۆ

١٢٠- دەربارەی ئۆدیسەكەی هۆمەر